عەبدوڵڵا ئۆجەلان

# لە دەوڵەتی راهیبی سۆمەرەوە بەرەو شارستانییەتی دیموکراسیانە



و . لوقمان عەبدوڵڵا

بەرگی دووەم

عەبدوڵلا ئۆج ئالان

# لە دەوڵەتی راهیبی سۆمەرەوە بەرەو شارستانیەتی دیموکراسیانە

وەرگێڕانی لەتورکییەوە: لوقمان عەبدوڵ

بەرگی دووەم

لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی راگەیاندنی ( پ.ج.د.ك )

# ناوەرۆك


VI: کێشەی کورد لە رۆژهەلاتی ناوین و رێگاکانی چارەسەری (٧)

أ ـ پێناسەکردنی هەندێ زاراوەی سەرەکی (١٤)

**ب ـ هەندێ هەلوێست سەبارەت بەدیاردەی کورد و کێشەکانی شێواز (٢٦)**

**ج ـ چوارچێوەیەك بۆ مێژووی کورد (٣٧)**

أ ـ سەردەمی نیۆلتیك و کورد (٣٧)

**ب ـ سەردەمی کۆیلەداری و کوردان (٤٥)**

**ج ـ کورد لەسەردەمی دەرەبەگایەتیدا (٦٩)**

**د ـ کوردان لەسەردەمیسەرمایەداریدا (٩٧)**

د ـ جولانەوەی نەتەوەیی و دیموکراسی و ئەتنیکی کوردان (١١٥)

**١ـ قۆناخی میللیگەرای سەرەتایی دەرەبەگایەتی (١٢٠)**

**٢ـ قۆناخی میللیگەرای بۆرژوازیەت (١٢٣)**

**٣ـ مەیلی ئازادیخوازی گەل (١٢٦)**

٤ـ لەدایکبوون و گەشەکردن و ئایینەدەی PKK (١٢٨)

هـ ـ بەرەو چارەسەری کێشەی کورد (١٦١)

١ ـ کێشەی کورد لە تورکیا و چارەسەری دیموکراسییانە (١٦٥)

**٢ ـ کێشەی نەتەوەیی لە ئێران و چارەسەری ئیسلامی دیموکراسییانە (١٨٢)**

٣ ـ عەرەبەکان و کێشەی کورد و چارەسەری (١٨٧)

٤ ـ کێشەی کوردەکانی سوریا بۆ بەدەستهێنانی ناسنامە و چارەسەری تەڤلیبوونی دیموکراسییانە (١٩٤)

VII : بوون بە جەنگاوەری ئازادی گەلێك کە لەنێو گەمارۆی پیلانگێرپدایە (٢٠١)

**١ـ مێژووی پیلانگێرییەکان و ئەو وانانەی پێویستە لێیەوە هەلبهێنجێنرێن (٢٠٨)**

أ ـ پیلانگێری چەرخی یەکەم و ئەفسانە خەلەتێنەرەکان (٢٠٨)

ب ـ چەرخی ناوین و پیلانگێری پەردەپۆشکراو بە ئایین (٢١٣)

ج ـ نەتەوەپەرستی سەرمایەداری و فاشیزم بەرەپێداوترین پیلانگێرییە (٢١٧)

٢ـ راستینەی ئەو پیلانگێڕیەی PKK دووچاری هاتووە (٢٢٠)
٣ـ ئەو پیلانگێڕیانەی بەسەر سەرۆکایەتی PKK دا سەپێنرا، دانانە بەو ترسەی بەرامبەر ناسنامەی ئازادی گەل هەیە (٢٤٧)
أ ـ سەردەمی لەدایکبوونی رێبەرایەتی لەپێناو گەل (١٩٧٠ـ١٩٨٠) (٢٥٣)
ب ـ پارچەبوونی سۆسیۆلۆژی کەسایەتی و سەرلەنوێ ناواکردن (٢٦١)
٤ ـ چۆن دەرك بە رووی ناوەوەی پیلانگێڕی سەدە بکرێت؟ (٢٦٩)
أـ پیلانگێڕییە مێژوویەکان پێشکەوتنەکان ناوەستێنێ، خێرای دەکات (٢٦٩)
ب ـ دەتوانرێ پیلانگێڕی ١٥ی شوبات بۆ گەلان بکرێتە ئاشتی و دیموکراسیەتێکی هەمیشەیی (٢٩٦)

VIII : ئایا یاسای ئەورووپا تواناکاریەکی چارەسەری بۆ کێشەی کورد دەخولقێنێ؟ (٣١١)
١ـ دەرکەوتن و پەرەسەندنی یاسا (٣١٣)
٢ـ رۆڵی یاسا لە چارەسەرکردنی کێشەکانی کۆمەڵگا (٣١٥)
٣ـ یاسای ئەورووپا، کۆماری تورکیا و کێشەی کورد (٣١٧)
٤ـ قۆناخی دادگایی ئیمرالی، پەیمانی مافی مرۆڤی ئەورووپا و دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپا (٣٢٩)

IX : ناسنامەی ئاپۆ: لەتێرەوە بەرەو بەگەلبوون (٣٥٣)
١ـ لەدایکبوونی سروشتی، پەرتەوازەبوونی کولتووری تیرە و هەنگاونان بۆ دارستانی شارستانییەت (٣٥٤)
٢ـ کۆمەڵگای بۆرژوازی و ئاشنابوون بە کۆمار، گومان و هەڵوێستی شۆڕشگێڕی (٣٦٥)
٣ـ خۆخولقاندن لەمیانەی شەڕ، بەڵام ئاوەکو کوێ؟ (٣٧٤)
٤ـ گەڕان بەدوای ئاشتی و پێشخستنی رەخنە و رەخنەدان (٣٨٦)

دوا گووتە(١) (٤٠٥)
دوا گووتە(٢) (٤١٣)

# کێشەی کورد لە رۆژهەڵاتی ناوین و رێگاکانی چارەسەری

## دەروازە

یەکێك لە کێشە هەرە ئاڵۆزەکانی رۆژهەڵاتی ناوین، کێشەی کوردە. ئەم تایبەتمەندێتیەی کێشەکە بۆ شێوازی پێکهاتنی ئەم دیاردەیە دەگەڕێتەوە. تاوەکو دیاردەی کورد بەشێوەیەکی راست تاوتوێ نەکرێت، هەروەکو رابردوو و رۆژگاری ئەمڕۆمان، ئەوا لەداهاتووشدا ئاڵۆزبوون و زیاتر گران بوونی کێشەکە چەندین کێشە و گیروگرفتی نوێتر لەگەڵ خۆی دێنێ. کێشەی کورد شوێنگەیەکی وەهای هەیە، هەم لەلایەنی بەرفراوانی، هەم لەبواری شێوەدا، زۆر لەکێشەی عەرەب ـ ئیسرائیل قورس و قووڵترە، کە بەرادەی هەرە زێدە جیهانی بەخۆیەوە خەریك کردووە. بەتەواوی ئاشکرا نەبوونی ئەم کێشەیە، دەبێتە بابەت و زەمینەی هەڵسەنگاندنی ناتەواو و چەوت. هەروەکو چۆن بەهۆی ژمارەی دانیشتوان و جوگرافیا و هەلومەرجە کۆمەلایەتی و سیاسیەکان لەناوچەدا خاوەنی شوێنگەیەکی ستراتیژیە، ئەوا لەبواری هەمەڕەنگی و قورسایی کێشەکانەوە لەسەرووی هەموویانەوە دێت.

رەوشە پارچەییەکەی لەنێوان قەوارەی هەرسێ نەتەوە سەرەکیەکەی ناوچەکە فارس و عەرەب و تورکەکان، رێگا لەپێش ئەوە دەکاتەوە کێشەکە لەسەر ئاستی ناوچەکەدا کاریگەری هەبێت. هەروەکو نموونەی قاپە بەیەکگرێدراوەکان، چارەسەری لەپارچەیەکدا، پارچە و وڵاتەکانی دیکە ناچاری چارەسەری دەکات. لەرەوشێکی پێچەوانەشدا هەمان کاریگەری هەیە. رەوشی ئابڵوقە دراوی جوگرافیاکەی، بەردەوام مەسەلەی تێکۆشانی چەکداری لەرۆژەقدا هێشتۆتەوە. هەر داگیرکاریەکی لەقۆناخە جیاجیاکانی مێژوو روویدا بێت، ئەوا بەهەر شێوەیەك بێت بەرخودانێکی بەرامبەر بەخۆی هێناوەتە ئاراوە. هەروەکو بڵێی ژیان بەشێوەیەکی خۆڕسك لەنێو سایکۆلۆژیای یاخیبوون بەڕێوە دەچێت. لەمیانەی زیادبوونی توانستەکانی پزیشکی، ژمارەی گشتی ٤٠ ملیۆنی تێپەڕکردووە. ئەم ژمارەیەش لەئاستێکدایە دەتوانرێ هەموو لێکدانەوەیەکی ستراتیژی دەرهەق بکرێت.

لەگەڵ ئاراستە گرتنی عەشیرەتگەری بەرەو هەڵوەشانەوە، کە بەدرێژایی مێژوو فۆرمێکی باو و کلاسیکی یە، بۆ یەکەمین جارە لەبواری کۆمەلگادا رێگا لەپێش چەندین نوێکاری دەکاتەوە. بێ بەشکردنی لەرێچکە هاوچەرخەکانی چارسەرکردنی کێشەکانی کۆمەلگا، ئەم نوێبوونەوانە دەکات بەزەمینەی قەیرانی سەخت و گران. لەکاتێکدا چەندین کۆمەلگا، لەمیانەی نوێبوونەوە لەکێشەکان رزگاریان دەبێت. هەرچی نوێبونەوەی کوردانە بەپێچەوانەی

ئەمە، گرێکوێرەی نوێتر دەخاتە سەر گرێکوێرە مێژووییەکان. چارەسەری لەولاوە بمێنێت، تەنانەت نکوڵیکردن لە هەبوونی کوردان یاخود ئینکارکردنی بەشێوەیەکی جیاواز و چەواشەکراو، هەروەکو سیاسەتێکی زاڵ بەڕێوە دەچێت. لەلایەکی دیکەشەوە لەڕێگای ئەو توانا کاریە تەکنۆلۆژیانەی زیادی کردووە، جیهانی هاوچەرخیان ناسیوە، ئەمەش ڕێگا لەپێش تەقینەوەیەکی وشیاری و داواکاریەکانی گەل دەکاتەوە. پێشنەکەوتنی ڕێگا چارەی دیموکراسییانە لەڕۆژهەڵاتی ناوین، دەبێتە هۆکاری ئەوەی تەقینەوەکان هاوسەنگ نەبن و چەندین ڕووداوی تراژیدی لێبکەوێتەوە. داخراوبوونی ڕێگا چارەکانی باوی ئایینی و سیاسیانەی هاوچەرخ، بەردەوام توندوتیژی وەکو تاکە ڕێگای ڕزگاری لەڕۆژەڤدا دەهێڵێتەوە. ئەمەش لەنێو ئەو رەوشە ناهاوسەنگەی هێز بەواتای خوێن ڕشتنێکی زیاتر و قووڵبونەوەی قەیران و ئێش دێت. ئەوەی خراپ و نەرێنییە ئەوەیە، بەڵام سەرەڕای ئەوەی کێشەیەکی نێجگار مەزنە و زۆر لەسەرووی کێشە هاوشێوەکانیەتی، ئەوا لەجیاتی ئەوەی دیبلۆماسی نێودەوڵەتی و دەزگا نەتەوەییەکانی ناوچە بەکێشەکەوە خەریک و پەیوەستدار بن، ئەوا نکوڵی و دواخستنی بەناقڵمەندانەترین سیاسەت لەقەڵەم دەدات. بەتایبەتیش بەهۆی ئەو بەرژەوەندییە هەمەلایەنانەی سەرچاوەی خۆی لەشوێنگەی جیۆستراتیژی ناوچەکە دەگرێت، لەمیانەی دیبلۆماسیەتێکی شاراوە. هەڵوێستی هەرە خراپی دژە مرۆڤانەی هاوبەشی کردووە بەسەرەکیترین شێوازی سیاسیانەی کە نیشانی بدەن. گرێدانیان بەهیچ بەهایەکی ئەخلاقی نەماوە.

بێگومان لەفاکتەرە دەرەکیەکان زیاتر، فاکتەرە ناوەکیەکان ڕۆڵێکی سەرەکی لەوەدا بینیوە کە بکەوێتە نێو ئەم ڕەوشەوە. خودی دیاردەی کورد کە هێندە ئاڵۆزە، بەڕەوشێك گەیەنراوە کە نەناسرێتەوە، تەنانەت لەسەرووی هەموویانەوە خودی کوردان و ئەوانەی خاوەن هەڵوێستەیەکی گەشبینن، سەبارەت بەچۆنیەتی نیشاندانی هەڵوێستێکی بەبڕیار و ئەنجامگیر بێچارە دەمێنن.

لەحاڵەتێکی بەمجۆرەدا ئەوەی پێویستە لەسەرووی هەموو شتێکەوە بکرێت، دیاردەی کورد خۆی دانێتە سەرمێزی نەشتەرگەری؛ لە گووتنی ئەوانەی خاوەن هەڵوێستی حاشالێکردنن تا دەگاتە خاوەن هەڵوێستە سۆزداریەکان کە سەبارەت بەدیاردەی کورد کراوە، لێکۆڵینەوە لەسەر هەموویان بکرێت، لەپێناسەیەکی نزیك بەڕاستی ببن بەیەك. ئەگەر ئەم یەکبوونە هزریەش بەدی نەیەت، لەڕێگای زانستی ترین هەڵوێستەوە ڕەهەندەکانی دیاردە و کێشەکە بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا بخاتە ڕۆژەڤی تەواوی ناوەندە پەیوەستدارەکان. بەلایەنی کەم گفتوگۆیەك لەسەرینەمای دیاردە زانستیەکان بێت، سەبارەت بەدروستترین ڕێگا چارەسەری چەتری گشتی و هاوبەش مەزن دەکات. ئەگەرنا هەروەکو چۆن تائێستا بەڕێوەچووە، لەڕێگای دیالۆگی کەرەکان هیچ سوودێك لەگەڵ خۆیدا ناهێنێ. ئیتر دەبێ دەرك بەوە بکرێت کە لۆژیکی

"ئەنجامم دا وادەرکەوت" خراپترین لۆژیکە، کە هەر ناوەندێك بەدەستپێشخەری یەکلایەنە ئەنجامی دەدات. دەبێ ئەوە بزانرێت کە بەدرێژایی مێژوو و زێدەتریش لەرۆژگاری ئەمڕۆماندا پێویستە لەیەکەم دەرفەتدا رێچکەی دیالۆگ وەکو رێگایەك پەیرەو بکرێت، هەروەکو لەتەواوی جیهان پێویستە سەبارەت بەم کێشەیەش بەبناخە بگیرێت. لەراستیدا سەپاندنی واقیعی یەکلایەنە سوودی بۆ هیچ لایەك نەبووە. بەم شێوەیە، نەتوانراوە کێشەکە لەنێو ببردرێت، نەرەوشی بوون بەکێشە بەلاوە نراوە، نە توانستێکی چارەسەری بەدەست هێنراوە.

لەرەوشێکی بەمجۆرەدا پێناسەکردنی دیاردەی کورد گرنگی و بایەخێکی مەزنی هەیە. گەورەترین ناکۆکی سەبارەت بەچۆنیەتی پێناسەکردنی دیاردەکەیە. ئەگەر عەرەبەکان کوردان بە (عەرەبەکانی یەمەن) دابنێن، تورکەکان بە "تورکەکانی شاخ" یان دابنێن، فارسەکان " وەکو خۆیان" ببینن یاخود بەپێچەوانەوە کوردان وەکو نەتەوەیەکی ساویلکە پێناسە بکرێن، ئەوا دەبێتە ناچاریەك کە ئەو هەڵوێستە سیاسیانەی سەرچاوەی خۆی لەم پێناسانەوە دەگرێت زۆر جیاوازتر نەبن. هەروەکو چۆن هەڵوێستە سیاسیە جیاوازەکان، کردەوەی جیاواز لەگەڵ خۆیدا دێنێت و دەیکات بەناچاریەك، ئەوا پێکدادانە کوێرانەکەشی بەرەوشێك دەگەیەنێت زۆر بە ئێشترە و گرێ کوێرەیە و رزگاربوون لێی سەختە، لەمەش بەولاوە چاوەڕوانی هیچ ئەنجامێکی دیکەی لێناکرێت.

ئەو کردەوە و پراکتیکانەی تائێستا بەڕێوەچووە، واتە راستینەی یاخیبوون و پەلامارەکانی قڕکردن، ئەم دەست نیشانکردنانە پشت راست دەکاتەوە. تەنانەت دوا قەڵەمبازە کرداریەکانی دوایی کە بەڕێبەرایەتی PKK ئەنجامدران، سەرەڕای ئەو هەموو بانگەشەو هەوڵە زانستیانەی، نەیتوانیوە خۆی لەپێشکەوتن و هەڵسەنگاندنی یەکلایەنە رزگار بکات.

بێگومان دیاردەی کورد لەئاسمانەوە نەهاتۆتە خوارەوە. نزیکبوون و لێکچوونێکی مەزنی لەگەڵ دیاردە هاوشێوەکانی جیهان هەیە. بەڵام ئەمە راستینەیەکە کە گەلێك جیاوازی بەگوێرەی خۆی لەخۆوە دەگرێت. ئەوەی پێویستە ئەنجام بدرێ بەئەندازەی لایەنە هاوشێوەکانی، دەبێ زێدەتر لایەنە تایبەتەکانی ئاشکرا بکرێت. سیاسەتێك تەنیا پشت بەلایەنە لێکچووەکان ببەستێ، لەوانەیە ئەنجامێك لەگەڵ خۆیدا بهێنێ بەرگەگرتنی ئاستەم بێت. تەنیا کاتێك زۆر بەباشی لایەنە تایبەتەکانی دەستنیشان کرا، سیاسەتێکی واقیعیانە و ئەوتۆ پیادە کرا کە دەرفەتی ئەنجامگیربوونی هەبێت، دەشێ سەرکەوتن بەدەست بێ. ئەوەی تاکو ئێستا تاقینەکراوەتەوە و لەئەنجامیشدا هەموو لایەنەکان لەشکست رزگاریان نەبوو، ئەم مەسەلەیەیە.

لەمێژووی رابردوو و رۆژگاری ئەمڕۆمان، گەلێك نزیکبوونەوە و هەڵوێستی هاوشێوەی ئەمە یاخود پێچەوانە بەرامبەر دیاردەی کورد نیشاندراوە. کاتێك تایبەتمەندێتیە

سەرەکییەکانی بێنینە بەرچاوان، دەتوانین ئەم نزیک بوونەوانە لەنێو سێ چوارچێوەدا هەڵسەنگێنین.

یەکەمیان، هەڵوێستی حاشاکردن و نکوڵیکردنە لەدیاردەی کورد. بەگوێرەی ئەم نزیکبوونەوە شتێك بەناوی کورد بوونی نییە؛ یاخود جێگای خۆی لەنێو کام وڵات بگرێت، ئەوا بەکێشەیەکی دروستکراوی وەکو جنۆکە (خەیاڵی) لەقەڵەم دەدرێت کە لەلایەن دوژمنانی ئەم وڵاتەوە خوڵقێنراوە. هەرشتێك بەناوی کورد بگوترێت و بنوسرێت و ئەنجام بدرێت بەکاری دوژمن دادەنرێ، حەرامە، هەربۆیە دەبێ کێشەکە حاشای لێبکرێت یاخود لەنێو ببرێت. سەدەی بیستەم کە بەرادەی هەرە زیندە زانستیبوونی تێدا پێشبکەوێت، بەداخەوە بەهۆی بۆچوونی نەتەوەی سەردەست پڕ لەم بۆچوونە تێپەڕ بوو. تەنانەت ئەگەر لەهەمان نەتەوەش لەقەڵەم بدرێت، تەنانەت کوێرەکانیش ناتوانن حاشا لەوە بکەن کە ناوچەیەکە تایبەتمەندێتی سۆسیۆ ـ ئابووری و کولتووری جیاوازیان هەیە و پێکهاتەیەکی جیاوازی زمانی تێدا زاڵە. تەنانەت لەنێو چەندین نەتەوەی پێشکەوتووی ئەمریکا و ئەوروپاشدا، چەندین ناوچە و کولتووری جیاواز لەخۆوە دەگرن و دانیان پێدانراوە، سەرباری ئەمەش ئەم هەڵوێستە کوێرانە ناخوازێ ئەمە پەسند بکات. سەرباری ئەوەی جیاوازیەکی مەزن لەئارادایە، نزیکبوونەوەی لەجۆری "ئێمە جۆنیەکین، بیانیەکان جیاوازی دروست دەکەن"، لەڕاستیدا بڕیار و حوکمی نکوڵی کاری ئەوتۆن کە نموونەیان لەمێژوودا زۆر دەگمەنە، بەڵام چالاکییە یەك بەدوای یەکەکان و جموجوڵی سانسۆر نەناسی پێشکەوتنی زانستی ـ تەکنەلۆژی، خاوەنی ئەم جۆرە هەڵوێستانەی خستۆتە رەوشێك کە کەس باوەڕی و متمانەیان پێناکات.

کێشەکە و ئەو دیاردەیەی کە پشتی پێ دەبەستێ، تەنانەت دوژمنەکانی، نکوڵیکارەکانی ناچاری ئەوە کردووە، ئەگەر بەدڵخوازیش نەبێت نیتر نزیکبوونەوەی جیاواز پێشبخەن و بەشێوەی بژاری (أهون الشر) سووکترین خراپی پەسندی بکەن.

لایەنگرانی بۆچوونی دووەم: جێگای خۆیان لەنێو شوێنگەیەکی پێچەوانەدا دەگرن. لەڕێگای نزیکبوونەوەیەکی سۆزداری و دوور لەواقیعیانە، لەمیانەی هەڵوێست و هەڵسوکەوتێك کە پەیوەندیەکی ئەوتۆیان لەگەڵ دیاردەکە نییە، پەنا دەبەنە بەر سیاسەت کردن. ئەمەیە ئەو پێڕەوەی بەنەدەبیاتی حەماسەت ناو دەبرێت. ئەمە لەولاوە بمێنێت کە ئەو رێچکەیە بابەتێکی وەکو دیاردەی کورد بەچارەسەری بگەیەنێ کە تادوارادە ئاڵۆزە و خراوەتە نێو رەوشێك دەرکەوتن لێی ئاستەمە، لەزیادکردنی دواگرێکوێرە بەولاوە هیچ رۆڵێکی دیکە نابینێ. لەکاتێکدا هەندێ کەس هەوڵدەدەن لەڕێگای نەتەوەپەرستی سەرەتایی و رێنماییە ئایینیەکان ئەم رێچکەیە پراکتیزە بکەن، بەشێکیش وەها باوەڕ دەکات لەژێر ناوی چەپڕەوی و شۆڕشگێڕێتی پراکتیزەی کردووە. بەواتایەکی دیکە، لەمیانەی ئەم رێچکانە تەمەنی کوردایەتی سەدەی بیستەم بەفیڕۆ چوو، کێشەکە قوورستر بوو، خراوەتە نێو رەوشێکی بێ باوەڕی و لاواز.

ـەرتەواو تەواوی هۆکاری ئەمەی یان لەهێزەکانی دەوڵەت یان لەڕەوشی کۆسپ نانەوەی لایەنی بەرعبەر بینیوە، پێویستی ئەوەی نەبینیوە کەموکوڕی و چەوتیەکان لەخۆیدا ببینێ و ـەردخنەدانێکی ریشەیی تێپەڕ ببن. ئەم خاڵەی ئەو توێژە پێی گەیشتووە، پێکهاتەی ڕۆحی و کەسیەتیەکە کە بێباوەڕە، گەندەڵ بووە و ئامادەیە تەسلیم بەهەر هەلومەرجێك ببێت. ـعمەش خۆی تەسلیمی کۆیلایەتی و گووتەی "بەمجۆرە هاتووە، بەمجۆرەش دەڕوات" کردووە کە گووتنێکی بابوباپیرانە و چەمکێکی قەدەرگەرایییە.

هەروەها پێویستە باس لەتوێژێکی دیکەش بکرێت کە لەنێوان ئەم دوو بۆچوونەی ـەکەمدا ڕۆڵ دەبینێ. ئەم توێژەی کە لەقۆناخە کۆنەکانی مێژووەوە ڕۆڵ دەبینن، **بەکرێگیراوە نوکەرەکان** (العملاء التقلیدیین). بەلام ئەمانە دەزانن بەگوێرەی قۆناخ خۆیان نوێ بکەنەوە، ـعمانە لەوەدا کارامەن و بوونەتە وەستا کام لا سەربکەوێت، هەڵوێست بەلای ئەودا نیشان بدەن. هەروەکو کۆمپانیای بنەماڵەیەك، ئەندامەکانی خۆیان لەنێو هەموو ناوەندەکانی هێز بەشی دەکەن، کامە لایەن دەسەلاتدار بێت هەڵوێست بەلایەنی ئەودا نیشان دەدەن، بەمجۆرە ئەمە دەکەن بەسیاسەتێکی سەرەکی کە وەستایانە بەردەوام بنەماڵەکەیان بالا بێت و بەرژەوەندییەکانیان هەمیشەیی بێت.

بۆ ئەمانە رامان و پرەنسیپ و ئەخلاق جێگای باس نییە. بەرژەوەندی بەرجەستە لەکوێ بێت، پرەنسیپ و هەموو شتێکیان گرێدراوی ئەوێ یە. لەڕاستیدا ئەوانەی کێشەکانی کۆمەلگایان ژەهرخوارد کردووەو خستوویانەتە نێو بنبەستبوون، ئەم توێژەی ناوینە. هەروەکو چۆن ئەمانە بەهێزن، لەهەمانکاتدا خاوەن ئەزموونێکی مێژوویین. زۆر باش دەزانن لەگەڵ کێ و چۆن پەیوەندی ببەستن و چۆن خۆیان هەراج بکەن و بفرۆشن. رێز لەهیچ بەهایەکی ئەخلاقی و پرەنسیپی کۆمەلگا ناگرن. ئەمە لەبەرژەوەندی خۆیان نابینن. دیاردەیەکی زۆر تایبەت لەژێر ئەم راستیانەدا شاراوەیە، کە لەوانەیە لەجیهاندا هاوتاکەی نەبینرابێت. لەسەرووی هەموو کەسێکەوە، ئەم توێژە بەرپرسیارە بەرامبەر ئەوەی دیاردەی کۆمەلگا و ئەو کێشانەی کە سەرچاوەی لێوە دەگرێت، بەم رەوشەی ئێستا بگات. لەبەرئەوەی بەهەرزانترین شێوە خزمەتی بالادەستی دەوڵەت دەکات، رەوشێکی بەمجۆرەشیان هەیە کە هەرلەسەرەتاوە هەنگاوە ئەرێنییەکانیش پووچەڵ دەکەنەوە. بەکارامەیی لەنێوان هەردوو لادا یاری دەکەن. تەنانەت لەوەشدا شارەزایە، کە لەژێرەوە پەیوەندی لەگەڵ لایەنی بەرامبەری خۆشی بەرێوەببات و کەلکی لێ ببینێ. تاوەکو لەهەموو لایەنێکەوە ئەم توێژەی ناو کۆمەلگا شینەکرێتەوە و ئاشکرا نەکرێت و بێکاریگەر نەکرێت، ئەوا ناتوانرێ بەشێوەیەکی راست دەرك بەم دیاردەیە بکرێت و بەشێوەیەکی راست چارەسەری پێشبکەوێت.

**وەکو بۆچوونی سێیەم:** دەتوانین نزیکبوونەوەی ئەو توێژانە نیشان بدەین کە بانگەوازی زانستی بوون دەکەن. لەگەڵ ئەوەی ئەم توێژە خاوەن نیازێکی باشە، بەلام لەلایەنی توانستی

زانستی خاوەنی ئاستی پێویست نییە. ئەو دیاردانەی دەست نیشانیکردووە پارچە پارچەیە، بێ سیستەمە. ئەم نزیکبوونەوەیەش لەوە دەچێت، بخوازێت فیلێک لەمیانەی تاڵە موویەکیەوە روون بکرێتەوە. هەربۆیە لەوانەیە بەئەندازەی خاوەن بۆچوونەکانی دیکە رۆڵێکی ئەرێنی ببینێ. بۆچوونێکی نیوەچڵ، مەترسیەکەی لەو بۆچوونە چەوتانە کەمتر نییە کە بەسیستەم کراون. نزیکبوونەوەی زانستیانە پێویستی بەقووڵبوونەوەیەك هەیە کە جددی و لەئاستێکی بەرزدا بێت. ئەگەر توانستێك بەدی نەیەت کە لەسەربنەمای تیۆری و لێکۆڵینەوە و تێڕوانین بێت، چاوەڕوانی ئەوە ناکرێت رێچکەی زانستیانە ئەنجامگیر بێت. گەلێك ئەنجامی هەڵوێستی تیۆری و لێکۆڵینەوە و تێڕوانین لەئارادایە. بەڵام لەبەرئەوەی ئەمانە هەر لەسەرەتاوە خۆیان لەکاریگەریەکانی یۆتۆپیا و دۆگماتیانە یەکلانەکردەوە و هەروەها چارەسەرییان نەکرد بەئامانجی خۆیان، جگە لەوەی لایەنی زانیاریان هەیە، بەهیچ ئەنجامێکی دیکە نەگەیشتوون. خاوەنەکانی ئەم هەڵوێستە لەجیاتی ئەوەی لەپێناو سیاسەتێکی راست و واقیعی هەوڵبدەن کە تواناکاری پەیڕەوکردنی هەبێت، هەروەکو بڵێی چارەسەری لەرێگای زانستەوە مەحاڵە، کەوتنە نێو رەوشێکی بێ بەرپرسیارێتی بەزانستی بوون لەقەڵەمدەدەن. لەڕاستیدا زانستی بوون بەگوێرەی رەوشی کێشەکە تاکە ئامرازی راستەقینەی دۆزینەوەی چارەسەرییە. بەتایبەتیش کاتێك کێشە هاوشێوەکان لەسەرتاسەری جیهان چارەسەر دەکرێت، هەرگیز ناتوانرێ تاوانی نەگەیشتن بەچارەسەری بخرێتە ئەستۆی رێچکەی زانستیانە. ئەم رەوشەش تەنیا ئەوە دەسەلمێنێ کە ئەم رێچکەیە بەشێوەیەکی لێهاتووانە و دروست و بەئامانجی چارەسەری بەکارنەهێنراوە. هەروەکو چۆن سەبارەت بە نەخۆشیەك کە ناسرابێت و چارەسەریەکەی دانرابێت ناتوانرێ بگوترێ " تیمار ناکرێ"، بەهەمان شێوە سەبارەت بەکێشەیەکی کۆمەڵایەتی پێگەیشتووش ناتوانرێ بگوترێ " چارەسەری نییە" لەرەوشێکی بەمجۆرەدا دەتوانرێ باس لە پزیشکی ناشارەزا و بێ توانا بکرێت، دەتوانرێ باس لەناتەواوی و لاوازی ئەو دەرمان و رێچکەیان بکرێت کە پەیڕەویان کردووە. هەربۆیە سووربوون لەسەر رێچکەی زانستیانە، تاکە رێگای راستی چارەسەرییە.

پراکتیکی ئەو نزیکبوونە سۆسیالیستی و نەتەوەپەرستیانەی بانگەشەی زانستی بوون دەکەن تاوەکو رۆژگاری ئەمڕۆشمان ئەنجامێکی سەرکەوتووانەی لێنەکەوتۆتەوە. تەنانەت زێدەتر رۆڵیان نیگەتیفە. هەروەها ئەمەش لەبەرچاوانە کە ئەو توێژانەی خاوەنی هەڵوێست و نزیکبوونەوەی فەرمی و بەکرێگیراوێتین، لەمیانەی ئەو ئەنجامانەی رێگایان لەپێش کردۆتەوە، بەرپرسیاری ئەوەن کە چیان بەدەست هێناوە و چ زیانێکیان ناوەتەوە. هیچ توێژێك لەرەوشێکی وەهادا نییە، لەتەواوی وڵات و ئاستی ناوچەکەشدا سەبارەت بەکێشەکە باس لە رەوشی پۆزەتیڤی بکات. لەگەڵ کێشەکانی دیکە: کێشەی کورد فاکتەری سەرەکی

ئەوەیە کە لەئاستی هەرێمیدا ئەو وڵاتانەی پێیەوە گرێدراوە، لەنێو قەیراندا بن. ئەمەش بەواتای ئیفلاسبوونی بەڕێوەبەرایەتییە سیاسیەکانە.

لەمیانەی ئەو قەیرانانەی وڵاتە پەیوەندیدارەکان تێی کەوتوون ئەوە روون دەبێتەوە کە لەجیاتی چارەسەرکردنی مەسەلەکان، بەبنەماگرتنی سیاسەتێك کە چارەسەری لەسەرکوتکردن و شاردنەوە و لەناوبردن یاخود پووچکردنی دا دەبینێت، چۆن گران دەکەوێت، ناتوانرێ باس لەڕەوشێك بکرێت کە باشتر ئەمە روون بکاتەوە. راستینەی قەیرانی رۆژهەڵاتی ناوینیش لەنزیکەوە گرێدراوی ئەم هێزە سیاسییەیە. دیسان ئەگەر باس لە بڵاوبوونی شارستانییەتی ئەوروپا بکرێت، هۆکاری سەرەکی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، بەشێوەیەکی زانستیانە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ کێشە و گرفتەکانی خۆیان کرد و تاوەکو دوایی رێگاکانی چارەسەری دیموکراسییانەیان تاقیکردەوە.

PKK کە لەمیانەی باوەڕی سۆسیالیزمی زانستیانە هەڵوێستی سەبارەت بەدیاردەی کورد نیشانداوە، سەرباری ئەوەی پێشکەوتنی بەبایەخی هێناوەتە ئاراوە، بەڵام پراکتیکەکەی بەچارەسەری نەگەیشتووە، هەربۆیە رووبەڕووی ئەوەبۆتەوە کە بەشێوەیەکی ناچاری بەنێو رەخنەدانێکدا تێپەڕ بێت. زۆر باش دەرك بەوە کراوە کە بەتەنیا باوەڕیەکی دڵسۆزانە و ئاستێکی بەرزی گرێدان بەسۆسیالیزمی زانستی، تێر ناکات و بەپێی پێویست زانستی بوون بەدی ناهێنێت. لەراستیدا خودی زانستی بوون لەجیاتی باوەڕی، گومان کردنێکی واتادار بەبناخە دەگرێت.

لەبەرئەوەی هەر لەسەرەتاوە بوون بەخاوەنی باوەڕی گومانی زانستیانەی بەلاوەناوە، ئەم رەوشە ئاسانکاری لەپێش کەوتنە نێو دۆگماتیزم کردووە. هەر باوەڕیەکی گەیشتبێتە ئاستی دۆگماتیزم، تەنانەت ئەگەر بناخەیەکی زانستیشی هەبێ، ئاشکرایە کە دەبێتە پەردەیەك لەپێش بینینی راستی. تەنانەت ئەو کەسایەتیانەی لەناو کۆمەڵگایەکی دەرەبەگایەتی پێشنەکەوتوو هاتوون و بەپەروەردەیەکی ئاسایی زانست دا تێپەڕ نەبوون، تاوەکو دوایی دەبێتە ئاسانکاری بۆ کەوتنە نێو مەیلی سۆزداری و دۆگماتیانە. کولتووری زاڵی کەسایەتی وەکو زەمینەیەك دەبێتە گرنگترین ئاستەنگ لەپێش نزیکبوونەوەیەکی زانستیانە.

کاتێك چەواشەکاری و زانیاری ناتەواو لەگەڵ ئەم زەمینە دەبنەیەك، رەوشێك دێنێتە ئاراوە کە لەخۆخەڵەتاندن دەچێت. ئەو فیداکاریەی دەکرێت و بوێریەی نیشان دەدرێت چەندە مەزنیش بێت، ئەوا لەئەنجامدا ئەو کەسایەتیە بەوە دەگەیەنێ بەخراپترین شێوە لەلایەن هەندێکی دیکە بەکاربهێنرێن و ببن بەئامراز. ئەوە بەچڕی لەنێو راستینەی PKK شدا روویداوە. ئەم رەوشە ئەوە دەکات بەپێویستییەك کە تەواوی هەڵوێست و رێچکە ئایدیۆلۆژی، سیاسی، رێکخراوەیی و کرداریەکان چاوی پێدا بخشێنرێ، لەمیانەی رەخنەدانەوە لایەنە نەرێنیەکانی بەلاوە بنرێت و پۆزەتیڤەکان زاڵ بکرێن.

ئەمەش ئەوە دەکات بەناچاریەك PKK پەند و وانە لەئەزموونی رابردووی قەیرانی سەرتاسەری سۆسیالیزمی بونیادنراو و قەیرانی شارستانییەتی هاوچەرخی سەرمایەداری دەربخات، سەرلەنوێ لێکۆڵینەوە سەبارەت بەپراکتیکی خۆی بکات و ئەنجامی لێ بەدەست بێنێ، ئەو هەنگاوانەی لەم بوارەوە لەکۆنگرەی حەوتەمی ئاوارتە هاوێشتوویەتی، ئەوا لەکۆنگرەی هەشتەمی ئاساییدا تەواو و پتەوی دەکات و دەیکات بەهەنگاوێکی ژیانی. ئەمەش ئەوە دەسەپێنی کە باش بزانرێ سەرەکیترین رێگای ئەمەیە کە ئەگەر و ئەنجامی سیاسی چارسەری رێچکەی زانستی بەدەست بهێنرێت و لەم چوارچێوەیەدا هەڵوێست نیشان بدرێت و سەربخرێت.

لەبەرگی یەکەمی بەرگرینامەکەمدا شیکردنەوەم سەبارەت بەمێژوو و چاخ و ناوچەکە کرد، ئەمە وەکو چوارچێوەیەکی بنچینەیی پەسند دەکەین و لەبەشەکانی دیکەدا هەوڵ دەدەین لەنزیکەوە تێروانین سەبارەت بەدیاردە و کێشەی کورد نیشان بدەین. ئەمەش بەواتای ئەوە دێت کە ئەو شیکردنەوە تیۆریەی پێی گەیشتووم سەبارەت بەگرنگترین کێشەی پراکتیکی تاقی بکرێتەوە. لەهەندێ زاراوەی سەرەکییەوە دەست پێدەکەین، هەوڵدەدەم لەئاستی جیهان، ناوچەکە و تورکیا لەسەربنەمایەکی زانستی سەبارەت بەواقیعی ترین و ئەگەری چارسەریەکی سیاسی بەئەنجامێك بگەم.

### أ. پێناسەکردنی هەندێ زاراوەی سەرەکی

١ ـ کۆمەڵگا: کۆمەڵگا گوزارشت لەوە دەکات کە مرۆڤ لەسەربنەمای داهێنانی ئامراز و بەئامانجی هەنگاونان بەرەو ئامانجێکی هاوبەش بە هۆشمەندی لەگەڵ هاورەگەزەکانی خۆی یەکیان گرتووە و لەوجۆرە ئاژەڵە جیا بۆتەوە کە زۆر لێی نزیکە. ئەوەی لەم پێناسەدا جێگای بایەخە، کارکردن بەئامرازەکان، بەهۆشمەندییەوە لەچوارچێوەی ئامانجێکی هاوبەشدا لەگەڵ هاورەگەزەکانی خۆی ئەنجامی بدات. هەروەکو چۆن مرۆڤ بەتەنیا نابێتە کۆمەڵگا، ئەوا بەبێ ئامرازیش بەکۆمەڵگابوون بەدی نایەت. هەروەها هاتنە لای یەکتر و کۆبوونەوەیان، بۆ ئەوەی درێژە بەژیانی ماددی خۆیان بدەن، بەدەست هێنانی بەرهەمی هاوبەش و ئاسایش دەکات بەپێویستییەك، ئەمەش وشیاریەکی هاوبەش دەکات بەناچارییەك. لەم چوارچێوەیەدا، لەبنەماڵەی تیرەیەکی بەرایی کە ژمارەکەی ١٥ تا ٢٥ کەسی تێپەرنەدەکرد، لەوێشەوە تاکۆمەڵگای رۆژگاری ئەمڕۆمان هاتووە. وەکو پێویستییەکی پێناسەکردنی، لەرۆژگاری دەرکەوتنی تا رۆژگاری ئەمڕۆمان کۆمەڵگا بەپێکهاتەی مەزندا تێپەڕیوە و بالابوونی خۆی

سەلماندووە. گەوهەری ئەم پێناسەیە ئەوەیە، هەروەکو چۆن جیهانی ئاژەڵ و گیاو ماددە بێ گیانەکان هەیە، ئەوا بەئەندازەی ئەوەش هەبووی جیهانی کۆمەڵگای مرۆڤ ڕاستینەیەکە. کەواتە مرۆڤ بەبێ کۆمەڵگا نابێت. هەروەکو چۆن جیهانی ئاژەڵ و گیا و ماددە بێ گیانەکان ڕاستینەیەکە، خودی کۆمەڵگاش بەلانی کەم هێندەی ئەوان یاخود وەکو ئەوان ڕاستینەیە. ناتوانرێ نکوڵی لەم ڕاستینەیە بکرێت. نکوڵی کردن لەمە، هەروەکو ئەوە وایە بانگەشەی ئەوە بکرێت کە سروشت بوونی نییە، دانەوێڵە و مەڕ و ماڵات ڕاستی نین

ئەگەر تەماشای ئاسەوارناسی یاخود مێژووی تۆمارکراو بکەین. بەشێوەیەکی بەرجەستەش قەوارە و هەبوونی ڕۆژگاری ئەمڕۆیان، ئەوا دەبینن کە ئەو دیاردەی بەکورد ناودەبرێت ڕاستینەیەکی کۆمەڵگایە و ناتوانرێ نکوڵی لێبکرێت. هەرچەندە بانگەشەی ئەوە بکرێت کە خاوەن دەوڵەتێك نین، بەتەواوەتی نەبووە بەنەتەوە و تەنانەت بانگەشەی لەناوبردنیان بکرێت، بەلانی کەم ئەگەر لەکوردان پرس بکرێت، لەوەڵامدا دەڵێن، بەملیۆنان کورد لەجوگرافیایەکی دیاریکراو دا چڕبوونەتەوە؛ ئەگەر شێوە زمانی جیاوازیشیان هەبێت، ئەوا وەکو کۆمەڵگاکانی دیکە بەیەك زمان قسە دەکەن؛ ئەگەر لەئاستێکی بەرزدا نەبووبن بەکۆمەڵگا و دەوڵەتێکی نەتەوەیی، بەڵام بەهەزاران ساڵە وەکو جڤاکی بەهێزی خێڵەکی دەژین، لەچەندین گوند و شاردا نیشتەجێ بوونە و بەرخودانیان کردووە و چەوسێنراونەتەوە و ستەمیان لێکراوە، تاوەکو ئێستاکەش سوورن لەسەر درێژەدان بەهەبوونی خۆیان و تەنانەت هەرگیز ئومێدی خۆیان بۆ ژیانێکی ئازاد نەبڕیوە. هەر حاڵ لەتەواوی ئەم ڕاستیانە زیاتر، بەڵگەی ئاشکراتر نادۆزینەوە. هەڵوێستێکی پێچەوانە، لەوە بەولاوە واتایەکی دیکەی نابێت، کە هەروەکو دادگاکانی ئەنگیزاسیۆنی چەرخەکانی ناوین لەمیانەی زەبر بەسەر گالیلۆدا بسەپێنێ کە زەوی ناسوڕێت. لەڕەوشێکی بەمجۆرەدا کاتێك کێشەی کورد تاوتوێ دەکرێت، بەرلەهەمەوو شتێك دەبێ دان بەوە دابنرێت کە کوردان خاوەنی ڕاستینەی کۆمەڵگایەکی تایبەت بەخۆیانن. ڕەوشی بێ دەوڵەتی، نەبوون بەنەتەوە، لەئاستێکی بەرزدا ڕووبەڕووبوونەوەی تواندنەوە، بێ بەشی لەیەکێتی، هیچ لەم ڕاستینەیە ناگۆڕێت. تەنانەت ئەگەر تاوەکو ئێستاکەش کۆمەڵە و جڤاکی کوێستانەکان و کۆچەری قۆناخی نیۆلیتیکی دەهەزار ساڵ پێش ئێستاش بن، تەنیا ئەمە بەسە بۆ ئەوەی کوردان وەکو کۆمەڵگا هەڵسەنگێنرێن. ئەم ڕاستینەیەش نکوڵی لە دیاردەی کۆمەڵگای کورد ناکات، بەڵکو تەنیا ئەوە دەسەلمێنێ کە لە نێو کێشەی زۆر سەختدا دەژیت. نکوڵی لێکردن یاخود چەواشەکردن و نیشاندانی بەجۆرێکی دیکە، تەنیا دەشی لەمیانەی شێوازەکانی ئەنگیزاسیۆنی چەرخەکانی ناوین ئەنجام بدرێت. ئەو شێواز و ڕێچکەیەی تەنانەت لەچەرخەکانی ناوینیش سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا، ئەوا زۆر بەسانایی دەتوانین بانگەشە بکەین و بسەلمێنین کە ئەوە لەولاوە بمێنێت کە بەرامبەر بەڕاستینەی کۆمەڵگای زانیاری و تەکنۆلۆژیای گەیاندن سەرکەوتن

بەدەست ناهێنێ، ئەوا ناتوانێ خۆی لەوە ڕزگار بکات کە لەلایەن یاسای نێودەوڵەتی بەتاوانبار دانەنرێت و دادگایی نەکرێت.

۲ ـ **خێڵ، خێڵایەتی، ئەتنیك**؛ قەوارەی کۆمەڵگا دوای ئەوەی لە ۹۸٪ی تەمەنی خۆی بەشێوەی ئەو تیرە بەراییانە بەسەر برد کە بیست ـ سی کەسی تێپەڕ نەدەکرد، لەساڵانی ۱۲۰۰۰ پ.ز لەگەڵ پەڕینەوە بۆ ئەو کۆمەڵگایەی پشت بەچاندنی دانەوێڵە و ماڵیکردنی ئاژەڵ دەبەستێ، قۆناخی مەزن بوونی ژمارە و ژیانی نیشتەجێ دەستی پێکردووە. لەمیانەی ئەم هەلومەرجە ماددیانە توانراوە لەبنەماڵەی تیرە سەرەتاییەکان (قلان) بەرەو کۆمەڵگای تیرە هەنگاو بهاوێژرێ کە پشت بەچەند بنەماڵەیەك دەبەستێت. ئەو کۆمەڵگایەی بۆ یەکەمین جار لەمێژوودا لەحەوزی سەرووی دیجلە و فورات ناواکرا کە بەمیزۆپۆتامیای سەروو ناو دەبرێت، لەساڵانی ۶۰۰۰ پ. ز بەدواوە بەرەو ئەتنیك، واتە **کۆمەڵگای خێڵ** هەنگاوی هاوێشتووە کە لەچەند تیرەیەکی مەزن پێکهاتووە. بێگومان بەدەزگابوونی کۆمەڵگای کشتوکاڵی نیشتەجێ ڕۆڵێکی دیاریکراوی لەمەدا بینیوە. لەدیاردەی خێڵەوە گەیشتن بەوشیاریەکی پێشکەوتووی خێڵایەتی تەنیا ئەو کاتە تەشەنە دەکات کە هێزە پەلامار دەرەکانی دەرەوە بێنە ئاراوە یاخود بەپێچەوانەوە لەپاراستنەوە بۆ پەلهاوێشتن و هێرش کردن هەنگاو بهاوێژرێ. لە نزیکەی ۳۰۰۰ پ.ز تاوەکو ڕۆژگاری ئەمڕۆمان، ئەم قۆناخە بەپێی شوێن و کاتی خۆی زیاد و کەمی کردووە و بەردەوام بووە. دیاردەی خێڵ فۆرمێکی کۆمەڵگایە، لەتەواوی جیهاندا هەبووە. هەر کۆمەڵگایەك پێشبکەوێت کەم زۆر بەم فۆرمەدا تێپەڕ دەبێت. دەشێ کۆچەر یان جێ نشین بێت. لە دیاردەی خێڵایەتیدا قەوارەیەکی سیاسی لەئاستی دەوڵەت ئاوا ناکرێت؛ ئاستی هەرە بەرزی بەڕێوەبەرایەتی **کۆنفیدراسیۆنی** نێوان خێڵەکانە. خێڵ گوزارشت لەو کۆمەڵگا سیاسیەی بەر لەدەوڵەت دەکات. سەرەتا دایکسالاری بوون، دواتر لەگەڵ زیادبوونی کاریگەریەکانی شارستانییەت بەرەو باوکسالاری چوون. بەدەوڵەتبوون لەهەمناوی خێڵدا، جیاوازی چینایەتی دێنێتە ئاراوە. لەئەنجامی جیابوونەوەی چینایەتی پەیوەندیەکانی خێڵایەتی هەڵدەوەشێتەوە، جێگای خۆی بۆ پەیوەندی بەڕێوەبەر و بەڕێوەبراوان بەجێ دێڵێ کە ڕێکخراوترە. لێرەدا لەجیاتی پەیوەندیەکانی خوێن و خزمایەتی، پەیوەندیە بیروکراسیە سیاسیەکان زاڵ دەبێت.

کاتێك فۆرمی خێڵەکی کۆمەڵگا هەڵدەوەشێتەوە و دەکەوێتە ڕیزی دووەم، ئەوا دیاردەی قەوم و میللەت وەکو فۆرمی نوێی کۆمەڵگا واتادار دەبێت. لەڕاستیدا بەتەواوەتی عەشیرەت هەڵنەوەشاوەتەوە، بەڵام گۆڕانکاری بەسەرداهاتووە و چەندین خێڵی نوێ لەسەربنەمای هەمان بناخەی کولتووری هاتوونەتە ئاراوە. هەم لەلایەنی ستوونی، هەم لایەنی ئاسۆیی مەزن بووە. چینەکان لەناواخنی دا دەرکەوتوون و دەوڵەت سەپێنراوە. جڤات و کۆمەڵەی خێڵە بەرفراوانەکان کە لەژێر سایەی ئەم ڕاستیانەدا نوێنەرایەتی کولتوور و زمانێکی لێکچوو

دەکەن، کەم زۆر لەجوگرافیایەکی جێگیردا دەژین و ناوەناوە لەمیانەی ئەو دەزگا سیاسیانەی داگیرکەرەکانی دەرەوە پێکیان هێناوە و کۆبوونەتەوە، بەقەوم یاخود میللەت ناو دەبرێت. لەکاتێکدا فۆرمی زاڵی قۆناخی شارستانییەتی کۆیلەداری خێڵی سامی بوون، بەلانی کەم ئەوانەی دووچاری جیاوازی چینایەتی نەهاتبوون بەمجۆرە بوون، ئەوا فۆرمی زاڵی کۆمەڵگای چاخی ناوین قەوم یاخود میللەتە. لەکاتێکدا توێژی سەرووی ئەو خێڵانەی دووچاری جیابوونەوەی چینایەتی هاتوون دەبنە بنەماڵە و خانەدانە بەڕێوەبەرەکان، توێژی ژێر دەبن بەو زەحمەتکێشانەی هەژارن و کراون بەکۆیلە. بەمجۆرە جێگرتن (المنسوبية) لەهەمان خێڵدا گرنگی خۆی لەدەست دەدات؛ جێگرتن لەهەمان چیندا بایەخدار دەبێت.

بەهێزترین فۆرمی دیاردەی کورد فۆرمی خێڵە و تاکو ئێستاکەش بەردەوامە.

نزیکەی دەهەزار ساڵ بەرلەئێستا کوردان لەبنارەکان و هێڵی ناوەوە و دەرەوەی زنجیرە چیای زاگرۆس ـ تۆرۆسدا، بەشێوەی کۆمەڵگای نیۆلیتیک فۆرمی خێڵایەتیان بەخۆیانەوە بینیوە. لەلێکۆڵینەوە مێژووییەکاندا دەردەکەوێ کە لە ٦٠٠٠ پ.ز کوردان بەئاستی خێڵی وشیارتر گەیشتوون. بەدەزگابوونی کۆمەڵگای نیۆلیتیک رۆڵێکی بەکلاکەرەوە لەوەدا دەبینێ. لەسالانی ٣٠٠٠ پ.ز بەولاوە بەهۆی پێشکەوتنی کۆلۆنیگەرایی سۆمەر، تێپەڕی رەوشێکی بەرخودانی گشتی بوون. بەرخودان و دژە هێرش، زوو وشیاری و هاوکارییەکی بەهێزی خێڵەکی دێنێتە ئاراوە. دواتر کاتێك هێرش و پەلامارە بەردەوامەکانی هێزە دەرەکییەکان لەگەڵ جوگرافیا لەبارەکەیدا بوو بەیەك، رێگای لەپێش ئەوە کردەوە ببن بەکۆمەڵگای خێڵەکی شاخی. بەردەوامی ئەم جۆرە پەلامار و هێرشانە تاوەکو رۆژگاری ئەمرۆمان، هێندە دەرفەتی ئەوە نادات دیاردەی کۆمەڵگای کورد بەوەرچەرخاندا تێپەڕ بێت و پاراستنی خۆیان وەکو کۆمەڵەی بچووکی بەرگری کردووە بەکێشەیەکی سەرەکی. ئەم رەوشە، لەچاخی ناویتیشدا رێگا لەپێش ئەوە دەکاتەوە کوردان وەکو قەوم و میللەت ببنە خاوەن فۆرمێك کە لەلایەنی سیاسیەوە لاوازە و هێندە پێشکەوتوو نییە؛ ئەمەش بەردەوام رێگا لەوە دەگرێت ببن بەکۆمەڵگایەکی پێشکەوتوو و هێزێکی سیاسی. هەروەها سەپاندنی ئایدیۆلۆژیای ئایینی لەدەرەوە، پەرەسەندنی بواری ئەخلاقی و رۆحی ئاستەنگ دەکات. هەروەکو بڵێی کۆمەڵگا بەیەکەوە لەنێو دوو دیاردە دەژیت: کۆمەڵی فەرمی و بالادەست کە لەدەرەوە هاتووە، هاوکاری بەڕێوەبەران و توێژەکانی سەرووی خێڵ دەکات، لەگەڵ ئەو توێژە نافەرمی (غیر رسمي) یەی کە زۆرینەی خێڵ پێکدێنێت و نوێنەرایەتی زەحمەتکێشان دەکات. کێشەی کوردیش لەسەر ئەم بنەمایە هاتۆتە ئاراوە و تاوەکو رۆژگاری ئەمرۆمان قووڵ بۆتەوە و بەردەوام بووە. تاوەکو ئێستا بەهێزی و کاریگەری تایبەتمەندێتییە خێڵەکییەکان و کۆسپ ئانەوەی لەپێش بوون بەکۆمەڵگایەکی هاوچەرخ، هۆکارێکی مێژوویی و سیاسی بەهێزی

بەمجۆرەی هەیە. تاوەکو ئێستاکەش لەسەر بنەمای فۆرمی خێڵەکی هەبوونی وەکو قەوم، میللەت و گەل، دیسان لەنزیکەوە گرێدراوی ئەم ڕاستینە سیاسی و مێژووییە.

**٣ ـ نەتەوە و دەوڵەتی نەتەوەیی:** گوزارشت لەوەرچەرخان و بەدەوڵەتبوونی ئەو قەوم و خێڵە لێکچووانە دەکات کە لە دەوروبەری ئەو بازارە ناوخۆییە بەجموجۆڵن کە زیاتر شێوەی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری خولقاندووییەتی، وەکو ناسنامەیەکی بالاّ فۆرمی نەتەوەیی وەرگرتووە. بازاڕی هاوبەش لەزمان و کولتووره هەرێمیەکانەوە ڕێگا لەپێش فۆرمەکانی زمانێکی هاوبەش و کولتووری نەتەوەیی دەکاتەوە. بەمجۆرە لەگەڵ یەکێتی ئابووری و یەکێتی کولتووری و زمان، لەو مۆنارشییەتەی جاران کە لەسەربنەمای بنەماڵێتی بوو و بەرژەوەندییەکانی ئەرستۆکراتە دەرەبەگەکانی دەکرد بەیەك بەرەو شێوازێکی نوێی بەڕێوەبەرایەتی سیاسی هەنگاو دەهاوێژرێ کە بە کۆماری ناو دەبرێت و یەکێتی سیاسیانەی تەواوی توێژەکانی گەلە کە لەژێر ڕێبەرایەتی بۆرژوازی بوونەتەیەك.

زێدەتر شێوازی سیاسەتی سەرمایەداری بەسەر کۆماردا زاڵە، لەئەنجامی هێزی بازاڕی نەتەوەیی پەیوەندییەکانی خێڵ و قەوم بۆ پەیوەندی نەتەوەیی دەگۆڕێت. دەوڵەتی نەتەوەیی بەشێوەیەکی بەپلان و وشیاری، هەندێ جاریش لەمیانەی فشار و ناچارکردن، ئەم قۆناخە خێراتر دەکات. نەتەوە و بەڕێوەبەرایەتی کۆمار کە گوزارشتە سیاسیەکەی نەتەوەییە، بەمجۆرە هاتنە ئاراوە، کە فۆرمی سەرەکی ئەم سەردەمەمانە. زیادبوونی جیهانگیری و بەتایبەتیش پێکهاتنی هێزەکانی بازاڕی نێو نەتەوەیی (نێو دەوڵەتی) کە پێشکەوتنە زانستی ـــ تەکنۆلۆژیەکان کردوویانە بەناچاریەك، بازاڕ و دەوڵەتی نەتەوەیی خستۆتە نێو ڕەوشێك کە بێن بەکۆسپ. هەربۆیە نەتەوە و دەوڵەتی نەتەوەیی کەوتوونەتە ڕەوشێك ڕۆڵێکی هاوشێوەی ڕۆڵی موحافەزەکاری بنەماڵە دەرەبەگەکانی دوێنێ دەبینێ؛ یەکینە سیاسی و یاسایی و ئابووری یە نێو (نەتەوەیی) دەوڵەتیەکان دێنە ئاراوە کە پێ بەپێ بایەخدار دەبن. لەئاستی هەرێمیدا پێکهاتە ئابووری و سیاسیەکان بایەخدار دەبن. کۆمەڵگای نێودەوڵەتی لەقۆناخی هەرە بەهێزی مێژووی خۆیدایە.

بەرامبەر بە پێشکەوتنی نەتەوە و دەوڵەتی نەتەوەیی، دیاردەی کۆمەڵگای کورد زێدەتر لەنێو هەلومەرجەکانی چەرخەکانی ناویندا دەژی. بەهۆی پەیوەندییە بەهێزەکانی خێڵایەتی و پەیوەندییە بەکرێگیراویەکانی چینی ژوور، نەتوانیویەتی بازاڕێکی نەتەوەیی پێك بهێنێت، نەبەرەو دەوڵەتێکی نەتەوەیی ئاراستە بگرێت. ژینگەی ستراتیژی کوردستانیش ڕۆڵێکی نیگەتیف لەوەدا دەبینێ. دەوڵەتە دەسەڵاتدارەکانیش دەرفەت بەوە نادەن بازاڕێکی ناوخۆ و پەیوەندی سیاسی نەتەوەیی پێشکەوتوو بەرە بسێنێ. هەربۆیە شانبەشانی کێشەی قورسی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسیەوە هەنگاو بۆ نێو هەلومەرجەکانی کۆمەڵگای نوژەن دەهاوێژرێ. دەرفەت بەوە نادرێت زمان و کولتووری نەتەوەیی لەرێگای ئامرازی هاوچەرخەوە

پێشبکەوێت. لەکاتێکدا کۆمەڵەکانی نەتەوەی سەردەست لەسایەی دەوڵەت هەموو جۆرە جیاکاری و تواناکاریە ماددی و مەعنەویەکان بۆ پێشخستنی زمان و کولتووریان ئامادە دەکرێت، ئەوەی دەبێتە بەشی زمانی کوردی قەدەخەکردن و حاشالێکردنە. هەمان شت بۆ کارە نەتەوەیی و ئابووریەکان و پەیوەندی سیاسی ئازادانە و دەزگاکانی جێگای باسە، ئەوە لەولاوە بمێنێت کە دەرفەت بەدەزگابوونی ئابووریەك نادات کە لەسەربنەمای سەرچاوەکان و بەرژەوەندیەکانی کۆمەڵگا بێت و ناهێڵێ دەزگابوونێکی سیاسی و فکری بەدیبێت کە ئازادی بیروڕا بەبنەما دەگرێت، تەنانەت دەبێتە هۆکاری سزادانێکی ئێجگار دژوار. قەدەخەنامەی هاوشێوە بەسەر ناسنامە کولتووریەکان دەسەپێنرێت و دەرفەتی ئازادییان پێنادرێت. لەم لایەنەوە نکوڵیکردن و قەدەخەکردن و توانەوەییەکی زۆرەملێیی جێگای باسە کە چەرخەکانی ناوینیش تێپەڕکردووە. ئەم سەپاندنانەی لەگەڵ ئاراستەی سەردەمدا ناکۆکە، رۆڵێکی یەکلاکەرەوەی هەیە لەوەی دیاردە و کێشەی کورد تا ئەم رادەیە قورس بێت.

ئەم راستینە هاوچەرخەی دیاردەی کورد تێیدا دەژی ئەو کۆسپ و ناستەمیانە دەخاتەڕوو کە دەکەوێتە پێش ئەوەی لەسەربنەمای نەتەوایەتی بگات بەنەتەوە و دەوڵەتێکی هاوشێوە. لەلایەکی دیکەشەوە نەتەوە و دەوڵەتی نەتەوەیی وەکو تاکە رێگای هاوچەرخ بایەخی خۆی لەدەست داوە و زیاتر ئەوەی گرنگی پەیدا کردووە و وەکو شێوەیەکی دەوڵەت و سیاسەت و کۆمەڵگا دەرکەوتۆتە پێش دیموکراسییە، ئەمەش ئەوە نیشان دەدات رێگا چارەی دیموکراسییانە گونجاوتر دەبێت و بەبێ ئەوەی دەوڵەتێکی نەتەوەیی جیاواز ناوا بکەین پەیڕەو دەکرێت، ئەوا وەکو کۆمەڵەی نەتەوەیەکی ئازاد ژیان لەناو دەوڵەتێکی دیموکراسییانە، گونجاوترە و دەوڵەمەندێتی یە. چەندین دەوڵەتی نەتەوەیی رابردوو بەرەو یەکێتیە فیدراڵیەکان هەنگاو دەهاوێژن و پەرە دەسەنن. گەوهەری فیدراڵی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە وەکو بەهێزترین دەوڵەتی جیهانە، ئاراستە گرتنی تەواوی ئەورووپاش بەرەو فیدراڵیزمی یەکێتی ئەورووپا. ئەم رەوشە سەبارەت بەکێشەی کوردیش دەرفەت بەکوردان دەدات لەسەربنەمای یەکێتی دیموکراسییانە لەگەڵ ئەو دەوڵەتانە بەرەو چارەسەری بچن کە کوردی تێدا دەژی. لەرێگای ئامرازەکانی سیاسەتی دیموکراتییانە کە لەسەربنەمای پرۆژەیەکی بەرفراوانی کۆمەڵگای مەدەنی پێکدێت، بەبێ ئەوەی رێگا بەپێشینە بڕیار بدەن و پەتابیەنە بەر ئەگەرەکانی شێوازی توندوتیژی، دەتوانن لەرێگای شێوازە ئاشتیخوازەکان بەرەو چارەسەری بڕۆن. ئەم رێگایەی بەبێ کەوتنە نێو جوداخوازی و توندوتیژی نەتەوە پەرستی پێشدەکەوێت و زیاتر دەرفەت بەوە دەدات کە تەواوی کۆمەڵە ئەتنیکیەکان هەبوونی کولتووری خۆیان بپارێزن و بەئازادانە بژین، ئیتر پێ بەپێ دەبێتە ئەو چارەسەریەی جیهان بەبنەمای دەگرێت.

٤ ـ چارەسەری سیاسی و سەربازی؛ بەدرێژایی مێژوو دەبینرێ کە ئەو کۆمەڵگایانەی کەوتونەتە نێو گێروگرفتەوە، هەوڵیانداوە لەمیانەی ئاراستە کردنی توندوتیژی بەرەو دەرەوە یان ناوەوە ئەم گێروگرفتانە چارەسەر بکەن. بەتایبەتیش ئەو دەوڵەتانەی پشت بەکۆمەڵگای چینایەتی دەبەستێ، ئەوەیان کردووە بەشێوازێکی کلاسیکی کە هەر شتێکی پێویستیان پێی بێت لەمیانەی هێزی توندوتیژی، واتە بەپشت بەستن بەسوپای سەربازی بەدەستی بێنن، لەم پێناوەشدا ناوە و دۆزینەوەی بیانووشیان وەکو ئەرکێکی دیبلۆماسی دیاریکردووە. لەو قۆناخانەی کە زێدە بایی سنووردارە و نایەکسانیەکی بێ هاوتای هاوسەنگییە سەربازیەکان لەئارادابوو، ئەوەی لەکۆتاییدا سیستەمی جیهانی دیار دەکرد، ئەو دەوڵەتەیە کە هێزی سەربازی لەهەمووان زیاترە. هێندەی ئەم دەوڵەتە سەرکەوتوو بێت دەتوانێ بەمانای ئیمپراتۆریەتێکی جیهانی بگات، کاتێك سەرکەوتوو نەبێت دەرووخێ، ئەم دەوڵەتەی لەشوێنی ئاوا دەگرێت، هەمان رۆڵ بۆخۆی دیاری دەکات. تاوەکو ناوەڕاستی سەدەی بیستەمیش ئەمە یەکێك بووە لەرێسا سەرەکیەکانی جیهان. کاتێك هاوسەنگی ناوکی سامناك ئاوابوو، هەروەها شۆڕشە زانستی ـ تەکنەلۆژیەکان شێوازە سەربازیەکانی بێ ئەنجام کرد، ئەوکاتە نیشاندان و پێشخستنی هەڵوێستی سیاسی سەبارەت بەکێشەکان بووە پێویستییەك. ئەنەگەری شەڕێکی جیهانی شیمانە بۆ کراودا، هیچ واتایەکی بۆ سەرکەوتوو و ژێر کەوتوو نابێت. لەرەوشێکی بەمجۆرەدا گرانی خستنە سەر شێواز و رێچکە سیاسیەکان دەکات بەرێسایەکی سەردەم. بێگومان بە بەها وەستان و بێ بەرهەمی رێگا سەربازیەکان رۆڵێکی سەرەکی لەمەدا دەبینێ. هەربۆیە چارەسەرکردنی کێشەکانی کۆمەڵگا بەگوێرەی پێوانەکانی دیموکراسی شێواز و رێچکەی سەرەکییە. لەبەرئەوەی بەبێ گۆڕینی سنوورەکان دەرفەت و تواناکاری چارەسەری هەموو جۆرە کێشەیەکی کولتووری، ئاینی و ئەتنیکی لەخۆوە دەگرێت، هەربۆیە وا دەکات ئەم جۆرە پراکتیك و کردارانە پەیرەو بکرێن.

پەرسەندنێکی بەمجۆرەی سەردەم سەبارەت بەدیاردە و کێشەی کورد، رەوشێکی لەبار دەخوڵقێنێ. بەبێ پێویستی بینین بەو توندوتیژیەی لەدەرەوە دەسەپێنرێ یاخود بەخۆی پێشی دەخات، لەمیانەی رێککەوتن لەسەر رێسا سەرەکیەکانی دیموکراسییەت و بەدیهێنانی چارەسەری لەرێگای دیالۆگەوە، تواناکاریەکی نوێ و راستەقینە دەئافرێنێ. کاتێك ئەوە لەبەرچاوان بێت کە رێگای سەربازی زیانی لێکەوتۆتەوە و وونکردنی هەردوولای لەگەڵ خۆیدا هێناوە، ناشێ بەرەو چارەسەریەك هەنگاو نەهاوێژن کە لەئەنجامدا هەمووﻻیەنەکان سوودمەند دەبن. تەنیا لەمیانەی چەمکێکی فاشیستی نکوڵی و قڕکردن دەشێ رێگای سەربازی پیادە بکرێت، ئەو هێزەی پەنا بباتە بەر ئەم رێگایە لەسەرتاسەری جیهان لەریسوابوون و لاتەریك بوون رزگاری نابێت. لەچەندین نموونەی جیهاندا ئەوە نیشان دەدات کە بۆ ماوەیەکی درێژ شانسی شێوازەکانی نکوڵیکردن و فاشیستی نەماوە.

دەرخستنی کێشەی کورد لەنێو چوارچێوەی شێوازی سەربازی و گواستنەوەی بۆ پلاتفۆرمێکی سیاسی دیموکراسییانە، ئەرکێکی بایەخدارە. هەروەکو چۆن پراکتیکێکی بەرفراوانی کۆمەڵگای مەدەنی پێشینە بڕیارەکانی نەتەوەپەرستی تێك دەشکێنێ و ئەو کۆسپە سایکۆلۆژیانە تێپەڕ دەکات کە پاشماوەی رابردوون، ئەوا لەپێناو چارەسەری هەمووجۆرە زەمینە و خوڵقکاریەکی لێبوردن و بەیەکەوە ژیانی دیموکراسییانە هانددەدات؛ کێشەکە لەو رەوشە دەردەخات کە بەساڵان لەنێو تابۆیەکی جوداخوازی دابوو، هەروەها وەکو پێویستییەکی یاسای هاوولاتییەتی هاوچەرخ، ئەوە دەسەلمێنێ کە بەهێزترین یەکێتی وڵات و دەوڵەت بەپراکتیزەکردنی پێودانگە دیموکراسیەکان تێپەڕ دەبێت. هاوچەرخی شێوازی سیاسەتی دیموکراتیيانە ئەم دەرفەتە دەدات، هەربۆیە رۆژبەدوای رۆژ تواناکاریەکانی سەرکەوتن زیاتر دەبێت؛ هەرچی ریسواکردن و لاتەریککردنی دژبەرەکانیشە بەهەمان خێرایی پێشدەکەوێت و بەپاکتاوکردنیان ئەنجامگیر دەبێ.

**٥ ـ شێوازی یاسایی و دیموکراتییانە:** سەرکەوتنی دیموکراسی لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستەم دیاردەیەکە ناتوانرێ حاشای لێبکرێت. سەرباری هەمموو کەموکوڕی و سنووردار کردنەکانی، دیموکراسی لەسەرووی ئەم مۆدێلە سیاسیانەوە دێن کە بەڕادەی هەرە زێدە کەناڵە سیاسیەکانی بۆ گەل کردۆتەوە. هەرچەندە لەلایەن هێزە باڵادەست و چەوسێنەرە باوەکان بەلای خۆیاندا بشکێنرێتەوە، بەلام دیسان پێوانە دیموکراسیەکان گونجاوترین رێگایە بۆ هەنگاونان بەرەو زەمینەی کۆمەڵگایەکی ئازادی و یەکسان. هەربۆیە ئەگەر رێسای دیموکراسییانە هەبێت لەو چوارچێوەیەدا داواکاریەکانی خۆیان فۆرمیلە بکەن، ئەگەر نەبێت، ئەوا تێکۆشان لەپێناو دیموکراسی ئەرکێکی ژیانی تەواوی ئەو ناوەندو توێژانەیە کە پێویستیان بەدیموکراسی هەیە. تاوەکو ئەم ئەرکانە جێبەجێ نەکرێن، ئەوا ناستەمە داواکاریەکانی ئازادانەی خۆیان بەدەست بێنن، چەندە دیموکراسی پێشبخرێت و بکرێت بەسیستەم و وەکو کولتوورێکی ژیان پێشبخرێت کە ببێ ئەو ژیان نابێت، ئەوا چارەسەرکردنی تەواوی کێشەکانی ئەم وڵات یان دەوڵەتە و هەنگاونانی بەرەو پێشکەوتن، مەحاڵ نییە، بەڵکو دەبێت بەرێسایەك.

دیاردەیەکی دیکە کە لەگەڵ ئەمەدا یەکە و لێی جیانابێتەوە، باڵابوون و پەیڕەوکردنی سیستەمی یاسای گەردوونییە. دیموکراسی و یاسا، بەواتای هاوچەرخ یەکێك بەبێ ئەوەی دیکە نابێت. ئەمانە دوو دەزگای سەرەکین کە یەکتری بەخێو دەکەن و هەموو جۆرە کێشە و گیرگرفتێکی کۆمەڵگا چارەسەر دەکەن. دیموکراسی، مافەکانی بواری سیاسییە. کاتێك مافە سەرەکیەکانی مرۆڤ دەخرێتە سەر ئەمە، پێوانەکانی دەوڵەتی حقوقی دیموکراسییانەی هاوچەرخ دێتە ئاراوە. زۆر جیاوازی لەنێوان ئەوەدا هەیە کە ماف ( حقوق) لەبناخەی دەوڵەتدا جێگیر بکرێت یان مافی دەوڵەت هەبێت. ئەگەر دەوڵەت ماف بەبنەما بگرێت، دەبێتە

دەوڵەتی ماف. بەپێچەوانەوە ئەگەر دەوڵەت بەتەنیا ماف (حقوق) بخولقێنێ، ئەمە دەبێتە مافی دەوڵەت. ئەگەر سەرچاوەی ماف تەنیا لەلایەن دەوڵەتەوە نەبێت، کولتوور و نەریتی ئەو گەلە بەبنەما بگرێت کە تێیدا پێکدێت، هەروەها پشتبەستنی بەپێوانەکانی مافی گەردوونی و رێز گرتنی لەرێساکانی یاسای رابردوو، رێگا لەپێش دەوڵەتێکی راستەقینەی ماف دەکاتەوە، لەنێو رژێمێکی دیموکراسی و دەوڵەتێکی گرێدراوی مافدارییەکی وەهابێت، چارەسەرکردنی هەموو جۆرە کێشەکانی کۆمەڵگا و داواکارییەکان لەنێو ئاشتی و دادوەریدا دەبێتە رێسایەکی بنەرەتی، چارەسەری مافی دیموکراسییانە (الحقوق الدیموقراطیة) گەرەنتی بەهەر کەس و توێژێك دەدات، رۆڵێکی سەرەکی لەپێشکەوتنی کۆمەڵگا دەبینێ.

هەرچەندە دەوڵەتی مافی دیموکراسییانە لەنێو کۆمەڵگاکانی رۆژهەڵاتی ناویندا لەئارادا نەبێت، بەڵام لەبەرئەوەی پێشکەوتنە هاوچەرخەکان بەو ئاقارە براوە، ئەوا وەکو ناچارییەك ئەم وڵاتانەش بەرەو ئەم ئاراستەیە دەبات. بێ بەبێ کێشەی کوردیش لەم چوارچێوەیەدا لەنێو پێوانەکانی یاسای دیموکراسییانەدا شێوازێکی چارەسەری دەکاتە ناچارییەك. لەجیاتی پەنابردنە بەر ئەو رێگایانەی جوداخوازی و توندوتیژی لەخۆوە دەگرێت، لەمیانەی شێواز و رێچکەکانی سیاسەتی دیموکراسییانە (حقوق) بەگوێرەی رەوشی بەرجەستە خۆی رێك دەخات، لەهەرسێ رەهەندەکانی مافە سەرەکییەکانی مرۆڤ تاوەکو دەگاتە مافی بەرگری رەوا بە شێوەیەکی وشیار و رێکخراو بەکاردێنێ و دەتوانێ سەرکەوتنی زیاتر بەدەست بێنێ. بەرادەی هەرە زیندە کوردان لەژێر سایەی دەوڵەتی مافی دیموکراسییانە سیاسەت و مافداری دەکەنە موڵکی خۆیان و دەتوانن مافەکانی کۆمەڵگا بەدەست بێنن، لەوە رزگاریان دەبێت بەردەوام ببن بەقوربانی لاسەنگییە بێ بەزەییانەکەی سەدان ساڵەی هێز و بێ ویژدانی سەردەم. هەربۆیە ئەرکی سەرەکی ئەوەیە لەهەموو کاتێك زیاتر بەگوێرەی شێوازی مافی دیموکراسییانە خەبات بکرێت و بە سەربخرێت.

٦ ـ **هاوولاتییەتی و نەتەوایەتی:** زاراوەی هاوولاتییەتی، گوزارشت لەو پەیوەندییە دەکات کە لەگەڵ دەوڵەت هەیە. بەواتای ئەندامێتی دەوڵەت دێت. ئەمە زاراوەیەکی سیاسی یە. هیچ جۆرە بەهایەکی ئەتنیکی و نەتەوایەتی لەخۆوە ناگرێت. هەرچی نەتەوایەتییە جێگرتن و ئەندامێتی نەتەوەیەکی دیاریکراو لەخۆوە دەگرێت. لەخۆوەگرتنی پەیوەندییە نەتەوەییەکان کە فۆرمێکی کۆمەڵایەتی بەبڕیارە و مێژوو و زمان و کولتووری هاوبەشی هەیە، بەواتای ئەوە نایەت کە بەهەمان شێوە پەیوەندی سیاسیش لەخۆوە دەگرێت. دەشێ سەربەهەمان نەتەوە بێت، بەڵام ناچارییەکی بەمجۆرە نییە کە هاوولاتی هەمان دەوڵەت بێت. ئەندامێتی دەوڵەت، وەکو ناچارییەك ئەندامێتی لەهەمان نەتەوە ناهێنێتە ئاراوە. ئەمە تەنیا لەئەنجامی چەمکێکی فاشیستی و سەرەڕۆیی رەها دەسەپێنرێ.

کاتێك لەدیاردەی کۆمەڵگای کورددا، تاك دەبێتە هاوولاتی ئەو دەوڵەتەی لەچوارچێوەی سنوورەکەیدا دەژیت، نابێ بەئەندامی ئەو نەتەوەیەی لەو دەوڵەتەدا سەردەستە. دەتوانن بەجیا ناسنامەی میللی و نەتەوەیی خۆیان دیاری بکەن و بەمجۆرە بژین. بەڵام کاتێك پەیوەندییەکی نیشتمانی پەسند دەکەن کە لەفەوارەی ئەو وڵاتەی تێیدا دەژین بەواتای ناسنامەی ژوور دێت، ئەمە لەگەڵ بنەچەی میللی خۆیان ناکۆك نییە. بۆ نموونە هەروەکو چۆن کاتێك دەگووترێ " لەگەڵ ئێرانم، بەڵام لەهەمان کاتدا کوردم" لەگەڵ یەکدا ناکۆك نییە. بەڵکو گوزارشت لەناسنامەیەکی سەرتاپاگیر دەکات ئەمە بۆ ئێراق و تورکیاش بەهەمان شێوەیە. کاتێك شانبەشانی گووتەی " ئەندامی گەلی تورکیا یاخود نەتەوەی تورکیام " بگوترێ "کوردم" ئەوا واقیعی ترە و لەناسنامەیەکی ژووردا گوزارشت لەیەکێتی دەکات. تێکەڵنەکردنی ناسنامەی ئەتنیکی و ناسنامەی (نیشتمانی) و رەچاوکردنی ئەوەی هەریەکە و واتایەکی تایبەتی خۆی هەیە و لەگەڵ یەکتردا ناکۆك نین، ئەمە زیاتر خزمەت بەژیانێکی هاوبەش و ئازاد دەکات.

٧ ـ **کۆمەڵگای مەدەنی و کۆمەڵگای فەرمی و باو:** زاراوەی کۆمەڵگای فەرمی گوزارشت لەو دەستە و کۆبوونەوەی ئەو مرۆڤانە دەکات کە لەچواردەورە و بەگوێرەی دەوڵەت و دەزگاکانی پێکهاتووە. لەبەرزترین ئاستی بەرپرسیارێتی تا دەگاتە باخەوان، لەکارکەرەکانەوە تا زەحمەتکێشان، تەواوی ئەو توێژانەی کۆمەڵگا کە لەگەوهەردا گرێدراوی فەرمان و رێساکانی دەوڵەتن، هەر هەموویان دەکەونە نێو چوارچێوەی کۆمەڵگای فەرمی. لێرەدا هێزی فەرمانبەرێتی زاڵە. دەوڵەت بەهەموو شتێك دادەنێن. لەدەرەوەی ئەمە هیچ جۆرە پێشکەوتنێکی وردیان نییە. لەکاتێکدا لەچەرخە سەرەتاییەکان کۆیلەی دەوڵەت بوو، لەهەلومەرجە هاوچەرخەکاندا خاوەنی ئازادیەکی سنووردارە. بەڵام لەبەرئەوەی خۆیان لەگەڵ دەوڵەت هاوتا دەبینن، ئەوا خۆیان لەسەرووی توێژەکانی دیکەی کۆمەڵگا دەبینن. لەبەرئەوەی ژیانیان گەرەنتی کراوە، تادوارادە رێسا پەیرەو دەکەن و لەخولقکاری بێبەشن.

کۆمەڵگای باو (تقلیدی) هەموو ئەو ئەندامانەی کۆمەڵگای کۆن دەگرێتەوە کە لەدەرەوەی دەوڵەت ماونەتەوە. راستتر، گوزارشت لەکۆمەڵگای رێکنەخراو و بڵاوە دەکات. ئەم جۆرە کۆمەڵگایانە لەنێو هێزێکی تێکەڵاوەی هێزی کۆیلایەتی و دەرەبەگایەتی و هێزی خۆرسکی دا دەژین، لەدەزگاکانی دیموکراسی هاوچەرخ و رێکخراوەکانی ماف مرۆڤ بێبەشن. ژیانێکی بەگوێرەی فەرموودەکانی هەزاران ساڵی پێش ئێستای ئایین و دەوڵەت و ملکەچکردن بۆ ئەو خۆبەدەستەوەدانەی بەقەدەر ناودەبرێت، بۆ خۆیان بەفەزیلەت دادەنێن. ئەم هێز و فێربوونانە ئەوە نیشاندەدات کە لەنێو کۆیلایەتییەکی قووڵدا دەژین.

لەسەرەتادا کۆمەڵگای مەدەنی گوزارشت لە کۆمەڵگای بۆرژوازی دەکات کە لەدەرەوەی دەوڵەتی دەرەبەگایەتی ئازادانە پێشکەوت. بەڵام دواتر کاتێك بۆرژوازی بووە کۆمەڵگای رەسمی

دەوڵەت. چوارچێوەکەی گۆڕاوە. لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا تەواوی ئەو توێژانەی کۆمەڵگا دەگرێتەوە کە لەدەرەوەی دەوڵەت. بەڵام بەمەرجی گرێدان بەرێساکانی ماف (حقوق)، سەرباری ئەمەش، خاوەنی هزرێکی ئازاد و پرۆگرامێکی بەرجەستەی کۆمەڵگان. پێ بەپێ لەدەرەوەی کۆمەڵگای فەرمی و باو پێشدەکەوێت و دەبێت بەشێوەی کۆمەڵگایەك کە ڕۆڵی دیاریکراوی هەبێت. لە گەوهەری خۆیدا سەرچاوەی خۆی لەو بۆشاییە دەگرێت کە ئەو کۆمەڵگا باو و فەرمیانە دەخوڵقێنن کە بێچارەن و دوورن لەداهێنان و دەبێتە سیستەمێکی بەهاداری چارەسەری بۆ کۆمەڵەکانی کۆمەڵگا.

٨ ـــ وڵاتپارێزی و نەتەوەناسیۆنالیزم: ئەوەی بەردەوام بەدرێژایی مێژوو گۆڕاوە و پێشکەوتووە ئەو پەیوەندییەی نێوان هەردوو زاراوەی وڵاتپارێزی و نەتەوەناسیۆنالیزمە. ئەو پارچە جوگرافیایەی کۆمەڵگا بەهەمیشەیی تێیدا نیشتەجێیە و سەرخان و ژێرخانی کۆمەڵگا لەگەڵ یەکتردا دەکەونە پەیوەندی بەنیشتمان (وڵات) ناو دەبرێت. هەرچی نەتەوەناسیۆنالیزمە ئاستی ئەو پەیوەندییەیە کە لەگەڵ کۆمەڵە و جڤاتی وڵاتێکی دیکەدا پێشدەخرێت. لەسەردەمی کولتووری نیۆلیتیکەوە کەیەکەمین کۆمەڵگای جێ نشینە، ئەم زاراوانە واتاداربوون. وڵات چەندە پێویستە ئەوا پەیوەندی نێوان دوو وڵاتیش هێندە پێویستە. لەڕەوشێکی پێچەوانەدا پێشکەوتنی مێژوویی بەدینەدەهات. هەندێ جار سنووری دەسەڵاتی سیاسی و نیشتمان تێکەڵ بەیەکتر دەکرێ. هەروەها وەها هەڵوێستە. دەکرێت کە مەرجە تاکە زمان و نەتەوەیەك لەناو نیشتمانێکدا (وڵات) بژین. تەنانەت ئەگەر وڵاتی بەمجۆرە هەشبێت، نابێ بکرێت بەگشتی. هەروەکو چۆن چەندین زمان و گەل دەتوانن لەسەر خاکی وڵاتێکدا بژین، ئەوا دەشێ تاکە زمان و نەتەوەیەك لەچەند وڵاتێکدا بژین. بۆ نموونە چەندین نەتەوە و زمان لەوڵاتی ڕوسیا دەژین. وەك تاکە نەتەوەیەکیش، تورکەکان لەچەندین وڵاتدا دەژین.

سەبارەت بەکوردان، کێشەکە دوولایەنی هەیە. هەرچەندە پارچە کرابن و سنوور بۆ زمانەکەشیان دابنرێت، لەگەڵ ئەوەی لەلایەنی مێژووییەوە وڵاتێکیان هەیە، ئەوا ئەو وڵاتانەی لەژێرناوی کوردان لەنێو سنووری سیاسی دەوڵەتەکەیدا دەژیت، وڵاتی فەرمیانە. چەمکی وڵاتی هاوبەش پێشدەکەوێت. لەسەرتاسەری جیهانیش پێشکەوتن بەو ئاراستەیە دایە. هەروەکو خێڵایەتی تەسکی ڕابردوو گرێدانێکی ئەوپەرگەری بەسنوورەکان بەرامبەر بەپێشکەوتنی تەکنۆلۆژیا بێ واتا بووە. دابەشکردنی جیهان وەکو وڵاتێکی هاوبەش، مەیلێکە پێبەپێ پێشدەکەوێت. ڕێزگرتن لەهەبوونە کولتوورییەکانی وڵاتەکان، بەڵام دابەشکردنی لەگەڵ خەڵکانی دیکەدا، تایبەتمەندێتییەکی گرنگی چەرخەکەمانە کە پێشدەکەوێت. هەربۆیە لەهەموو قۆناخێك زیاتر وڵاتپارێزی و نەتەوەناسیۆنالیزم بەناویەکداچوون. ئەدەبیاتی یەك بست خاکی وەتەن، کە زیاتر لەسەدەی نۆزدەهەمدا کراوە بەپرەنسیپێکی وشکی میلیگەرایی، لەهەلومەرجەکانی ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا لەخزمەت کردنی وڵات زیاتر زیانی پێدەگەیەنێ.

هەروەکو چۆن موڵکایەتی زەوی سنوورەکانی میرنشینی دەرەبەگایەتی بەرامبەر بەنەتەوەبوون بەواتای پاشڤەڕۆیەتی دەهات، ئەوا چەمکی تەسکی نەتەوەپەرستی سەبارەت بەوڵاتیش بەرامبەر بەنەنتەرناسیۆنالیزم گوزارشت لە پاشڤەڕۆیەتی دەکات. ئیتر نیشتمان پەروەری هاوچەرخ گرێدراو بەئاستی رەفاهیەت و دەوڵەمەندێتی وڵات واتادار دەبێت. نیشتمان پەروەری هاوچەرخ بەواتای ئەوە دێت کە وڵات دەوڵەمەند بکرێت و لەبواری ماددی و مەعنەویدا دەرفەتی ژیانی تێدا پێشبخرێت و مرۆڤایەتی تێدا هاوبەش بێت. ناوچە هەرە دەوڵەمەندەکانی جیهان، وڵاتانی وەکو ئەمریکا و یەکێتی ئەورووپا کە لەجیهاندا هەرە پێشکەوتوون لەمیانەی ئەم چەمکەوە تەواوی مرۆڤایەتی راکێش دەکات. هەروەکو چۆن کەس بایەخ بەو وڵاتانە نادات کە تیرەکانی زۆڵۆ تێیدا باڵادەستن، هەروەها مانەوەیان وەکو هەژارترین ناوچەی جیهان گرێدراوی پاشڤەڕۆیەتی وڵاتپارێزییە لەلایان، تێکۆشانێکی هاوچەرخی وڵاتپارێزی لەوەدایە کە هەوڵ و کۆششێکی هاوبەش بدرێت بۆ ئەوەی هەم لەبواری ماددی و هەم لەبواری مەعنەوی ئەو وڵات و ناوچەیەی تێیدا دەژین بکرێت بەوڵاتێکی هاوبەشی دەوڵەمەند و خۆشگوزەران.

نەك لەپێناوی نەتەوەپەرستیەکی ساختە، بەڵکو تێکۆشانێك کە لەرێچکەی چالاکی و یەکێتی هاوبەش بێت و لەپێناو وڵاتی هاوبەشی گەلان بێت و ئازادی و یەکسانی بەبنەما بگیردرێت، بەواتای وڵاتپارێزی راستەقینە دێت.

لەو دەوڵەتانەی کوردی تێدایە، تێکۆشانێکی جێگیری وڵاتپارێزی، بەتێکۆشانێکی هاوبەش لەگەڵ ئەو گروپە کولتووری و گەلانە تێپەڕ دەبێت کە لەنێو سنووری تەواوی وڵاتدا بەرژەوەندییەکانیان لەیەکتر دەچن و لەنێو یەکێتییەکی بەرفراوان بەرێوە دەچێت کە ئازادی و یەکسانی بەبنەما دەگرن. بەکارهێنانی گەلان دژ بەیەکتری لەرێگای پێشینە بڕیارەکانی نەتەوەپەرستیەوە بەدرێژایی مێژوو سیاسەتی تەواوی سێزە دەسەڵاتدار و داگیرکاری و بەکرێگیراوەکان بووە. لەکاتێکدا چەرخەکەمان بەسەردەمێکدا تێپەڕ دەبێت کە هێندەی بڵێی زانست و تەکنۆلۆژیا پێشکەوتووە، ئەوا وڵاتپارێزی و نەنتەرناسیۆنالیزمیشی پێشخستووە. هێندەی جیهانگیری دەسەڵاتداران، ئەوا جیهانگیری رەنجدەران و چەوساوەکانیش بەو ئەندازەیە پێویستە و راستیەکە، کە برایانەیە و بەواتای راستەقینەی خۆی گەیشتووە.

ئەوەی بەڕادەیەکی زیاتر لەدیاردەی کۆمەڵگای کورد زاڵە مۆدێلی باو و کلاسیکیە. لەهەزاران ساڵ بەرلەئێستا بەشێوەی یەکینەی خێڵەکی لەنێو نەریتێکی باو و کلاسیکی داخراودا ژیاون. جگە لە توێژێکی سەروو کە هاوکاری کۆمەڵگای فەرمی و دەسەڵاتدار دەکات، هەروەکو بڵێی کۆمەڵگای کوردەواری لەتەواوی چاخەکان بەدەرنراوە، مەحکومی دەرکەوتن لەرۆژگار کراوە. دووچاری هزرێك هاتووە کە بێچارەیە و قەدەر هەموو شتێك دیاری دەکات. تادواڕادە لەپێکهاتەیەکی رۆحی و هزری بەمجۆرە بێ بەشە کە لێپرسینەوە بکات و بەدوای

چارەسەریدا بگەڕێت. فشاری توندو تیژی و پڕوپاگەندەی ئایینی سەدان ساڵە فێری ئەوەی کردوون کە بەهۆی قەدەر تەنانەت سوپاس و ملکەچی مەرگی بێ واتا و ناڕەوا بن. ئەم ڕەوشەش بەپێچەوانەوە هەندێ جار تەقینەوەی دژوار و یاخیبوون لەهەناوی خۆی دەگرێت و دەخوڵقێنێت. بەهۆی ئەو هەلومەرجە ناوخۆیی و دەرەکیانەی تێیدا دژی نە دەتوانێ کۆمەڵگای فەرمی خۆی بخوڵقێنێ، نەدەتوانێ بەبەرفراوانی تەقلی کومەڵگای فەرمی دەسەڵاتدار بێت. سوارەی حەمیدی و یەکینەی گوند پارێزان (جاشەکان) کە لەڕابردو و ڕۆژگاری ئەمڕۆمان ناواکران تەنیا دەتوانرێ وەکو کۆمەڵگای فەرمی دەسەڵاتدار هەڵسەنگێنرێت.

بەهۆی فاکتەرە زانستی ــ تەکنۆلۆژییەکانی لەهەلومەرجی هاوچەرخدا بەخێرایی پەرتەوازەبوونی کۆمەڵگای باو ڕێگا لەپێش قەیرانێکی قورسی کۆمەڵگا دەکاتەوە. کۆمەڵگای باوی قەیراناوی لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا لەنێو داڕووخانێکی گران و هەڵوەشانەوە و پەرتەوازەبووندا دەژیت. ڕێکخراوە شۆڕشگێڕیەکان و یاخیبوون کە لەڕەوشێکی بەمجۆرە کەوتنە گەڕ، بەهۆی لاسەنگی لەڕادەبەدەری هێز و بێبەشی لەدۆستی ستراتیژی، نەیانتوانیوە سەربکەون و چارەسەریەك بۆ بێچارەیی بدۆزنەوە. هەربۆیە کۆمەڵی مەدەنی سەبارەت بەکوردان بووە بەهێزێکی گرنگی چارەسەری کۆمەڵگا کە پێویستە تاقی بکرێتەوە. لەجیاتی کۆمەڵی باو و فەرمی و یاخیبوون کە قەیران قووڵدەکەنەوە، گرێدراو بەپرۆگرام و پرۆژەیەکی بەرفراوان و خشتەکاری کۆمەڵگایەکی مەدەنی کە بەگوێرەی ئەرکە بەرفراوانەکانی دەکەوێتە پێشی ژمارەیەکی زۆر چالاکی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی پێشدەخات، دەبێتە شێوەیەکی بڵندی کۆمەڵگای چارەسەری. ئەو ژمارە زۆرەی ئۆرگانەکانی کۆمەڵی مەدەنی کە لەگۆڕەپانەکانی ئابووری، کۆمەڵایەتی، کولتووری، سیاسی، ژینگە، مافداری، وەرزشی، هونەری و مێژوویی پێشدەخرێت دەتوانێ کۆمەڵگای کوردەواری بنبەستبوو بکات بەکۆمەڵگایەکی دیموکراتی هاوچەرخ.

ب ـ هەندێ هەڵوێست سەبارەت بەدیاردەی کورد و کێشەکانی شێواز

بەبێ ئەوەی ڕاستینەکەی ڕوشن بکرێتەوە تەنیا کێشەی کورد تاوتوێ بکرێت، هەڵوێستێکە هەرلەسەرەتاوە لەنێو هەڵەدایە. دەرککردن بەکێشەکە و پێناسەکردنی کۆڵەکە سەرەکیەکانی و شیکردنەوەی تادەگاتە ئەگەرە تیۆریەکان و دووبارە ڕەچاوکردنی شیکردنەوەکان و ئەنجامەکانی تایبەت بەم گۆڕەپانە، پێویستییەکی ڕێبازی زانستی یە. بەبێ ئەوەی بەزاراوەی ڕاست بگەین، ئەوا لەمیانەی ئەگەرەکان یاخود دۆگما ئایدیۆلۆژییە گشتییەکان هەڵوێستە سەبارەت ئەم بابەتە بکرێت، ئەوا ڕێگا لەپێش گەلێك ئەنجام دەکاتەوە کە لەگەڵ زانستدا ناکۆکە. تەنیا سنووردار بوون بەزاراوەی ڕاستیش لەپێناسەیەکی پارچە پارچەی دیاردەکە

بەولاوە ئەنجامێکی دیکەی نابێت. شتی خراپتریش ئەوەیە ئەمانە هەڵوێستێکن لایەنی دۆگماتییانەی قورسە و لەپێشە.لەنکوڵیکردن لەدیاردەکەوە تادەگاتە هەڵوێستی هەرە قەبەی شێواندن و چەواشەکردن، بەرپرسیاری راستەقینەمن بەرامبەر بەو ئەنجامە خراپانەی لەبواری کرداریدا رووبەرووومان دەبنەوە. کاتێك لەم چوارچێوەیەدا لەنزیکەوە تەماشای مەسەلەکە بکەین؛

١ ـ هەڵوێستی ئایدیۆلۆژی: سەبارەت بەراستینەی کورد (راستینەو دیاردە هەمان واتایان هەیە و پێناسەیەکی زانستی بەبنەما دەگرێت) بێگومان مرۆڤێك نییە بەبێ ئایدیۆلۆژیا بێت. هەموو کەسێك ناچارە سەبارەت بە جیهان و تەواوی ئەو بوونەوەرانەی تێیدا دەژین خاوەن هەڵوێستێکی ئایدیۆلۆژی بێت. کاتێك باس لەهەڵوێستی ئایدیۆلۆژی دەکەین مەبەستمان تەماشاکردنە لەچوار گۆشەوە، لەتێڕوانینی ئایدیۆلۆژی تاوەکو ئایین و فەلسەفە و زانست. سەبارەت بەتاکەکانی چەرخەکانی یەکەمین شرۆڤەکردنی مەسەلەکان لەسەربنەمای ئەفسانە و ئەفسانەناسییە. ئەوانەی بەشێوەیەکی باش شارەزاییان سەبارەت بەئەفسانە و ئەفسانەناسین هەیە، ئەوان ئەو کەس و دەسەڵاتانەن کە لەخەڵکی تر زیاتر و باشتر دەتوانن شرۆڤە بکەن. هەڵوێستی لەمە پێشکەوتووتر هەڵوێستی (لاهوتیەت) خوداناسی یە کە بەشێوەیەکی تێکەڵاو ئەنجامدەدرێت. لێرەدا هەوڵ دەدرێت هەموو شتێك بەگوێرەی تێڕوانینی ئایین و زانستی خوداناسی روون بکرێتەوە. بێگومان ئەم دوو هەڵوێستەش ئەنجامی دوور لەواقیع لەگەڵ خۆیاندا دێنن. بەلام دیسان ئەم شێوازەی راڤەکردن شێوازێکی دەست لێبەرنەدراوی شرۆڤە کردنی هزری مرۆڤەکانی بەرابیە. لەو گۆڕەپانانەی شارستانییەت کە تەسکبوونی هزری تێدا دەژی و هێشتا فەلسەفە و زانست پێشنەکەوتووە، ئەوا ئەفسانە و ئایین بۆ ماوەیەکی درێژخایەن وەکو شێوازێکی روون کردنەوە بەردەوام دەبێت. تاوەکو رۆژگاری ئەمڕۆشمان بەتەواوی کاریگەرییەکانی ئەمجۆرە روونکردنەوە بەلاوە نەنراوە.

هەڵوێستی فەلسەفی زیاتر نزیکی ئەوەیە دیاردەکە لەمیانەی تایبەتمەندییەکانی خۆیەوە روون بکاتەوە. ناتوانرێ دیاردەکان لەرێگای چیرۆك و خوداوەندەکان روون بکرێتەوە، بەڵکو هەوڵ دەدرێ دیاردەکان بەگوێرەی هۆکار و چۆنیەتی و ئەنجامەکانی روون بکرێتەوە. ئەم هەڵوێستە لەسەردەمی شارستانییەتی کۆیلەداری رۆماو ئەتینای کلاسیك لەمنارادا بوو کە پراکتیکی کۆمەڵگا تێیدا پێشکەوت و شاری مەزنی تێدا ئاواکرا. هەنگاوێکی لەپێشتری ئەم هەڵوێستە دواشێوازی زانستی یە کە شارستانییەتی سەرمایەداری پشتی پێدەبەستێت و پێشیخست. ئەم هەڵوێستە زادەی ئەگەری فەلسەفی دارنراوە کە سەرباری ئەوەی کۆکبوونێکی گشتی دەرهەق نییە، لەمیانەی تاقیکردنەوە و تێبینی راستیەکەی دەسەلێندرێ و بەمجۆرە نزیکترین زانیاری لەراستی دەردەکەوێت و روون کردنەوەیەکی زانستی بەدی دێت. کاتێك لەرێگای ئەزموون و تێبینیەکانەوە شیمانە فەلسەفیە دارنراوەکان دەسەلێندرێن،

ڕوونکردنەوەی زانستی و نزیکترین زانیاری لەڕاستی دێتە ئاراوە. باسکردنی زانیاری رەها ( موتلەق) پێچەوانەی هەڵوێستی زانستی یە. ئەوە تێڕوانینێکی گشتی پەسندکراوە کە زانیاری کارەکتەرێکی ڕێژەیی هەیە، بەردەوام پێشدەکەوێت و هێزی واتا بەخشینی زیاد دەبێت، هەربۆیە زیاتر ڕێگا لەپێش گۆڕانکاری و پێشکەوتنی پراکتیکی و تەکنۆلۆژی دەکاتەوە. لەزانیاری نەگۆڕ زیاتر، باسکردنی ڕوونکردنەوە و زانیاری قووڵ و واقیعی ترە.

لەچوارچێوەی ئەم پێناسانە، تاج رادەیەك بەشی زانستی بوون لەنێو هەڵوێستە ئایدیۆلۆژیەکان زیاد بێت، ئەوا بەو ئەندازەیەش ئاستی زانیاری سەبارەت بەو دیاردەیە پێشدەکەوێت کە تاوتوێ دەکرێت. یەکێك تەنیا بەڕوونکردنەوەی ئایینی یاخود ئەفسانەیی (میتۆلۆژی) سنووردار بێت، تەنیا دەتوانێ هەوڵبدات لەمیانەی شرۆڤەی چیرۆك و نموونەکان لەژێر باری مەسەلەکە دەربکەوێت. هەرچی شیمانە و نەگەرە فەلسەفی و تیۆریەکانە، لەبەرئەوەی بەتەواوی بەواقیع و ڕەوشی بەرجەستە ناگات، لەوە ڕزگاری نابێت کە بخرێتە ناو دۆگماتیزم و دارنراوی و لەهەندێ زاراوە بەهەڵواسراوی بمێنێ. هەربۆیە تێڕوانینی زانستی و ئەزموون و ڕێنومایی ئایدیۆلۆژی لەسەربنەمای زانستی، بایەخێکی گرنگیان سەبارەت بە زانیاری دیاردەکەوە هەیە. پێناسەیەك کە لەلایەنی گشتییەوە پەسند بکرێت تەنیا ئەوکاتە بەدی دێت کە ئەنجامەکانی تێڕوانین و ئەزموون لەمیانەی هەڵوێستێکی تیۆری پاڵپشتی لێبکرێت. هەڵوێست و شرۆڤەکانی دەرەوەی ئەمە یان چیرۆك و باوەڕی ئایینی یە، یاخود لەتێبینی دارنراوی تیۆری بەولاوە واتایەکی دیکە نابەخشێت.

خاسیەتێکی زۆر جار بەرچاو دەکەوێ ئەوەیە کە بەگشتی لەمیانەی چوارچێوەیەکی ئایدیۆلۆژی لەزانست بێبەش هەڵوێست سەبارەت دیاردەی کورد دەکرێت و زیاتریش لایەنە نەرێنیەکانی بەبنەما دەگیردرێت. لەچەرخەکانی یەکەمین و ناوینیدا خوازراوە لەمیانەی چیرۆك و گێڕانەوە لەسەر زەمانی خوداوەندەکان هەڵسەنگاندن ئەنجام بدرێت. بەتایبەتیش سەبارەت بەم بابەتە فەرموودەی ساختەیان دروست کردووە و لەسەر زەمانی حەزرەتی محەمەد دەیگێڕنەوە کە بۆچی خوا نەیخواستوە کورد بەهێز بێت. هەروەها باسی بەمجۆرە هەیە کە چۆن لەپێغەمبەر نووح کەوتوونەتەوە. تەنانەت لەمیتۆلۆژیای گریك (یۆنان)یشدا وڵاتی (میدیا)یان لەکەسایەتی ژنێکدا (مادۆس) وەکو ڕەمزێکی ترسناك باس دەکرێت. لەبەرئەوەی لەو سەردەمەدا وەکو چۆن دەیخواست نەیاندەتوانی دەسەڵات و بەرژەوندیەکانیان لەسەر ئەو گەلانە و ئەم جوگرافیایە درێژە پێبدەن کە کوردان تێیدا دەژین، ئەوا پەنابردنیان بۆ ئەم شرۆڤە میتۆلۆژی و ئایینیانە وەکو شێوازێکی پڕوپاگەندە بەکاریگەر بوو.

مەحاڵە و ناتوانرێ لەمیانەی دەمامکە ئایدیۆلۆژیەکانی چەرخەکانی سەرەتا و ناوین دیاردەی کورد بەشێوەیەکی ڕاست پێناسە بکرێت. بەتایبەتیش لەبەرئەوەی ئەم گۆڕەپانە داگیرکاریەکی هەمەلایەن و فرەئامانجی بەخۆیەوە بینیوە، ئەوا ئاشکرایە کە بەرامبەر

بەگەلەکەشی رێگای لەپێش شێواز و گوزارەی نەگونجاو و شرۆڤەی میتۆلۆژی و ئایینی دەکردەوە. ئەم راستینەیەش هۆکاری سەرەکییە کە کوردان لەبواری میتۆلۆژی و ئایینییەوە بەپێی پێویست ناتوانن روونکردنەوە سەبارەت بەخۆیان بکەن. چەوسانەوە و داگیرکاری رووت، تادوا رادە پاراستنی ئایدیۆلۆژیشی ئاستەم کردووە. کوردان تاوتوێ کردنی خۆیان هەروەکو راستینە و چۆنیەتی خۆیان، وەکو دەرکەوتن لەدژی فەرمانە پیرۆزەکانی دەوڵەت و خوداوەند دەبینن، تاکەوتوونەتە نێو رەوشێکی نەوپەرگەری کوێرانە و داڕووخانەوە. نکوڵی کردن لەسەربنەمای ئەم زەمینە مێژووییە بەرز بۆتەوە.

یەکەمین خاوەنەکانی هەڵوێستی زانستی بەپشت بەستن بەشارستانییەتی ئەوروپا دەرکەوتن. وەکو ئەنجامێکی ئەو شەرە مەزنەی لەپێناو زانست پیادەکرا، زاناکان بوێریان بەدەست هێنا و تەنانەت لێکۆڵینەوەیان سەبارەت ئەو بابەتانەش کرد کە تابۆ بوون، ئیتر هەڵوێستێکی بەمجۆرە بەرامبەر بەکێشەی کوردیش بووە ناچاریەك کە بابەتێکی تابۆکراوە.

بێگومان بەرژەوەندییە سیاسیە هەرێمیەکان رۆڵێکی سەرەکییەکان لەمەدا بینیوە. لەبەرئەوەی رۆشن کردنەوەی دیاردەی کورد گەلێك بەرژەوەندی هەرێمی، نەتەوەیی و نێو نەتەوەیی پووچەڵ دەکاتەوە، بەرژەوەندیان لەوەدا بینیوە کە بەگۆڕەپانێکی قەدەخەکراو بهێڵرێتەوە و بەڕوونکردنەوەیەکی زانستی نەگات؛ خوازراوە لەڕێگای فشارەوە درێژە بەم بەرژەوەندییانە بدرێ. هەربۆیە لەمیانەی ئەو ترسەی لەهزردا دروست کراوە و بێبەشبوونی لەبەرژەوەندیەکانی، هەروەکو بڵێی مەسەلەی کورد بێ خاوەن هێڵراوەتەوە، یان نکوڵیکردنێکی قەبە ئەنجامدراوە، یاخود خوازراوە بەگوێرەی بەرژەوەندیەکانی خۆیان هەڵوێستی دۆگماتیکی (بەمجۆرە سەر بەنێمەن) زاڵ بکرێت. تاکو ئێستاش ناتوانرێ بگوترێ ئەم رەوشە کۆتایی پێهاتووە.

٢ ـ ئەو هەڵوێستە نیگەتیڤانەی هەڵوێستە ئایدیۆلۆژیەکانی بەسەردا زاڵە رێگا لەپێش دژی خۆی دەکاتەوە، هەڵوێستێکی بەمجۆرە نیشان دەدات کە لەهەر قۆناخێکدا مەسەلەیەکی کوردی چالاك هەیە. تەنانەت کوردایەتیەك ئایدیالیزە دەکرێت کە بەهێزە، بەرخودان دەکات و هێزی بەرەنگار بوونەوەی هەیە و سەرکەوتووە. ئەم تایبەتمەندیانەش سەبارەت بەهەڵوێستەکانی نەتەوەپەرستی زیاتر لەجێگای خۆیدایە. کاتێك فەلسەفەی کۆمەڵگایان میتافیزقیا بێت، ئەوا ئەمجۆرە هەڵوێستانە ئەو راستینەیە ئاڵۆزتر دەکات کە لە ئارادایە. راستینەیەك جێگای باسە هەروەکو بڵێی بەجارێك فەرمانی خوداوەند هاتۆتە ئاراوە. ئەم هەڵوێستەی لەگەڵ خۆیدا رێگا لەپێش چەندین هەڵە دەکاتەوە دەکەوێتە نێو ئایدیالیزم و لەمیانەی ئەنجامە کرداریەکانیشی رووخێنەرە. کاتێك شرۆڤەی جیاواز سەبارەت بەڕاستینەی دیاردەکە رەنگدانەوەی خۆی بکاتە سەر رێبازی چالاکی و سیاسەت ئەوا هەر یەکە دەبێت بەسەیر و سەمەرە یەك.

قەبەترین شێوە پێشکەوتنی سەبارەت بەکۆمەڵگاکان قۆناخەکانی پێشکەوتنیان پەیڕەو کردووە. ساویلکەیی و لەناکاو دەرکەوتن و کۆتایی هاتن، لەبنەمای هیچ کۆمەڵگایەکدا نییە. بەدەست هێنانی راستینەی کۆمەڵگاکان لەمیانەی پێشکەوتنێکی دیالەکتیکی لەهەلومەرجێکی بەرفراوانی شوێن و درێژخایەنی کاتدا، نیتر ئەگەرێك نییە بەڵکو ئەنجامێکی زانستی یە. مەسەلەی گرنگیش ئەوەیە لەمیانەی جیاکردنەوەی قۆناخەکان و هەلومەرجی شوێن و کاتی هەر کۆمەڵگایەك بەرفراوانترین زانیاری دەربارەی دیاردەکە بەدەست بهێنرێ و بەراوردی نێوان هەلومەرجی تایبەتی هەر قۆناخێك بکرێت. لەمیانەی ئەم رێگایە گەیشتن بەزانیاریەکی نزیك بەڕاستی سەبارەت بەهەر دیاردە و واقیعێکی کۆمەڵایەتی پێویستییەکی هەڵوێستی زانستی یە. هیچ دیاردەیەك یاخود بابەتێك لەئارادا نییە کە شیکردنەوە و پێناسەکردنی مەحاڵ بێت. لەم بارەیەوە پێویست ناکات داکۆکی لەسەر ئەو داهێنانە نوێ و پێڕەوانە بکرێت کە چەوت بوونیان سەلمێنراوە. تەنانەت هەوڵێکی سنوورداریش دەشێ هەڵوێستی مێژوویی دیالەکتیکی ڕاست بکات و دەرفەتی ئەوە بدات بەزانیاریەکی نزیك بەڕاستی بگەیت، تەنانەت لەمیانەی تیۆرانیش سنووردارییش بێت.

کاتێك لەم گۆشە نیگایەوە تەماشا بکەین ئەوا لەنێو رێڕەوی پێشکەوتنی گشتیدا باشتر لەگەوهەر و تایبەتمەندێتی دیاردەی کورد دەگەین. تاوەکو سەردەمی نیۆلیتیك گەلان لەیەکتر دەچن؛ هەروەکو دەزانرێ بەشێوەی ئەو گروپانەن کە ژمارەیان لەسەدان تێپەڕ ناکات، بەدوای نێچیرکردندا دەگەرێن و لەمیانەی کۆکردنەوەی بەروبووم گوزەران دەکەن. زمان و کولتوورەکانیان خاوەنی پێشکەوتنێکی سنووردارن، تازە بەتازە جیاوازی دەست پێدەکات. لەم قۆناخەدا ناشێ هیچ کۆمەڵەیەك لەئەوەی دیکە بالاتر ببینرێ. کۆمەڵگای نیۆلیتیك لەگەڵ سەردەمی بەرەبەیانی مێژوودا هاوتا و کۆکە. ئەو کۆمەڵگایەی نیۆلیتیکی پێکهێناوە رۆڵی لەدەست پێکردنی مێژوودا روون و ئاشکرایە. تەواوی شیکردنەوەکانی ئاسەوارناسی و زمانناسی هیچ گومانێکیان لەوەدا نەهێشتۆتەوە کە ئەم کۆمەڵگایە لەو ناوچەیە خوڵقێنراوە کە کوردان لێی نیشتەجێن. کەواتە گرنگترین تایبەتمەندێتی دەستنیشانکراو سەبارەت بەدیاردەی کورد ئەوەیە کە یەکێکە لەکۆنترین بوونەوەری کۆمەڵایەتی کە نیۆلیتیکی پێشخستووە و تاکو ئێستا دەژیت. ئەم تایبەتمەندێتیە دەست نیشانکراوە زۆر گرنگە. چونکە بەگوێرەی ئەوەی تایبەتمەندێتیەکانی کۆمەڵگای نیۆلیتیك دەزانرێ، ئەوا پێناسەکردنی باپیرەوداپیرەی کوردان کە خوڵقێنەری نیۆلیتیکن ئاسانتر و گرنگترە. بەپلەی یەکەم جێگرتنی لەنێو کۆنترین و خوڵقکارترین گەلان، رەسەنایەتیەکی گرنگە و ئەنجامەکەشی بووە بەبێشکەی مێژوو. تەواوی ئەو دراوانەی کە هەن ئەم راستییە پشت راست دەکەنەوە.

لەبەرئەوەی شوێنگەی هەر کۆمەڵگایەك لەرێگای شرۆڤەکانی سەردەمی کۆیلایەتی و دەرەبەگایەتی ئەنجام دەدرێت، ئەوا ئەمە لەمیانەی پێشکەوتنە نوێکاندا لەتایبەتمەندێتیەکانی

کوردانیش دیار دەبێت. چونکە جیابوونـەوەی چینایـەتی بـەگوێرەی خـۆی بەسیاسـیبوون و بەدەزگابوونی پێکهاتەکانی سەرخان و ژێرخان ڕۆڵی زیـاتر لـە پێشکەوتنی کۆمـەڵگادا دەبینـێ. ئەگـەر بەشـێوەیەکی سـنوورداریش بێـت بـەگوێرەی ئـەم سـەردەمە، وەکـو پێویسـتییەکی هەلومەرجەکان کورد لەمیانەی داهێنانەکانی خۆیدا پێگەیشت. مەسەلەی گرنگیش ئەوەیە کـە ئەم دیاردانە لەمیانەی تێڕوانینێکی تۆکمە و بەهێزدا لەهەلومەرجێکی ڕاستی کـات و شـوێندا دیار بکرێت و بەگوێرەی ئەم واقیعە ئەگەر و پێناسەکان پێشبخرێن.

ئەمـە ڕاستیەکی گشتی ڕەچاو کـراوە کـە سـەردەمی سـەرمایەداری کۆمـەڵگاکانی لەڕەوشـی گروپی خێڵەکی و قەوم دەرخست و لـەچوارچێوەی بـازاڕێکی نەتـەوەیی و زمـان و کولتوورێکـی هاوبەش گردنی بەنەتەوە. لـەچوارچێوەی ئـەم هەلومەرجانـەدا هـەر کۆمەڵگایـەکی لەئارادایـە دەتوانێت بیێ بەنەتەوە، یان لەگەڵ نموونەی جۆری خۆی یاخود لەگەڵ نموونـەی هەمـەجۆری نزیك لەخۆی دەبێتە یەك بەنەتەوەبوونی جیاواز دێتە ئاراوە. ئـەو کۆمـەڵانـە زۆر کـەمن کـە تەڤلی قۆناخی بەنەتەوە بوون نەبوون، ئەمەش لەئەنجامی ئەو کۆسپە بـەرچاوە ناچاریەکانـە. بێگومان پەیڕەوکردنی ئەم ڕاستیە گشتییە سەبارەت بەکوردانیش ناچارییەکە. لەمیانـەی ئـەم ڕاستەڕێیەوە سێ بژار لەپێش کوردان دایـە، کـوردان یـان بەنەتـەوەبوونێکی ساف بەخۆیانـەوە دەبینن، ئەگەر بەهۆی توندوتیژی سیاسی و سەربازی نەتەوە بوون لەو ڕێگایـە بـەدی نـەیـەت، ئەوا وەکو بژاری دووەم، بۆ پێکهاتنی نەتەوەیەکی هاوبەش وەکو ناسـنامەیەکی سەروو لەگـەڵ نەتـەوەی سەردەستی ئـەو دەوڵەتانـەی تێیدا دەژیـن دەبنـە زەمینـە. ئـەوەی زیـاتر ڕوودەدات ئەمەیانە. ئەگەر ئەم ڕێگایەش سەرکەوتوو نـەبێت، جگـە لـە توێـژی یـاخیبوو، ئـەوا لـەڕێگای تواندنەوەیـەکی زۆرەملـێ هـەموویان دووچـاری گـۆڕان دێـن و لـەنێو دەچـن. لەبەرئـەوەی بەگوێرەی پێویستییەکانی سەردەم ئەگەر و دەرفەتی ئەوە نییـە، ئـەوا بەهـەر شـێوەیەك بێـت دەبن بەدیاردەی نەتەوە.

هـەروەکو پێشـتر بینـرا، لەسـەرەتا نەتەوەیـەکی بـەهێز، قـەوم، تەنانـەت خێڵێکـی بێگـەرد نەبوو. بەپێی قۆناخ لەمیانەی پێکهاتەی تێکەڵاو وەرچەرخان یەکلاکەرەوەتر دەبێت. لەناوەوە تادەگاتـە خـودی دیاردەکـە ئـەم پێشکەوتنە بەردەوامـە. زۆر بـاش دەزانـرێ کـە سـۆمەریەکان دەستپێکەری یەکەمین ناولێنـانن لەشارسـتانییەتدا. تەنانـەت ئەمـە شـیمانەیەکی بـەهێزە کـە ووشەی کوردیش سـەرچاوەکەی بـۆ سـۆمەریەکان دەگەڕێتـەوە. بـەزمانی سـۆمەری UR ? کـور بـەواتای "شـاخ" دێت؛ هـەرچی پاشـگری دی یـە بـەواتای (تبعیـة) دێـت. هەربۆیـە "کـوردی" بەواتای شاخیەکان دێت. هەروەکو دەزانرێ ئێستا بەگشتی کوردان بەگـەلی شـاخی نـاو دەبرێـن. تورکەکان بە "تورکی چیا" ناویان دەبەن.

لەبواری سیاسیشەوە شرۆڤەکردنی دیاردەی کورد ئاستەم نییە. بەگوێرەی هەڵوێستە دۆگمـا و ئایدیۆلۆژیـەکان بـۆ ئـەوەی ببیتـە خـاوەن مێـژوو ئـاواکردنی دەوڵـەت مەرجـە. بـەڵام کـاتێك

تەماشای دیاردەی دەوڵەت و سیاسەت بکرێت، دەبینین کە هیچ دەوڵەتێك بەتەنیا موڵکی نەژادێك، یاخود قەوم و نەتەوەیەك نییە، بەڵکو دەوڵەت لەلایەن چینی دەسەڵاتداری چەندین قەوم و نەتەوە ئاواکراوە، بەیەکتریان سپاردووە یاخود لێك جیابوونەتەوە. نەك گەلان ونەتەوەکان، بەڵکو چینە دەسەڵاتدار و چەوسێنەرەکان دەوڵەت ئاوا دەکەن. خەڵکانی دیکە دەستی بەسەردا دەگرن، دەیگۆڕن یاخود جیادەبنەوە. بەمجۆرە مێژوو بەردەوام دەکات. بەڵام بەگوێرەی هەڵوێستی ئایدیالیستیانە بۆ ئەوەی بەباشترین شێوە ببێتە خاوەنی مێژوو وەکو سەرەکیترین مەرج دەبێ دەوڵەت ئاوا بکەیت یان خاوەنی دەوڵەت بیت. هەڵبەتە ڕاستینەی مێژوویی ئەوەی سەلماندووە کە ڕەوشێکی بەمجۆرە تەنیا دەبێتە هەڵوێستێکی باشی ئایدیالیستیانە و ڕاستی بەمەرجێك نییە. هەربۆیە کاتێك خاڵی دەستپێکردنی مێژووی کوردان بەدەوڵەتێك دەست پێبکات کە هی خۆیان بێت، تادواڕادە ئایدیالیستی یە و لەگەڵ ڕاستیدا ناگونجێ. هەڵوێستێکی رووتی سیاسی بەمجۆرە بۆ هیچ گەلێك جێگای باس نییە.

بەشێوەیەکی گشتی بنەماڵەیەك یان چینێکی دەسەڵاتداری ئەم گەلە هەڵدەستێ بەدامەزراندنی دەوڵەت و بەسەریاندا باڵادەست دەبێ و دەیانچەوسێنێتەوە. گووتنی دەوڵەتی خێڵ، گەل، نەتەوە، تەنیا فەلسەفەیەکە. ئەوەی زیاتر لەنێو کورداندا ڕوویداوە ئەوەیە و لەوە زیاتر لەنێو دەوڵەتێکدا بن کە چینە سەردەستەکانی خۆیان خاوەنی بن، لەمیانەی هاوبەشێتی لەو دەوڵەتانەی کە بنەماڵە و چینە سەردەستەکانی ئەتنیکیە جیاوازەکان دەسەڵاتدار بوون، مێژوویەکی سیاسی فەرمی بووە کە تاوەکو خراپترین بەکرێگیراوێتی دەچێت: هەروەها تایبەتمەندێتیەکی دیکەی مێژووی سیاسییان ئەوەیە کە وەکو گەل و خێڵەکان بەردەوام بەرامبەر داگیرکاری دەرەوە و بەکرێگیراوەکان لەنێو یاخیبووندا بوون. هەڵبەتە مێژووی گەلان تەنیا بەگۆڕەپانی سیاسی سنووردار نییە. بەڵکو لە ئابوورییەوە تا دیبلۆماسی، لەبواری کۆمەڵایەتی تا سیاسەت و ماف، لەمێژووی گشتی کولتوور تاوەکو پێشکەوتنی گشتی کۆمەڵگا، لەناو یەکتردا گوزارشت لە گەلێك قۆناغ دەکات. تەواوی ئەم قۆناخانەش لەنێو پەیوەندیەکی مێژوویی دیالەکتیکدا گوزارشت لەپێشکەوتنی گشتگیرانەی مێژووی کۆمەڵگاو گەلان دەکات. تەنیا لەمیانەی یەك قۆناخدا باسکردن و گوزارەکردن لەمێژوو، تادواڕادە هەڵەیە.

پێشنەکەوتن لەبواری سیاسیدا، بەواتای ئەوە نایێت کە لەبواری کولتووریشدا پێشکەوتن بەدینەهاتووە. بۆ نموونە یەهودیەکان تەنیا لەم پەنجا ساڵەی دواییدا لەبواری سیاسیدا توانیان ببن بە خاوەنی دەوڵەتێکی تایبەت بەخۆیان. بەڵام لەبوارەکانی ڕۆشنبیری و ئاینی و بازرگانی و دارایی دا نزیکەی تەواوی دەسەڵاتی جیهانیان بەدەستەوە بوو. ئەمەش سەرەڕای ئەوەی تارابردوویەکی نزیك ڕەوشێکی جێگیریان نەبوو. ئەوە هەڵەیەکی مەزنە لەو ڕاستینە بەرەو ئەنجام گرتن بچین کە دەڵێ یەهودیەکان بێ مێژوون. هەروەها مێژووی ئەتنیکی دیاردەیەکی جیاوازە. مێژووی کولتووری بەواتای بەرفراوانترین مێژوو دێت. ئەو هەڵوێستە

ئایدیالیستیانەی یەك لایەنەن هەڵەی گەورەی سەبارەت بەمەسەلەی کوردی لێکەوتۆتەوە. کاتێك هەڵوێستێکی مێژوویی و زانستی بەبنەما بگرین دەبینین کە کوردان لەنێو چوارچێوەی تایبەتمەندیە گەوهەریەکان تاڕادەیەکی مەزن خاوەنی مێژوویێکی شکۆدار و هەمەڕەنگن.

٢ ـ یەکێکی تر لەهەڵەکانی شێواز ئەوەیە کە کێشەی نەتەوەیی کوردان وەکو ناواکردنی دەوڵەت دەبینێ. بەگوێرەی ئەمەش تەنیا لەپێناو ناواکردنی دەوڵەت هەڵدەستینە سەر پێیان. لەدەرەوەی ئەمە تەواوی ڕێگاکانی چارەسەری بەهەڵپەرستی و لەڕێ لادان و خیانەت، یاخود بەکرێگیراوێتی دەبینێ. بەتایبەتیش شرۆڤەی ستالینی سۆسیالیزمی بونیادنراو سەبارەت بەکێشەی نەتەوەیی کاریگەری و ڕۆڵی لەم جۆرە گشتگیریە هەبووە. ناستەمە و ناتوانرێ بانگەشەی ئەوە بکرێت کە هەڵوێستێکی لینینستی یە. چونکە گرێدانی کێشەیەکی نەتەوەیی یان کۆمەڵایەتی بەناواکردنی دەوڵەت یاخود کەوتنی ئەم کێشەیە بەهۆی نەبوونی دەوڵەت، ئەمە تێڕوانینێکە کە پاشماوەی سەردەمی چینە چەوسێنەرە کۆنەکانە. دەشێ ناواکردنی سیستەمی دیموکراتی بناخەیەك بێت بۆ گەلان، نەك ناواکردنی دەوڵەت. هەروەها کاتێك بەگوێرەی پێرەوێکی زانستی تەماشا بکەین دەبینین کە ناواکردنی دیموکراسیەت زۆر لەمەسەلەی ناواکردنی دەوڵەت پێشکەوتووتر و واقیعی ترە. تەنانەت باشترین چارەسەری بەرجەستەیە کە لەگەڵ بەرژەوەندی گەلاندا دەگونجێ.

کاتێك فشارەکانی هەلومەرج بەو لایەنەدا دەبێت دەبێ وەکو دوا ڕێگای چارەسەری بیر لەناواکردنی دەوڵەت بکرێتەوە. بەڵام نەتەوەپەرستی نەتەوە سەردەستەکان و کاریگەریەکانی لەسەر ئەو چینانەی بانگەشەی سۆسیالیزم دەکەن، لەکام هەلومەرجدا دەبێت بابێت مەسەلەی ناواکردنی دەوڵەتی خستۆتە نێو بەرنامەی هەموو ڕێکخراوەکان. ئەمەش تەنیا زێدەڕۆیی و شێواندنێکە گەوهەری خۆی لەئایدیالیزمی چینی سەردەستی چەوسێنەر وەردەگرێت. باشترین چارەسەری کە لەگەڵ بەرژەوەندی گەلان دەگونجێ، ئەوەیە کە یەکێتی سیاسیانە بەشێوەیەکی هاوبەش لەنێوان وڵاتەکان ناوا بکرێت و ئەمەش گرێدراوی چەمکەکانی ئازادی و یەکسانی بێت لەماف و خوڵقاندنی بەهای نیشتمانی هاوبەش. تاوەکو ئێستا بەدەیان ساڵە لەپێناو بەدەستهێنانی دەوڵەتێکی بچووك لەخۆڕا خوێن دەڕێژرێت. یەکێتی سیاسی وڵات کە ئازادی و یەکسانی بەبنەما دەگرێت، لەبوارەکانی ئابووری و مێژوو و گەلان و تەواوی پێکهاتە کولتووریەکان، دەرفەتی زیاتر لەپێناو ژیانێکی دەوڵەمەند دەڕەخسێنێ. هەرچی جوداخوازییە بەواتای هەژاری و تەنیایی و تاك ڕەنگی دێت. بێگومان ئەو شرۆڤە دۆگماتیکانەی ئایدیۆلۆژیەکان بەتایبەتیش نەتەوەپەرستی زۆر بەکاریگەر بووە. سۆسیالیزمی بونیادنراویش کە وەکو پێچەوانەی ئەمە دیارە، هەر لەسەرەتاوە شێوەی چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوەیی لەناواکردنی دەوڵەتێکی جودا بینیوە و بەمەڕەنگەی هەڵسەنگاندووە. لەگەوهەردا هەردووکیان شێوەی پێشکەوتووی نەتەوەگەرای بۆرژوایە،

بەرژەوەندییەکانی چینە سەردەست و چەوسێنەرەکان بەدی دێنێت. هەرچی بەرژەوەندی ئەو گەلانەیە کە لە شێوازی ژیاندا پشت بەجوداخوازی نابەستن و ئەو یەکێتییە هەمە جۆرانەی کە لەسەربنەمای یەکسانی ماف و ئازادی یە، کارەکتەری ئەنتەرناسیۆنالیستی تێکۆشانی ئازادی لێرەوە سەرچاوە دەگرێت.

کاتێك هەڵوێستەکانی نەتەوەپەرستی و سۆسیالیزمی بونیادنراو بەمجۆرە دەرهەق بەکێشەی کورد پەیڕەوکرا، بەهۆی ئەو شوێنگەی تێیدایە تادواڕادە هەستی بەوە کردووە کە لەڕەوشێکدایە لەنێو تەڵەزگە تەنگەتاو بووە. بێگومان لەبەر نەبوونی هاوکاری ئەنتەرناسیۆنالیستی لەسەرووی هەمووشیانەوە ئەم هاوکاریە لەلایەن گەلانی دراوسێوە پێشکەش نەکرا، ئەوا ئۆناخێك بووە ناچاری کە بەساڵان بەردەوام دەبێت و تەنگەتاوی و رووخان بۆ هەموو لایەنەکان دەهێنێت. تەنانەت ئەگەر بەپشت بەستن بەپێناسەیەکی راست سەبارەت بەدیاردەی کورد و بەگوێرەی پێوانە دیموکراتیەکان پرۆژەیەکی چارەسەری بەبنەما بگیردرێت، ئەوا هەموو لایەنەکان بەهێز دەبن و کێشەکە لەمیانەی یەکێتیەکی هەمیشەییدا ئەنجامگیر دەبێت. لەسەربنەمای پێوانە دیموکراتیەکان گەیشتنی دەوڵەت و سیاسەت و کۆمەڵگا بەسیستەمێکی دیموکراتی، هەروەکو چۆن هەوڵەکانی فشار و یاخیبوون و ترس و گومانی سەدان ساڵە بێ واتا دەبێت، ئەوا دەرفەتی ژیانێکی ئازادی و برایەتی راستەقینە ئاوەڵا دەکات. کاتێك کوردان ئەم رۆڵە وەکو سیاسەت و ستراتیژیەتێکی سەرەکی پەسند دەکەن، رێگا لەپێش ئەوە دەکاتەوە لەتەواوی رۆژهەڵاتی ناوین وەکو هێزی دینەمۆی دیموکراسییەت و هاوکاری پێناسە و پەسند بکرێن.

بەدرێژایی مێژوو کاتێك دۆگماتیزم بەرەو ئاقارێکی مەترسیدار ئاراستەی گرتە رێگای لەپێش تێکدەرانەترین ئەنجام کردۆتەوە. پۆتۆپیاگەرایی ئەو رووەیەتی کە سەبارەت بەنایینەدیە، کاتێك پەیوەندی خۆی لەگەڵ زانستدا پچڕاند هەمان ئەنجامی مەترسیدار لەگەڵ خۆیدا دێنێت. کاتێك هەڵوێستی زانستیانە، ئەو دیاردانە پێناسە بکات کە بنەمای کێشەکانن، ئەوا رێگا لەپێش چالاکی و سیاسەتی واقیعی دەکاتەوە و دەرفەتی چارەسەری سەرکەوتووانە ئاوەڵا دەکات. واقیعی بوونی زیاتر، واتای زیاتر بەمرۆڤ بوونە. ئەمەش روونترین گوزارەی خۆی لەسیستەمی شارستانییەتی دیموکراتیدا دەبینێتەوە.

٤ ــ لە هەڵوێست نیشاندان بەرامبەر دیاردەی کورد لایەنی مەعنەویات و ئەخلاق جێگایەکی گرنگی هەیە. هەڵوێستە سیاسی و ئابووریە زیادەکان بەحیسابەکانی رۆژگاری ئەمڕۆمان گەیشتۆتە ئاستێك کەتەواوی حیساباتی مەعنەوی و ئەخلاقی پێشێل دەکات. لەڕاستیدا پێشکەوتنی زانست و تەکنۆلۆژیای لەڕادەبەدەر بەرامبەر بە وورە و ئەخلاق، پێکهاتەی هزری گۆڕانکاری مەترسیدار دەخولقێنێ. ئەو زانستەی پێوانەی ئەخلاقی لەخۆوە ناگرێت، کاتێك رێککەوتنی بێ پرەنسیپ لەگەڵ سیاسەت و ئابووری بە ئەنجام گەیاند. رێگای

لەپێش شەڕی یەکەم و دووەمی جیهانی و چەندین شەڕی هەرێمی بێ واتا و بەکارهێنانی بۆمبای ئەتۆمی و هاوسەنگی ئەتۆمی سامناک کردەوە، هەروەها ژینگە کەوتە نێو رەوشێك دەرفەتی ژیانی تێدا نەمێنێ، بەشێوەیەکی مەترسیدار ژمارەی دانیشتوان زیاد بێت، کە ئەمانەش هەریەکە کێشەیەکن رێگا لەپێش ئەنجامی وەها دەکەنەوە کە مرۆڤایەتی بەرەو پووکانەوە ببات. بێگومان ئەو رەوشە سامناکانەش دەزانرێت کە ئەو ئەخلاقە رێگای لەپێش کردەوە کە لەسەربنەمای میتۆلۆژی و ئایینین. ئاشکرایە کە تەنیا ئەخلاق سەربەخۆ هێزێك نییە، وەکو هەڵسوکەوتی گشتی کۆمەڵگا رۆڵ دەبینێ. بەلام دیسان بەفالآیی هێشتنەوەی ئەم بوارە گەورەترین کەم و کوڕی چەرخی زانستە. مسۆگەر زانست پێویستی بە ئەخلاق هەیە. چونکە پێشکەوتنی زانستی دوور لە ئەخلاق، سەرچاوەی نەخۆشیەکانی سەردەمە. لاواز بوونی ئایینیش ئەم قۆناخەی مەترسیدارتر کردووە. پێویست دەکات بەبایەخەوە ئەخلاقی تایبەت بەخۆی پێش بخات، تەنانەت دەبێت رێکخراوی ئەخلاقی زانست دابمەزرێنێت و پیادەی بکات کە وەکو دەسەلاتێکی پیرۆز گوزارشت لەهێزێکی سەرووی دەوڵەت بکات. راستینەی کۆمەڵی مەدەنی دانانە بەو کەموکورییانە کە تا دوارادە ناتەواون. لەگەڵ ئەوەی زیاتر پێشخستنی کۆمەڵی مەدەنی ناچاریەکە، پێویست دەکات پێکهێنانی ئەخلاقی زانست و گەیاندنی بەدەسەلاتێك کە هێزی پراکتیزەکردنی هەبێت وەکو دەزگایەك هەڵسەنگێنرێت کە لە UN ی رۆژگاری ئەمڕۆمان بەکاریگەرتر بێت. ئەنتەرناسیۆنالیزم و مرۆڤایەتی راستەقینە، لەمیانەی هێزی دەزگای بەمجۆرە واتادار دەبێت، مسۆگەرە کە بەرژەوەندی بێ ئامانی ئابووری و سیاسی دەوڵەتان و تەواوی ئەو دەزگایانەی پشتیان پێدەبەستێ، ئەوا بەو رەوشەی ئێستایان مرۆڤایەتی بەرەو هەڵدێری زیاتر دەبەن.

یەکێك لەو کردارە مەترسیدارانەی ئەم راستینەی چەرخەکەمان سەبارەت بەکێشەی کورد نیشان دەدات. کاتێك تەواوی لایەنە پەیوەندیدارەکان بەرژەوەندیە ئابووری و سیاسیەکانی خۆیان لەجیاتی چارەسەریەکی دادوەرانە لەبێچارەییدا دەبینن، رێگا لەپێش هۆڤێتی ئەوتۆ دەکاتەوە کە کوشتاری بەکۆمەڵی لەجۆری هەڵەبجە لەگەڵ خۆیدا دێنێ.

فشاری سەر کوردان گەیشتۆتە ئاستی قەدەخەکردنی زمان. تەواوی هێزە جیهانی و هەرێمیەکان، بەهۆی بەرژەوەندیەکانیان بەرامبەر ئەمە بێدەنگن، نە برایەتی ئایین، ئەمرۆڤپەروەری و ئەیاسای نێو نەتەوەیی، هیچ یەکێکیان پەیڕەو ناکرێت. کوردان لەنێو تەڵەزگە بەجێ هێڵراون. هەرکەسێك مانەوە لەنێو سیاسەتێکی رۆژانە ناقڵمەندانە دەبینێ کە لەگەڵ بەرژەوەندیەکانی دا بگونجێ. هەروەکو بڵێی کێشەی کورد رۆڵی کارتی پێوانەکردنی ویژدانی ئەم سەردەمە دەبینێ. لەمێژووشدا رەوشی هاوشێوەی ئەمە هۆکاری راستەقینەی تراژیدیای مرۆڤایەتییە. ئەگەر بەمجۆرە بەردەوام بێت، ئەوا کوردان زیاتر دەبنە سەرچاوەی تراژیدیای سەدەی بیست و یەکەم. ئەم راستینە تاڵانەی کە یەکەمین نموونەکانی لەهەڵەبجە و

ئەو کەشتیانەدا دەرکەوتووە کە پڕن لەکۆچبەر و نقوومـی ژێـر دەریـا دەبـن، ئەمانـە نیشانەی راسـتەقینەی ویژدانـی ئـەم سـەردەمەن. بـەڕادەی هـەرە زێـدە لـەدیاردە و کێشـەی کـورد لەبەرچاوانـە کە پێویستە تـەنیا لـەبواری ئـابوری و نەتـەوەیی و سیاسی هەڵوێست سـەبارەت بەکێشەکان نەکرێت، مسۆگەر پێویستە رەهەندی ئەخلاقیشی لێ زیادە بکرێت. لەوانەیـە لـەم بوارەدا کوردان بۆ بەلاوەنانی ئەم کەموکوڕیە رۆڵێکی مێژوویی ببینن.

٥ ـ دەربازی قۆناخێك دەبین کە لەسایەی ئەم رەخنانەی سەبارەت بەشێواز و پـێڕەو هـەن پێویستی بەتاوتوێکردنێکی واقیعیانەتری دیاردە و کێشەی کورد هەیـە. لەسـەر تـەواوی لایەنـە پەیوندیدارەکانی کێشەکە پێویستە هەڵوێستی خۆیان دیار بکەن و نـەهێڵن بۆسـنا و کۆسـۆڤۆ و چاچانێکی دیکە بێتـە ئـاراوە، تـاوەکو رەوشـی بنبەسـتبوون وەکـو چارەسـەریەك نەمێنێتـەوە. لەسەر ئـەم لایەنانـە پێویستە لەسـەر بنـەمای راسـتینەکان و ئـەو ئومێدانـەی گـەلی کـورد چارەسـەری پێش بخـەن کـە نـاتوانرێ دوابخرێـت و سـەرچاوەی خـۆی لـەقووڵایی مێـژووەوە دەگرێت. هەروەها پێویستە بـەرژەوەندی سیاسـی و ئابوریـەکانی خـۆی لەچارەسـەرکردنی ئـەم کێشەیەدا ببینێ، ئەمەش سەرباری ئەوەی لەرابردوو دەرکیان بەوە نـەدەکرد کـە ئەمـە لەگـەڵ بەرژەوەندیەکانیان دەگونجێ. بەدیهێنانی ئاشتییەکی کوردی شەرەفمەندانە لەسەدەی بیست و یەکەمدا بایەخێکی مەزنی بۆ هەموو لایەنـەکان هەیـە. شێوازەکانی بنبەسـتکردنی کێشـەکە و دواخستنی چارەسەری بۆ ماوەیەکی درێژ لەخەریك بوون بـەململانێی عـەرەبی ـ ئیسـرائیل و شەڕی ئێراق ـ ئێران زیاتر تەواوی ناوچەکە بـەخۆیـەوە خـەریك دەکات. هـەروەها مەسـەلەی ئاگربەستی کە لەئاراشدایە بەهاوسەنگیەکەوە گرێـدراوە کە جێگای بـاوەڕی و متمانـە نییـە و هەرساتێك شیمانەی تێکچوونی هەیـە. هـەروەها جوگرافیـا و زیـادبوونی ژمـارەی دانیشـتوان و قەیرانـە ئـابووری و کۆمەڵایەتیـەکان تـەواوی کەرەسـتەکان پێشـکەش بـەیاخیبوون و شـەڕێکی گشتگیر دەکات. هەر تەقینەوەیەکی نوێش بەواتای لەدەستدانی چارەکـە سـەدەیەك و گەڕانـەوە بۆ هەمان خاڵی سـەرەتا دێـت. ئـەو بـێ بـاوەڕی و تـرس و هەڵوێسـتە دۆگماتیـە زێدەڕۆییانـەی لەرێشـەی کێشـەکەدان، لەسـەدەی بیسـتەم تەنانـەت لەسـەدەی نۆزدەهـەمیش هەڵوێسـتی هاوچەرخانەی بەلاوەنا. ئاشکرایە کە پێویست دەکات سەدەی بیست و یەکەم بـەمجۆرە بـەڕێوە نـەچێت. هەڵبەتـە مەحاڵـە ئـەم ستاتۆیەی لەئارادایـە بەسـەر ئـەم سـەردەمەدا بسـەپێنرێ. ئەوانەی ئەمە تاقی بکەنەوە، لەگۆشەگیریەکی هاوشێوەی رژێمی ئێراق رزگاریان نابێت.

پێویسـتە دەوڵەتـە پـەیوەندیدارەکان بەتایبـەتیش تورکیـا کـە گۆڕەپـانی سـەرەکی چارەسەرییە، راستینەی کورد لەپێکهاتەیەکی بەمەرەنگە رزگار بکات کە لاوازی دەکـات و بیکات بەپێکهاتەیەك کە لەمیانەی ریفۆرم و سەرلەنوێ ئاواکردنەوە هێزێکی مەزنی پێ دەبەخشێ و سـەرلەنوێ لەئاسـتی سیاسـەتی نـاوخۆ و دەرەوە خـۆی رێـك بخات. ئەمـەش وەکـو دەرفـەتێك هەڵسەنگێنێ کە ئـەنجامەکانی قەڵەمبازێکی مـەزنی بۆ دەرەخسێنێ. هەربۆیـە ئـەم مەسـەلەیە

بایەخێکی گەورەی هەیە. هەروەها لەسەر ناوەندە ڕۆشنبیر و سیاسی یە کوردییەکان بەتایبەتیش پێویستە ئاستی بەرپرسیار لەپارتی کرێکارانی کوردستان ئەم هەڵوێستە کۆنانەیان تێپەڕ بکەن کە خاوەن مۆرکێکی دۆگماتیانەی ئەوتۆ بوو نەدەتوانرا جێبەجێ بکرێت و لەمیانەی پرۆژەی خولقکارانە تێیدا پێوانەکانی کۆماری عەلمانی و دیموکراتی و یاسای گەردوونی بۆ خۆیان بەبنەما دەگرن و ڕۆژەڤ پێکدێنن، هەروەها بەگوێرەی ئەمەش هێزەکانیان لەڕەوشی ئاشتی و دیموکراسییانە سەفەربەر دەکات و دەخاتە نێو چالاکی و ئەمەش ئەرکێکی مێژووییانە. نە یاخیبوون و نەنکوڵی و فڕکردن، بەڵکو هەنگاونان بەرەو لەیەکتر گەیشتنی دوولایەنەو چارەسەری لەسەربنەمای بەرژەوەندی هاوبەش، دەبێ وەکو ئەنجامێکی هاوچەرخ و واتای ژیانێکی هاوبەشی هەزاران ساڵە پەسند بکرێت. بێگومان بەلاوەنانی پێشینە بڕیارەکانی ئەوپەڕگەری نەتەوەپەرستی، چەمکی هاووڵاتی ئازاد، ئازادی دەربڕینی کولتووری و بەکراوەیی هێشتنەوەی کەناڵەکانی سیاسەتی دیموکراتییانە، پێویستییەکی کۆمەڵگا و کۆمارێکی دیموکراتییە.

لەکاتێکدا تورکیا تێپەڕی سەدەی بیست و یەکەم دەبێت، دەبێ بزانێ کە ئەو قەیرانە قورسەی تێیدایە سەرچاوەی خۆی لەم کێشەوە دەگرێت و ڕزگاربوون لێی بەجێبەجێکردنی پێویستییەکانی کۆماری دیموکراتی بەدی دێت و بەرەو چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە هەنگاو بهاوێژێت، چونکە ئەمە پێویستییەکی وڵاتپارێزی ڕاستەقینە و یەکێتی و برایەتییە. کاریگەری ئەم چارەسەرییە لەتەواوی ڕۆژهەڵاتی ناوین و بەلکان و قەفقاسیا و ئاسیای ناوین بڵاودەبێتەوە و لەمیانەی بیرۆکەی بەهێزەوە دەرفەتی ئەوەی پێدەدات بەرامبەر بەیەکێتی ئەورووپا هەڵسوڕێ؛ وەکو هێزێکی ڕێبەرایەتی ڕێز بۆ خۆی دەئافرێنێ کە بەوریاییەوە سەدەی بیستەم هەڵدەسەنگێنێ و ئەزموونی لێ وەردەگرێت.

## ج - چوارچێوەیەك بۆ مێژووی کورد

### أ- سەردەمی نیۆلیتیك و کورد

کۆمەڵگای نیۆلیتیك لانکەی لەدایکبوونی مێژووی کوردە. شیکردنەوەی کۆمەڵگای نیۆلیتیك وەکو زاراوەیەك و دەست نیشانکردنی نموونەی بەرایی کوردان لەو سەردەمەدا، ڕۆڵی کلیل دەبینێ لەتێشك خستنە سەر مێژوو. هیچ چاودێرێکی ووریا زەحمەتی لەوەدا نابینێ کە بسەلمێنێ کوردان تاوەکو ڕۆژگاری ئەمڕۆشمان بەشێوەیەکی چڕ لەنێو تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگای نیۆلیتیکدا دەژین.

هەڵسەنگاندنە بەراوردکارییەکانی زانستەکانی ئاسەوارناسی و زمانناسی و نەژادناسی ئەوەیان دەست نیشانکردووە کە کۆمەڵگای نیۆلیتیك پێش دوازدە هەزار ساڵ لەمبنارەکانی

ناوەوە و دەرەوەی زنجیرەکانی چیای تۆرۆس و زاگرۆس لەمێژوودا پێشکەوتووە، واتە لەو دۆڵە نزیکانە پێشکەوتووە کە لەسەرچاوە و بەرهەمە ناوبیەکان نزیک بووە کە دەشت و چیاکان بەیەکتری دەگەن. هۆکارەکەشی بۆ ئەو دەوڵەمەندی کولتووری گیایی و ئاژەڵیە دەگەڕێتەوە کە لەگەڵ کشتوکاڵ و ماڵیکردن دەگونجێ و تێکەڵاویان لەگەڵ یەکتر و سیستەمی کەشوهەوا هەیە کەبەئاودێریەکی سروشتی دەچێت. چونکە نموونەی هەموو جۆرە دانەوێڵەیەك و ئاژەڵی بچووك و مەزن لەم ناوچەیەدا هەبوو کە بەدرێژایی سەردەمی بەستەڵەك گۆڕەپانی یەکتر برین و بەیەکگەیشتنی هەرسێ کیشوەر بوو. ئەمەش ئەوە دیار دەکات کە ئەو جۆرە مرۆڤەی لە رۆژهەڵاتی ئەفریقیا دەرکەوت ئەم ناوچەیەی وەکو گۆڕەپانێکی بەئارامی بڵاو بوونەوە بۆ تەواوی جیهان هەڵبژارد. خۆراکی گونجاو و ئاسایش و کەشی لەبار رۆڵێکی سەرەکی لەمەدا دەبینن. گەلێك بەڵگە هەن دەسەلمێنن کە هەردوو سەردەمی پالیۆلیتیك و مەزۆلیتیك لەم ناوچەیەدا ژیاوە، چونکە ئەو ئامراز و نیگارانەی کە لە ئەشکەوتەکاندا ماونەتەوە، ئەو نموونانە نیشان دەدەن کە ئاسەوارەکانی گەل لەسەردەمی مەزۆلیتیك بەزیندوویی ماوەتەوە.

کۆمەڵگای نیۆلیتیك لەدەشتەکانی بناری زنجیرە چیای تۆرۆس و زاگرۆس وەکو کاردانەوەیەك بەرامبەر ئەو قۆناخە دژوارەی وشکایی دەستی پێکرد کە لەدوای سەردەمی بەستەڵەکی دوایی نزیکەی پانزە هەزار پێش زایین هاتە ئاراوە. هەروەها ئاسەوارەکانی نیۆلیتیك کە لەئەنجامی لێکۆڕین و هەڵکەندن لە " چەمی هالان "ی سەر بە باتمان و " ئەرکانی" و "چەمێ کۆتەبەر" و گەلێك گردۆڵەی ئورفا دۆزراونەتەوە، ئەوە دەسەلمێنێ کە یەکەمین نیشتەجێبوون نزیکەی ساڵانی ١١ هەزار پێش زایین لەم ناوچەیە دەستی پێکردووە. مێژوو نووسەکان لەسەر ئەوە هاوبیرن کە گەورەترین شۆڕش لەمێژوودا، هەنگاونانە بۆ قۆناخی ژیانی جێگیر لەم جوگرافیایەدا.

کۆمەڵە گەڕۆکەکانی سەردەمی پالیۆلیتیك کە بەسەدان هەزار ساڵ بەردەوام بوو لە ٢٠ ـ ٣٠ کەس پێکدەهاتن و شوێن پەنجەیەکی کەمیان بەجێهێشتووە، لەڕاستیدا لەپێکهاتنی مێژوودا رۆڵێکی ئەوتۆی نەبووە. توانست و کولتوورەکەیان زۆر لاوازە، لەو تایبەتمەندیانە بێبەشن کە مێژوو خێرا دەکەن. تێپەڕبوون بۆ کۆمەڵی نیشتەجێ واتە شۆڕشی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری، بەهێزترین قۆناخە لەخێراکردنی ڕەوڕەوەی مێژوو. بێگومان ئەم رۆڵەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە کۆتایی بەتاکشێوازی سەدان هەزار ساڵە هێناوە. لەمە بەدواوە مێژوو دەرچوونێکی بەهێز ئەنجام دەدات. ئیتر بەرەو ساڵانی ٦ هەزار پ.ز کولتووری نیۆلیتیك بەشێوەیەکی بەربڵاو لەم ناوچەیەدا بەدەزگا دەبێت. یەکەمین نموونە سەرکەوتووەکانی دۆزراوەتەوە بەهۆی "تەل خەلەف"ی شوێنی نیشتەجێ بوونی، ئەم قۆناخە بەکولتووری تەل خەلەف ناو دەبرێت. ئەم کولتوورەی زیاتر لەو هێڵە چڕبۆتەوە کە لەرۆژهەڵاتی دەریای سپی تاوەکو زاگرۆس درێژ بۆتەوەو بەمیزۆپۆتامیای سەروو ناو دەبرێت. لەگۆڕەپانێکی بەرفراواندا لەیەکتر دەچێ و

تاوەکو نزیکەی سالانی ٤ هەزار ساڵ پ.ز رۆڵێکی سەرەتایی بینیوە و لەناستی جیهاندا نوێنەرایەتی رەسەنێتی دەکات. مێژوو ئەوە نیشان دەدات کە نموونەیەکی ئەم زانیاری و ئامرازانەی لەم قۆناخەدا پێکهات کە دوو هەزار ساڵی خایاند تەنیا دەتوانرێ لەگەڵ ئەوە بەراورد بکرێت کە لەسەدەی شانزەهەمەوە لەئەوروپا پێشکەوت. ئەوە لەبەرچاوانە کە ریشەدارترین هەنگاوی مرۆڤایەتی تەواوی ئەو داهێنانەی شارستانییەتی دەخوڵقێ لەلایەن کولتووری ئەم ناوچەیە خوڵقێنراوە. دەشێ ئەمە وەکو یەکەمین قۆناخی زێرینی مێژووش هەڵسەنگێنرێت.

لەمیانەی ماوە و توانستەوە سەردەمی نیۆلیتیک سەرەکیترین قۆناخە کە پێکهاتەی هزر و رۆحی مرۆڤایەتی پێکهێناوە. فاکتەرە سەرەکییە ئایدیۆلۆژییەکانی لەجۆری یەکەمین قاڵبی بیرکردنەوە، شکۆمەندی رۆحی، وشیاری، بەرێوەبردن، هۆشمەندی بوون بەکۆمەڵگا و گەیشتن بەمزاراوەی خوداوەند لەم قۆناخەدا پێشکەوتنێکی مەزنی بەخۆیەوە بینی. لەمێژووی مرۆڤایەتیدا سەرخانی ئایدیۆلۆژی تایبەتمەندێتیە سەرەکیەکانی خۆی لەنێو هەلومەرجی کۆمەڵگای نیۆلیتیک بەدەست هێنا. ئەمەش واتایەکی وەهای هەیە هەروەکو منداڵێک تازە بەتازە فێری رۆیشتن و قسەکردن بێت. لەلایەکی دیکەشەوە دەزگایە مادییە سەرەکیەکانی وەکو دروستکردنی جل و بەرگ و چنین و لەبەرکردنی، هاڕینی دانەوێڵە بەدەستاڕ، نان و خواردن دروست کردن لەنێو قاپ و قاچاخ و پاراستنیان، بڕینی بەرد بەشێوەی خشت بۆ ئاواکردنی خانوو، ئەنجامی ئەم سەردەمەن. زۆربەی ئەو دانەوێڵە و ئاژەڵانەی لەرۆژگاری ئەمرۆمان بەکاردەهێنرێ، لەم سەردەمەدا چاندران و ماڵی کراون. دروستکردنی تەور و قازمە و گاسن و پێچکە و گالیسکە لەمیانەی داتاشینی تەڵەزمی بەرد و مس دروست دەکران، ئەمانەش داهێنانە سەرەکیەکانی ئەم سەردەمە بوون. ئەم قۆناخە تەنیا لانکەی مرۆڤایەتی رۆژگاری ئەمرۆمان نییە، بەڵکو قۆناخی منداڵیتی و هەرزەکاریشی پێکدێنێت. تەواوی زاراوە سەرەکیەکانی ئایین و میتۆلۆژیا سەرچاوەی خۆی لەم قۆناخە وەردەگرێت. ئەو پێشکەوتنەی بۆ یەکەمین جار لەگەڵ جیهانی ئاژەڵان رێگای لەپێش جیاوازیەکی مەزن کردەوە، وەکو رەوشێکی نائاسایی و موعجیزە لەلایەن مرۆڤ دەرکی پێکراوە. لەراستیدا ئایین و میتۆلۆژیا وەکو رەنگدانەوەی هزری ئەم پێشکەوتن و شۆرشە مەزنە بووە خاوەنی ناسنامە. هەروەکو چۆن روونکردنەوەی زانستی و فەلسەفی سەبارەت بەمنداڵان شێوازێکی هزری زووە، سەبارەت بەم قۆناخەی مرۆڤایەتیش رەوشێکی وەهایە کە تەنیا هزری ئایینی و میتۆلۆژی دەتوانێت پێش بکەوێت. کۆمەڵگای نیۆلیتیک لەگەوهەری خۆیدا زەمینەی ماددی میتۆلۆژیا و ئایینە. لەشێوەکانی پێشوتری کۆمەڵگادا ناسنامەیەکی ئایدیۆلۆژی وەها بەرچاو ناکەوێ؛ کە لەوانەیە دەرفەتی گەیشتن بەهەمەندێ زاراوەی پیرۆزی زۆر سنووردار بدات. شۆرشی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری تا دوایی رێگای لەپێش ئایین و میتۆلۆژیا کردەوە و زەمینەی ماددیان بۆپێک دێنێ.

یەکەمین نموونەی سەرەتایی سیاسەتیش لەم شێوەیەی کۆمەڵگادا دەبینین. ئەو کۆمەڵگایەی تا ئاستی چەند تیرەیەك مەزن بووە، ڕووبەڕووی کێشەی بەڕێوەبەرایەتی دەمێنێتەوە. کەسانی هەرە بەئەزموون لەناو تیرە و ئەوانەی درێژە بە پێشکەوتن دەدەن بەشێوەیەکی سروشتی ڕۆڵی ڕێبەرایەتی دەبینن، لەسەر ئەم بنەمایەش بەشێوەی شامان و سیحربازی دابەش دەبن. ڕێبەرایەتی سیاسی و مەعنەوی یەکەمین جیاوازی لەنێو ئەم هەلومەرجانە وەردەگرێت. لەبەرئەوەی شۆڕشی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری لەچواردەوری ژن شێوە دەگرێت، بۆ ماوەیەکی درێژخایەن تایبەتمەندێتیەکانی کۆمەڵگای دایکسالاری زاڵە. باوەڕبوون بەهێزی دایك بەرهەمی ئەم سەردەمەیە. پیاو تادوارادە بێکاریگەر و گشتی یە. هەرچی "ژنە، دایکە"خاوەنی ڕۆڵی یەکلاکەرەوەیە و گەوهەرە. ئەم ڕەوشە وەکو ڕەنگدانەیەکی مەعنەوی بناخەی کولتووری خوداوەندی ژنە. خوداوەندی ژن لەگەوهەری خۆیدا گوزارشتی گشتی تایبەتمەندێتی ئەو ژنەیە کە شۆڕشی نیۆلیتیکی ئەنجامداوە. کاتێك وشیاری ئەم شۆڕشە مەزنەی مرۆڤایەتی بەسەر جیهانی هزردا ڕەنگدەداتەوە، ڕێگا لەپێش شێوازێکی شکۆداری و پیرۆزکردن دەکاتەوە کە خوداوەندی ژن دەکات بەناوەند. خوڵقکاری، ناسینی دانەوێڵە و چاندن و ماڵیکردنی ئاژەڵ، دروستکردنی قاپ و قاچاخ، چنین و دروستکردنی خانوو، بەخێوکردنی منداڵ، چاوەڕوانیکردنی دارەکانی میوە، لەمیانەی ڕۆڵی سەرەکی ژنانەوە ئەنجام دەدرێت.

خوداوەندی ژنی بەهێز سەرچاوەی خۆی لەو کۆمەڵگایە دایکسالاریەوە وەردەگرێت. لەبەرئەوەی تەواوی ئەم پەیکەرانەی لەم سەردەمە ماوەتەوە ژنیان کردووە بەسەمبوڵ، سەرەکیترین نموونەی سەلماندن. پیاو زۆر دواتر دەرکەوتە پێش، ئەو لەنێو ئەو کۆمەڵانەدا دەردەکەوێت کە ڕەوەندن و بە گاسن جووت دەکەن و هێشتا نێچیر گرتن جێگای بایەخە. بەشێوەیەکی سەرەکی باوەڕی پیاو لە ٤ هەزار پ.ز دەرکەوتە پێش و لەگەڵ کۆمەڵگای چینایەتی سۆمەریەکانیش هەنگاوی هاوێشت و باڵادەستیەکی مەزنی بەدەست هێنا. پێشکەوتنەکانی لەئامرازەکانی بەرهەمهێناندا بەدیهات ڕۆڵێکی یەکلاکەرەوەیان لەمەدا بینی. بەتایبەتی پێداویستی تەور و گاسن بەهێزێکی زیاتری بازوو و ناچارکردنی کە دوور لەماڵەوە بمێنێ، دەبێتە شێوەی سەرەکی کە لەبەرهەم هێناندا پیاو دەرکەوێتە پێش.

کولتووری کۆمەڵگای نیۆلیتیك کە مۆری خۆی لەمێژوو داوە، ڕەسەنێتی خۆی لەم ناوچەیەیە. لەڕۆژهەڵاتی دەریای سپی تا دەگاتە زنجیرە چیاکانی زاگرۆس، لەبیابانەکانی باکووری عەرەبستان تاوەکو چیاکانی تۆرۆس لەئەنادۆڵ بەتایبەتیش بناری ئەو چیایانەی ئاوەکانی دیجلە و فورات و زاپ ی لێ هەڵدەقوڵێ و ئەو دەشتەی دەکەوێتە نێوانیان، ناوەندی سەرەکی شێوەگرتنی ئەم جۆرە کۆمەڵگایەیە. هەر بەهۆی ئەم تایبەتمەندێتیە ئەم ناوچەیە لەمێژوودا بەهیلالی بەپیت ناودەبرێت. نزیکەی بەدرێژایی ١٠ هەزار ساڵ مرۆڤایەتی لەمیانەی ڕۆڵی خوڵقکارانەی ئەم ناوچەیە بەخێوکراوە. بەواتایەکی دیکە لەتەواوی ئەم سەردەمەدا

هیلالی بەپیت ڕێبەرایەتی بۆ کۆمەڵگای مرۆڤایەتی جیهان کردووە. ئەوە سەلمێنراوە کە سێ شەپۆلی کولتووری مێژوو لەم ناوچەیەوە سەرچاوە دەگرێت. هەروەکو دەزانرێ یەکەمین داهێنانەکانی نیۆلیتیك نزیکەی بەدرەنگ کەوتنی دوو هەزار ساڵ بۆ ناوەندی ئەوروپا و ئاسیا، لە ٧ هەزار پێش زایین لەباکووری ئەفریقیا بڵاو بۆتەوە. لێکچوونی سەرنج راکێشی ئامرازەکانی نیۆلیتیك کە لەم ناوچانە دەرکەوتوون لەگەڵ ئەوانەی هیلالی بەپیت ئەم راستینەیە دەسەلمێنێ. شیمانەی بەهێز ئەوەیە کە لەکۆچی جەستەیی زیاتر، بڵاوبوونەوە بەشێوەی کولتووری ئەنجامدراوە. هەرچی کولتووری تەل خەلەفە بەدواکەوتنێکی ١٠٠٠ تا ٢٠٠٠ ساڵە لە زەریای ئەتڵەسیەوە گەیشتۆتە زەریای مەزن. سێیەمین بڵاوبوونەوەی مەزن پشت بەشارستانییەتی سۆمەر دەبەستێ. شارستانییەتی سۆمەریش لەماوەی نێوان ٢٠٠٠ ـ ١٠٠٠ پێش زایین دەتوانێ بگاتە تەواوی ئەم ناوچانە. لەمیانەی ئەو لێکۆڵینانەی لەبواری ئاسەوارناسیەوە ئەنجامدراوە، لەرێی لەیەکچوونی گەوهەری کولتوورەکەی زۆر بەسانایی دەتوانرێ ئەم راستینەیە دەست نیشان بکرێت.

بڵاوبوونەوەی کولتووری تەنیا بەئامرازەکانی بەرهەمی ماددی سنووردار نییە. راستیەکی دیکەی سەلمێنراو ئەوەیە کە بەتایبەتیش سەرچاوەی سەرەکی گرووپی زمانی هیندۆ ـ ئەورووپی بەشی سەرووی حەوزی دیجلە ــ فوراتە کە ئەم شۆڕشە مەزنەی تێدا ئەنجامدرا. لەمیانەی بەراوردکاریە ئاسەوارناسی و رەگەزناسی و زمانناسیەکانەوە زۆر بەسانایی سەلمێنراوەکە گرووپی کولتوور و زمانی ئاری شیمانەی هەیە ١١ هەزار ساڵ پ.ز لەمیانەی ئەم نەریتە گرنگەی مرۆڤایەتی لەم سەرچاوە سەرەکیەدا شێوەی گرتووە. بەتایبەتیش چەندین وشەی کە لەم سەردەمەدا ماونەتەوە و تاوەکو ئێستا لەناوچەکەدا لەنێو شێوە زاراوەکانی زمانی کوردی بەکار دەهێنرێ، ئەوە نیشان دەدات کە سەرچاوەکەی لەو قۆناخ و سەردەمەدا پێکهاتووە. کولتوور و زمانی ئاریان لەبناخەی خۆیدا بەرهەمی شۆڕشی کشتوکاڵ و ئاژەڵدارییە. تەواوی ئەم گۆڕەپانانەی ئەو شۆڕشەی تێدا بڵاوبۆتەوە، ئەو زمانانە بەکاردێنن کە لەم سەرچاوەوە هەڵکەوتووە. تاکە (شاز)، گرووپی زمانی سامی بیابان و گرووپی زمانی فین ـ ئورال ـ مەغۆل کە سەرچاوەی خۆی لەناوچە بەستەڵەکەکان دەگرێت. یەکەمیان کۆمەڵگای کۆچەری بیابان، دووەمیان سەرچاوەی خۆی لەبنارەکانی سەهۆڵبەندی دەگرێت، دیسان زیاتر کۆمەڵگایەکی رەوەند بەبناخە دەگرێت. گرووپی ئاریانی ناوەڕاست ناوەندی بەرفراوانترین و خولقکارترین کولتوورە.

هەروەکو سەردەمێك بانگەشە دەکرا گرووپی زمان و کولتووری هیندۆ ئەورووپی لەناوچە دەشتاییەکانی روسیا و ئەوروپا بەرەو باشوور و رۆژهەڵاتی ناوین نەهاتووە، بەڵکو بەپێچەوانەوە راستی مێژوویی سەلمێنراو ئەوەیە کە لەهیلالی بەپیتەوە بەرەو ئەم ناوچانە بڵاو بۆتەوە. بێگومان سروشتی یە کە ئەنجامی بڵاوبوونەوەیەکی درێژخایەنی بەمجۆرە کە

جوگرافیایەکی بەرفراوانی گرتۆتە پێش خۆ، زۆر پارچە دەبێت، دەبێت بەسەدان زاراوەی خۆجێیی و دەبێ ئەمەش وەکو پێشکەوتنێکی سروشتی ببینرێ. بەڵام ناتوانرێ نکوڵی لەو راستییە بکرێت کە ناوچەکانی سەرووی حەوزی دیجلە و فورات ناوەندی سەرەکی و ریشەیی شۆڕشە و ئەمەش بۆ نزیکەی ١٢ هەزار ساڵ پ. ز دەگەڕێتەوە. بەشێوەیەکی راست دەرککردن بە مێژوو لەنزیکەوە گرێدراوی شێوازی پێکهاتن و بڵاوبوونەوەیە. تەنانەت لەبەرئەوەی مێژوو دایکی هەموو زانستەکانە، ئەگەر رێبازی لەدایکبوون و پێشکەوتن بڵاوبوونەوەکەی بەشێوەیەکی راست دەست نیشان نەکرێت، ئەوا لەتەواوی زانستەکانی کۆمەڵگادا هەڵە و کەموکوڕی ناوەڕۆك و شێواز دەبێتە راستییەکی حاشاهەڵنەگر.

هەربۆیە شیکردنەوەی کۆمەڵگای نیۆلیتیك تەنیا سەبارەت بەمێژووی کوردان نییە، بەڵکو بۆ مێژووی تەواوی مرۆڤایەتی بایەخێکی مەزنی هەیە. راستە مێژووی نوسراوە، واتە خودی مێژوو لەسۆمەریەکان دەست پێدەکات. بەڵام سۆمەریەکانیش هەموو شتێکی خۆیان لەکۆمەڵگای نیۆلیتیك لەحەوزی سەرووی دیجلە ـ فورات وەرگرتووە. بەئەندازەی تەواوی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان زاراوە سەرەکیەکانی دەزگا سەرەکیەکانی سەرخانیش لەم کۆمەڵگایەدا شێوەی گرتووە و بۆ سۆمەریەکان گواستراوەتەوە. خاوەنی چەندین بەڵگەی سەلێنەری ئەم راستیەین. تەنانەت ئەوە بەتەواوی بەڵگەکراوە کە سۆمەریەکان هەنگاو بەهەنگاو لەمیزۆپۆتامیای باکوور بەرەو میزۆپۆتامیای باشوور بڵاو بوونەتەوە. کەواتە سەرچاوەی راستەقینەی مێژوو کە پشت بەنووسین نابەستێ؛ ئەو دۆڵ و دەشتە نیوگردۆڵکانەن کە لەشوێنی بەیەکگەیشتنی ئەو چیاو دەشتانە پێکلێت کە بۆ چاندن و ماڵیکردنی ئاژەڵ گونجاوە و شوێنی ئاژەڵ و دانەوێڵەی خۆڕسکە و دەکەوێتە ئەو شوێنەی کە لقە جیاکانی بەدیجلە و فورات و زاپ دەگەن و ناوەندی شۆڕشی نیۆلیتیکە. ئەفسونی ئەم دەشت و دۆڵ و چیایانە لەوەوە دێت کە لانکەی خوڵقاندنی مێژووە.

یەکەم ناوی کە لەناوچە و گەلەکەی نراوە دەزانرێ هی سۆمەریەکانە. راستتر، زۆر بەسانایی لەسەرچاوە نووسراوەکان دەتوانین ئەم مەسەلانە ببینن. ئەوەی کۆمەڵگای نیۆلیتیکی خوڵقاندووە کولتوورێك یاخود کۆمەڵێك نییە لەدەرەوە هاتبێت، بەڵکو ئەو کولتوور و گروپە خۆجێیی یە خوڵقکارانەن کە لەسەردەمێکی کۆنەوە لەناوچەکەدا نیشتەجێن و خاوەنی تایبەتمەندێتی رەسەنن. تەواوی تۆمارەکانی مێژوو ئەوە دەسەلێنن کە لەساڵانی ٢٠ هەزار پێش زایینی پالیۆلیتیکی سەروو، لەماوەی نێوان ١٥ ـ ١١ هەزار ساڵ پ.ز واتە لەتەواوی سەردەمی مەزۆلیتیك، دواتریش لە کۆمەڵگای نیۆلیتیك تا دەگاتە سۆمەریەکان، بەردەوام کولتوورێکی جێگیر و کۆمەڵەی تیرەکان لەناو پێشکەوتندا بوون. هەڵبەتە لەسەردەمی سۆمەریەکان تاوەکو رۆژگاری ئەمڕۆشمان، دەشێ ئەمە لەو تۆمارە نووسراوانەی مێژوو ببینرێ کە پێشکەوتوون. ئەو راستینەیەی دەرکەوتووە ئەوەیە کە باپیرە و داپیرەی

کوردانی ڕۆژگاری ئەمڕۆ لەتەواوی ئەم قۆناخانەی مێژوودا خوڵقێنەری ڕاستەقینەی کولتوور و زمانی ناوچەکەن. دەشێ تەواوی ئەو کۆمەڵانەی تاوەکو سەردەمی سۆمەریەکان لەناوچەکەدا دەژیان بەکوردە بەرایییەکان ناو ببرێت.

تەواوی بەڵگە مێژووییەکان دەسەلمێنن کە ئەو گروپانەی لەم ناوچەیەدا دەژیان لەو سەردەمەی کە دەستدرێژی و داگیرکاری بێ ئامانی بەخۆیەوە بینی لەمیانەی پەنابردنە بەر چیا و دارستانەکان هەبوونی خۆیان پاراستووە. بەتایبەتیش ئیمپراتۆرە ئاشوریەکان لەزۆربەی زۆری ئەو تەختە بەردینانەی نوسیویانە ئەوە دەسەلمێنن کە شاڵاوی مەزنیان کردۆتە سەرناوچەکە، بەڵام سەرکەوتنیان بەدەست نەهێناوە. ئەمەش ڕەوشێك بوو بەسەر هەموو داگیرکاری و دەستدرێژیەکان هاتووە و بەڵگەکراوە. بێگومان ژمارەی دانیشتوانی ئەو گروپانەی بەرلەمێژوو کەم بوو کە جیاوازیەکی ئەوتۆیان لەگەڵ یەکتردا نەبووە توندوتیژیان پەیڕەو دەکرد، بەچڕی بەرەو نیشتەجێبوونی جێگیر هەنگاویان ناوە؛ ئاشکرایە ئەهێندە بەرەو دەرەوە بەلیان هاوێشتووە. نە ئەو گروپانەشیان پەسەندکردووە کە لەدەرەوە هاتوون تاوەکو شوێنەکانیان لێ زەوت بکات. بەرامبەر ئەمانە تێکنەشکاون. لەبەرئەوەی ناوچەکە دەرفەت بەوە دەدات کە بەردەوام پێشکەوتن و خوڵقکاری بەدیبێت، زەمینە و هەلی ئەوەی ڕەخساندووە گەلەکەی جێنشین بێت و گەورەترین شۆڕشی مێژوو ئەنجام بدات. ئاشکرایە کە کۆمەڵە و کولتوورێك بەردەوام لەنێو ڕەوشی پێشکەوتن و شۆڕشدا بێت، لەسەر ئەم بنەمایە بەهێز دەبن و بەشێوەیەك ڕیشە دادەکوتن کە کەس ناتوانێ ڕیشەکێشیان بکات. تەنانەت تەواوی بەڵگەکانی ئاسەوارناسی ئەم بەردەوامیە پشت ڕاست و ئەرێ دەکەن. جیاوازی نێوان شێوە زاراوەکان لەهەموو زمانێکدا هەیە. تەنانەت کاتێك لەگەڵ شێوە زاراوەکانی زمانی کوردی بەراورد بکرێت، ئەوا دەبینرێ کە جیاوازیەکانیان زۆر قووڵە. سەرەڕای تەواوی داگیرکاریەکان، لەماوەیەکی وەها درێژ خایەنەوە بەردەوامبوونی هاوشێوەیی و لێك نزیکبوونی شێوە زاراوەکان، سەبارەت بەزمانی کوردی و کوردان سەرکەوتنێکی گرنگە.

لێك نزیکبوونی شێوە زاراوەکانی چەندین گروپ کە بۆتە زمانی فەرمی دەوڵەت بەئەندازەی شێوە زاراوەکانی زمانی کوردی نییە. دیسان هۆکاری یەکلاکەرەوەی ئەمەش لەبەهێزبوونی درێژخایەنی زمان و کولتووری شۆڕشی نیۆلیتیك دێت و ئەم ڕاستینەیەش پشت ڕاست دەکات. لەلایەکی دیکەشەوە ئەمە بەو واتایە دێت کە کوردە بەرایییەکان و کوردان هێندە جێگۆڕکێیان نەکردووە و بەجێنشینی ماونەتەوە و بەمجۆرە بۆماوەیەکی درێژ بێگەردی زمان و کولتووری خۆیان پاراستووە. تەنانەت لەڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا گووتنەوەی گەوهەر و ئاوازی هۆنراوەیەکی چوارهەزار ساڵ بەر لەئێستا، گوزارشت لەبەهێزی ئەم زمان و کولتوورە دەکات و دەیسەلمێنێ. ئەگەر داستانی گلگامێش بێت یاخود ئاوازی گیرۆی کچە ئەناسراوەکە بێت ئەم ڕاستینەیە ئەرێ دەکەن. مێژووی دیاریکراوی ئەم شێوازە ئەدەبیاتە بەلانی کەم بۆ

٢٠٠٠ پ.ز دەگەڕێتەوە و لێکچوونێکی مەزنی لەگەڵ ئەم شێوازانەی داستانی کوردی هەیە کە تارۆژگاری ئەمڕۆمان هاتوون. هەروەها سەرچاوەی خوداوەندی ژن ئینانای سۆمەری کە بە زمانی ئەکەدی عەشتارە، ئاشکرایە کە لەوشەی ستار، ستێرك هاتووە، کە تەنانەت ئەمڕۆش لەکولتووری کوردیدا بەواتای خوداوەند، دواتریش "شکۆمەندترین و مەزنترین" دێت. لەکولتووری سۆمەریەکاندا ئەم کولتوورەی خوداوەندی ژن نینهۆرساك ی پێ دەگووترێت، واتە خوداوەندە ژنی ناوچە شاخاویەکان. ئەمەش پەیوەندیەکەی لەگەڵ نەریتی ستێرك ئاشکرایە. تەواوی لێکەرینەکان ئەوە نیشان دەدات کە لەسەردەمی نیۆلیتیکدا خوداوەندەکان لەمیانەی ئەستێرەکانەوە دەکران بەسەمبوڵ. ستێرك لەزمانی کوردیدا هەم بەواتای ئەستێرە دێتە هەم لەبواری کولتووریدا بەواتای گەورەترین دێتە ئەمەش خودی خوداوەندە. بۆ یەکەمین جار کاتێك خوداوەندەکانیان هێنایەئاراوە و ئەستێرەکانیان کرد بەسەمبوڵیان، سەرچاوەکەی بۆ کولتووری کوردان دەگەڕێتەوە، بناخەی تەواوی ئەو ئاینە ئاسمانیانە پێکدێنێت کە دواتر دەرکەوتن.

دەتوانرێ بگوترێ هیچ گەلێك وەکو رەسەن و بنەچەی کوردان، هەم سەردەمی نیۆلیتیکیان نەخوڵقاندووە، هەم هێندە بەفووڵایی تێیدا نەژیاون. ئەم تایبەتمەندێتیە هەم لەبواری ماوە، هەم لەبواری گشتگیری، بەشێوەیەکی هەرە چڕ لەدیاردەی کورددا بەرێوەچووە. کاریگەریەکانی ئەم تایبەتمەندێتیەش تاوەکو رۆژگاری ئەمڕۆمان بەردەوامە. کوردان تەواوی هێز و وزەی خۆیان لەم سەردەمە وەرگرتووە و پێیان بەخشیوە. لەمڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا زۆر بەدواکەوتوویی مانەوەی پێکهاتەی هزری کوردان بەشێوەیەکی سەرەکی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە بەهەڵواسراوی لەسەردەمی نیۆلیتیك ماونەتەوە، هەروەکو بڵێی بەدڵخوازی خۆیان لەوێ هێڵراونەتەوە. بەپێچەوانەی ئەوەی مەزنەندە دەکرێ، تاوەکو ئێستا بەشێوەیەك کاریگەری سەردەمی نیۆلیتیك لەئاستێکدا بەسەر جیهاندا هەیە کە ناتوانرێ بچووك بکرێتەوە. لادێیەتی، وەکو ژیانی ماددی و هزر کۆمەڵگایەکی لەنیۆلیتیك ماوەتەوە. کولتووری کشتوکاڵ تایبەتمەندێتیە سەرەکیەکانی خۆی لەم سەردەمە بەدەست هێناوە.

نەبوونی مێژوویەکی نووسراوەی سەردەمی نیۆلیتیك بەو واتایە نایەت کە ئەو گەلانەی ئەم قۆناخەیان بەخۆوە دیوە بێ مێژوون، بەڵام بەو واتایە دێت کە خاوەنی مێژوویەکی سیاسی نووسراو نین. لەلایەکی دیکەوە مسۆگەرە کە خاوەنی مێژوویێکی دەوڵەمەندی کولتوور و میتۆلۆژی و ئەتنیکین. مێژوو تەنیا خاوەن ناوەرۆکێکی سیاسی و نووسراو نییە. تەنانەت مێژووی راستەقینە و واتادار ئەو مێژوویە کە تەواوی فاکتەرە ماددی و مەعنەویەکانی کولتوور لەخۆوە بگرێت. کاتێك لەم روانگەیەوە تەماشا بکرێت دەبینرێ کە کوردان لەپێشترین گەلی سەردەمی نیۆلیتیکین، لەسەرووی هەمووانەوە خاوەنی ئەو کولتوورەن کە زانیاری خولقکارانە و ئامرازیان پێشخست. هێندە بەفووڵایی کاریگەری کولتووری میزۆپۆتامیا

لەمێژوودا لەم هێزەیەوە سەرچاوە دەگرێت. کوردان بۆ ماوەیەکی درێژ و گشتگیر رۆڵێکی مەزنیان لەپێشکەوتنی مرۆڤایەتیدا بینی کە لەرۆڵی ئەمریکا و یەکێتی ئەورووپای رۆژگاری ئەمڕۆمان زیاترە. واتە شوێنگەیەکی وەهای هەیە کە کولتووری ئەو سەردەمەی خولقاند و لەجیهاندا بڵاویکردەوە. تاکە کەمو کوڕیشیان، نەیانتوانیوە ئەم مێژووە بنووسن. ئەمەش جگە لەوەی مێژووی رەنجی گەلان بەشێوەیەك نانوسرێ کە شایستەی مێژوو بێت، ئەوا لەلایەنی داگیرکار و دەسەڵاتدارەکان بەنەبوو لەقەڵەمدراوە و لەچەواشەکاری رزگاری نەبووە. هیچ زانستێك هێندەی مێژوو لەلایەنی چینی دەسەڵاتدار و چەوسێنەر بەچەواشەکراوی نەنووسراوە. تێپەڕی قۆناخێك دەبین کە لەمیانەی زاڵبوون و کاریگەری رێچکەی زانست، هێندی هێندی مێژووی رەنج و گەلان رۆشن دەبێتەوە و دەنووسرێ. لەم بوارەوە لەمیانەی پەیرەوکردنی شێواز و رێچکەی زانستی رەسەنێتی کورد بەناوەرۆکێکی واقیعیەوە رۆشن دەکرێتەوە و شوێنی شایستەی خۆی دەدۆزێتەوە.

هەر چاودێرێکی رشت کاتێك بەئۆتۆمبێلەکەی بەناوچەکەدا تێپەرێت دەتوانێ بەسەدان گرد لەم بەرو ئەوبەری دیجلە و فوراتدا بژمێرێت، بەتایبەتیش لەئورفا و دیاربەکر و ماردین و ناوچەکانی دەوروبەری. تەواوی ئەم گردۆڵکانەی ئەو گەنجینە راستەقینانەن کە بەلانی کەم مێژووی ١٥ هەزار ساڵیان حەشارداوە. ئەمانە یەکەمین جێنشینی کۆمەڵگای نیۆلیتیکن، ئەو ناوچە و شوێنەوارانەن کە بەدرێژایی تەواوی سەردەمەکان کولتوورەکانی بەسەر یەکتردا کەڵەکە بوون. کاتێك ئەم گردۆڵکانە بکرێنەوە و شیبکرێنەوە، ئەو کاتە دەتوانرێ مێژووی راستەقینە بنووسرێ. بەڵام چەندە جێگای داخە کە ئەم گەنجینانەی کولتوور لەمیانەی جینۆسایدی مێژوو واتە لەرێی سیاسەتی بەنداوەکان نقوومی ژێر ئاو دەکرێن و لەنێو دەبردرێن. رەنجی بەهەزاران ساڵەی مرۆڤایەتی لەپێناو بەرژەوەندی ماددی کورت خایەن تێکدەدرێت. نکوڵیکردن لەو کولتوور و مێژووەی کە بووە لانکەی مێژووی مرۆڤایەتی، هەروەها دەستپێکردن و روون کردنەوەی مێژوو لەمیانەی ئیسلامیەت و مەسیحیەت و یەهودیەت هەروەها بنەماڵەی دەسەڵاتدار و رێکخستنەکانی نەتەوەپەرستی رۆژگاری ئەمڕۆمان بەواتای سووکایەتی و نکوڵی و چەواشەکردنی مێژووی راستەقینە دێت. تەنیا کاتێك ئەم چەمکانەی سەبارەت بەمێژوو بەلاوە بنرێت و کۆتایی پێ بێت دەتوانرێ مێژووی رەنج و گەلان بنووسرێ.

### ب ـ سەردەمی کۆیلەداری و کوردان:

لەم قۆناخەی کە مێژوو بەشێوەیەکی نووسراو دەستی پێکرد، لەبەڵگە نووسراوەکانی سۆمەریەکاندا بەشێوەیەکی بەهێز باس لەوە دەکرێت کە ئەو کۆمەڵانەی بنەچەی کوردان پێك دێنن رۆڵێکی سەرەکییان لەسەر شانۆی مێژوودا بینیوە. تەنانەت لێکۆڵینەوەی ئەم

بەڵگانە لەمیانەی وشیاریەکی گشتی مێژوویش بەسە بۆ ئەوەی دەرك بەوە بکرێت کە سۆمەریەکان هەرە زێدە لەمیانەی ناوهێنانی دراوسێکانیان باس لەکۆمەڵەی بنەچەی کوردان دەکەن. سۆمەریەکان ناوی لەجۆری هۆری، گۆتی، کاسی لەم گروپانە ناوە. کاتێك لەبواری نەژادناسیەوە لێکۆڵینەوەی سەبارەت ئەنجامدرا، ئەوا زۆر بەئاشکرایی دەبینرێ کە باس لەباپیرەی کوردانی ڕۆژگاری ئەمڕۆمان دەکرێت. هۆری بەواتای وڵاتی بەرزاییەکان "چیاکان" دێت، گۆتیەکان بەواتای "کۆمەڵەی گەلی خاوەن گا دێت" (گود - گا تاوەکو ئێستا لەزمانی کوردیدا بەو واتایە بەکاردێت). هەرچی کاسیەکانە گوزارشت لە زەحمەتکێشە هەژارەکانی هەمان کۆمەڵە دەکات کە لەشارەکانی سۆمەریەکان نیشتەجێ بوون، ئەو ناوە لەو توێژانەی شارەکان نراوە کە لەشارەکانی سۆمەریەکان وەکو هێزی کاری هەرزان، فەرمانبەری و پیشەکاریان کردووە و بەشارهێنراون. زۆر باش دەزانرێ تاچ رادەیەك مێژووی سۆمەریەکان لەگەڵ ئەم گروپانە لەناو یەکتردایە. بەتایبەتیش بەرامبەر ئەکەد و بابلیەکانی بەبنەچە سامی هۆزیە شاخاویەکان وەکو هاوپەیمانی سەرەکی گۆتی و کاسیەکانیان بەبنەما گرتووە. هەروەکو چۆن بەیەکەوە بنەماڵەی سەرجۆنی ئەکەدییان رووخاند، بنەماڵەکانی گۆتی و کاسی بۆ ماوەیەکی درێژ شارە سۆمەریەکانیان بەڕێوە بردووە.

کاتێك تەماشای پێکهاتەی کولتوور و زمانی سۆمەریەکان بکرێ دەبینرێ کە تەواوی کەرەستەکان و ئامرازەکانی لەو هۆزیانە وەرگرتووە کە لەکەنارەکانی سەرووی دیجلە و فورات و زاپ سەردەمی نیۆلیتیکان خوڵقاندووە. چەندین پێشگر و ئەندامی مێیەی پێکهاتەی زمانی سۆمەری لەم کولتووورە وەرگیراوە. تەنانەت چەندین داستان و هۆنراوەی سۆمەریەکان، لەبواری ناوەڕۆك و شێوەدا، لەڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا لەنێو کولتووری خێڵە کوردیەکان بەردەوام دەکات. بۆ نموونە داستانی دەروێشی عەبدی سەرچاوەی بۆ ئەو تابلێتانەی سۆمەریەکان دەگەڕێتەوە کە ٢٠٠٠ ساڵ پ.ز نووسراوە. هەمان هۆنراوە لەناوچەی شەنگال لەلایەن کچێکی نەناسراو بە گورۆ ناوبراوە و لەسەر قارەمانێکی گەلەری دەگووترێتەوە. هۆنراوەی گیرۆ کە ٢٠٠٠ ساڵ پ.ز نوسراوە، لەگەڵ داستانی دەروێشی عەبدی ئەمڕۆمان، لەلایەنی وشە و شێوەیەوە بەشێوەیەکی سەرنج ڕاکێش لەیەکتر دەچن. چەندین بەڵگەی لێکچووی هاوشێوەی ئەمە دەبینرێ.

هەوڵدرا پەیوەندی کولتووری ئینانا ـ عەشتار لەگەڵ ستێرك پێناسە بکرێت، داستانەکانی گلگامێش و تۆفانی نووح تایبەتمەندێتی لێکچوو لەخۆوە دەگرن. لەڕاستیدا ئەگەر بەقوولاییەکی زیاتر تەماشا بکرێت، هەروەکو چۆن لەڕەوش و شوێنگەی ئێراقی ڕۆژگاری ئەمڕۆمان دەرکی پێدەکرێت، مێژووی سۆمەر لەمیانەی پێکدادان و ڕێککەوتنی هەمەجۆری نێوان هۆزیە ئاریانیەکان و ئامۆزیە سامیەکان هاتۆتە ئاراوە. هەرچەندە یەکەمین کۆمەڵە سۆمەریەکان بەگوێرەی خۆیان پێکهاتەیەکی زمانیان پێشخستووە، بەڵام گەورەترین سەرچاوەی ئەم زمانە بڕە لەو وشانەی سەرچاوەکەیان ئاری و سامین. هەروەها دواتر

لەناوچوونی ئەم زمانە بۆ هەڵگشانی ئەو شارستانییەتانەی دەوروبەری دەگەڕێتەوە کە بەبنەچە هۆری و ئامۆرین. راستتر ئەوەیە کاتێك ئەم دوو گروپە کولتوورییە بۆ قۆناخی شارستانییەتی چینایەتی هەنگاویان هاویشت، جیابوونەوەی سۆمەرییەکان روویدا، ئەم گروپانەش لەمیانەی گۆڕانیان بۆ بنەماڵەی سەردەستی ئەم دوو گروپە درێژەیان بەهەبوونی خۆیان دا. لەنێو ناچن، بەڵکو لەژێر سایەی دەسەڵاتی بنەماڵەی خاوەن پێکهاتەی لاو و کولتووری و جیاواز ناچاربوون بەردەوامی بەهەبوونی خۆیان بدەن.

تەنانەت ئەم پێناسە کورتەش نیشانەدات کە تارادەیەکی مەزن مێژووی سۆمەرییەکان لەگەڵ دراوسێ هۆرییەکانیان تێکەڵە کە پەیوەندی بەهێزیان لەگەڵ کوردان سەلمێنراوە. مێژوویێکی هاوبەش جێگای باسە. بەمجۆرە گرنگترین سەرچاوەی مێژووی کورد لەگەڵ مێژووی سۆمەرییەکان بەناوییەکدا چووە کە مێژووی نووسراویان دەست پێکردووە. تەواوی فاکتەرە کولتوورییەکانی لەچیاوە هاتووە و پەیوەندییەکانی وململانێی بەرجەستەیان و کاریگەرییەکانی ئەم مێژووە لەسەری، لەهەمان کاتدا مێژوویێکی بنەچەی کوردانیشە.

پێشکەوتنەکانی گرێدراو بەمێژووی سۆمەر لەسالانی ۲۰۰۰ پ.ز گەشەکردنێکی زیاتر بەدی دێنێ. قۆناخی فەبوونی سۆمەرییەکان بۆ دەرەوەو پێشخستنی کۆلۆنییەکان لەم مێژووەدا خێرا دەبێت. سەرچاوە دەوڵەمەندەکانی کانزا و داستان، پێویستی ئەوە دێنێتە ئاراوە کە زوو لەم ناوچانە کۆلۆنی ئاوا بکرێن و شالاو رێکبخرێت. گرنگترین کۆلۆنی سۆمەرییەکان لەنێوارەکانی دیجلە و فورات، لەرێگاکانی بازرگانی، لەو ناوچانە ئاوا دەکرێن کە کانزا و کەرەستەکانی لێ زۆرە. نورفا، حەران، کارگامیش، سامسات، کانش: نۆرکیش، نوزی لەسەرووی هەموویانەوە، ئەو شارە کۆلۆنیانەی ئاواکران پێ بەپێ فەبوونی ناوچەی بەرووی شارستانییەت لەگەڵ خۆیدا هێنا. ئاواکردنی شار، قۆناخێکی نوێ دەست پێدەکات. شانبەشانی ئەو جیابوونەوەی چینایەتی کە لەهەناوی کۆمەڵگای کشتوکاڵیدایە، بەشاربوون و بەدەوڵەتبوونیش پەرە دەسەنێ. دوای خوارووی میزۆپۆتامیا، سەرەتا بڵاوبوونەوەی شارستانییەت تەواوی میزۆپۆتامیا دەگرێتەوە. لەدوای سالانی ۲۰۰۰ پ.ز قۆناخی شارستانییەتی خۆجێیی دەست پێدەکات. شارە کۆلۆنییەکان هەریەکەیان دەبێتە نیمچە دەوڵەتی شار. لەدوای سۆمەرییەکان ئەو کۆمەڵەی هەرە زێدە دەناسرێ واتە هۆرییەکان لەمیانەی مۆدێلی سۆمەرییەکان شارستانییەتیان هەرسکرد. لەگەڵ کۆنفیدراسیۆنە بەرفراوانەکانی خێڵەکان، هێدی هێدی بە پشتبەستن بەناوەندی شارەکان دەربازی پێکهاتەی دەوڵەتی ناوەندی دەبن. نوزی و نۆرکیش یەکەم ناوەند پێکدێنن. هەروەها نورفا وەکو ناوەندێکی گرنگ دەردەکەوێتە سەرشانۆی مێژوو. نۆرکیش شاری عامودەی رۆژگاری ئەمڕۆمانە کە دەکەوێتە سنووری سوریا ـ تورکیا. یەکەمین پایتەختەکانی هۆرییەکان ئەم شارانەن. زۆر بەسانایی لەپەڵگەی سۆمەری و هیتیتەکانی دراوسێیان دەرك بەوە دەکرێت کە لەماوەی نێوان ۲۰۰۰ ـ ۱۵۰۰ بوونەتە هێزێکی سیاسی گرنگ.

ئەو هێرشانەی سۆمەریەکان و بابلیەکان، یاخود هیتیتەکان کردوویانەتە سەر ئەم ناوچەیە، لەمیانەی بەرخودانی بەهێزەوە بەرەنگاریان دەبنەوە و تێکدەشکێنرێن. کاتێک هێزی سیاسی و سەربازی نەبێت ئاستەمە ئەم جۆرە بەرخودانانە ئەنجام بدرێت. لەقۆناخەکانی دواییدا گەلێک بەڵگە بینراونەتەوە کە بەزمانی هۆریەکان نووسراوە. ئەو بەڵگانەی لەشارەکانی نوزی، ئۆرکیش و هیتیتەکان دۆزراونەتەوە، زانیاری بەرفراوانی سەبارەت بەهۆریەکان تێدایە. ئەوە رەچاو دەکرێت کە هۆریەکان بەردەوامی ئەو کۆمەڵانەن کە ٦ هەزار ساڵ پ.ز شێوەیان بەکولتووری تەل خەلەف داوە و نیۆلیتیکیان بەدەزگا کرد. ئاماژەمان بەوە کردبوو کە بۆ یەکەمین جار ٢٠٠٠ پ.ز هۆریەکان لەلایەن سۆمەریەکان بەهۆری ناوبراوان کە بەواتای "شاخیەکان" دێت. مەزەندە دەکرێ کە ئەو گۆتی و سەباری و کاسییانەی دواتر ناویان لێنرا. لەسەردەم و شوێنی جیاوازدا زمان و کولتووری هاوبەشیان هەبووە و ئەمەش بەپێی تێپەڕبوونی کات یەکلابۆتەوە. ناوە هەمە جۆرەکانی ئەمڕۆ لە یەکینەی خێڵەکان نراوە بەو واتایە نایێت کە بۆ هەمان گرووپی گەلەری ناگەڕێنەوە و تایبەتمەندێتی هاوبەشیان نییە.

پێکهاتەی زمانی هۆری ئاری یە. ئەمەش سەلمێنراوە کە زۆربەی وشەکانی بۆزمانی سۆمەری گوازراوەتەوە، بەتایبەتیش ناوی دانەوێڵە و ئاژەڵەکان. بەڵام ناوەکانی حوشتر کە بە کەشتی بیابان دادەنرێ ریشەکەی سامییە. سۆمەریەکان گەلێک ناوی ئامرازەکانی کشتوکاڵیان لەهۆریەکان وەرگرتووە. زۆر بەساناییی دەتوانرێ بانگەشەی ئەوە بکرێت کە هۆریەکان لەبواری ئایدیۆلۆژی کاریگەریان کردۆتە سەر سۆمەریەکان، لەم چوارچێوەیەشدا گەلێک زاراوەی میتۆلۆژی بۆ سۆمەریەکان گواستراوەتەوە. هەروەها ئەو چەمکە میتۆلۆژی و خودا ئاسیانەی پشت بەئاسمان دەبەستێ سەرچاوەی خۆی لەکولتووری هۆریەکان وەردەگرێت. ئەمانەش رەنگدانەوەی گوزارشتی یەکسانی و ئازادی نیشان دەدەن. چونکە هێشتا جیابوونەوەی چینایەتی نەناسیوە. هەروەها تایبەتمەندییەکانی خوداوەندی دایک بەربڵاوبووە. راهیبە سۆمەریەکان ئەم ئامرازە ماددی و مەعنەوییانەیان تێکەڵ بەیەکتر کرد و لەو شارانەی بە"ئور" ناو دەبرێت سەنتێزێکیان دروست کرد و سەرکەوتن لەوەی بیکەن بەبناخەی کۆمەڵگای چینایەتی. دەتوانین بڵێین: پەرستگای راهیبە سۆمەریەکانی ئور، ئەرکی ئەو مندالدانەیان بینی کە یەکەمین کۆمەڵگای چینایەتی و دەوڵەتەکەی تێدا خوڵقێنرا. پەرستگاکان ئەو کارگە راستەقینانەن کە دەوڵەتی تێدا خوڵقێنرا. بۆیە هیچ کاتێک ناشێ دەوڵەت بەتەواوی عەلانی بێت. چونکە ئایین لە بۆهێڵ و هەوێنەکەیدا هەیە. ئەگەر ئایین جیابکەینەوە و لەلایەکی دابنێین، شتێک بەناوی دەوڵەت لەئارادا نامێنێ. بێگومان کاتێک باسی ئایین دەکرێت، پێویست دەکات بەیەکەوە بیر لەتەواوی یۆتۆپیا ئایدیالیستی و دۆگماکان

بکرێتـەوە. بەدەوڵـەتبوون باڵابوونێکی مـەزنی سۆمەریەکان بـەدی دێـتێ و قۆنـاخی کۆڵۆنـی ناوچەی هۆریەکان دەست پێدەکات.

کەواتـە کۆڵۆنیگەرایی بـەواتای داگیرکاری کلاسـیکی، نزیکـەی لـە ٢٠٠٠ سـاڵ پ.ز تـاوەکو رۆژگاری ئـەمرۆمان خاوەنی مێژوویەکـی نـەفرەت لێکـراوە. فشـار، نـامۆبوون و چەوسـانەوە بەیەکەوە لەکۆڵۆنیەکان لەناو یەکتردا بەرێوە دەبرێت. لەقۆناخی خانەدانی بابلی کە بەرپشە نامۆرین و دوای سۆمەریەکان دەسەڵاتیان گرتـە دەست، لەمەملەکەتی هۆریـەکان بەتایبـەتیش لەناوچەی ئورفا کۆڵۆنیبوون خێرا بوو. وەکو کاردانەوەیـەك بەرامبـەر ئەمـە، رکابەرایەتیەك پێشدەکەوێت کە لـەمێژوودا نـاوی پێغەمبەرایـەتی یە. ئەمـەش لەلایەنێکەوە بـەو تێکۆشـانە دەچێت کە لـەرۆژگاری ئـەمرۆماندا رۆشـنبیران بەرامبـەر بـە ئیمپریـالیزم و بـەکرێگیراوێتی ئەنجامی دەدەن. لەم لایەنەوە بۆ یەکەمین جار لەمێژوودا ئورفا بـە رێبەرایـەتی پێغەمبـەران، بەتایبەتیش لەسەر راستەرێی ئەو کولتـوورەی کە حـەزرەتی ئیبراهیم بووە بەسـەمبوڵەکەی بەرامبـەر بـەکۆڵۆنیالیزم رۆڵـی نـاوەندێك دەبیـنێ. نوێنـەری کۆڵۆنـی ئـەم قۆناخـە بەنـەمرود ناودەبرێت. تێکۆشانی حەزرەتی ئیبراهیم بەرامبـەر بـە نـەمرود، لەگەوهـەری خۆیـدا بـەواتای تێکۆشـانی ئازادی و بـەرخودانی گرووپی گەلـە خۆجێیـەکان دێـت بەرامبـەر بــە نوێنـەرەکانی ئیمپریالیستی کۆیلەداری سۆمەر و بابل.

تیرە هۆری و ئامۆریەکانی بەبنەچە ئـاری و سامی کـە هێشـتا بەشارستانییەتی چینایـەتی ئاشنا نەبوون ئەم تێکۆشانەیان هەندێ جار بەیەکەوە، هەندێ جاریش جیاجیـا ئـەنجامدەدەن. لـەکولتووری ئیـبراهیمدا کاریگـەری کولتـووری هـەردوو گــروپ لــەناو یــەکتردا دەبیــنرێ. لەبەرئەوەی لەم قۆناخەدا تاوەکو ساڵانی ٢٠٠٠ ـ ١٢٥٠ پ.ز ئورفا و دەوروبەرەکـەی دووریەکـەی لەسۆمەری و بابلیەکان و میسری و هیتیتەکان وەکو یەك بوو، زەمینەیەکی لەبار بۆ تێکۆشانی ئازادی دەرەخسێنێ. لەراستیدا پێغەمبەرایـەتی رەنگدانـەوەی ئایدیۆلۆژی ئـەو شوێنگە لـەبارە جوگرافی و ئابوورییەکەی بەرخودانە. یەکەمین جوڵانەوەی شکاندنی بتەکان بـەواتای یەکـەمین لێدان دێت کە لەئایینی کۆیلایەتی دراوە، هەربۆیـە رۆڵە مێژووییەکـەی مەزنـە. تائـەم رادەیـە بەناوبانگی نەریتی ئیـبراهیمی سـەرچاوەی خۆی لەئـەنجامدانی ئـەم یەکـەمین هـەنگاوە دێت. دواتـر مێژوو ئـەم نەریتـە پـێرەو دەکـات و تـاوەکو حـەزرەتی محەمـەد وەکـو زنجیرەیـەکی پێغەمبەران دەبێتە خاوەن رێبازێکی جیاواز. ئورفا یەکەمین ناوەندی پیرۆزی ئـەم مێژووەیـە. دواتر بەگوێرەی ریزبەندییەوە قودس و مەککە ئەم رۆڵە دەبینن.

دەتوانرێ کاریگەری و باڵادەستی سـۆمەریەکان لـەم لایەنـە ببیـنرێ دوای ئـەوەی لەمیانـەی بونیادی میتۆلۆژییان پێکهاتەی سەرخان و کۆمەڵگایان بەشێوەیەکی باش پێشخست. هۆریـەکان بەو گەل و کولتوورە دادەنرێـن کە بـۆ یەکـەمین جـار میتۆلۆژیـای سۆمەریان بـۆ کولتوورێکـی گەلەری خۆجێیی گۆڕی و خوداوەندە مەزنەکانی سۆمەر خوداوەندی ئاسمان ئەن، خوداوەنـدی

زەوی ئەنکی و خوداوەندە ژن ئینانا کەببوونە خاوەن ناسنامە، لای هۆریەکان گۆڕا و بووە ئانو، کومباربی ـ تەشوب و هەپات. هیتیتەکانیش ئەم ناوانەیان وەکو خۆی لەهۆریەکان وەرگرتووە. لەکاتێکدا ئەمانە لەلای گریکەکان بەشێوەی زیۆس، ئاپۆلۆ و ئافرۆدیت خوجێیی کراون، رۆمانیەکانیش لەژێر ناوی ژۆپیتەر و ڤینۆس بەگوێرەی هەلومەرجی خۆیان گونجاندوویانە. بەکورتی مێژوو وەکو ئەڵقەکانی زنجیرەیەك لەبواری میتۆلۆژیشدا گۆڕانکاری بەسەردا دێت و بەردەوام دەبێت.

سەبارەت بەکولتووری سۆمەرییەکان، هۆرییەکان یەکەمین ئەڵقەی سەرەکی ڤەبوونن بەرەو ئەنادۆڵ و قەفقاسیا و لەرێی باکووری رۆژئاوای ئێرانیش بەرەو ئاسیا. هەروەکو چۆن ئەو کولتوورەی کۆڵەکەی هۆریەکان بوو بەهەزاران ساڵ کولتووری نیۆلیتیکی بڵاوکردەوە، ئەوا لەمیانەی بەرجەستەکردن و بەجێکردنی کولتووری سۆمەرییەکان بەگوێرەی هەلومەرجی واقیعی خۆی، بووە ناوەندێکی بڵاوبوونەوە بۆ دەرەوەی خۆی. لەکاتێکدا دواتر لەساڵانی ۱۷۰۰ ی پ.ز ئەریتی ئیبراهیمی خرایە سەر ئەم تایبەتمەندییەی، لە ۱۵۰۰ پ.ز باوەڕی مەزدا لەرۆژهەڵات پێشدەخات؛ دوای ئەوەی هەروەکو ئەوەی حەزرەتی ئیبراهیم ئەنجامی دا ئەوا زەردەشت پش لەمیانەی ئەنجامدانی ریفۆرم لەباوەڕی مەزدا دا بناخەی رەوتێکی دیکەی پێغەمبەرایەتی دادەنێت. تایبەتمەندێتی نیۆلیتیکی کە لەبناخەی کولتووری ئاوچەکەدا هەیە، زەمینەی ماددی ئەم ریفۆرمانەی پێغەمبەران پێکدێنن. هەروەها کولتووری خوداوەندی سەردەمی نیۆلیتیك کە دۆستی مرۆڤە و پارەستیدەرێتی بەرامبەر بەخوداوەندە زاڵم و سزادەرەکانی سۆمەری و بابلیەکان، کاریگەرییەکی مەزن دەکاتە سەرچەمکی نوێی خوداوەندی. بەشێوەیەکی سەرەکی ئەریت یاخود ئایینی زەردەشتی و ئیبراهیمی وەکو ئەزموونێکی ریفۆرم لەمیانەی چەمکی خوداوەندی سیستەمی نیۆلیتیك لەبەرامبەر سیستەمی خوداوەندی سۆمەر و میسر لەدایك بوو کە کۆیلایەتی دەسەپێنن. زیاتر لەخۆوەگرتنی تایبەتمەندێتی نزیك بەمرۆڤ و کولتووری خۆجێیی و رەنج و بەخشندەیی و میهرەبانیان شوێنپەنجەی خوداوەندی ژن لەخۆوە دەگرێت کە پشتیان پێ بەستووە. لەدوای قۆناخی تێپەڕبوونی ماوەی نێوان ٤۰۰۰ ـ ۲۰۰۰ پ.ز کە باوەڕی خوداوەندی ژن لەقۆناخی سۆمەرییەکان لەنێو ململانێی ئینانا ـ ئەنکی دایە لەگەڵ میتۆلۆژیای بابلی، دوای ساڵانی ۲۰۰۰ پ.ز لێدانێکی کوشندەی بەردەکەوێت و تاوەکو رۆژگاری ئەمرۆمان نەهاتۆتەوە سەرخۆ. لەراستیدا ئەم نکوڵیکردنە سەرچاوەی خۆی لەوەوە دەگرێت کە پێ بەپێ رۆڵی ژن لەکۆمەڵگادا سنووردار دەکرێت و دەکرێت بەمقووڵترین دەزگای کۆیلایەتی.

وەکو دوا بابەت، دەتوانرێ گەلێك بەڵگە بژمێردرێ سەبارەت بەوەی هۆرییەکان باپیرەی کوردانی رۆژگاری ئەمرۆمانن. لێکچوونی پێکهاتەی زمان لەسەررووی هەموویانەوە دێت. تاوەکو ئێستاش چەندین وشە بەکاردەهێنرێن کە لەهەمان ریشەوە هاتوون. ئەو بەڵگانەی

لەئاسەوارەکان بەجێیان هێشتووە، ئەوە نیشان دەدەن کە لەسەردەمی " هەزارەی پێش زایین تاکو ئێستا بەردەوام دوو کولتوور لەم ناوچەیەدا هەبوون. هیچ تۆمارێکی بەمجۆرە نییە کە لەئەنجامی شەپۆلێکی جەستەیی دەرەوە لەنێوچوو بن. بەپێچەوانەوە تەواوی شارەزایانی مەیارەت بەم بابەتە هاوبیرن لەسەر ئەوەی یان لەمیانەی پێکدادان لەگەڵ دراوسێکانیان یاخود بەرێککەوتن لەگەڵیان درێژەیان بەهەبوونی خۆیان داوە. هەروەکو لەتەواوی کۆمەڵگاکان روودەدات، لەتەواوی قۆناخەکانی وەرچەرخانی مێژوودا گۆرانکاری مەسەلەیەکی چاوەروانکراوە. ئەمەش بەو واتایە نایێت کە لەنێوچوون یاخود بەتەواوەتی گۆڕاون. لەنێو هەر گروپێکی کولتووریدا جیاوازی ناو و شێوە زاراوەی زمان هەیە. لەوانەیە لەم لایەنەوە کولتووری گروپە هۆریەکان یەکێك بێت لەو کولتوورانەی تارۆژگاری ئەمرۆمان بە بێگەردی ماوەتەوە. هۆریەکان بەشێوەیەکی چڕ وەکو خێڵ درێژەیان بەهەبوونی خۆیان دەدا. داگیرکاریەکانی لەدەرەوە دەهاتن و تایبەتمەندیەکانی کۆمەڵگای نیۆلیتیك کاریگەرییان لەمەدا هەبوو. ئەمەش دەزانرێ کە وەکو چەندین کۆنفدراسیۆنی خێڵەکان بوون بەنێو دەوڵەتێك. لەنموونەی تۆرکیش، نوزی، ئورفا و سامسات روون دەبێتەوە کە ماوەیەك دوای کۆلۆنی سۆمەریەکان خاوەنی دەوڵەتی ـ شار ناوەندی بوون. هەروەها ئەمەش بەرچاو دەکەوێ کە وەکو سۆمەر، میسر و هیتیتەکان نەبوون بەهێزێکی ئیمپراتۆری ناوەندی.

جگە لەتەنگەتاو بوونیان بەرامبەر بەباڵادەست بوونی هیتیتەکان، گەلێك جاریش لەنێو یەکێتی و رێککەوتن دا بوون. لەم قۆناخەدا لەساڵانی ١٥٠٠ پ. ز بەدواوە گروپێکی دیکەی خزم یاخود وەکو بنەماڵەیەك لەجیاتی هۆریەکان، میتانیەکان دەردەکەونە پێش.

دوای ئەم قۆناخە مێژووییە میتانیەکان جێگای خۆیان لەسەر شانۆی مێژوو گرت، ئەمەش بەسوود وەرگرتن لەو بۆشاییە بوو کە لەئەنجامی هاوپەیمانێتی هیتیتەکان لەگەڵ هۆریەکان هاتە ئاراوە و نزیکەی ساڵانی ١٦٠٠ پ.ز کۆتایی بەقۆناخی گەشەسەندووی ئیمپراتۆریەتی بابلی هێنا. پایتەختەکەیان " خۆشکانی " بوو کە دەکەوێتە نزیکەی سەرچاوەی خاپوور، هەروەها شیمانە دەکرێت لەناوچەی "سەرێ کانی" رۆژگاری ئەمرۆمان ناواکراوە، هەروەکو دەردەکەوێ زمانێکی هاوشێوەی زمانی هۆریان بەکار دەهێنا. ئەوانیش سەر بە گروپی زمانی ئارین. ئەمەش لەمیانەی بەڵگەکانی ئەو رێککەوتنانە روون دەبێتەوە کە لەگەڵ هیتیتەکانیان ئەنجامدا و ئەو نامانە دیارە کە بۆ فیرعەونەکانی میسریان ناردووە. لەخوارووی رێککەوتننامەکان کە لەگەڵ هیتیتەکانیان ئەنجامداوە ئیمزاکردنیان بەناوی خوداوەند ئارونا و ئەندرا و میترا و ناساتینا دەسەلمێنێ کە میتۆلۆژیا و ئایینی گروپی هیندۆ ـ ئەوروپیان بەبنەماگرتووە. ئەمەش ئەوە نیشان دەدات کە هۆری و هیتیت و میتانی و لوویەکانی باشووری رۆژئاوای ئەنادۆڵ خاوەنی زمان و کولتوورێکی لێکچوون. هەرچەندەی گۆڕان بۆ خۆجێیی قووڵ دەبۆوە جیاوازیش زیادی دەکرد. هەروەها کولتووری نیۆلیتیکی لە

سەرچاوەکەیان دا هەیە کە بەناری ناوبراوە. بەمەرجێک لەلایەکەوە لێکچوون لە زیادبووندایە و لەلایەکی دیکەشەوە جیاوازی تێکەڵاو و بەناوییەکداچوو لەئارادایە. کاتێک ئەم گروپە گەلەریانەی هەن لەناوچە جیاوازەکانی ئەم کولتوور و زاراوانە بەراورد بکرێن، دەبینین کە پەیوەندی میتانییەکان لەگەڵ پادشا میسرییەکان لەئاستی دەوڵەتدا بووە، خەڵاتیان لەنێوان خۆیاندا ئاڵوگۆڕ دەکرد، پەیوەندییەکی هاوشێوەی ئەمەیان لەگەڵ هیتیتەکانیش هەبوو.

لەدوای رووخانی ئیمپراتۆریەتی بابلی رۆڵی بیروکراسیەتی کاسیەکان زیاد دەبێت کە بەرپیشە هۆرین. بەجۆرێک بەرێوەبەرایەتییەکی هاوبەشی بابلی ـ کاسی پەیرەو دەکرێت. خانەدانەکانی گروپە ئاشوریە بەرپیشە ئامۆریەکان کە بەر لە ۲۰۰۰ پ.ز لەباکووری بابل لەبواری بازرگانی هەڵکشا، لەساڵانی ۱۳۰۰ پ.ز بەدواوە دەربازی قۆناخی باڵادەستیەکی بەهێز دەبن. لەبەرئەوەی لەگەڵ میتانیەکاندا بەناوییەکداچوون، قۆناخێکی ململانێ لەنێوانیاندا دەست پێدەکات. ئاشوریەکان نەیاندەخواست رکابەرێک لەبەرامبەر خۆیاندا ببینن. لەوەش گرنگتر میتانیەکان بەسەر رێگاکانی بەرهەمە کانزاییەکان و دارستانەکان زاڵ بوون و سەرپەرشتیان دەکرد کە سەبارەت بەئاشوریەکان گرنگیەکی ژیانی هەبوو. میتانیەکان تەواوی ئەم ناوچانەیان کۆنترۆڵ دەکرد کە دەکەوێتە نێوان چیاکانی زاگرۆس و ئامانۆس. سەبارەت بەسوارچاکی شارەزابوون کە لەساڵانی ۱۵۰۰ پ.ز وەکو تەکنیکێکی شەڕ جێگای خۆی لەسەرشانۆی مێژوودا گرت. ئاشکرایە کە هێزی خۆیان لەو تەکنیکە دەگرت کە مێژوو دەگۆڕێت. دوای ئەوەی بۆ ماوەیەکی درێژ لەگەڵ هیتیتەکان و ئاشوریەکان لەنێو شەڕدا بوون و ئەو فیدراسیۆنە خێڵەکیەی بەردەوام لەمیانەی خیانەتەوە پارچە دەبوو ریزیان دەگۆڕی، لەساڵانی ۱۲۵۰ پەرتەوازە بوون. هێزی ئاشوریەکان لەناوچەکەدا پێشکەوتووە. دوای ئەوەی لەساڵانی ۱۲۰۰ پ.ز تەروادەی بەناوبانگ لەلایەن هێلینیەکان دەستی بەسەردا گیرا، هیتیتەکانیش دووچاری هێرشی قەومەکانی دەریا هاتن و پەرتەوازە بوون، لەرۆژئاوای ئەنادۆڵ قۆناخی فریگیەکان دەست پێدەکات. لەباشووریش لوویەکان گروپ گەلێکی بەهێزن. بەڵام دوای ئەوەی ئاشنایەتییان لەگەڵ ئاسن پەیدا کرد، هێلینیەکان سەرەتا لەناوچەی ئیگە، دواتریش لەتەواوی دەریای رەش و دەریای سپی و کامپادۆکیا باڵادەستی و کولتووری خۆیان بڵاو کردەوە. ئەم قۆناخە لە ۱۰۰۰ پ.ز دەست پێدەکات تاوەکو سەرەتای سەدەی بیستەم بەردەوام دەکات کە لەلایەن تورکەکان لەئەنادۆڵ بەدەردەنرێن.

هەروەکو سەردەمی سۆمەریەکان، هێلینیەکانیش تەواوی رۆژهەڵاتی دەریای سپی و ئەنادۆڵ لەمیانەی سیستەمێکی نوێی ناولێنان ناودەبەن. ئەم کولتوورەش پاشماوەکانی هیتیت و لیدیەکان و فیرگیەکان و لوویەکان لەناو خۆیدا دەتوێنێتەوە. لەراستیدا هێلینیەکان بەشێکی مەزنی گەوهەری کولتووری خۆیان لەنیۆلیتیک و فینیقیەکان وەرگرتووە. لەجیاتی خوڵقکاریەکی تایبەت بەخۆیان، زیاتر رەوشی کۆکردنەوە و سەنتێزگەراییان لەپێشە.

دراوسێکانی ئەوبەری رۆژهەڵات ئەرمەنیەکانی لەم قۆناخەدا هایاس یان پێدەگووترا ئەو کوردانە بوون کە بەکۆمەڵگەدا ناودەبران. هەرلەم سەردەمەشدا ناوچەکە ناوی میزۆپۆتامیای پێنرا. کۆمەڵگەدا ناوچەکانی ئادیامان، مەلاتیا، ئەلازخ، مەرەش، عەنتاب و ئورفای رۆژگاری ئەمرۆمان بووە و بەواتای گەلی جووتیار و شوانکار دێت. لەڕاستیدا وشەکانی "کۆم" و "گەمن" و "گەل" بەڕیشە زمانی کوردین. لێرەدا دیسان ئەوەی بەردەوام رووبەڕوومان دەبێتەوە هێلینیەکان بەگوێرەی دیالەکتیکی خۆیان کردوویانە بەیەك. هەروەکو دەزانرێ، " کۆم" ئەمرۆ لەزمانی کوردیدا بەواتای رەشماڵ بەکار دەهێنرێ کە گروپە نیو جێ نیشینەکانی بەجووت و شوانکاریەوە خەریکن. "گەمن" و "گەل" بەواتای رەچەڵەك و گەل دێت. کاتێك ببێت بەیەك بەواتای گەلی لادێی ـ شوانکار دێت. ناوی هۆری و گۆتی کە سۆمەریەکان پێشیان خستبوو، لەلایەن هێلینیەکان گۆڕانیان بەسەردا هات و کرا بەکۆما گەمەس و میزۆپۆتامیا. لەگەڵ هەڵکشانی میدیا و پارسیا قۆناخی ململانێیەکی مەزنی رۆژهەڵات و رۆژئاوا لەڕێی ئەنادۆڵەوە دەست پێدەکات.

بەرتەوازەکردنی میتانیەکان لەلایەن ئاشوریەکانەوە، لەناوچەکەدا رێگای لەپێش فیدراسیۆن و هاوپەیمانێتی نوێ کردەوە. لەم چوارچێوەیەشدا سەرەتا فیدراسیۆنی "ئەنیری" دەرکەوت. لەبەرئەوەی ئاشوریەکان دۆڵەکانی دیجلە و فورات و زاپ یان بەوڵاتی ناو ناودەبرد، بە "گەلی ناو" ناوزەد دەکران. نائیریەکان لەسەدان گروپی خێڵەکی پێکدەهاتن و گەلێك فیدراڵیەتیان بەخۆیانەوە بینی. چونکە چەندین جار ئاوا دەکران و بەخێراییش پارچە دەبوون. هەرچەندە ئاشوریەکان سەرپەرشتیان دەکردن. بەڵام بەشێوەیەکی تەواو نەیاندەتوانی بەسەریاندا دەسەڵاتدار بن. بەڵگەی ئاشوریەکان ئەوە روون دەکەنەوە کە نائیریەکان هەندێ جار سەرهەڵدانیان دەکرد و بۆناوچەکانی یاخیبوون پاشەکشەیان دەکرد. لەنووسینە بەردینەکانی ئاشوریەکان تێدەگەین کە یاخیبوونە خەرەکیەکانی خێڵە کوردیەکان لەم سەردەمەشدا هەبوو.

ئەم یەکێتیەی عەشیرەتان کە بە نائیری ناو دەبرێن لەساڵانی ۹۰۰ پ.ز بەناوی ئۆرارتۆ و وەکو دەوڵەتێك دێنە سەر شانۆی مێژوو. ئۆرارتۆییەکان نزیك بەشاری "وان"ی رۆژگاری ئەمرۆمان پایتەختێك بەناوی توشپا ئاوا دەکەن، لەناستی میتانیەکاندا بەرفراوان دەبن. لەبواری کانزاو سواریدا خاوەنی تواناکاریەکی بەرفراوانن. یەکەمین جار لەمێژوودا درێژترین جۆگەلەی ئاو لەگورپنار تاوەکو نزیکی وان دروست دەکەن ـ نزیکەی ۵۲ کیلۆمەترە ـ تاوەکو رۆژگاری ئەمرۆمان سوود لەم جۆگەلەیە دەبینرێ. هەروەها لەبەڵگە مێژووییەکاندا بۆمان روون دەبێتەوە کە چەندین قەڵا و بەنداو و شاریان ئاواکردووە. ئۆرارتۆییەکان لەباکوور تاوەکو چیای ئاگری درێژبوونەتەوە. وەکو گەلێکی سەرەکی لە خالیدیەکان پێکدەهات کە بەردەوامی هۆریەکانن و مەزندە دەکرێ خزمایەتیان لەگەڵ ئەرمەنیەکان هەبێ. زیاتر

بەرپشە هۆرین. وەك زمانی فەرمی زمانی ئورارتۆیی نزیك ـمزمانی هۆری و زمانی ئاشوری بەکار دێنن. هەروەکو چۆن لەرۆژگاری ئەمرۆماندا ئینگلیـزی زمانی دیپلۆماسیە و تاوەکو ئێستا لەزۆر لەکۆلۆنیە کۆنەکاندا بەکار دەهێنرێ، هەروەها زمانی ئەکەدی کەکۆڵەکەی زمانی ئاشوریە بۆ قۆناخێکی درێژخایەن زمانی هاوبەشی دیپلۆماسی و کولتووری ناوچەکە بوو. زمانی ئاشوری درێژە بەم نەریتە دەدات. هەرچی دوای رووخانی ئاشووریەکانە، زمانی ئارامی درێژە بەم نەریتە دەدات. بەڵام ئەو زمانەی عەشیرەتەکان بەکاریان هێناوە بەردەوام زمانی زگماکی خۆیان بووە. بەڵام چینی سەردەستی بەکرێگیراو زمانی فەرمی قۆناخ بەکاردێنن. لەهەر سەردەم و ناوچەیەك قۆناخی هاوشێوەی ئەمە بەرێوەچوون. لەکاتێکدا گەلان هەبوونی زمان و کولتووری خۆیان نەخۆوە دەگرن، بەکرێگیراوەکان زمان و کولتووری بیانی داگیرکار و دەسەڵاتدارەکان بەکار دێ ـن. هیتیت و میتانی و عیبرانی و دەوڵەتە تازە پێگەیشتووەکانی هاوشێوەیان بەشێوەیەکی گشتی کاریگەری کولتووری میسری و سۆمەریەکانیان لەسەرە و بنەماڵە باڵادەستەکانیان بەکارهێنانی زمانی فەرمی ئەم کولتوورانە وەکو پایەدار بوونێك هەڵدەسەنگێنن. لەرۆژگاری ئەمرۆشماندا قۆناخی هاوشێوەی ئەمە تاوەکو ئێستا کارایە. بەرامبەر بەمەش گەلان هەم حەشارگەی زمان و کولتووری نەتەوەیین هەم دەیگوازنەوە.

میتۆلۆژیای ئورارتۆیەکان بەردەوامی میتۆلۆژیای هۆریەکانە. "خالدی"یەکانیش خرانە نێو سیستەمی خوداوەندی سیانی. وشەی ئورارتۆ بەمانای شوێنی بەرز دێت و پشت بەناو لێنانەکانی کولتووری سۆمەری دەبەستێت. ئورارتۆیەکان نەیاندەتوانی ببن بەئیمپراتۆریەت و لەئاستی دەوڵەتی قەومدا مانەوە. بەلانی کەم هێندەی میتانیەکان بەبەخێوکردنی ئەسپ و دروستکردنی ئامراز لەکانزاکان بەناوبانگ بوون. وەکو هەنگاوی یەکەم رۆڵیان لەقەبوون بەرەو ئێران بینی. بەرامبەر بەئاشوریەکان کەوتنە نێو شەری دژوار و نزیکەی سێ سەد ساڵ دەسەڵاتدار بوون. دواتر مادەکان (میدیەکان) میراسەکەیان وەرگرت. شیمانە دەکرێ نزیکەی ساڵی ٦٥٠ پ.ز رووخان. جێگای خۆیان لەنێوان دەوڵەتە ناوەندیەکان وکۆنفیدراسیۆنی خێڵەکانی گرت. ناتوانین بڵێین گەیشتە ئاستی دەوڵەتێکی ناوەندی کۆیلەداری. لەدوای ئورارتۆیەکان جیابوونەوە لەلای ئەرمەن و کوردەکان روویدا. گەلە ئەسکیتیەکانیش لەتواندەوە لەنێو ئەو کولتوورانە رزگاری نەبوو کە لەناوچەکەدا بڵاو ببوونەوە.

ئیمپراتۆریەتی ماد ـ پارس گرنگترین هەڵمەتی شارستانییەتە کە لەسەردەمی کۆیلەداری لەناوچەکە هەڵکشا. لەباکووری رۆژئاوای ئێران واتە لەمیدیا بەردی بناغەی ئەم ئیمپراتۆریەتە دانرا. میدیەکان لە رۆژهەڵات دراوسێی ئاشوریەکان بوون و بەرپشە هۆرین. بەڵام کاریگەری ئەم کولتوورەیان کرابووە سەر کە لەرێگای ئێرانەوە پێیان گەیشتبوو. هەروەکو مەزەندە دەکرێ میدیەکان لەقەومەکانی گروپی هیندۆ ـ ئەوروپی نین کە لە ٢٠٠٠ ساڵ پ.ز. لە هێڵی باکووری ئەوروپا و باشووری روسیا بەرەو ئێران و هیندستان هاتبن.

لەمەش زیاتر گومانێکی زۆر سەبارەت بەڕوودانی کۆچێکی بەمجۆرە هەیە. لەوانەیە سنوور دەربازکردنێکی بەرامبەر، واتە دوولایەنە هەبێت. بەڵام کۆچی بەکۆمەڵی گەلێکی تەواو و نیشتەجێ بوونیان لەگۆڕەپانێکی نیشتەجێ بەبێ ئەوەی شتێك رووبدات، شتێکە لەبواری تیۆریدا ناشێت. مەسەلەی راست ئەوەیە کە کوردە بەهێزەکان پێشکەوتوون و کاریگەرییان کردۆتە سەر گۆڕەپانە کولتووریە لاوازەکان. بەدرێژایی هەزاران ساڵ بڵاوبوونەوەی کولتووری لەئێران بەرەو باکوور و رۆژهەڵات بەرەو چین و هیندستان بەردەوام بوو. کۆچە سنووردارەکانیش لەتوانەنەوە لەنێو کولتوورە بەهێزەکان رزگاریان نەبوو. ئەمە راستیەکی مێژوویی یە کە بەدرێژایی پانزە هەزار ساڵ ناوەندە کولتوورە بەهێزەکان لەرۆژهەڵات کولتووری سەردەمی نیۆلیتیك و کۆمەڵگای چینایەتی چەرخە سەرەتاییەکانیان بەشێوەیەکی دوای یەك بۆ هەرچوار لای جیهان بڵاوکردۆتەوە. ئەمەش رەوشێکە لەگەڵ هەناردنی کولتووری دەگونجێ نەك لەگەڵ هاوردنی کولتووری. حەوزەکانی سەرووی دیجلەو فورات بەنزیکترین ناوچە لەم ناوەندانە لەقەڵەم دەدرێت، چونکە بەردەوام خۆراکی پێداوە.

سێ ناوچە مێژووییەکەی ئێران، واتە ناوچەکانی میدیەای باکووری رۆژئاوا و پارسیا لەباشوور و باشووری رۆژئاوا و پارتیا لەباکووری رۆژهەڵات، هێڵی پەرینەوەی بڵاوبوونەوە بوون. هەربۆیە میدیەکان شوێنگەیەکی نیشتەجێ و گواستنەوەیان هەبوو. لەقۆناخی پرشنگداری ئاشوریەکان میدیەکان دراوسێیان بوون. لەبواری دروستکردنی کانزا و تەختە و بەردە بەنرخەکان و بەخێوکردنی ئەسپدا شوێنگەیەکی پێشکەوتوویان هەبوو. لەسەردەمی دەسەڵاتی ئۆرارتۆیەکان خۆیان لێ نزیك دەکرنەوە و بەردەوام لەگەڵیان لەنێو پەیوەندی دابوون. هەرچی کوردە گۆتیەکانن لەسۆرانیەکانی رۆژگاری ئەمرۆمان نزیکن. شیمانە دەکرێ ناوبردنیان بەمیدی ریشەکەی بۆ ئاشوریەکان دەگەرێتەوە. ناوبردنی ناوچەکە بە مەدائن لەلایەن ئاشووریەکانەوە بەواتای وڵاتی مەعدەنی (کانزا)، ئاماژە بەوە دەکات کە وشەی ماد لەم ناوە وەرگیرابێت. هەروەکو دەزانرێ لەناوچەی دیاربەکر ئاشوریەکان بایەخیان بەئاسن و مس و زیو دەدا. لێکچوونی وشەی ئامەد و قەزای مەعدەنی وماد ئاماژە بەوە دەکات کە شیمانە هەیە بەگەلی وڵاتی مەعدەن ناوبراون، هەروەکو چۆن سۆمەریەکان وشەی "هۆریەکان" یان بەواتای گەلی وڵاتی بەرزاییەکان ناوبردووە، شیمانە دەکرێ ئاشوریەکان ووشەکانی مەدائین و ماد و میدیایان بەواتای گەلی وڵاتی مەعادن ناوبردووە. هەروەها شیمانەی ئەوەش دەکرێ زاراوەکانی ئامەد و مەدائن لەم سەردەمە ماوەتەوە.

میدیەکان بەرلەوەی لەبواری سیاسی هەڵکشێن دەربازی قۆناخێکی وەرچەرخانی ئایدیۆلۆژی بوون. پێغەمبەر زەردەشت رێبەرە بەهێزەکەی ئەم قۆناخە بوو. هەڵمەتی یەکەم گۆڕینی میتۆلۆژیای سۆمەری بوو بۆ میتۆلۆژیای خۆجێیی بەگەوهەرێکی ئاری کە لقێکی هیندۆ ئەورووپی بوو، کە سیستەمێکی خوداوەندی سیانی هەیە و دواتریش بووە دووانی.

ئەگەری ئەوە هەیە لەساڵانی ١٥٠٠ پ.ز خوداوەندی دووانی پێکهات، کە بەشێوەی دوانیەکی ناکۆك بوو وەك خوداوەندی روناکی و تاریکی. بەرلە ریفۆرمەکانی بوودا لە براهمانیزم، کۆنفۆشیۆس لە تاوی، سوکرات لە فەلسەفە، و پێغەمبەر زەردەشت ریفۆرمی ئەخلاقی مەزنی لەباوەڕی ئاهورا مەزدا ئەنجامدا. هەروەها زەردەشت ئەو کەسەیە کە ئەم ئایینزایەی گۆڕی کە لەساڵانی ١٠٠٠ ـ ٥٠٠ پ.ز ریفۆرمی بەخۆیەوە بینی. دەبێ باش دەرك بەوە بکەین کە ئەو ریفۆرمانەی پێغەمبەر ئیبراهم ئەنجامیدا هەنگاوی کۆتایی قۆناخێکە کە چەند سەدەیەك بەردەوام بوو و سەرەتای قۆناخێکی نوێیە. لەیەکێکیان پێغەمبەر ئیبراهیم لەباشووری رۆژهەڵات رۆڵی بینی، ئەومیتریشیان زەردەشت لەباکووری رۆژهەڵات رۆڵی بینی.

گرنگترین نوێبوونەوەی زەردەشت ئەنجامیداوە دانانێتی بەئازادی ئیرادەی مرۆڤ کە سیستەمی کۆیلەداری گەیاندبووی بەئاستێك تەنانەت مرۆڤ خاوەنی سێبەری خۆشی نەبێت. بەمجۆرە ئەم نوێبوونەوە توانی تاك لەباڵادەستی چارەنووسی رەهای خوداوەندەکانی کۆیلەداری رزگار بکات. ئەمەش بەرەنگار بوونەوەی باڵادەستی میتۆلۆژیای کۆیلەداری بوو کە لەسەر هزر و هەڵسوکەوتی مرۆڤ هەبوو. هەربۆیە سیستەمی توندی کۆیلەداری بەرەو نەرم بوون و گۆڕانێکی مەزن دەبات. لەم لایەنەوە لەحەزرەتی ئیبراهیم رادیکاڵتر و تێکۆشەرترە. لەپێکهاتنی ئایینی تاکخوداییدا رۆڵی لەحەزرەتی ئیبراهیم کەمتر نییە. بەرلەوەی ئیمپراتۆریەتی ماد ـ پارس لەدایك ببێت، بناخەی ئایدیۆلۆژی لەمیانەی شۆڕشێکی ئیرادەی بەمجۆرە ئامادە دەکرێت. ئەگەر ئەم شۆڕشەی ئیرادە نەبووایە، بەرەنگار بوونەوەی سیستەمی کۆیلەداری لەشێوەی میسر و سۆمەریەکان زۆر ئاستەم بوو. سەرەتا هەوڵەکان و مەزنایەتی پێغەمبەران، تەنیا دەتوانن دەرفەتێکی سنوورداری نەرم بوون و وەرچەرخان برەخسێنێ. زەردەشت بەهێزترین نوێنەری شۆڕشی ئیرادە و ئەم مەیلەیە. هەروەکو چۆن ئەسکەندەر بەپشت بەستن بەمامۆستای خۆی ئەرستۆ گەورەترین ئیمپراتۆریەتی لەجیهان ئاواکرد، ئەوا ئەوانەی ئیمپراتۆریەتی ماد ـ پارس یان ئاواکرد پشتیان بەئەخلاقی زەردەشت بەست و ئەو رۆڵەیان بینی.

لەریشەی دەوڵەتی کۆیلەداری سۆمەری و میسری کۆن دا هەوڵە مەزنەکانی ریفۆرمخوازی پەرستگای راهیبە میسری و سۆمەریەکان شاراوەیە. هیچ پێکهاتەیەکی شارستانییەت و سیاسی بەهێز بەبێ ئەوەی لەبناخەی خۆیدا پشت بەبەهایەکی ئایدیۆلۆژی بەهێز و تۆکمە ببەستێ بەدی نایێت. بەئەندازەی پێکهاتەی ژێرخانی بەرهەم هێنان ناسنامەی ئایدیۆلۆژیش کاریگەری دەکاتە سەر جوڵانەوەی دەوڵەت و شارستانییەتی تازە هەڵکشاو. ئەم کاریگەریانە بەیەکەوە دەکرێتە سەر سەرخان و ژێرخان یاخود لەناویەکدا کاریگەر دەبن و دەوڵەت یان شارستانییەت ئاوا دەکەن یاخود ئەوەی هەیە وەریدەچەرخێنن. تەنیا روون کردنەوەی دەوڵەت بەئابووری چەندە هەڵە و پڕ لەکەموکوڕیە، ئەوە بەتەواوی دیاریکردنی رۆڵی ئایدیۆلۆژیاش،

شیکردنەوەی دەوڵەت بەدروستی ئەنجام نادرێ. هەروەکو دەزانرێ مارکسیزم لەم لایەنە بەتەواوی مایەوە یاخود بەپێی پێویست رۆڵی بەئایدیۆلۆژیا نەدا. لەئەنجامدا ئەم پێناسە بەتەواوەوە، بۆتە هۆکارێکی سەرەکی هەڵوەشانەوەی سۆسیالیزمی بونیادنراو.

بەر لەوەی کۆنفیدراسیۆنی ماد ئاوا بکرێت، لەکەسایەتی ئەفسانەی کاوە بەرخودانی خێڵەکان بەئامرازی ئاسن بەرامبەر ئیمپراتۆرەکانی ئاشووری، لەبواری پراکتیک ـ سیاسی رۆڵێکی گرنگی بینیوە. بەرخودانەکانی سەردەمی هۆری، میتانی، نائیری و ئورارتۆییەکان، بەشێوەیەکی سەمبوڵ لەکولتووری ناوچەکەدا گوزارشتی خۆی لەئەفسانەی کاوەی ئاسنگەر بینیوەتەوە. شرۆڤەیەکی راست سەبارەت بەو ئەفسانە و پێشکەوتنی لەمێژوودا راستیەکە، شەری گەلی مەعدەنکار لەپێناو ئازادی و پاراستنی وڵاتەکەیان ئەفسانەی کاوەی ئاسنگەر دەخوڵقێنێ.

ئەم دوو نەریتە بەهێزە، واتە شۆرشە بەهێزەکەی ئیرادە و ئەخلاقی زەردەشت و بەرخوداتی سەدان ساڵەی عەشیرەتەکان بەچەکی لەئاسن دروستکراو، لەسەمبۆڵی نەریتی کاوەی ئاسنگەر دەبێتە یەك و لەکەسایەتی مادەکاندا لەساڵی ٦١٢ ی پ.ز کۆتایی بەئیمپراتۆریەتی ئاشووری دێنێ. لەراستیدا ئەو تێکۆشانەی بەسەدان ساڵ بەردەوام بوو، لەم رێکەوتە بەسەرکەوتن ئەنجامگیر بوو. گەلانی رۆژهەڵاتی ناوین جەژنی نەورۆز وەکو جەژنی بەهار و ئازادی پیرۆز دەکەن کە دوای نەهێشتنی ئامرازی ستەمکاری هاتە ئاراوە. ئەمەش لەو کارەی حەزرەتی ئیبراهیم دەچێت کە کۆتایی بەو نەریتە ستەمکاریەی کۆیلەداری هێنا کە منداڵانیان وەکو قوربانی سەردەبڕن، ئەویش وەکو جەژنێك ماوەتەوە. هەردوو جەژنیش گوزارشت لەرزگاربوون لەنەریتی سیستەمی کۆیلەداری و ئامرازە سیاسیەکانی دەکات کە وەکو حەزیا دەبینران و گۆشتی مرۆڤیان دەخوارد.

رێکخستنی میدیەکان زیاتر بەشێوەی کۆنفیدراسیۆنی عەشیرەت بوو. هەبوونی خێڵی پارسی لەناویدا لەکۆنفیدراسیۆنەکانی دیکەی جیا دەکردەوە. دەبێ ئاماژە بەوە بکرێ کە کۆنفیدراسیۆنی هۆری و نائیری لەرەوشێکی هاوشێوەدا نەبوون. چونکە لەم خێڵ و تیرانە پێکدەهات کە هەمان زمان و کولتووریان هەبوو. هاوپەیمانێتی میدیەکان لەگەڵ بابلیەکان کە درێژە پێدەری ئەو نەریتەی سۆمەریەکانن کە بەردەوام لەگەڵ گەلی شاخی لەنێو رێککەوتندا بوون، لەگەڵ ئەوەی کۆتایی بەئیمپراتۆریەتی ئاشووری هێنا، سەرباری پێکهاتە لاوازەکەی دیسان لێرەدا یاسای خیانەتی لقێکی ئەو عەشیرەتە رۆڵ دەبینێ کە پەیوەندی خزمایەتییان لەنێواندا هەیە. دواتر کۆرشی پارسی لەئەنجامی پیلانێکدا کۆتایی بەدەسەڵاتی ئاستیاك هێناو دەسەڵاتی گرتە دەست. ئەو بالادەستیەی لەخێڵە میدیەکان بۆ خێڵە پارسیەکان دەگواسترێتەوە، بەمناوی ئیمپراتۆریەتی پارس ناو دەبرێت. لەرێشەدا میدیەکان رۆڵی دامەزراندن دەبینن. بەڵام وەکو هێزێکی لاو بۆ یەکەمین جار دەرکەوتنی پارسەکان بۆ سەر

شانۆی مێژوو، دەشێ لەم گۆڕانەدا رۆڵ ببینێ. چونکە خێڵ هۆزە بەرپێشە هۆزیەکان لەماوەی ۲۵۰۰ تاوەکو ٥٠٠ ی پ.ز لەئەنجامی ئەو بەرخودانانەی کردوویانە ماندوو ببوون و لەپەلوپۆ کەوتبوون. لەکەسایەتی گۆرش دا وەك هێزێکی لاو دەرکەوتنی ئەخمینییەکان بۆ سەر شانۆی مێژوو رێکەوت نییە، کە هەمان زمان و کولتوورێکی هاوشێوەیان هەبوو و خێڵێکی پارسەکان بوون.

شوێنی میدیەکان لەمێژووی کوردا بینیتی رۆڵی دەستپێشخەری سەردەمی کۆیلەداری کلاسیکە. هەروەها رووخانی ئاشوریەکان کە نوێنەرایەتی کۆیلەداری چاخە سەرەتاییەکانیان دەکرد، سەبارەت بەرۆژهەڵاتی ناوین و تەواوی مێژووی جیهانی شارستانییەت بەواتای کۆتایی سەردەمێك دێت. جیاوازی نێوان کۆیلەداری چەرخەکانی یەکەم و چەرخەکانی کلاسیکی، بەجیاوازی نێوان سەرمایەداری هۆف و سەرمایەداری شارستانییەت دەچێت.

لەیەکەمیندا توندوتیژیەکی بێ سنوور پەیرەو دەکرێ، بەڵام لەهی دووەمدا هەوڵدەدرێ سیستەم لەمیانەی ماف و رێساکانی دەست نیشان بکرێت. ئامرازە سەرەکیەکانی چەرخی یەکەم لەبرۆنز دروست دەکرا، هەرچی چاخی کلاسیکە لەبواری ئامرازدا سەردەمی ئاسن بوو. لەبواری ئایدیۆلۆژیدا چەرخی یەکەم پشتی بەمیتۆلۆژیای پادشای خوداوەند دەبەست، هەرچی ئایدیۆلۆژیای چەرخەکانی کلاسیکە پشت بەئایینە تاکخوداییەکان و فەلسەفیەکان دەبەستێ. جیاوازی گرنگ لەبواری ئامراز و بەرهەم هێنان و ئایدیۆلۆژی و سیستەمی دەوڵەت لەنێوان هەردوو چەرخدا هەیە. لەجیاتی پادشای خوداوەند، پادشا بوو بەنوێنەری خوداوەند لەسەر زەوی، ئەمەش ئاماژە بە نەرمبوونێکی بایەخدار دەکات.

دوای رووخانی ئیمپراتۆریەتی ئاشووری چەمکی کۆیلەداری ئاماژە پێکراو ژێر خاك کرا. هەروەها چەمکی کۆمەڵایەتی و نەفسانەیی و ئایینی کە ئیمپراتۆریەتی میدیا ـ پارس پشتی پێدەبەست، گەوهەر و رۆحی چاخی کۆیلەداری کلاسیکە. هەروەکو چۆن نەریتی زەردەشتی و ئیبراهیمی هێزی ئایدیۆلۆژی ئەم وەرچەرخانەی خوڵقاند، فیدراسیۆنی خێڵەکانی ناوچەکە لەکەسایەتی کاوەی ئاسنگەر هەم ئامرازی ئاسنیان بەرهەم دەهێناو هەم لەپاراستندا بەکاریان دەهێنا، هێزی سەرەکی ئامادەکردنی قۆناخی کلاسیکی نوێیە. یەکێك لەهاوکاری و رۆڵی مەزنی شارستانییەتی رۆژهەڵات بۆ شارستانییەتی رۆژئاوا لەم خاڵەدایە. ئەو قۆناخەی سەردەمی کلاسیکی دەست پێکرد لەوڵاتی میدیا هەوێن کرا کە هزری ئازادی و رۆح و ئیرادەی زەردەشتی تێدا پێشخرا. قۆناخی بەرخودانی ۲۰۰۰ساڵەی لەهۆزیەکان دەستی پێکرد تاوەکو مادەکان بەردەوام بوو؛ راستینەی ئەو گەلە خۆراگرەی کاوەی ئاسنگەر بۆتە سەمبۆڵەکەی، لەکەسایەتی زەردەشتدا ئیرادەی ئازادی هێنا ئاراوە، هەرچەندە زێدە لەنێو مێژووی نووسراویشدا رەنگی نەداوەتەوە، لەراستیدا مەزنترین قۆناخی مێژوویە کە لایەنە ئازادیخوازیەکەی لەپێشە. بەگوزارشتێکی بەرجەستە تر، مێژووی سۆمەریەکان تاوەکو

ـتوریەکان کە مێژووی مەزنترین کۆیلەداریە و ناوی چاخی دێرینی لێدەنرێ تا چ رادەیەك ـستیەکی بایەخدارە، ئەوا بەرخودانی ئیرادە و هێزی ئازاد کە باپیرەوداپیرەی کوردان ـەوریەکانەوە تا مادەکان رۆڵیان تێدا بینی و راستینەی گەلە خۆراگرەکان کە خێڵەکان ـاخەیان پێکدەهێنا، بەهەمان ئەندازە راستیەکی بایەخداری مێژووە. لەکاتێکدا یەکێکیان مێژووی تالان و ستەمکاری چەوسێنەرانە ئەویتریشیان مێژووی رەنج و ئازادی گەلانە کە لە رەنج و ئازادی خۆیان بەخاوەن دەردەکەون. دوا هەنگاوی وڵاتی میدیا هاوێشتراوە تا ئەم ـەیە بەهاکەی بایەخدارە. کاتێك لەتەواوی رۆژهەڵاتی ناوین، قەفقاسیا و تا ئاسیای ناوین وەکو جەژنی ئازادی و سەرلەنوێ لەدایکبوون و مەزنترین نوێبوونەوەی گەلان بەهادار دەبینرێ و ئەمەش لەنزیکەوە گرێداروی ئەم پێشکەوتنە مێژووییەیە.

شتێکی رێکەوت نییە کە رزگاربوون لەکۆیلایەتی چاخی کۆن سەبارەت بەشارستانییەت و ئایندەی گەلانی جیهان یەکێکە لەهەنگاوە مەزنەکانی ریفۆرم یاخود وەرچەرخان. لەئەنجامی ستەمکاری کۆیلەداری چاخی کۆن تەواوی ئەو بەهایانەی مرۆڤایەتی لەمیانەی کۆمەڵگای نیۆلیتیك بەدەستی هێناوە کەوتە ژێرەوەی مێژوو و هەروەکو بڵێی لەزینداندا بەندکراوە؛ میتۆلۆژیا و ئایینێکی وەها دەخوڵقێنرێ هەروەکو بڵێی بەهیچ شێوەیەك مرۆڤایەتیەکی ئازاد و یەکسانبوونی نییە. هەروەکو بڵێی چارەنووسی مرۆڤایەتی بەندایەتی و کۆیلایەتیە کەناتوانێ خاوەنی سێبەری خۆیشی بێت. جیهانێك ئاوا دەکرێت هەروەکو بڵێی سیستەمی شارستانییەتیکی هارو چەوسێنەر و سزادەر، تاکە سیستەمی پیادەکراوە. ئایدیۆلۆژیایەکی ـ میتۆلۆژی ـ ئایینی کە پادشاکان دەکات بەخوداوەند، رەنجدەران دەکات بەهۆف و درندە، لەتەواوی رۆح و هزرێکدا بەجێدەکرێت. ئەم داهێنانە نوێیەی کۆمەڵگای نوێ کە لەپەرستگاکانی راهیبەکانی کۆمەڵگای چینایەتی سۆمەر و میسریەکان ئاوا دەکرێت لەمێژوودا پێشکەوتنێکی مەزنە؛ بەڵام وون کردنێکی مەزنی مرۆڤایەتی ئازادە. دیالەکتیکی مێژوویی ئەم قۆناخە بەمجۆرەیە. فەیلەسوف ئەلمانی نیتشە لەخۆڕا بەپشت بەستن بەزەردەشت شاکاری "زەردەشت وای فەرموو"ی نەنووسی. لەڕاستیدا ئەمە بەواتای ئەوە دێت کە یاخیبوونی ئیرادەی ئازاد کە زەردەشت و نەریتەکەی نوێنەرایەتی دەکات بەرامبەر بەخوداوەندی کۆیلەداری، واتە بەواتای لێپرسینەوە و شڵەژانێکی قووڵی سیستەمی کۆیلایەتی راهیبەکان و پادشا ـــ خوداوەندەکانە. لەکاتێکدا رەمزی خوداوەندی ستەم و چەوسانەوە، واتە بتەکان دەهەژێنن و دەشکێنن، لەپێناو مرۆڤایەتی بەدوای رێگایەکی ژیاندا دەگەڕێن کە تواناکاری تەقلیبوونی زیاتری هەبێت. یادگاریەکانی ئازادی کە لەسەردەمی نیۆلیتیك ماوەتەوە ـ یادگاری بەهەشتی ونکراو ـــ دەبێتە ئومێدی نوێ و ئاواتەکانی ئازادی مرۆڤایەتی. خوداوەندی ئیبراهیمی کە بەخشندە و دۆستە ـ رێگای لەوەگرتووە مرۆڤ ببێتە قوربانی ـ و خوداوەندی زەردەشت کە لێپرسینەوەی لێدەکات و لەبەرامبەر تاریکایی رووناکی پایەدار دەکات، لەگەوهەری خۆیدا

لەگوزارشتکردنی ئەم تێکۆشانە مەزنەی رەنج و ئازادی لەژێر پەردەیەکی ئایینی بەولاوە هیچ واتایەکی دیکە نابەخشێت. تەواوی تێکۆشانەکانی ئەم قۆناخە لەمیانەی شێوازی هزری میتۆلۆژی و ئایینی گوزارە دەکرێت. بەبێ شاز بوون، ئەمە بۆ تەواوی مرۆڤایەتی بەمەرجێگەیە. ئەگەر بخوازین دەرك بەتێکۆشانی ئازادی و رەنج بکەین، ئەوا لەمیانەی شیکردنەوەی زمانی ئایین و میتۆلۆژیا دەتوانین سەرکەوتن لەمەدا بەدەست بێنین. هەروەکو دەگووترێ میتۆلۆژیاو ئایین، باسێکی خەیاڵی و بێ ناوەرۆك نییە. بەپێچەوانەوە گوزارشتی مێژووی هەزاران ساڵەی مرۆڤایەتییە بەشێوازێکی هزری تایبەت بەخۆی. تاوەکو میتۆلۆژیا و ئایینەکان شینەکرێنەوە و لەمیانەی زمانێکی زانستیانە شرۆڤەیەکی راستی سەبارەت نەکرێت، ئەوا ناتوانرێ ئەو مێژووەی تا نزیکەی چاخی نیۆلیتیك بەپێناسەیەکی راست و گوزارشتێکی زانستیانە بگەیەنن و سەرکەوتوو بێت، ناتەواو دەمێنێ و چەوت دەبێ.

بەشێوەیەکی راست شیکردنەوەی نەریتی گەلەری گاوەی ئاسنگەر و بەرخودانی ئایدیۆلۆژی نەریتی زەردەشتی کە لە ولاتی (میدیا). "ولاتی مەعدەن". و (هۆریەکان). "خەڵکی شاخە بەرزەکان" ئەنجامدراوە، بایەخێکی مەزنی لەراست نووسینی مێژووی رۆژهەلاتی ناوین و جیهان لەخۆوە دەگرێت. ئەم بایەخە مەزنەش لەمیانەی ناوبژیوانی پارسەکان چەکی کلاسیکی شارستانییەت بۆ یەکەمجار بەرەو رۆژهەلات بەئاراستەی ناوەوەی ئاسیا و هیندستاندا گواستراوەتەوە. لەرێگای کاریگەری پارسەکان لەئاسیای ناوین و هیندستان و چین قۆناخێکی نوێی مێژوویی دەست پێدەکات. ئیمپراتۆریەتی بنەماڵە لە چین، ئیمپراتۆریەتی مۆریا لەهیندستان، لەئاسیای ناوینیش یەکەم قۆناخەکانی بنەماڵەی مەتاو هون، پێشکەوتنێکی گرێدراوی ئەم کاریگەریەن. قۆناخێکی نوێ لەبابل دەکرێتەوە. قۆناخی بابلی لاو ئەنجامێکی ئەم کاریگەریەیە. هەروەها لەساڵی ٥٣٨ ی پ.ز ئازادکردنی یەهودیە بەندکراوەکان و گەرانەوەیان بۆ قودس، پێشکەوتنێکی دیکەیە کە ئەنجامی زۆر گرنگی هەیە.

ئەم قۆناخە لەدایکبوونی عیسا و مەسیحیەت ئامادە دەکات. لەم قۆناخەی کۆچبەری و گەرانەوەدا یەهودیەکان ئایینی یەهودی و نەریتی ئیبراهیمی و نەریتی زەردەشتیان کرد بەیەك و بووە خاوەن گەوهەرێکی ئایدیۆلۆژی دەوڵەمەند تر. رۆڵی یەهودیەکان زیاد دەبێت. ئەمەش بەجۆرێکە یەهودیەکان دەخوازن رزگاربوونیان لەژێر دەسەلاتی بابلی و ئاشوریەکان وەکو پەیمانی خوداوەند و هاتنی مەسیح هەڵدەسەنگێنن. بەمجۆرە لەرۆژهەلاتی ناویندا نەریتێکی بەهێزی مەسیح ( فریاد رەس) و مەهدی دەردەکەوێت.

کاریگەریەکی دیکەی بایەخدار، ئەوەیە کە ئەو رێگایەی بەرەو چاخی کلاسیکی گریك ـ رۆمان دەچێت بەهۆولایی کاریگەری ئیمپراتۆریەتی ماد ـــ پارسە. لەسەردەمی دەسەلاتداریتی میسر و ئاشووردا رەوشێکی وەها لەئارادا نییە چاخی گریك ـ رۆما بەسەربەخۆ پێشبکەوێت. هەربۆیە ناتوانرێ بگوترێ تاوەکو ساڵانی ٥٠٠ پ.ز رۆما و ئەتینا قۆناخێکی مێژوویی

ـوتۆیان بەخۆیانەوە بینیوە. لەچەندین ناوچەدا قۆناخێکی کۆنفیدراسیۆنی هاوشێوە ـەیەدەچێت. ئەمانە لەبواری ئایدیۆلۆژیدا لەژێر کاریگەری قووڵی بابل و میسردان. ـوەرەکانیان پەروەردەی خۆیان لەمیسر و بابل دەبینن. ئەوانەی بە پەروەردەی ئەم ـوێنەدا تێپەڕ نەبن ناشێ ببنە خاوەنی هێزێکی رۆشنبیری. ئەم ناوەندانە زانکۆی قۆناخن. ـالیس و فیتاگۆرس کە فەلسەفەیان دەست پێکردووە بۆ ماوەیەکی درێژ پەروەردەیان لەم ـوێنانە وەرگرتووە. ئەم سەردەمە قۆناخێکە کە لەهەموو لایەنێکەوە رۆژئاوا بەرۆژهەڵاتەوە گرێدراوە. تاوەکو ٥٠٠ ی پ.ز ئەم گرێدانە بەشێوەیەکی قووڵ بەردەوام دەبێت. کاتێك ئیمپراتۆری پارس کۆرش و داریوش بەتەواوی بابل و میسر دەخەنە ژێر دەستی خۆیان ( ٥٢٨ ـ ٣٣٣ پ.ز)، ئەوکاتە شانسی رۆژئاوا پێشدەکەوێت. سەرەتا لەکەنارەکانی ئیگە، دواتریش ـنیمچەی دورگەی گریك قۆناخی بەخێرایی هەڵکشانی شارستانییەتی ئەتینا دەستپێدەکات. ـەنجامی شکستی پارسەکان لەماراتۆن لەساڵی ٤٩٠ ی پ.ز باڵابوون دەکەوێتە دەستی رۆژئاوا و پێشکەوتووترین قۆناخی کلاسیکی مێژوو دەست پێدەکات. هەڵکشانی فەلسەفە رێگای ئەوە ـەکاتەوە کولتووری هێلینی دەرکەوێتەپێش. لەگەڵ کاروانە مێژووییەکەی ئەسکەندەری مەزنی قوتابی ئەرستۆ بۆ ئاسیا لەئیگە تا هیندستان و میزۆپۆتامیا تاوەکو میسر قۆناخی ـارستانییەتی هێلینی بەکاریگەر دەبێت.

تەنانەت ئەم باسە کورتەش زۆر بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا نیشاندەدات کە هێلینییەکان ئەو رێگایەوە پێشکەوتن کە مادەکان و پارسەکان کردیانەوە. رێگا تەنیا بەشێوەیەکی تەکنیکی ( لەشاری ساردی ئیگە تاوەکو پایتەختی ئێران پەرسە پۆلیس وەکو رێگای پادشا " ئەکراوەتەوە. ئەوەی گرنگترە لەمیانەی ئەخلاقی ئازاد و فەلسەفەی زەردەشت هزری چاخی کۆن شیکراوەتەوە و تێپەڕکراوە. ئەوەی بەشێوەیەکی سەرەکی رێگای فەلسەفە و شارستانییەتی یۆنانی کردۆتەوە ئەم پێشکەوتنەیە. تەنانەت کاتێك لێکۆڵینەوە سەبارەت بە مێژووی هیرۆدۆت پێشبخرێت، زۆر بەڕوونی ئەم مەسەلەیە دەردەکەوێتەڕوو. بەقورسایی میتۆلۆژیای یۆنانی لەژێر کاریگەری گونجاندنی میتۆلۆژیای هۆری و هیتییەکان پێکهاتووە. ئامرازەکانی مس و ئاسن لێرانەوە چووە. بەکورتی لەئامرازە تەکنیکییەکان تاوەکو دەگاتە کەرەستە ئایدیۆلۆژی و سیاسییەکان شارستانییەتی گریك، لەرێگای ئەنادۆڵەوە لەژێر کاریگەری پێشکەوتنی زنجیرەی هۆری، هیتیت، لوویی، فریگیا، لیدیا، ماد و پارس پێکهاتووە. کاریگەری بابل، میسر و فینیقییەکان بەپلەی دووەم دێت. مەعریفەتی گریکەکان ئەوەیە کە بەباشی رۆڵی گواستنەوە و بە سەنتێزکردن دەبینن. لەمیانەی ئەم سەنتێزە رۆڵی پێشەنگایەتییان لەهەڵمەتی فەلسەفەی مێژوو کردووە، هەروەها لەسەرووەدا لە بواری بیناسازی لەگۆڕەپانی هونەریشدا توانیویانە هەڵمەباز ئەنجام بدەن. پێشخستنی ئەدەبیاتێك کە لەگەڵ هۆمیرۆس دەستی پێکرد جیا لەتیۆلۆژیا ( خوداناسی) دەسکەوتێکی گرنگی شارستانییەتی یۆنان (گریکە).

پەیوەندی تەواوی ئەم پێشکەوتنە مێژووییانە لەگەڵ رۆحی ئازادیخوازی کوێستانەکانی میدیا پێویستی بە هەڵسەنگاندنێکی بایەخدار هەیە. کاتێك میتۆلۆژیا و ئەدەبیاتی گریت بەباشی لێکۆڵینەوەی سەبارەت ئەنجامدرا، ئەوا بەشێوەیەکی سەرنج راکێش ئەم پەیوەندییە دەرکی پێدەکرێت. بەبێ ئەوەی جولانەوەکانی مادەکان هەبێت، شارستانییەتی یۆنانیش نەدەبوو، بەگوزارشتێکی دیکە پێشکەوتنە زانراوەکانی چاخی کلاسیك بەدینەدەهات، بەڵکو وەکو شارستانییەتی گریك رەوشێکی هاوشێوەی کۆیلەداری چاخی دێرینی بەخۆیەوە دەبینی. واتە بەدرێژایی ۲۰۰۰ساڵ قۆناخی هۆریەکان و هیتیتەکان و تەنانەت میدی و پارسەکان کەش و زەمینەی ئەم پێشکەوتنەیان ئامادە کرد و لەرێگای پێشکەوتنەکانی ئەنادۆڵ لەجیاتی شێوازی کۆیلایەتی میسریەکان، لەشارستانییەتی گریکیدا بەشێوازی رۆژئاوا رێگای لەپێش ئازادیەکانی ئاك کردەوە. بەمجۆرە بەشێوەیەکی راست دانانی دیالەکتیکی مێژوو، بایەخێکی مەزنی هەیە بۆ راست دەرککردن بەو رێگایەی کە دەچێتە شارستانییەتی رۆژئاوا. تێگەیشتنێکی واقیعیانەی پەیوەندی نێوان رۆژهەلات ــ رۆژئاوا گرێدراوی ئەمەیە. دانەنانی ئەم پەیوەندییە لەلایەن مێژوو نووسانی رۆژئاوا و تازەبەتازە تاوتوێکردنی ئەم بابەتە کەم و کوڕیەکی مەزنە. بەلام هەوڵدان بۆ بەلاوەنانی ئەم کەموکوڕیەش پێشکەوتنێکی بایەخدارە.

لەگەڵ رووخانی ئیمپراتۆریەتی پارس لەساڵانی ۳۳۰ پ.ز لەلایەن ئەسکەندەری مەزنەوە، پێشکەوتنی نوێ لەشارستانییەتی میزۆپۆتامیا بەدی دێت. ئیتر لەسەربنەمای شارستانییەتی رۆژئاوا هەندێ پێشکەوتن کاریگەری لەسەر ناوچەکە دەکات. ناولێنانە نوێکانیش هەروەکو ناولێنانی سۆمەریەکان نوێنەرایەتی راستینەی ناوچەکە دەکات. هێلینیەکان لەیەکەمین هەنگاودا کۆنترین گەلانی ئەنادۆڵ تروا، فیرگیا، لیدیا و لوویەکان لەناو کولتوورەکانی خۆیان دەتوێننەوە. ئەم تواندنەوەیە لەو سنوورانە دەوەستێ کە بنەچە کوردەکان تێیدا بالادەستن. هێزی کولتووری کوردە سەرەتاییەکان رۆڵی لەمەدا یەکلاکەرەوەیە. پێکهاتەی بەهێزی خێڵەکی دزەکردنەکانی دەرەوە بۆ ناو کولتوور و زمان ئاستەم دەکات. کولتوورێکە زۆر بەئاستەمی دووچاری گۆڕان دەکرێت. لەکولتووری هێلینیدا لێکۆڵینەوەکانی میدیا یەکێکە لەبابەتە سەیرەکان. زەقترین نموونەش، پادشایەتی کۆماگەنەیە کەناوەندەکەی ئادیامانە. ئەم دەوڵەتەی لەدوای ئەسکەندەر، لەسەربنەمای قۆناخی ماد ـ پارس لەساڵانی ۲۰۰ پ.ز هەڵکشانی بەخۆیەوە بینی تاوەکو سەردەمی رووبەڕووبوونەوەی یەکتری ساسانی و رۆمانییەکان نزیکەی ۵۰۰ ساڵ بەردەوام دەکات. پادشایەتی کۆماگەنا لەم ساڵانە نموونەیەکی بریقەداری قۆناخی کلاسیکە. لەگەڵ ئەوەی ناوەندە سەرەکییەکانی ئادیەمان و سامساتە، تاوەکو مەلاتیا، مەرعش، عەنتاب، ئورفا و ئەلازخ درێژ دەبێتەوە ـ زۆگما کە لەم قۆناخانەی دواییدا بابەتێکی رۆژانەی پێکدەهێنا، ناوەندێکی گرنگی ئەم قۆناخەیە. دیسان وێرانە و پاشماوەکانی نەمرود کە هەشتەمین سەیر و سەمەرەی دونیایە لەم قۆناخەدا ماوەتەوە. بەکانزاکاری بەناوبانگە. هێڵی

تێپەڕبوونی ڕێگای بازرگانی رۆژهەڵات ــ رۆژئاوا، باکوور ــ باشووره. تەواوی ئەو موڵك و هزرانەی لەمیسر، میزۆپۆتامیا، ئێران، قەفقاسیا و ئەنادۆڵ و یۆنان دەهاتن، لەناوەند و کەناڵەکانی ئێره دەرفەتی مامەڵە و بازاڕی هەبوو.

هەربۆیە کولتووری هێلینی تەواو سەنتێزێکی کولتووری رۆژهەڵات ــ رۆژئاوا پێکدێنێ. ئەپەیکەر و بیناسازیەکاندا زۆر بەسانایی دەتوانرێ ئەم ئەنجامە بەدەست بهێنرێ. هەربۆیە وەکو کولتوورێك هەڵدەسەنگێنرێ کە بۆ یەکەمین جار لەمێژوودا سەنتێزی رۆژهەڵات ــ رۆژئاوای پێك هێناوە. لەسەرتاسەری جیهاندا پەیوەندی نیشاندان بەرامبەری هۆکارێکی گرنگی لەم راستینەیەدا شاراوەیە. شارستانییەتیکی دیکە تاوەکو ئێستا ئەم سەنتێزەی بەشێوەیەکی وەها پرشنگدار نیشان نەداوە. سەبارەت بەسەنتێزی شارستانییەتەکان پێویست دەکات بەبایەخەوە هەڵوەستەی لەسەر بکرێ و تاوتوێ بکرێت. خاڵی گرنگتریش ئەوەیە تەواوی شارستانییەتەکانی دواتر، کاریگەرییەکی یەکلایەنەیان بەبنەما گرتووە. ئەو لایەنەی بەگرانی دەرکەوتۆتەپێش سەنتێز نییە؛ بەڵکو لەمیانەی هزرێکی داگیرکاری بەتەواوەتی رێگای زاڵکردنی بیرۆکەی خۆی هەڵبژێردراوە. ئەمرۆکەش شارستانییەتی ئەوروپا، لەراستیدا لەمیانەی بەتەواوی بالادەستکردنی بیرۆکەی خۆی دەجولێتەوە. لەچاخە یەکەمینەکاندا هەڵوێستی شارستانییەتی رۆژهەڵاتیش بەم شێوازە بوو. بەڵام ئەوەی لەکۆماگەنا بەدیهاتووە، سەنتێزێکی خولقکارە و نوێنەرایەتی یەکەمین نموونەی بایەخداری دەرفەتی سەنتێزی شارستانییەتەکان دەکات. لەگەڵ ئەوەی گەلی سەرەکی کۆماگەنا بەشێوەیەکی زیاتر ئەو گروپە خێڵەکیانەن کە نزیکی کوردەکانی رۆژگاری ئەمرۆمانن، لەئەرمەنییەکان، لوویییەکان، هێلینیەکان و گروپی ئاشووری بەرپیشەی سامی پێکهاتووە. مەزندە دەکرێ بەکوردبوون لەم قۆناخەدا پێشکەوتنێکی گەوهەری بەخۆیەوە بینیوە. لەکاتێکدا لووییەکان و هێلینیەکان دەتوێنەوە، ئەوا کوردان و ئەرمەنییەکان وەکوقەومی حاکم بایەخدار دەبن. لەکاتێکدا ئەرمەنیەکان زیاتر لەبواری کانزاکاری و پیشەکاری کاری دەست پێشەنگایەتی دەکەن، ئەوا کوردان لەکشتوکاڵ و بەخێوکردنی ئاژەڵدا بالادەستن. لەم قۆناخەدا نزیکترین دراوسێی کۆماگەنا پادشایەتی پالیمێرای ــ سوریایە. زەنۆبیا کەدوا شاژنە لەساڵی ۲٦٨ ی ز بەدیلی دەکەوێتە دەست ئیمپراتۆریەتی رۆما ئاورلیوس و کۆتایی بەپادشایەتیەکەی دێت. وەکو شیمانە دەکرێ لەئەنجامی ململانێ و پێکدادانەکانی نێوان رۆما ــ ساسانی کە دوای ساڵانی ۲٥٠ ی زایینی زیادی کرد، رێگای لەپێش پەرتەوازەبوونی پادشایەتی کۆماگەنا و دابەشکردنی لەنێوان هەردوو لایەن دەکاتەوە.

دوای ئەمە قۆناخی پێکدادانێکی بەرفراوانی نێوان ساسانی و رۆمایە. ئەم پێکدادانە رێگا لەپێش رووخانێکی زیاتر دەکاتەوە. پۆتانسیەلی بەهێزی ناوچەکە، لەنێو هەلومەرجی شەڕدا ئەو هێزەی شارستانییەت بەدەست ناهێنێ کە مافی خۆیەتی؛ ناچاردەبێ بەشێوەی میرنشینی

بچووك و گروپی خێڵەکی درێژە بەهەبوونی خۆی بدات. بەگوێرەی هێزی لایەنەکان، ئەم لاو ئەولاکردن، هەروەکو بڵێی بۆتە سیاسەتێکی سەرەکی. قۆناخی هاوشێوەی ئەمە، لەراستیدا لەسەردەمی نیۆلیتیکەوە بەردەوام بووە. ناوچەکە دەبێتە شوێنگەی قەڵەمباز و تەشەنە کردنی کولتوورەکان. هێڵی بڵاوبوونەوەی رۆژهەڵات ــ رۆژئاوا و باکوور ــ باشوور سەبارەت بەتەواوی کۆمەڵەکانی مرۆڤ بەردەوامی بەم رۆڵەی دەدات. بۆ نموونە لەبەرئەوەی میسر و میزۆپۆتامیای خواروو ناوچەی دابڕاو و تایبەتمەندێتی هاوشێوە نیشاندەدەن، بەبێ ئەوەی لەدەرەوە ناچار بکرێت بەهەزاران ساڵ پێشکەوتنەکان بەردەوام دەکات. هەرچی کەوانەی زاگرۆس ــ تۆرۆسە بەپێچەوانەوە ناوچەی سەرەکی بڵاوبوونەوەی هەرسێ کیشوەرە. بۆ ماوەیەکی درێژخایەن ناتوانێ درێژە بە شارستانییەتیکی تایبەت بەخۆی بدات. لەهەر قۆناخێکدا هێزەکانی داگیرکاری و تالان کە لەهەر چوارلاوە دێن دەرفەت بەمە نادات. تەنیا لەرەوشی هاوسەنگی هێزەکاندا بەشێوەیەکی رێژەیی، ناوچەکە دەتوانێ پێشبکەوێت. لەسەردەمی هۆری و میتانی و میدیەکانیش پێشکەوتن ئەنجامی هاوسەنگی بەمجۆرەیە. لەم بارەیەوە بریقەدارتین و هەمیشەییترین نموونە پادشاییەتی کۆماگەنایە. پێکهێنانی سەنتێزێکی بەهێز گەوهەرەکەی لەم رەوشە سەرچاوە دەگرێت. لەبەرئەوەی ئاشنای شوێنەوازی سەرجەم کولتوورەکانە لەهەرس کردن و گەیشتن بەسەنتێزی نوێ خاوەن شوێنگەیەکی بەتوانایە. لەقووڵاییدا موحافەزەکاریەکی نییە. چەندین کولتوور دەتوانن لەگەڵ یەکتردا بژین. هەروەکو بڵێی ناوچەکە مۆزائیکێکی زمان و ئایین و کولتوورەکانە، ناوچەی پەیکەری نەمرود و مۆزائیکی زۆگما بەباشترین شێوە ئەمە نیشان دەدات. رێبازی تەواوی کولتووری رۆژهەڵات و رۆژئاوا لەو پەیکەر و مۆزائیکانە رەنگدەداتەوە. لەشێوەشدا سپی و رەش، هێڵی سامی و ئاریان لەخۆوە گرتووە. لەشێوازی ژیان و باوەڕیدا هەمەرەنگیەکی هاوشێوە بەرچاو دەکەوێ. هەروەکو بڵێی ناوچەی کۆبوونەوەی خەرمانی زمان و ئایین و فاکتەرەکانی دیکەی کولتوورە. لەبەرئەوەی تەواوی ئەم گەوهەرانە لەکۆماگەنا بووە بەسەنتێز و کۆبۆتەوە بایەخدارە. بەدرێژایی هەزاران ساڵ لەخۆوەگرتنی تایبەتمەندێتی کەش و هەوایەکی ئەفسوونی و پیرۆز، بەهۆی ئەم راستینانەیە.

بلیمەتی سەرەکی مرۆڤایەتی لەقووڵایی نیۆلیتیکدا شاراوەیە؛ لەوێ خوڵقاوە و پێشکەوتووە. دەرکەوتنە شکۆدارەکانی پێغەمبەرایەتی و دەزگابوونی دیسان هێزێکی دیکەی زایینی کولتوورە. ئەو رێگایەی بەرەو فەلسەفەی یۆنانی چووە، بەم ناوچەیەدا، بەشوێنپێی ئەریتی زەردەشتدا تێپەڕیوە. ئەمەش سەرچاوەی خۆی لەجیاکاری مەعریفی ناوچەکە وەردەگرێت. سەرەکیترین ناوچەی لەدایکبوونی کولتووری خوداوەندی ژن ودایکە. خوداوەندە ژنی هۆری هەپتا، دواتر وەکو یەکەمین دایك لەکتێبە ئایینیە پیرۆزەکاندا بوو بە حەوا. لای هیتیتیەکان بووە بە کوپاپا، لای فریگیەکان کیبەلە، لای عەرەبەکان بووە بە هیبلە و لە مەککە

٠ کەعبە) جێگیرکراوە. لەریشەی هەموویاندا کولتووری ستێرك هەیە، کـە لـەئاسمان لەمیانـەی ـەستێرەکان نوێنەرایەتی خوداوەندی ژن، خولقێنەری نیۆلیتیك دەکات. لای سۆمەرییەکان بـوو ـە ئینانـا ــ عەشــتار، لای میسـرییەکان بـووە بــە ئیســیس، لای یۆنانیــەکان ئــافرۆدیت، ـۆمانیەکانیش ڤینۆس، لای مەسیحیەکان بووە بە مەریەم.

لەمیانەی تەواوی بەڵگە مێژووییەکان ئەمە سەلمێنراوە کـە سەرچاوە رەسـەنەکانی کوردان ـەدوای کۆتـایی هـاتنی قۆنـاخی دواتریـن بەسـتەڵەکی مـەزن لەسـەردەمی ٢٠ هــەزار سـاڵ پ.ز کەونەکانی ناوەوەی هێڵی زاگرۆس ـ تۆرۆس کـە بەشـی سـەرو و نـاوەوەی دیجلـە و فوراتـە چ ـێکۆڵینـەوە ئاسەوارناسی و زمانناسیەکان بێـت، یـاخود عەشیرەتناسـی بێـت گـەلێك بەڵگـە ـەبارەت بەمە پێشکەش دەکەن و لەگەڵێك لایەنـەوە ئـەم راسـتینەیە دەسـەلمێنین. گرنگـتریش ئەوەیە، ئەو ناوچە و گەلەیە کە شۆرشی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری و چاخی گوندەکانی خولقـاند و پێشیخست. هەروەها ئەمەش سەلمێنراوە کە یەکـەمین کۆمـەڵگای چینایـەتی توانسـتە مـاددی و مەعنەوییەکانی لـەم کولتـوورە وەرگرتـووە. لـەم قۆنـاخە بـەدواوە تـاوەکو مێـژووی نووسـراوەی سۆمەرییەکان بەزمانی سۆمەری بەواتای " گـەلی شـاخی " کـوردی، بـاس لەگـەڵی ئـەم ناوچەیـە ـەکات. ئەم زاراوەیەی کە هەرە دوایـی لەلوویـیـەکانیان وەرگـرت لای یۆنانیـەکان بـووە کوردینـا (مەملەکەتی کوردان)، سنجاری سوڵتانی سەلجوقی کاریگەری زمانی فارسی لەسەر بوو جـارێکی دیکـە ناوچەکـەی بەکوردسـتان نـاوبردووە. ناوەکـانی هـۆری، گۆتـی، کاسـیت، میتــانی، نائـیری، نۆرارتـۆ و مادەکـان بـەردەوامی ئـەم نەریتەیـە، ئـەم ناوانـەن کـە لەقۆناخــە جیاجیاکـاندا بـۆ کۆنفیدراسیۆنی عەشیرەت و دەوڵەتەکان پێشدەخران. خوازراوە هەمان قۆناخی زمان، کولتــوور و ئـەتنیك بـاس بکرێـت. گۆڕینـی نـاو لەلایـەن دراوسـێکانیان کـە پـەیوەندییان لەگـەڵ گرووپـە ئەتنیکی و ناوچەکە دا هەیە و بەتایبەتی لەلایەن خۆیانەوە ئەنجامدراوە. نابێ جیاوازی نـاو و رێگا لـەپێش ئەناسـراوی و ئـەنجامێکی وەهـا بکاتـەوە کـە دیـاردەی جیـاوازن. گـەلێك قۆنــاخی کۆمەڵایــەتی کــە لــەمێژوودا رەوشــیان هاوشــێوەی ئەمــە بــووە لەمیانــەی زاراوەی هاوشــێوە گوزارشتکراوە.

سـەرەکیترین تایبەتمـەندێتی گرووپـەکانی بنەچـەی کـورد لـەمێژووی چـاخی کۆیلـەداری، جیـاوازی نێـوان پێکهاتــەی خێڵـە خۆڕاگــرە لـەناوخۆ داخراوەکــان و چیــنی ســەرووە کــە لەسەربنەمای بەکرێگیراوێتی پەیوەندییان لەگەڵ چینە سەردەستەکانی دراوسێکانیان بەستووە کە شارستانییەتی بـەهێزتریان ئـاواکردووە. ئەمانـە رۆڵـی دابڕانیـان دەبیـنی. هـەروەکو چـۆن بەگوێرەی تایبەتمەندێتی کۆمەڵگاکانی خۆی بەرەو قەوارەیەکی سیاسی نەچوون، بەناوی هێزە دەرەکیـەکان لـەپێناو کۆنـترۆڵ و چـاودێریکردنی کۆمـەڵگای خۆیـان، بەشــێوەیەکی بێنـاوەرۆك نوێنەرایـەتیکردنی پێکهاتـە سیاسـی یـە بیانیـەکانیان کـردووە بەهونـەرێکی سیاسـی. ئــەم شوێنگەیان رێگا لەوە دەگرێت لەمێژوودا رۆڵێکی پێشکەوتووخوازی و خولقکار ببینن. ئەوەی

ئەرکی پاسەوانی بێت، خولقکار نابێت، بەمانای هەندێکی ترەوە بەردەوام کاری کۆنترۆڵ دەکەن. لەم لایەنەوە چینی بەکرێگیراوێتی باوی کورد چینێکی بەکرێگیراوی هەرە بێ بەرهەم و بێ شەرەف و خائینە بەرامبەر بە رەچەڵەکی خۆی کە مێژوو ناسیوویەتی. بێگومان لەهەر چوار لاوە گەمارۆدان کاریگەریەکی دیاریکراوی هەیە. بەڵام دیسان زۆر پووچن، تەنانەت کاتێك دەرفەتیش دەرەخسێ، لەبەرئەوەی لەبۆهێڵەکانیان بەجێ بووە، بەلای هیچ پێشکەوتنێکی بەپلان و باوەڕ و خولقکار ناراستە ناگرن. تەنانەت ئەو یاخیبوونانەی پێشەنگایەتیشیان کردووە، بەهۆی بەرژەوەندی تەسکی بنەماڵەیی و بەکارهێنانیان لەلایەن هێزە دەرەکیەکان روویداوە. لەو قۆناخەی کە مێژوو دەستی پێکردووە تاڕۆژگاری ئەمڕۆمان، ئەم تایبەتمەندێتیە بەردەوام بەلایەنی خراپدا کاریگەر بووە. زەقترین و سەرنج ڕاکێشترین نموونەی ئەمە ئەنکیدۆی یەکەمین داستانی نووسراوەی مێژوو داستانی گلگامێش ە کە لەچیا بەشێوەیەکی سەرەتایی دەژیت و لەلایەن بەرێوەبەرایەتی شاری سۆمەریەکان لەرێگای ژن دەخەڵەتێنرێ و لەلایەن گلگامێش بۆ نێچیرکردنی ڕێبەری دارستان، واتە بۆ نێچیرکردنی سەرۆك خێڵی خۆی بەکاردەهێنرێ. ئەو هۆڤەی کە پێویستە وەکو ڕێبەری خێڵ بناسرێت، لەدارستاندا ناوی هەمبابایە کە دەگیرێت، لەکاتێکدا گلگامێش دەڵێ ئەیکوژین و بەکاری بێنین، سەرەڕای ئەوەی ئەنکیدۆ دەیناسێ و لەوانەیە خزمیشی بێت، ئەمە بەمەترسی دەبینێ و دەڵی "بیکوژن". لەو ڕۆژە بەدواوە بەکرێگیراوان بۆ ئەوەی ئەرکی خۆیان جێبەجێ بکەن، نێچیرکردنی ئەو ڕێبەرانە بەهونەرێك دەزانن کە وڵات و عەشیرەتیان دەپارێزێ. ئەم هەڵوێست و سیاسەتەی کە لەپادشا پادشاترە لەسەردەمی گلگامێش لەئەنکیدۆوە تا ڕۆژگاری ئەمڕۆمان بەبێ لەدەستدانی خێراییەکەی بەردەوام بووە.

لەگەڵ ئەمەشدا ئەو گەلەی کە بەردەوام سروشت و هێزی داگیرکەرە دەرەکیەکان لەنێو رەوشی بەرخودان دابووە و لەبەرئەم هۆکارەش نەیتوانیوە لەئاستێکی پێشکەوتوودا هێزی بەلاوەنانی فۆرمی خێڵەکی نیشانبدات بۆتە پارێزەر و درێژەپێدەری زمان و کولتوور و وڵات. لەکاتێکدا بەکرێگیراوە سەردەستەکان زمان و کولتووری هێزی شارستانییەتی بیانیەکان لەنێو بنەماڵەی خۆیاندا زاڵ دەکەن، زمان و کولتوور و شێوازی ژیانی گەلیان بچووك بینیوە، هەروەکو چۆن کیسەڵ بەسەدەق خۆی رازی نابێت، زمان و کولتووری گەلیان بچووك بینیوە. سەرباری ئەوەی ئەم راستینەیە کۆنترین و خولقکارترین زمانی شۆڕشی کشتوکاڵ و ناژەڵداری یە، ئەوە روون دەکاتەوە کە بۆچی زمانی کوردی پێشنەکەوتووە؛ هەروەها ئەمەش روون دەکاتەوە کە بۆچی بەشێوەی چەندین ناوچە و خێڵ بەدواکەوتوویی و جیاواز ماوەتەوە. ئەگەر زمان و کولتوورێك وەکو زمانێکی نووسراوەی پەروەردە بەدەزگا نەبێت و پێشنەکەوێت ئەوا بەهێی کات لەنێوچوونی راستیەکی دەست لێبەرنەدراوە. سەرەڕای ئەم تایبەتمەندێتیەی کات سەبارەت بەتوانەوە، تاوەکو ئێستاش بەهێزی مانەوەی شێوە زاراوەکانی زمانی کوردی، بۆ

ئەوە دەگەڕێتەوە کە گرووپەکانی گەل بەشێوەیەکی بەهێز و کاریگەر رۆڵی بەرخودان و پاراستنیان بینیوە. هەرچەندە چینە سەردەستەکانیان نامۆ و بێ کەسایەتی بوونە، ئەوا ڕاستیەکی دیکەی گرنگ ئەوەیە کە کوردان وەکو گەل بەو ئەندازەیە بەئازادی و رەسەن ماونەتەوە. بۆ نموونە ئەوەی سۆمەرییەکان، میسرییەکان، گریکەکان و رۆمای خوڵقاند شوێنگەی ڕێبەرایەتی چینە سەردەست و چەوسێنەرەکانە. ئەمانە لەمیانەی تواندنەوەی گەلەکانیان ئەم ڕۆڵەیان بینیوە. هەرچی لای کوردانە، چینی سەردەست بەردەوام لەم ڕۆڵە رای کردووە؛ بەشێوەیەکی سنووردار بەرپەرچوون و پاراستن و مەزنکردنی بنەماڵەی خۆی وەکو سەرەکیترین سیاسەتی ئەم جیهانە بینیوە. بێگومان ئەگەر ئەم رۆڵەیان یەکلاکەرەوەش نەبێ، وەکو هۆکارێکی گرنگ ئاماژە بەوە دەکات بۆچی کوردان نەیانتوانیوە بەشارستانییەتی بەهێز بگەن.

سەرەڕای ئەم لایەنە نەرێتییانە، رۆڵی کوردان لەچاخی یەکەمدا بایەخێکی مەزنی لەخۆوە گرتووە. هەروەکو تاڕادەیەك روون کرایەوە، وەکو ناوچەیەکی سەرەکی پەلهاوێشتن و سەنتێز شوێنگە و رۆڵیان لەگۆڕانکاری و گواستنەوەی شارستانییەتدا مەزنە. کوردان یەکێکن لەو کولتوور و گەلە سەرەکیانەی چاخی یەکەمیان خوڵقاند. لەتەواوی ئەو شارستانییەتانە و بەدەوڵەت بوونە ناوەندیانەی لەئێران، ئەنادۆڵ، رۆژهەلاتی دەریای سپی و میزۆپۆتامیا ئاوالکراوە بەردەوام رۆڵێکی کارایان بینیوە و هاوبەشێتیان کردووە؛ وەکو چەندین بەرپەوبەر و فەرمانبەر خزمەتیان کردووە. سەبارەت بەتێگەیشتنی مێژووی کوردان ئەم تایبەتمەندێتیانە گرنگە. لەمێژوودا بەدەگمەن فەوارەی تەنیا تایبەت بەکوردان دەبینرێ؛ بەلام مسۆگەر لەهەر فەوارەیەکی دراوسێدا رۆڵی گرنگیان هەیە.

تایبەتمەندێتییەکی دیکەی کوردان، یەکینەی سیاسی فیدراڵ و پێکهاتەی خێڵە بەرگریکارەکانە کە زمان و کولتووریان پاراستووە. لێکۆڵینەوەی چاخی یەکەم و مێژووی کوردانی دواتر لەمیانەی ئەم فۆرمیلە سەرەکیانە دەبێتە نزیکبوون و هەڵوێستێکی واقیعی. چونکە نموونە رەسەنەکەی وەهایە مێژوویکی نییە کە لە خۆمانەوە دروستمان کردبێت. لەڕاستیدا مێژوویکی وەهاش جێگای باس نییە کە ستایشی بکرێت. ئەو دەوڵەت و شارستانییەتانەی سەردەستەکان ئاوایان کردووە، ناشێ جێگای شانازی بێت. تەنیا پەند و وانەی لێ وەردەگیردرێت. سەبارەت بەگەلان لەم گۆشە نیگایەوە تەماشاکردنی مێژوو هەم واقیعی یە، هەم دادوەرانەترە و دەرفەتی ئەوە دەرەخسێنێ کە بە بەهاکانی ئازادی گرێدراو بن، لەجیاتی ئەوەی لەمیانەی پیاهەڵدان و هەڵوێست سەبارەت بەمێژوو نیشان بدرێت، هەڵوەستە کردن لەسەربنەمای ئەوەی کە رەنج و ئازادی، واتە رۆڵی خوڵقکاری چۆن بووە، بەکامە قۆناغ تێپەڕیوە و لەئەنجامدا رێگای لەپێش چی کردەوە، پەند و ئەزموونی زیاتری

لێدەکەوێتەوە. بەمجۆرە مێژوو واتایەکی مەزن لەخۆوە دەگرێت و هەنگاو هاوێشتن سەبارەت بەخوڵقێنەرە ڕاستەقینەکانی مێژوو ڕۆڵێکی ڕۆشنکەرەوە دەبینێ.

کوردان نوێنەرایەتی یەکەمین و گەورەترین کولتووری خوڵقێنەری سەردەمی نیۆلیتیک دەکەن. بێگومان بەهەڵواسراوی مانەوەیان لەقۆناخی نیۆلیتیکیش، بۆئەوە دەگەڕێتەوە کە بەهەزاران ساڵ بەقووڵایی ئەم ڕۆڵەیان بینیوە. هەروەکو بڵێی هەموو هێزی خۆیان لەخوڵقاندنی شۆڕش و کۆمەڵگای نیۆلیتیک بەکارهێناوە. گەلێك تا چ ڕادەیەك بەقووڵایی و بۆ ماوەیەکی درێژخایەن لەنێو کولتوورێك و شێوەیەکی کۆمەڵگادا ژیابێت، ئەوا بەو ئەندازەیە لەشێوەکانی دواتر بەپاشکەوتوویی ماوەتەوە. کاتێك لێکۆڵینەوە سەبارەت بەدیاردە و مێژووی کورد دەکرێت، بەردەوام پێویست دەکات ئەم ڕێسا گەردوونییە ڕەچاو بکرێت. بەشێوەیەکی گشتی هێزە لاوەکان شارستانییەتی جیاواز پێشدەخەن. لەسەردەمی فیوداڵی و چاخەکانی نزیکدا تادێت ڕۆڵی کوردان بێکاریگەر و کەم دەبێت؛ ئەو هێڵ و مەیلەی لەچاخەکانی یەکەمدا تێکەوتوون بەردەوامی پێدەدەن. ئەو گەل و کولتوورە سەرەکی و شکۆدارەی دەستپێکی مرۆڤایەتی، پێ بەپێ بەدایکێکی بەساڵاچوو دەچێت. ئەو ڕۆڵانەی بەدەستی خۆی خوڵقاندنی و لەبێشکەدا گەورەی کردن، ئەو مرۆڤایەتییەی مەزن بووە، خۆی لێ نەناس دەکات. ئەمە سەرەکیترین تراژیدیای کوردانە، لەڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا ئەم تراژیدیایە بەشێوەیەکی زۆر بەهەژمەت بەردەوامە؛ لەڕاستیدا بەرامبەر خیانەتی ئەم مێژووەی بەخۆی خوڵقاندی، خۆناسین و داواکردنی مافی خۆی کێشەیەکی زۆر مەزنە؛ ئەمەش هەروەکو هەڵوەستەی پڕ لەخەمگینی دایکانە بەرامبەر بەرۆڵە بێ خێرەکانی.

وەکو ئەنجام، کوردان لەنێو سیستەمی کۆیلەداری چاخەکانی یەکەمدا وەکو گەل و وڵاتی دەوروبەری ناوەندە بەهێزەکان ڕۆڵیان بینیوە؛ لە لەدایکبوون و گەشەکردن و پەلهاوێشتنی سیستەمدا بەکاریگەربوون. لەبەرئەوەی شوێنیان لەناوەڕاستی دەوڵەتە کۆیلەدارییە گرنگەکان بووە، بەردەوام بۆتە شوێنگەی داگیرکاری و تاڵان. لەکاتێکدا ئەم ڕاستینەیە توێژی سەرەوەی خێڵەکانی ناچاری بەکرێگیراویتی دەکرد، جەماوەرە سەرەکییەکەی دووچاری بەرخودان داخراوبوون لەناوخۆدا کردووە. دەوڵەمەندێتی جوگرافیاکەی لەبواری کانزا و کشتوکاڵ و ئاژەڵداری بووە بەفاکتەرێکی دیاریکراو لەپێکهاتنی ئەم ستاتۆیەدا. بەردەوامی فشارەکانی دەرەوە و پێکهاتەی توندی خێڵەکی، بۆتە کۆسپ لەپێش پێکهاتنی قەوارەی سیاسی پێشکەوتوو و هەمیشەیی. قۆناخێك بەرێوەچووە زیاتر لەسەر بنەمای فیدراسیۆنی خێڵەکان، ئۆرگانیزاسیۆنی سیاسی ناجێگیر و کورتخایەن ناواکراوە و بەپەرتەوازە بوونی ئەنجامگیر بووە. بەرژەوەندی تەسکی خێڵەکی و تێگەیشتنەکەی ڕۆڵێکی گرنگی لەمەدا بینیوە. بەرامبەر بەوەی کە چینی ژوور وەکو بەکرێگیراوی ناوەندەکانی شارستانییەتی بیانی بەشێوەیەکی سنووردار جێگای خۆیان لەنێو کۆمەڵگای چینایەتی کۆیلەداری گرتووە، بەشێوەیەکی سەرەکی گەل وەکو کۆمەڵەی عەشیرەتەکان لەنێو هەلومەرجی ئازادی و یەکسانی کۆمەڵگای نیۆلیتیکیدا

درێژەیان بەژیانی خۆیان داوە. لەسەر ئەم بنەمایە وەکو هێزێکی ئەتنیکی گرنگی رۆژهەڵاتی ناوین، جێگای خۆی لەدەرکەوتن و گەشەکردنی دەرەبەگایەتیدا بینیوە.

### ج ـ کورد لەسەردەمی دەرەبەگایەتیدا

لەدیالەکتیکی مێژووی کۆمەڵگاکاندا بەردەوام رێسایەك کاریگەر دەبێت: ئەویش ئەوەیە کە قەوارەیەکی کۆمەڵایەتی لەسەربنەمای کام فاکتەرە سەرەکییە ئاوەکی و دەرەکیەکان هاتبێتە ئاراوە، تاوەکو ئاواکردنی قەوارەیەکی نوێی کۆمەڵایەتی، لەژێر ئەم فاکتەرانە بەردەوام دەبێت. ئەمە پێویستییەکی دیالەکتیکی کۆمەڵگایە. هەلومەرجە ناوخۆو دەرەکیەکان کە رۆڵی بیرۆکە (سەنتێز) و دژە بیرۆکە (دژە سەنتێز) دەبینن تاوەکو بەسەنتێزێکی نوێ ئەنجامگیر دەبێ، لەچالاکی هاوشێوەدا درێژە بەرۆڵی خۆی دەدات. هەروەکو چۆن ناتوانرێ لەمیانەی داسەپاندنی ئارەزوومەندی (کەیفی) رێگا لەپێش قۆناخەکانی پێشکەوتنی کۆمەڵگاکان بگیرێت، ئەوا بەرامبەر بە نکوڵی و چەواشەکاری بەسووربوونەوە مەیلی بەردەوامکردنی هەبوونی خۆیان هەیە. هێز و قۆناخەکانی ئەزانی وەکو پێویستییەکی ئەزانی تا چ رادەیەك کۆسپ بنێتەوە، ئەوەی ئەنجام یەکلادەکاتەوە ئەو فاکتەر و تایبەتمەندێتیانەن کە بنەمای پێشکەوتنەکان پێکدێنن. دەشێ هێزی لەرادەبەدەری تێکدەر بێ، بەڵام بەشێوەی چەواشەکاریش بێت ناتوانێ درێژە بەهیچ پێشکەوتنێك بدات. فاکتەرە سەرەکیەکانی پێشکەوتن، شوێنگەی دیاردەکە لەنێو دەوروبەر و ئەو تایبەتمەندیانەی ناوەوەیەتی کە بەسەریدا زاڵە.

کاتێك تایبەتمەندێتیە سەرەکیەکانی دیاردەی کورد و ئەو دەوروبەرە هەڵدەسەنگێنین کە پشتی پێدەبەستێ، پێویست دەکات بەردەوام ئەم یاسا دیالەکتیکی یە لەبەرچاوان بگیرێت. هەروەکو چۆن تایبەتمەندێتیەکانی پێکهاتەی سەردەمەکانی نیۆلیتیك و کۆیلەداری و ئەو زەمینەی تێیدا دەجوڵێتەوە کاریگەری خۆی لەچەرخەکانی ناوینیش بەردەوام دەکات، ئەوا تاوەکو رۆژگاری ئەمڕۆمان و بەدیهێنانی وەرچەرخانی ریشەیی لێکچوون بەردەوام دەکات. کوردان بۆئەوەی لەمە رزگاریان بێت یان دەبێ بەتەواوی دەست لەخۆیان بەردەن یان بگۆڕێن و ببن بەشتێکی دیکە، یاخود بەشێوەیەکی جەستەیی پێویستە لەنێو ببردرێن. دەستبەردان لەخۆیان وابەسانایی نییە. هەرچی پاکتاوکردنی جەستەیی یە، کردەوەیەکە بەشێوەیەکی سنووردار دەتوانرێ ئەنجام بدرێ. ئەوەی دەمێنێتەوە؛ یان لەمیانەی شۆڕشی ریشەیی یان لەرێگای ریفۆرمی ئەرمترەوە وەرچەرخانێکی پلەبەپلەیی (تدریجی) ئەنجام بدرێ و لەم ستاتۆیە چەقبەستووە رزگاری بێت کە لە رادەبەدەر دەپەرژێنێ و هەنگاو بۆ قۆناخی هەڵسوڕانی نوێی دیالەکتیکی بهاوێژرێ. ئەوەی مۆری خۆی لەدیاردەی کورد داوە، لەسایەی جوگرافیایەکی لەبار بۆ خۆپاراستن و بەردەوامی هێرشەکانی دەرەوە، لەسەربنەمای

کاردانەوەیەکی گونجاو بەرامبەر ئەم دوو هەلومەرجە، زیانێکە لەسایەی راستینەی گەلێك کە لەژێر وشیاری و فۆرمیلەی خێڵەکیدایە. هەروەکو چۆن تایبەتمەندێتی لەباری جوگرافیا رێگای لە پێش کردنەوە چەرخی نیۆلیتك بخوڵقێنن، ئەوا داگیرکاریشی هێناوەتە ئاراوە. لەکاتێکدا لەباریەکەی بۆ کشتوکاڵ و ئاژەڵداری لەلایەك کۆمەڵگای پێشدەخست، ئەوا لەدەرەوەش تەماعکاری دەبزواند. دەوڵەمەندێتی کانزا، دەبێتە هۆی ئەوەی بەردەوام لەلایەن ئەو شارستانییەتانە ببێتە ئامانج کە پێویستیان بەکانزا هەیە. هەروەکو چۆن ئەم هۆکارانە لەسەردەمی ئاواکردنی شارستانییەتدا بەشێوەیەکی سەرەکی شێوەی بەدیاردەی گورد داوە، لەرۆژگاری ئەمرۆشماندا بەرادەی جیاوازی دەوروبەری دەرەوە دەگۆڕێ و ئەم رۆڵە بەردەوام دەکات. کاتێك هۆکارە دەرەکییەکان لەئاستێکی بڵنددا رۆڵی کۆسپ نانەوەیان لەپێش رۆڵی یەکلاکەرەوەی دەسپێشخەری ناوخۆ بینی، ئەوا گۆڕانکاری زیاتر لەدەرەوە سەرچاوەی دەگرێت و لەناوەوە وەکو پێشکەوتنێك کاردانەوە و رەنگدانەوەی دەبێت. ئەم رێسایەی کە لە چەرخی یەکەمیندا پەیرەوکرا، ئەوا لە چەرخی ناوینیش بەشێوەیەکی کاریگەرانەتر بەردەوام دەبێت.

ناتوانرێ بەشێوەیەکی سەربەخۆ باس لەدەرەبەگایەتیبوونێکی کوردان بکرێت. شارستانییەتی کۆماگەنا وەکو دواترین شارستانییەتی مەزنی سەردەمی کۆیلەداری کلاسیك، کاتێك لەسالانی ۲٥٠ ی زایینی لەژێر دەسەلاتی سیستەمی کۆیلەداری رۆما و ساسانی پەرتەوازە بوو، ئەوەی ماوەتەوە بەڕێوەبەرایەتی شارەکانە کە بەکرێگیراوەکان رۆڵی فەرمانبەریان تێدا بینیوە و کۆمەڵەی عەشیرەتە ئازادەکان بوون کە بەرەو شاخەکان پاشەکشێیان کردووە. قۆناخێکی مەزنی ململانێ و پێکدادان و تێکدان لەسەر میزۆپۆتامیای سەروو بەڕێوەدەچێت. ناوچە و شارەکان بەردەوام فەرمانڕەواکانیان لەگۆڕاندان. کاتێك دەرفەت بڕەخسێ و هاوسەنگییەکان لەباربێت، ناوە ناوە میرنشێنی سەربەخۆ ئاوا دەکرێ. هیچ کاتێك لەمێژوودا ئۆتۆنۆمیگەرایی کەم نابێت. بەڵام ئەمەش راستیەکە ئەم ئۆتۆنۆمیگەراییانە وابەسانایی ئیرادەی خێڵ تێپەڕ ناکات. قۆناخی ململانێی ساسانی ـ رۆما تاوەکو لەدایکبوون و پەلهاوێشتنی ئیسلامیەت بەردەوام دەکات. هەروەکو دەزانرێ ئەم دوو ئیمپراتۆریەتە کلاسیکە کە بەخێرایی بەرامبەر ئیسلامیەت پەرتەوازە دەبن. یەکلاکەرەوەترین فاکتەر لەمەدا ئەوەیە کە ئیسلامیەت وەکو ئایدیۆلۆژیا و کردەوە شێوەیەکی بالاتری کۆمەڵگایە و دەرفەتی ئەوەدەدات کە وەرچەرخان بەرەو سیستەمێکی شارستانییەت بکرێت کە ئەویش دەرەبەگایەتییە. تەواوی روونکردنەوەکانی دیکە گرێدراو بەم فاکتەرە سەرەکییە واتادار دەبێت.

لەبەرئەوەی لەیەکەم پەرتووکی هەڵسەنگاندنەکانمدا لەئاستی پێناسەکردندا شیکردنەوەی ئیسلامەمان کرد، لێرەدا دووبارەی ناکەمەوە، تەنیا بۆ بەبیرهێناوەی ئامـاژەی پێدەکەم. بەناوکردنی قۆناخی ئیسلامیەت بە سەردەمی دەرەبەگایەتی واقیعی یە. بێگومان بەهۆی جیاوازی مێژوویی و جوگرافی بەبێ ئەوەی لایەنە جیاوازەکان لەگەڵ دەرەبەگایەتی رۆژئاوا

ڕەچاو نەکرێت، لەمیانەی ئەم شێوازەی شارستانییەتی دەرەبەگایەتی کاریگەری لەسەر تەواوی ناوچەکە دەکات. لەگەڵ گەیشتن بەساڵانی ٦٥٠ ی زایینی ڤەبوونەکانی ئیسلامیەت، بەشێوەیەکی سەرەکی ئەو ناوچانەیان فەتح کردووە کە کوردان لێی نیشتەجێن. لەکاتێکدا ناوچە فراوانەکانی کشتوکاڵ و ناوەندی شارەکان بەتەواوی دەسەڵاتی خۆیان ئاواکردووە، ناوچە شاخاویەکان بەرخودانی باو بەرامبەر بیانیەکان بەردەوام بووە. لەکاتێکدا هێشتا تەرمی حەزرەتی محەممەد لەئەرز بوو، ئەو ناکۆکی و پێکدادانانەی ئیسلامیەت بەخۆیەوە بینی، لەگەڵ شەهیدکردنی ئیمام حوسێن و دەوروبەرەکانی لە کەربەلا گەیشتۆتە قۆناخێکی نوێ. کاتێك ئەمەویەکان دەسەڵاتیان گرتەدەست کە توێژی باڵادەستی فیدارسیۆنی قورەیشی کۆمەڵگای کۆن بوون، ڕێگای لەپێش فشارێکی زیاتر بۆ سەر توێژی هەژار و گەلانی دیکە کردۆتەوە. ئێران لەمیانەی پشتبەستن بە بنەما بەهێزەکانی شارستانییەتی کۆن جێگای خۆی لەرێزی ئەهلی بەیتی موسڵمانان گرت و لەمیانەی شێوازی شیعەگەرایی وەڵامی دایەوە کە شێوەی گۆڕانی ئیسلامیەتە بەگوێرەی هەلومەرجەکانی خۆی. ئەم بەرخودانەش یەکەمین نموونەی مەزنی جیابوونەوەی ریشەیی ئیسلامیەت و گۆڕانیتی بەگوێرەی هەلومەرجە خۆجێیەکان. هەرچی وەڵامی کوردانە بەرامبەر ئەمە، هەرچەندە لەگۆڕەپانێکی ستووردارێش بێت بەشێوەی عەلەویگەرایی بووە. هەرچی لەناوچە دەشتایی و ناوەندەکانی شارەکان بوو سونیگەرایی زاڵ بووە کە شرۆڤەی بنەماڵەی ئەمەوی باڵادەست بوو سەبارەت بەئیسلامیەت. لەسەرووی هەموویانەوە لەنێو عەرەبەکان و چەندین قەومی دیکە، جگە لەشێوەکانی پێشووتری پارچەبوون، پێشکەوتنی پارچەبوون و جیابوونەوەیەکی وەها بەشێوەیەکی ریشەدار جێگای باسە. بەکۆمەڵایەتی بوونی پێکهاتنی چینی نوێ لەبنەوانی ئەم جیابوونەوەیە شاراوە بوو. لەشێوازی کۆمەڵگای کۆیلەداری و پێکهاتە چینایەتیەکەی بۆ شێوازی کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی و پێکهاتە چینایەتیەکەی وەرچەرخان ئەنجام دەدرێت.

لەم چوارچێوەیەدا ئەنجامدانی پێناسەیەکی زانستیانەی هەرە راست سەبارەت بەئیسلامیەت، بایەخێکی مەزن لەخۆوە دەگرێت. تەنیا لەمیانەی دۆگما ئاینییەکانەوە هەوڵدان بۆ روون کردنەوەی ئیسلامیەت، زیاتر بەواتای دەمامکردنی راستی و شاردنەوەی لەنێو تاریکایی دێت. باڵادەستێتی دەرەبەگایەتی لەسایەی حوکمەتە ستەمکارییەکەی ئەم روونکردنەوە دۆگماتیکە ئاینییەی سەبارەت بە ئیسلامیەت وەکو فەرموودەی نەگۆڕی خوداوەند پێشکەش دەکات، بەمجۆرە بەدرێژایی چەندین سەدەیە باڵادەستییەکی هزری و ئەخلاقی لەسەر گەلانی رۆژهەڵاتی ناویندا ئاواکردووە. ئیسلامیەت سێیەمین قەڵەمبازی مەزنی چینی بازرگانی باوی نیمچە دورگەی عەرەبە. وەڵامی پێویستی یەکێتی و بوون بەهێزی سیاسی تیرە و هۆزە عەرەبەکان دەداتەوە کە لەمیانەی بازرگانی نێوان میسر، میزۆپۆتامیا، یەمەن و حەبەشە مەزن بوون. دوا هەڵمەتی شارستانییەتی بەرێشە سامی یە.

لەژێر ناوی ئیسلامیەت تەواوی عەرەبەکانی بیابان کۆ دەکاتەوە کە بەشارستانییەتەکانی دیکە گرێدراو نین و دەیانکات بەهێزی شارستانییەتی دەرەبەگایەتی. بەشێوەیەکی بابەتی قەومیەت بەهێز دەکات. هێزی یەکبوون کە چەمکی تیرەگەرێتی تێپەڕ دەکات لەئیسلامیەتدا زۆر بەهێزە. هەربۆیە ئەو هۆز و خێڵانەی لەچاخی ناویندا لەنێو رەوشی پەرتەوازەیی و دوور لەرۆحی یەکبوون، دەکەونە نێو پەیوەندی نزیکی قەومگەرایی. قەوم شێوەبەندییەکی دەرەبەگایەتی تایبەت بەچاخی ناوینە؛ لەنێوان ئەتنیك و نەتەوەدا شوێنگەیەك دەگرێت. گرێدانی زیاتر بەخاك و بازرگانی، زەمینەی ماددی یەکێتی قەوم بەهێز دەکات. دەرەبەگە خاوەن زەویەکان و بازرگانەکانی شار، لەمیانەی ئەم زەمینەیەی قەومدا دەبن بەخاوەنی دەسەڵاتێکی بەهێزتر. پێشخستنی قەومگەرایی عەرەبەکان لەلایەن ئەمەویەکانەوە بۆ ئەم هۆکارە ماددی یە دەگەڕێتەوە.

قەومگەرایی زیاتر لەنێو توێژی ژووردا پێشکەوتووە. لەم قۆناخەدا عەرەبێتی بۆ سۆزی پایەداری کراوە بەفەزیلەت و بیانوویەك. جۆرێکی شۆڤێنیزمی میللیگەرایی لەئارادا بووە. هەوڵدراوە لەژێر دەمامکی ئیسلامیەت هەم چینی باڵادەست هەم میللیگەرایی لەنێو یەکتردا بژین. ئەوەی لەسەردەمی ئیسلامیەتدا دەسەڵاتدار بوون بەشێوەیەکی گشتی جیاکاری و دەرفەتیان بەو نەتەوانە داوە کە خۆیان پێیەوە گرێداوە. چینە سەردەستەکانی عەرەب و فارس و تورك کە دەسەڵاتی ئیسلامیەتیان بەدەستەوە بووە، رۆڵیان لەوەدا بینیوە کە تایبەتمەندێتی خێڵە ئەتنیکەکانی ئەو قەومانەی خۆیان جێگای تێدا دەگرن بکەن بەتایبەتمەندێتی قەومی پێشکەوتووتر. بەڵام ئەوانەی لەمیانەی زمان و هەبوونی کولتووری خۆیان جێگایان لەدەستەڵاتدا نەگرت لەم بوارەدا بەدواکەوتوویی ماونەتەوە.

جیاوازی لەنێوان دیاردەی ئەتنیك و دیاردەی قەومگەرایی هەیە. ئەتنیك زیاتر فۆرمی زاڵی کۆمەڵگای نیۆلیتیك و کۆیلەداری چاخی یەکەمینە. تەواوی کۆمەڵەکان لەم قۆناخانەدا ناچاربوون هەریەکە و جێگای خۆی لەنێو گرووپێکی ئەتنیکی بگرێت. لەم چوارچێوەیەدا قەوارەی ئەتنیکی فۆرمێکی مێژوویی و دیاردەیەکی بابەتی یە. وشیاری ئەتنیکی لەقۆناخێکی جیاوازتردا دەکەوێتە رۆژەڤ. بەشێوەیەکی گشتی ئەمە لەئەنجامی پێویستی یەکبوون و خۆپاراستنی تیرە و خێڵەکان بەرامبەر بەهێزەکانی شارستانییەتی کۆیلەداری پێشدەکەوێت. لەکاتێکدا هەبوونی دیاردەی ئەتنیك بۆ ١٠ هەزار ساڵ پ.ز دەگەڕێتەوە، ئەوا وشیاری ئەتنیکی بەرامبەر هەوڵەکانی بەکۆیلەکردن و چەوساندنەوە پێشدەکەوێت کە لە ٣ هەزار ساڵ پ.ز بەدواوە پێشخرا. تاوەکو چەرخی ناوین بەردەوام دەبێت و لەوە بەدواوەش هەوڵەدات هێزی خۆی بپارێزێ. ئەم رابردووە مێژووییە رۆڵێکی سەرەکی دەبینێ لە هێندە بەهێزبوونی عەشیرەتگەرایی لەرۆژهەڵاتی ناویندا. هێندە بەقووڵایی بەرێوەچوونی عەشیرەتگەرایی لەناو کوردانیدا جگە لەوەی خولقێنەری کۆمەڵگای نیۆلیتیکن و بەشێوەیەکی سەرتاسەری لەنێو ئەم

سەردەمانەدا ژیاون. بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە بەدرێژایی کۆیلایەتی چەرخی یەکەم بەرامبەر بەهێرشە دەرەکییەکان بەردەوام لەنێو ڕەوشی بەرخودانیدا بوون. هۆکارە سیاسی و کۆمەڵایەتی و مێژووییەکانی عەشیرەتگەرایی کوردان زۆر بەرفراوانە. لەمیانەی شیکردنەوەیەکی قووڵدا زیاتر دەرکی پێدەکرێت.

هەرچی قەومە، زیاتر وەکو شێوەیەکی دەرەبەگایەتی چەرخی ناوین، وەکو فۆرمێکی سەرووتری ئەتنیك و عەشیرەت هاتۆتە ئاراوە. لەگەڵ زیاتر بوونی گرنگی گرێدان بەزەوی و بازرگانی و هاتنەئارای یەکێتی سیاسی بەشێوەیەکی بەرفراوانتر، لەپەیوەندی خێڵەکییەوە بەرەو پەیوەندیی قەوم گۆڕانکاری و پێشکەوتنی لەگەڵ خۆیدا هێنایە ئاراوە. لەم لایەنەوە ئیسلامییەت ڕێگای لەپێش کاریگەرییەکی بەهێز کردۆتەوە. ئەو ڕۆڵەی سەرمایەداری لەبەنەتەوەبووندا بینیویەتی ئیسلامییەت لەمیللیگەرایبوون و قەومبووندا بینیویەتی. هەروەکو چۆن دەمارگیری نەتەوەپەرستی وەکو مەیلی توێژی هەرە ڕاستڕەو و پاوانخوازەکانی سەرمایە دەرکەوتووە ئەوا قەومگەرایش لەئیسلامیەتدا وەکو مەیلێکی ڕاستڕەو دواکەتووترین چینی دەرەبەگەکانی زەوی و بازرگانەکان لەنێو میللەتە باڵادەستەکاندا پێشکەوتووە. ئەگەر بەشێوەیەکی زۆر ئاشکراش نەبێ، تەنانەت بەدەمامك کراویش بێت، ئەم مەیلە لەنێو ئیسلامیەتدا هەیە و بەهێزە. بەئەندازەی ئەوەی بەشێوەیەکی بابەتییە، ئەوا لەلایەنی خۆیشیدا ( سۆبژەکتیف) دەردەکەوێت. کاتێ هێشتا حەزرەتی محەممەد لەژیاندا مابوو ئەم مەترسیەی بینبوو، بۆیە ناچاربووە بڵێ " هیچ جیاوازیەك لەنێوان عەرەب و عەجەمێکدا نییە، تەنیا بەعیبادەت نەبێ". کاتێك لینینیش زیندوو بوو، ئاگاداریەکی هاوشێوەی ئەمە بەرامبەر بە شۆڤێنیزمی ڕوس دەکات.

لەنێو عەرەبەکاندا شۆڤێنیزمی عەشیرەتگەرایی قەوم وەکو گەوهەری زاراوەی (ئەصحابیەت) بەشێوەی هەستێکی بەهێز لەئارادایە. هەروەها پێشکەوتنی ئەوپەڕگەری سۆزداری خێڵەکیش جێگای باسە. شێوەیەکی شۆڤێنیزمی خێڵەکی لە کۆمەڵەی ئەتنیکی نەتەوەکان و ئەو قەومانەی پێشنەکەوتوون بەشێوەیەکی بەهێز درێژە بەهەبوونی خۆی دەدات، هەندێ جار ڕەوشی خۆپاراستن تێپەڕ دەکات و دەشێ ببێتە هێرش بەر. هەرچەندە ئیسلامیەت، بەتایبەتیش لەڕێگای حەزرەتی محەممەد خواستبێتی ئەم هەستانە تێك بشکێنێ، بەڵام سەرکەوتوو نەبووە. تەنانەت بنەماڵەی دەسەڵاتدار، گەیشتۆتە ئاستێك کە خۆی لەتەواوی تیرە و هۆزەکان زیاتر بەڕەسەن نیشان بدات و پەسند بکات.

گونجاندنی ئیسلامیەت لەلایەن گەلانەوە بەگوێرەی کولتوور و هەلومەرجە خۆجێیەکانیان، دەرکەوتنی مەزهەب و تەریقەتی جیاوازی لەگەڵ خۆیدا هێناوە. لەکولتووری ڕۆژهەڵاتی ناویندا، بەتایبەتیش لەدوای ئیمپراتۆریەتی ئاشووریەوە، لەیەکینەکانی بەبنەما ئەتنیکی بەرەو یەکینەی بنەما تەریقەتگەراییەکان پێشکەوتنێکی نوێ سەریهەڵدا. ئەم

یەکینانەی بۆ یەکەمین جار لە ٥٠٠ پ.ز بەربڵاو بووەوە دەکەوێتە نێو فۆرمی هزر و باوەڕی. خەڵکانی هەموو قەوم و تیرە جیاوازەکان، یەکینەی وەها ناوا دەکەن کە هەمان باوەڕی و رەوشت و هەڵسوکەوتیان هەیە. دەشێ ئەمانە وەکو شێوازێکی سەرەتایی رێکخستنی چینە چەوساوە و زۆرلێکراوەکان پێناسە بکرێت. لەکاتێکدا توێژەکانی سەرەوەی تیرە و قەومەکان لەنێو دەوڵەتە فەرمیەکاندا خۆیان رێك دەخەن، ئەوا چینەکانی ژێر دەخوازن جگە لەوشیاری ئەتنیکی، لەمیانەی ئەو باوەڕی و بۆچوونە سۆفیگەرایيە نیونهێنیانە ئەو تەنیایی و بێچارەییە بەلاوە بنێن کە تێیکەوتوون. دەتوانرێ ئەمانە وەکو نموونە سەرەتاییەکانی یەکەمین بەپارتیبوونی ئۆپۆزسیۆن هەڵسەنگێنرێت. باوەڕی نیو نهێنی سۆفیگەرایی دەبنە نموونەی رێکخستنی هەژاران و دەزگاکانی فەلسەفەگەرایی گریك و بلیمەتی میزۆپۆتامیا و پێغەمبەرایەتی شێوەی پێشکەوتووی ئەم مەیلەن.

تەنانەت عیساش کاریگەری تەریقەتێکی ساق هەژارانی لەسەرە کە بەرلەو پێشکەوتووە و بە ئەسەنیەکان ناو دەبرێن. لەماوەی نێوان ٥٠٠ ی پ.ز تا ٥٠٠ ی زایینی کە هێشتا موسڵمانێتی و مەسیحیەت بەتەواوەتی باڵادەست نەببوون، بەپشتبەستن بەمجۆرە بۆچوونانە، قۆناخی تەریقەتەکانی جێگای باس بوو. بۆ نموونە لەجیهانی گریك و رۆمادا، لەسەرووی هەموویانەوە ستۆواگەرایی، ژمارەیەکی زۆری گروپی باوەڕی بەمجۆرە مرۆڤیان راکێش دەکرد. یەکێك لەهەنگاوە هەرە بەهێزەکانی میزۆپۆتامیا لەم قۆناخەدا جوڵانەوەی مانی یە. ئەم مەیلەی لەساڵی ٢٥٠ ی زایینی یەکلابۆتەوە سەنتێزێکی لەمەسیحیەت، زەردەشتایەتی و بودیزم خولقاندووە، خواستوویەتی رێنسانسێك ئەنجام بدات. لەسەرەتادا زۆر بەکاریگەر بووە. مانی خواستوویەتی لەپایتەختی ساسانیەکان کتیسۆفۆن تاوەکو رۆما لەمیانەی ئەم باوەڕەوە نەوەیەکی ئاشتی بخولقێنێ. هەروەکو دەزانرێ یەخۆی لایەنگری شەڕ نەبووە. سەنتێزی پێشووی کۆماگەنا قوولدەکاتەوە و دەخوازێ درێژەی پێبدات. بەڵام راهیبە فەرمیەکانی ساسانیەکان کە بەرژەوەندیان گرێدراوی دوژمنایەتی و شەڕە، لەیەکەمین دەرفەتدا لەئەنجامی پیلانگێڕیەکدا بەشێوەیەکی دڕندانە دەیکوژن و تیرۆرێکی مەزن لەسەر لایەنگرەکانی پەیڕەو دەکەن. ئەگەر مانی بیتوانیبایە سەرکەوتن بەدەست بێنێ، ئەوا لەوانەیە یەکێك لەهەنگاوە سەرەکیەکانی شارستانییەتیکی شێوازی ئەورووپا دەبووە رێنیسانسی رۆژهەڵاتی ناوین.

تەنانەت ئیسلامیەتیش بەشی خۆی لەکاریگەری مەزهەبی باوەڕی تاکخودایی وەرگرتووە کە لەم قۆناخە لەمەککە بە حەنەفیەکان ناو دەبران. تاکو بڵێی حەزرەتی محەممەد سوودی لە مەسیحیەت، یەهودیەت، حەنەفی و ئاگرپەرستی وەرگرتووە و ئیسلامیەتی وەکو سەنتێزی ئەو باوەڕی و تێڕوانینە پێکهێناوە. لەبەرئەوەی ئیسلامیەت لەگەوهەری خۆیدا لەئەنجامی پێشکەوتنی ئەو باوەڕی و هزرانە بەشێوەیەکی واقیعی لەژێر سایەی هەلومەرجە نوێکان وەڵامی پێداویستییە یاسایی و سیاسی و کۆمەڵایەتیەکانی و ئابووریەکانی قۆناخی دەدایەوە،

پێشکەوتنێکی مەزنی بەخۆوە بینیوە. باوەڕیەکی وەها بەهێز و جیهانی هەزر لەژێریدا شاراوەیە. لەم چوارچێوەیەدا حەزرەتی محەممەد هەم ریفۆرمخوازێکی مەزنە هەم شۆڕشگێڕە. لەمێژوودا ماوەی نێوان ٥٠٠ ی پ.ز و ٥٠٠ زایین بەقۆناخی هزر و باوەڕی مەزن ناو دەبرێت. هۆکارەکەشی ئەوەیە کە تەواوی باوەڕی و هەزرە فەلسەفی و ئەخلاقیەکانی کاریگەرییان لەچارەنووسی مرۆڤایەتی کرد. لەم قۆناخەدا لەلایەن دامەزرێنەرە مەزنەکانیان پێشکەش کران و پێشخران. لەلایەنێکەوە دەشێ بەقۆناخی رەوتەکانی هەزر و تەریقەتگەراییش ناو ببرێت. لەگەڵ ئەوەی ئەم هزر و تەریقەتانە کاریگەری لەیەکتری دەکەن، کارەکتەریان رەسەنە. بێگومان کاریگەری میتۆلۆژیای چاخی دێرینیان لەسەر هەیە. هەڵبەتە دەرکەوتنیان وەکو کاردانەوەیەك ئەنجامێکی ئەم کاریگەرییەیە. لەمیانەی لێپرسینەوەی باوەڕی و میتۆلۆژیا وشك و دۆگماتیەکانی کۆیلەداری چاخی یەکەمین سیستەمی خۆیان پێشخستووە. لەرۆژهەڵات کۆنفیشیۆس، بودا، زەردەشت، لەرۆژئاوا سوکرات، سەردەمی کلاسیکە مەزنەکان، بناخەی ئایدیۆلۆژی و ئەخلاقی بەلاوەنانی کۆیلەداری و پێشکەوتنی شارستانییەتی دەرەبەگایەتی پێکهێناوە.

هەرچی قۆناخی ٥٠٠ - ١٥٠٠ زایینی یە چەرخێکی بەهێزی باوەڕی جێگای باسەکە زیاتر مەسیحیەت و ئیسلامیەت و بودیزم مۆری خۆی لێداوە. ئەم قۆناخە سەردەمی دەرەبەگایەتی یە. لەمیانەی باوەڕی بەهەمبوون و یەکبوونی خودا کە بناخەی ئایدیۆلۆژی سیستەمی ئاواکراوە و لەگەڵیدا رێکە، ئامانجی ئەوە بووە ئەم چاخە بکات بەچاخێکی بێ کۆتایی( ) هەروەکو چۆن هەرسەردەمێك خۆی وەکو یەکەمین و دواترین سیستەم رادەگەیەنێ. ئەوا سەردەمی دەرەبەگایەتیش بەپشتبەستن بەهەمبوون و یەکبوونی خودا لەچوارچێوەی ئایدیۆلۆژیایەکدا خواستوویەتی خۆی بکات بەسیستەمێکی ئەبەدی. ئەم راستینەیە کە بنەماکانی پێکهێنانی لە چاخی وشکە باوەڕیدا شاراوەیە. لەگەڵوهەری باوەڕی و چەمکی پەیوەندیەکانی چەوساونەوە و بەڕێوەبەرایەتی کۆمەڵگای چینایەتی لەباوەڕی و چەمکی " خودای ئەمر، سیستەمی ئەبەدی" شاراوەیە. دەمامککردن و نیشاندانی وەکو فەرمانێکی پیرۆز، لەهێناو ئەو سیستەمە بەرژەوەندیخوازیەیە کە دەیپەرستێ. ئەوەی دەخوازرێ لەکەسایەتی خوداوەندا بکرێت بە ئەمرونەبەدی بەرژەوەندی و باڵادەستی خۆیانە.

شیکردنەوەیەکی وردکارانە سەبارەت بە پەیوەندی نێوان هێڵکاریە ئایدیۆلۆژیەکان و سیستەمی چەوسانەوە و ستەمکاری چینایەتی و بەشێوەیەکی رۆشنکەرەوە پێشکەشکردنی بەچەوساوە و زەحمەتکێشان، لەسەرووی ئەرکەکانی رۆشنگەری دێت. چونکە بەبێ شیکردنەوەی سەردەمی وشکە باوەڕی کە هەزاران ساڵ بەردەوام بووە ناتوانرێ واقیعی کۆمەڵگای جیهان بەگشتی و بەتایبەتی کۆمەڵگاکانی رۆژهەڵاتی ناوین روون بکرێتەوە و بەچەمکێکی مێژوویی و کۆمەڵایەتی راست بگەین. هەروەها بە بەهاکانی لێپرسینەوەی

عەلمانیەتی ساختە و باوەڕیە کوێرانەکان ناتوانرێ دەرك بەم سەردەمە بکرێت کە هەزار ساڵی خایاند. لێکۆڵینەوەی تەواوی ئەم وشکە باوەڕە دۆگماتییانە وەکو زنجیرەیەکی بەڵگەی مێژوویی و ئەدەبی و شیکردنەوەیان و دیاریکردنی ئەم ڕاستینە چینایەتی و کۆمەڵایەتی و سیاسیانەی لەناواخنی خۆیدا شاردۆتەوە، مەرجێکی سەرەکییە بۆ ڕۆشنکردنەوەی ڕۆژهەڵاتی ناوین و پێویستییەکە دەستبەرداری لێناکرێت. قەبوون بەرەو عەلمانیەتی رووکەشی ڕۆژئاوایی و جیهانی باوەڕی کە سەرلەنوێ دەخوازرێ زیندوو بکرێتەوە، ئاستەنگێکن کە ئەم ئەرکە مێژوویی یە پووچەڵ دەکەنەوە. تاوتوێکردنی تەواوی شارستانییەتەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوین و بەڵگە میتۆلۆژی و ئایینی یە دەوڵەمەندەکان و لەسەرووی هەمووشیانەوە سەرچاوە ئایدیۆلۆژیەکان و ئاسەوارناسیەکان و سەرچاوە ئەدەبیەکان بەپێڕەوێکی لێکۆڵینەوەی زانستی، بەهەوڵێك دادەنرێت بۆ ڕوونکردنەوەی پێکهاتە و گۆڕانکاری ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی کۆمەڵگا لەپێناو قەڵەمبازێکی نوێ.

کاریگەری ئیسلام لەسەر کوردان لەم چوارچێوە سەرەکیەدا بووە. چینی سەرووی عەشیرەتی خەرەکی و میرنشینەکانی زەوی، یەکەمین توێژن کە تەسلیم بوون و لەگەڵ بنەماڵەی ئەمەوی و عەباسیەکان لەنێو پەیوەندیەکی نزیکدا بوون؛ شرۆڤەی سوننی ئیسلامیەتی فەرمییان پەسند کردووە و تەواوی پەیوەندییەکانی خۆیان بەگوێرەی دەسەڵات گونجاندووە. لەبواری زمان و کولتووردا ئەمجارە کەوتوونەتە ژێر کاریگەری زمانی عەرەبی. ناو و شێوازی ژیان و تەنانەت ڕەچەڵەکی خۆشیان بەعەرەبەکانەوە گرێداوە و، لادان بەرەو نکوڵیکردن لەخود لەبەرژەوەندی خۆیاندا بینیوە.

لەقۆناخی دەسەڵاتدارێتی عەرەبەکان بەسەر ناوچەدا پێشکەوتن لەشارستانییەتی دەرەبەگایەتی بەدیهاتووە. تەواوی وڵات بەگوێرەی زلراوە عەرەبیەکان ناوی لێنراوە، بۆ یەکەمین جار بە ئەکراد واتە کوردەکان موخاتەبەی گەل کراوە. لەگەڵ ئەوەی نکوڵیان لەکوردان نەکردووە، قولپ لێدان لە بەرابردووەکەیان و گرێدانیان بەخۆیان زیاتر بەگوێرەی سیاسەتی خۆیان بینیوە. یەکبوونی چەمك و پەیوەندی بەمجۆرە لەگەڵ بەشی سوننی دا گەیشتۆتە ئاستێکی بڵند. لەشوێنە بەبەرهەمەکانی ناوچە بەتایبەتیش لەشوێنە ناویەکاندا و کەناری ڕووبارەکان ژمارەیەکی زۆری دانیشتوانی عەرەب بەجێکراون، تاوەکو بنارەکانی تۆرۆس بڵاوبۆونەتەوە، تاوەکو بڵێی توانەوە لەنێو کولتوور و زمانی عەرەبیدا پێشکەوتووە. بەرامبەر ئەمەش چینی ژێرەوە و ئەداری عەشیرەتەکان و ئەوانەی لەناوچە شاخاویەکان دەژیان تایبەتمەندێتی بەرخودان کردنیان پاراستووە، لەهەندێ شوێندا بەئاخافتن ئیسلامەتیان پەسند کردووە، سەبارەت بەپاراستنی باوەڕی و ژیانی خۆیان بەبڕیار بوون. ئەو توێژەی لەسەر ئەم بنەمایە جوڵاونەتەوە، زیاتر بەشێوەی عەلەویگەرایی کوردان بەتەواوەتی بەجێ بوونە؛ بەشێوەیەکی سنووردار ئیسلامیەتێکیان پەسند کردووە کە بەگوێرەی هەلومەرجەکانی

ژیانی خۆیان گونجێنراوە. ئەمەشیان لەئەنجامی فشار و توندوتیژی نەبزاردووە، بەڵکو وەکو دڵسۆزیەك بەرامبەر بەو ستەمە ئەنجامیانداوە کە دەرهەق بە ئەهلی بەیت کراوە، عەلەویگەرایی کوردان هەڵوێستێکە کە کەمترین پەیوەندی لەگەڵ ئیسلامیەتدا هەیە. بەجۆرێکە تەنانەت ناتوانرێ بەمەزهەبیش دابنرێ. عەلەویگەرایی کوردان هەندێ لایەنی ئیسلامیان وەرگرتووە کە ژیانیان دەوڵەمەند دەکات و وەکو دەوڵەمەندیەکی کولتوورییان بینیوە، پەیوەندی سەبارەت بەدۆگما ئایینی یە وشکەکان نیشان نەداوە. لەم لایەنەوە دەتوانرێ بگوترێ کە لە رەتکردنەوەی تایبەتمەندێتییە دواکەوتووە نەتەنیکی و قەومگەراییەکانی ئیسلامی سونی و پەسندکردنی هەندێ تایبەتمەندێتی باشی، باشترین هەڵوێستی نیشانداوە. ئەگەر ئەم هەڵوێستەی عەلەویگەرایی نوژەن بکرێت و بەشرۆڤەیەکی زانستی بگەیەنرێت، دەشێ رۆڵێکی گرنگ لە رۆشنگەریدا بگێرێ. عەلەویگەرایی جێگایەکی تایبەتی هەیە لەهەستکردن و وەستان لەدژی چەوسانەوە و فشاری ئەو چینە بالادەستەی کە لەهەناوی ئیسلامدا هەیە. کەموکورتیەکەی، پێشنەخستنی شرۆڤەیەکی ئایدیۆلۆژی بەهێز و تێپەڕنەکردنی ئاستی تەریقەتی سەرەتایی و سۆزدارییە.

بەرامبەر بەئیسلام زەردەشتایەتی نوێنەرایەتی بەبڕیارترین توێژی بەرخودانی کوردان دەکات. ئەم بەرخودانە لەمەزنەکان زیاتر پێویستی بەشیکردنەوەیەکی زیاتر هەیە. بەهۆی هێرشی بەرفراوانی ئایدیۆلۆژی و فشاری سیاسی و ئابلۆقەی ئابووری بەو هێزە نەگەیشتووە کە بەشێوەیەکی راست گوزارشت لەراستینەی خۆی بکات. لەم لایەنەوە بەعەلەویگەرایی دەچێت. بەڵام تاوەکو ئەمڕۆ درێژەدان بەهەبوونی خۆیان ئەوە نیشان دەدات کە بەژیانێکی زۆر سەختدا تێپەڕیون و بەرخودانەکەیان واتادار دەکات. ئەم سێ جۆرە ئەزموونەی کوردان بەرامبەر بە ئیسلامیەت، فاکتەرێکی گرنگی پێشنەکەوتنی یەکێتی نەتەوەیی پێکدێنێت. کاتێك ئەم بەها بیانیانەی دەرەبەگایەتی بێتە سەر ئەو پارچەبوونە ئەتنیکی و بەکرێگیراوێتیەی لە چەرخەکانی یەکەمدا ماوەتەوە، ئەوا رێگای لەپێش نامۆبوون و پارچەبوونێکی قووڵتر کردۆتەوە. لەگەڵ ئەمەشدا لەئاستی چینایەتیدا پێشکەوتن بەدیهاتووە. بەشێکی گرنگی دەرەبەگ و بازرگانەکان بوونە بەچینێکی خاوەن موڵك. ترازاندنی ئاستی ئازادی و یەکسانی نێو پێکهاتەی عەشیرەت گەیشتۆتە ئاستێکی بەرز. کۆمەڵگا بەقووڵایی دابەشبوونی چینایەتی بەخۆیەوە بینیوە. بە بەراوردکردن لەگەڵ ئاژەڵداری، گرێدان بەخاك و جووتیاری پێشکەوتنی بەخۆیەوە دیوە. لەتایبەتمەندێتی کۆمەڵگای شوانکاری بەخێرایی بەرەو کۆمەڵگای کشتوکاڵی هەنگاو هاوێشتراوە. بەپێی دەشتەکانی میزۆپۆتامیا رۆڵێکی گرنگی لەمەدا بینیوە. لەپێشکەوتنی چینی بازرگانیشدا پەرەسەندن دەبینرێ. بەڵام ئەوەی مۆری خۆی لەبازرگانی داوە، بازرگانە عەرەبەکانن. ئەرمەنی وسریانیەکان لەگەڵ ئەوەی ئایینی

مەسیحی خۆیان پاراستووە، کەوتوونەتە نێو رەوشی هاوڵاتی پلەدوو. بەڵام لەنێو هەندێ هەلومەرجی دیاریکراودا بەئازاد هێڵراون کە ناسنامەی ئایینی خۆیان بپارێزن.

لەم لایەنەوە ئیسلامیەت چینی سەردەستی کوردی بەرامبەر بەگەلە مەسیحیەکان کردۆتە خاوەنی شوێنگەیەکی بەهێز. لەسایەی دەوڵەتی ئیسلامیدا بەرامبەر بەم گەلانە بوونەتە چەندین تواناکاری. بێگومان شرۆڤەی سوننی ئیسلامیەتی چینی سەردەستی کورد لەنزیکەوە پەیوەندی بەبەرژەوەندی ماددیەوە هەیە. لای ئەمانە ئایین و بەرژەوەندی ماددی لەنێو پەیوەندییەکی بەهێزدایە، ئەمەش لەمناواخنی ئەوەدا شاراوەیە کە تەواوی ئەو تایبەتمەندێتیانەی کۆمەڵگا دەخەنە پلەی دواوە کە لەگەڵ ئەمەدا کۆك نین و بەتەواوی هێزی خۆی جێگای لەرێزی ئیسلامی فەرمی گرتووە و ئەمەیان کردووە بەسیاسەتێکی سەرەکی خۆیان.

بەپێچەوانەی مەزهەبەکان ئەمانە لەبەرئەوە نەبوونەتە موسڵمان کە زۆرباوەڕییان بە دۆگما ئایینیەکان هەیە. لەبەرئەوەی باشیان دەزانی کە لەنێو زەمینەی باوەڕی وشك و دەمامکی دۆگماتیزم دەتوانن بەرژەوەندییە ماددیەکانیان بەدەست بێنن و ببن بە هێزێکی سیاسی، بەردەوام پێویستی ئەوەیان بینیوە کە خۆیان لەئیسلامیەتی فەرمی بناڵێنن. لەحیاتی چینی دەرەبەگ چینی بۆرژوای خۆجێییش هەوڵدەدات لەم لایەنەوە سوود لەئایدیۆلۆژیای ئیسلام ببینێ. لەپێچە و ئازادی باوەڕی زیاتر، مەسەلەکە لەوە سەرچاوە دەگرێت کە بۆ چینی بۆرژوا گۆڕاوە.

ئەو وەرچەرخانەی لەگەڵ ئیسلامیەت لەئایدیۆلۆژیای چەرخی ناوین بەدیهات، لەگەوهەری خۆیدا دواترین قۆناخی پێشکەوتنی ئایینی تاکخودایی پێکدێنێت کە ریشەکەی بۆ میتۆلۆژیای سۆمەر و میسر دەگەڕێتەوە. سادەترین قۆناخی ئەم ئایدیۆلۆژیایە، ئەفسانەکانی لەدایکبوونی شارستانییەتی سۆمەرە. ئەمە رەسەنەکەیەتی. لەمیانەی دەمامکێکی میتۆلۆژی روونکردنەوە بەبنەما دەگرێت، گوایە سیستەمی چەوسانەوەی کۆیلەداری پێویستییەکی سیستەمی ئاسمانی یە و نوێنەرەکەیەتی لەسەر زەوی. تەواوی وردەکارییەکانی دیکە، پەرستگا و عیبادەتەکان رۆڵی زاڵکردنی سیستەم لەهزردا و شکۆمەندکردنی لەرۆحدا پێدەدرێ. یەکەمین ناوەندەکانی عیبادەت وەکو مزگەوت، کلێسە، حەورا، پەرستگاکانی سۆمەرە. یەکەمین عیبادەت لێرە ئەنجامدراوە.

دووەمین وەرچەرخانی گرنگی ئەم ئایدیۆلۆژیایە نەریتی ئیبراهیمییە کە بەشێوەی ئایینی تاکخودایی و پێغەمبەرەکانە کە نوێنەری خوداوەندن. رۆژ بەدوای رۆژ زیاتر دەسەلمێنرێ کە بەشێوەیەکی بەرفراوان کاریگەری میتۆلۆژیای میسر و سۆمەری کراوەتە سەر. لەمیانەی مەسیحیەتەوە وەرچەرخانێك بەدیدێت، کە کاریگەری ئەخلاقگەرایی زەردەشت و فەلسەفەی یۆنانی لەسەر سێیەمین شەپۆلە. بوونی ئیسلام بەدوا ئایین و حەزرەتی محەممەد بەدوا

پێغەمبەر، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە حەزرەتی محەمەد لەنزیکەوە ئەم راستیەی بینیوە و هەڵیسەنگاندووە. لەمیانەی ئەم وتەیەدا ئەمە واتادارتر دەبێت کە بەپێچەوانەی ئەوەی باوەڕی پێدە هێنرێ، لەگەڵ حەزرەتی محەمەد سەردەمی میتۆلۆژیا و هزری ئایینی دەکەوێتە قۆناخی پووکانەوە و لەناوچوون. لەڕاستیدا دوا پێغەمبەرایەتی گوزارشت لەوە دەکات کە لەم قۆناخە بەدواوە سانایی نییە لەرێگای میتۆلۆژیا و ئایین مرۆڤ و کۆمەڵگا تێر بکرێت و بەرێوە ببرێت. ئەمە هەڵسەنگاندنێکی واقیعی یە. بەڵام دوای حەزرەتی محەمەد گۆڕانی ئیسلام بۆ دەمارگیری و رێسای وشك، بەهۆی بەرژەوەندی بازرگانەکان و دەرەبەگە خاوەن زەوی و زارەکان بوو کە تازە هەڵدەکشان.

لەم لایەنەوە ئیسلامیەت یەکێکە لەموحافەزەکارترین ئایدیۆلۆژیاکان. بەتایبەتی لەدوای کۆچی دوایی حەزرەتی محەمەد و پاکتاوکردنی ئەهلی بەیت و دواتریش لەمیانەی هەردوو بنەماڵەی ئەمەوی و عەباسی قۆناخێکی وشك و کۆنەپەرستی دەستپێکردووە. لەگەڵ سەرکوتکردنی چەندین تەریقەتی باتینی کە نوێنەرایەتی گەلیان دەکرد، تاریکاییەکی سەرتاسەری باڵی بەسەر رۆژهەڵاتی ناویندا کێشاوە. قۆناخی نێوان سەدەکانی ١٠ ــ ١٢، قۆناخێکی تێکۆشانی ئایدیۆلۆژی ــ پراکتیکییە کە کاریگەری لەسەر تەواوی مێژوو دەکات. تەواوی جولانەوەکانی باتینی لەسەرووی هەمووشیانەوە خەواریجەکان، خورەمیەکان، بابەکیەکان، قەرمەتیەکان، حەشاشیەکان و ئیسماعیلیەکان کە وەکو جولانەوەی هەژاران و چەوساوەکان هاتنە ئاراوە، لەڕاستیدا هەم لەبواری ئایدیۆلۆژی هەم پراکتیکی تێکۆشانێکی مەزنیان کردووە؛ نوێنەرایەتی جۆرێکی سۆسیالیزمی سەرەتاییان کردووە. بەڵام لەبەرئەوەی هێشتا پەیوەندی و هێزی بەرهەمهێنانی شێوەی دەرەبەگایەتی پێویستییان بەخۆوە نەبینیبوو، سەرکەوتنی تەواوی ئەم جولانەوانە بەدینەهاتووە. بەڵام دیسان جێگایەکی گرنگیان لەمێژووی تێکۆشانی ئازادی و یەکسانیدا هەیە.

یەکێك لە ناوەندە سەرەکیەکانی ئەم تێکۆشانانە ئەو ناوچانەن کوردان تێیدا نیشتەجێن. لەکاتێکدا سەردەستەکانی کوردان تەقلی ئیسلامی سوننی فەرمی بوون، ئەوا بەشی زۆرینەی گەل جێگایەکی گرنگی لەتەواوی جولانەوە باتینیەکان هەبوو. عەلەویگەرایی و زەردەشتی شێوەکانی ئەم تێکۆشانەن کە لەسەر پێیان ماونەتەوە. لەگەڵ ئەوەی لەسەرەتای سەدەی دوانزەهەم تاوەکو رۆژی ئەمڕۆمان دەرگای "ئیجتهاد" داخراوە، تاریکترین قۆناخ لەمێژووی رۆژهەڵاتی ناوین کراوەتەوە. لەژێر ناوی کوێرانەترین و پووچترین دۆگماتیزم و رێسای ئایینی نەگۆڕ قۆناخێکی باڵادەستی لەسەر جیهانی رۆحی و هزری مرۆڤ و گەلانی رۆژهەڵاتی ناوین دەستپێکردووە کە هێندە پاشڤەڕۆ و کۆنەپەرستە کە لەهیچ قۆناخێکی مێژوودا هاوتاکەی نەبینراوە. هەنگاوانی شارستانییەتی رۆژهەڵاتی ناوین بۆ قۆناخی رووخان و دواکەوتن،

لەنزیکەوە گرێدراوی ئەم داخراوبوونە ئایدیۆلۆژیە و قۆناخی تاریکایی یە. تاوەکو رۆژگاری ئەمرۆمان ئەم باڵادەستیەی بەشێوەیەکی سەرەکی بەردەوامە.

ئاشکرایە کە شرۆڤەی سوننیگەرایی ئایدیۆلۆژیای ئیسلامی چەرخی ناوین رۆڵێکی خراپەکارانەی کردۆتە سەر جیهانی مەعنەوی کۆمەڵگای کورد. بەڕێوەبردنی ئەم رۆڵە لەرێگای چینی سەردەست کە وەکو ئاغای زەوی و سەرۆك خێڵ خۆیان بەدەزگا کردووە، خراپەکاری بەرەو فشارێکی سەرکوتکەرانە و جیهانێکی تاریك گواستووەتەوە. هەرچی کاریگەری بلیمەتی و نەریتی باوی گەلە پێ بەپێ کەم بۆتەوە و گەندەڵ بووە. کاتێك بۆچوون و باوەڕی زەردەشتی و عەلەویگەراییش بەهەمان شێوە بەدەزگابوون زیاتر بنەماڵە بەکرێگیراوەکان جڵەویان پێدرا، ئەوا رێگای ئەو رۆشنگەری و ئازادیەش بنبەست بوو کە لەم رێیەوە بەهێز دەکرا. پێ بەپێ ئەو پێکهاتە و هزر و ئازادیخواز و یەکسانیخوازەی کوردان لەسەردەمی کۆمەڵگای نیۆلیتیکەوە بەدەستیان هێناوە لەنێو تاریکایی ژێر خاك کراوە و لەژێر ناوی تەسلیم بوونی قەدەر لەلایەنی ئیرادەوە ملکەچی بۆ سیستەم کردووە. سەرەکیترین خراپەکاری چەرخی ناوین لەسەر کوردان ئەوەیە کە قەدەرگەرایی کردووە بەفەلسەفەیەکی سەرەکی. لەڕاستیدا پڕوپاگەندە ئایینی یە مەزنەکان ئەم رۆڵەیان بینیوە. بەقووڵایی شیکردنەوەی ئەم رۆڵەی ئایدیۆلۆژیای فەرمی و رەنگدانەوەی ئەنجامەکانی بەشێوەیەکی ئەلتەرناتیڤی و راست لەنێو گەلدا ئەرکێکی رۆشنگەری یە کە بناخەی رێنسانسی رۆژهەڵاتی ناوین پێك دێنێ.

بەدەزگابوونی سیاسی چەرخی ناوین رێگای لەپێش پێشکەوتنی گرنگی کوردان کردۆتەوە، هەروەها بۆ قۆناخی میرنشینەکانی شیکردۆتەوە. چینی سەردەستی کورد هەروەکو بڵێی لەسەردەمی سۆمەریەکانەوە فێری جۆرێکی میرنشینی خۆجێیی کراوە. لەمیانەی ئەم شێوازەوە لەلایەك وەکو چینی سەردەست خۆی بەسەر کۆمەڵەکانی ژێرەوەی خێڵ سەپاندووە، لەدەرەوەش لەنێو پەیوەندی سیاسی و ئابووری جێگای خۆی لای خاوەنەکانی باش کردووە و بەردەوام بەرژەوەندیەکانی خۆی پێشخستووە. لەم لایەنەوە خاوەنی رۆڵێکی تایبەت و دەستپێشخەری یە. لەجیاتی چینێکی دەسەڵاتداری سەربەخۆ بەئەنقەست گرێدراوی دەبژێری کە تاراددیەك گرێدراوی دەرەوەیە، لەناوەوەش لەسەربنەمای ئۆتۆنۆمیخوازی یە. تەنیا باڵادەستیەکی سەربەخۆ، هەم لەناوەوە هەم لەدەرەوە بەڵای بەسەردا دێنێت، رێگا لەپێش ئەوە دەکاتەوە رووبەڕووی تاڵان ببێتەوە. هەم یاخیبوونی گەل، هەم داگیرکارە بیانیەکان دەرفەتی ژیانێکی ئاسوودەیان پێنادات. ئەو وەڵامەی دەیدۆزنەوە مۆدێلێکی بەکرێگیراوێتییە کە لەناوەوە پشت بەئۆتۆنۆمی دەبەستێت. لەڕاستیدا لەدەرەوە رێگا بەدەزگابوونێك نادەن کە خاوەنی گەوهەرێکی پێشکەوتووخوازی بێت. بۆ نموونە بۆ خۆیان یان سۆمەریەکان سیستەمی سۆمەریان بۆ بەدەزگا کرد بوایە، ئەمە دەبوو بەهەنگاوێکی پێشکەوتوو. دواترین نموونەش

کۆماری تورکیایە. یان بەخۆیان یاخود ڕاستەوخۆ بەڕێوەبەرایەتی تورك کۆماریان بەدەزگا کردبوایە، ئەوا دەشێ ڕۆڵێکی باشتر ببینن. بەڵام لەمیانەی کۆسپ نانەوە لەپێش هەردوو ڕێگا ئەوا بنبەستکردنی ڕێگاکانی پێشکەوتن زیاتر لەبەرژەوەندی خۆیاندا دەبینن. لەمناوەوە سڕکردنی گەل لەگەڵ بەرژەوەندییە چینایەتییەکانیان دەگونجێ، لەدەرەوەش لەڕێگای گۆڕینی بەرامبەرەکەی بۆ بەرژەوەندی سیاسی و ئابووری، دەرفەت و قازانجێکی دوولایەنە بەدەست دێنن. لەڕۆژگاری ئەمڕۆمان سەرباری ئەوەی سەردەمێکی درێژە ڕێگاچارەی دیموکراتییانە بۆ کوردەکانی ئێراق تاوەکو دوایی ئاوەڵایە، بەڵام بەپشتبەستن بەبنەماڵەگەرێتی داکۆکی کردن لەسەر ئۆتۆنۆمیخوازی، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە گونجاوترین ڕژێمە سەبارەت بە بەرژەوەندییەکانی ئەم داب و نەریتە مێژوویی یە.

لە چەرخی ناویندا لە ئاستێکی بەرزدا بەجووتیاربوونی کۆمەڵەی عەشیرەتەکان ڕێگای لەپێش پێشکەوتنێکی مەزنی سیستەمی میرنشینی کردۆتەوە، ژمارەیەکی زۆری حکومەتی کوردی ئاواکراون کە ئۆتۆنۆمیەکی بەرفراوانیان هەبووە. پەیوەندیان لەگەڵ خەلیفە و سوڵتانەکان قۆناخێکی زێڕینی بۆ ئەم حکومەتانە ئافراندووە. لەماوەی نێوان سەدەی نۆیەم و سێزدەیەم، لەقۆناخی خەلیفە و سوڵتانە عەباسی وعوسمانیەکان، لەدەوڵەتی دەرەبەگایەتی مەروانی کوردیەوە تاوەکو بنەماڵەی ئەیوبی ڕێگا لەپێش قەوارەی سیاسی بەهێز کراوەتەوە. چەندین میرنشینی دیکەی کوردی هاوشێوەی ئەمانە بەشێوەی حکومەت خۆیان بەسوڵتانەکانەوە گرێداوە، وەکو شێوازێکی بەڕێوەبەرایەتی بەفەرمی دان بە ڕەوابوونیان نراوە.

ئەم شێوە بەڕێوەبەرایەتییە لەقۆناخی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی زیاتر فەرمی بووە و ۳۰۰ ساڵ بەردەوام بووە. ئەم قۆناخە لەسەدەی شانزەهەمەوە تاوەکو سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم، بەشێوەیەکی تایبەت هەرە زێدە بۆ میرنیشینەکانی کوردان و سەرۆك خێڵەکان پێشخراوە و پەسند کراوە. بەمجۆرە لەسەردەمی سۆمەریەکانەوە تاکو ئێستا گرێدراوی ڕۆحی سیستەم ماونەتەوە، هەر قۆناخێك تایبەتمەندێتی خۆیان خستۆتە سەر، بەردەوامکردن وەکو گونجاوترین ڕێگا دیاریکراوە.

شیکردنەوەی دەرەبەگایەتی کورد کە لە چەرخی ناوین تاوەکو ڕۆژگاری ئەمڕۆمان پێکهێنراوە و بەردەوام بەکاریگەر کراوە و گرنگیەکی مەزنی هەیە سەبارەت بەدەرککردن بەرلەبردوو و ڕووداوەکان. کاتێك بەئەندازەی کارەکتەرە گشتییەکانی لەهەموو لایەنێکەوە شیبکرێتەوە، لەڕێچکەکانی پێکهاتن و بەردەوامبوون، چۆن و بەرژەوەندی یەکێتی بەدیهێنا، چی لەگەل بردووە، چۆن و بەچ شێوەیەك کاریگەری کردۆتە سەر هزر و ژیانی ڕۆحی، چۆن ئیرادە و ئەخلاقی خستووە، لەناسنامەی مێژوویی گەل و کولتوورەکەیدا ڕێگای لەپێش کامە خراپەکاری و لادان کردۆتەوە، تاچ رادەیەك ناموبوونی قووڵکردۆتەوە، لەبواری ئابووری و

کۆمەڵایـەتی و سیاسـی چـۆن کۆسـپی خسـتۆتە پێـش نواناکـاری دەوڵەمـەند تـر، ئـەوا رۆشـنگەریەکی مـەزن بـەدیدێت. لـەم چوارچێوەیەشـدا رۆڵـای شـێوەگرتنی دیموکراتـی و سیاسیبوونێك دەکرێتەوە کە راست و بەرەو پێشەوە بێـت. بەبایەخەوە پێویستە ئاماژە بەوە بکرێت کە تاکو ئێستا بـەهیچ جۆرێك ئـەم ئەرکە جێبەجێ نـەکراوە. هیـچ کـاتێك چیـنی سەردەستی کورد زەمینـەی سیاسی خـۆی بـۆ گفتوگۆ نەکردۆتـەوە و رەخنـەی خـۆی نـەداوە. جیـهانێکی بـەرژەوەندیخوازی هـەزاران سـاڵەی نـەفرین لێکـراو لـەژێر ئەمـەدا شـاراوەیە، لەبەرئەوەی باش دەزانێ بەناشکرابوونی ئەمـە دەبن بەخیانـەتکار و تاوانبارێکی مـەزن، کێ بەگوێرەی بەرژەوەندیەکانی گونجاو بێت، بەبێ ئەوەی گرێدان بەهیچ پرەنسیپێکی مرۆڤایەتی بـەرچاو بگرێـت، پێویسـت بکات، بـەبێ هیـچ چاوترووکاندنێك گـەڵ لـەتاریکایی دا دەهێڵـن و پێکهاتـەی پێشـکەوتخوار و پێشـکەوتنەکان لـەنێو دەبـات و تەنانـەت پـەیوەندی لەگـەڵ فاشیستترین و تاریکترین و تەسفیەکارترین هێز دەبەستێ و جێبەجێکردنی پێویستییەکانی ئەمە بەگونجاوترین سیاسەت دادەنێ؛ هەرگیز دەسـت لـە مێـژووی نـەفرین لێکـراو و بـێ خێر بەرنادات و بەردەوامی پێدەدات.

بـەزاراوەکردنی کـورد و کوردسـتان بـەر لـە چـەرخی نـاوین دەردەکـەوێ. لـەقۆناخی فەرمانڕەوایـەتی عەرەبـەکاندا، بـەزاراوەکردنی کوردان لەلایـەنی سیاسـیەوە لـەژێر شـێوەیەکی نوێدا پێشکەوتن بەخۆیەوە دەبینێ. کوردەکـان کـە بـە بـەرفراوانی ئاشـنای دەزگاکانی دەوڵـەت دەبن سنووردار بوونـی فەرهـەنگیان بـەناولێنانی دەزگاکـان دەوڵەمـەند کـردووە. بـەڵام ئـەم قۆناخـە لەگـەڵ نـامۆبوون و توانـەوەیـەکی بـەرفراوان پێشکەوتووە و بـەرێوەچووە. لەڕاسـتیدا عەرەبـەکان کـە مۆدێلـی بەرێوەبەرایـەتی و دەوڵـەتیان زیـاتر لەفارسـەکان و بێزەنتیـەکان وەرگرتـووە، بـەخێرایی ئەمـەیان پەسـند کـردووە و کردوویانـە بـەهی خۆیـان. دواتـر لەهـەر شوێنێکی پێی گەیشتبن بەعەرەبکردن و چەسپاندنی وەکو جیاوازیەك پێشکەش کردووە. زمان و کولتووری عەرەبی جێگای پیرۆزی زمـانی سۆمەری کۆنـی گرتۆتـەوە. زانـین و بـەکارهێنان و پەیڕەوکردنی ئەم زمان و کولتوورە، بۆ باڵادەستی و هەڵکشان بابەتێکی سەرەکی پەروەردەیە.

سـەردەمی باڵادەستی عەرەبـەکان لەهـەمان کـاتدا قۆنـاخی باڵادەسـتی کولتـوور و زمـانی عـەرەبی یـە. لەڕاسـتیدا ئـەم زمـان و کولتـوورە پارچـە پارچەیـە، لـەدەرەوە وەرگـیراوە. بـەڵام بەسەرکەوتووانە گونجاندنی بـەگوێرەی خۆیـان رێگـای لـەپێش بـاڵابوونی کردۆتـەوە. بـەڵام لەبەرئەوەی ریشەکەی بیابانی یە دەرفەتی ئەوە نادات ببێتە خاوەن گەوهـەر. بەرامبـەر بەمـە کولتوور و زمانی کورد زۆر دەوڵەمەنـدترە. توانستەکانی شارستانییەتی هەزاران سـاڵەی پەسـند کردووە. تەواوی تایبەتمەندێتیەکانی قۆناخی نیۆلیتیك و چەرخی یەکەمینی ناسیووە و تێیدا ژیاوە. بلیمەتیەکی سروشتی، ئەنجامی ئەم کولتوورەیە. هەروەها پێویستە ئەریتی زەردەشـتی و ئیبراهیمی وەکو بەرهـەمێکی ئـەم توانستە کولتووریـە ببینـرێ. لایـەنی بـاڵای عەرەبـەکان و

ئەوەی ئەنجامیانداوە، لەمیانەی ئەم کولتوورە دەوڵەمەندە قاڵبەکانی بیابانیان پێ پڕکردۆتەوە و کردوویانە بەخەریتێکی بەهێز و لەمیانەی هزر و رۆحێکی بازرگانی ئەمەیان بۆ هەموو کەسێك هەراج کردووە. هێزی بازرگانی بەریشە سامی لەئاستێکی بەرزدا ئەمەیان کردووە بەتوانستێك. هێزی باڵای یەهودیەکان لەبواری بازرگانی و دارایی دا لەسەرتاسەری جیهان، سەرچاوەی خۆی لەم نەریتە وەردەگرێت. عەرەبەکان وەکو دوا هۆز و تیرەی ئەم نەریتە لەرێگای ئیسلامیەتەوە توانیویانە هەڵمەتێکی مەزن ئەنجامبدەن و باڵابوونی خۆیان نیشان بدەن.

هەروەکو دەزانرێ کولتووری بازرگانی بەهەرزان کڕین و بە بەها فرۆشتنی کردووە بە بابەتێکی سەرەکی کارامەیی. ئایینی ئیسلام بەخۆی ئایین و هزرێکی بازرگانی یە، واتە ویژدانەکەیەتی. مامەڵە کردنی ئەمە لە چەرخی ناویندا سەرکەوتنێکی شکۆدارانەی نەریتی بازرگانییە. ئیسلامیەت و ئەو شارستانییەتەی رێگای لەپێش کردەوە سەرکەوتنێکی چینی بازرگانە. حەزرەتی محەمەد بەکارامەیی و لێهاتووییەکی مەزن دەسکەوتی تەواوی چاخەکانی رابردووی لەبۆتەی ئەخلاق و هزری خۆیدا تواندۆتەوە و بەناوی ئیسلامیەت پێشکەشی مرۆڤایەتی کردووە، ئەمەش شێوەیەکە بەئاستی ناسنامەی بازرگانی گەیشتووە. نابێ لەبیر بکرێ کە حەزرەتی محەمەد خۆی لەنێو زەمینەی پەیوەندی لەگەڵ خەدیجەی بازرگان دۆزیوەتەوە و یەکێکە کە بۆ یەکەمین جار لەگەڵ خەدیجە باوەڕی بەئیسلام هێناوە. تا چ رادەیەك دیاردەی بازرگانی رۆژهەڵاتی ناوین بەشێوەیەکی راست شیبکرێتەوە و چۆنیەتی پێشکەوتنی لەمێژوودا بخرێتەڕوو، ئایینی تاکخودایی و راستینەی ئیسلامیش تا ئەم رادەیە بەڕوونکردنەوەیەکی راست دەگات. خاڵە بازرگانی و پیشەکاری ئەو سێ وشە ئەفسووناویەی بناخەی تەواوی ئەو شارستانییەتانەن کە لەرۆژهەڵاتی ناوین بەرز بوونەتەوە. کاتێك واتای ئەم سێ وشە بەشێوەیەکی لێهاتووانە شیبکرێتەوە، ئەوا مێژووی مرۆڤایەتی گەورەترین رۆشنگەری بەخۆیەوە دەبینێ. کاتێك سیاسەتی ئیسلامی باس دەکەین، بەوریایی شیکردنەوەی ئەم بەرە مێژووییەی دواوە، لەژێر رۆشنایی ئەمەشدا هەڵسەنگاندنی چەرخی ناوینی ئیسلام بایەخێکی مەزن لەخۆوە دەگرێت.

باڵادەستی عەرەبەکان لەسەر کوردستان، تاوەکو کۆتاییەکانی سەدەی دوانزەهەم بەپشتبەستن بە بەکرێگیراوە بەهێزەکانی کوردان بەشێوەی ئۆتۆنۆمی خۆجێیی بەردەوام بووە. لەسەدەی پانزدەهەمەوە بەهێز بوونی هۆزە تورکەکان سەرەتا لەبواری سەربازی دواتریش لەبواری سیاسیەوە، گرێدانی خەلیفە عەباسیەکان بەخۆیانەوە قۆناخێکی نوێ دەست پێدەکات. لەجیاتی باڵادەستانی عەرەب کە گەندەڵ ببوون، هۆزە تورکەکان وەکو خوێنێکی تازە جێگای خۆیان لەنێو سیستەمدا دەگرن. لەسەدەی یانزدە بەدواوە بەشێوەیەکی کرداری دەسەڵات لەژێر بەڕێوەبەرایەتی هۆزە تورکە سەلجوقیەکاندا بوو. هەبوونی خەلیفە تەنیا

شتێکی رووکەشی یە. سیاسەتی میرنشین و سوڵتانە تورکەکان سەبارەت بە کورد و کوردستان بابەتێکە شایانی لێتوێژینەوە و لێکۆڵینەوەیە. خودی سوڵتان سنجار بۆ یەکەمین جار لەمێژوودا ئەو شوێنانەی بەچڕی کورد تێیدا دەژیان بە کوردستان ناوبرد و کردوویەتی بەناسنامەیەکی فەرمی. سیاسەتی هۆزە تورکەکان لەم سەدانەدا ئەوە نەبووە کە کوردان لەشوێنی خۆیان دەربەرێنن و لەجێگایان نیشتەجێ ببن "بێگومان هێزەکەیان بۆ ئەمە تێرناکات و بەرژەوەندییەکانیان ڕێ نادات" لەجیاتی ئەوە لەگەڵ کوردەکان ڕێکدەکەون و روو لەشوێنی رۆمەکان دەکەن و دەیکەن بەوڵاتی خۆیان. دەتوانرێ بگوترێ ئەم هەڵوێستە تاوەکو سەدەی بیستەم مۆری خۆی لەسیاسەتەکانی میرنشین و سەڵتەنەتەکانی تورکان دایە، سەرباری ئەوەی ناوە ناوە تەنگەتاوی کردووە، بەڵام بەشێوەیەکی سەرەکی بەردەوام بووە و پەیڕەوکراوە. تورکەکان باش دەرکیان بەوەکردووە کە لەمیانەی دوژمنایەتی کردنی کوردان لەرۆژهەڵاتی ناوین نابن بەخاوەنی قەوارەیەکی بەهێز. دوژمنایەتی لەگەڵ کوردان بەواتای ون کردن و دووبارە گەڕانەوە بۆ ئەو شوێنە دێت کە لێوەی هاتوون. هەربۆیە جگە لە ناکۆکیە نائاساییەکان بەرژەوەندی لایەنی زاڵ بەسەر پەیوەندی نێوان کوردان و تورکان لەسەدەی یازدەهەمەوە تەبایی و ڕێککەوتنە. لەم ڕێککەوتنەدا ئیسلامیەت تای تەرازووی زیاتر بەلایەنی سونیەکاندا شکاندۆتەوە. بەشی عەلەوی و شیعە لەسوود زیاتر، زیانیان بەرکەوتووە. واتە ڕێککەوتن لەئەنجامی شرۆڤەی فەرمی سوننی بەدیهاتووە کە بەرژەوەندی نێوان چینە سەردەستەکان هاوسەنگ دەکات. ڕێککەوتنی سەردەمی یاوز سوڵتان سەلیم ئەم راستینەیەی ئاشکراتر کردووە.

لەسەدەی پانزدەهەمەوە تاوەکو سەدەی نۆزدەهەم لەزاڵبوونی تورکان بەسەر کوردان زیاتر، ئەوا باسکردنی تەبایی و بەڕێوەبەرایەتی هاوبەش واقیعیتر دەبێت. چینی سەرووی هەردوو لایەن، تەنانەت لەبەرئەوەی تێکەڵ بەیەکتر بوون، بەدواداچوونی قەوارەی سیاسی ناکۆکی جیاجیا یاخود لەگەڵ یەکتر، ڕێگای لەپێش ئەوە کردۆتەوە کە وەکو پێشکەوتنێکی لەبەرژەوەندی خۆیان هەڵیدەسەنگێنن. هەربۆیە جێگرتن لەنێو پێکهاتەی سیاسی هاوبەش، هەم بۆ بەرژەوەندی چینی ژوور هەم لە پێناو هەبوونی قەومییان بەپێویستییەکی ژیانی بینراوە و زیاتر خزمەتی کردارێکی بەمجۆرەیان کردووە. ئەم راستینەیە لەسەردەمی هیتیتەکانەوە واتایەکی بەمجۆرەی هەیە. هیتیتەکان و هۆرییەکان لەگەوهەردا یەکێتی بەرژەوەندی ئەنادۆڵ و میزۆپۆتامیایان بەبنەماگرتووە، بەردەوام ڕێککەوتنیان لەگەڵ یەکتردا وەکو بژارێك پەسندکردووە، یەکێتییەکی بەرفراوانیان هەبووە. بەیەکەوە لەساڵی ١٥٩٥ ی پ.ز بابل یان خستۆتە ژێر رکێفی خۆیان. بەیەکەوە لەگەڵ تورکان لەشەڕی مەلازگرتی ساڵی ١٠٧١ قۆناخی شکستی بێزەنتیەکان لەئەنادۆڵ دەستی پێکردووە. لەقۆناخی یاوز سوڵتان سەلیمی عوسمانیدا لەئەنجامی شەڕی چاڵدیران و مەرج ئەلدابق لەقەفقاسیاوە تاوەکو تەواوی

عەرەبستان و رێگای باکووری ئەفریقیای گرتەوە ، رێگای لەپێش بەهێزترین ئیمپراتۆریەتی رۆژهەڵاتی ناوین کردەوە. ساڵی ١٩٢٠ جارێکی دیکە وەکو هێزی بەرخودانی رۆژهەلات بەرامبەر باکوور قۆناخی رزگاری نیشتمانی هاوبەشی ئەنادۆڵ و میزۆپۆتامیایان دەست پێکردووە.

تا چ رادەیەك ئەمە راستینەیەکی بەرچاو بێت لەمێژوودا کە رێککەوتنی ئەم دوو گەلە رێگای لەبەردەم پێشکەوتن و سەرکەوتنی بەبایەخ کردۆتەوە، لەرەوشێکی پێچەوانەشدا بەیەکەوە زیانیان بەرکەوتووە. لەهەردوو رەوشیشدا مێژوو چەندین نموونەی پێشکەشکردووە. بەئەندازەی ئەوەی پێشکەوتن و سەرکەوتن گرێدراوی یەکێتی یە، دەبینرێ کە ژێرکەوتن و دواکەوتن لەئەنجامی دوورکەوتن لەرۆحی رێککەوتن و دەستبەردان لەماف برایانە هاتۆتە ئاراوە.

بەناویەکدا چوون و لێکچوونی کولتووری هەردوو ناوچەکە، لەسەردەمی نیۆلیتیکەوە رێگای لەپێش ئەوە کردۆتەوە کە پەیوەندیەکی دیالەکتیکیان لەنێواندا ئاوا ببێت. کاتێك چینە باڵادەستەکانی سەروو بەگوێرەی رۆحی ئەم راستینەیە بجوڵێنەوە، ئەوا بەیەکەوە پێشکەوتنی ژیاری مەزن بەخۆوە دەبینن. بەڵام کاتێك بەگوێرەی نکوڵی و پاکتاوکردن جوڵانەوە، ئەوا بەیەکەوە ونکردنیان وەکو ئەنجامێکی حەتمی دەبینرێ.

لەقۆناخەکانی دەسەڵاتدارێتی تورکە عوسمانی و سەلجوقیەکانیشدا پەیوەندیەکانیان لەگەڵ کورد و کوردستان لەچوارچێوەی ئەم هاوسەنگیە مێژوویی یە پێشکەوتنی بەخۆیەوە بینیوە. هەرچەندە ناوەناوە ئەو هەڵوێستە یەکلایەنانە دەرکەوتبن کە بەئامانجی تێکدانی ئەم هاوسەنگیە رێگای لەپێش هەندێ پێکدادان کردبێتەوە، بەڵام دیسان لەمیانەی ئاواکردنەوەی هاوسەنگیەکان رەوشی بەمجۆرە لەئارادا نەماوە. هەروەها راستینەیەکی دیکەی بینراو ئەوەیە کە بەدرێژایی مێژوو سیاسەتی درێژخایەنی هەردوو ناوچە لەسەربنەمای نکوڵی کردن لەهەبوونی یەکتری شانسی سەرکەوتنی نییە. خاوەنی ئاڵوگۆرێکی کولتووری دەوڵەمەندی خاوەن مێژوویکی پانزە هەزار ساڵی یە. پێشکەوتنەکانی شارستانییەتی چەرخەکانی یەکەم و ناوین لەسەربنەمای ئەم زەمینە کولتووریە هاوبەشە بەرز بۆتەوە. سەرباری هەڵوێستی نکوڵی و بەکرێگیراوانەی هەندێ چینی سەروو، بەڵام ئەو زەمینە کولتووریە هاوبەشەی گەلان پشتی پێدەبەستن بەردەوام برایەتی و هاوکاری بەبناخە گرتووە. لەوانەیە ئەم رەوشە وەکو ناکۆکیەك دیار بێت. بەڵام لەراستیدا ناکۆکی نییە. لێکچوون و هاوبەشێتی کولتووری رۆژهەڵاتی ناوین بەرهەمی رەنجی گەلان و بلیمەتی پێغەمبەرەکانە. هەرچی چینی باڵادەست و چەوسێنەری بەرێوەبەرایەتی سیاسی یە هەوڵدەدات لەپێناو بەرژەوەندیەکانی خۆی جیاوازیەکان تارادەی دوژمنکاری بەکاربهێنێ. لەکاتێکدا گروپێك باڵادەستی و هێزی سیاسی

بـالای خـۆی بـەبالابوونێکی شـوفێنی و خودایـی دەگەیـەنێ، ئـەوا توێـژە لاوازەکـە یـاخود تێکشکێنـراوەکە داردەستەیی و ملکەچی بۆ خۆی بەبنەما دەگرێت.

پـەیوەندی نێـوان بەڕێوەبـەر و بـەڕێوەبراو تـەنیا لـەنێوان چینـەکانی سـتەمکار و ستەملێکراوان و چەوسێنەر و چەوساوەدا پەیرەو نـاکرێت. لەنێوان خودی سەردەستەکانیش پەیوەندیەکی هەرەمـەکی چـڕ نـاواکراوە. دەسـەڵاتدارەکان کولتوورێکـی جیـنایـەتی تایبـەت بـەخۆیان پێکـهێناوە، پەیوەندیـەکی ئـەوتۆیان بەهـەمبوونی کولتـووری گەلانـەوە نـەماوە. لەکاتێکدا، پێکهاتەکانی زمان و کولتووری لەزەمینەی گەلدا بەردەوامی بەپەرەسەندنی خۆیان دەدەن، دەسـەڵاتداران زمـان و کولتوورێکـی تایبـەت بـەخۆیان دابڕاو لەگەل پێکدەهێنـن. بـۆ نموونە سـەردەمێك زمـانی ئەکـەدی زمـانی دیپلۆماسـی تـەواوی دەسەڵاتدارەکانی رۆژهـەڵاتی ناوین بوو. لەکوێ دەوڵەتۆکەیەك دابمەزرێت، یەکسەر لەتەنیشـتیەوە فێرگـەی زمـانی ئەکـەدی ئاوا دەکرێت. لەرۆژهەڵاتی ناوین زمانی عەرەبی ئەم رۆڵەی گرتۆتـە ئەسـتۆ. هـەروەها زمـانی لاتینی رۆڵێکی هاوشێوەی ئەمەی بینیوە. لە رۆژگـاری ئـەمڕۆشماندا زیـاتر زمـانی ئینگلیـزی و کولتووری ئەمریکی ئەم رۆڵە دەبینن.

بـەڵام لـەنێو گـەلاندا زمـان و کولتـووری نەتـەوەیی بـەردەوامی بەهـەمبوونی خـۆی دەدات. لـەکاتێکدا پێکهاتەیـەکی کولتـووری لێکچوو لەرۆژهـەڵاتی نـاوین هەسـتی برایـەتی و هاوکـاری لـەنێوان گـەلان پـەرەپێدەدات، بـەڵام چیـنی سەردەسـتەکان بـەئامانجی ئـەوەی بەسـانایی بـەڕێوەیان ببـات وەکـو پێویستییەکی تـەکتیکی پەرتکە و زاڵبـە لـەخولقاندنی دوژمنایـەتی ئایدیۆلۆژی و سیاسی دوو دڵ نەبوون؛ لەسەر ئـەم بنەمایـەش ورووژانـدن و خۆشـکردنی ئـاگری شـەڕی ئـایینی و مەزهـەبییان وەکـو سیاسـەتێکی سـەرەکی دیـار کـردووە. کـاتێك بـۆ بەرژەوەندیەکانیان پێویست بێـت تەنانـەت لـەماوەی یـەك رۆژدا کۆتـایی بەدوژمنایـەتی نێوان خۆیـان دێنـن. بـەردەوام بەسـەدان ساڵ شـەڕی مەزهـەبی و پێکدادانـی خێڵـەکی لـەنێو گـەلدا بـەزیندوویی هێشتۆتەوە. ئـەوەی لەئـەنجامدا یەکلاکەرەوەیـە دۆسـتایەتی و برایـەتی گەلانـە لـەرۆژانی سـەختدا. ئـەوەی لـەمێژەوە شارسـتانییەتەکانی بـەخێو کـردووە ئـەم سـەرچاوە سەرەکییەیە. کاتێك لەم لایەنەوە تەماشا بکرێت دەبینرێ کە کولتـووری رۆژهـەڵاتی نـاوین بـۆ گەلان وەکو فیدراسیۆنێکی سروشـتی وایـە. راسـتتر ئەوەیـە تـادواڕادە زەمینـەی فیدراسیۆنێکی دیموکراتـی بـەهێزە؛ تـاوەکو ئـەم ماوانـەی دوایـی لەئـەمریکا، ئـەفریقیا، رۆژهـەڵاتی دوور و ئەوروپا زەمینەی کولتووری هاوبەش پێشنەکەوتووە. بەپێچەوانەوە جیاوازی دوژمنکاری زاڵتر بـووە. لەراسـتیدا کولتـووری سیاسـی رۆژهـەڵاتی نـاوین خـاوەنی تایبەتمـەندێتی شـێوازی فیدراسیۆنە. لەسەردەمی سۆمەریەکان تـاوەکو عوسمانیـەکان بـەردەوام ئۆتۆنۆمـی بـەرفراوانی ئەیالەتـەکان لـەئارادا بـووە. دانـنـان بـەئازادی قـەوارە ئـەتنیکی و کولتووریـەکان مـەرجێکی سـەرەکی و گرنگـە. جگـە لەئاشـوریەکان لەپێکهاتـەی تـەواوی ئیمپراتۆریەتـەکان سیاسـەتی

لەنێوبردنی کۆمەڵە ئەتنیکی و کولتوورییەکان هەبوونی نییە. فاکتەرەکانی یەکبوون یەکلاکەرەوەترە.

بەڵام بەرژەوەندییە چینایەتی و بنەماڵەگەرێتییەکان پارچەبوون و بەرزبوونەوەی هێشتنەوەی زەمینەی پێکدادان وەکو مەرجێکی شەڕی دەسەڵات بینیوە.

بناخەی ماددی ئەم پێکدادانانە بە بەرژەوەندی بنەماڵەگەرێتی سنووردارە. پێشکەوتنی ئابووری، کۆمەڵایەتی و سیاسی درێژخایەن تەنیا لەنێو تەبایی و هاوکاری و برایەتی مسۆگەر دەبێت کە لەزەمینەی کولتووری گەلان پێدەگات. کولتووری ڕۆژهەڵاتی ناوین لەتەواوی ناوچەکانی دیکەی جیهان زیاتر خاوەنی ئەم هەستانەی برایەتی و هاوکاری یە. هەروەها بەناویەکداچوونی جوگرافی، دیموکراتی، ئابووری، کۆمەڵایەتی و کولتووری سیاسەتێکی هاوبەش دەکاتە ناچاری. لەسەربنەمای نەتەوەپەرستی و دەمارگیری خێڵەکی و پێکدادانی مەزهەبی داخراوبوون لەناوخۆدا شانسی یەکینەکان نییە کە بۆ ماوەیەکی درێژخایەن پێشبکەون و خۆیان بپارێزن. ڕاست نییە ئەگەر بگوترێ ئەم ڕاستینە بابەتی یە بەشێوەیەکی ئەرێنی لەلایەنی چینەکانی سەروو هەڵسەنگێنراوە. بەپێچەوانەوە لە چەرخی یەکەم بەشەڕی ئەتنیکی و نێوان شارەکان، لە چەرخی ناوینیش لەمیانەی پێکدادانە ئایینی و مەزهەبییەکان، لە چەرخە نزیکەکانیش لەڕێگای شەڕەکانی نەتەوەپەرستی، پارچە پارچە کردن و بەرێوەبردنیان بەسیاسەت بینیوە.

ئەم تایبەتمەندێتیانەی کەسایەتی چینی باڵادەست و چەوسێنەر بەخراپترین شێوە گوزارشتی خۆی لەچینی سەرووی کوردان بینیوە، زیاتر بەشێوەی هەڵوێستی تێکۆشکارانە بەرامبەر هەبوونی کولتووری و لەپەیوەندی لەگەڵ هێزە دەرەکییەکان بەشێوەی تەسلیمیەت و ڕۆحی نۆکەرێتی جموجۆڵ دەکات. جیاوازی و تایبەتمەندێتی لەگەڵ هاوشێوەکانی دیکە لەم ڕاستینەیەدا شاراوەیە. لەپێشکەوتنە خراپ و ئەرێنییەکانی مێژووی کورد بەشێوەیەکی سەرەکی تایبەتمەندێتی چینی باڵادەست بەرپرسیارە. لەجیاتی بەبناخەگرتنی ئەم تایبەتمەندێتیانە، بیانتوانیایە لەمیانەی بەرخودانێکی بەبڕیار و وشیارانە تەباییەکی هاوسەنگ بەرێوە ببەن، دەشیا پێشکەوتنی هەمەجۆری وەها بێتە ئاراوە کە لایەنی ئەرێنی قورسترە. لەبەرئەوەی لەناوەڕاستی گروپە کولتوورییەکان و ناوەندە جوگرافییەکاندا هەڵکەوتووە، ئەوا سیاسەتێکی هاوبەشی سیاسی و ئابووری کە ئازادی و مافی یەکسانی کوردان بەبناخە بگرێت، بەشێوەیەکی ئەرێنی و پێشکەوتووخواز کاریگەری لەئاراستەی پێشکەوتنەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوین دەکات.

تایبەتمەندێتیەکی دیکەی لەدیاردەی کۆمەڵگای کورد بەرچاو دەکەوێت، ئەوەیە کە سەرباری ئەوەی لەلایەنی سیاسی یەوە لەنێو دەزگا دەسەڵاتدارە بیانییەکاندا تواوەتەوە، لەلایەنی کۆمەڵایەتیدا هێزی ئەوەی هەبووە ئەم گروپانە بتوێنێتەوە کە تێکەڵیان بووە. ئەمە

بەتایبەتی سەرچاوەی خۆی لەهێزی پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکان دەگرێت. بەلاوازی مانەوەیان لەلایەنی سیاسی، مەیلی هاوسەنگ کردنی لەبواری کۆمەڵایەتییەوە لەنێو کوردان دەردەکەوێتە پێش. بەدرێژایی مێژوو چوار گروپ لەنێو کوردانەدا هاتن و چوون. لەئەنجامدا هەموویان لەتوانەوەی سروشتی ڕزگاریان نەبووە. لەنێسکیتەکان تاهێلینیەکان، لەڕیشە سامیەکان تاڕیشە تورکەکان، گرنگترین گروپەکانی مێژوو لەنێو زەمینەی کۆمەڵایەتی و کولتووری کوردان بوونەتە کورد. ئەم مەیلە تاوەکو ناوەڕاستی سەدەی بیستەم بەردەوام بوو کە بالادەستی سەرمایەداری تێیدا دەستپێکرد. کۆمەڵە دراوسێکان لەمیانەی سەرمایەداری دەوڵەتی بالابوونی نەتەوەیی، کۆمەڵایەتی و ئابووریان بەدەست هێناوە و قۆناغ بەپێچەوانەوە هەڵسوڕاو ڕووبەڕووی توانەوەیەکی بەرفراوان ماتەوە.

کولتووری ئاژەڵداری و کشتوکاڵ کە لەسەردەمی نیۆلیتیکدا جیهانی وەرچەرخان و لەگەڵ ئەوەی لە چەرخەکانی یەکەم و ناویندا درێژەی بەم بالابوونەی خۆیدا، بەلام نەیتوانی بەرامبەر شۆڕشی پیشەسازی سەردەمی سەرمایەداری بەرخودان بکات. قۆناخێکی سەر بەرەوژێری دەست پێدەکات. لەچوار لاوە کوردان دووچاری توانەوە دێن. تەنیا لەمیانەی موداخەلەیەکی وشیارانە و جموجۆڵێکی سیاسی دەتوانرێ ئەم قۆناخە بوەستێنرێ. هەرچەندە بزاڤی نەتەوەیی کوردان بەسەرکەوتنێکی ئەوتۆ ناگات، توانەوەی کولتووری و نەتەوەیی دەوەستێنێ. لەبەزیندوویی هێشتنەوەی کێشەی کورد سەردەکەوێ.

لەبەدەزگابوونی ئابووری و کۆمەڵایەتی چەرخی ناویندا کوردان لەزۆر لایەنەوە لەدراوسێکانیان پێشکەوتووتر بوون. توانستی مێژوویی و هەلومەرجی جوگرافی لەبار دەرفەتی ئەوەی بەکوردان داوە کە پێکهاتەی ئابووری و کۆمەڵایەتی دەرەبەگایەتی بەخێرایی پێشبکەوێت. نیشتەجێبوونی خێڵە کۆچەرەکان لەم قۆناخەدا گەیشتۆتە ئاستێکی بەرز. ژمارەی دانیشتوان بەرامبەر بەژمارەی کۆچەرەکان زۆر زیادی کردووە. گرێدان بەخاک، بووە بەتایبەتمەندییەکی جووتیاری. بەلام دیسان پێکهاتەی خێڵە کۆچەرە باوەکان تا ئاستێکی مەزن بەردەوامیان بەهەبوونی خۆیان داوە و پاراستوویانە. بەرامبەر بە کارەکتەری ئازادانە و یەکسانیخوازتری عەشیرەت، ڕۆحی کۆیلایەتی لە جوتیارەکاندا قووڵبۆتەوە. لەگەڵ ئەمەشدا پێ بەپێ پێکهاتەی ڕۆحی و هزری دەرەبەگایەتی لەنێو پێکهاتەی خێڵدا بەکاریگەر بووە. سەرۆکایەتی خێڵ و ئاغایەتی زەوی بەتایبەتمەندێتی هاوشێوە دەگات. هەڵسوکەوت و هزری شێوازی دەرەبەگایەتی، هەم لەنێو دەزگای جێگری ئاغایەتی و هەم لەنێو بەڕێوەبەرایەتی خێڵدا پێ بەپێ کاریگەر بووە. سەرۆکایەتی خێڵ و ئاغایەتی و گوند نزیکی کارەکتەرێکی هاوبەش بوونەتەوە.

لە کوردستان بازرگانی لەژێر کۆنترۆڵی بازرگانە عەرەبەکان پەرەی سەندووە. ئابووری بەپارە پێشکەوتنی بەدیهێناوە. ئەم ڕەوشەش خێرابوونی بازرگانی و چڕبوونەوەی لەگەڵ

خۆیدا هێناوە. وەکو نەریتێکی باو بڵاوبوون لەکانزاکاری و پیشەکاری لەدەستی وەستا ئەرمەنی و ئاشورییەکاندا بوو. ئەمەش ڕێگای لەپێش ئەوە کردەوە کە دانیشتوانی سوریانی و ئەرمەنی لەناوەوەی شارەکان چڕببنەوە. پیشەکاری و بازرگانی کاری سەرەکین کەدانیشتوانی شار پێیەوە خەریك دەبن. لەشارستانییەتی شاردا بازرگانە عەرەبەکان و وەستا پیشەکارە ئەرمەنی و سوریانیەکان ژمارەی سەرەکی دانیشتوان پێکدێنن. کوردان و توێژە هەژارەکانی دیکە بەجۆرێك ڕۆڵی تڵەی پرۆلیتاری شارەکان دەبینن. بێگومان ئەم ڕەوشە بابەتییە لە یەکبوونی جولانەوەکانی پاخیبوونی باتینیەکان دیار دەبێت. ئەوەی جەماوەرە سەرەکیەکەی جوڵانەوەکان پێکدێنن، لەپێکهاتەی تازە پەرتەوازە بووی عەشیرەتەکان و ئەو لادێیانە سەرچاوە دەگرێت کە ئابووری دەشت لەجێگای خۆیانی دوورخستۆتەوە.

زیادبوونی باڵادەستی دەوڵەتی ناوەندی و کۆبوونەوەی موڵکایەتی خاك لەچەند دەستێکی سنووردار‌دا جیابوونەوەی چینایەتی یەکلادەکاتەوە و ڕێگا لەپێش تەقینەوەی جولانەوە باتینیە ئاسراوەکان دەکاتەوە. بەدرێژایی چەرخەکانی ناوین و لەنێو هەلومەرجی کۆمەڵی دەرەبەگایەتییدا ناچاربوون لەژێر پەردەی ئایینی جیاواز وەکو مەزهەب و تەریقەت سەرهەڵبدەن. لەهیچ شوێنێکیدا ئایدیۆلۆژیایەکی نوژەن و زانستی پێشنەکەوتووە. تەنیا لەسەردەمی سەرمایەداریدا چینەکان دەتوانن لەژێر ناوی خۆیان و بەرژەوەندیەکانیان بە گوزارشتێکی زانستیانە بکەن.

ئاماژەمان بەوە کرد کە کۆمەڵە ئەتنیکیەکانی چەرخی ناوین بەئاراستەی قەومبوون ریفۆرمێکی گشتیان بەخۆیانەوە بینی. ئەم مەیلە لەکوردانیشدا خێرا دەبێت. دیاردەی قەوم دوای دیاردەی ئەتنیك دێتە ئاراوە. گرێدانی کۆمەڵایەتی و ئابووری قووڵ و درێژخایەن بەخاك بناخە ماددیەکەی پێکدێنێ. فۆرمەکانی عەشیرەت زیاتر لەنێو هەلومەرجەکانی نیو داخراو بوون و نیو کۆچبەریدا بایەخدار دەبێت. نیشتەجێبوونی درێژخایەن ڕێگا لەپێش بەلادێ بوون دەکاتەوە، ئەویش ڕێگا لەپێش جیاوازی کۆمەڵایەتی دەکاتەوە. جیاوازی کۆمەڵایەتی کە لەیەکینەکانی خێڵدا زۆر سنووردارە، لەگەڵ نیشتەجێبوون و لادێیەتی زیاد دەبێت. ناوچەیەکی بەرفراوان و ژمارەیەکی زۆری دانیشتوان دەکەوێتە نێو کۆنترۆڵی میرنشینەکان. ئەم دیاردانەی ئاستی عەشیرەتێك تێپەڕدەکات، وەکو پەیوەندی میللی و قەوم بایەخدار دەبن.

لەگەڵ ئەوەی جیابوونەوەی چینایەتی لەشارەکان بەرچاوترە، بچووکبوونەوەی پێکهاتەی خێزان عەشیرەتگەرایی لاواز دەکات. شارەکان خاوەنی پێکهاتەیەکی ئاڵۆزتری ژمارەی دانیشتوانن. هەرچی لەناوچە لادێیەکانە، لەسەربنەمای زمان و کولتووری هاوبەشی بەرفراوانتر یەکێتی عەشیرەتەکان پێ بەپێ وشیاری قەوم پێشدەخات.

هەڵبەتە ئەم راستینەیە لەگەوهەری ئایدیۆلۆژیای ئیسلامدا هەیە. تەنانەت خودی حەزرەتی محەممەد هەوڵێکی مەزنی لەپێناو یەکبوونی تیرە و هۆزەکانی بیابان داوە کە لەناوخۆیان داخراون. بەشێوەیەکی سەرەکی قورئان مانیفێستۆی کۆمەڵگای نوێیە کە هەوڵدەدات هۆزەکانی بیابان بکات بەیەك و تێڕوانینی تەسکی عەشیرەتگەری تێکبشکێنێ و لەژێرکاریگەری دەوڵەمەندی بازرگانی شارستانییەتەکی پێشکەوتوخوازی شار ئاوا بکات. کاتێك بەشێوەیەکی قووڵ و لەلایەنی کۆمەڵناسیەوە لێکۆڵینەوە سەبارەت بەقورئان بکرێت دەبینرێ کە سەرەتا لەجەخت کردن لەسەر هەبوون و تاقانەیی خودا تاوەکو تەواوی فەرمانە یاسایی و سیاسیەکانی دەقی ئەو بانگەوازیانەن کە سەبارەت بەپێکلاکردنەوەی کۆمەڵگای نوێیە. هەروەها ئەو بەشەی کە بە "مقاوەلەی مەدینە" ناو دەبرێ لەپەیمانێکی نوێی کۆمەڵگا بەولاوە شتێکی دیکە نییە. یەکێنەی عەشیرەتەکانی لەم چوارچێوە ئایدیۆلۆژیەدا پێشدەکەوێت لەگەڵ قۆناخی سیاسیبوونی بەرفراوان وەکو یەکێك لەبەهێزترین قەومەکان فۆرم بەعەرەبەکان دەدات. هەروەکو چۆن ئایدیۆلۆژیای سەرمایەداری فۆرمی نەتەوە و نەتەوەپەرستی خوڵقاندووە، وەکو بەهێزترین گوزارشتی ئایدیۆلۆژی دەرەبەگایەتی ئیسلامیەتیش میلیگەرایی و وشیاریەکەی دەخوڵقێنێ. لەقۆناخی بنەماڵە ئەمەوی و عەباسیەکان هەڵکشانی عەرەبێتی ڕێکەوت نییە. گرێدراوی سروشتی مەسەلەکە و ئایدیۆلۆژیای ئیسلامە کە ڕێگای لەپێش زاڵبوون کردەوە. هەرچەندە حەزرەتی محەممەد بەرامبەر ئەمە هەڵوێستی نیشانداوە کە زێدەڕۆیی لێبکرێت، بەتەواوەتی ئاگادارە کە سەردەمی شکۆداری عەرەبێتی کردۆتەوە. ئەم رەوشە سەبارەت بەئیسلامیەت دەبێتە راستینەیەکی بابەتی.

فۆرمی سەرەکی کۆمەڵگای ئیسلامی تازە خوڵقێنراو عەشیرەت نییە بەڵکو میللەتە. هەرچی لە سەرمایەداریە نەتەوەیە کە قۆناخێکی وشیاری و بەچڕی بەیەکەوە گرێدراوی میللەتە. لەگەڵ ئیسلامیەتدا میلیگەرایی خێرا بووە، لەسەرووی هەموشیانەوە لەفارسەکان و تورکەکان. بەتایبەتیش ئەو توێژانەی دەسەڵاتدار بوون لەم قۆناخەدا پەیوەندییە میلیگەراییەکانیان دیاردەی میلیگەرایی سەردەستی لەگەڵ خۆیدا هێنا. لەقۆناخی زاڵبوونی عەرەب و فارس و تورکەکان رۆڵی لەباڵادەستی و قەومگەراییش بینیوە. سنووردار بوونی بنەماڵە خانەدانە کوردەکان، ئەوانەی کە هەشبوون لەبەرئەوەی زمان و کولتووری عەرەبەکانیان پەسند کردبوو، لەجیاتی لایەنی باشە، سەبارەت بەپێشکەوتنی کوردان وەکو میللەت رۆڵێکی خراپیان بینی. بێگومان ئەو بنەماڵانەی کوردان کە کەوتوونەتە نێو پەیوەندیەکی بەمجۆرە یەکەم کاری ئەنجامیانداوە یان پێوانەکانی کولتوور و زمانی خۆیان شاردۆتەوە یاخود دەستیان لێبەرداوە و لەسەربنەمای بناخە گرتنی فۆرمی زمان و کولتووری دەسەڵاتدار جوڵاونەتەوە. بەتایبەتیش لە چەرخی ناویندا هەروەکو بڵێی جوڵانەوەی بەم

شێوەیە کراوە بەڕێسایەکی سەرەکی. سەرباری ئەوەی بنەماڵەی ئەیوبی بەڕیشە کورد بوون، بەڵام هەموو شتێکی خۆی لەپێناو خزمەتکردنی باڵادەستی عەرەبی سوننە بەکار هێناوە.

ئەم ڕاستینە لای فارس و تورکەکانیش ڕوویداوە. بەڵام هەرچەندە کۆشکەکانی عوسمانی و فارسەکان لەژێر کاریگەری چڕی زمانی عەرەبیدا بووبێت، بەڵام شێوە زمانی فارسی و تورکی توانیویانە پەرە بسێنن. کاتێك کوردانیش بوونەتە دەسەڵات، میرنشین و دەوڵەتییان دامەزراندووە، هەرچەندە ڕاست نییە ئەگەر بڵێین هیچ بەرەسەندنێك لەم لایەنەوە بەدینەهاتووە، بەڵام ئەمە ڕاستیەکە زۆر بەسنووورداری ماوەتەوە. بەڵام دەتوانرێ باس لەخزمەتێکی سنووورداری شەرەفخانی ئەمیری بەتلیس بکرێت. لای ئەو توێژانەی کوردان کە خزمەتکاری دەوڵەت بوون، لەچاخەکانی یەکەمیندا زاراوە کۆنەکانی زمانی فارسی و زمانی ئاشوری، لەچاخەکانی ناویندا زمانی عەرەبی بۆتە ئامرازی زمان و کولتووری سەرەکی بەکارهێنراو. هەرچی زمان و کولتووری خۆیانە، تەنیا کاتێك پێویستیان بینیوە بەشێوەیەکی نافەرمی لەنێو زەمینەی خێزان و پەیوەندیان لەگەڵ عەشیرەتەکان بەکاریان هێناوە. لەم لایەنەوە ڕۆڵی مێژوویی چینی سەردەستی بەکرێگیراوی کورد نیگەتیف بووە. تەنانەت جێگای ئاماژە پێکردنە کوردان وەکو زمان و کولتووری ئەتنیکی لەتەواوی گروپە ئەتنیکیەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوین پێشکەوتووتر بووە. تاکە کەموکوڕیان سوود وەرنەگرتنیانە لەهێزی بەدەزگابوون و پێکهاتەی سیاسی. سەرەڕای ئەوەی بەردەوام لە دەزگا سیاسی فەرمیەکان بەدەرنراوە تاوەکو ڕۆژگاری ئەمڕۆمان درێژەدان بەهەبوونی خۆیان هێزی کولتوور و گروپەکانی زمانی کوردی نیشان دەدات. هەروەکو لەبەشەکانی پێشووتریشدا جەختی کرایە سەر سەرچاوەی سەرەکی خوڵقاندن و پێشخستنی هێزی زمان و کولتوور خودی ژیانی گەلانە. بەتایبەتی ئەم ڕاستینەیە لەپێشکەوتنی کولتوور و زمانی نەتەوەیی یەکلا کەرەوەیە. بەرامبەر بەمەش زمانەکانی ئەکەدی، ئارامی، لاتینی، هێلینی، عوسمانلی و عەرەبی کە بەسەدان ساڵ چینە باڵادەست و چەوسێنەرەکان وەکو زمانی بەڕێوەبەرایەتی و پەروەردە بەکاریان هێناوە، نەیانتوانیوە لەبیری بکەن و خۆیانی لێ ڕزگار بکەن. کاتێك ئەو چین و توێژانە لەئارادا نەمان کە خزمەتیان دەکردن، ئەوا ئەو فۆرمانەی کولتوور و زمانیان بەکاردەهێنا پەرتەوازە دەبێت، دەتوێتەوە و لەنێو دەچێت.

بەدرێژایی مێژووی چەرخی ناوین بەڕێوەبەرایەتی بنەماڵەکانی سێ میلیگەرای مەزنی ناسیووە. لەدوای ڕووخانی خانەدانی بنەماڵەی مادەکان، بنەماڵە فارسەکان لەبەڕێوەبەرایەتیدا فۆرسابیان پاراستووە کە نزیکایەتی زمان و کولتووری لێکچوویان لەنێوانیاندا هەبوو. یەك بەدوای یەك لەدوای قۆناخەکانی ئەخمینی یە پارسەکان، ساکیە پارتەکان و پارسە ساسانیەکان لە سەردەمی کۆیلەداری دەرباز بوون بۆ سەردەمی دەرەبەگایەتی جێگای باسە. تایبەتمەندیەکی دیکەی گرنگی ئەم قۆناخەی بەڕێوەبەرایەتی وەکو نزیکترین قەوم

لەفارسەکان کوردەکان لەریزی دووەمدا لەنێو بەڕێوەبەرایەتی بەکاریگەر بوون. مێژوو، زمان و کولتووری هاوبەش ئەم رەوشە سانایی تر دەکات. لەچاخی ناویندا کوردەکانی گۆڕەپانی ئێران توانیویانە چەندین میرنشین و حکومەت ئاوا بکەن، رۆڵێکی چالاکیان لەبەرخودانەکانی مەزدەك، خورەمی و بابەکیەکان بینیوە. لەقۆناخی بنەماڵەی سەفەوی بەهۆی ناکۆکیەکانیان لەگەڵ عوسمانیەکان و کوردان هەوڵیاندا هەردوو لایەن بەکار بێنن، بەڵام زیاتر ئەوان بەکارهێنران. بەرپرسیارە سەرەکیەکان بەرامبەر بەم رەوشە کەتا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم بەردەوام بوو میر و سەرۆك خێڵ و شێخە کوردەکانن.

وەکو گەل لەم قۆناخەدا کوردان دووچاری رووخان و تێکدانێکی قووڵ هاتن. دەزگاکانی شێخایەتی و دەرەبەگێتی و سەرۆك عەشیرەتی وەکو پێویستییەکی کارەکتەرەکەی لەمیانەی بەرژەوەندییە تەسکەکانی خێزان خاوەن ناسۆیەکی سنووردارە. کاتێك یاری بەبنەماڵەکانیان کرا، بۆ هەموو جۆرە بەکارهێنانێك کراوە دەبن. لەیاخیبوون و تەسلیمکاری چاوەڕواننەکراو دوو دڵ نابن یاخود لێی رزگار نابن. ئەم پەیوەندییانەی بەدەستی ئەم رێبەرایەتییە ئەنجامدراوە، بەشێوەیەکی سەرەکی ئەنجامی هاوشێوەی ئەمە بەسەر گەلدا دەسەپێنن، بەمجۆرە بچووککردنەوەی گەلیان کردووە بەرێسایەك. رزگاری و ئازادی و ژیانێکی برایانە و شەرەفمەندانەی هاوبەش لەگەڵ گەلانی دیکە لەراستینەی دەزگای ئەم شێوازەی رێبەرایەتی بوونی نییە. لەوێدا یاخیبوون لەپێناو بەرژەوەندییە تەسکەکانی بنەماڵە و تاکەکەس و خۆبەدەستەوەدان و خزمەتی نۆکەرایەتی نووسراوە. هەروەکو بڵێی ئەمە بووە بەتایبەتمەندیەکی بۆ ماوەیی.

پەیوەندی گرووپە بەرپشە سامیەکان لەگەڵ هۆزە بەرپشە کوردەکان زۆر کۆنە. ئەمە سەلێنراوە کە ئەم پەیوەندیانە بۆ سێ هەزار پ.ز تاوەکو سەردەمی مێژووی نووسراو دەگەڕێتەوە. گرووپە سامیەکان کە بەرامبەر بەبیابان ئەم جوگرافیایە شاخی و دەشت و ئاو و سەوزاییەیان وەکو بەهەشت هەڵسەنگاندووە و بەردەوام خواستوویانە رووی تێبکەن. ئەم راستینەیە زەمینەی ماددی ئەو پێکدادانانە دەخاتە روو کە بەهەزاران ساڵ لەنێوان تیرەکانی بیابانی بەرپشە سامی و خێڵە شاخیەکانی بەرپشە ئاریانی بەردەوام بوو. لەململانێکانی شارەکانی سۆمەریش لەراستیدا بەردەوام رێککەوتنەکانی نێوان ئەم دوو رەچەڵەکە لەئارادایە. بەشێوەیەکی نووسراو دەست نیشانکراوە کە سێ هەزار ساڵ پ.ز تیرەی بەرپشە هۆری و ئامۆریەکان وەکو بەردەوامی ئەم نەریتە هەمان رۆڵیان گێڕاوە. نەریتی ئیبراهیمی وەکو رێککەوتن و سەنتێزی هەردوو رەچەڵەك و کولتوور بەرامبەر چینی زوور و دەوڵەتی کۆیلەداری بەشێوەیەکی جیاوازتر دەردەکەوێتە پێش. وەکو یەکەمین جۆری ئەزموونی هاوبەشی نێوان کولتوورەکان، لەلایەنی هەردوو کولتوور پەسەند دەکرێ. لێکۆڵینەوە زانستیەکانی ئەم دواییە رۆژ بەدوای رۆژ ئەم راستینەیە زیاتر دەسەلێنێ و ئەرێ دەکەن.

هەڵسەنگاندنی پێغەمبەرایەتی وەکو دەزگایەکی باڵاتر لەخێل و تیرە، پەیداکردنی لایەنگری لەنێو سەرجەم گروپە ئەتنیکییەکان و پەسەندکردنی، گرێدراوی ئەم تایبەتمەندێتییە سەرەکیانەیەتی. دەرکەوتنی لەسەربنەمای ڕووبەڕووبوونەوەی چەمکی خوداوەندی تایبەت بە قەوم و تیرە و هۆزەکان، هەروەها دەرکەوتنی لەدژی چەمکی پادشای خوداوەند و چاندنی تۆوی هزر و باوەڕێکی گەردوونی، ڕێگا لەپێش بایەخداربوون و پەرەسەندن کردۆتەوە.

دواتر هێرشەکانی بابلی و ئاشورییەکان پشت بەسیستەمی دەوڵەتی کۆیلەداری چەرخی یەکەمین دەبەستێ و زۆر بێ بەزەییانەیە. لەم قۆناخەدا بەرخودانی خێڵە کوردەکان ئاستی چەندین فیدراسیۆن و کۆنفیدراسیۆن و دەوڵەتی ناوەندی بووە. هۆریەکان، میتانیەکان، نائیریەکان، ئۆرارتۆییەکان دواتریشیان مادەکان لەقۆناخی یەك بەدوای یەکدا نوێنەرایەتی ئەم ڕاستینەیان کردووە. لەقۆناخی پارسەکانیشدا وەکو بەهێزترین بەڕێوەبەرێتی ئەیالەت) میدیا دەبینرێ. ناوچەکە بایەخە تایبەتیەکەی لەڕیزی دووەم دێت. پادشایەتی کۆمەگەنا کە دوای ئەسکەندەر وەکو سەنتێزی کولتووری ماد ـ پارس و هێلینیەکان هاتە ئاراوە لەماوەی نێوان ۲۵۰ ی پ.ز تا ۲۵۰ ی زایینی قۆناخێکی ۵۰۰ ساڵی گرنگ پێکدێنێ. لەگەڵ ئەوەی لەم قۆناخەدا کاریگەری والیەکانی ڕۆما دیار بووە، تاڕادەیەکی بەرچاو دەسەڵاتە خۆجێییەکان هەبوونی سیاسی خۆیان پاراستووە. یەکێك لەمانەش پادشایەتی ئەبگەرییە کە گروپە ئاشوری و کوردەکان تێیدا بەکاریگەر بوون و لەهەمان ڕێکەوتدا لەناوەندی ئورفا بوو. لەم قۆناخەدا کولتوور و زمانی ئارامی کە وەکو میراسێکی زمانی ئاشووری ماوەتەوە لەسەرتاسەری ڕۆژهەڵاتی ناوین خاوەن کاریگەری بووە، ناسنامەی زمان و کولتوورێکی ئەنتەرناسیۆنالی هەیە.

لەدوای عیسا ڕەوتی مەسیحیەت لە ڕۆژهەڵات پەرەسەندنێکی خێرای بەخۆیەوە بینیوە. زمانی ئارامی بەجۆرێك زمانی لەدایك بوونی مەسیحیەتە. مەسیحیەت لەناو کوردەکان و ئاشورییەکان بڵاو دەبێتەوە؛ بەرامبەر بە زەردەشتایەتی فەرمی ساسانیەکان باڵا دەبێت. کوردەکان و ئاشورییەکان زیاتر لەیەکتر نزیك دەبنەوە. مەسیحیەت ڕۆڵێکی پۆزەتیڤ لەمەدا دەبینێ. لەباکووریش نزیکبوونەوەیەکی هاوشێوەی ئەمە لەنێوان کوردەکان و ئەرمەنیەکان دێتە ئاراوە. میزۆپۆتامیای سەروو دەبێتە ناوەندێکی بەهێزی باوەڕییە نوێیەکە. بەتایبەتیش پەتریارکە نەستورییەکان سوود لەفەلسەفەی یۆنانیش دەبینن، لەبواری هزردا ڕۆڵێکی پێشکەوتووخوازانە دەبینن. مانیگەرایی لەم زەمینەیەدا سەرهەڵدەدات. بودیزم پەلهاوێشتنێکی هاوشێوە دەکات کە ناوەندەکەی هیندستانە.کاریگەرییەکانی بودیزم تاوەکو میزۆپۆتامیا بڵاو دەبێتەوە. مانی لەسەرووی هەموویانەوە میراسی پۆزەتیڤی نەریتی زەردەشتی، سەنتێزێك لەتەواوی شێوەکانی ئەم باوەڕی و هزرانە پێکدێنێتە هەوڵدەدات لەسەربنەمای ئاشتی

جیهانێك بئافرێنێ کە ئەخلاق و باوەڕی برایەتی تێیدا زاڵ بکات. بەو لەئیسلامیەت مانیگەرایی بەهێزترین پێهەڵگرتنە.

کاتێك باڵادەستی عەرەبەکان لەسەر ئەم میراسە دەوڵەمەندە ئاوا دەکرێت، ڕۆڵێکی هاوشێوەی ئەو بەربەرانە دەبینن کە بەرامبەر شارستانییەتی ڕۆما بینیان. لەگەڵ ئەوەی عەرەبەکان لەبواری سەربازی بەهێزن، لەلایەنی کولتووری لاوازن. ئەم لاوازییە لەمیانەی توانەوەیەکی خێرای کولتووری تێپەڕ دەکەن. زاڵبوونیان لەبواری بەڕێوەبەرایەتی و بازرگانی، بەخێرایی ڕێگا لەپێش دەوڵەمەند بوونیان و ئاوالکردنی ناوەندی شاری نوێ دەکاتەوە. زمانی تازە پەرەسەندووی عەرەبی جێگای زمانی کۆنی ئەکەدی و ئارامی دەگرێتەوە. عەرەبی زمانی سیاسەت و دیبلۆماسیەتە. لەبەرئەوەی قورئان بەزمانی عەرەبی هاتۆتە خوارەوە پیرۆز بووە، بەرامبەر بەزمان و کولتووره خۆجێییەکان باڵا دەبێت. کاریگەری زمانی عەرەبی دەکەوێتە نێو تەواوی کولتوور و گروپەکانی زمان. وەکو زمانی هاوبەشی قسەکردن، پەروەردە، کولتوور و زانستی چینە سەردەستەکان، ئەگەر بەشێوەیەکی لەسەرخۆش بێت تاوەکو ڕۆژگاری ئەمڕۆمان درێژەی بەم کاریگەرییەی خۆیداوە. هەرچی باڵادەستی سیاسی چینە سەردەستەکانی عەرەبەکانە تاوەکو سەدەی دوانزەهەم بەردەوام دەکات کە کۆنترۆڵ دەکەوێتە دەستی سوڵتان و بەگە تورکەکان. تا ئاستێکی بەرز کاریگەری کولتووری و سیاسی عەرەبەکان لەسەر کوردان هەیە. بەتایبەتیش چینەکانی سەروو نیوە بەنیوە دەبن بەعەرەب. بایەخێکی تایبەت بەوە دەدەن کە خۆیان بەعەرەب و لەڕەچەڵەکی پێغەمبەر نیشان بدەن. دابڕان لەگەل و نکوڵیکردن لەمیللەت، لەم قۆناخەشدا بەشێوەیەکی باو بەردەوام دەکات. ئەم قۆناخە قۆناخێکە کە نامۆبوون لەگەوهەر چڕ و قووڵبۆتەوە. جیابوونەوەی چینایەتی و نامۆبوون کە ڕیشەکەی بۆ بیانیەکان دەگەڕێتەوە بەیەکەوە پێشدەکەون. لەگەڵ ئەمەشدا لەسەر ڕاستەڕێی بە نەتەوەبوون پێشکەوتنی زمان و کولتووری گەل، وەکو مەیلێکی جیاوازتر لەکەناڵی خۆیەوە پێشدەکەوێت. پێشکەوتنی ئاینی جیاواز بەئەندازەی ئەوروپا، لەنێوان گەلان ڕێگا لەپێش دوژمنایەتی ناکاتەوە. نزیکایەتی باوی کولتووری کاریگەری لەمەدا دەبێت. بەشێوەیەکی سەرەکی میر و سەرۆك خێڵ و پیاوە لەپێشەکانی مەزهەبەکانی کە دەخوازن ببن بەچینی سەردەست دوژمنایەتی نێوان باوەڕیەکان دەوروژێنن.

هەرچەندە لە چەرخی ئاوین لەسەردەمی فەرمانڕەوایەتی عەرەبەکاندا لەبوارەکانی سیاسی، بازرگانی و زانستی هەندێ پێشکەوتن بەدیهاتووە، بەڵام لەبەرئەوەی بەگشتی قۆناخێکی بەهێزی دۆگماتیزمی ئاواکرد، دەبێتە مەزنترین هۆکاری ئەو دواکەوتنە مێژووییەی لەسەدەکانی دواتر هاتە ئاراوە. بەشێوەیەکی سەرەکی قۆناخی دواکەوتن لەسەردەمی سوڵتانە تورکەکان دێتە ئاراوە. لەسەدەکانی نۆیەم و دەیەم وەکو کۆیلە و سەربازی بەپارە لەکۆشکەکانی عەباسیەکان جێدەگرن. ئەو گەندەڵی و لەپەلوپۆکەوتنەی لەبەڕێوەبەرایەتی

عەرەبەکاندا هەیە کاریگەری فەرماندە بەرپشە تورکەکان زیاد دەکات. لەسەدەی پانزەهەمدا کۆچی بەکۆمەڵی تیرەکانی ئۆغوز و ئاواکردنی بنەماڵەی سەلجوقی، هەروەها کاتێك دەبن بەپیاوە بەرچاوەکانی خەلیفە، تورکەکان بەشێوەی کۆمەڵ لەناوچەکە نیشتەجێ دەبن. لەساڵی ١٠٥٥ دا سەڵتەنەت دەکەوێتە ژێر رکێفی سوڵتانی سەلجوقی توغرول. بەمجۆرە قۆناخێکی نوێ لەمێژووی رۆژهەڵاتی ناوین دەست پێدەکات، قۆناخی بەفەرمی باڵادەستی قەومە تورکەکان دەست پێدەکات. ئەم قۆناخە بەپێی کات پەرە دەسەنێ. پارچەبوونێکی باو لەژێر ناوی سەلجوقیەکانی ئەنادۆڵ سوریا، ئێراق و ئێران دێتە ئاراوە. سەلجوقیەکانی ئەنادۆڵ لەبەرئەوەی بەرامبەر بە رۆمەکان شانسی پەلهاوێشتنیان هەیە، بەهێزتر و تەمەن درێژتر دەبن. ئیتر خوێنێ تازە و هێزی بڵاوکردنەوەی ئیسلامیەت چینی سەرووی تورکە.

ئەو پارچەبوونەی لەنێو قەومەکان دەبینرێ لەناو تورکەکانیش پەرە دەسەنێ. لەکاتێکدا توێژەکانی سەرووی تیرەکان بەشێوەی میرنشین و سەڵتەنەت دەبن بەچینی دەرەبەگی سوننی باڵادەست، توێژە هەژارەکانی تیرەکان لەمیانەی شرۆڤەی عەلەوی ـــ بەگداشی وەکو تورکمانەکانن بەشێوەی کۆچبەری لەناوچە بەستەڵەك و شاخاویەکان دەژین کە زیاتر بەژیانی کۆنیان دەچێت. پارچەبوونێکی هاوشێوە لەبواری زمان و کولتووریشدا دێتە ئاراوە. لەکاتێکدا لەنێو ژیانی کۆشکەکانی بەگ و سوڵتانەکان، زمانی فارسی و عەرەبی زاڵە، گەلی تورکمان دەبێتە هێزی لەخۆوەگرتن و پێشخستنی زمانی تورکی. بەناوەندبوونی دەرەبەگایەتی لەدەوروبەری سوڵتانە تورکەکان، لەقۆناخی سوڵتانە عوسمانیەکان پێشکەوتن بەخۆیەوە دەبینێ. لەبەرئەوەی هاوکاتە لەگەڵ سەردەمی لەدایکبوونی سەرمایەداری لەئەوروپا، نوێنەرایەتی کردنی رۆژهەڵاتی ناوین لەلایەن عوسمانیەکان وەکو قۆناخێکی دواکەوتنی مەزن واتادار دەبێت. لەبەرئەوەی ئەو شەڕانەی بەرامبەر بە ئەوروپا بەرێوەچوون پشتی بە شارستانییەتی رۆژئاوای هەڵکشاو و شارستانییەتی رۆژهەڵاتی دواکەوتوو دەبەست، لەئەنجامدا لەشکست رزگاری نابێت. قۆناخی عوسمانیەکان بەرلەهەموو شتێك قۆناخێکە کە بەردەوام رۆژئاوا بەرامبەر بە رۆژهەڵات باڵابوونی بەدەست هێناوە. ئیتر لەجیاتی تەسفیەکردنی رۆژئاوا، پەسندکردن و خۆپێ گەیاندنی دەبێتە تاکە رێگای راست. تاوەکو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دەرك بەمە دەکات، درەنگ دەمێنێ. تەنیا بە دامەزراندنی کۆماری تورکیا بەپیرەوکردنی ئەم رێگایە مسۆگەر دەبێت کە بەرێبەرایەتی مستەفا کەمال راگەیەنرا.

ئیمپراتۆریەتی ناوەندی دەرەبەگایەتی عوسمانی لەرەوشی موحافەزەکاری مێژوویی و دواکەوتندایە. شارستانییەتی سەرمایەداری رۆژئاوا کە لەدەرەوەی ئیرادەی ئەو پێشکەوتنە ، ئەمەی کردووە بەراستینەیەکی بابەتی. بەڵام لەمیانەی رێگرتن لەوەی داگیرکەری سەرمایەداری زوو بکەوێتە رۆژهەڵاتی ناوین، پێشکەوتنی داگیرکاری کلاسیکی ئاستەنگ کردووە کە لەتەواوی گۆشەکانی جیهان پێشکەوت. ئەمە کاریگەریەکی دوولایەنەی هەبووە،

لەکاتێکدا لەمیانەی درێژکردنی تەمەنی دەرەبەگایەتی رۆڵێکی نێگەتیڤی بینیوە، ئەوا لە کۆسپخستنە پێش داگیرکاری جوگرافی ناوچەکە و ئەو خراپەکاریانەی ئەگەری دەرکەوتنیان هەبوو، رۆڵێکی پۆزەتیڤی بینیوە. بەشێوەیەکی گشتی هەڵسەنگاندنی ئەم قۆناخە وەکو سەدەیەکی لەدەستدراو سەبارەت بەکولتوور و گەلانی رۆژهەڵاتی ناوین لەجێگای خۆیدایە.

پەیوەندی کوردەکان لەگەڵ سەڵتەنەت و میرنشینی تورکەکان لەمەی قۆناخی عەرەبەکان جیاواز تر نییە. لەگەڵ ئەوەی لەبواری زمان و کولتووردا کاریگەری عەرەبەکان لەسەر چینی سەرووی کوردەکان بەردەوامە، هێندی هێندی بالادەستی سیاسی بۆ بنەماڵە دەسەڵاتدارەکانی تورکەکان دەگوازرێتەوە. لەقۆناخی میرنشینەکانی ئەنادۆڵ و سەلجوقی بالادەستیەکی زەق لەسەر کۆمەڵگای کورد نییە. لەم قۆناخەدا چەندین بنەماڵەی وەکو مەروانی، ئەیوبی، شەرەفخانی کە بەرپشە کوردن، بەشێوەیەك نوێنەرایەتی قۆناخی پێشکەوتنی ئازادانەی دەرەبەگی کورد دەکەن. لەسەدەی هەشتەمەوە تاسەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەم لەگەوهەری خۆیدا دەرەبەگی کوردان تاڕادەیەکی مەزن خاوەنی پێشکەوتنێکی تایبەت بەخۆیەتی. هەرچەندە نەبووبن بەهێزی دەوڵەتێکی ناوەندی دەرەبەگایەتی، لەئاستی حکومەت و نێودەوڵەتدا چەندین قەوارەی سیاسییان ئاواکردووە. لەجیاتی ملکەچیەکی ناچاری، لەسەربنەمای بەرژەوەندی دەرەبەگایەتی هاوبەش پەیوەندییان لەگەڵ سەڵتەنەت و میرنشینە تورکەکان بەستووە. لەلایەنێکەوە نزیکترین هێزن لەچەمکی دەوڵەتی هاوبەش. لەم لایەنەوە رەوشی کوردان بەرەوشی پارسەکانی ئێران دەچێت. لەمیرنشین و سەڵتەنەتی تورکەکاندا لەدوای قەومی تورك لەلایەنی پلەی گرنگییەوە کوردان لەرێزی دووەمدا رۆڵ دەبینن. ئەم رۆڵە لەمێژووی کورداندا بۆتە کارەکتەر. هەروەکو بڵێی بوون بەسەرەکیترین یەدەگی هێزە سیاسیەکەی تەنیشتی وەکو قەدەرێکە. ئەمە لەگەوهەری خۆیدا پێویستی رۆحی سیستەمی کۆیلایەتی و جوتیارییە و بناخەیەکی چینایەتی هەیە. ئەم رەوشە لەبرایەتی و هاوکاری راستەقینەی نێوان گەلان جیاوازترە. ئەمەش راستیەکە وەکو پێویستییەکی لاسەنگی، نامۆبوون، سیاسەتی پەرتکە و زاڵبە بۆتە هۆکاری چەندین پێکدادان. تاکە ئەنجامی پۆزەتیڤی ئەوەیە لەرەوشی بەرخودانی لاسەنگ و یاخیبووندا دەرفەتی بەکۆچ و کوشتارە شیمانە بۆکراوەکان نەداوە.

لە قۆناخی ئیمراتۆریەتی عوسمانی ئەم مەیلە زۆر بەئاشکرایی پیادە کراوە. هەڵسەنگاندنی بەجێی سوڵتان سەلیم یاوز کە بالادەستی لەسەر رۆژهەڵاتی ناوین لەرێککەوتن لەگەڵ دەرەبەگی کوردا دەبینێ و بەبنەماگرتنی تەباییەکی نزیك بەئاستی یەکسانی تاوەکو سەدەی نۆزدەهەم رێگای لەپێش پێرەوێکی سیاسی سەرکەوتوو کردەوە. لەم قۆناخەدا دەرەبەگایەتی کورد بەشێوەیەکی فەرمی خاوەنی حکومەت و فەرمانڕەوایی بوون کە دەسەڵاتێکی خۆجێییە و لە باوکەوە بۆ کوڕ دەمایەوە. دەسەڵاتی ناوەندی سوڵتان و دەسەڵاتی

خۆجێیی دەرەبەگایەتی بەهاوبەشی بەڕێوەچووە. لەگەڵ ئەمەشدا هەبوونی خێڵە کۆچەرەکان بەردەوام بووە. عەلەویگەرایی و یەزیدیەکان درێژەیان بەرەوشی بەرخودان داوە، قەوارەی کولتووری و زمان درێژەیان بەهەبوونی خۆیان داوە. هیچ جۆرە قەدەخە کاریەك جێگای باس نییە. گرنگتریش بەهۆی پێکهاتە ئابووری و کۆمەڵایەتییە بەهێزەکەیان، چەندین تیرە و هۆزی عەرەب و تورك بەشێوەیەکی سروشتی لەنێو ئەم پێکهاتانەدا تواونەتەوە. سەرباری شوێنگە و رۆڵی خراپی باڵادەستی سیاسی چینە سەردەستەکانی عەرەب و تورکەکان و کوردە بەکرێگیراوەکان، ئەم هێزە تونێەرەوەی زمان و کولتووری کورد سەرچاوەی خۆی لەو تایبەتمەندێتیە بەهێزانە دەگرێت کە لەسەردەمی کۆمەڵگای نیۆلیتیکەوە بەدەستی هێناوە.

د ـ کوردان لەسەردەمی سەرمایەداریدا

سەرباری ئەوەی کورد لەکۆنترین گەلانی جیهانن و لەهەموویان خوڵقکارترن لەمێژوودا، بەڵام هەروەکو بڵێی بەهیچ شێوەیەك لەمێژوودا نەژیاون. لەم سەردەمەدا وەکو نەخۆشیەك رووبەڕوومان دەبێتەوە. دەبیت بە لانکە و دایکی مێژوو، بەڵام رێسا و ئەخلاق دەرهەق بە تۆ بەپیرەو ناکرێتە وەکو گەلێك هەڵیدەسەنگێنن کە کەس تۆی ناوێت، دەبیتە قوربانی ترسناکترین خیانەت. لەسەرەکیترین مافەکانی مرۆڤ بێبەش دەکرێیت، بەڵام وەکو تاوانبارترین کۆمەڵەی مرۆڤ رادەگەیەنرێی. بۆ خزمەتکردنی هەموو کەسێك ئامادە دەبیت، بەڵام لەنەفرین لێکراوی رزگارت نابێت. هاوشێوەی مرۆڤە هاوچەرخەکان دەبیت، بەڵام لەگەوهەردا نابیتە خاوەنی هیچ بەهایەکی سەردەم؛ تەنانەت شایەنی ئەوە نابینرێی وەکو گەلانی رەش پێست، زەرد، یاخود هیندە سوورەکان ببیتە کۆیلەی سەردەمی مۆدێرن. رووبەرووی ستاتۆ و کوردایەتیەك دەبیتەوە کە کەوتۆتە تەڵەزگە و مەحاڵە هاوتاکەی هەبێت. نکوڵی لەکورد دەکرێ، دەڵێن؛ دیاردەیەکی وەها بوونی نییە، بەڵام گەورەترین ترسیان لەم راستینەیە کە نکوڵی لێدەکەن و دەڵێن بوونی نییە. چۆن لەشتێك دەترسن کە بوونی نییە؟ دەڵێی هەیە، دان بەوە دادەنێی کە وەکو تەواوی هاووڵاتییەکان خاوەنی هەموو مافێکە، تەنانەت مافی دەربڕینی ئازادانە بەزمانێك نادەیت کە بەنیوەچڵی لەسەر پێیان ماوەتەوە. پێویستە ئەمە ئەو کێشەیە بێت کە لە چەرخەکەماندا بەناسەتەمی چارەسەر دەکرێت.

سەردەمی سەرمایەداری کە کۆمەڵە ئەتنیکی و قەومەکان لەمیانەی جۆش و وشیاری نەتەوەیی هەڵسانە سەرپێ، بۆ کوردان رەنگی قۆناخێکی نەخۆشی پێوەیە کە چارەسەر نابێت. لەدەستدانی ناوەڕۆکی نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی ئومێدەکانی ژیان، هەڵدێران بۆ نێو قووڵترین بیری نەزانی، بێزاری لەخۆپێناسەکردن؛ یەکتری کوشتن لەپێناو مریشکێك، بەڵام کەوتنە نێو رەوشێك کە تەنانەت لەپێناو دەست لێبەرنەدراوترین ماف جوڵەیەك نەکات، هەروەکو بڵێی پێویستییەکی قەدەرە زۆر بەسانایی پێشوازی لێ دەکات. دیاردە و کێشەی کورد لەڕاستیدا

لەمیانەی ئەو پێناسانەی دەکرێ زیاتر روون بکرێتەوە دەبینرێ کە لەنێو رەوشێکدا دەژی کە زۆر لە سنووری نەتەوەیی بەولاوەترە. چەرخی سەرمایەداری هەم سەردەمی دەستپێکردنی رابوونی نەتەوەیی و ئاواکردنی دەوڵەتی نەتەوەیی یە، هەم سەردەمێکە ئومێدی چارەسەری بەگەلێك گروپی نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی بەخشیوە کە لە ئاستی بوون بە کێشە و گرفت ماونەتەوە. ئەگەر پێناسەیەك و رێگا چارەیەکی سەرکەوتووانە سەبارەت بەکوردان ئەنجام نەدراوە، هۆکاری سەرەکی ئەمە پێشنەخستنی پێناسەیەکی راستە سەبارەت بە خودی دیاردەکە. ئەگەرنا روونکردنەوەیەکی راست دەرهەق بەرەوشی کە لەئارادایە لەمیانەی رەوشی پارچە پارچەیی و بێبەزەیی و دوژمن و بێچارەیی ستراتیژی و هۆکاری وەکو دواکەوتنی کۆمەڵایەتی لەجێگای خۆیدا نابێت. ئەگەر شتێکی وەهاش لەئارادا بێت دیسان بەرەو ئەنجامێکی سەرکەوتووانەمان نابات. ئەگەر کێشەیەك لە گۆرەپاندا هەبێت و هاوار بکات، ئەوەی لەم شوێنە نییە چارەسەری یە، ئەمە خاسیەتێکی سەرەکییە کە بەهەڵە دەستنیشانکردنی نەخۆشی لەبناخەی هەر بێچارەییەکدا شاراوەیە.

کاتێك PKKمان وەکو رێکخستنێکی رزگاری نەتەوەیی پێناسە کرد و رێگای کاروانمان گرتەبەر، هەروەکو باوەرهێنان بەقورئان باوەرپمان بەراستەرێی خۆمان و بەدەستهێنانی سەرکەوتن هەبوو. هەرچی ئەو راستیەی دەرکەوت ئەوەیە، هەروەکو لەنموونەی سۆسیالیزمی بونیادنراودا بینرا، تەنانەت فەرمانرەوایەتی یەك لەسێی جیهانیش بکات، سیستەمێك لەدۆگماتیزم رزگاری نەبێت، تەنانەت سیستەمێکی درێژخایەنی حەفتا ساڵەی دەوڵەتیش بێت لە هەڵوەشانەوە رزگاری نەدەبوو. ئەم هەڵوێستە رەوایەتی بە سەرمایەداری نادات؛ بەپێچەوانەوە، هەروەکو چۆن ئەوە ئاشکرا دەکات کە ئەو کێشانەی رێگای لەپێش کردۆتەوە بەشێوەیەکی راست پێناسە نەکراوە، هەوڵدەدات ئەمەش نیشان بدات کە چارەسەریەکانیشی جێگای باوەرپی نییە. دیسان ئەمە بەواتای دەست بەردان لەهەوڵەکانی چارەسەری نایەت. تەواو بەپێچەوانەوە بەسووربوونەوە جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە لێکۆڵینەوە و پێویستی بەدیهێنانی گونجاوترین چارەسەری دەکات بەگوێرەی گەوهەری شۆرشگێری زانستی بوون. لەحاڵەتێکدا چەوتی یان کەموکورپی لە هەڵوێست و پراکتیك دەربکەوێت، بەسووربوونەوە ئامازە بەوە دەکات کە دۆزینەوە و پیادەکردنی رێگایەکی دیکەی راست و لێهاتووانەتر لەئارادایە. ئەم راستینەیە بەو واتایە نایێت کە سەرباری هێندە ئێش و زیانانە سەرلەنوێ بۆ سەرەتا دەگەرێتەوە. بەو واتایە دێت کە لەسەرەتاوە تادوایی بەقووڵایی ئەم قۆناخە رەخنە بکرێت کە جموجۆڵی تێدا دەکرێت و راست بکرێتەوە و پێویست دەکات بەگوێرەی ئامانجەکانی لەمیانەی پێوانە جوان و باشەکانی بەرجەستە بکرێت.

ئەگەر سەرنج نەدرێ، ئەوا ئەو دۆگماتیزمەی لە زانستەوە سەرچاوە دەگرێت لەو دۆگماتیزمانەی لەئایین و میتۆلۆژیا سەرچاوەیان دەگرت کەمتر کوێرایی ناهێنێ، هەربۆیە رێگا

لەپێش ئەنجامی مەترسیدارتر دەکاتەوە. تەنانەت هەروەکو لەڕاستینەی سەدەی بیستەم بینرا، رێگا لەپێش بەئێشترین و خوێناویترین پراکتیکی مێژووی مرۆڤایەتی دەکاتەوە. مەترسی هەڵوێستی رۆژانەیی لێرەدا رووبەڕوومان دەبێتەوە. بانگەشەی ئەم هەڵوێستە ئەمەیە؛ چەرخەکەمان سەردەمی بالآبوونی زانستە؛ هەربۆیە هەرشتێکی بەگوێرەی زانست ئەنجامبدرێت راستە و لەجێی خۆیدایە. لەم بارەیەوە هیتلەر گەورەترین پۆزەتیفیستیە. بەڵام جگە لەکەسانێکی دەمارگیری کوێرانە هیچ کەسێك داکۆکی لەسەر مافداری و راستبوونی کردەوەکانی ناکات. تەنانەت زۆر بەسانایی دەتوانرێ بگوترێ ئەو دۆگماتیزمانەی لەسەربنەمای پۆزەتیفیزمن لەمێژوودا رێگایان لەپێش مەترسیدارترین کردار کردۆتەوە. ئەمەش ئەوە پێش ناخات کە گومان لەزانست بکرێت. بەپێچەوانەوە ئاستەمترین هەڵوێستی زانستی پێویستی بە بەرپۆوەبەرایەتی هەیە؛ ئەگەر بەختەوەری مرۆڤایەتی ئامانجی سەرەکی بێت، پێویستە تاوەکو دوایی هەست بە بەرپرسیارێتی هەر خراپەکاری و کەموکوڕیەك بکرێت کە لەم بارەیەوە ئەگەری روودانی هەیە، ئەوا لەگەڵ تەواوی ئەنجامە فەلسەفی و ئەخلاقیەکانیەوە مسۆگەر فەرمانی گۆڕانکاری رێچکە و شێواز دەدات. بەتایبەتیش زانستی سەردەمی هۆڤێتی سەرمایەداری و سۆسیالیزمی بونیادنراو پێویستی بەلێپرسینەوە هەیە. ئەگەر ئەوە ئەنجام نەدرێت، ئەوا تەنیا دەتوانرێ ئومێدی چارەسەرکردنی کێشە زەبەلاحەکانی رۆژگاری ئەمرۆمان ببڕدرێت. شایانی باسە نابێ قەدەری زانست سەبارەت بەمرۆڤایەتی ئەمە بێت. قۆناخ قۆناخی چارەسەرییەکە لە رێگا چارەکانی هەموو سەردەمەکان پێشکەوتووتر بێت، تەنانەت لەلایەنێکەوە قۆناخی بەدواداگەڕانی دەرگای ئەمرییە. لەگەڵ ئەم رەخنانە، ئەو باوەڕیەی بەزانست هەیە، پێویستی بەباوەڕیەکی وەهایە کە شانسی چارەسەرکردنی سەختترین کێشەکانی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی لەئارادایە.

کاتێك لەمیانەی ئەم رێنومایییەوە تەماشای دیاردەی کورد و ئەو گرفتە هەمەجۆرانە کرا کە رێگای لەپێش کردۆتەوە، ئەوا دەبینرێ کە پێویست دەکات لەئاستی خوڵقکاری تایبەتدا بە راستەرێیەك بگەین کە چارەسەری پراکتیکی هەڵوێستی زانستی بەدیبێنێت. دوای سی ساڵ دیسان لەمیانەی چوارچێوەیەکی مێژوو هەنگاونان بۆ شیکردنەوەی قۆناخی سەرمایەداری لەم لایەنەوە واتای گەڕانەوە بۆ سەرەتا نایەت، بەواتای ئەوە دێت کە وەکو پێویستییەکی پەیوەستبوون بەیادی ئێش و قوربانیە مەزنەکان، لەپێناو شایستەبوونی تەواوی مرۆڤە پەیوەندیدارەکان و گەلەکانمان، مسۆگەر بە ئامانج و باوەڕی سەرکەوتن و رۆڵ بینین و لە هەوڵەکانی ئازادی و یەکسانی، لەژێر هەر جۆرە هەلومەرجێکدا بەلێهاتوویی و ئەخلاقیانە لە ئەرکە پیرۆزەکانمان بەخاوەن دەردەکەوین.

شەپۆلەکانی سەردەمی سەرمایەداری هەڵکشاو لەسەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەمدا زیاتر رۆژهەڵاتی ناوین دەخاتە ژێر کاریگەری خۆی. بەرامبەر بەبالآبوونی ئابووری و سیاسی و

سەربازی، ئەو شتەی کە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی نوێنەری ناوچەکە ئەنجامی بدات سنووردارە. یان ئەوەتا بالأبوونی سیستەم پەسند دەکات و ریفۆرم ئەنجامدەدات، یاخود لەمیانەی بەرخودانێکی موحافەزەکارانە و بێ ئومێد و سیاسەتی هاوسەنگی هەوڵدەدات ڕۆژی خۆی بەسەرببات. ئەوەی ڕوویدا هاتوچۆ بوو لەنێوان ئەم دوو مەیلەدا. دووسەد ساڵە تاوەکو ئێستا ناوچەکە خۆی لەم گێژەلووکە ڕزگار نەکردووە. نە قەڵەمبازێك ئەنجام دەدات کە ئەلتەرناتیف بێتە ئاراوە، نە بژاری ریفۆرمێکی خوازراوی بەپرەنسیپ و وشیاری بەپێی بڕیار و پەیڕەوی پێویست بەڕێوەدەبردرێت. پێکهاتەی شارستانییەتی باوی ناوچەکە و هێزە ناوخۆ و دەرەکییەکانی نێو پێکدادان ڕۆڵێکی سەرەکی لەمەدا دەبینن. تەواوی زیرەکی سوڵتانە عوسمانییەکان ئەوەیە لەنێو ئەم یاریەی هاوسەنگییەکاندا کەمێکی دیکە تەمەنی خۆیان درێژ بکەنەوە.

ڕووخانی ئیمپراتۆریەت لەگەڵ هەڵوەشانەوەی هاوسەنگییە دەرەکییەکان لەناوچەدا بووە بەیەك. کاتێك ئەو هاوسەنگییەی لەئەوروپا بەڕێبەرایەتی بەریتانیا ئاواکرابوو لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا تەقییەوە و ئەم هاوسەنگییە دژ بە ئەڵمانیا ئەنجامگیر بوو، ئەوا پەرتەوازەبوونی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی کرد بەناچارییەك کە هاوپەیمانی ئەڵمانیا بوو. تەواوی ڕۆژهەڵاتی ناوین ڕووبەڕووی هەلومەرجەکانی داگیرکاری بۆوە. ئیتر ئەو ناوچەیەی بەدرێژایی پانزدە هەزار ساڵ و چەندین سەردەم لەبواری ماددی و مەعنەوی ئەوروپای تێر دەکرد، ڕووبەڕووی شکستێکی تەواو مابۆوە.

لەوە زیاتر کە ئەم قۆناخە نوێیە بەشکست ناو ببرێت، ڕاستتر ئەوەیە بگوترێ ڕووبەڕووی دانان بەباڵابوونی شارستانییەتی ئەوروپا بۆوە. لەوەزیاتر کە شارستانییەتەکان ڕەوشی سەرکەوتن و ژێرکەوتنیان بەرامبەر بە یەکتر هەیە؛ ئەوا لایەنی خوڵقکاری و پێشکەوتن ڕۆڵێکی یەکلاکەرەوەتر دەبینێ. واتە لایەنی دۆستایەتی و خزمەتکردنی پێشکەوتن لەولایەنە لەپێشترە کە بەرەو دوژمنایەتی و دواکەوتن دەبات. ئەو حوکمانەی شارستانییەتەکان وەکو دوژمنی یەکتر نیشان دەدا چەوتە و تادوارادە زێدەڕۆییە. بێگومان جیاوازییەکان گەلێك لایەنیان هەبووە کە لەململانێدا بوون و ڕێگایان لەبەردەم شەڕ و پێکدادان کردۆتەوە. شایەنی باسە کە لەیاسا سەرەکییەکانی دیالەکتیکی سەبارەت بەپەرەسەندن، هەبوونی یەکێتی دژەکان لەنێو یەکترتەواوکردن دایە. کاریگەری دوو جەمسەر لەسەر یەکتری بەتەواوی بەشێوەی لەناوبردنی یەکتر نییە، تایبەتمەندێتیەکی وەهای هەیە کە جێگای خۆیان بۆ توخمێکی سێیەم واتە بۆ سەنتێز بەجێ دێڵن. هەروەکو چۆن تەواوی پێشکەوتنەکانی گەردوون لەمیانەی ڕاستینەی ئەم یاسایە هاتوونەتە ئاراوە، ئەوا لەدیاردەکانی وەرچەرخانی کۆمەڵگاشدا ئەم قۆناخە بەڕێوە دەچێت. وەرچەرخان و ململانێی شارستانییەتەکانیش کە گوزارشت لەبەرفراوانترین و چڕترین یەکێنە و جیاوازییەکانی شێوەکانی کۆمەڵگا دەکات، لەچوارچێوەی

ئەم یاسا گەردوونییەدایە. بەتەواوەتی ژێر خستن و لەناوبردنی یەکتری لەئارادا نییە، زیاتر گەیشتن بە سەنتێزێکی ژوور بەبناخە دەگیردرێت. دەسپێشخەری و دەستپێکەری لایەنێك ئەم ڕاستینە و یاسایە لەگەوهەری خۆیدا لەنێو نابات و ناگۆڕدرێت، مەسەلەی لایەنە زاڵەکان دەردەخاتە پێش.

کاتێك لەسەر ئەم بنەمایە تەماشا بکرێ، لەگەڵ ئەوەی بەو باڵابوونەی شارستانییەتی ئەورووپا بەرامبەر بە بەها باوەکانی شارستانییەتی ڕۆژهەڵاتی ناوین بەدەستیهێناوە ڕاستیەکە، بەڵام نابێ ئەوە بەتەواوەتی وەکو خراپی و ژێرکەوتن هەڵبسەنگێنرێ. هەڵسەنگاندنێکی بەمجۆرە دەشێ بۆ ئەو ئەندامە موحافەزەکار و کۆنەپەرستانە لەجێگای خۆیدا بێت کە تەمەنی خۆیان تەواو کردووە و لەبناخەی شارستانییەتی خۆی بێ ئاگایە و ڕەوشێکی لەقی هەیە، لەبەرئەم هۆکارەش لەناوچوونی ڕاستیەکی دەست لێبەرنەدراوە. هەرچی هەبوونی هەمیشەیی شارستانییەتەکانە، لەمیانەی تێرکردن لەلایەن ئەوانی دیکەوە لەژوور لەڕێگای سەنتێزێك دەشێ بکەوێتە سەر ڕێی پێشکەوتن. چەندین ئەندام (لایەن)ی میراسی شارستانییەتی ڕۆژهەڵاتی ناوین هەیە کە پێویستە لەناوببردرێت. هەڵبەتە بەپێی تێپەڕبوونی ڕۆژگار ئەمانە دەهاوێژرێنە ناو زبڵدانی مێژوو. بەڵام تایبەتمەندێتی بەرئەندامی سەنتێزی زوورتر و هەمیشەیی هەیە. بەرخودانی ئەمانە لە بەرخودانی موحافەزەکاری و کۆنەپەرستی ناچێت. بەپێچەوانەوە، هەروەکو چۆن بەرخودانی گەوهەری تواناکاری ژیانی و قەڵەمبازی هەیە و بناخەی پێشکەوتنی مێژوویی یە، ئەگەر سنوورداریش بێت لەسەر ئەم بنەمایە لە ڕۆژهەڵاتی ناوین ڕەوشی دژە بیرۆکەی هەیە و بەسووربوونەوە بەردەوامی بەهەبوونی خۆی دەدات. ئەوانە بەرامبەر بەپێشکەوتنی شارستانییەتێکی باڵا دەتۆقێن و دەکەونە نێو بەرخودانێکی بێ ئومێدانە، بۆ قۆناخێکی کورت لەگەڵ ئەو توێژانەی ڕۆڵی تەسلیمکاری و ژاردەستی دەبینن هەمان پێکهاتە و فۆرم پێکدێنن. ئەمانەش ئەو توێژانەن کە کاتینە و ڕەوشیان لەقە. بەرامبەر بەمەش توێژێك هەیە کە لەگەڵ بەها پێشکەوتووخوازەکانی شارستانییەتی باڵا کەوتۆتە نێو تەبایی و نوێنەرایەتی ئەم بەهایانەی کردووە. بەڵام لەهەمانکاتیشدا بەرخودانی دژی ئەو لایەنەکرد کە دەبێتە هۆکاری باڵادەستی و باڵابوونی لایەنێك، دژی ئەو لایەنە بەرخودان دەکەن کە ئامانجی لەناوبردنی لایەنەکەی تر و نوێنەرایەتی توێژە پێشکەوتووخوازە هەمیشەییەکان دەکات. بەو واتایەش دەتوانرێ مێژوو وەها پێناسە بکرێ کە لەمیانەی ناکۆکی و تەبایی لەپێناو پێکهێنانی سەنتێزێکی نوێ پێشدەکەوێت، ئەمەش بەهەڵوێستێکی زانستییانە دادەنرێت. هەبوونی ناکۆکی و ڕێککەوتنی شارستانییەت و پێشکەوتن بەرەو پێکهێنانی سەنتێزێکی نوێ لەنێوان ئەورووپا و ڕۆژهەڵاتی ناوین، بابەتێکی هەنووکەیی یە لەمیانەی ڕووداو و پێشکەوتنە ڕۆژانەییەکان بەجۆش و خرۆشەوە چاودێری دەکرێت.

لەچوارچێوەی ئەم پرۆسەیەدا، شەڕی رزگاری نیشتمانی دە بەرێبەرایەتی مستەفا کەمال لەسەر بنەمای ئیرادەی هاوبەشی هەردوو گەلی کورد و تورک پێشکەوت، شەڕێکی پێشکەوتووخواز و هەمیشەییە. تایبەتمەندێتیە پۆزەتیڤەکانی شارستانییەتی ئەوروپای بەبنەماگرت، بەڵام لەگەوهەری خۆیدا دژی ئەو لایەنەی وەستا کە پشت بەمزاڵبوون و باڵادەستی دەبەستێ. هێزی خۆشی لەم گەوهەرە پێشکەوتووخواز و دادپەروەرانە وەرگرت. جگە لەمەش لایەنێکی ناکۆکی هەبوو کە کۆسپی دروست کرد و دژی ئەم تایبەتمەندێتیانە وەستا کە دەشیا خزمەتێکی باش لەپێشکەوتنی کۆماری تورکیا بکات. سەرباری ئەوەی لەسەردەمی دامەزراندندا، کۆمار سەرکەوتوو بوو مافدار بوو لەوەی دژی لایەنە کۆنەپەرست و دەمارگیرەکان بەرخۆدان بتات، بەڵام خاوەن ماف نەبوو و ژێرکەوت لەوەی وەڵامی داواکاری و بەهای گەلان بداتەوە ک ە دەخوازن پەرەسەندن و پێشکەوتنێکی باشتر بەدەست بێنن. لەکاتێکدا رۆڵێکی باشی بینی لە بەلاوەنانی پاشماوەکانی دەرەبەگایەتی، بەڵام رۆڵێکی خراپی بینی لەبەرئەوەی نەیتوانی وەرچەرخانی دیموکراتییانە ئەنجام بدات، ئەویش بەهۆی ئەو وەڵامە شۆڤێنیستیانەی بوو کە بەرامبەر پێشکەوتنی بەها هەمیشەییەکانی گەل نیشانیدا. هەروەها نەگەیشتنی بەخێرایییەکی بەرزی پێشکەوتن، گرێدانێکی توندی بەم شێوە ناکۆکەی ناواخنی هەیە. تاوەکو چارەسەرییەکی پۆزەتیڤانە کە بە ئاراستەی دیموکراسییەت بێت سەبارەت بەم ناکۆکیە پێشکەش نەکرێت کە هۆکارێکی سەرەکی ئەم قەیرانە قووڵ و هەمەلایەنەیە و لەرۆژگاری ئەمڕۆمان زیاتر کەڵەکە دەبێت، بەتایبەتیش لەو کاتەی ئەم ناکۆکییە دەردەکەوێتە پێشمان کە بەتەواوی رەهەندە نێگەتیڤەکانی لەکاتی دامەزراندنی کۆمار هەبوو، ئەوا چارەسەریەك لەچوارچێوەی بنەما ئەرێنییەکان ئەکاتە ناچاریەك. لەبەرئەوەی چارەسەری بۆ ئەم ناکۆکیە پێشکەش ناکات، هەرچەندە پێڕەوی زێرانە سەبارەت بەکپکردن و شاردنەوەی بەکار بهێنرێت، رەوشێکی قەیراناوی هاوشێوەی تورکیا هاوتاکەی نابینرێ، تواناکارییەکی وەهاشی هەیە بسەلێنێ کە ئەم ناکۆکیە لەبوومەلەرزە دەچێت. هیچ کۆسپێك نییە کە رێگای لێ بگرێت و نەهێڵێ لەژێر خاکەوە دەربکەوێ کە لەمیانەی ئەو قەیرانانەی تورکیا لەساڵانی ۲۰۰۰ تێیدا دەژی گوزارشت لەهەبوونی خۆی بکات.

وڵاتەکانی دیکەی رۆژهەڵاتی ناوین کە هەمان شێوازی تورکیایان هەیە و درەنگ وەخت نوێ کراوەتەوە و ئەمەش لەبوارێکی تەسکدا بەرێوەچووە، ناکۆکی هاوشێوەی ئەم ناکۆکیانە بەخۆوە دەبینن کە باسمان کرد، تەنانەت ناکۆکی قووڵتریشن. دەوڵەتە عەرەبییەکان پاشماوەکانی سیستەمی دەرەبەگایەتییان بەسەردا زاڵە، کەمێك پەروەردەی لەسەردەستی شارستانییەتی رۆژئاوا وەرگرت تاوەکو بەشێوەیەکی تەسلیمکاری درێژە بەهەبوونی خۆی بدات. ئەمەش لەو وڵاتانە بەرێوە دەچێت کە دەسەڵاتی پادشا و میر لەئارادایە. هەروەکو چۆن ئەوانەی بانگەوازی نوژەنی دەکەن و بەبانگەشەی وەرچەرخانی زێنەرۆیی و ئەو جوڵانەوانە

دەرکەوتن کە لەبناخەدا پشت بە بۆرژوازی بچووك دەبەستن نەیانتوانی رژێمی دەرەبەگایەتی تێپەڕ بکەن، لەهەمانکاتدا نەیانتوانی تێڕوانینێکی ئاشکرا بەرەو بەدیهێنانی دیموکراتی گونجاو پێکبێنن. هەروەکو بڵێی جگە لە بوون بەپادشایەتیەکی هاوچەرخ نەیانتوانی هیچ رۆڵێکی دیکە ببینن. بەمجۆرە ئەمانە نەیانتوانی ببن بەخاوەنی وزە و توانای ئاواکردنی پەیوەندیەکی واتادار چ لەگەڵ بنەما مێژووییەکانی رۆژهەڵاتی ناوین بێت یاخود پێوانە دیموکراتیەکانی کە شارستانییەتی هاوچەرخ ئاراستەی بۆ گرتووە، بەڵکو بەسیاسەتێکی سەرەکی سنووردار بوون کە پشت بەهاوسەنگیە نێودەوڵەتیەکان دەبەستێ و بریتییە لەجولانەوەی رزگارکردنی رەوشی هەنووکەیی لەمیانەی بەکارهێنانی نەتەوەپەرستی عەرەبی دژی نەتەوەپەرستی ئیسرائیلی. هەربۆیە کۆمەڵگاکانیان لەگەڵ ئەو گرفت و کێشە ئابووری و سیاسی و دیموکراسی و کولتووری و کۆمەڵایەتییانەی لەنێو ناکۆکیەکی دژواردان کە رۆژ بەدوای رۆژ زیاتر کەڵەکە دەبێت. نەیانتوانی ئەو تواناکاری و لێهاتوویە پێویستە سەبارەت بەنوێنەرایەتی کردنی تایبەتمەندێتیە باشەکانی شارستانییەتی رۆژئاوا و رەسەنایەتی خۆیان نیشان بدەن. تەنانەت ئەگەر بەهۆی داهاتەکانی پەترۆڵ رەوشێکی ناکۆك و قووڵی هاوشێوەی شێوازی تورکیاش بەشێوەیەك نەیێتە ئاراوە، ئەوا لەشێوەی تەقینەوەی کۆمەڵایەتی مەزن و کەم بوونەوەی داهات گوزارشتی لێدەکرێ، ئەمەش بەردەوام دەبێت تاوەکو رەوشی لەئارادایە لەسەر بنەمای پۆزەتیف چارەسەری تایبەت بەخۆی دەخولقێنرێ، ئەمەش یان لەرێگای وەرچەرخانێکی دیموکراتییانەی تەواو دەبێت یان بەهەڵوەشانەوە و قەیرانی بەردەوام دەبێتە رۆژەڤی رۆژانە.

بەڵام سەبارەت بەوڵاتەکانی دیکەی وەکو ئێران و پاکستان و ئەفغانستان، سەرباری ئەو ناکۆکیانەی بەخۆیانەوە دەبینن، لەنێو رەوشێکی هاوشێوەدا دەژین. کاتێك ئەو پەیڕەوە کەمالیانەی تا دوا چارەکی سەدەی بیستەم تاقییان کردەوە بەکەڵکیان نەهات، ئەم وڵاتانە هەستیان بەپێویستی ئیسلامیەت کرد، ئەم رەوشەش گوزارشت لەشکستهێنانیان دەکات بەرامبەر بەشارستانییەتی رۆژئاوا. هەروەها ئەو هەوڵانەی لەرێگای کاردانەوەی ئیسلامی دران بۆ ئەوەی رەوشی خۆ بەدەستەوەدانی لەئارادایە تێپەڕ بکرێت. ئەمەش هەروەکو لەنموونەی ئەفغانستان دەبینرێ نەیتوانی شتێك بکات جگە لەوەی خستیە نێو دەرەوەی سنووری سەردەم. بەڵام ئەو ململانێیەی لەژێر پەردەی ئیسلام لەپاکستان لەنێوان گروپە دەسەڵاتدارە سەربازی و سڤیلەکان بەرێوەدەچێت، نەیتوانی دەرەتانێکی سەرکەوتوو بدۆزێتەوە. رەوشی هەنووکەیی ئەم کڵێشانە جگە لە دەزگای ئۆلیگارشی کۆنەپەرستی گوزارشت لەهیچ شتێکی دیکە ناکات. سەرباری سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی ئێران کەوەکو کاردانەوەی گەلەری دژی رژێمی شای تەسلیمکار و قەیراناوی سەریهەڵدا، ئێستاکە کێشەی سەرەکی سەبارەت بەوەرچەرخانی دیموکراتییانە بەخۆیەوە دەبینێ. هەروەکو تێبینی کراوە ئەم دەوڵەتانە ناتوانن لەم ناکۆکیە

قوولانە رزگار ببن کە پێیەوە دەناڵن، چونکە لەهەڵوێستە ئایدیۆلۆژی و سیاسییەکانی کە تاقیکردەوە پشتی بەکۆڵەکەکانی شارستانییەت نەبەست لەپێناو گەیشتن بەگەوهەر، ئینجا چ ئەمە بەدەمامکی نەتەوایەتی یان سۆسیالیزمی بونیادنراو بێت یاخود لەژێر پەردەی ئیسلامیەت. هەربۆیە نەیتوانی لەناکۆکیە قووڵەکانی رزگار بێت. بەمجۆرەش دەبینن کە لەسەر تەواوی ولاتانی رۆژهەلاتی ناوین پێویستە، یان بەپێوانە دیموکراتیەکان بکات و بە لایەنە ئەرێیەکانی شارستانییەتی هاوچەرخی بگەیەنێ. بەمجۆرەش چارەسەری بۆ ناکۆکیەکان دەدۆزرێتەوە و لە رێگای پێشکەوتن بەرێوە دەچێت، یان درێژە بەوشێوازانە دەدات کە تا ئێستا تاقی کردۆتەوە و قەیرانەکانی قووڵەکاتەوە، بەمجۆرەش لەچوارچێوەی خۆبەدەستەوەدانەوە دەمێنێ.

دەستێوەردانەکانی ئەوروپا کە لەسەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەم خێرابوو، لایەنە فورسەکەی داگیرکاری بوو، چاوچنۆکی بێ سنوور بۆ بالادەستی و قازانج، فاکتەری سەرەکی هاندەری چاوتێبڕین بوو. ئامانجی سەرەکی تێکشکان و تەسلیمگرتنی رۆژهەلاتی ناوینە. کوردان کە لە چەرخەکانی یەکەمین و ناوین ئاشنای داگیرکاری ببوون، لەنێو تەڵەزگەیەکدا پێشوازییان لەو شێوە نوێیەی داگیرکاری کرد کە پێشتر تێیکەوتبوون.

لە راستیدا "تەڵەزگەی کورد" زاراوەیەکی سیاسییە پێویستە زۆر بەباشی شیبکرێتەوە. ریشەکانی تاوەکو سەردەمی کۆلۆنیەکانی سۆمەر دەگەرێتەوە. ئەم تەڵەزگەیە بەتایبەت و بەردەوامی تۆکمە و ئامادەکراوە. ئەو چوارچێوەیەی سەبارەت بە مێژوو دیارمان کرد بەئامانجی پێناسەکردنی ئەم تەڵەزگەیە هەوڵدەدات فاکتەرە سەرەکیەکانی دیاری بکات. ئەمانە دووبارە ناکەینەوە. بەلام ئەوەی بەدەستی سەرمایەداری رۆژئاوا تۆکمەکراوە لەهەمووییان مەترسیدارترە. هەربۆیە لەگەڵ بنەما مێژووییەکانی "تەڵەزگەی کورد" پێناسە و شیکردنەوەی ئەوەی بەپشتبەستن بەسەرمایەداری ئاواکراوە بایەخێکی مەزنی هەیە. ئەو تەڵەزگەیەی دوو سەد ساڵە سەرلەنوێ ئاواکراوە و تۆکمەکراوە چ واتایەکی هەیە؟

لایەنی یەکەم: سەرمایەداری رۆژئاوا لەجیاتی ئەوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی برووخێنێ و رەوشێك بخولقێنێ کە سەری لێ دەرنەچێ و رزگاربوونی بۆ نەبێ، گرێدانی سوڵتان و بەشێکی گرنگ لە بیرۆکراتەکان بەخۆیان بەگوێرەی بەرژەوەندیەکانی خۆیان دەبینن. لە رێگای ئەمانەوە هەم ئەو کۆنترۆڵەی دیخوازێت لەسەر ناوچەکەی پێشدەخات، هەم سنووردانان بۆ گەلە یاخیبووەکان سانایی تر دەبێ. بەتایبەتی ئیمپراتۆریەتی بەریتانیا ئەم رێچکەیە پەیرەو دەکات، لەم رێگایەوە سەد ساڵ تەمەنی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی درێژ دەکات. هەڵوێستی فەرەنسا و ئەڵمانیاش لەگەوهەردا هەمان شتە، ئەو ناکۆکیانەی لەنێوانیاندا هەیە لەسەر هاوسەنگیەکانی رۆژهەلاتی ناوین رەنگ نادانەوە. ئەو سوڵتان و بیرۆکراتانەی لەنێو خۆیاندا دابەشیان کردبوو و بەخۆیانەوە گرێ دابوون، بۆ ئامانجەکانی سەدەی نۆزدەهەم

گونجاوترین شوێنگەی بۆ مەیسەر دەکردن. بەمجۆرە بەئەندازەی هەنگاو بەهەنگاو پەلهاوێشتن، لێدانی ئەوانەی لەدژی دەرکەوتوون بەڤامچیەکانی عوسمانیەکان ئاقڵمەندانەترین رێگا و شێوازە. کۆڵەکەیەکی گرنگی تەڵەزگەکە بەمجۆرە تۆکمە دەکرێت. دووەمیان، لایەنی گرنگ یاخود کۆلەکەی دیکەی تەڵەزگە کە، بەپشتبەستن بەگەلە بەرپشە مەسیحیەکان پەرەی پێبدرێت. داگیرکاری رۆژئاوا لەرێی ئەم رێچکەیە گوایە دەخوازێ گەلانی رۆم، ئەرمەنی و ئاشووری بپارێزێ، لەناوچەکەدا مەترسیدارترین رێگا بۆ پاکتاوکردنیان دەکاتەوە. تەواوی گەلانی رۆژهەلاتی ناوین لەنێو ئەم گەمەیەدا دەکرێنە ڤوربانی ئەم پیلانگێڕییە. نەریتی بەڤوربانی کردنی منداڵان کە لەسەردەمێکدا بەرامبەر بە ئافاتەکان پەیڕەو کرا، ئەمجارە نەك لەلایەنی خوداوەندەکان، لەلایەن ئەو هاوڕەگەزانەیان بەرێوەدەچێت کە خۆیان وەکو دۆست نیشان دەدەن. داگیرکاری تەڵەکەباز و ڤێڵباز بەدەستی کۆمەڵێك بەکرێگیراو، تەواوی گەلان لەولاتی هەزاران ساڵەیان دادەبرێت، لە کولتوورەکانیان دەپچڕێنێ و دەیانکات بە دوژمنی یەکتری.

لەنێو ئەم تابلۆیەدا رەوشی کوردان بەتەواوی وەکو لاشە و تەنێکی تاقیکردنەوەیە، ئامراز و کەرەستەیەکە بەرادەیەکی هەرە زێدە لە هەموو جۆرە گەمەیەکی پیلانگێڕان بەکار دەهێنرێ. کوردان کە لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەم وەکو ماشەیەك بەکار دەهێنرێن، بەتایبەتی لەلایەن ئینگلیزەکانەوە بۆ زیاتر بەخۆوە گرێدانی یەك بەدوای یەکی بەرێوەبەرەکانی تورك، عەجەم و عەرەبەکان رۆڵی هەڵگری (مانیولا) دەبینن. هەروەکو بڵێی سیاسەتی "سەگ بە گژ سەگەوە بنێ" پەیڕەو دەکات یاخود "بە بەردێك دەخوازێ لەچەند چۆلەکەیەك بدات". بەر لە هەموو شتێك لەگەڵ دەستدرێژکردن بۆیان کوردە بەکرێگیراوەکان بەلای خۆیاندا رادەکێشن. دووەم، بەرێوەبەرە تورك و عەجەم و عەرەبەکان کە لەمە دەترسن، زیاتر پێیانەوە گرێدەدرێن. سێیەم، گەلی ئەرمەنی و ئاشووری کە لەلایەن کوردە دەرەبەگە بەکرێگیراوەکان تەنگەتاو دەکرێن، زیاتر ناچار دەبن پەنا ببەنە بەر سوڵتان و شێخ و پادشاکان. بەرێوەبردنی ئەم گەمەیە لەمیانەی وانەی دووەمەوە بۆ خۆیان بەمەعریفەت دەزانن. واتە سیاسەتی بەگژەوەنانی یەکتری کە سەبارەت بەوان پەیڕەو دەکرێت، ئەوانیش لەئاستێکی ژێردا دژ بە رکابەرەکانیان بەکاری دێنن. هەرچی ئەو گەلانەی دەکەونە رەوشی ڤوربانی بوون، وەکو پێویستییەکی گەمەکە جگە لەجێ بەجێکردنی پێویستی فەرمانەکان نابن بەخاوەن رۆڵێکی دیکە.

هەرچەندە ڤوربانی لەپێشینەی تەڵەزگە کوردەکان بن، ئەوا هەروەکو پەندی "ئەگەر ماڵەکەت لە شووشە یە بەرد لە ماڵی خەڵکی مەگرە"، پێك دێت. تەواوی گەلانی ناوچەکە دەخرێنە نێو ئەم تەڵەزگەیە. کوردان لەبەرئەوەی بەهۆی بێبەشییان لە تواناکاری ستراتیژی و پارچەبوونی بێ سنوور هێزی خۆیان نەکردووە بەیەك، هەرزانترین ئامرازی پیلانەکەن.

هەرچەندە هەڵوێستی چاوچنۆکی سەرمایەداری بۆ بەدەست هێنانی قازانج کە هیچ سنوورێك ناناسێ فەلسەفەی گەوهەری پیلانەکە بێت، ئەوا بەکارهێنانێکی هاوشێوە کە بەدرێژایی مێژوو بەردەوام بووە، ڕێگای لەپێش ئەوە کردۆتەوە کە ڕەوشیان ببێتە ڕەوشی خراپترین گەل. دەشێ ئەمە بەسیاسەتی، "کەروێشك ڕاکە، تاژی بیگرە"، ناوببرێت. بەمجۆرە تاوەکو دوایی ئەم لایەنانە بەکاردێنێ کە وەکو گرفت بۆ خۆی دەیانبینێ، ماندوویان دەکات و لەدواییشدا ڕۆڵی فریادڕەس بەخۆی دەدات و تەنانەت ئەگەر پێویست بکات بۆ سەرلەنوێ بەکارهێنان خاوەندارێتییان لێ دەکات. کاتێك دەڵێین تەنی تاقیکردنەوە مەبەستمان ئەم ڕاستینە پڕ لە ئێشەیە.

بێگومان کارەکتەری هەزاران ساڵەی بەکرێگیراوێتی چینی سەرووی کوردان فاکتەرێکی سەرەکی ئەم ڕەوشەیە. ڕەوشی گەل کە لەنێو نەزانیدایە پارچەیە و بەگژ یەکتردا دەهێنرێ، بەردەوام زەمینەیەکی لەبار دەڕەخسێنێ. ئەم پیلانانە دەرهەق بەتەواوی ئەو یاخیبوونانەی کوردان پەیڕەوکراوە کە لەسەدەکانی نۆزدەم و بیستەم لەسایەی سەرمایەداری ئەنجامدراون و سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە. هۆکارە بەجێ و ماقدارەکانی یاخیبوونەکان واتایەکی ئەوتۆیان نابێت. ئەوەی گرنگە لەئەنجامدا بەلایەنی کێدا شکاوەتەوە و زیاتر لەبەرژەوەندی کامە لایەندا بووە.

ئەگەر کوردان یاخی ببن و بەدوای مافەکانیاندا بگەڕێن، بەهەموو جۆرێك ئەنجامەکەی ئێش و ئازارە، ئەگەر بەدوای مافەکانیدا نەگەڕێت، لەجێگای خۆیدا دەستەوەستان بمێنێ، ئەنجامێکی خراپتری بەسەر دێت. کاتێك باس لەکەوتنە نێو تەڵەزگە دەکەین، مەبەستمان ئەمەیە، ئافاتی بەمجۆرە بەدەگمەن بەسەر هەندێ گەلان هاتووە. ئەگەر مێژووناسانی کورد یەکەڵك بێن و کارێك بکەن، لەهەموو شتێك زیاتر پێویستە ئەم واقیعە شیبکەنەوە. ئەگەر هەندێ نموونە ڕوون بکەینەوە، ئەوکاتە زیاتر دەرك بەم ڕەوشە دەکرێت.

کاتێك لەیەکەمین نیوەی سەدەی نۆزدەهەم بەهۆی ڕێگای هیندستان و ئەگەری دەوڵەمەندێتی کانزا و پەترۆڵ ئینگلیزەکان دەستیان بۆ ئێراق درێژ کرد، بەکارهێنانی کوردان، عەرەب و ئاشورییەکان بەرامبەر بەڕێوەبەرایەتی تورك و خراپتریش بەکارهێنانی دژ بەیەکتریان، کرد بەسەرەکیترین سیاسەت. سەرەتا بەکوردانی گووت: پشتگیریتان لێ دەکەم، بەمجۆرە کوردانی وروژاند. بەڕێوەبەرایەتی تورکان کە تەنگەتاوبوون زیاتر لەئینگلیزەکان نزیك بوونەوە. ئاشورییەکانیش بەهۆی مەسیحیەت وەکو هاوپەیمانێکی سروشتی لەقەڵەمیان دان. عەرەبەکان لەهەمووان زیاتر وەکو بەکرێگیراو پەنایان بۆ بردن. کاتێك گەیشتنە ساڵانی ١٨٥٠، دواجار لەمیانەی ئەو یاخیبوونەی بەڕێبەرایەتی بەدرخان بەگ ئەنجامدرا یەکەمین پەردەی لەیستۆکەکە بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە تەواو ببوو، داگیرکاری ئینگلیز پەرەسەندنێکی مەزنی بەخۆیەوە بینیوە، بەڕێوەبەرایەتی تورك هێزێکی زۆری لەدەستدا.

عەرەبەکان خاوەنێکی نوێیان بۆ خۆیان دۆزیەوە. ئومێدێکی ساختە لای ئاشورییەکان سەریهەڵدابوو. هەرچی کوردەکانن کە قوربانیەکی پیلانگێڕیەکەن و لەهەمووان زیاتر ئێش و ئازار دەکێشن، ڕووبەڕووی سەرکوتکردن هێڵراونەتەوە.

لەدووەمین نیوەی سەدەی نۆزدەیەم و لەمیانەی یاخیبوونی نەهریەکان کە سەید تەها ڕێبەرایەتی کرد. ئەمجارە گەمەکە لەسەر ئێران پەیڕەوکراوە. ئەنجام هەمان شتە. شاهنشاهی ئێران لەبەرێوەبەرایەتی کۆلۆنیالیزمی ئینگلیز نزیك کراوەتەوە. ئاشورییەکان کەوتوونەتە نێو ڕەوشێکی تەنگەتاوی. کوردەکان دیسان ڕووبەڕووی ئەنجامێکی پڕ لەئێش و ئازار دەبنەوە، هەم سەرکوت دەکرێن، هەم مۆرکی هۆڤێتییان لێدەدرێت و دەکەونە نێو ڕەوشی تاوانبارییەوە.

بەئێش و ئازارترینیان یاخیبوونی ١٩٢٥ کە بەڕێبەرایەتی شێخ سەعید بوو. بەهۆی پەترۆڵ ئینگلتەرا دەخوازێت موسڵ و کەرکوك لەدەرەوەی سنووری میساقی میللی بهێڵێتەوە. هەرچی کۆماری تورکیایە بەڕێبەرایەتی مستەفا کەمال وەکو پێویستییەکی پەیوەستبوون بە میساقی میللی دەست لەداواکردنی ناوچەکە بەرنادات. کوردەکان و تورکەکان داوای جێبەجێکردنی پێویستییەکانی میساقی میللی دەکەن. لەم هەلومەرجانەدا دیسان گەمە ناسراوەکەی ئینگلیزەکان دەکەوێتە گەڕ. ئامادەکارییەکان بۆ لێدانی چەند جۆلەکە بەبەردێك لەئارادایە. ئەو کوردانەی نزیکی خۆی دەبینێ ڕازی دەکات و سەرنجیان ڕادەکێشێ بەوەی یارمەتیان دەدات. تەنانەت ئومێدی ساختەی وەهایان نیشان دەدات کە لەئەگەری یاخیبووندا یارمەتیان دەدات. کاتێك یاخیبوون دەتەقێتەوە، لەگەڵ حکومەتی کەمالیستی ڕێك دەکەوێت. قووڵترین پارچەبوون لەچارەنووسی کورد و کوردستان دێنێتە ئاراوە. ئێراق بەبەر خۆی کەوتووە. لەسەختترین قۆناخدا تورکیای کەمالیستی نزیکی خۆی کردۆتەوە. کۆمار هانی هێرشکردنە سەر کوردان دەدات و بەمجۆرە دەیخاتە نێو هەڵدێرێکی مەترسیدار. واتە جارێکی دیکە لەمیانەی سیاسەتی "پەرتکە و زاڵبە" بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە لەیستۆکی، "کەروێشك ڕابکە، تاژی بیگرە" بەڕێوەچووە، بەبەردێك چەند ئامانج پێکێنراوە. کۆمار کوردانی لەبیر کردووە کە تاوەکو دوێنێ لە سەختترین قۆناخدا هاوپەیمانی ستراتیژیان بوون، ڕێبەرەکانیان لەسێدارەدا، بەمجۆرەش وایزانیوە کێشەیەکی مێژوویی چارەسەر کردووە. لەمیانەی پەیڕەوکردنی شێوازەکانی سەرکوتکردن و نکوڵی، وەکو پێویستییەکی ئەم لەیستۆکە دەکەوێتە نێو سیاسەتێك کە زۆر لەهی عوسمانیەکان دواکەوتووترە، هەروەها دەکەوێتە نێو کێشەیەك زۆر بەخۆیەوە خەریك دەکات. نەك تەنیا کوردان بەڵکو بەمجۆرە تورکەکان و کۆماریش دەکەونە نێو لەیستۆکەکە. ئیمپریالیزم و داگیرکاری تەنیا یاری بەلایەنێك ناکات. ڕێساکەی بەمجۆرەیە؛ بەردەوام یاری بەهەردوو لایەن دەکات، بەرژەوەندیەکەی زیاتر بەکام لایەندا بشکێتەوە بڕیار بەلایەنی ئەو دەدات.

لەم مێژووەدا واتە لەقۆناخی ۱۹۲۰ ـ ۱۹۲۵ هەمان سیاسەت و لەپیستۆك لەرێی ئێران و ئێراقیش تاقی دەکرێتەوە. لەکاتێکدا ئیسماعیل سمکۆ پێوانێکە و هەموو هێزێك تاقی کردۆتەوە، وا دەزانێ ئەو بەکاریان دەهێنێ. لەئەنجامدا سەرباری ئەو تواناکاریە مەزنانەی لەناراداان، بەڵام ئەو زهنیەتەی لەخۆیەوە دەگرێت، دەبێتە هۆکاری لەدەستدان و زیانی زۆر خراپ و مەزن. لەبەرئەوەی بەکارهێنان بەئامانجی تەکتیکی بەگوێرەی پێویست و لەکاتی خۆیدا بەشێوەیەکی راست هەڵناسەنگێنرێت، ئافاتی مەزن دێنێتە سەر کەسایەتی و جوڵانەوە و گەلان.

لەکوردستانی ئێراقیش بەرێبەرایەتی مەحمود بەرزنجی ئەنجامەکە هەمان شت بوو. ئەگەر یەکتری بەکارهێنانی بەرامبەر لەبواری تەکتیکیدا پشت بەهێزی خۆیی نەبەستێت و بەئەنجامێك نەگەیەنرێت، ئەوا رزگاربوون لەئەنجامی وونکردنێکی نیگەتیڤانە مەحاڵە. لەوەدا نابێ تەنیا تاوان بخرێتە سەر رێبەرایەتی سەرهەڵدان و رێکخەری ئەم پیلانانە و دوژمنەکانی گەل لەبیربکرێت. بەپێچەوانەوە، جەخت لەسەر ئەوە دەکەینەوە کە پێویستە زۆر باش بزانین تەڵەزگەی کورد خاوەنی لۆژیکێکی چۆنی دامەزرانننە و بەمجۆرە هەنگاو بهاوێژێ.

دوا پەردەکانی ئەمجۆرە سیناریۆیانە، ئەوانەن کە دوای شەڕی دووەمی جیهانی تاوەکو رۆژگاری ئەمرۆمان بەڕێوەچووە. ئەو پارتییانەی لەنێو ئەو هەلومەرجە خوازرا لەژێر ناوی PDK پێشبخرێن کە شەڕی دووەمی جیهانی رێگای لەپێش کردەوە، داردەستی باو و بەکرێگیراوێتی هاوچەرخی بەیەکەوە لەناویەکتردا بەرێوەبرد، لەمیانەی پارتەکانی خۆیان نەك تەنیا بۆ ئەندام و لایەنگرەکانیان تەنانەت بۆ تەواوی گەلی کورد بوون بەخراپترین نموونە. لەکاتێکدا سەرکەوتن لەتێکۆشانی ئازادی لەسەرتاسەری جیهان ببووە رێسایەك سەرباری ئەوەی گەلی کورد بەدەستی ئەو پارتیانەی بە PDK ناو دەبران گەورەترین زیانی بەرکەوت، ئەم پارتانە نەیانتوانی خۆیان لەدەست یاری کەرە تەکتیکیەکان دەربهێنن و لەرەوشی پاشکۆیەتی رزگاریان بێت. دیاردەی کورد کە لەئاستی دەرککردن بەداگیرکاری رۆژئاوا پێشکەوتنی بەخۆیەوە نەدیبوو، کەوتە نێو قۆناخێکی تاریکتر.

تورکەکان، عەرەبەکان و عەجەمەکان کە لەچوارلاوە دراوسێیانن هەرچەندە بەدەستی دەوڵەتیش بێت، لەمیانەی هەنگاونان بۆ سەر رێی پێشکەوتنی سەرمایەداری، مەوداکەی نێوانیان زیاتر کرد. توانای بوون بەچینی بۆرژوا و نەتەوەی سەردەستی سەردەمی سەرمایەدارییان خستە سەر بالابوونی میللەت و چینی سەردەستی قۆناخی دەرەبەگایەتی. ئەگەر لەنێو هەلومەرجی گرێدان بەئیمپریالیزمیش بێت لەبواری دەوڵەت و کولتوور و ئابووری نەتەوەیی درێژەیان بە پێشکەوتنی خۆیاندا. لەبواری زانست و تەکنۆلۆژیادا چینێکی هەڵبژاردەی نەتەوەییان پێکهێنا. زمانی نەتەوەیی و راگەیاندن و بڵاوکردنەوە سەربەخۆ بوو بەهێزێك. بەپشتبەستن بەنەتەوەپەرستی لەمیانەی سیاسەتەکانی ناوخۆ و دەرەوە

ئەکەسایەتی چینەکاندا جیاوازی نەتەوەییان بەرپێی بەرژەوەندی بەرجەستە تۆکمە کردووە. ئامرازی پۆلیسی و سەربازی بەهێزیان ئاوا کرد کە بتوانێ بەرخودانی گەلان تێك بشکێنێ. میللەتە بەهێزەکانی چەرخی ناوین تورك، عەرەب و فارسەکان کە بەدرێژایی سەدەی بیستەم پێشکەوتنیان بەخۆیانەوە بینی، لەمیانەی چینی بۆرژوا و دەوڵەتی نەتەوەیی کە بەدەستی دەوڵەت خوڵقێنران، راستیەکە تارادەیەکی مەزن مەودایان لەنێوان خۆیان و کوردەکان کردەوە. بەر لەوەی خۆیان لەگەمەکانی داگیرکاری ئیمپریالیزم رزگار بکەن، ئەمجارە خۆیان رووبەرووی شۆڤێنیزمی نەتەوەیی و فشار و نکوڵیکردنی دراوسێکانیان بینیەوە. زەمینەیەکی وەها هاتە ئاراوە، گووتنی، مـن کـوردم؛ بـەواتای خۆبەتەنیابینینـەوە و داخسـتنی هـەموو رێگاکـانی پێشکەوتن و تەنیا رووبەڕوو بوونەوەی هەموو مەترسیەك دەهات. کوردایەتی بەتـەواوی بـووە بـەڵای سـەر. زۆر لـە کۆلۆنیکـردن بـەولاوەتر، مـەحکومی سـتاتۆیەك کـران کـە هاوشـێوەی بێبەشکردنە لەهەموو بەهاکانی مرۆڤایەتی.

لەتـەواوی جیهان سیاسـەتی نابەجێ و رەتکردنـەوەی دیاردەی کورد بـووە بەزاراوەیـەکی سیاسی خراپ. تایبەتمەندیەکە کە هیچ لەبارەیەوە بەرپرسیار نـابینرێ و لەزگماکەوە بۆی ماوەتـەوە و گـەورەترین مەترسی دێنێتـە سەر. دەشـێ زاراوەکـانی نەژادپەرسـتی، فاشیسـتی، نەتەوەپەرستی و کۆمۆنیستی پێناسە بکرێن. ئەمانـە لـەچوارچێوەی یاسـای نێونەتـەوەییدا هەڵسـەنگێنراون. بـەڵام دیاردەی کورد لەمیانـەی هیـچ زاراوەیـەك روون ناکرێتـەوە. سەرباری ئەوەی لە بچووکترین مافـەکانی مـرۆڤ بێبـەش بـوون، بۆ نموونـە لەتواناکاریـەکانی پـەروەردە بـەزمانی کـوردی بـێ بەشـــن، تەنانـــەت کـــوردان لەلایـــەن وڵاتـــانی ئـــەوروپا کـــە خۆیـــان بەشارستانییەت دادەنێـن بەشێوەی پێویست و شایستە نـــەکراون بەبابـەتی هەڵسـەنگاندن و پێناسەکردن. سەرباری ئەوەی بەسەدان ساڵ خزمەتیان کردوون، ئەوە لەولاوە بمێنێ کە بە برا کوردەکان بـەناومان ناکەن، تـاوەکو ئێستا نـەیانتوانیوە خۆیـان لـەوە رزگـار بکـەن کەلەلایـەن دراوسێکانیانەوە وەکو سەرچاوەی مەترسی نەبینرێن.

بەرامبـەر ئـەم راسـتینەیەی مرۆڤایـەتی ئایـا چـۆن دەتوانـرێ بـاس لەسـایکۆلۆژی و کەسایەتیەکی کورد بکرێ؟ چۆن دەتوانـین ئـەم سـتاتۆیە بێ بەزەییانـە روون بکەینـەوە کـە بەسـەر کۆنـترین گـەلی رەنجدەری مێـژوو سـەپێنراوە و لـەهیچ پـەرتووکێکی مرۆڤایـەتی نەنووسـراوە؟ هیـچ پـەرتوکێکی زانستی و فەلسەفی، ئـەخلاقی و ئیلاهـی، بـەمجۆرە لەمیانـەی نکۆڵیکردن و دەرەوەی مرۆڤایەتی هەڵسوکەوت ناکات. بـەڵام ئەمـەش راسـتینەیەکە نـاتوانرێ نکوڵی لێبکرێت. هەروەکو بڵێی کونێکی رەشە، لەدەوروبـەری دیاردەی کورد خـەیاڵ و زاراوەی دوور لەڕاسـتی خوڵقێـنراوە. هەربۆیـە هەڵسـەنگاندنی دیـاردەی کـورد وەك نەتەوەیـەك، کۆلۆنیەك، نیو کۆلۆنیەك سووکە، ئاماژە بەوە دەکەین کە بوونەتە قوربانی سـتاتۆیەك ئەمانـە تێپەڕ دەکات. ئەگەر قوربانی کوشتار و جینۆسایدێکی ئاشکرابوونایە پێناسە سانایی تر دەبوو.

رەوش بەتەواوی لەمیانەی ئەم زاراوانەشەوە گوزارشتی لێناکرێت. تەواوی ئەو پێناسە تەم و مژاوییانەی لەدەوروبەری دیاردەکەن، راستینەکەی لەنێو نابات و کۆتایی پێ ناهێنێت.

بۆئەوەی بتوانین دیاردەی کوردان پێناسە بکەین، دەشێ بەشێوەیەکی قووڵ ئەم چوارچێوە مێژووییە پەیرەو بکرێت کە هەوڵی دیاریکردنمان دا. دەتوانرێ لەمیانەی بەڵگە نووسراو و ئاسەوار ئاسیەکانەوە بسەلمێنرێ. لەقۆناخێکدا گفتوگۆی (کورد هەیە یاخود نا) لەلایەنی زانستیەوە زیاتر وەکو بەرهەمی زەمینەیەکی سەختی تیرۆر کەوتە رۆژەڤەوە. هەرچەندە سەربەیەك نەتەوە، چین تەنانەت عەشیرەتیش بن بەڵام بەردەوام بەش و ناوچەی وەها هەیە کە شوێنگە و هەلومەرجی تایبەتی هەیە. جیاوازی تایبەتمەندیەکی سروشتە. لەهەمەرەنگی رووناکی تا دەگاتە هەمەرەنگی گوڵەکان، خودی سروشت خاوەنی یاسایەکی پێشکەوتنە کە لایەنگری فرە رەنگی و جیاوازی یە. تەنانەت جیاوازی رەنگەکانی بەشێوەی رەش و سپی، راستینەیەکی زانستی ئەو خاڵەیە کە رەنگەکان کۆتایی پێهاتووە. ئەگەر دەخوازن کۆتاییان پێ بێت، ئەوە بەسە کە بەشێوەی رەش و سپی پارچە ببن. رەشێتی فاشیزم بەناوی سەرمایەداری، سپییەتی سۆسیالیزمی بونیادنراو بەناوی سۆسیالیزم، هەریەکە گوزارشت لەتەنگەتاویەك دەکەن. لەو نموونە زەقانەی کە خۆیان زۆر بەهێز دەبینی زۆر باش دەرك بەوە دەکرێ کە کاتێك پێچەوانەی سروشت بێ تەمەنی درێژ نابێ. لەمیانەی هێز گۆڕینی دیاردە کۆمەڵایەتیەکان بۆ ئەو رەنگەی دەیخوازێ؛ لەسەربنەمای تاك زمان، تاکە کولتوور، تاکە سیاسەت و..هتد سەپاندنی گۆڕانکاری نموونەی خراپترین سیستەمن، ئەمە سەلێنراوە کە ئەمانە تەنیا لەمیانەی تیرۆر و بەشێوەیەکی کاتی توانیویانە خاوەن هەبوون بن.

هەرچۆنێك پێناسەی بکەین، ئیتر پێویستە بەهەموو ئاشکرایی و بەپرسیارێتی ئەخلاقی و سیاسی ببینن کە دیاردەی کورد راستینەیەك نییە کە لە میانەی فشاری ئایدیۆلۆژی و سیاسی و پێشینە بڕیارە خۆییەکانمان بۆ ئەم شێوەیان بگۆڕین کە دەخوازین. ئەگەر وەکو کەمە نەتەوە و ئەتنیك یاخود وەکو دیاردەیەکی نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی پەسند بکرێ، شتی گرنگ گەوهەرە سەرەکیەکەی دیاردەکەیە، خودی دیاردەکەیە. مافی ئەوەمان نییە بەهیچ یەکێك بڵێین (دەخوازم تۆ بەمجۆرە ببینم). تەنیا ئەگەر خاوەنی لەمپەرێ لادانێکی میتۆلۆژی قۆناخی پاشا خوداوەندەکان بین ئەمە واتایەك دەبەخشێت. لەو لاوە بمێنێ کە هەڵوێستێك لەچوارچێوەی سنوورەکانی دیموکراسی فرەلایەنی لەئارادا بێت، تەنانەت لەئەگەرە ئایدیۆلۆژیە هەرە دۆگماتیکیەکان بانگەشەیەکی کوێرانەی وەها پێشنەخراوە. ناتوانرێ نکوڵی لەوەرچەرخانی دیاردەکان بکرێ. بەڵام رێساکانی ئەمە لەمیانەی گرێدان بەیاساکانی دیالەکتیك واتادار دەبێت. ئەو وەرچەرخانانەی هەلومەرجەکان لەکات و شوێنی خۆیدا دەیکەن بە پێویستییەك، واتای پێشکەوتن و دەوڵەمەندێتی ژیانیشە. ئەوەی پەسند ناکرێت جۆری چالاکی لەجۆری دەستێوەردانی کۆڕبەلەیەکی ناوسکی دایکیەتی کە بگۆڕدرێت یاخود

پێشوەخت بهێنرێتە دونیا. هیچ دکتۆرێکی بەئاقڵ و گرێدراوی سوێندی پیشەکەی بێت، دەسەڵات و ماق ئەنجامدانی نەشتەرگەری بەمجۆرەی نییە.

بۆ ئەوە ئاماژە بەو راستینە تاڵە دەکەین، تاوەکو ئەوە روون بکەینەوە کە ئەو کردەوە سەرەڕۆییانەی بەسەر دیاردەی کورد سەپێنراون چ واتایەك دەبەخشێت. دەخوازین ئەوە دیاری بکەین کە هیچ کەسێك ناتوانێ لەئەنجامی ئەو تەنگەتاویە ناوخۆییە و بێخەمی و بێ بەپرسیارێتی دەرەوە دیاردەی کورد دووچاری هاتووە بڵێ (تواناکاریم لەدەستدا هەیە) و هەموو جۆرە کردەوەیەکی لەسەر پەیڕەو بکات و بەردەوام وەکو ئامراز و کەرەستەیەکی تاقیکردنەوە و چاوەڕوانیکردن بەجێ بێڵن. سەبارەت بەسیاسەتمەدارەکانی کە گرێدراوی چەمکی پادشای خوداوەندن، لەوانەیە لەژێر ناوی وڵاتپارێزیەکی بێ سنوور و مەزنایەتی نەتەوەیی لەپێناو گەیشتن بەئامانجەکانی دەشێ هەموو شتێك رەوا بێت. هەروەکو دەزانرێ هەڵوێستەکانی فاشیست و سۆسیالیزمی بونیادنراو ئەمەیان تاقیکردەوە. ئەنجامەکانی ئەمانەش لەئارادایە. نابێت بێ خاوەنی لەو تیرۆرەی بەسەر دیاردەی کوردان سەپێنراوە و تاوەکو رۆژگاری ئەمڕۆمان بەردەوامکردنی لەرێگای هەڵوێستی تەڵەکەبازی و خیانەتکاری هیچ خاوەن هێزێك بخەڵەتێنێ. حەزرەتی عیساش کاتێك لەخاچدرا لەبەرامبەر رۆما و شاهیدە ساختەکان بەتەنیا بوو. تەنانەت باسی ئەوە دەکرێت کە سکاڵای لەخوداوەندی خۆی کردووە و گوتوویەتی: بۆچی منت بەتەنیا هێشتەوە؟!. بەڵام کاتێك سەیری مێژوو و رۆژگاری ئەمڕۆ بکەین، سەرباری ئەوەی مەسیحیەت راستینەیەکی گەردوونیە و یەکێك لەمەزنترین ویژدانەکانی مرۆڤایەتی پێك دێنێ، ئەوانەی کە عیساشیان لەخاچدا جگە لە نەفرەت نەبوونەتە خاوەنی هیچ شانس و هەبوونێکی دیکە. لەم لایەنەوەی دیاردەی کورد لەوە بەدەر کە سیاسی بێت تەواو بووە بەکێشەیەکی ئەخلاقی و کوردانیش وەکو مەسیحیەکانی چەرخی یەکەمین پڕ لەکەشتیەکان دەبن بەرەو کەنارەکانی یۆنان و ئیتاڵیا، لەرێی وشکانی راکردنیان بۆ ئەوروپا، هەروەکو بڵێی بەدووبارەبوونەوەی مێژوو دەچێت.

کورد نە ئەندامی ئایینێکی نوێن، نەهێزێکە چاوی بڕیبێتە خاك و موڵکی گەلانی دیکە. باس لە داواکاری سیاسی بەرفراوانی کوردان ناکەین، هەروەکو چەرخەکانی سەرەتا لەچوارچێوەی هەبوونی کولتووری لەداواکاری خۆگوزارشت کردنێکی ئازادانە بەولاوە هیچ داخوازیەکی دیکەیان نییە. ئەگەر هەشبێت لەئاستێکدا نییە کە جێگای مەترسی بێت. ناشێ بیر لەوە بکرێتەوە کەگەلێکی تا ئەم رادەیە بەتەنیا ماوەتەوە بەرامبەر بەو هێزانەی ببێتە هەڕەشە و مەترسی کە سەرتاسەر پڕچەکن.

گواستنەوەی کێشەیەکی سنووردار بۆ ئاستی رووداوێکی مێژوویی مەترسیەکی راستییە. ئەگەر نەخوازین لەمیانەی ئێش و ئازاری مەزنەوە ئەنجامەکانی ببینین، ئەوا ناچارین دۆزینەوەی چارەسەری بۆ ئەم کێشەیە وەکو بابەتێکی لەپێشینە هەڵسەنگێنین. مێژووی

رۆژهەڵاتی ناوین پڕ لەڕووداوی بەمجۆرەیە. مێژووناسەکان هاوبیرن کە ئەگەر عیسا لەخاچ نەدرابوایە مەسیحیەتیش پەرەی نەدەسەند. لەمە بەولاوەتر ئەگەر ستەم و زۆرداری نەمرودەکان نەبوایە پێغەمبەرەکانیش نەدەبوون. ئەوەی مووسای ناچاری هەڵەمباز کرد ستەمکارییەکانی فیرعەون بوو. ئەگەر فشارەکانی مەککە بۆ سەرحەزرەتی محەممەد نەبوایە، کۆچ روونەدەدا. ئەگەر لەجیاتی دەمارگیری بەنەرمایی هەڵوێست نیشاندرابوایە، ئەو ئیسلامیش بەوشێوەیە نەدەبوو. لەمێژوودا هۆکاری ترازیدیا و ئێشی مەزن و زیان، بەردەوام نەزانی و کردەوەکانی ستەمکاری و فشاری نوێنەرە هارەکانی دەمارگیر و بەرژەوەندیخوازەکانە کە پشت بەنەزانی دەبەستن.

ئەرکی گرنگی تەواوی ناوەندە پەیوەندیدارەکان و تەواوی مرۆڤایەتییە کە دیاردەی کورد و ئەو کێشانەی رێگای لەپێش کردۆتەوە بۆ رەهەندی دراماتیزەتر بگوازنەوە. ئێش و ئازار و ناسۆرییەکی مەزنی لەرادەبەدەر چێژرا، هەربۆیە زۆر بێ واتایە ئەگەر لەپێناوی کردەوەکانی بەگوێرەی تەواوی ئەو مەسەلە و حیسابە مێژووییەکان هەنگاو بهاوێژرێ، چونکە ناوچەکە دەخاتە نێو رەوشێك رزگاربوون لێی زەحمەتە. ئەمەش دەرکەوتووە کە سیاسەتی بەمجۆرە هیچ دەسکەوتێکی بۆ خاوەنەکانی نابێت. ئیتر لەسەردەمێکداین کە بەرامبەر ویژدانی مرۆڤایەتی کە لەئارادایە، نیازە فاشیەکانی پشت بەنەزانی و تالان دەبەستێ هیچ دەرفەتێکی سەرکەوتنیان نییە.

کاتێك دوای پراکتیکێکی درێژخایەن بۆ دواوە دەگەڕێینەوە و تەماشای ئەو دەستنیشانکردنانە دەکەین کە لەسالانی ۱۹۷۰ لەمیانەی هەڵوێستی پڕ لەسۆزداری و ئاستی دۆگمایی و ئایدیۆلۆژی سەبارەت بەدیاردەی کورد و کوردستان پێشمان خست، ئەوا باشتر دەبینین. هیچ کاتێك گومان لەوە نەکراوە کە پێویستە دیاردە ئازاد بێت. رەوشی (ئەگەر ژیان هەبێت، بەئازادی دەبێت، یاخود هیچ نابێت) کە لە تەمەنی حەوت ساڵیدا خاوەنی بووین، واتایەکی پیرۆزی هەیە، هیچ کاتێك دەستی لێبەرنادرێت. بەلام هیچ کاتێك دەست لەوەش بەرنادرێت کە پێویستە هەموو کاتێك گوزارشتی زانستیانەی ئەمە بەبناخە بگیردرێت. دۆگماتیزم لەهیچ کێشەیەکدا وەکو کێشەی کورد دەرگای لەپێش مەترسیداری ئاوالا نەکردووە. ئەرکی لەپێشینە ئەوەیە کە زانست بکرێت بەچل پارچە و بەشێوەیەکی گونجاو گوزارشت لەکێشەکە بکرێت کە بەگوێرەی شەرەفمەندی و بەرژەوەندی هەموو لایەك بێت و بەچارەسەری پێویست بگەیەنرێت. لەبەرئەوەی لەحەفتاکان بەشێوەیەکی سنووردار ئەم ئەرکە جێبەجێکرا، چەواشەکارە بابەتی و خودیەکانی بابەتەکە، گەلێك پردیان بۆ خۆیان دۆزیوەتەوە و تواناکاری بەردەوامکردنی بەرژەوەندی نۆکەرایەتیان بەدەستهێناوە. بەشێوەیەکی سەرەکی رەخنەدان لەم خاڵەدا ژیانییە، بەر لەهەموو شتێك جێبەجێکردنی پێویستییە کرداریەکانی ئەمە وەکو مەرجێکی مرۆڤایەتی دەبینێ.

لەو باوەڕەدام کە ئەو چوارچێوە مێژووییەی هەوڵماندا پێشبیخەین لەژێر رۆشنایی ئەو زانیاریانەی کە هەن نزیکترین پێناسەن لەراستی. ئەو خاڵەی روونکردنەوەکە بەدرێژایی تەمەنێك و هەناسە بەهەناسە سەبارەت بەم کێشە و دیاردەیە قاڵبووینەوە، پێویستە بۆ رکابەرەکانیشی وەکو رێگایەکی دەرکەوتن و دەسکەوتێك ببینرێ. توێژەکانی نەتەوەی سەردەست کە لە رۆژگاری ئەمڕۆمان بەشێوەیەکی زۆر ئاشکرا خۆیان وەکو تورك، عەرەب، فارس پێناسە دەکەن، پێویستە کۆڵەکەکانی ناوخۆ و دەرەوە، چوارچێوەی قۆناخێکی هەڵوێستەکانی سەنتۆ و ناتۆی رۆژگاری ئەمڕۆمان تێپەڕ بکەن و لەهەڵوێستەکانی خۆیاندا سەرکەوتووبن. چوارچێوەی مافەکانی مرۆڤ و پێوانە دیموکراتیەکانی سەردەم کە بەردەوام پێشدەکەوێت، لەمێژوویێکی کە زۆر دوور ناخایانێ تەواوی لایەنەکان لەخاڵێکی هاوبەشدا ناچاری چارەسەری دەکات.

رێگای کەمکردنەوەی زیان و ئێشەکانی ئەم قۆناخە هەستیاری زانستی و وشیاری و دیاردەیەکی لە رادەبەدەرە سەبارەت بەپێوانەکانی شارستانییەتی دیموکراتییە کە گوزارشتی زەمانی سیاسی زانستە. ناتوانرێ مەترسی سێبەری دۆگماتی ماتریالیزمی میکانیکی و ئایدیالیزمی سەدەی بیستەم لەسەر زانست بچووك بکرێتەوە. لەجیاتی نەتەوەپەرستی سەرمایەداری رێکردنەوە لەپێش نەژادپەرستی فاشیستی و لەسۆسیالیزمی زانستیەوە بۆ چەمکی کۆمەڵگای تۆتالیتاری و سەرەڕۆیی سۆسیالیزمی بونیادنراو، لەنزیکەوە گرێدراوی دۆگماتیزمی سەدەی بیستەمە. دەرك بەمە دەکرێت کە چەمکی هەنووکەیی (رۆژانەیی) لەژێر ئەمەدا شاراوەیە. قووڵایی شۆڕشی زانستی دیالەکتیکی (مادەگەرایی) خوڵقاندووە. لەم چوارچێوەیەدا توانراوە بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە روونکردنەوەی فەلسەفی هەمەرەنگی سروشت بکرێت. هەمەرەنگی دیاردەی کۆمەڵگا و، رۆڵی ئەم وەرچەرخانەش شیکراوەتەوە کە رۆڵی لەمەدا بینیوە. لەراستیدا بناخەی زانستی شارستانییەتی دیموکراتی لەم خاڵەدا دەردەکەوێتە پێشمان. لەسەردەمەکانی هەزری دۆگماتیانە یاخود لەتەواوی ئەو بابەتانەی دۆگماتیزمی زاڵ پەیڕەوکرا. وەرچەرخان هاوشێوەی خیانەت دەبینرێ و دەشێ بکرێ بەبابەتی سزای سەخت. ناتوانرێ لەبەخوێناوی تێپەڕبوونی ئەم قۆناخە مێژووییە نکۆڵی لە پەیوەندیەکەی بەدۆگماتیزمەوە بکرێت. ئەگەر لەکۆتاییەکانی سەدەی بیستەمدا ئەو کێشانەی لەرابردوو لەمیانەی رێگای خوێناوی هەوڵی چارەسەرکردنی دەدرا، لەرێگای ئامرازە سیاسی و دیموکراتیەکان ئەمڕۆ دەربازی قۆناخی چارەسەری کێشەکان بووە، بێگومان فەلسەفەی وەرچەرخان لەژێر ئەمەدا شاراوەیە. رەنگدانەوەی مادیگەرایی دیالەکتیك لەگۆڕەپانی سیاسیدا، واتای بەدەستهاتنی تواناکاریەکانی چارەسەری ئاشتیخوازانەی تەواوی کێشەکانی کۆمەڵگا و دیموکراتی فرە لایەنە. ئیتر ئەمجۆرە پێشکەوتنانە لەوە بەملاوە بەشێوەی

هەڵوێستی فەلسەفی و پرۆگرامی سیاسی نیشانبدرێت، وەکو هەوڵی چروپڕی پراکتیکی سیاسی بەرەو رووومان دەبێتەوە.

ناشێ بەجیا لەم پێشکەوتنانە بیر لەدیاردە و کێشەی کورد بکرێتەوە. لەبواری کرداریدا لەمیانەی فەلسەفە روون بۆتەوە و دەرك بەوەکراوە کە لەرێگای چەپگەرایی سەدەی نۆزدەیەم و بیستەم و تەنانەت لەمیانەی دۆگما ئایینییەکانی پاشماوەی چەرخەکانی ناوین، ناشێ روونکردنەوەی دیاردەی کورد بکرێت و رێگای چارەسەری دروست ببینرێتەوە. ئەمجۆرە هەڵوێستە ئایدیۆلۆژیانەی لایەنەکان رۆڵێکی یەکلاکەرەوەی لەوەدا بینی تا ئەم ئاستە قورسکردنی کێشەی کورد هەبووە. ئەوەی پێویستە ئەنجامبدرێ، ئەم راستینە لای هەموو لایەنەکان ببینرێ، دوولایەنە لێبوردن و رەخنەدان پێشبخرێت. پێویستە باش ببینرێ کە مەحکومکردن و داسەپاندنە یەکلایەنەکان لەوەڵامی توند و دژوارتر بەولاوە هیچ ئەنجامێکی دیکە لەگەڵ خۆیدا ناهێنن.

لەکاتێکدا لەرۆژگاری ئەمڕۆمان هەوڵدەدەین سەرلەنوێ هەڵسەنگاندن سەبارەت بەکورد و کوردستان بکەین، هۆکاری پێشخستنی ئەم چوارچێوە مێژوویییە و پێشکەشکردنی وەکو هاوکارییەك، پێویستی هەڵوێستی واقیعی بە لەقۆناخەکانی چارەسەری نوێدا. ئاشکرا بووە کە تیۆری و پرۆگرام و پراکتیکی حەفتاکان جوداخوازی و توندوتیژی دەخوڵقێنێ و خراپتریش ئەوەیە و روون بۆتەوە کە ئەو نەتەوەپەرستییەی پێویستە لەبەرامبەری بێن لەوانەیە هەموو لایەنەکان دیل بکات. سەرباری ئەوەی لەبنچینەدا لەدژین، بەڵام پەسندکردنی ئەمە وەکو قەدەرێك، پێویستی بە سەرلەنوێ گەڕانەوە بۆ وشیاری هەڵمەتی ئازادی و رابوونێکی مەزن هەیە. لەلایەنی پاشڤەڕۆیی و فاشیزمەوە کە بەرژەوەندیخوازی سیاسی و ئابووری گوزارشتی هەموویانە کردنی دیاردەی کورد بەدیاردەیەك کە ئیمپریالیزم بەکاری دێنی، بەتایبەتی سەبارەت بە جولانەوەی ئازادی پەسند ناکرێت.

هەرچەندە درەنگیش کەوتبێت ئەم هەڵوێستەمان بەئامانجی جێبەجێکردنی پێویستییەکانی بەرپرسیارێتی یە بەرامبەر ئەمجۆرە مەترسیانە. هەروەها ئومێدی ئەوەش لەخۆوە دەگرێت مسۆگەر رۆژێك ئەوە روون دەکاتەوە کە کێ بەرامبەر بە وڵاتی ئازاد و کۆماری دیموکراتی لەنێو غەفلەت و خیانەتدا بووە. هەروەها گوزارشت لەوە دەکات کە پێویستە گرێدان بەرەنج و ئارەقەی نێوچاوانی ئەو کەسانە چۆن بێت کە لەپێناو پێشکەوتن و کەرامەت و یەکێتی ئازادانەی گەلان و مرۆڤایەتی خۆیان بەخت کردووە.

هەروەکو چۆن لەرابردوو ئەنجامدەدرا هەڵسەنگاندنی درێژی سۆسیۆ ئابووری لەرۆژگاری ئەمڕۆماندا راست و بەجێ نابینم. تەنانەت هاووڵاتییەکی شەڤامیش تا مۆخەکانی ئێسکی هەست بەم بابەتانە دەکات. هەروەها ئەنجامدانی هەڵسەنگاندن و دەستنیشانکردنی لەمیانەی هەڵوێستە میللیگەرایییە سەرەتاییەکان و چەپەگەرییەکی دۆگماتی سەبارەت بەکورد و

کوردستان ڕاست نابینم. لەم لایەنەشەوە لەگەڵ ئەوانەی تا تەوقی سەریان لەنێو ئەم ڕاستیەدا ژیاون، ئەوانەی تادوایی نقوومی خیانەت بوون، تاوەکو دوایی روونیان کردۆتەوە و لەڕەوشێکی سەیرکردن دان. تەنانەت بەئەندازەی ئەوەی وڵات، کۆمەڵگا، دەزگاکانی ژێرخان و سەرخانی کۆمەڵگا، لەگەڵ شێوەکانی ئایدیۆلۆژیا و تەواوی زاراوەکە ئێمە پەیوەندیدار دەکات، ئەوا بەشێوەیەکی مێژوویی چۆن شێوەیان گرتووە و تارۆژگاری ئەمڕۆمان هاتووە، بۆ یەکەمین جارە بەشێوەیەکی واقیعی و بەشێوازێك کە هزر دەخولقێنێ خراوەتە ڕوو.

لەمە بەدواوە لەبەشەکانی دیکەی هەڵسەنگاندنماندا، لەسەربنەمای دیاریکردنی بنەما سەرەکیەکانی جوڵانەوەی نەتەوەیی و سیاسی کوردان دەبێت لەپێناو هەڵوێستێکی بەرفراوان و ڕێگایەکی هاوچەرخی چارەسەری. ئەگەر سەرنج بدرێ دەبینرێ کە ئەمجۆرە هەڵوێستانە لەژێر ڕۆشنایی ئەزموونی گرنگی بزاڤی کوردی قۆناخی نوێ، بەئامانجی ڕوونکردنەوەی چۆنیەتی و پێویستی تاوتوێکردن و پلانکردن و پەیڕەوکردنی بەرنامەی نوێ و ڕێکخستن و هێڵی چالاکیەکانیەتی.

د - جوڵانەوەی نەتەوەیی و دیموکراسی و ئەتنیکی کوردان

فاکتەرەکانی وشیاری و خۆڕسکی دیاردەی کۆمەڵگا، بەڕادەیەك بەناو یەکدا چرژاون کە ناتوانرێت لەیەکدی جیابکرێتەوە. ناتوانرێ لەمیانەی دەستنیشانکردنێکی دیارکراودا ئاماژە بەوە بکرێت، کە یەکێکیان لەکوێ تەواو دەبێت، ئەوەی دیکەیان لەکوێ دەست پێدەکات، وەڵامدانەوەی پرسیارێکی بەمجۆرە یەکلا نابێتەوە. دیاردە، تێگەیشتن و وشیاری پێشدەخات، وشیاریش دیاردەکە پێشدەخات. ئەمانە ڕێگا لە گۆڕانکاری یەکدی ناگرن، بەڵکو لە وەرچەرخانی یەکتریدا ڕۆڵ دەبینین. لەکاتێکدا دیاردەی کۆمەڵگا گوزارشتی بەدەزگابوونی تەواوی توانستەکانی ڕابردووە، جوڵانەوەی کۆمەڵگا گوزارشت لەچالاکبوونی دیاردە و وزەی شاراوەی وەرچەرخانی ئایندە دەکات. دیاردەی کۆمەڵگا بەشێوەیەکی گشتگیر کەڵەکەبوونی وشیاری و تێگەیشتنە. هەرچی جوڵانەوەیە، ئەو فاکتەرە کارایە لەخۆوە دەگرێت کە پشت بەم توانستە دەبەستێت و هێشتا کز نەبووە. هەرچی مرۆڤەکانی ئەو قۆناخەن، لەسەرووی فاکتەرە چالاکەکانەوە دێن. دوو ئامرازی ئایدیۆلۆژی ڕۆڵی سەرەکی لەجوڵانەوەی کۆمەڵگادا دەبینن؛ ئایدیۆلۆژیا وزەی جوڵانەوەیە، کە لەڕێساکانی سەبارەت بەڕابردووە خەیاڵڕاکێش و سەرنج ڕاکێشەکانی ئایندە پێکهاتووە؛ ئاراستەی جوڵانەوەی ئەم قەوارەیەی کۆمەڵگا دیاردەکات کە بەدۆگما، ڕێسا و یاسا ناوی دەبەین. هەرچی پەیوەندی و هەلومەرجەکانی بەرهەمهێنان و دەزگا کۆمەڵایەتی و سیاسی و سەربازیەکانە، ئەو زەمینە مادیە پێکدێنێ کە بەکار دەهێنرێ.

لەتەواوی سەردەم و قۆناخەکاندا کۆمەڵگاکان بەگوێرەی خۆیان جولانەوەیان هەیە. سەرەکیترین جولانەوەی سەردەمی نیۆلیتیک، بۆ ئەوەی بەشێوەی وەرزی بتوانن درێژە بەو ژیانەیان بدەن کە پەیوەندییەکی توندوتۆڵی لەگەڵ سروشتەوە هەیە، وەکو پارچەیەک و هاوشێوەی ئایینی سروشت لەچواردەوری خوداوەندی دایک شێوە دەگرێت. پێکەهێنانی خوداوەندی دۆستی مرۆڤ سەرەکیترین جولانەوەیە. نزا و رێورەسمی تایبەت و قوربانی و بۆنەکانی جەژن بەرچاوترین شێوەی جولانەوەی کۆمەڵگان. پیرۆزکردنی خوداوەندی دایک و پابەندبوون پێی، شکۆمەندترین جولانەوەیە. تەواوی ئەو خزمەتانەی سەبارەت بەخوداوەندە دۆستەکان دەکرێت و کارەکانی کۆمەڵگا ئاسان دەکات، پارچەیەکی ئەم جولانەوە شکۆدارەن. سەرەکیترین جولانەوەی سیاسی قۆناخ خاوەنی ئەم گەوهەرەیە.

جولانەوە کۆمەڵایەتیەکانی وشیاری سەردەمە سەرەتاییەکان ئەو پەرستگایانەی دەوروبەری پادشا ـ خوداوەندەکان بەبنەما دەگرن کە گوزارشت لەڕاستینەی کۆمەڵگای چینایەتی دەکەن و واتایەکی ئەفسانەییان پێدراوە. دەزگای پادشایەتی و ئەو هەوڵانەی لەدەوروبەری بۆ بەڕێوەچوونی دەدرێت، ناوەندی هێز و جموجۆڵە. هەبوونی کۆمەڵگا لەمیانەی ئەو پادشایەتییەدا مسۆگەر دەکرێت کە کراوەتە خودایی. پەرستنە رێکخراو و جەژنەکان لەپێناو بەردەوام بوون و پاراستنی پادشایەتیدایە. هەمان دابونەریت سەبارەت بەسەرۆکی ئەو خێڵ و کۆمەڵە تیرانەش باو دەبێت کە نەگەیشتوونەتە ئاستی پادشایەتی. هەلومەرجی سەرچاوەی سروشتی تەواوی جولانەوەکانی کۆمەڵگا بەمجۆرە رەخساوە. تەنانەت بیر لەجولانەوەیەکی سیاسی ـ ئەتنیکی سەربەخۆ بۆ کۆمەڵگا ناکرێتەوە. ئەو ناوەندەی کراوەتە سەمبۆڵی وشیاری و جموجۆڵ، بنەڕەتییە. لەپێناویدا شەڕ دەکرێت، خۆبەخت دەکرێت، کار دەکرێت.

ئەم رەوشە لەسەردەمی دەرەبەگایەتی دا هەنگاوێکی دیکە بەرەو پێشەوە دەچێت. جموجۆڵ نەک بۆ خودی خودا (خودی پادشا) بەڵکو لەپێناو وتەکانی (یاساکانی کۆمەڵگای نوێ) بەبنەما دەگیردرێت. لەڕاستیدا کاتێک دەڵێن "خودا وای فەرموو، وەها فەرمانی دا " ئەوا یان کۆمەڵگا سەرلەنوێ ئاوا دەکرێتەوە، یاخود هەوڵدەدرێت کۆمەڵگایەکی نوێ ئاوا بکرێت. جموجۆڵی کۆمەڵگا لەسەربنەمای بەدەزگابوون و چوارچێوەی رێساکان رێکدەخرێت. ئیتر جولانەوە سیاسی و سەربازیەکان لەکەسایەتیەکان رزگاری دەبێت، لەپێناو پرەنسیپی هەمیشەیی دا سەفەربەر دەکرێت. بەم شێوەیە دەتوانرێ باس لەوە بکرێت کە قۆناخی جولانەوەی سیاسی راستەقینە لە چەرخی ناوەندا دەستپێکردووە. هەرچەندە لەژێر پەردەی شێوەکانی تەریقەت و ئایینزا بەڕێوەبچێت، بەڵام لەو قۆناخەدا ژمارەی ئەو جولانەوە سیاسیە رێکخراو و وشیارانە زێدە دەبێت. زێدەبوونی ناکۆکیەکانی کۆمەڵگا رۆڵێکی سەرەکی لەمەدا دەبینێت. ئیتر لەناو عەشیرەتەکانیشدا جولانەوەیەک پێشدەکەوێت کە سەرۆک عەشیرەت تێپەڕدەکات و پابەندی بەها بنەڕەتیەکانی خێڵە. ئیتر قۆناخێک هاتۆتە ئاراوە کە دەتوانرێ

بە جولانەوە ئەتنیکیەکان ناوببرێت. لەکاتێکدا جولانەوە ئایینزاییەکان زیاتر سەرچاوەی خۆی لەناکۆکیە چینایەتیەکان دەگرێت، ئەوا جولانەوە ئەتنیکییەکان، پاراستنی خێڵ بەرامبەر هەرەشە و مەترسییەکانی دەرەوە بەبنەما دەگرێت. هێشتا راستەوخۆ قۆناخی جولانەوەی قەوم و نەتەوە دەستی پێنەکردووە.

هەرچی سەرەکیترین جولانەوەی کۆمەڵایەتی سەردەمی سەرمایەداریشە بەشێوەی نەتەوەییە. شێوازی دەرەبەگایەتی بەکۆسپی سەرەکی دەبینێ کە وڵاتی پارچە کردووە و سنووری تەسکی هەرێمی بەبنەما دەگرێت. بەرژەوەندییەکانی سەرمایەداری بەلانی کەم ئەو جڤاتانەی خاوەنی هەمان کولتوور و زمانی هاوبەشن، لەژێر چەتری بازارێکی پێشکەوتوو، زمان و کولتوور و وشیاری سیاسی کۆدەکاتەوە، ئامانجی شکاندنی بەرژینەکانی دەرەبەگایەتی و ئاواکردنی نەتەوە و دەوڵەتی نەتەوەییە. ئیتر بازاڕ، زمان، کولتوور، مێژوو و دەوڵەتی نەتەوەیی بەردەوام وەکو ئامانجی پیرۆز بەرز دەکرێنەوە. ئەو دەستانەی دەستدرێژی بۆ بکات دەشکێنرێ، بەڵام ئەوانەی خزمەتی بکەن، وەکو قارەمانی مەزن لەشوێنی پادشا ـ خوداوەندە کۆنەکان دادەنرێن. سیستەمی نوێی خودایی و ئەو جولانەوە کۆمەڵایەتییەی لەپێناویدا دێتە ئاراوە، لەژێر ناوی نەتەوایەتی بەرێوەدەچێت. بەرژەوەندی باڵای هەرچوارلای جیهان، هەموو جۆرە جولانەوەیەکیان بەمجۆرە جولانەوە بنەڕەتیانەوە گرێدەدا. تەنانەت هیچ بەهایەك نامێنێ بەبازاڕ و دەوڵەتی نەتەوەییەوە گرێنەدرابێت. سەرەکیترین کێشەی ئایینی نوێ یاخود جولانەوەی نوێ ئەوەیە، هەرشتێك تاچ رادەیەك نەتەوەییە. ئەگەر میللی بێت بەهادار و پیرۆزە؛ ئەگەر میللی (نەتەوەیی) نەبێت، خائین و ساختەکارە. قۆناخی هەرە دوایی کە ئایدیۆلۆژیە دۆگماتیکەکان لەناو هەموو کۆمەڵگاکان پێی دەگەن ئەمەیە.

بێگومان ئەنجامی سروشتی ئەم چەمکە ئەو شەڕە ئایدیۆلۆژیانەیە کە بەردەوام دەبێت، راستتر ئەوەیە، قۆناخی خوێناوی و هۆڤێتی بەرژەوەندییە چینایەتیەکانە کەدۆگماکان قووڵیان کردۆتەوە، جولانەوە و شەڕەکانیەتی. بێگومان هەندێ جار بەرامبەر بەو جوڵانەوانەی کە گەیشتوونەتە ئاستی شێوان، ئەوا لەمیانەی ئاکار و باوەڕی و هزری ئاشتیخوازتری فەلسەفە و ئایینزا و ئایینەکان، کە چەقی هەڵوێستەکەی مرۆڤپەروەرانەیە، گەلێك کۆمەڵە و جولانەوە هاتوونەتەئاراوە. هیچ کاتێك مێژوو وەکو شوێن پەنجەی ئیرادەیەکی یەکلایەنە پێشناکەوێت، هەموو کاتێك لەمیانەی پەیوەندی دیالەکتیکی دوو جەمسەری دژ پێشدەکەوێت. کاتێك ئەوەی نوێنەرایەتی تایبەتمەندێتی نوێ دەکات پایەدارتر بێت، ئیدی قۆناخێکی نوێ دەستپێدەکات. دیاردەی کۆمەڵگا و جموجۆڵ لەمیانەی ئەم چوارچێوە بنەڕەتیەدا، بۆ تەواوی کۆمەڵگاکان پەیڕەو دەکرێت. ئەو قۆناخە دیالەکتیکیەی لەسادەترین دیاردەی کۆمەڵگا تاوەکو دەگاتە کۆمەڵەی باڵای نەتەوەیی هەرە پێشکەوتوو، لەمیانەی ئەم گەوهەرە بەرێوە دەچێت.

ئەو جولانەوە چینایەتی و کۆمەڵە ئەتنیکیانەی دەچەوسێنرێنەوە و ستەمکاریان لێدەکرێت، پارچەیەکن لەم چوارچێوە گشتییە. لەڕاستیدا ئەو شێوە هزرەی "سەرچاوەی ئەو کارەساتە چییە کە دووچاری بووم، هێندە فشار و چەوسانەوە بەناوی کامە خوداوەند دەبێت؟" کە لەپاڵ یەکەمین جولانەوەی پادشای خودایی پێشکەوت، لەڕاستیدا تۆوی یەکەمین جولانەوەی چینایەتی و ئەتنیکی چەوساوەکان دەچێنێ. کاتێك مرۆڤ دەڵێ "ئەی خودایە، بۆچی ئەم ئێش و ئازارانە دەچێژم؟" بەواتای ئەوە دێت کە ڕووی لەیاخیبوون کردووە. کاتێك خێڵەکان بەرامبەر بە هێرش و پەلامارەکانی بەدیلگرتن و تاڵانکاری هێزە زرێپۆشاکەکان خۆیان پاراست، بەو واتایە دێت قۆناخی جولانەوەکانی ئازادی دەستپێکردووە. بەمجۆرە پێغەمبەرایەتی، قوتابخانە فەلسەفی و تەریقەتە سۆفیگەرایییەکان لەمیانەی ئەم ئاراستەیەدا وەکو دەزگاکانی هزر و باوەڕ، جێگایەکی گرنگ لەمێژووی جولانەوە کۆمەڵایەتییەکاندا دەگرن. ئەو جولانەوە مەزهەبگەرایییانەی سەرتاسەری چەرخی ناوینیان گرتۆتەوە، لە گەوهەری خۆیاندا جولانەوەی چینایەتی و کۆمەڵایەتی توێژە چەوساوە و ستەملێکراوە نەدارەکانن.

بۆ یەکەمین جار لەسەردەمی سەرمایەداریدا هەوڵی پێشخستنی پێناسەیەکی زانستیانە سەبارەت بەکۆمەڵگا درا، ڕێگای لەپێش بەلاوەنانی دۆگماتیزم و پێشکەوتنی سۆسیالیزمی زانستیانە کردۆتەوە. سۆسیالیزم کە گوزارشتێکی زانستیانەی بەرژەوەندی و ڕاستینەی گەلان و زەحمەتکێشە چەوساوەکانە، لە مێژوودا وەکو ڕێنیشاندەرێکی کرداری، ڕێگای لەپێش جۆرێکی نوێی جولانەوە نەتەوەیی و کۆمەڵایەتییەکان کردەوە. جولانەوەی زەحمەتکێشان و چەوساوەکان، لەگەوهەری خۆیدا گوزارشت لەڕەوشی تیۆرتەسەلی دیموکراسی دەکات. دیموکراسی لەچوارچێوەی تەسکی چینایەتی دەردەکەوێ، هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵگا و ناسنامە ئەتنیکی و نەتەوەییەکان لەخۆوە دەگرێت، وەکو شێوەیەکی ڕێچکەی سیاسی لەسەرتاسەری جیهاندا واتادار و بەهێز دەبێت. ئیتر لەدیموکراسییەتی سروشتی سەردەمی نیۆلیتیکەوە هەنگاو بۆ قۆناخی شارستانییەتی دیموکراسییانە دەهاوێشترێ، کە لەسەربنەمای هزری زانستیانە وشیار بۆتەوە و ڕێکخراوە و لەنێو زەمینەی ئاشتی و ئارامیدا تواناکاری وەرچەرخان بۆ تەواوی چین و جڤاتەکان دەڕەخسێنێ.

لەتەواوی قۆناخەکانی پەرەسەندنی کۆمەڵگادا کوردان وەکو گەلێکی بەرهەمهێنەر و خوڵقێنەر و بەجموجۆڵ هەبوونی خۆیان نیشانداوە. بەجموجۆڵترین گەلی سەردەمی نیۆلیتیك کوردەکانن. ئەو گەلەیە کە گەورەترین شۆڕشی لەسەربنەمای کشتوکاڵ و ئاژەڵداری ئەنجامدا. کوردەکان لەسەردەمی ئەو جڤاتانەوە دێت کە چەرخی سەرەتاییان خوڵقاند و بناخەی ئەو باوەڕیە خودایییانەیان دانا کە پشت بەئاسمان دەبەستن و شێوەی هزری ئەفسانە "میتۆلۆژیا" یان لەمیانەی چوارچێوەیەکی سیستەمکراودا ڕێکخست. هەروەها خاوەنی شەرەف

ناسنامەی ئەو گەلە ئەتنیکییە کە بۆیەکەمین جار لەمیانەی وشیاری خێڵەکی و تامەزرۆی ئازادی بەرامبەر بەکۆیلەداری و کۆلۆنیالی سۆمەرییەکان بەرخودانی کرد. تاوەکو ئێستاش بەهێزبوونی خێڵایەتی، لەنزیکەوە گرێدراوی ئەم ڕاستینەیەی نێو فوولایەکانی مێژووە. ئەو گەلەیە کە یەکەمین ئاڵای ئازادی مرۆڤایەتی بەرامبەر کۆیلایەتی بەرزکردەوە. بەدرێژایی چەرخەکانی سەرەتا بەرخودانی ئازادی کوردان کە لەسەربنەمای ئەتنیکی بوو، بۆ گەلان بووە بەچاوگی سروش بەخشی. دیسان کوردان نوێنەرایەتی هێزی سەرەکی ئەو گەلە دەکەن کە لەمێژووی ڕۆژهەڵاتی ناویندا، لەهەمووان زیاتر بەرامبەر دەوڵەتی کۆیلەداری بەرخودانی کرد، تەسلیم نەبوو، بەرامبەر بە شارستانییەتی کۆیلەداری ژیانی ئازادی سەر لوتکەی چیاکانی هەڵبژارد. کوردان لەمێژوودا ڕۆڵێکی ڕەسەن و دەسپێکردنی بەرفراوانترین و درێژخایەنترین جولانەوەی بەرخودانیان هەیە کە لەسەر بنەمای ئەتنیکی پێشکەوتووە. ئەم بەرخودانانەی ئازادی لە میزۆپۆتامیای سەروو، لەکوێستانەکانی میدیا ئاکاری مەزنی ئازادی خوڵقاند. ئیرادەی ئازاد و ئاکاری زەردەشت کە جێگایەکی گرنگی لەمێژووی ئازادیدا هەیە، سەنتێزێك و چڕبوونەوەی ئەم بەرخودانە ڕەسەنانەیە. لەلایەکەوە ڕێگای لەپێش ئایینە ئیبراهیمییەکان کردەوە، لەلایەکی دیکەشەوە تاوەکو دوایی ئەم دەروازەیەی ئاوەڵاکرد کەبەرەو فەلسەفەی یۆنانی دەچێت. تەنیا شارستانییەتی کۆیلەداری سۆمەر لەمیانەی سەرچاوەکانی دیجلە و فورات تێر نەبوون، لەهەمان کاتدا تەواوی جولانەوەکانی ئازادی لەلایەن ئەم سەرچاوەیەوە بەخێوکراون.

دیسان بەرامبەر بە ڕەهاکانی (ڕەهایەتی) ئیسلامیەتی چەرخی ناوین بەرپادەی هەرە زێدە لەناو کوردانیدا هەوڵەکانی ئازادی دەبینرێت. زەردەشتایەتی و مانیزم و عەلەویگەرایی و تەریقەتە هەمەجۆرە سۆفیگەراییەکان، بەرامبەر بە کۆیلایەتی دەرەبەگایەتی، نوێنەرایەتی مەیلی بەرخودان و ژیانی ئازادی گەل دەکەن. درێژە بە بەرخودانی عەشیرەتگەرایی باو دەدات. خراپترین گۆڕانکاری ئەم چەرخە ئەوەیە کە پێبەپێ بەکرێگیراوێتی سوننی دەرەبەگایەتی لەکۆمەڵگا ئامۆ دەبێت و خزمەت بەسیستەمی بەندایەتی دەکات. گەل بۆ هەوڵەکانی بەدەستهێنانی ناسنامە و ژیانێکی ئازاد بەتەنیا ماوەتەوە، ڕووبەڕووی قووڵترین خیانەتی چینە سەردەستەکانی خۆی بۆتەوە. دەرەبەگ و سەرۆك تیرە و شێخەکان گەلیان کردووە بەئامرازێکی بێ کەسێتی و تەنیا لەپێناوی بەرژەوەندییە تەسکەکانی بنەماڵە و کەسێتی خۆیان بەکاریان هێناون.سەردەمی قارەمانێتی و بەرخودانی ئەتنیکی باو، پەردەکەی داخراوە. هەروەها لەجیاتی تەریقەتە ڕەسەنەکانی باوەڕی، قۆناخی ئەو تەریقەتە لادەرانە دەستیپێکردووە کە بەتەواوی بەگوێرەی بەرژەوەندییەکانی خێزان و بنەماڵە و دەوڵەت دەجوڵێنەوە. لەهەموو بوارەکانیدا داڕووخان و لادانێکی گشتی باڵی خۆی بەسەر جولانەوەکانی کۆمەڵگا دەکێشێ.

لەسەردەمی وشیاربوونەوەی نەتەوەیی و دەوڵەتی نەتەوەیی سەرمایەدارییدا، هەروەکو تەواوی گەلانی دیکە، بۆ کوردانیش قۆناغێکی نوێ دەست پێدەکات. جوڵانەوەکانی گەلی کورد لەو قۆناغەدا شێوەی نوێ بەخۆوە دەگرێت. لەمیانەی پەیبەماگرتنی پێکهاتە چینایەتییەکان لەنزیکەوە و بەبەرفراوانی هەڵسەنگاندنی ئەم قۆناغانە، سەبارەت بەڕۆشنکردنەوەی قۆناغی ئایندە و نیشاندانی هەڵوێستێکی ڕاست، جێگای گرنگی و بایەخ پێدانە.

۱ ـ قۆناغی میلیگەرای سەرەتایی دەرەبەگایەتی

ئەو جموجۆڵەی لەئەنجامی کاریگەرییەکانی داگیرکەری سەرمایەداری لەکوردستان هاتە ئاراوە، ڕێگا لەپێش لێکەرینی نوێ دەکاتەوە. لەگەڵ ئەوەی بۆرژوازی کورد پێکنەهاتووە، لەهەمان کاتدا لە بەرامبەر بەبۆرژوابوونی ئەرمەنی و سوریانییەکان و نەتەوەپەرستی بۆرژوا، کاردانەوە پێشدەکەوێت. لەبەرئەوەی بنەمای چینی بۆرژوا لاوازە و پێکهاتەی خێڵایەتی و دەرەبەگایەتی بەهێزە، دەتوانین ئەم کاردانەوانە لەچوارچێوەی میلیگەرای سەرەتایی دابنێین. زەقترین تایبەتمەندێتییەکانی ئەوەیە لەبنەمایەکی ئایدیۆلۆژی بۆرژوازی بێبەشە، پشت بەکوردایەتییەکی سۆزداری و پێکهاتەی باوی کۆمەڵگا دەبەستێ. ئەم تایبەتمەندێتیانە دەرفەت بە پرۆگرام و ڕێکخستنێکی هاوچەرخ نادات. کاتێك خواستوویانە لەژێر ناوی کوردایەتی جموجۆڵ بکەن، ئەوا پەیوەندییە ئایینی و خێڵەکیە باوەکانیان بەبنەما وەرگرتووە. هەروەکو چۆن ڕێکخستنێکی نوژەن نییە، ئەوا ئەو ئامانجە سیاسیەی بەباوەڕیەوە پێیەوە گرێدراون بەشێوەیەکی واقیعیانە دەستنیشانیان نەکردووە. هەربۆیە پێکهاتەیەك دێتە ئاراوە کە هەموو کاتێك بۆ بەکارهێنان و خیانەتکردن لەبارە. کارەکتەری جوڵانەوەکانی یاخیبوونی سەدەی نۆزدەهەم و بیستەم لەسەر ئەم بنەمایە بوو. ئەم جوڵانەوانە گەورەترین زیانیان بەگەلی کورد گەیاندووە.

ئەم جۆرە ڕێبەرایەتیە دەرەبەگایەتی و میلیگەرا سەرەتاییانە کە لەهەڵسەنگاندنێکی بابەتیانەی ڕەوش بێبەشن، ئامانجی سیاسی واقیعی دیار ناکەن، بەشێوەیەکی ڕاست جیاوازی نێوان دۆست ـ دوژمن ناکەن، کات و شێوەی جوڵانەوەکان بەگوێرەی هەلومەرجی واقیعی بەرجەستە ناکۆرن و پێشی ناخەن، هەروەکو چۆن ڕێگایان لەپێش زیانی مەزن کردۆتەوە، بەهەمان شێوە نەبوونەتە خاوەنی هیچ دەسکەوتێکیش. شتی خراپتر ئەوەیە هێزە دەسەڵاتدارەکان بنەماڵەکانیان بۆلای خۆیان ڕاکێش کردووە و وەکو ئامرازێکی کۆنترۆڵکردنی گەل بەکاریان هێناون. بابانییەکان بۆ یەکەمین جار لەهەرێمی سلێمانی لەساڵی ۱۸۰٦ یاخیبوونیان بەواتا هاوچەرخەکەی دەستپێکرد، لەمێژووی دواتردا بوونە بنەماڵەیەك کە هەرە زێدە بەکرێگیراوی تێدا دەرکەوت؛ لەخزمەتکردنی تەواوی هێزە دەسەڵاتدارەکانی نەتەوەکانی دراوسێدا، هیچ سنوورێکیان نەناسیووە. هەمان شت لەڕێبەرایەتی بەدرخان بەگ

ی یـاخیبوونی بۆتـانی سـەدەی بیسـتەمدا دەبینـین. کـاتێك بـەهۆی کاریگـەری زیـاتری پەیوەندیـەکانی دەرەبەگایـەتی و میلیگـەرای سـەرەتایی ئـەم یاخیبوونـەش لەشکسـت رزگـاری نـەبوو، وەکو بنەماڵە تـاوەکو ئێسـتاش نـەیانتوانیوە خۆیـان رزگـار بکـەن و نـەهێڵن بـەکاریان بێنن. بەدرخانیەکان لەسەرووی ئەو بنەماڵانەوە دێن کە بـەرادەی هـەرە زێـدە ئیمپریـالیزم و بـەکرێگیراوێتی هـەرێمی پشتیان پێدەبەسـتن و بـەئامانجی کۆنـترۆڵکردنی کـوردان بـەکاریان هێنـاون. ئـەو کوردایەتیـەی پـەیرەویان کـردووە سـنوورەکانی میلیگـەرای سـەرەتایی تێپەرنەکردووە، رەوتێکی نەتەوەیی و سیاسی جێگیریان نەخوڵقاندووە.

سەبارەت ئـەوەی لەسـەردەمی شـەڕی یەکـەمی جیـهانی هەلومـەرج لـەبار بـوو، بـەڵام لەبەرئـەوەی زۆر دووربـوون لەگەڵاڵەکردنی پرۆگرامێکـی دیموکراسـی و دژە ئیمپریالیسـتی و ئاوالکردنی رێکخستنێك جولانەوەکانی کورد لەنێران بەرێبەرایەتی سمکۆ شکاك، لـەئێراق شێخ مەحمود بەرزنجی، لەتورکیا شێخ سەعید، لەبینینی رۆڵێکی شکست هێنەرانە رزگاریـان نـەبوو. زیاتر گەمە هەرزانـەکانی سیخوڕەکانی ئیمپریالیزمیـان بەپـەیوەندی لەقەڵەمداوە و بوونەتـە ئامرازی لەیستۆکەکانیان. ئەو هەموو هەوڵەیان، نەبۆ خۆیـان و نـەبۆ گـەل هیـچ دەسکەوتێکی لێنەکەوتۆتەوە. تەنیا وەکو میراس بۆ بنەماڵەکانیان بەجێهێشتووە. هـەرچی ئـەو کۆنترۆڵەیـە کە لەسەر ئەم بنەماڵانە دانراوە، دیسان لەچاودێری کردنی گەل بەولاوە هیچ واتایەکی دیکەی نەبووە. لەراستیدا ئەم جۆرە نزیکبوونەوانە بەدرێژایی مێژوو بەچڕی لەناو دەسـەڵاتدارەکاندا پـەیرەوکراوە. بـەکارهێنانی کەسـێتییە لاواز و تێکشـکاوەکان وەکـو ئـامرازێکی چـاودێری سیاسەتێکی بەربڵاوە. بەڵام لەبەرئەوەی لەناو کورداندا بەئەنقەست لـەولاوەتر، ئـەم سیاسـەتە لەناواخنیاندا جێگیر کراوە و فـێرکراون، هەربۆیـە خۆبەخشانە بەرامبـەر بـەخۆیان پـەیرەوی دەکەن.

لەقۆناخی PDK دا کە میلیگـەرای سـەرەتایی بـەرەو پـارتیبوون چوو، بـووە بـەدواترین و تێکدەرانەترین نموونەی ئەم نزیکبوونەوەیە. پێکهاتـەی لـەجۆری PDK بوونەتـە بژاردەترین ئامرازی سیاسـەتی هـەرێمی هێزە دەرەکیـەکان. بـەهۆی پێشنەکەوتنی بنـەمای بۆرژوازیـەت و پێکهاتە دەرەبەگایەتیە ـ خێڵەکیە سنووردارەکانیان، بـەردەوام لـەبینینی رۆڵی مەترسیدار دژ بەهێزی خۆیی گەل دوودڵیان نەکردووە. لەپێناو ژیان و ئـەو سـامانەی بەدەستیانەوەیە، تاکە قۆزیان ئەوەیە بەرامبەر جولانەوەیەکی هاوچەرخی نەتەوەیی گەلی کورد ببن بەباشترین داش. لەسـەربنەمای بەرژەوەندییـە بچووکـەکانی بنـەماڵێتی ئامادەیـە مەترسـیدارترین پـەیوەندی لەگەڵ دەوڵەتـەکانی ناوچەکە پێشـبخات و ناکەوێتـە نێـو دوودڵیـەوە. لـەم لایەنـەوە هیـچ بەهایـەکی ئاکـاری یـاخود پرەنسـیپێکی ئـایدیۆلۆژی و سیاسـی نییـە. ئەگـەر هەشـبێت لەهەراجکردنیاندا دوودڵ نابێت.

لەتەواوی ئەو وڵاتانەی کوردی لێیە، ئەو زیانەی لەمیانەی پارتەکانی بەمناوی PDK دووچاری هاتوون، لەگەڵ هیچ قۆناخێکی مێژوو بەراورد ناکرێت. ئەوەی بواری مەترسی و خراپەکاریەکانی مەزن کردووە، ئەوەیە کە بەدەزگابوونە و پەنایان بردۆتە بەر خاوەنە بەهێزەکانیان. لەبەرئەوەی یاریکردن بەجولانەوەی هاوچەرخی ئازادی گەلی کورد لەناوچەکەدا پارەیەکی باش دەکات و پلەوپایە دێنێتە ئەوا بینیتی ئەم رۆڵە بەشێوەیەکی دوولایەنەوە بە یارییەکی بەبەرهەم لەقەڵەم دەدرێت. بەڵام لەبەرئەوەی بێ بەهێ بوونەتە سەربازی بەمووچە و ئەو گەلەیان لەدەستدا کە لەمیانەی پەیرەوە باوەکان بەخۆیانەوە گرێدابوون، ئەوا لەوە رزگاریان نابێت بەخێرایی ریسوا و گۆشەگیر ببن. کاتێك سەرچاوەکانی پارە و ئەو هێزانە لەدەست بدەن کە دەستیان گرتوون، ئەوا لەرەوشێکی بەمجۆرەدا نین تەنانەت بۆ یەك دانە رۆژیش بتوانن لەسەر پێیان بمێننەوە. هەروەکو زۆرجار بینراوە، کاتێك پشتگیری و یارمەتی خاوەنەکانیان لەدەست بدەن، تەنانەت لەیەك رۆژدا بەسەدان هەزار هێزی چەکدار بڵاوە پێدەکەن و رادەکەن. لەرۆژگاری ئەمرۆماندا مەترسیدارترین ستوونی تەڵەزگەی کوردانن. ئەو دووڕیانەی پێی گەیشتوون، یا ئەوەتا بەرەو هێزێکی دیموکراسی ـ نەتەوەیی بەپرەنسیپ و بەبڕیار وەرچەرخان ئەنجام بدەن، یاخود هەروەکو چۆن لەرابردوودا گەلێك نموونەی بینراوە دەکەونە رەوشی ئەو بنەماڵە ئاساییانەی دوورخراونەتەوە. ناشێ ،وشی ئێستایان لەگەڵ رێساکانی سیاسەتی دیموکراسییانە لێك بچوێنرێ.

سەرباری ئەو شکستانەی دووچاری هاتوون، هۆکاری سەرەکی بەردەوامبوونی میلیگەرای سەرەتایی ئەوەیە کە تاماوەیەکی درێژخایەن جولانەوەی نەتەوەیی ـ دیموکراسی گەلی کورد پێشنەکەوتە ئەگەر سەریان هەڵدابێت، ئەوا میلیگەرای سەرەتایی لەگەڵ ئەو هێزانەی پێیەوە گرێدراون بەسانایی پاکتاویان کردوون. بۆیەکەمین جار تەنگەتاوبوونیان بەرامبەر PKK، هۆیەکەی بۆ ئەوە دەگەرێتەوە کە لەگەلێك بوار و شوێندا ئەم کەمەیە پووچەڵکراوەتەوە. کاتێك PKK، ئەو سیاسەتەیانی ریسواکرد کە بەنهێنی دژی گەلیان پەیرەو دەکرد و تێکیشکاند، کەوتوونەتە نێو خیانەتکارترین هەڵوێستی بەکرێگیراوێتی. کاتێك پێکدادانە درێژخایەنەکان ئەنجامی خوازراوی بۆ بەدەست نەهێناون، زۆر بەباشی بۆیان روون بۆتەوە کە ناتوانن لەمیانەی سیاسەتی باوی بەکرێگیراوێتی مەودا ببڕن. شێوە و فۆرمە جیاوازەکانی میللگەرای سەرەتایی لەهەموو گۆڕەپانەکاندا بۆ ماوەیەکی درێژ چاوەڕوانی شکستی PKK بوون. کاتێك ئەمە بەدینەهات، بەشێکیان پەلامار زیاتریان هێنا، بەشەکەی دیکەش دوورکەوتنەوەیان لەجولانەوەی سیاسی بەگوێرەی پێداویستی بەرژەوەندی خۆیان لەقەڵەمدا. لەو قۆناخەی کە نەبوونیان لەهەبوونیان باشتر بوو، هێز و باوەڕی ئەوەیان نەبوو سیاسەتی نەتەوەیی پەیرەو بکەن. ئەو جولانەوانەی لەسەربنەمای بەرژەوەندی تەسکی بنەماڵەگەرێتی

و کەسێتی ئاواکراون، کاتێك ئـەنجامی پێچەوانـەی لەگـەڵ خۆیـدا هێنـا، لەپەرتـەوازەبوون ڕزگاریان نەبووە.

ئەو ڕەوشەی لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا میللیگەرای سەرمایی تێیدا دەژیت، لەدەروازەی ئـەم ڕێگایەدایە. بۆ ئەوەی ڕێگا لەوە بگیردرێت کە مەترسیدارترین، باشترین ڕێگا ئەوەیـە بـۆ نێـو ڕێککەوتنێك ڕاکێش بکرێن کە هەست بەمتمانـە و ئاسایش بکەن، ئەوانـەی نایەنـەوە سـەر ڕێگـاش ڕیسـوا بکرێـن و دابـەڕێنرێن. کـاتێك ڕاسـتینەی ڕۆژبـەڕۆژ سـنووردارەبوون و پەرتـەوازەبوونی بنـەما چینایەتییەکـەیان و بێبەشـکردنی ئـەم ڕەوتـە و جولانەوەکـەیان لەزەمینەی ماددی بێننە بەرچاوان ، ئەوا ئەگەر بخوازن بژین، ناچارن پێویستی وەرچەرخانی دیموکراسییانە وەکو بژارێك لەپێش خۆیان دابنێن.

هەرچـەندە ئـەو بەرژەوەندیە کەسێتی و بنەماڵەگەرێتیـە بـەهێزەی فێری بـوون، ئـەوە نیشانیدات کە بەسانایی بەرەو پێوانە دیموکراسییەکان نایەن، لەجیاتی ئەوەی بەتـەواوی ژیان لەدەست بـدەن، ئـەوا ئاواکردنـەوەیان لەسـەر ئـەو بنەمایـە، دەتوانـرێ وەکو گونجاوترین ڕێگا لەپێشیان دابنرێت. هەربۆیە پێویست دەکات بەردەوام لەمیانـەی ڕێککەوتنی دیموکراسییانەی بەرفراوان و بەرامبەر بە لایەنە مەترسیدارەکانی بەتەگبیر بێـت، بـەمجۆرە شیکردنەوەی ئـەم بەڵا مێژووییە و دەرخستنی لەڕەوشی کۆسپ نانەوە، بایەخێکی مەزنی هەیە.

## ٢ ـ قۆناخی میللیگەرای بۆرژوازیەت

میللیگەرای بۆرژوازیەت، مەیلێکە لەناواختی میللیگەرای سەرمایەوە پێشکەوتووە. کاتێك دەوروبەر و ناوەندی دەرەبەگایەتی چینی باڵادەستی کـوردان پـەیوەندییان لەگەڵ سـەرمایەداری بەست، بەپێی تێپەڕبوونی کات ڕێگای لەپێش پێکهاتەی چینایەتی نیو ـ بۆرژوا کـردەوە. ئـەو توێژەی کە لـەنێو گرێدانێکی چڕ بـە بۆرژوازیـەتی نەتـەوەی سەردەسـتەوە پێشـدەکەوێت، هـەروەکو لەجولانـەوەکانی بەنەتـەوەبووندا دەبیـنرێ ئەمانـە تایبەتمـەندێتی شۆڕشـگێڕی تەنانەت ڕیفۆرمخوازیشیان پێشنەکەوتووە، هێندە کەمە مرۆڤ دەتوانێ بڵی نییـە. دیاردەیەکە گۆڕانکارییە بابەتیـەکان کردوویانـە بەناچارییـەك. تەنانـەت بـەگوێرەی بـەرژەوەندی خـۆی سەبارەت بـەبازاڕ تێکۆشـانێك ئـەنجام نـادات. لـە فۆرمێکدایـە کـە زۆر لەگەڵ پێناسـەی چینی سـێخوڕ گونجـاوە. بەتایبـەتیش ئـەو شـارانەی لـەناکامی پێشـکەوتنی پەیوەندیـەکانی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری مەزنبوون، شوێنگەی ئەم چینە لـەناو کۆمـەڵگادا بـەهێز دەکات. لەنیوەی دووەمی سەدەی بیستەم تەواوی کوردستان گۆڕانکاری بابەتیانەی بـەمجۆرەی بـەخۆوە بینی.

پێچکەیەکی دیکەی گرنگی ئەم پێکهاتە چینایەتیە، پێشـکەوتنی خـێرای وردە بۆرژوازیەتـە هەم لەشار و هەم لەناوچە لادێیەکان. بەرامبەر بەپێشکەوتنێکی سنووورداری بۆرژوازی مـەزنی

کۆمپرادۆر، بەشێوەیەکی فراوان و بەربڵاو چینی وردە بۆرژوا پێکدێت. لەناوچە لادێیەکاندا وردە بۆرژوازیەتی گوند مەیلێکی زۆر گرنگە، لەشارەکانیشدا چینی وردە بۆرژوا لەناو بیروکراسیەتی دەوڵەتدا خزمەت دەکات، مەزن دەبێت و جێگایەکی گرنگ دەگرێت. لەبەرئەوەی هەردووکیشیان لەوە بێبەشن کە لە دەوروبەری بازاڕێکی نەتەوەیی تێکۆشانی زمان و کولتووری نەتەوەیی بکەن و زیاتر لەسەربنەمای وابەستەبوون بەهێزە دەرەبەگایەتیەکانی بەکرێگیراوێتی باو و بیروکراسیەتی دەوڵەت گوزەران دەکەن، لەژێر کاریگەری کارەکتەر و کەسایەتیەکدان کە هاوتەریبی بۆرژوازیەتی نەتەوەیی سەردەست و نەتەوە پەرستیەکەیەتی و لەناویاندا تواوەتەوە. هێزی ئەوەیان نییە هەڵوێستێکی نەتەوەیی ولاتپارێزانە سەبارەت بەبەهاکانی زمان و کولتووری گەل نیشان بدەن. هەروەکو چۆن پێکهاتەکەیان و بەرژەوەندییەکانیان رێگا بە مەیل و هەڵوێستێکی بەمجۆرە نادات، ئەوا لەئاستی ئایدیۆلۆژی و ئاکاری پێویستیش بێبەشن.

رێبەرایەتییە چینایەتیەکانی ئەم پێکهاتانە کە ترسنۆکن، بێکاریگەرن، لەراستیەکان دوورن و تادوارادە هەڵگری تایبەتمەندێتی تەسلیمکارانەن، ئەگەر دەرفەت ببینن رێگا لەپێش پەنابردنە بەر مەیلی میللیگەرای ریفۆرمخوازانە دەکەنەوە. پێشکەوتنی شێوازێکی بەمجۆرەی نەتەوەپەرستی جێگای باسە. واقیعی بابەتی کە لەئارادایە ئەمە دێنێتە ئاراوە. دەرەبەگایەتی لە پشتیەوەیە، لە هەرچوارلایەوە هێزەکانی دەوڵەتی نەتەوەکانی سەردەست، هەبوونی گەلیش لەپێشیدا، بۆتە هۆکاری ئەوەی ئەم مەیلە تایبەتمەندێتیەکی بەمجۆرەی هەبێت هاوتاکەی لەجیهاندا زۆر کەمە. فێڵبازی، هەڵپەرستی، پیلانگێری، دووڕوویی، خیانەتی لەناکاو، هەموو جۆرە ساختەکارییەك، بەردەوام گرنگیدان بەبەرژەوەندیەکانی کەسێتی، بێ پرەنسیپی، تاوەکو بڵێی قەرەبوو دەدات، هەروەکو حەربا رەنگ دەگۆڕێت، هێندەی لەناکاو دەبێت بەشۆڕشگێڕ لەناکاویش دەبێت بەدژە شۆڕش، بێباوەڕی بەگەل، بەردەوام لەخاوەن دەگەڕێ تاکو پشتیان پێ ببەستێ، سۆزدارییەکی رادەبەدەر و بێ خەمی، هێندەی لە ئایدیۆلۆژیا بێبەشە تا بڵێی دیماگۆگیشە، بەهەمان شێوە لەبەها ئەخلاقیەکان بێبەشە، بەئەندازەی ئەوەی بەخێرایی یاخی دەبێت بەخێراییش دەبێتە تەسلیمکار، لەناکاو رێبازێك ئاوا دەکات و پەنادەباتە بەر ئایدیۆلۆژیایەك بەهەمان خێراییش دەستی لێبەردەدات و بێ رێبازە، لەرووخساردا بەجموجۆڵ دیارە لەژێرەوە ماندوو بوون و تەمبەڵە، بەئەندازەی ئەوەی سەبارەت بەرابردوو خاوەنی دۆگما و زانیاری لەقە، بەئەندازەی بێ ئومێدی سەبارەت بەئاییندە خەیاڵی پڕوپووچی هەیە، ئەمانە وەکو تایبەتمەندێتی گشتی ئایدیۆلۆژی و سیاسی و کولتووری و کرداری مەیلەکانی ئەم چینە رووبەڕوومان دەبێتەوە.

سۆسیالیزمی بونیادنراو و رزگاری نەتەوەیی دژبە ئیمپریالیزم کە لەنیوەی دووەمی سەدەی بیستەم بایەخدار بوو، ئەم مەیلە کاریگەری کردە سەر تەواوی کوردستان، رێگای

لەپێش ئەوە کردەوە چەپرەوێتی وردە بۆرژوا ریفۆرمیستەکان بێتە ئاراوە. تایبەتمەندێتیە سواوەکانی نەتەوەپەرستی بۆرژوا، ئەوەیان لەبەرژەوەندی خۆیاندا بینی کە لەمیانەی ئەو مەیلەی رەواجی هەیە، تەنانەت لەمیانەی چەنەبازێتی مارکسیستی - لینینیستی خۆیان بخەنەروو، لەلایەکی دیکەشەوە بەبێ سڵەمینەوە بۆ هەموو جۆرە پەیوەندیەکی تەسلیمکاری و بێ پرەنسیپیانە لەگەڵ هێزە داگیرکارەکان و ئیمپریالیزم کراوەبوون. رێگرتنی لەپێش سۆسیالیزم و نەتەوەپەرستیەکی شۆڕشگێری راستەقینە، لەنزیکەوە گرێدراوی ئەم نزیکبوونەوەیانە. سەرەکیترین هەڵسوکەوتی ئەم مەیلە و گروپەکانیان ئەوەبوو، لەروخساردا خۆیان وەکو لایەنگری مەیلی شۆڕشگێری نیشانبدەن و لەپشتەوەش خەنجەری لێبدەن.

ژمارەیەکی زۆری ئەو پارتی و گروپانەی وەکو هاوپەیمان و درێژەی پارتیەکانی بەناوی PDK و ئەو پارتە کۆمۆنیستیانە بوون کە هەڵگری تایبەتمەندێتیەکانی سۆسیالیزمی بونیادنراو بوون، لەهەموو پارچەکاندا زۆر لەدواوەی نەتەوەپەرستی سەرەتایی دەرەبەگایەتی مانەوە و رێگایان لەپێش گەلێك خراپەکاری کردەوە. بەردەوام مەیلی ئازادیخوازی گەلیان شێواندووە. ئاژاوەچێتی و جێنەگرتنیان لەناو یەکێتی بەرەیی بەبڕیار، هەڵوێستێکی دیکەیانە کە نیشانیانداوە. لێرەشدا کاریگەرێتیەکی راستەوخۆی بەرژەوەندیەکانی بنەماڵێتی و کەسێتی و ئەو پارەمتیە ماددیە هەبوو کە لەو دەوروبەرانەیان وەردەگرت کە پێیانەوە گرێدراو بوون. کارێکی دیکەی گرنگیان ئەوەبووە، ئەو کادیرە دڵسۆز و وڵاتپارێزانەی جێگای خۆیان لەناویاندا گرتبوو لەمیانەی هەموو جۆرە شێوازێکەوە بێکاریگەریان بکەن، لە کوشتنەوە تاوەکو لەرێ لادان و گەندەڵ کردنیان بەکارهێناوە. کۆششێکی رێکخراوەیی، سیاسی و کولتووری و کرداری ئەوتۆیان نییە بەهەند وەربگیردرێت. دەستبەسەرداگرتنی دەسکەوتەکان و لارێکردنی و لەئەنجامیشدا پووچەڵکردنەوەی، مەسەلەیەکن لەنزیکەوە گرێدراوی ئەم مەیلەن. لەرۆژگاری ئەمرۆماندا لەنێو بێچارەییەکی قووڵ و شوێنگەیەکی هەرە لاوازدا دەژین.

ئەوانە چاوەڕوانی ئەوە دەکەن، پێشەنگی گەل PKK لەناو بچێت و پەرتەوازە بێت. سەرەڕای ئەوەی رۆڵێکی گرنگیشیان لەدوا پیلانگێڕی ١٥ ی شوبات هەیە، بەڵام بەدینەهاتنی ئەم چاوەڕوانی و ئومێدەیان، رێگای لەپێش پووچەڵبوونەوەی خەیاڵەکانیان کردەوە. ئەو پەیوەندییە هەمە لایەنانەی لەگەڵ هێزە داگیرکەر و ئیمپریالیستەکان پێشیان خستووە، زیاتر رێگای لەپێش گۆشەگیربوونیان کردۆتەوە. لەگەڵ ئەوەی وەکو چینێك زەمینە ماددیەکەیان بۆ پەیوەندی کراوەیە، بەڵام بەهۆی تایبەتمەندیەکانی پێکهاتەکەیان، بەردەوام پێویست دەکات ئەم مەیلە چاودێری بکرێت. دوژمنایەتییەکی (تەڵەکەبازانە بەرامبەر چارەسەری ستراتیژی برایەتی و یەکێتی ئازاد و یەوانە دیموکراسییەکان) دەکەن کە رێبەرایەتی گەل هەوڵدەدات لەگەڵ تەواوی کولتوور و گەلان پێشیبخات، بەتایبەتیش لەگەڵ گەلان و نەتەوە دراوسێکان. هەوڵدەدەن ئەمە وەکو تەسلیمبوون و "فرۆشتنی کێشەی کورد" هەراج بکەن. تاوەکو دوایی بە

تەگبیربوون و هەستیاری بەرامبەر بە نوێنەرانی ئەم مەیلە کە بەرزترین بەهای گەلی کوردیان لەخۆڕا هەراج کرد و لەمیانەی گلاوترین پیلانگێڕییەوە جێگای خۆیان لەپاکتاوکردنیدا گرت، گرنگییەکی مەزن لەخۆوە دەگرێت. نابێ بە رووخساری لاوازی و ساویلکەییان هەڵخەڵەتێن. هەم ئەوانەی پاشماوەی نەتەوەپەرەستی سەرەتایی دەرەبەگایەتین، هەم ئەوانەی شێوەی جیاوازیان بەخۆیان داوە و خاوەنی رووخسارێکی نەتەوەپەرستی بۆرژوازین و بەشێوەیەکی چالاکانە لەنێو هەڵوێستی مامەڵەکردن و هەراجکردن دان، بەئەندازەی ئەوەی ئەوانەی دڵسۆزن و دەخوازن بێنەوە سەر راستەڕێ، هەڵسەنگاندنیان لە میانەی هەڵوێستێکی رەخنەدانانە و قازانجکردنیان و لەخۆوە گرتنیان لەنێو یەکێتی و کۆمەڵەی گونجاودا، ئەوا پێویستە لەبوارەکانی ئایدیۆلۆژی، سیاسی، کولتووری و کرداریدا تەگبیری دیکە وەربگیردرێت و بێکاریگەر بکرێن، بەمجۆرەش بەلاوەنانیان وەکو کۆسپێکی پێش چارەسەری دیموکراسییانە، بایەخێکی گرنگی هەیە.

### ٣ ـ مەیلی ئازادیخوازی گەل

بەستنەوەی مەیلی ئازادیخوازی گەلی کوردستان بەناسنامەی ئازادی و یەکسانی سەردەمی نیۆلیتیك واقیعی ترە و ئەزموونی زیاتری لێ دەکەوێتەوە. چەمکی یەکسانی و ئازادیخوازی کۆمەڵە ئەتنیکییەکانی ئەو قۆناخە کە باپیرە و داپیرەی گەلی کوردی رۆژگاری ئەمڕۆمانن، بەتایبەتیش جێگایەکی گرنگیان لەنێو ژیانی خێزانەکانی گوند و خێڵە لادێیەکاندا گرتووە. لە ناوچە شاخاویەکاندا ئەم تایبەتمەندێتیە بەهێزترە. جگە لەو توێژە بەکرێگیراوانەی کە لەنێو چینی سەرووی سیستەمی بەندایەتی چەرخەکانی سەرەتا و ناوین دا جێگای خۆیان گرتووە، تاکو ئێستاکەش مەیلی سروشتی ئازادیخوازی گەل جێگایەکی گرنگ دەگرێت. چەمکەکانی نۆکەرایەتی و کۆیلایەتی، زیاتر لەنێو پەیوەندییەکانی نۆکەرایەتی چینی سەروو و شێوازی ژیانیاندا دەرفەتی پراکتیزەکردن دەبینن. سەرەڕای تەواوی کاریگەرییەکانی تۆڕی پەیوەندییەکانی سەرمایەداری و پێوانەکانی ژیانیان، ئەوا یەکسانی سروشتی ناو گەل، چەمك و لێکەڕینەکانی برایەتی و ئازادی بەزیندوویی ماوەتەوە. هەربۆیە رێکەوت نییە کە گەلی کورد لەهەموو گەلانی دیکەی رۆژهەڵاتی ناوین زیاتر لایەنگری ئازادییە. ئەمە گرێدراوی بەرەسەنێتی مێژوویانەیە. چونکە لەبەرئەوەی چینە باڵادەست و چەوسێنەرەکان نامۆبوونە و هیچ بەهایەکی ئەرێنی نییە کە پێشکەشی بکەن، ئەوا بەدرێژایی مێژووی خۆی بەرامبەر بەسروشت و دەستدرێژییەکانی دەرەوە لەنێو بەرخوداندا بووە، رۆڵێکی گرنگ دەبینێ لەبەدەستهێنانی تایبەتمەندێتیەکی بەمجۆرە. لەم لایەنەشەوە رۆڵی لەپێشینەی ژن گرێدراوی ئەم راستینە مێژووییەیە. کولتووری بەهێزی خوداوەندی دایکی سەردەمی نیۆلیتیك تاوەکو ئێستا بەشێوەیەکی بەهێز لەناو دایکانی کورددا بەردەوامە. بەو رادەیەی ژنی کورد ببێتە

خاوەن بڕیار و بانگەشە، ئەوا لەگەوهەری خۆیدا ڕێـز و گرێدانێکـی وەهـای بـەو ئـایین و کولتوورو شێوازەی ژیان نییە کە لەسەربنەمای پیاوسالارییە. لەمیانەی ئەو یاخیبوونانـەی کـە لەبچووکترین دەرفـەتدا ئـەنجامی دەدەن روون دەبێتـەوە کـە ئـەوەی تـا ئێسـتاش ڕوویـداوە لەئەنجامی دابونەریت و فشاری مەعنەوی و ماددی و ناچارییەوە پەسندیان کردووە.

هەژاری و نـەداری کوردانیـش وەکو ڕووداو و مـەیلێکی مێژوویـی ڕووبـەڕوومان دەبێتـەوە. ئەو قۆناخەی لەگەڕەکە کەلاوەکانی کەنار شارەکانی سۆمەر و بابل و ئاشوور دەستپێکردووە بەدرێژایی چەرخی ناوین بەردەوام بووە، لە شارە گەورەکانی نەتەوە سەردەستەکانی ڕۆژگـاری ئـەمڕۆمان تـاوەکو گەیشـتوونەتە شـارەگەورەکانی ئیمپریـالیزم و لـەئاواکردنی شـارەکانی کوردستانیشدا ڕەوشەکەیان بەمجۆرە بەردەوام بووە؛ بەشێوەی ئاوارەیی و کۆچبەری و هـەژاری بەردەوام بووە. لەجیاتی ئـەوەی لەناواخنی چینـە دەسـەڵاتدارەکانی خۆیـان پێـك بێـن، زیـاتر لەسـەربنەمای خزمـەتکردنی چـین و هێزەباڵادەسـتە بیانیـەکان هاتوونەتـە ئـاراوە. ڕەوشـی نیوکارکـەری، ژیـانی ئـاوارەیی، بێبەشـی لـە هەلومەرجـەکانی تەندروسـتی و پـەروەردە و کولتووری، ژیانیان زۆر سەخت کردووە. بەهەرزانترین شێوە بـەکارهێنانی ڕەنجەکانیان و ئـەو فشارەی لەلایەن چینی باڵادەستی خۆی و دەسەڵاتدارە بیانیەکان دووچاریان دێـت، ژیـانێکی پـڕ لە مەینەتی و ئێش و ئازاریان وەکو قەدەرێك لەئەستۆ کردووە. بەرامبەر بەژیانێکی بەمجۆرە لەناو ڕەوشێکی تووڕە بوون و کینی سروشـتیدان. بـەقوولایی هەست دەکەن کـە بـە بچووك و نـەزان دەبینـرێن، دەرك بـەوە دەکـەن کـە خیانـەتیان لێکـراوە. بـەڵام بەرامبـەر بـەدزواری و مەزنبوونی ئەو فشارەی دەکرێتـە سـەریان هەسـت بـەبێچارەیی خۆیـان دەکـەن. ئـەم ڕەوشـەش ڕێگا لـەپێش ڕەوشـی دەروونـی لاسـەنگ و گەشـانەوەی کتوپـڕ و ململانـێ و پێکدادانـی ورد و مەزنی نێوان تاکەکان و بنەماڵێتی دەکاتەوە. بێبەشی لەهەلومەرج و تواناکاریەکانی تێکۆشانی چینایەتی هاوچـەرخ، ناچاری شـەڕ و پێکدادانـی نێـوان تاکـەکان و بنەماڵەگـەرێتی و تەنانـەت خێڵایەتیشیان دەکات. ئـەو ئـاژاوە و گێرەشـێوێنیانەی دەسـەڵاتداران بەئەنقەسـت دەینێنـەوە ڕێگای لەپێش ڕاستینەی گەلێك کردۆتـەوە کە بـەردەوام لـەناوخۆ لـەنێو شـەڕ و ململانێدایـە. هەربۆیە زیاتر لەناو خۆیاندا پێویستییان بە کولتوورێکی قووڵی ئاشتی هەیە.

چڕبوونەوەی پەیوەندیەکانی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری، ڕێگا لەپێش ئەوە دەکاتەوە کە بێکاری و هەژاری جەماوەری جاران بـەرەو بەدەسـتەوەهێنانی گەوهـەرێکی کارکـەری وەرزی و بەڕادەیەکیش کارکەری کارگە هەنگاو بهاوێژن. بێکاری زیـاتر لـەناو لاوان پێشکەوتووە و بۆتـە هۆکاری کۆچێکی گشتی بەرەو شارەگەورەکانی دەرەوە، بەتایبەتیش ئەوروپا. کەوتۆتە ڕەوشێك کە هـەزاران سـاڵ پـەلامارەکانی داگیرکـاری و دەستبەسـەرداگرتن، سـەرکەوتنی تێـدا بەدەسـت نەهێنا؛ لەپێناو خەیاڵی پڕوپووچ و لەئەنجامی ناچارکردنیان بۆ گەڕان بەدوای پێنج فرۆشێك

بەخۆیان وڵاتی خوداوەندە ژن و پیاوەکان بەجێ دێڵن و چۆڵی دەکەن. کارەساتێکی لەوە مەزنتر بەسەر گەلێکدا نایێت و ژیانێکی لەوە نەفرین لێکراوتر بەخۆیەوە نابینێ.

ئەو جموجۆڵ و گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەی لەنیوەی دووەمی سەدەی بیستەم چڕبۆوە بناخە و زەمینەی ماددی مەیلی ئازادیخوازی هاوچەرخی گەل پێکدێنێت. جموجۆڵ و شیلەی رزگاری نەتەوەیی و چینایەتی کە لەم قۆناخەدا هەڵکشا، لەدەرەوە کاریگەرییەکی مەزنی خوڵقاندووە، دەرفەتی کاریگەری زانست و ئایدیۆلۆژیا نوژەنەکان رەخساوە، پێشکەوتنەکانی تەکنۆلۆژیای راگەیاندن و گەیاندن، قۆناخی نوێی وشیاربوونەوەی خێرا کردووە. هەرچەند کاریگەری سەرچاوەی لەنەتەوەپەرستی بۆرژوازی و چەپڕەوێتی سۆسیالیزمی بونیادنراو وەربگرێت، بەڵام دەرفەت و زەمینەی قووڵبوونەوەیەکی ئایدیۆلۆژی سەبارەت بەچەمکێکی سەربەخۆ و ئازاد و یەکسانیخواز هاتۆتە ئاراوە. هەرچەندە کاریگەرییەکی قووڵی دۆگماتیزم و یۆتۆپیاگەرایی هەبووبێت، بەڵام هەڵسەنگاندنێکی راستی کۆمەڵگا و مێژووی کوردستان کراوە هەڵسەنگاندن سەبارەت بەرەوشی هەنووکەیی هەلومەرجە بابەتی و خودییەکان کراوە. ئەو جموجۆڵە چڕەی لەحەفتاکان هاتە ئاراوە، هەروەکو چۆن کاریگەری لەسەر تەواوی رۆژهەڵاتی ناوین کرد، ئەوا کاریگەری کردە سەر لاوان و رۆشنبیرانی کوردیش، کە لەنێو ریزی لاوان و رۆشنبیرانی تورکیادا جێگای خۆیان گرتبوو؛ ئەمەش رێگای لەپێش ئەوە کردۆتەوە هەڵسەنگاندن سەبارەت بەوڵات و مێژوو و راستینەی کۆمەڵگای خۆیان بکەن، هەروەها جولانەوە و رێکخراوی هەڵگری گەوهەری نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی بێنە ئاراوە. دەشێ ئەمجۆرە جولانەوانە بە مەیلی ئازادی ناو ببرێن. ئەو هێزەی لەناو چەندین گروپ بایەخی پەیدا کرد و مۆری خۆی لەقۆناخدا PKKیە. پێویست دەکات هەڵسەنگاندنێکی قووڵ سەبارەت بەم راستینەیە بکرێت.

## ٤ ـ لەدایکبوون و گەشەکردن و ئایندەی PKK

أ ـــ دەشێ PKK وەکو رەوتێکی سیاسی ـــ کرداری هەڵسەنگێنرێ کە لەمیانەی تایبەتمەندێتیە سەرەکیەکانی قۆناخ، کە مۆرکی خۆیان لەسەدەی بیستەم داوە، لەسەر بنەمای سۆسیالیزمی زانستی رەوشی واقیعی و بەرجەستەی کوردستانی هەڵسەنگاندووە. بێگومان پێشخستنی شرۆڤەیەکی دروست سەبارەت بەو پێشکەوتنانەی PKK رێگای لەپێش کردەوە، لەنزیکەوە گرێدراوی هەڵسەنگاندنێکی راستە سەبارەت بەراستینەی سەدەی بیستەم؛ هەروەها پابەندی ئیاردەی کورد و چۆنیەتی ئەو کونەڕەشەی دەورووبەری کێشەکەیە. هەڵسەنگاندنێکی جودا، کە بەشێوەیەکی دارێنراو هەندێ پێودانگ تاوتوێ بکات، بۆ نموونە بەبناخە گرتنی قاڵبی توندوتیژی و جوداخوازی، دەبێتە هۆکاری شرۆڤەی یەکلایەنە و سۆبژەکتیفانە. کاتێک لەهەڵسەنگاندنەکاندا شوێنێکی گرنگ و بەرفراوان سەبارەت بە PKK تەرخان دەکەین،

هۆکارەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە بابەتی سەرەکی بەرگرینامەیە. لەمەش گرنگتر بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە نەك تەنیا سەبارەت بەڕابردوویەکی نزیکی، بەڵکو دەرهەق بەڕۆژگاری ئەمڕۆمان و ئاییندەی نزیکدا تاڕادەیەکی مەزن خاوەنی وزەی شاراوەی کارتێکردنە و ڕۆڵێکی گرنگ لەئاراستەی پۆزەتیڤی پێشکەوتنەکاندا دەبینێ. پێناسەکردنی PKK لەبواری ئایدیۆلۆژی، سیاسی، سەربازی و دیموکراتی، خستنەڕووی ئەوەی تا چ ڕادەیەك لەبواری پراکتیزەکردندا بەشێوەیەکی کۆك لەگەڵ ڕێبازی سەرەتا پێشکەوتووە و تاچ ڕادەیەك لایداوە، هەڵسەنگاندنێکی واقیعیانە سەبارەت بەتواناکاری و بەهەرەی ڕەخنە و وەرچەرخان، مەسەلەیەکن پێویستییان بەڕۆشنکردنەوە هەیە.

هەروەکو دەبینرێ داوانامەکەی کۆماری تورکیا و هەندێ لەو بڕیارانەی دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپا وەریگرتوون، زۆر لەڕاستینە بابەتیەکان دوورن. قورسایی دراوەتە سەر شرۆڤەی یاسایی بەرتەسك و خودییەوە. ئەنجامدانی ئەم هەڵسەنگاندنە زێدەڕۆیانە سەبارەت بەمن، تاوتوێکردنی هەزاران دۆز، هەم پەنابردنە بەر ڕێچکەیەك هەروەك بڵێی ئەم بابەتەی نوێنەرایەتی دەکرێت هیچ پەیوەندییەکی لەگەڵ دیاردەی کورد و کێشەکەیەوە نییە، لەڕێ لادانێکی زۆر مەترسیدارە کە لەژێر ناوی یاساوە ئەنجام دەدرێت. هەڵسەنگاندنەکانمان ئەو ئەرکەی دەکەوێتە ئەستۆی جێبەجێی دەکات تاوەکو ئەو یاسایەی پێویستە وەکو ئامرازێکی چارەسەری دادوەرانە، کێشەکانی کۆمەڵگا چارەسەر بکات و نەبێتە ئامرازێکی هەڵوێست و نزیکبوونە ئەرێنیەکان. هێزی بنەڕەتی بەرگرینامەیەکی ڕاستەقینەش، لەمیانەی ئەو پێشکەوتنانە دەپێورێت کە لەئەنجامی پێشخستنی چارەسەری کێشەکە لەبواری کرداریدا ڕێگای لەپێش کردۆتەوە. لەم بوارەشدا بڕیاری ئەرێنی و نەرێنی دادگاش ڕۆڵێکی مەزن دەبینێ.

هەربۆ ئەوەی لەبەرگرینامەدا بەرەو ئەنجام بچین هەڵسەنگاندنێکی درێژی شارستانییەتەکان و ڕۆژهەڵاتی ناوینم لەبەرتووکی یەکەمدا ئەنجامدا. هەرچی بەرتووکی دووەمە، زیاتر دیاردەی کورد و ڕەوشی بەرجەستەی کێشەکە لەئەگەری چارەسەریەکی چاوەڕوانکراودا واتاکەی سەبارەت بەیاسای گەردوونی، بەتایبەتیش بەهاکانی یاسای دیموکراسییانەی ئەورووپا و شیکردنەوەیەکی زانستی و یاسایی ئەو ڕووداوانە لەخۆوە دەگرێت کە سەبارەت بەکەسێتی منە.

کاتێك لەژێر سایەی ئەم تۆمارانە پێناسەی PKK ڕوون بکەینەوە، دەبینرێ کە لەهەموو لایەنێکەوە ڕاستیەکان ئاشکرا دەبن.

بۆ ئەوەی شیکردنەوەیەکی ڕاست سەبارەت بە PKK بکرێت، پێویست دەکات بەشێوەیەکی نزیك ڕاستی ئەوە بخرێتەڕوو کە سۆسیالیزمی زانستی وەکو ئایدیۆلۆژیایەك گوزارشت لەچی دەکات و لەبواری کرداریدا ڕێگای لەپێش چۆن ئەنجامێك کردەوە، ئەمەش جێگای بایەخە، ئەگەر وەکو ئایدیۆلۆژیایەکی ئاواکردنی دەوڵەت ببینرێ لەم ڕێگایەدا وەکو پەیڕەوی چالاکی و

کرداری سەرەکی دیار بکرێت و رۆڵی پێبدرێ، ئەوا ئەنجامی ئەگەری چاوەڕوانکراو ئەوەیە کە سۆسیالیزمی دەوڵەت بەواتای شێوەیەکی هاوچەرخی ئایدیۆلۆژیای راهیبەکانی سۆمەر دێت. ئەگەر لەنزیکەوە لێکۆڵینەوە سەبارەت بەدەوڵەتی راهیبی سۆمەر بکرێت، دەبینرێ کە بەشێوەیەکی زۆر بالآتر لەسەرکەوتنی سۆسیالیزمی بونیادنراو، لەخولقاندنی سۆسیالیزمی دەوڵەت، تەنانەت کۆمۆنیزمی دەوڵەت سەرکەوتنی بەدەست هێناوە. کاتێك ئامانج ئاواکردنی دەوڵەت بێت، تەنیا جیاوازی لەوەدایە کە یەکێکیان بناخە زانستیەکەی پێشکەوتووترە، وەلێ گەوهەر هەمان شتە. کاتێك دەوڵەت ئاوا بکرێت، ئەوا وەکو راستینەیەکی کارگێڕی بالآ، یاخود هەروەکو لەنموونەی سۆمەردا بینرا دەستەی راهیبەکانە، یاخود هەروەکو لەچەمکی ئەفلاتوون سەبارەت بەدەوڵەت بینرا دەبێتە کارگێڕی فەیلەسوفەکان. لە فەلسەفەی ئەم دەوڵەتانەی لەرۆژگاری ئەمرۆشماندا ئاواکراون بەردەوام ئەم لایەنانە زاڵ بوون. مۆنارشیەت، ئەرستۆکراتی و ئۆلیگارشی جێگای خۆیان لەنێو ئەم واتا گشتییەدا دەگرن. نابێ لەبیر بکرێ دەوڵەتی راهیبی سۆمەر، واتە یەکەمین دەوڵەت؛ لەسەر بنەمای نکوڵیکردن لەکۆمەڵگای نیۆلیتیك، واتە لەرێگای نکوڵیکردن لەدرێژخایەنترین کۆمەڵگای یەکسانی و ئازادی هاتۆتە ئاراوە. ئەم پێشکەوتنە سەبارەت بەئاواکردنی تەواوی دەوڵەتەکان دیاریکراوە و رەوشێکی گشتییە. کاتێك دەوڵەت ئاواکرا بالآدەستی و جیاوازی، جێگای مەیلی ئازادیخوازی و یەکسانی کۆمەڵگای گرتەوە. کاتێك دەوڵەت پشت بەکۆمەڵگا جیاوازەکانی کۆیلەداری و دەرەبەگایەتی و سەرمایەداری دەبەستێ لەگەوهەری خۆیدا گۆڕانکاریەك لەگەڵ خۆیدا ناهێنێ. جیاوازی لەشێوەدا روودەدات. هەروەها پشتبەستنی بە یاسا یاخود ئارەزووەکان، رێگا لەپێش جیاوازیەکی بنەرەتی ناکاتەوە. لەکاتێکدا یاسا دەوڵەتی خاوەن رێسا ئاوا دەکات؛ دەوڵەتی ئارەزوومەندی، پشت بەشرۆڤەی رۆژانەی بەڕێوەبەران دەبەستێت. هەروەکو چۆن سەبارەت بەبەڕێوەبراوەکان رۆڵێکی زۆر خراپ دەبینێ، بەڕێوەبەر باش بێت، دەتوانێ رۆڵێکی بالآتریش ببینێ.

بێگومان مەترسی ئەوە هەیە ئەم هەڵسەنگاندنە وەکو شرۆڤەیەکی ئەنارشیستانە هەڵسەنگێنرێ. بەلآم لە روخساردا ئەمە بەمجۆرەیە. ئەنارشیزم مەیلێکی سەرمایەدارییە؛ شێوەی ئەو تاکرەوێتیە زێدەرۆییەیە کە گەیشتۆتە ئاستێك دەوڵەت ناناسێ. تاکرەوێتیەکی وەها هیچ پەیوەندیەکی لەگەڵ یەکسانی و ئازادی کۆمۆنەدا نییە.

کێشەیەکی دیکەی گرنگ، بەدرێژایی مێژوو رۆڵی پێشکەوتووخوازی دەوڵەت، واتە ئەو کۆمەڵگایە چینایەتییەیە کە پشتی پێبەستووە. لەئاستێکی سنوورداری زانست و ئامرازەکاندا ئامرازی دەوڵەت جیابوونەوەی چینایەتی، لەژێر سایەی هەندێ پێوانەی دیاریکراودا بۆتە ناچاریەك و رۆڵێکی پێشکەوتووخوازی بینیوە. بەلآم بەدرێژایی مێژوو بینراوە و لەرۆژگاری ئەمرۆشماندا لەبواری زانستیەوە سەلێنراوە کە بابەتێکی سەرەکیش ئەوەیە، زیاتر وەکو

تەنێکی شێرپەنجە لەسەر پشتی کۆمەڵگا مەزن بووە و لەپەلوپۆی خستووە. دەبێ زۆر بەباشی ببینرێ ئەگەر لەسەدا پێنجی جیابوونەوەی چینایەتی و بەدەوڵەتبوون واتادار بێت، ئەوا لەسەدا نەوەد و پێنجی بێ واتایە و وەکو تەنێکی نەخۆشی شێرپەنجە وایە.

تەواوی ئەو شێوە هزریانەی میتۆلۆژی و ئایینی و فەلسەفی و زانستیانەی پشت بە جیابوونەوەی چینایەتی و بەدەوڵەتبوون دەبەستن، تا چ رادەیەك جیاوازییان لەنێواندا هەبێ بابێت، لەسەدا نەوەد و پێنجی ئەمانە، تاوەکو دژ بەو دەوڵەتە نەوەستن کە بەشێوەیەکی گشتی پێویست نییە و بێ واتایە، ئەوا ئەگەر بەهەشتیش بخوڵقێنن لە بوون بەئامرازی باڵادەستی و زۆرداری رزگاریان نابێت. بەشێکیان، کەمایەتیەکی زۆر سنووردار، هۆشمەندترین و بەتواناترین توێژ پێکدێنن،توێژە زۆرینەکانی گەلیش، دەبن بەنەزانترین بەش و ژێردەست دەبن. ئەم جیاوازییە لە گەوهەری هەموو جیاوازیە چینایەتیەکان و دەوڵەتدا شاراوەیە. ئەو بەشە گشتییەی رەوایەتی دەوڵەت و جیابوونەوەی چینایەتی، کە لەسەدا پێنجی کردوویەتی بە پێویستیەك، لەمیانەی ئاستی زانست و تەکنۆلۆژیا واتادار دەبێت. ئەو ئاستەی شۆڕشی زانستی و تەکنۆلۆژی لەکۆتاییەکانی سەدەی بیستەم پێی گەیشت، ئەو باوەڕییەی دەستەبەرکردووە کە ئەم لەسەدا پێنجەی دەوڵەت شێوەی ژیانی چینایەتی کردۆتە ناچارییەك، لەئارادا نەماوە. بەلانی کەم ئەگەر شیمانەکانی ئەوانەی پێویستی بە چەمکێکی نوێی سۆسیالیزم دەبینن، لەو لایەنەیە کە ئیتر لەدوای شۆڕشی زانستی ـ تەکنۆلۆژی پێویستی بە پێکهاتەی کۆنی دەوڵەت و کۆمەڵگای چینایەتی نییە و ئیتر وەکو ناچارییەك نییە.

ئەم چەمکە لەمارکسیزم دوور نییە. بەڵام کاتێك مۆدێلێکی دەوڵەتی دارێنراوی لەجۆری دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریایان بەهەموو جۆرێك پەسند کرد، ئەوا مارکسیزم خۆی لەزەلکاوی دەوڵەت و کۆمەڵگای کۆندا بینیەوە و لێی رزگارنەبوو. تەنانەت هەروەکو بەچڕی لەئەزموونەکانی سۆسیالیزمی بونیادنراودا بینرا، زێدەڕۆییترین جیابوونەوەی چینایەتی و بەدەوڵەتبوون لەژێر ناوی ئەم مۆدێلەی پرۆلیتاریا شێوەی گرت. لەمێژووی دەوڵەتەکاندا سەرەڕۆترین و تۆتالیتارترین شێوەی دەوڵەت لەو وڵاتانە بینرا کە ئەم مۆدێلەیان پەیڕەو کرد. بەرەوشێکی وەها گەیشت، ئیتر ئەو درندەیەی خوڵقێنرابوو خاوەنەکانی خۆی دەخوارد. چەندە بەئێشە، لەدەرئەنجامی ئەو حەپەسانەی لەمیانەی ئەو درندەیە دووچاری هاتن، خۆیان هاوێشتە باوەشی دەوڵەت و کۆمەڵگای کۆن. پیشەی گەوادی و سۆزانی کۆنیان بەرزگاربوون لەقەڵەمدا و تێی ئاڵان و تا بینەقاقای تێیکەوتن. سەرەکیترین وانەوپەندی سۆسیالیزمی بونیادنراو ئەوەیە، کامە شرۆڤەی دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا بێت بابێت، تاوەکو کۆتایی بەو ئامرازەی دەوڵەت نەهێنی کە ئیتر بەلاوەنانی بۆتە ناچارییەك، ئەوا ئەو کۆمەڵگا سۆسیالیستییەی ناوا دەکرێت لە لادانێك بەولاوە رۆڵێکی تر نابینێ و گوزارشت لە هیچی دیکە ناکات، یاخود لە شێوەیەکی ئەو دەوڵەتە سەرمایەدارییانە بەولاوە تێپەڕ ناکات کە ئارایشتێکی

سۆسیالیستانەیان کردووە. لە هەمانکاتدا ئەم نموونەیە ئەو هەڵسەنگاندنەمان مافدار و پشتڕاست دەکات کە هەوڵماندا سەبارەت بە دەوڵەت ئەنجامی بدەین.

ئەگەر بەڕاستی سۆسیالیزمی زانستی بخوازێ وەکو سیستەمێکی ئازادیخواز و یەکسانی و دۆستی ژینگە و سیستەمێکی تەبایی پێناسە بکرێت کە کردبووی بەئامانجی خۆی، شێوەکانی دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریاشی تێدا، ناچارە تەواوی شێوەکانی دەوڵەت لەپەراوی فەرهەنگی خۆیدا دەربخات. بێگومان کۆمەڵگاکان بەبێ بەڕێوەبەرایەتی و بێخشتەکاری (بدون تنسيق) نابێت، بەڵام لەم سەردەمەی زانست و تەکنۆلۆژیادا ئەم واتایەی لەدەستداوە کە تەنیا لەمیانەی ئامرازی دەوڵەتەوە پێناسە بکرێت. تاوەکو باشترین پێودانگەکانی دیموکراسییانە دێنەئاراوە کە یەکلایبووبنەوە و تواناکاری پراکتیزەکردنیان هەبێت، وەکو مۆدێلێك کە تەواو ناتوانرێت بەدەوڵەتیش ناوببرێت ئەگەر لەهەمووشیان باشتر نەبێ، دەشێ وەکو گونجاوترین مۆێلی بەڕێوەبەرایەتی ڕۆڵ ببینێ. تاوەکو ئەو قۆناخانەی لەسەر بنەمای ئەو تواناکاریانەی زانست و تەکنۆلۆژیا هێناویانەتە ئاراوە بە شێوەیەکی بەڕێوەبەرایەتی یەکسان و ئازاد و کۆك لەگەڵ ژینگە پێناسەی دەکەین، ئەوا ناوزەدکردنی چەرخەکەمان بە بەڕێوەبەرایەتی دیموکراتییانە ( وەکو گوزارشتێکی کۆمەڵگاکانیش شارستانییەتی دیموکراسییانە) شایستەیە و لەجێی خۆیدایە.

دەشێ سەبارەت بەبابەتەکانی ڕێکخراو، چالاکی، نەتەوە، ئایین، هونەر، ژن، کێشەی نەتەوەیی، پەیوەندییەکانی پێکهاتەکانی سەرخان و ژێرخان، چەمکی مێژوو، سۆسیالیزم لەیەك ولاتدا و ئەنتەرناسیۆنالیزم، چەندین بەرگی تایبەتی ڕەخنە پێشبخرێت. بەڵام ئێمە ئەو ڕەخنانەی لەچوارچێوەی هەڵسەنگاندنەکاندا سەبارەت بە بابەتی دەوڵەت پێشمان خست لەئاستی پێناسەکردندا بوو، بەس دەبینین.

ئەوە ڕاستییەکە لەکاتی دامەزراندنی PKK ئەو سۆسیالیزمە بەبناخە وەرگیرا کە گرێدراوی ئەم چەمکەی دەوڵەت بوو. لەگەڵ کارێگەری نەتەوەپەرستی بۆرژوازی و هەبوونی پاشماوەکانی ژیانی دەرەبەگایەتی، ئەوەی لەدامەزراندندا مۆری خۆی لێدا، چەمکێکی سۆسیالیزمە کە لەقۆناخی حەفتاکانی تورکیادا هێشتا گەوهەرەکەی یەکلا نەببۆوە، بەشێوەیەکی سنووردار لە کتێبە کلاسیکەکان ئاماژەی پێکراوە و لەئاستی یەکەمین گرووپی هەواداردا دەرکی پێکراوە. ئاشکرایە کە توانستێکی ئایدیۆلۆژی رووکەشی بەمجۆرە دواتر کێشەی گرنگ دێنێتە ئاراوە. کێشەیەکی دیکەی گرێدراوی ئەمە، ئەو هەڵسەنگاندنانەیە کە لەژێر ڕۆشنایی سۆسیالیزم سەبارەت بەمێژوو و ڕەوشی بەرجەستە پێشخراوە. بەشێوەیەکی گشتی ڕەخنەیەکی سنووردار دەرهەق بەسەرمایەداری، ئەویش زیاتر ئەوانەی ئاراستەی پێکهاتە ئابووریەکەی کراوە، بۆ ئایدیۆلۆژیایەکی سەرتاپاگیر، کەموکوڕیەکی جدییە. بەهۆی کێشەکانی وەرگێران و لاوازی کولتووری و پێکهاتەی هزری دۆگماتیك ـ یۆتۆپیانە نەدەشیا

لەسەر بنەمای توانستی سۆسیالیزم لێکۆڵینەوە سەبارەت بەشارستانییەتەکانی رۆژهەڵاتی ناوین بەتایبەتیش کۆمەڵگای سۆمەر بکرێت، کە زۆر ئاڵۆزە و تەنیا لەرۆژگاری ئەمڕۆمان تارادەیەك بەڵگەکانی دۆزراونەتەوە. هەربۆیە شیکردنەوەیەکی رووکەشانە سەبارەت بەرۆژهەڵاتی ناوین و مێژووی کورد و کوردستان، راستیەکی حاشاهەڵنەگرە کە گەلێك هەڵە و کەموکوڕی لەخۆوە دەگرێت. هەرلەبەر ئەم هۆکارانەشە ئاساییە کە بیرۆکەکانی نەتەوەپەرستی و سۆسیالیستی رێگا لەپێش چەمکێکی پارچە پارچەیی سەبارەت بەمێژوو، کۆمەڵگا و نەتەوە بکاتەوە.

تاوتوێکردنی چەمکەکانی مێژوو و کۆمەڵگا و نەتەوە لەئاستێکی داڕنراو و قاڵبڕێژ، هەروەکو خۆی رەنگیدایەوە سەر پرۆگرام و پێکهاتەی رێکخراویش. لەبەرئەوەی تەفلیبوونەکانی سەرەتا، لە کەسێتی نەتەوە و چینێکی پێشکەوتوو بێبەش بوو، بنگە لادێییە هەژارەکەی، تێپەڕنەبوونی بەنێو ئەزموونی سیاسی ـ کرداری، پێکهاتەیەکی لاوازی کادیرانی دەکرد بەناچاریەك. سەبارەت بەکێشەی کورد بالآبوونی چەمکی سۆسیال ـ شۆڤێنیزمی لەناو چەپی تورکدا، کاریگەری بەهێزی نەتەوەپەرستی بۆرژوا و نەتەوەپەرستی سەرەتایی کوردان کە جەمسەرێکی دژی چەپی تورك بوو، هەلومەرجەکانی دەرکەوتنیان ئاستەمتر کردووە. سەرەڕای تەواوی هەوڵ و کەموکوڕیەکانی ئەم هەلومەرجە کرداری و ئایدیۆلۆژیانە، ئەو بۆشاییە مەزنەی دیاردەی کورد و کێشەکەی تێیدا بوو، لەمیانەی هەندێ هەوڵی سنووردار رێگای لەپێش لەدایکبوون و پێشکەوتنێکی مەزن کردەوە. هێزی لەدایکبوون و پێشکەوتن بۆ پێکهاتەیەکی تۆکمەی رێکخستن نەدەگەڕایەوە. کێشەکە بێ خاوەن بوو. خاوەندارێتی کردن، هەوڵێکی گەوهەری و سنووردار، توانیویەتی تەقینەوەی پێویست ئەنجام بدات. لەم لایەنەوە زۆر لە جولانەوەکانی پێغەمبەران دەچێت. هەروەکو دەزانرێ عیسا بەزەحمەتیەکی زۆرەوە دوانزدە حەواریەکەی کۆکردەوە. ئەو هەژارانەی چاوەڕوانی موعجیزەیەکن، لەدەوروبەر هەن. سەرەڕای ئەمەش گەورەترین جولانەوەی باوەڕ و ئیرادەی لەمێژوودا ئەنجامداوە. بەڕادەی هەرە زێدە وێکچوونی PKK و ئەو جولانەوەیەی حەواریەکان، تارادەیەك بەهۆی پێکهاتەی گشتی سۆفیگەرایی رۆژهەڵاتی ناوینە. پێکهاتە هاوچەرخەکانی رێکخستنی ئەوروپا ناشێ ببێتە مۆدێلی رۆژهەڵاتی ناوین. جیاوازی مێژوو و ناسنامەی کولتووری رەنگدانەوەی خۆی دەکاتە سەر پێکهاتەی چالاکی و رێکخستنیش. پێشکەوتنی خێرای تەریقەتەکان لەتورکیا، هۆکارێکی لەم تایبەتمەندیانەدا شاراوەیە.

دەتوانرێ بگوترێ PKK وەکو سەنتێزێکی پێکهاتەی سۆسیالیزمی نوژەن و ناسنامەی کلاسیکی رۆژهەڵاتی ناوین هاتۆتە ئاراوە. بەواتایەکی دیکە گوزارشتێکی سەمبۆلی سەنتێزی رۆژهەڵات ـ رۆژئاوایە. بەهێزی و لاوازی خۆشی لەم سەنتێزە وەردەگرێت.

جدیترین لایەنی سەنتێزی رۆژهەڵات ـــ رۆژئاوای PKK، رەسەنایەتی و هەڵوەستەی بەباوەڕیەتی. گرێدراوی هیچ ناوەندێکی دۆگماتیکانە نییە. خەیاڵی هەرزان لەخۆوە ناگرێت. مرۆڤی بوێر و دڵسۆز بەبنەما وەردەگرێت. بەڵێنی بەرژەوەندی کەسێتی و پایەی تایبەت بەهیچ یەکێك لەئەندامەکانی خۆی نادات. لەنێو هەڵوێستێکدایە کە بەئازادی دەرگاکانی لەپێش راستی و دادوەری و جوانی کردۆتەوە. لەژیاندا یەکسانی و رێزگرتن لەرەنج بەبنەما وەردەگرێت. هەرچەندەی پێشدەکەوێت، دوای ئەوەی کۆمەڵگا ئەم تایبەتمەندێتیە رەسەنانە بەچاوی خۆی دەبینێ، خاوەندارێتی لەرێکخستن دەکات. کۆمەڵگا لە وتەکانیان زیاتر ژیانەکەیانی لەلا سەرنج راکێشترە. ئەم تایبەتمەندێتیانە یەکەمین کارەکتەر و خێرایی پێشکەوتنی دیاری کردووە. بەڵام لایەنی سەرەکی لاوازییان ئەو کاتە دەردەکەوێت کە ئەم تایبەتمەندێتیانە بەتەنیا بێر ناکات.

کاتێك جولانەوە مەزن بوو و گروپێکی سنووورداری تێپەڕکرد، لەگەڵ دەرکەوتنی کێشەی جددی کارگێڕی و کرداری، بەخێرایی لاوازی و کەموکوڕیەکانیان ئاشکرا دەبوو. تەواو لەم نێوەندەدا دژواربوون و پەلامارەکانی هێزەکانی سیستەم، لەلایەنێکدا رۆڵی ئاودانی پۆڵایان بینی. ئەو کۆچەی بۆ دەرەوە ئەنجامدرا، قۆناخێکی گرنگی لەمێژووی تورکیا، ئەنادۆڵ، کوردستان و رۆژهەڵاتی ناوین لەگەڵ خۆیدا هێنا. لەقۆناخێکدا کە هاوسەنگیەکانی جیهان لەنێو پێکدادانێکی دژواردا بوو هەلومەرجەکانی سوریا، فەلەستین، ئیسرائیل و لوبنان دەرفەتی پێشکەوتنی دەدا. دواتر تەقینەوەی شۆڕشی ئێران و شەڕی ئێران ـــ ئێراق زەمینەکەی گونجاو و لەبارتر کرد. ئەو هەلومەرجانەی کودەتای ١٢ی ئەیلولی تورکیا لەگەڵ خۆیدا هێنا و پێشوازیکردنی لەدەرەوە، هەلودەرفەتی بەکەڵکی دەرەخساند. لەکاتێکدا چاوەڕوانی دەکرا ئەم لەدایکبوونە بەمەردنێکی پێشوەخت ئەنجامگیر بێت یاخود لەنێو هەلومەرجی زۆر جیاوازتردا وەکو رێکخستنەکانی دیکە بەسنووورداری بمێنێتەوە، قۆناخی ١٥ی ئاب دەستپێکرد، کەلای هەمووان دەناسرێ. هەروەکو مەزندە دەکرێ ئەم قۆناخەش لەسەرەتادا زۆر بەپلان نەبوو، قەڵەمبازێك بوو لایەنی خۆرسکی لەپێش بوو. سەرباری ئەمەش ئەنجامەکانی زۆر مەزن بوو قۆناخێکی نوێی پێشکەوتن هاتە ئاراوە کە کەس، تەنانەت لەسەرووی هەموویانەوە سەرۆکایەتی PKK و ئەندامانی، مەزندەی بۆ نەدەکرد.

ب ـ هەڵسەنگاندنێکی واقیعیانە، تەنانەت پێناسەیەکی بەرجەستە سەبارەت بە PKK ی ئەو ساڵانە کە بەواتای قۆناخێکی نوێی مێژوویی دێت، سەبارەت بەگەیشتن بەراستی پایەخێکی مەزن لەخۆوە دەگرێت. ئەو فێربوون و خوو و نەریتانەی سۆسیالیزمی بونیادنراو و سیستەم کە سەرەتا لەسەردەمی لەدایکبوونی ئایدیۆلۆژی لەخۆوەی گرت، لەم قۆناخە نوێیەی پێشکەوتندا هەروەکو بڵێی دەمامکی خۆی فڕێدا و لەمیانەی رووی راستەقینەی خۆی کەوتەڕوو. ئەو ئایدیۆلۆژیایەی بەشێوەیەکی سنووردار بەرجەستەکرابوو لەولاوە بەجێ

هێنرا. کەسێتی باو لەمیانەی دەرفەتی دەسەلات و ئەو چەکەی بەدەستی هێنا، بووە خاوەن کەسێتیەکی لەجۆری نەمرووت. ئەو کەسایەتیانەی لەبۆسەدا بوون و لایەنی دەرەبەگایەتیان قورس بوو، هەروەها لەمیانەی هێز وەرگرتن لەمەیلی میلیگەرای سەرەتایی کە لەنێو گۆرەپانی جموجۆڵدا بەکاریگەر بوو، لەخۆبایی بوون و کەوتنە نێو ئەشقی ئەوەی تاوەکو دوایی زاڵ و بالادەست بن. لەبەرئەوەی کادیرە دروست و لادێییە هەزارەکان توانستیان سنووردار بوو و قەڵەمبازی پێویستیان ئەنجامنەدا، ئەوا کەسێتی دەرەبەگ لەمیانەی پشتبەستن بە میلیگەرای سەرەتایی، جورئەتی زیاتریان بەدەست دەهێنا. وەکو دەرەبەگێکی زۆردار ئەو دەسکەوتانەیان بەکار دەهێنا کە بەرهەمی رەنجێکی دەگمەن و کۆششەکانی سەرۆکایەتی جولانەوەکە بوو. تینوێتی سەدان ساڵەی دەسەلات و فەرمانداریێتی سەخت، کەمێك مابوو ئەو ئەقڵەی کە هەشیانبوو لە دەستیان دەربهێنێ.

زۆر درەنگ دەرك بەوەکرا کە ئەمانە لەمیانەی پیلانگێری دەرەبەگایەتی لەناوبردنی پێکهاتەی کادیرە گەوهەری و دڵسۆزەکانی پارتیان کردبوو بەکردارێکی پیلانکراو. هەر لەدوای شەهیدبوونی عەگید (مەعسوم قورقماز) کە سەمبوڵی کادیری دڵسۆز بوو، دەرکەوت کە ئەو مەیلەی بە چوارچێوە ناودەبرێت لەنێو هەوڵێکی تاریك و شاراوەدان کە تاوەکو ئێستا بەتەواوی روون نەبۆتەوە. لەماوەی نێوان ساڵی ١٩٨٧ ـ ١٩٨٨ قۆناخێك بوو ئەم چەتانە مۆری خۆیان لەپراکتیکدا. چەمکێکی چالاکی دەبوو بەپێرەو کە سەرەتا ئاستەم بوو باوەڕ بکرێت و بەشێوازێك دەبینرا کە تەنیا چەتەکان ئەنجامی دەدەن. پێوانەکانی ئایدیۆلۆژی، ئاکاری، رێسا، بەرپرسیارێتی و دڵسۆزی جولانەوە بەتەواوی بەلاوەنرا. هەڵوێستێك وەکو نەخۆشی لەناو گەریلا بڵاوبۆوە کە دیارنییە کێ چیکرد و لەناو هیچ یاسایەکی شەڕدا بوونی نییە. بۆ ئەوەی مەسەلەکان ئاشکرا نەبێت، لەژێر پەردە و شێوەی پێکدادان تاوەکو کوشتنی کادیرە دڵسۆزەکان هەنگاویان هاوێشت.

رووداوی شەهیدکردنی حەسەن بیندالێ کە لەسەرەتاکانی ١٩٩٠ روویدا و لایەنی پیلانگێری زۆر ئاشکرایە، ئەقڵی لەسەری مرۆڤ دەبرد. ئەمەش تەنیا هێمایەك بوو. ئەم چەمکە، هەرچەندە ناچاریەکیش نەبوو، پێشتریش بەرپرسیاری ئاشکرا و بەئەنقەستی کوشتنی چەندین ژن و منالێ بوو. کادیرێك، مەیلێك کاتێك بەهادارترین هەڤاڵانیشی وەکو کۆسپێك لەپێش خۆی بینیبوایە بەبێ چاوتروکاندن بەکوشتنی دەدا، گۆڕانکاریەکی شێتایەتی بوو، بەلام واقیعی روویدا. ئەمانە مەودایەکی زۆریان بڕی . تاڕادەیەکی مەزن بنکە (قاعدە) کرابوو بەهاوبەشی تاوان. کادیرانی کۆمیتەی ناوەندی کە پێویست بوو بەرپرسیار بن دەیانگوت "نەمبیست، نەمدیت، نازانم". هەرچەندە لەلایەنی سەرۆکایەتیەوە چەندین هەڵمەتی مێژوویی ئەنجام بدرێت و هاوکاری پێشکەش بکرێت، بەلام خاوەنەکانی ئەم چەمکە لەپێناو هەڵوێستە نارەزوومەندیەکانیان کە زۆر ساختەکارانە و هیچ بەهایەکی نەبوو، پووچەڵ

کردنەوەیان کردبوو بەئارەزووێك. ئەو گەنجانەی هێشتا بەرخۆڵەی دایکیان بوون و بەرهەمی هەزار و یەك ڕەنج بوون، گروپ گروپ لەمیانەی ئەو چالاکیانەی پێویست نەبوون و بێ پیلان بوون، تەنانەت بەڵکو بۆ پاکێتێك سیگارە یاخود بۆ قوتو خواردنێك بۆمردنیان دەناردن. ببوون بە ئامێری هارپین. ئەو کیژۆڵە گەنجانەی پێویست بوو وەکو گوڵ پێشوازیان لێبکرێت، وەکو بارێك و بە نەزان و بچووك دەبینران، لەکەسی ئەوانەدا ڕۆحی ئەشقی ئازادییان هەڵدەکێشا. کاتێك دەرفەتیان بینیبوایە، لەسەپاندنی دواکەوتوویی دوودڵ نەبوون. کاتێك زۆر تەنگەتاویش ببونایە خۆیان فرێدەدا ئامێزی دەوڵەت یان بڕیارگاکانی میلیگەرای سەرەتایی، تەنانەت لەئەنجامی ڕاکردنەکانیان ئەورووپاشیان کردبوو بە کاروانسەرای حەسانەوە. ئەوە لەو لاوە بمێنێت کە خۆی پەروەردە ناکات، تەنانەت بن بەردەکانیان پڕکردبوو لەو کەرەستانەی پەروەردە کە لەمیانەی هەزار و یەك ڕەنجەوە پێشخرابوون. یەکەمین کاریان تێکدانی دیسپلینی ڕێکخستن بوو. گووتەی بەگوێرەی هەوەس و خزمەتکردنی خۆی، غەریزە نەفرەت لێکراوەکانی هەزاران ساڵەی چینی دەسەڵاتدار، لەمیانەی دواکەوتوو ترین شێوە لەریزەکاندا باڵادەست دەبوو. سەرباری تەواوی ئەو تەگبیرانەی پێشخرا، لەڕاستیدا لەقۆناخی ۱۹۸۷ ـ ۱۹۹۷ تاڕادەیەکی مەزن PKK گەوهەر و شێوەی لە دەستدا. ڕاستە PKK بنکەیەکی جەماوەری هەیە. قارەمانێتی مەزن ئەنجامدراوە، یەکەمین مانگرتنەکانی تامردن، شەهیدی پێشکەش کردووە. لەنێو سەختترین هەلومەرجدا شەرەفی خۆیان پاراستووە. بەڵام لەزیندانەکان و شاخ و ئەورووپاش هەندێکی دیکە لەپێناو تێرکردنی غەریزە چەپەڵەکانی چینی باڵادەست هەوڵی مەترسیداریان داوە. هەموو جۆرێکی تاوان و لەیستۆك لای ئەوان بەکارامەیی لەقەڵەم دەدرا.

لەگەڵ ئەوەی ئامار نەکراوە و بەتەواوی یەکلانەبۆتەوە، بەڵام بەسانایی دەتوانرێ بگووترێ کە سەدا نەوەد و هەشتی ئەو هێزانەی دەیانتوانی ببن بە کادیری ڕاستەقینەی پارت و ئەندامی ڕێکخراو، بوونە قوربانی چەمکی بەئەنقەست سەپاندنی چەوتی. لێکۆڵینەوەیەکی ورد و هەمەلایەنە، زیاتر ڕاستیەکان دەخاتەڕوو. لەهەموو ئاستێکدا لەدەستدانی شان و شکۆی PKK، پێشکەوتنی پیلانگێڕی لەسەر سەرۆکایەتی و لەدەستدانی ژمارەیەکی زۆری کادیرانمان و شەرڤان و هەواداران، ئەوا لەدەستدانی بێ سنووری ئامرازەکان و لۆژستیك و جەماوەریش تاڕادەیەکی مەزن گرێدراوی ئەم چەمکەیە. کاتێك گەیشتینە ساڵی ۱۹۹۸، ڕفاندنی شەمدین و دواتریش بەندکردنی، ئەوە نیشان دەدات کە کۆمیتەی ناوەندی PKK لەچ ڕەوشێکدایە. بەرپرسیارێتیەك تاکو ئێستا زەمینە و هەلومەرج بۆ خیانەتی بەمجۆرە دەڕەخسێنێ، تا چ ڕادەیەك هێواش هێواش دەتوانێ بانگەشەی ئەوە بکات کە تا چ ڕادەیەك کەسێتی و ئەقڵیان هاتۆتەوە سەرخۆ و ویژدانیان کۆکردۆتەوە و بەرامبەر خۆیان بەرێزن؟

دەشێ ڕەخنەیەکی بەرفراوانتر سەبارەت بەرێبازی سەربازی بکرێت. سەرباری هەبوونی هەموو جۆرە تواناکاریە سەربازیەکان و زەمینەی لەبار و پشتگیری جەماوەری و کۆمەکی

بیتاك، بەرامبەر بەو راستینەی گەریلاییەك و شوێنگەی فەرماندارێتییەك چی بڵێی کە نەیتوانیوە هێڵێکی سادەی بەرگری رەوا جێگیر بکات؟ فەرماندارێتییەك کە بێ ناوەڕۆکە و لە پەروەردە و رێکخستنێك رادەکات کە بەواتای رێباز و هێڵێکی سەربازی سادە نییت، لەنێو زەمینەی تواناکاریە بەرفراوانەکاندا هەندێ جار دەکەوێتە نێو تەمبەڵییەك کە ژیانی سەیران و گەشتوگوزەران تێپەڕ دەکات، تەنانەت تواناکاریە ئامادەکراوەکانیش بێهودە و بێ هۆ لەدەست دەدات، تا چ رادەیەك دەتوانێ خۆی شایستەی کەسێتی سەربازی ببینێت؟ سەرباری ئەوەی هەموو تایبەتمەندێتی و هەلومەرجە گونجاوەکان بۆ شەڕێکی بەرگری رەوا هاتۆتە ئاراوە، فەرماندارێتییەك لەلەبارترین شاخدا ناخوازێ بەرگرییەکی رەوا بزانێ و بێ خەمی دەکات، تا چ رادەیەك دەتوانرێ جددی ببینرێت؟ فەرماندارێتییەك، ناوەندێکی پراکتیکی کە بوێرترین مرۆڤ وەکو بار هەڵدەسەنگێنێ، تا چ رادەیەك دەتوانێ خاوەن بانگەشە بێت؟ ئاشکرایە کە پەلوپۆی بۆ دەوڵەتەکان یان ئەوروپا یاخود نەتەوەپەرستێتی بۆرژوا و نەتەوەپەرستی سەرەتایی درێژ بێتەوە و پشتیان پێببەستێ، مەیلی چەتەگەرێتی، مۆری خۆی لەرێکخستنی، فەرماندارێتی، پەیڕەوی چالاکی و شێوازی ژیانداوە. ئەوەی سەرۆکایەتی بەرەو خنکان بردووە، خستنی رێکخراوە بۆ ناو ئەم رەوشە.

کاتێك خۆم لەدەرەوە بووم، زۆر باش بەبیرم دێت لەکۆتاییەکانی ساڵی ١٩٩٨ لەو ماوەیەی نزیك بەکۆنگرەی شەشەم گووتبوم: "بەرامبەر بەهێزی ئەو جورجە کوێرە و شەمشەمە کوێرانە چی بکەم کە ئەو شەڕەی بەرگری رەوایان خستۆتە نێو ئەم رەوشە، ئەمە لەکاتێکدا دەجار دەتوانرا قازانج بکرێ؟" بەرامبەر بەرێکخراو دۆڕاندبووم. مەیلی چەتەگەری رەوشێکی بێ خەمی و دوور لەئەنجامگیری لەناو بنکەدا خوڵقاندبوو، شکست لەناوەوە وەکو تێزاب دەیتواندەوە. ئیتر گەیشتبووم بەو ئاستەی لەئارەزوو بەدەر بۆ رۆژنامەیەکی ئیتاڵی رابگەیەنم " دەست لە PKK بەردەدەم". شەمدین ساکاك لەدان پێدانانەکانی دواتردا گوتویەتی: من ئەم قۆناخەم ئافراند. بەمجۆرە بەخاوەن بانگەشە و بەڵگە قسە دەکات و تەنانەت داوای دانیشتنی نهێنی دەکات. رووی ناوەوەی قۆناخ نازانرێ. نموونەیەکی دیکەی ئەو کارەساتانەی بەدرێژایی مێژوو بەسەر گەلی کورد هاتووە، جارێکی دیکە روویدەدا. پاشەڕۆیەتی کوردان تۆڵەی دەسەندەوە. ئەوەی چەندین ساڵە لەدەرەوە، لەمیانەی رێککەوتن لەگەڵ دەوڵەتان نەیتوانی ئەنجامی بدات"، ئەوا لەبەندیخانە، لەمیانەی لەناوبردنی ئەو تواناکاریانەی PKK کە بەهای زێڕیان هەبوو، هەروەکو بڵێی PKK بەرەو هەڵدێر دەبات، بەمجۆرە خۆی ئاسوودە دەکرد.

دواتر دەوڵەت ئەقڵی بەوە نەدەشکا شەڕێك کە زۆر بەسانایی PKK تێیدا سەرکەوتنی بەدەست دەهێنا، بۆچی لەدەستیدا. دەیبینی کە ئەمە لەمیانەی تەگبیرەکانی خۆی نەبووە، نزای بۆ هاوکاری پاشەڕۆیەتی ناوخۆ و دەرەوەی کوردان دەکرد. بەڵام ئەو دەوڵەتەی ببوو بە

دەوڵـەتی چەتەگـەریتی زۆر لـە بـەهاکانی خـۆی لەدەسـتدەدا. پـەند وەرگرتنمـان لـە ئاگادارکردنـەوەکانی ٢٨ی شوبات باش بـوو. لەگـەڵ گەیشـتن بەسـاڵی ١٩٩٨، بـەلاوەنانی ئـەو پنبەستبوونەی لەئارادابوو، لەمیانەی ئاشتیەکی شەرەفمەندانە و چارەسەری دیموکراتییانە، بۆ تەواوی لایەنەکان وەکو گونجاوترین ڕێگا دەبینرا. کاتێك هێشتا لە ڕۆژهەڵاتی ناوین بـووم ئـەم بەبڕیاربوونە پێشـدەکەوت. ڕێگای پەیامـە ناڕاستەوخۆکان کرابۆوە. بـەڵام بـەرژەوەندیخوازی سیاسـەتی ڕۆژانـە و هـەرزانی ڕۆژهـەڵاتی نـاوین و ڕێنـەدانی ئیمپریـالیزم بەچارەسـەریەکی شەرفمەندانە، بـۆ ئـەوەی بیهێننـە سـەر حاڵـەتێك کە بـەگوێرەی بەرژەوەندیەکـەیان بێـت و پاشکۆیان بێت، ڕێچکەی بەگوێرەی خۆی خستەگەر، کاتێك کاردانەوە بەرامبەر ئەوە نیشاندرا، بەبێ ئەوەی ڕێز لەهیچ نەریتێکی یاسای دیموکراسییانە بگرن، تەواوی ڕۆژئاوا پیلانگێڕیـەکی دەرەوەی مرۆڤایەتیان ئەنجامدا، بەرامبەر بەمەش ئەو کارانەی ئـەنجامدرابان زۆر سنووردار و ناستەم بوو. سانایـیترینـیان یەکسەر پەسندکردنی مردن بوو. پیلانی پیلانگێڕان لەسەر بنەمای چاوەڕوانیـەکی بـەمجۆرە بـوو. هـەرچی ئـەو ڕێگایـەی دەرفـەتی بەمـە نـەدەدا، تاقیکردنـەوەی ژیانێك بوو لەناو تابووت و لەخاچدان، هەموو شتێك کۆتایی قۆناخێك و دەستپێکی قۆناخێکی نوێی دەکرد بەناچاریەك و وەها نیشانیدەدا.

سەرچاوەی سەرەکی ئەو کەموکوڕی و لەرێ لادانەی لـەقۆناخی لەدایکبوون و گەشەکردنی PKK دا دەرکەوت، بەشێوەیەکی بنەڕەتی گرێدراوی چەمکی دەوڵەت و شـێوازی توندوتیژییـە. پەیوەندی نێوان دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریای سۆسیالیزم و چەمکی شۆڕشی پشـت بـەتوندوتیژی دەبەسـتێ، ئاشـکرایە. لەحاڵـەتی توندوتیـژی شۆڕشـگێڕی و سـەرکەوتنیدا، ئـەوا گوزارشـتی بەدەزگابوونەکەی واتـە دیکتاتۆریـەتی پرۆلیتاریـا، لەسۆسـیالیزمی بونیـادنراودا کارەکتـەری ناکۆکی خۆی نیشانداوە و لەوە رزگاری نەبووە کە ببێتە ئامرازێکی توندوتیـژی سـەرمایەداری. ئەم قۆناخە کە لەسۆڤیەت بەشـێوەیەکی پـڕ لـە ئێش بـەڕێوەچوو، لـەناوەخۆیدا کۆك لەگـەڵ بەرژەوەندیەکانی سەرمایەداری میللی، وەکو شێوەیەکی کولتووری باوی ئیمپراتۆریـەت، هـەمان ڕۆڵ دەبینێ، واتە فرەلایەنی نییـە و لایـەنی دیکتاتۆریـەتی، وەکـو دەوڵـەتی سەرمایەداری زاڵ، درێـژە بـە هـەبوونی خـۆی دەدات. هـەنگاو بـە هـەنگاو وەرچـەرخانی دژی گـەلی زەحمـەتکێش دەشـکێتەوە. وەکـو ئـەنجام، سـەلێنراوە کـە بەسـەرکەوتوویی وەکـو ئـامرازێکی کۆمـەڵگای سۆسیالیسـتی بـەکار نـاهێنرێت. لەڕاسـتیدا گرنگـترین ئـەنجامی سـەدەی بیسـتەم لـەبواری ئایدیۆلۆژی و سیاسیدا ئەم ڕاستینەیەیە.

هەربۆیە نوێبوونەوەی چەمکی شۆڕش و دەوڵـەتی، ئایدیۆلۆژیـای سۆسیالیستی، لەبناخـەی تـەواوی کێشـەکان شـاراوەیە. هـەندێ دەوڵـەت و پـارتی سۆسیالیسـتی، هـەوڵدەدەن لەمیانـەی مۆدێلی کۆنـی سۆسـیال ـ دیموکـرات نوێبوونـەوە ئـەنجام بـدەن کـە سـەرمایەداری بەبنـەما دەگرێت. ئەورووپای ڕۆژهەڵات و ڕوسیا بەچری بـەم قۆناخـەدا تێپـەڕدەبن. هـەندێکیان لەسـەر

بنەمای جولانـەوەی ژینگـە و سـەوزایی وەکـو جولانـەوەی نـویٚ بـەرەو شـێوەبەندی ئاراسـتە دەگرن.

لەکاتێکدا بەشێکیشیان هـەوڵدەدات لەمیانـەی دامـەزراوەکانی کۆمـەڵگای مـەدەنی درێـژە بەهەبوونی خۆی بدات. ئەو بـەش و توێـژە سنووردارانەی داکۆکی لەسـەر کۆن دەکەن لەنێو هەوڵ و کۆششی ئەوەدان لەسەرپێیان بمێننەوە. ئاشکرایە کە قۆنـاخێکی پەرپـنەوە لەئارادایـە. ئـەوەی پێویستە شێوەبەندیەکی جێگیری ئایدیۆلۆژیـە بـەناوی گـەلان و پراکتیزەکردنیـەتی. تاوەکو لەبواری کرداریدا ئەنجامە سەرکەوتووەکانی دەسەلێنێ، سروشـتییە کـە گفتوگۆی وەها بەردەوام بکات.

ئەوەی بەپەلە بۆ PKK پێویستە ئەوەیە کە لەقۆناخی ئـەم وەرچەرخانـە سەرتاپاگیریەی جیهاندا، سەرلەنوێ رێرەوی ئایدیۆلۆژی و پراکتیکی خۆی دەستنیشان بکات؛ کە بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە و بەقووڵایی درێژە بەقۆناخی رەخنە ـ رەخنەدان بـدات کـە دەستی پێکـردووە، تـاوەکو سـەرلەنوێ ئاواکردنەوەیـەکی پتـەو و تۆکمـە بـەردەوامی پێبـدات. بەسـتنەوەی ئـەم قۆناخە بەشکست یـاخود سـەرکەوتنێکی بـالا، راست نییـە. نزیکبوونـەوەی وەهـا، رووکەشییە. تەنانـەت سـەرکەوتنێکی تـەواویش بەدەسـت بـهێنرێت، ئەمـە قۆنـاخێکی پێویسـتە ئەگـەر بەحاڵەتی دەزگایەکی بـەهێزی دەوڵەتیش بگـەیت، هـەروەکو لەنموونـەی سۆڤیەتیشدا بینرا، رەوش دەکەوێتە نێـو ئاستەمیەکی زیاتر. لەلایـەکی دیکـە هەڵوەستەیەکی شکست لەئارادایـە. هەربۆیە کاتێك دەڵێن باهەموو شتێك بگۆڕین بەلانی کەم هێندەی هەڵوێستی یەکەم هەڵەیـە. کاتێك هۆکارەکانی شکست و سەرکەوتن هەمان شت بـن و دەسـت لـەم هۆکارانـە نـەدرێت، ئـەو وەرچەرخانـەی ئـەنجام دەدرێـت نـاتوانرێ بەنوێبوونـەوە نـاو بـبرێت. بـەڵکو تـەنیا دەشـێ بـە ریفۆرمیسیـۆن یـاخود پینـەکاری ناوبـبرێت. لـەم چوارچێوەیـەدا سـەرلەنوێ ئاواکردنـەوەش گوزارشت لەنوێبوونەوەیەکی ئەوتۆ ناکات. ئەوەی پێویستە شێوەگرتنێکی ئایدیۆلۆژی بنەڕەتی و ئاستێکی کرداری جێگیرە.

بەسـتنەوەی چـەمکی سۆسیالیزم بەرەخنـەکردنی دەوڵەتی راهیبی سۆمەر یـاخود شـێوە بەرجەستەی رۆژگاری ئەمرۆمان کە دەوڵەتی سەرمایەدارییە، لەسەر ئەم بنەمایەش پێشخستنی ئەم چەمکە، لەدڵەڕاوکێی ئەوەدام کەموکوڕی و هەڵەی جدی لەخۆوە بگرێت. لـەو بـاوەڕەدام سەرەکیترین هەڵە و کەموکوڕیـەکانی مارکسیزم، سـەرچاوەی خـۆی لەشێوازی سۆسیالیزمێکی وەها دەگرێت. لەقۆناخـەکانی دوایی خۆیدا هەڵوەستەکردنی ئـەنگلس سـەبارەت بـە کتێبی "کۆمـەڵگای کۆن" ی مۆرگان، پەسـندکردنی ئەمـەش لەلایـەن مـارکس، دەبـێ وەکـو بینیـنی کەموکوڕیەکانی خۆیان شرۆڤە بکرێت. دەرنەکەوتنیان لـە گۆڕەپـانی سـەرمایەداری، سـەرباری ئەوەی ئەیاندەخواست، بەلام خۆیان کرد بـە جەمسـەری چـەپی سیستەم. ئەمـەش شێوەیەکی پێشخراوی جیابوونـەوەی چـەپ ــ راستی شۆڕشی فەرەنسایە. نـەبینینی ئـەو راستییەی کـە

لەمیانەی ئەم ڕەخنەیە سیستەمێکی ئەلتەرناتیڤی سەرمایەداری یاخود ئەو تێپەڕ بکات، بە تۆکمەیی ئاوا ناکرێت، دەبێ سەرەکیترین لایەنی بەهەڵەداچوون و کەموکوڕیان بێت. هەڵبەتە گرێدراوی ئەمەش هەڵوەستەیەکی بواری ئابووریانە، بەتەواوی هەڵنەسەنگاندنی ڕۆڵی ئایدیۆلۆژیا، لەژێر ناوی پرۆلیتاریا دووبارەکردنەوەی ڕوانگەی چینی دەسەڵاتدار سەبارەت بەشیکردنەوەی دەوڵەت، نزیك بوونەوەیەکی زۆر دواکەوتووانە لە ئایین، دیارینەکردنی ڕۆڵی تەواوی دەزگاکانی سەرخان بەگوێرەی واقیعی خۆیان، گوێ نەدان بەفاکتەری ئاکار، کەموکوڕیە سەرەکیەکانی دیکەن.

وەکو ئەنجام، پێویست بوو لەمیانەی چەمکێکی تیۆری یەکلاکەرەوە ئەوە ببینن کە جیهانی زەحمەتکێشان لەڕێگای ئاستێکی ئاکاری و باوەڕی وەها ئاوا ناکرێت کە زۆر لەوەی ڕاهیبەکانی سۆمەر دواکەوتووتر بێت کە دەوڵەتیان خوڵقاند، لەوەش گرنگتر، دەبوو بە ڕشتی جەخت لەسەرئەوە بکەنەوە کە لەمیانەی شێوازێکی کار و ژیانێکی کرداری تایبەت، کە وەکو بەرد وایە، تەنیا دەشێ شێوە مێژوویییەکانی کۆمەڵگا پشت ڕاست بکاتەوە. هەروەها شینەکردنەوەی دیموکراسی کەموکوڕیەکی مەزنیانە.

ئەوەی وەکو بۆچوونێکی تایبەتی خۆم دەمەوێ ئاماژەی پێبکەم ئەوەیە، کە چ ناوێکی لێ دەنرێت بالێی بنرێت، نەك تەنیا بەرامبەر سەرمایەداری، بەرامبەر تەواوی دەوڵەتگەرایی کلاسیکی کۆمەڵگای چینایەتی، بەبنەماگرتنی شیکردنەوەی کۆمەڵگای نیۆلیتیك ڕاستترە و سیستەمێکی ئایدیۆلۆژی دێنێتە ئاراوە و بەرەو جیهانی زەحمەتکێشانمان دەبات؛ ئەوەیە کە بەرامبەر بەو سیستەمەی شارستانییەت کە پشت بە کۆمەڵگای چینایەتی سۆمەر و تەواوی ئەو کۆمەڵگایانەی چینایەتی دەبەستێ کە دواتر هاتنەئاراوە، لەسەربنەمای ئەو زانست و تەکنۆلۆژیایە پێشکەوتووە پێکهاتەی کۆمەڵگای نیۆلیتیك کە لە هەموو چەرخەکانی دیکە زیاتر بەفوولایی یەکسانی و ئازادی تێدا بەرپێوەچووە، سەرلەنوێ لەبوارەکانی ئابووری، کۆمەڵایەتی، دیموکراتی ئایدیۆلۆژی شێوەی پێ بدرێت. کاتێك لەچوارچێوەی ئەم پێناسە سەرەکیەدا تایبەتمەندێتیەکانی کۆمەڵگای سۆسیالیستانە ڕیز بکەین، ئەوا ڕیزکردنێکی بەمجۆرە ناچارییە:

کۆمەڵگای سۆسیالیستی لەبواری ئایدیۆلۆژیدا پێشکەوتنی زانستیانە بەبنەما دەگرێت. بەکارهێنانی تەکنۆلۆژیا بەشێوەیەکی گونجاو لەگەڵ سروشت و یەکسانی و ئازادی کۆمەڵگا، هەم پرەنسیپێکی سەرەکی ئاکارە، هەم لەمیانەی ڕێساکانی یاسا، خستنە ژێر چاودێری دەکات بەمەرجێك. بەرامبەر بە تەکنۆلۆژیا لەجیاتی پرەنسیپی ئابووری، پرەنسیپی ئاکاری و ڕێکخستنەوەی یاسایی دەبێتە جێگای بایەخ. هیچ بەرژەوەندیەکی ئابووری لەو پرەنسیپە بەبایەختر و بەهادارتر نابێتە کە لەمیانەی توندوتیژی، هاوسەنگی کۆکی نێوان یەکسانی و ئازادی کۆمەڵگا لەگەڵ سروشت تێك نادات. گرنگ ئەوەیە زانست و تەکنۆلۆژیا لەنێو

جولرچێوەیەکدا بەجێبکرێت بەردەوام لەژێر خزمەتی بەرژەوەندییە ژیانیەکانی کۆمەڵگادا بێت. خاڵی بنەڕەتی ئەوەیە ئەو شێوە ئایدیۆلۆژیەی وەڵامی ئەم ئامانجە دەداتەوە، وەکو مەزنترین ئۆرگان، خۆبەخشانە بەپیرۆزی ڕێ نیشاندەری جیهانی هزر و ڕۆح بێت. لەم جولرچێوەیەدا ڕۆڵی ئاکار و ئایینی نوێ دەبینرێ. بەوڕادەیەی گرێدراوی ئەو ئامانجە بن، بەرێزەوە هەڵسوکەوت لەگەڵ بەهاکانی تەواوی هزر و باوەڕیەکان دەکرێت. ئەم شێوە ئایدیۆلۆژیە بەها و تایبەتمەندێتیەکی لەپێشینەی وەهای هەیە، بەیەکەوە نوێنەرایەتی هزری زانستی و ئاکاری ئازادی دەکات. ئازادی تاك و بەختەوەری کۆمەڵگا لەبارترین هەلومەرج لەم جولرچێوە ئایدیۆلۆژیەدا دەبینێ. بەگوزارەیەکی دیکە، ئاستی ئازادی کۆمەڵگا و ئازادی تاك، سەرکەوتووترین سەنتێزی خۆی لەژێر سایەی ئەم شێوە ئایدیۆلۆژیەدا ئەنجام دەدات.

هەڵوێستی ڕاست ئەوەیە، لەسەربنەمای ڕەخنەکردنی تەواوی ئەو سیستەمانەی یەکێك دەکەن بەقوربانی ئەوەی تر، سۆسیالیزمی بونیادنراو و کۆمەڵە بچووکەکانی کۆمۆنەشی تێدا بێت، یەکێتیەکی لەبار یاخود سەنتێزەکەی ئەنجامگیر ببێت.

کۆمەڵگای سۆسیالیستی لەڕێگای پشتبەستن بەتوندوتیژی و شێوە دیکتاتۆریەتی زەحمەتکێشان کێشەی بەلاوەنانی کۆمەڵگا و دەوڵەتی کۆن تاوتوێ ناکات. هەر جۆرە توندوتیژیەك لەسەر بنەمای بەدەستهێنانی هێز و چەوسانەوە و پەلامار بێت، جێگای خۆی لەنێو دیدگای ئایدیۆلۆژی زەحمەتکێشان ناگرێت. تەنانەت ئەوەی بەرامبەر دەوڵەتێك بێت کە قەبەترین توندوتیژی بەبنەما دەگرێت، ئەوا هەوڵدان بۆ ڕووخانی لەمیانەی توندوتیژی لەگەڵ ئەم سیستەمە ئایدیۆلۆژیەدا ناکۆکە. ئەم پرەنسیپە سەرەکییە بەو واتایە نایەت سیستەمی لەئارادایە بەبنەما بگرین، تەسلیمی ببین؛ بەپێچەوانەوە تێپەڕکردنی ئەو سیستەمە وەکو پرەنسیپێکی سەرەکی پەسند دەکات. ئەمە پرەنسیپی تێکۆشان بەرامبەر تەواوی چەمك و کردارەکانی دەوڵەت بەبنەما دەگرێت. بەڵام لەجیاتی شێوازی توندوتیژی و ڕووخان لەسەر بنەمای ڕێکخستنی توندوتیژیەوە، ئەوا بەرەنگاربوونەوە و پووچەڵکردنەوەی لەسەر بنەمای هەڵوەستە و جموجۆڵی بەرگری ڕەوا وەکو ستراتیژیەتێکی بنەڕەتی پەسند دەکات. وەکو پێویستییەکی یاسای گەردوونی بەرگری ڕەوا بەپرەنسیپێکی سەرەکی دادەنێت.

ئەگەر فشارەکانیان گەیشتبێتە ئاستێك مەبەستی لەنێوبردنی جەستەیی بێت، ئەگەر دان بەئاساییترین مافەکانی مرۆڤ دانەنێت، لەمیانەی توندوتیژی مافە کولتووریەکانی گەل سەرکوت بکات و نکوڵی لێبکات، ئەگەر ئەو هێزانەی بەبڕیار دەخوازن ئەم مافانەیان بەکار بێنن، سەرکوتیان بکات و بەتاوانباریان دابنێت، بەرامبەر بەو دەوڵەتەی یاساکانی پێشێل کردووە و پێداویستیەکانی یاسای گەردوونی جێبەجێ ناکات و توندوتیژی کاری ئەم دەوڵەتەیە، ئەو کاتە شێوەی چەکداریشی لەناودا بێت، بەگوێرەی تەواوی وردەکاریەکانی هونەری شەڕ و یەکینەکانی پاراستنی گەل، لەناوەوە و دەرەوە ئاستێکی کرداری بەرفراوانی

بەرگری رەوا پەیرەو دەکرێت. دەبێ ئەمە وەکو مافێکی دەستووری ببینرێ، ئەگەر ئەم مافە لەنێو دەستووردا نەبێت، تاوەکو بەجێکردنی ئەمە لەنێو دەستووردا درێژەدان بەتێکۆشان، پێویستییەکی ژیانی چەمکی بەرگری رەوایە. بەڵام ئەگەر ئەو دەوڵەتەی لەئارادایە، دەوڵەتی دەستووری و مافە سەرەکییەکانی مرۆڤ و پێوانەکانی سیاسەتی دیموکراتییانە بەبنەما بگرێت، ئەمە نارەوایە و بەهای ئایدیۆلۆژی خۆی لەدەستدەدات. هەرچەندە چەندین رێکخراوی شۆڕش و دەوڵەتی سۆسیالیستی بونیادنراو لەژێرناوی پاراستنی وڵات و بەرێوەبردنی شۆڕش لاف چەمکی بەرگری رەوایان لێدابێت، ئەوە سەلێنراوە کەسیستەمی توندوتیژی کە پەیرەویان کردووە پەیوەندی بەم چەمکەوە نەبووە، تەنانەت سیستەمێکی تۆقاندن بووە. پرەنسیپێکی دەست لێبەرنەدراوی بەرگری رەوا، لەگەڵ مۆدێلی دەوڵەتی تیرۆریستیدا سازش ناکات و رێکناکەوێت. لەوانەیە وەکو پێداویستییەکی تەکتیکی لەژێر هەموو هەلومەرجێکدا بەشێوازی چەکداری بەرامبەر دەوڵەتی تیرۆریستی شەڕ ناکات. بەڵام وەکو پرەنسیپێك رەتکردنەوەی تەسلیمیەت و سازشکاری مەرجە.

هەربۆیە پرەنسیپی گۆڕەپانی سیاسی، کۆمەڵگای دیموکراتی و سیاسەتی دیموکراتی و دەوڵەتی دیموکراتییانەیە. لێرەدا جیاوازی دەوڵەت لەگەڵ دەوڵەتی کلاسیکی ئاشکرایە. دەوڵەتی دیموکراتییانە؛ ئەو دەوڵەتەیە کە گرێدراوی چوارچێوەی یاسای گەردوونییە، بەردەوام کەناڵەکانی سیاسەتی دیموکراسییانەی تێدا هەیە، دەرفەت بەدامەزراوەکانی کۆمەڵگای دیموکراسییانە و هەموو جۆرە رێکخراوێکی کۆمەڵگای مەدەنی دەدات. کاتێك ئەم پێوانانە پەیرەو نەکات یاخود تەنگەتاوی بکات، تاوەکو ئەم پێوانانە رەچاو و پەیرەو دەکات، ئاشکرایە کە گرێدراو بەستراتیژیەتی بەرگری رەوا پێویست دەکات یەکینەکانی پاراستنی گەل و تەکتیکەکانی شەڕ رۆڵی خۆیان ببینن و ئەمەش وەکو پرەنسیپێکی دەست لێبەرنەدراوە. ئەگەر سەرنج بدرێ، ئاشکرایە ئەم چەمکە سیاسییە رووخاندنی دەوڵەت یاخود ئاواکردنی دەوڵەتێکی جودا بەبنەما ناگرێت. بەڵکو لەبواری گەوهەر و شێوەدا، ئامانج گەیاندنی دەوڵەتە بەدەوڵەتی یاسای دیموکراتییانە. لەجیاتی سنووری سیاسی، ئامانجی وەرچەرخاندنی ناوەرۆکەکەیەتی. ئەگەر رەوشی بەرگری رەوا لەئارادا نەبێت، ئەوا لەچوارچێوەی رێسای دیموکراتییانەدا سیاسەت دەستنیشان دەکرێت. ماف لەرێگای تێکۆشانی دیموکراسییانە بەدەست دەهێنرێ. لەحاڵەتێکدا نکوڵی لەگەلان بکرێت و رێسا دیموکراسیەکان ئاستەنگ بکرێن، بەرگری رەوا بەشێوازی چەکداریشەوە، ئەوا لەمیانەی هەموو شێوەیەکدا هەوڵی ئەنجام بەدەستهێنانی دەدات.

لێرەدا ئەوەی جێگای بایەخە، ئەوەیە کە سەبارەت بەهەر گۆڕەپان و بابەتێکی پێویستی پێی هەیە، بەمەبەستی جێبەجێکردنی ئەو پێویستیە یەکینەی وشیار و رێکخراوی کۆمەڵگا ئاوا بکرێت؛ واتە بۆ تێپەرکردنی دەوڵەت و کۆمەڵگای کلاسیك خوڵقاندنی گۆڕەپانی سێیەمە.

مەبەست لەگۆڕەپانی سێیەم، ئەو چەمك و پراكتیكە سەرەكییەیە كە نەلایەنگر و نەركابەری كۆمەڵگا و دەوڵەتی كۆنە و دەرفەت بەوە نادات بكەوێتە نێو ڕەوشێك بەردەوام لەمیانەی ململانێیەوە بنبەستبوون قووڵ بكاتەوە، ئەو وەرچەرخانەی بەهۆی كەم و كوڕییەكانیان ئەنجامیان نەدابوو، ئەو لەهەناوی هەردووكیان ئەنجامیدەدات و لەمیانەی ئاستی ڕێكخستن و وشیارییەوە ناكۆكییەكان چارەسەر دەكات. لەرابردوو یان لەمیانەی بۆچوون و كرداری فەرمی دەوڵەت كە كۆمەڵگای كۆنی دەڕووخاند وەرچەرخان ئەنجامدەدرا، یاخود لەمیانەی ئەو تیۆری و پراكتیكەوە هەوڵ دەدرا كۆمەڵگای نوێ ئاوابكرێت كە دەوڵەتی دەڕووخاند. هەرچی تیۆری و پراكتیكی گۆڕەپانی سێیەمە، لەژێر سایەی هاوسەنگی جیهانی كە لەئارادایە لە نەرمترین هەلومەرجەكانی دیموكراسیدا، لەرێگای خۆگەیاندنی بەئاستی وشیاری و ڕێكخراوەیی پێویست بەشێوەیەكی خوڵقێنەرانە بەئاواكردنی كۆمەڵگای نوێ بەبنەما دەگرێت. لەجیاتی پێكدادان و ڕووخان، لەهەناوی كۆنەكەدا ئەڵتەرناتیف دەخوڵقێنێ، هەوڵ دەدات لەنێو زەمینەی ئاشتی و بەیرەوی پلەبەپلە (تدریجی) وەرچەرخان ئەنجام بدات. كاتێك ڕێگای ئەمەش ئاستەنگ بكرێت، ئەوا لەمیانەی بەكارهێنانی شێوازی بەرگری ڕەوا، بەرەو بەكارهێنانی ئەم مافە ئەنجامگیر دەبێت.

لە بەرنامەرێژكردنی سیستەمی ئابووری و كۆمەلایەتیدا هاوسەنگیەكی گونجاو لەنێوان بەتاكبوون و بەكۆمەڵگابوون بەبنەما دەگرێت. نە لەپێناو تاك دەست لەكۆمەڵگا بەردەدات، نە لەپێناو كۆمەڵگاش دەست لەتاكی ئازاد بەردەدات. ئەوەی لەحاڵەتی تاكێتی و بەكۆمەڵدا بەرهەمهێنان دەست نیشان دەكات ئەم پێودانگە سەرەكییەیە. هەڵبەتە لەژێر هەموو هەلومەرجێكدا كۆكبوون لەگەڵ ژینگە لەپێشەوە دێت. لەنێو ئەم چوارچێوەیەدا دەرفەت بەموڵكایەتی تاك و كۆمەڵەیەكیش دەدرێت. پێویستییەكی دادوەرییە كە ڕەنجی خوڵقێنەر بەبەراوردكردن لەگەڵ ئەوانەی دیكە بەگوێرەی ڕێژەی خوڵقكاریەكەی بەشی خۆی وەربگرێت. نەهێشتنەوەی هیچ كەسێك بە بێكاری ئەركی ڕای گشتییە. لەمیانەی سیاسەتی گونجاو، لەبوارەكانی تەندروستی، پەروەردە، هونەر و وەرزشی تەفلیبوونی هەموو كەسێك بەگوێرەی ڕەنج و پێداویستیەكانی مەرجە.

دەشێ باس لەوە بكرێت ئەو كۆمەڵگا نوێیەی بەمجۆرە شێوە دەگرێت، بەڕێوەبەرایەتیەكی دەوڵەتی كلاسیكی تێپەڕكردووە. دەبێ ئەوەش بزانرێ كە زانست و تەكنۆلۆژیای لەئارادایە دەرفەت بەكۆمەڵگایەكی بەمجۆرە دەدات، ئەوەی پێویستە بەڕێوەبردن و ڕێكخستنی ئەم تواناكاریانەیە. لەرەوشێكی وەهادا ناوبردنی ئەو كارگێڕیەی دێتە ئاراوە بە خشتەكاری ڕۆڵ و كار گونجاوتر دەبێت. ئەمە مەكانیزمێكە وەكو دەستەی چاودێری كاروباری كۆمەڵگا وایە. پەیڕەوكردنی توندوتیژی، بڵاوەكردن، دەستێوەردان، بڵاوكردنەوەی بەرژەوەندیخوازی، بەدەستهێنانی هێز و خوڵقاندنی دەستە و گروپی جوداخواز نابێتە كاری ئەم كارگێڕیە.

لەلایەنێکیشدا دەتوانرێ وەکو ڕێکخستنێکی تەکنیکی پێناسەی بکەین، ناوبردنی ئەم کۆمەڵگایە بەسۆسیالیستی یاخود دیموکراتی وردەکاری مەسەلەکەیە. ئەوەی گرنگە، زاڵبوونی گەوهەرە. ئاشکرایە کە ئەمەش مەسەلەی قۆناخێکە تێپەڕکردنی جیاوازی و نایەکسانی کۆمەڵایەتی و فشار، لەمیانەی تێکۆشانی دیموکراسییانەی درێژخایەن سروشتییە. لەم بوارەدا بەخێرایی پێشکەوتنی کۆمەڵگاکانی ڕۆژئاوا، هۆکاری ڕاستەقینەی باڵابوونیانە: شارستانییەتی ڕۆژئاوا لەئەنجامی ئەو پەندو ئەزموونانەی لەپێکدادانەکانی سەدەی ۱۹ و ۲۰ ی وەرگرت لەئاستێکی بڵند کۆمەڵگای دیموکراسییانەی خوڵقاند و باڵابوونی خۆی بەسەر جیهاندا چەسپاند. کەموکوڕی هەیە. تێپەڕکردنی ناتۆ و ئاواکردنی سوپای پاراستنی یەکێتی ئەورووپا، وەکو ئامرازی بەرگری ڕەوا پتەوتری دەکات. بابەتەکانی نەتەوە، وڵاتپارێزی، هاووڵاتییەتی و ئەنتەرناسیۆنالیزم کە پێویستە شێوەبەندی ئایدیۆلۆژی ڕەنگدانەوەی خۆی بکاتە سەر پرۆگرام، لەمیانەی کۆکبوون لەگەڵ ئەم چوارچێوە سەرەکییەدا شیکردنەوەیان دەکرێت بەئامانج. لەژێر سایەی کارگێڕی هاوبەشی دەوڵەتێکی تەکنیکی، تاك یان هەمەڕەنگی نەتەوەیی و کولتووری هیچ کێشەیەك پێك ناهێنێ. کاتێك ڕێساکانی دەوڵەتی یاسای دیموکراسییانە پەیڕەو بکرێت، ئەو بابەتانەی کێشەیان لەگەڵ یەکتردا هەیە لەنێو ئاشتیدا چارەسەر دەکرێت. دوای ئەوەی نکوڵیکردن و فشار بەبنەما نەگیرا، ئیتر تێکۆشانی دیموکراسییانە ئەوەی دواتر دەست نیشان دەکات. تەنیا لەمیانەی ئەم تێکۆشانە یەکسانی و ئازادی بەدەست دەهێنرێ، برایەتی و دۆستایەتی ڕاستەقینە لەنێوان گەلان و ناسنامەکان دێنێتە ئاراوە.

وەکو گوزارشتی توانستێك ئەو شوێنەی گەلێك یاخود کولتوورێك تێیدا بژیت کاتێك بگوترێ ناوچەی ڕەسەن یاخود هەرێمی خۆیەتی، نابێتە جوداخوازی. بەڵام ئەمە ڕاستینەیەکی هاوچەرخە کە تەنانەت هەمان نەتەوە لەچەندین گۆڕەپاندا پلەی هاووڵاتییەتی هەیە، لەژێر هەمان کارگێڕیدا ئەم ڕەوشە لەنێوان سنووری هەر وڵات و نەتەوەیەکدا لەئارادایە. تەنیا کاتێك هاووڵاتییەکان لەوڵاتی خۆیاندا ئازادانە بژین، ئەو کاتە یەکێتی وڵات دەکەوێتە ژێر گەرەنتیەکی بەهێزەوە. زاراوەی وڵات و وڵاتپارێزی کە وەکو ناسنامەی باڵای چڤاتەکانە، تەنیا لەمیانەی زاراوەی ژیانی گروپە بچووکەکان و کولتوور و گەلان لەهەرێمە ڕەسەنەکەیان و شوێنی توانستە مەعنەویەکەیان دەوڵەمەند دەبێت. هاووڵاتییەتی گوزارشت لەو پەیوەندییە دەکات کە لەگەڵ دەوڵەتی تەکنیکدا هەیە. لەمیانەی توندوتیژییەوە گۆڕینی ناسنامە لەخۆوە ناگرێت. مرۆڤی هەر باوەڕێك، نەژادێك، ڕەگەزێك و نەتەوەیەك وەکو ئەندامی هەمان دەوڵەتی تەکنیك دەتوانێ ببێتە هاووڵاتی، بەڵام ناتوانرێ بەناچاری بکرێت بە ئەندامی نەتەوەیەك. ئەنتەرناسیۆنالیزم وەکو دابەشکردنی هاوبەشی ناسنامە کولتووری و نەتەوەییەکان، لەهەرچەرخێکدا پێشکەوتنی بەخۆوە دیوە. لەڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا وەکو

لایەنێکی ئەرێنی جیهانگیری، لە بەربلاوترین و چڕترین قۆناخی خۆیدا دەژیت. لەگوندی جیهاندا هاوبەشێتی لەتەواوی کێشە و پێشکەوتنەکاندا هەیە. هەربۆیە چارەسەریش پێویستی بەهەوڵی هاوبەش هەیە و تەواوی مرۆڤایەتیش بەیەکەوە پێشکەوتن و گۆڕانکارییە ئەرێنییەکانی لەنێو خۆیدا دابەش دەکات.

ج ـ شێوەگرتنی ئایدیۆلۆژی قۆناخی نوێ کە لەمیانەی هێڵە گشتییەکان هەوڵی ڕوونکردنەوەیماندا، هەروەها ڕەنگدانەوەی پرۆگرام، ڕێکخستن و بنەماکانی خەبات لەچوارچێوەی ئەم پرەنسیپانەدا، سەبارەت بە PKKی قۆناخی نوێش لەجێگای خۆیدایە و واتایەکی مەزن دەبەخشێ. هەوڵەکانی رەخنە و رەخنەدان و نوێبوونەوەی کە PKK تێیدا دەژیت لەمیانەی ئەم پرەنسیپانەوە زیندوو و بەگوڕتر دەبێت. ناشێ نکوڵیکردنێکی تەواوەتی لەڕابردوو بکرێتە جێگای باس. بەڵام ئاشکرایە کە پێویستە وەرچەرخانی گرنگ و ژیانی ئەنجام بدات. پێویست دەکات بەخۆداچوونەوە گشتگیر بێت و نوێبوونەوە قووڵ بێت و لەناویەك لەگەڵ پراکتیکدا واتادار بکرێت. شێوەگرتنی ئایدیۆلۆژی PKK ی قۆناخی داهاتوو چارەسەرکردنی کێشەکانی پرۆگرام لەپێش هەموو شتێکەوە دێت. شێوەگرتنی ئایدیۆلۆژی، ڕوانگەی سەبارەت بەجیهان و ئەگەر و شێمانە تیۆرییە سەرەکییەکان لەخۆوە دەگرێت.

لەپەرتووکی یەکەمدا هەوڵدرا لەدایکبوون و واتای هزری میتۆلۆژی و ئایینی و فەلسەفی و زانستی شیبکرێتەوە. لەجیاتی دووبارەکردنەوە، تەنیا بەیەکتریان گرێدەدەین. بەرلە هەموو شتێك پێویست دەکات پێشکەوتنی دیالەکتیکی هەر چوار شێوەی هزر بەبنەما بگیردرێت و دەرکی پێبکرێت. گەیشتن بەهزرێکی زانستیانە؛ بەرجەستەکردنی یاساکانی گۆڕانکاری کە لە وەرچەرخانی وزە ـ ماددەوە تاوەکو پەیوەندی بچووکترین پارچەی پێشکەوتن، لەسروشت بۆ گیانلەبەری، لەدانەوێڵە و ئاژەڵ و رەگەزی مرۆڤ تاوەکو دیاردەی کۆمەڵگا و بەدەستهێنانی دیدگایەك، بەو واتایە دێت کە لەم بوارەوە تەماشای تەواوی ڕووداوەکان دەکرێت و شرۆڤەکەی بەبنەما دەگیردرێت، ماتریالیزمی دیالەکتیکی و مێژوویی فۆرمیلەی ئەم تێڕوانینەیە. بەشێوەیەکی ڕاست بەرجەستەکردنی، سەبارەت بەشێوەگرتنێکی ئایدیۆلۆژی دروست ناچارییەکە. ئەوانەی خاوەنی تێڕوانینێکی بەمجۆرە نەبن، کاتێك ڕێبەرایەتی وەرچەرخانەکانی کۆمەڵگا بکەن مەترسی مەزن لەخۆوە دەگرێت. هەربۆیە ئەم شێوە گرتنە ئایدیۆلۆژییە چوارچێوەی تیۆری ئەو پارت و ڕێکخراوانە پێك دێنێت کە بانگەشەی وەرچەرخانێنی کۆمەڵگایان هەیە و زانست بەبنەما دەگرن. لەم ئاستەدا بەدەستهێنانی شێوەگرتنێکی ئایدیۆلۆژی لەلایەن PKK کە لەنێو وەرچەرخاندایە، مەرجێکی لەپێشینە و پێویستییەکە. لەم چوارچێوەیەشدا پێویستە رەخنە و رەخنەدانی تەواوی ئەم ڕەوشە هزرییانە بکرێت کە بەسەر پێکهاتەی کادیر و شێوازی ژیاندا زاڵە، هەروەها لەبەرجەستەکردنی شێوەگرتنێکی ئایدیۆلۆژی پتەو و تێڕوانینێکی تیۆری پەکلابۆوە سەربکەون و دەبێ ئەم

نزیکبوون و هەڵوەستە لەپێشینەش وەکو ئەرکێکی سەرەکی ببینرێت. ئاشکرایە کە شێوەگرتنی ئایدیۆلۆژیانە چەندەی لێهاتوو و تۆکمە بێت، بەو رادەیە پرۆگرام و پراکتیکیش راست دەبێت و پێشکەوتنێکی سەرکەوتووانە بەدیدێنێت.

ئەو خراپەکاریانەی پێکهاتەی هێزی گوندێتی ـــ دەرەبەگایەتی و وردە بۆرژوا رێگای لەپێش کردەوە بچووک ناکرێتەوە. ئەم هێز و پێکهاتەی کەسێتی بناخەی هەموو چەتەگەرێتی و گەندەڵی و راکردن و خیانەتێکە. پارتییەکی بەبڕیار کاتێك هەرسکردنی شێوەگرتنێکی ئایدیۆلۆژی تۆکمە بۆ پێکهاتەی کادیران و ئەندامەکانی بەبنەمابگرێت و سەرکەوتنی تێدا بەدەستهێنا، بەو رادەیە پرۆگرام و پراکتیکێکی راست دەخاتە ژێر گەرەنتیەوە. تاوەکو ئەوە ئەنجام نەدرێت، ئەوا ئەو تەگبیرانەی بەپلەی دووەم پێشدەخرێن ئەنجامی هەمیشەیی بەدەست ناهێنن. هەربۆیە پێویستە بەئەندازەی شکاندنی تێتوێتی، پەروەردەی ئایدیۆلۆژی هەرس بکرێت، بەتایبەتیش پێویستە کادیرانی ناوەندی "سەرکردایەتی" بەقووڵیی هەرسی بکەن. بەتەنیا نیاز باشی، دڵسۆزی، بوێری و فیداکاری تێرناکات و لەو رۆڵە گرنگانەی وەرچەرخانی کۆمەڵگا کە پێویستی بە هێزێکی مەزن و کەسێتی هەیە ناتوانن سەربکەون. ئەم خەسڵەتە بەهادارانە تەنیا لەمیانەی شێوەگرتنی ئایدیۆلۆژی بەهێز و تۆکمە دەتوانێ بەرەو ئەو سەرکەوتنە بچێت کە شایستەی خۆیەتی.

پرۆگرام و پراکتیك کێشەی گرنگ و بەپەلەن. پرۆگرامی قۆناخی دامەزراندنی PKK، هەروەکو کۆپییەکی ناوینی جیهان پێکهات. ناتوانرێ بگوترێ ئەم پرۆگرامە بەپێی پێویست پەیوەندیەکی خولقێنەرانە و نزیك بەراستی لەگەڵ تایبەتمەندێتیە بەرجەستەکانی سەردەم و مێژوو و هەنووکەیی و سیاسەتێکدا پێشخست کە توانای پراکتیزەکردنی هەبێت. ئاشکرایە کە لەئاستی دارێنراو و گشتیدا ماوەتەوە. هەروەکو دەزانرێ، تاڕادەیەکی مەزن جیهانی سالانی حەفتاکان گۆڕاوە. سۆسیالیزمی بونیادنراو هەڵوەشاوەتەوە. چەمکی شارستانییەتی دیموکراسییانە بالابووە. بەبێ ئەوەی ئەم گۆڕانکاریە مێژووییانە رەچاو بکرێت، ناشێ هیچ پرۆگرامێکی سیاسی بەرنامەرێژ بکرێت. ئەگەر پرۆگرامی بەمجۆرەش هەبێت، لەخەیاڵی بێ ناوەرۆك بەولاوە تێپەرناکات. دەبێ پرۆگرامی قۆناخی نوێ بەئەندازەی رەخنەدانی پرۆگرامی کۆن، شێوەگرتنی ئایدیۆلۆژی بەبنەما بگرێت؛ گرنگتریش ئەوەیە، دەبێ قورسایی بداتە سەر دەستنیشانکردنی ئەو ئامانجانەی واقیعین و پراکتیزە دەکرێن و بەدیدەهێنرێن. هەربۆیە ئەگەر کوردستان وەکو یەك وڵاتیش دیاری بکات، ئەوا پێویستە سنووری سیاسییەکانی وەکو کۆسپێك نەبینێ، بەڵکو وەکو پردێکی پەرینەوە هەڵیان سەنگێنێ و لەسەربنەمای یەکێتی دیموکراسییانە هەر پارچەیەك لەگەڵ ئەو وڵاتەی جێگای خۆی تێدا دەگرێت بەدوای یەکپارچەییدا بگەرێت و وەکو بژارێکی ستراتیژی جەختی لەسەر بکاتەوە. دەبێ یەکێتی دیموکراسییانە لەگەڵ هەر وڵاتێك، وەکو دروستترین رێگای برایەتی و دۆستایەتی و یەکێتی

نێوان وڵاتەکان ببینرێت. هەروەکو چۆن کوردستانێکی جودا کە لەنێو خۆیدا گۆشەگیر کراوە لەلایەنی ئایدیۆلۆژیدا راست نییە، ئەوا لەبواری پراکتیکیشدا راست نییە.

هەرلەنێستاوە گۆڕانکارییەکان و رەوشی لەناراداییە ئامازە بەوە دەکەن، هەم لەبواری ئایدیۆلۆژی هەم پراکتیکی کوردستان لەرێگای یەکێتییە دیموکراتییەکان بەشداری و رۆڵێکی مەزنی لە دیموکراتیزەکردن و یەکێتی رۆژهەڵاتی ناویندا دەبێت و دەگێرێت. هەربۆیە دروشمی سەرەکی " یەکێتی دیموکراتییانە لەگەڵ وڵاتانی دراوسێ، رۆژهەڵاتی ناوینی دیموکراتییانە"یە. دەشێ بەشێوەی " رۆژهەڵاتی ناوینی دیموکراتییانە، یەکێتی دیموکراتییانەی کوردستان" فۆرمیلە بکرێت. پێویستە قورسایی بخرێتە سەر پێشخستنی یەکێتی دیموکراتییانە لەگەڵ هەر وڵاتێك. هەروەکو لە نموونەی ئەورووپاشدا بینرا، ئەو جوداخوازییەی سەدان ساڵە خوێنی لەپێناو دەرژێنرێ، لەکۆتاییدا یەکێتییەکی فیدراڵیانە لەگەڵ خۆیدا دێنێ. واتە ئەگەر جیابوونەوەش رووبدات، دوای ئەمە چەمکی هەمەجۆری یەکێتی دەکەوێتە رۆژەڤ. تەنانەت بەهۆی چەندین فاکتەرەوە واقیعی کوردستان ناچارە هەڵوێستی یەکێتی دیموکراسییانە ببژێرێ. بەبەراوردکردنی لەگەڵ کوردستانێکی گۆشەگیرکراو، ئەو ئەرێنی و سوودەی یەکێتی دیموکراسییانەی سنووردار لەگەڵ خۆیدا دێنێ، بەهاکەی چەندین قات زیاترە لەبوارەکانی سیاسی، ستراتیژی، ئابووری، دیپلۆماسی و کولتووریدا، لەناوچەکە و تەواوی رۆژهەڵاتی ناویندا رۆڵی هاندانی و خێراکردنی دیموکراتیزەبوون و دۆستایەتی دەبینێ.

بابەتێکی دیکەی گرنگ ئەوەیە کە پرۆگرام، کۆمەڵگای دیموکراتییانە بەبنەما بگرێت. بەرامبەر بەدەوڵەت و کۆمەڵگای کۆن لەجیاتی نزیکبوونەوەیەك کە لەمیانەی پێکدادان و فشارەوە چارەسەری بسەپێنێ، پێوستە لەمیانەی ئاواکردنی ئەلتەرناتیف و بەبنەماگرتنی تیۆری و پراکتیکی گۆڕەپانی سێیەم چارەسەری بەدیبێنێ.

پێویستە ئەو باس و ئامازانەی سەبارەت بەبوارەکانی ئابووری و کۆمەڵایەتی لەبەشە پەیوەندیدارەکاندا ئەنجام درا بەرچاو بگیردرێت. پێویستە ئازادی رادەربرین لەبواری کولتووری و پەروەردە بەزمانی کوردی وەکو سەرەکیترین بابەت جێگای خۆی تێدا بگرێت. داخوازییەکانی راگەیاندن و بڵاوکردنەوە و هونەر بەزمانی دایك، داواکارییەکی دەست لێبەرنەدراون.

پێویستە بناخەی هاوکاری دیموکراسییانە لەنێو پارچەکان دابنرێت. دەبێ لەنێو رۆحی یەکێتی دیموکراسییانەدا لەگەڵ تەواوی وڵاتانی دراوسێدا نزیکبوونەوەیەکی دۆستانە بەبناخە دابنرێت.

پێویستە بەشێوەیەکی بیروکراسیانە و قاڵب نزیکی مەسەلەی رێکخستن نەبنەوە. دەبێ سیاسەتی رێکخستن بەگوێرەی پێویستی و رۆڵەکەی بەبنەما بگیردرێت. چەمکی رێکخستنی

نمایشکردن بناخەی بیروکراسیەتە، مسۆگەر پاشماوەیەکی چەمکی دەوڵەت و کۆمەڵگای چینی کلاسیکە. پێویستە لەو چەمکەی رێکخستن و پراکتیزەکردن دوور بن کە بەکاریگەر نییە و رۆڵ و چوارچێوە و ماوەکەی ناشکرا نییە. چەمکی رێکخستن بە ئەندازەی رۆڵ و کاریگەریەکەی زیاتر پێشکەوتن بەدیدێنێت. چەمکی گشتی رێکخستنی بیروکراسیانە، چەمکی رێکخستنی فرە لایەنی و بەرهەمەکەی بەربەست دەکات. پێویستە چەمکێکی دیموکراسییانەی فرەلایەنی بەتەواوی پەیرەو بکرێت. بابەتێکی دیکە لەم لایەنەوە بایەخدار دەبێت، ئەرکی پێگەیاندنی ئەو کادیر و کارگێڕیەیە کە بۆ ئەم جۆرە رێکخراوانە پێویستە. گرێدراو بەبنەماکانی کارگێڕی هاوچەرخ سیاسەتێك سەبارەت بە کادیران مەرجە. لەرەوشێکی پێچەوانەدا ئەمانە رێگا لەپێش نەخۆشی دەسەڵات دەکەنەوە، زیاتر نەخۆشی بیروکراسیەت بڵاو دەکەنەوە. نەخۆشی دەسەڵات نەخۆشیەکی کۆمەڵگای چینایەتیە و تێپەڕکردنی مەرجە. بەرێوەبەرایەتیەکانی رێکخراو نەك بەگوێرەی دەسەڵات، بەڵکو بەگوێرەی توانست و سەرکەوتن دیار دەکرێن. بەگوێرەی پێویست ئەندامی بۆ دیاری دەکرێت.

لەم چوارچێوەیەشدا مەترسیدارترین نەخۆشی چەمکی چەپرەوێتی کلاسیکە، کە رێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی وەکو کارێکی ئیمپریالیزم دەبینێ، خۆی وەکو کادیرێکی شۆڕشگێڕ و پیرۆزی سۆسیالیستی دەبینێ و لەوەبەولاوە بە هیچ خەباتێکی دیکە رازی نییە. پێویستە لەم هزرە رزگاریان بێت کە بەتەواوی ئیفلاسی کردووە و کاتێك دەرفەت برەخسێ بەباشترین شێوە خۆی بۆ سەرمایەداری هەراج دەکات. پێویستە زەمینە بۆ ئەم جۆرە کەسایەتیانە نەرەخسێنرێ. پێوەندگی بەهادارترین رەنجی سۆسیالیستانە، خەباتی کۆمەڵگای دیموکراتییانەیە کە پێشیخستووە، رێکخستن و پراکتیکەکەیەتی. بەکارهێنانی هەموو کەسێك لەنێو رێکخستنێکدا کە بتوانێ خۆی و دەوروبەرەکەی پێش بخات و بەرهەمهێن بێت، پێویستە وەکو ئەرکێکی گەوهەری کارگێڕی رێکخراو ببینرێت. پێویستە ئەوە وەکو ئاکارێکی رێکخراو پەسند بکرێت کە لەرێکخستنێکی ئابووری سادەوە تاوەکو دەگاتە رێکخستنێکی ئایدیۆلۆژی باڵا هەموویان واتایەکی شکۆداریان هەیە.

دەبێ باش بزانرێ کاتێك هەوڵدەدرێ سەرلەنوێ رێبازی چالاکی دیار بکرێت، ئەوا یەبێ ئەوەی رەخنەدانێکی دروستی رابردوو بکرێت و پەند و وانەی پێویست هەڵنەهێنجرێ پێشکەوتن بەدینایەت.

چەمکی شەڕی رزگاری نەتەوەیی ۱۹۷۰ کان، بۆ ئەو قۆناخە واتایەکی هەبوو. لەو قۆناخەی کە سۆسیالیزمی بونیادنراو و نەتەوەپەرستی زاڵ بوون، داکۆکی نەکردن لەسەر ئەم رێچکەیە، لەگەڵ خیانەتدا هاوتا دەبینرا. ئەو رێچکەیەی کە PKK ش پەنای بۆ برد، سەرباری ئەوەی چەتەگەرێتی لەناودا پێشکەوت و پووچەڵی کردەوە، رۆڵێکی ئەرێنیشی بینیوە. ئەگەر مەیلەکانی چەتەگەرێتی نەبووایە، تواناکاریەکانی سەرکەوتن زیاتر دەبوو. بەڵام لەو

ـوونانەی بەتەواوەتیش به سەرکەوتن گەیشتووە دیارە کە لە گەوهەری خۆیدا کۆمەڵگایـەکی ـموکراتی یاخود سۆسیالیستیانە ناهێنێتـە ئاراوە. لەڕاستیدا ئـەو چەمکـەی توندوتیـژی کـە ـێویست بوو لەسەرەتاوە PKK پەسندی بکات، دەبووایە نەکەوێتـە دەرەوەی چـەمکی بـەرگری ـەوا. سـەرەڕای ئـەوەی لەگەوهـەری خۆیـدا وەها بـوو، بـەڵام فۆرمیلەنـەکردنی بەشـێوەیەکی ـستە پێویستە وەکو بابەتێکی رەخنەدانی دروست ببینین. ئەگەر سەرنج بدرێ دەبینـرێ کـە، ـەرکەوتنـە شاخ، پەنابردنـە بەرچەك، تەنانـەت خۆپاراسـتن بەرامبـەر پـەلامارەکانی ئاغـا و ـکیستەکان، هەموویان دەکەونە نێو چوارچێوەی بەرگری گەوهەری یاخود چـەمکی بـەرگری ـەوا. لەمیانەی وەرچەرخاندنی ئـەم مافـە بـۆ هێرش و یـاخیبوون، لـەکۆتاییدا رۆڵـی چـەکێك ـەبینیێ کـە لـەخۆی دەدات. هـەرواش روویـدا. ئـەو هەڵسەنگاندنە بەرفراوانـەی لەسـەربنەمای ـەخنەدان بکرێت، ئەوە نیشاندەدات، ئەگەر PKK تەواوی هێزەکانی خۆی لـە جوگرافیایـەکی گونجاو بەگوێرەی هەلومەرجەکانی جەماوەر و لۆژستیك هەڵسەگاندبوایە، بەتایبەتیش ئـەوەی بەبنەما گرتبووایە کە لـە ئـەوەدەکان دەوڵەت دانـی بـە ریالیتـەی کـورد دانـا، تەنانـەت ئەگەر متمانەشی پێ نەکردبایە، لەمیانەی ئامادەکاریەکی دیـارکراودا، دیسان بـۆ ئـەوەی شانسێك بـۆ ئاشـتی بڕەخسێ، ئاگربەسـتێکی ئـەوتۆی رابگەیاندبوایـە کـە متمانـەی پێبکرێـت، ئـەوا راستینەیەکە و ناتوانرێ رەتبکرێتەوە کە تواناکاریەکانی چارەسەری زیاتر دەبوو.

لەوانەیە لەکاتی خۆیدا نەبینینی پێویستی رێککەوتن، بۆ شۆڕشـگێڕیەتیکی تیـژ سـەروەری بێت، بەڵام کاتێك لەگەڵ راستینەکان بەراورد بکرێـت، ئاشکرایە کە هەڵوێستێکە پێش خۆی نابینێت و پووچە. زۆر جار ئەم جۆرە هەڵانە ئەنجام دراون.

پێویسـتە ئـەوەش ببیـنرێ کـە نەتەوەپەرسـتەکان و نەتەوەپەرسـتە سـەرەتاییەکان لـە پەیوەندیەکانیان لەگەڵ دەوڵەتـەکانی ئـەوروپا و رۆژهـەڵاتی نـاوین، زۆرجـار کەوتوونەتـە نێو هەمان هەڵوێستی هەڵەوە. پێویست بوو بەهەڵسوکەوتێکی دڵنزمانە ( ) و بینینی راستییەکان، هونەری رێککەوتن پەیڕەو بکرێت. پێویستە باش بزانـرێ کە نـابێ ئەمـە لەگـەڵ تەسلیمیەتدا تێکەڵ بکرێت. کەسایەتی کورد یاخود بەشێوەیەکی گشتی ئەو کەسایەتیەی خۆی بەشۆڕشگێر دادەنێ، خۆی لەدووڕیانی؛ یان تـاوەکو دوایـی بـەرخودان یـان تەسـلیمیەت، رزگـار نەکردووە. تەنانەت پێویست بـوو ببیـنرێ کـە ژیـان تـەنیا رەش و سـپی نییـە، بـەدڵی خۆمـان رەنگێکـی گونجـاو و جوانمـان لـەناو رەنگـەکانی دیکـە هەڵبژاردایـە. ئـەم توانستە رەچاونـەکرا. کەسایەتی دۆگمای سەدان ساڵ دەرفەتی بە بینینی هەمەرەنگی ژیان نەدا. قۆناخی فیلمی رەش و سپی تێپەڕنەکرد.

بەڵام جەوتی یاخود هەڵەی سەرەکی پراکتیکی PKK لەبواری رێبازی شەڕ ـ چالاکیدا، بەو ئەندازەیـەی بـەقووڵایی رێبـازی بـەرگری رەوای نـەکرد بەتیۆریـەك، بـە رۆحـی بـێ بەرپرسیاریەتیەك کە ئـەقڵ پەسندی ناکات، پراکتیزەکردنەکەی بۆ چەمك و بێ ویژدانـی

چەتەگەریتی بەجێهێشت. ئەگەر تاراددیەك ئەو بابەتانە بەهەند وەربگیرابایە کە شەهید عەگید سەرنجی بۆ ڕاکێشابوو، لەوانەیە دەرفەت بەچەمکی چەتەکان نەدرابووایە، دەتوانرا ڕێگا لەو گەندەڵییە بگیردرێت کە لەهیچ چەمکێکی شەڕ نەدەچوو. بەڵام کاتێك بەرپرسیارێتی جێبەجێ نەکرا، ئەوا ئەو قۆناخە مێردەزمەی کە دەزانرێت و نەدەبووایە ببێت چەندە خۆی دەسەپاند ئەوەندەش ئەنجامی بەدەستدەهێنا، چەندە ئەنجامیشی بەدەستدەهێنا ئەوەندەیتر خۆی دەسەپاند. سەپاندنی گەیاندە خاڵێك تەنانەت کوشتنی بەهادارترین هەڤاڵانی کرد بەچەمکی سەرۆکایەتی. لەڕاستیدا لەیستۆکی هەزاران ساڵەی خیانەتی چینی ژوور پەیڕەو دەکرا. بەهەرحاڵ بۆ خۆ لەناوبردن ڕێگایەکی لەمە مەترسیدارتر نەدەدۆزرایەوە. ئەو شوێنەی ئەم چەمکەی لێبوایە کە تەنانەت غەریزە سەرەتاییەکانی لەمیانەی کوشتن چارەسەر دەکرد، ئەوە لەولاوە بمێنێ کە چاوەڕوانی ئازادی و سەرکەوتنی لێناکرێت، ئاشکرایە تەنانەت مرۆڤایەتیش ڕێگای تێپەڕبوونی تێدا نابینێت. لەوانەیە ئاژاوەچی لەئارادا هەبووبێت. بەڵام ئاشکرایە زیاتر سەرچاوەی خۆی لەکەسایەتی نیو ـ دەرەبەگ، وردە بۆرژوا و نەزانی گوندێتی و بێ بەرپرسیارێتی بەڕێوەبەرایەتی و فەرماندارێتی و ڕێکخراو دەگرێت کە ئەمانەی نەخستە ژێر کۆنترۆڵەوە.

ئەم ڕەوشە تەواوی ئەو تواناکاریانەی سەرکەوتنی لەگەڵ زەویدا تەخت کرد، کە دەوڵەت و تەنانەت ناوەندە پەیوەندیدارەکانی جیهانیش پەسندیان کردبوو. مەسەلەی ئایا لەئاستی ناودا پێویستە کامانە بەرپرسیار ببینرێن، واتای کرداری خۆی لەدەستداوە. بەڵام ئاشکرایە کە ئەو پەندانەی پێویستە لێی وەربگیردرێت جۆر و چۆنایەتیەکی ئەوتۆیان هەیە هەرگیز لەبیر ناکرێت و بەردەوام دڵی مرۆڤ دەهەژێنێ: ئەم پەند و وانانە لەئاستی تراژیدیایەکدان، تەنانەت بۆ ساتێکیش لەبیر ناکرێت. ئەگەر ئەم بەڵایە ئاستەنگ کرابایە، ئەگەر ئەو ئاگربەستە سەرکەوتووانە پراکتیزە کرابایە کە سەرۆك کۆماری ئەوکاتە ئۆزالیش ڕێگای لەپێش کردەوە، ئەوا دەشیا نەکەوینە نێو بەئازارترین قۆناخ و لەوانەیە قۆناخی ڕێککەوتن پراکتیزە کرابایە. بەڵام کینی کەسێتی و ئەو بەرژەوەندیانەی قازانجی ئابووری بەرزی دەکردەوە، باڵاتر بینرا. دیسان لەم ڕەوشەشدا دەرفەتی بەرگری ڕەوا هەڵنەسەنگێنرا. توندوتیژی بێ سنوور، لەهەردوو لایەندا گەیشتە ئاست و بواری هەرە بەئێش و تەنانەت یاساکانی شەڕیش بێ واتا ببوو. دەرفەتێکی هەرە بچووك، لەمیانەی کوشتنەوە وەڵامی دەدرایەوە.

من خۆم وەکو سەرۆکایەتی، لەگەڵ دەستپێکردنی ئەم قۆناخە بۆ لەسەرپێ مانەوە لەخەباتێکی بێ پەروا بەولاوە هیچ ڕێگایەکی دیکەم نەدەبینی. لەگەڵ ئەوەی هەوڵەکانی قۆناخی ٢٨ی شوبات بۆ ئاسایی کردنەوەی ڕەوش دەنگدانەوەی هەبوو، بەڵام درەنگ کەوت. چەندین هێزی ناوخۆ و دەرەوە بەرژەوەندیەکانی خۆیان بەزەمینەی توندوتیژی گوێرانەوە

گرێدابوو. سەرباری ئەوەی ئومێد دەکرا، بەڵام لەناو PKK، لەپراکتیکدا توانستێك دەرنەکەوت بتوانێ ئەم قۆناخە بەلاوە بنێت. بەتایبەتیش گروپ گروپ ناردنی کچ و کوڕی لاو بۆ لەنێوچوون، هێشتنەوەیان ڕووبەڕووی مردن، وەکو هەڵوێستێك خۆی دەسەپاند کە نابێت لێی بیووردرێت. سەرەڕای ئەوەش لێپرسینەوەی پێویست نەدەکرا و ڕێگای لێ نەدەگیرا. لە ڕاستییدا هەر لە سەرەتاوە ئەو ڕێککەوتنە تێکدرابوو کە لەمیانەی بەرگری ڕەوا و کەمترین زیان پەیدەدەهات. ئەوە سەرەکیترین هۆکاری ناوخۆ بوو کە کۆتایی بەسەرۆکایەتی هێنا. چوون بۆ شاخ خەونێکی چل ساڵە بوو. بەڵام ئەمەش بەواتای مردنی هەزاران گەنج دەهات، کە هەقی ئێمە نەبوو. بەرپرسیارێتی ئەخلاقیم ئەم هەقەی پێ نەدەدام و خەونە مێژووییەکەی خۆم بەدینەهێنا. هەر لەمێژبوو چەتەگەرێتی ئەم ڕێگایەی بەربەست کردبوو. بەمجۆرەش ڕووڕوویی خۆیان نیشاندەدا. بەجۆرێك ئەوەیان نیشاندەدا کە تۆڵەیان سەندەوە. کاتێك هەمدین بەنهێنی و بەئاشکرا ئەمەی لەدانیشتنەکانی دادگا ڕاگەیاند، یەکێکی دیکە کۆنترین هاوڕێی منداڵیم دەکوژێت، یەکێکیتریان دەڵێ "بەدڵنەرمییەوە سەرۆکایەتی دەکوژین"، ئەوەیتریش ئەو گەنجانەی وەکو شاخ خۆڕاگر بوون، گوللە بارانیان دەکات.

تا چ ڕادەیەك بەوردەکارییانەوە پاڵاوتنی ئەم پراکتیکە سەبارەت بەهەر کەس بکرێت، بەو ئەندازەیە ڕاستییەکان دەبینرێت. لەبەرئەوەی تەواوی پێکهاتەی ڕێکخراو بەشێوەیەکی بابەتی کەوتۆتە ناو ئەم تاوانە لەبەرپرسیارێتی ڕزگاری نابێت و تەنانەت ڕەخنەدانێکی دروست لەسادەترین ئەندامیش دەخوازرێت.

بێگومان ڕۆڵێکی دیاری ئەو هێزەی لەماوەی ۱۹۹۳ ـ ۱۹۹٦ بەسەر دەوڵەتدا زاڵ بوو، لەو گۆڕانکاریانەدا هەبوو کە بەمجۆرە لە کۆنترۆڵ دەرکەوتبوو. ئەگەر بەشێوەیەکی قووڵ مردنی بەگومانی ئۆزال و ئەشرەف بەدلیسی فەرماندەی جەندرمە و خستنەگەڕی حزب اللە، شیکرابایەوە، دەتوانرا تەگبیری باشتر پێشبخرێت. گووتەی سەرۆك وەزیرانی ئەوکاتە " لیستە لەگیرفانمە، ئەوەی پێویست ئەنجام دەدرێت"، دەستگیرکردنی ئەندام پەرلەمانەکانی پارتی ڕەنجی دیموکراتی DEP، ڤاڵاکردنی نزیکەی ٤٠٠٠ گوند، کوشتنی هەزاران کەسی بێتاوان و بێ چەك، کە هیچ پەیوەندییەکیان لەگەڵ ڕێکخستن نییە، دڵسۆزن، دیموکراتن و دەیانخواست بە ئاسوودەیی لە ماڵی خۆیان دابنیشن، ئابلۆقەی ئابووری، لەهەموو شوێنێك ئەنجامدانی کێوماڵی بەرفراوان، نیشانی دەدا کە لەئاستی دەوڵەتیشدا کارەکان لەژێر کۆنترۆڵ دەرکەوتبوون. تاریکترین و بێ بەزەییانەترین قۆناخێکی مێژوو بەمجۆرە پیادە دەکرا. کێوماڵەکانی لەدوای ۱۹۹٦ سەبارەت بە سوسورلوك و حزب اللە ئەنجامدران، زۆربە ڕووکەشی ماونەتەوە. تاوەکو ئەو کەس و لایەنانەی تاوانی یاسایی زۆر قورسیان ئەنجامداوە ئاشکرا نەکرێن و دادگایی نەکرێن، ناشێ دەوڵەت خۆی بەبێ تاوان دەربخات. مسۆگەر پێویستە ئەم قۆناخە بە دادگایی کردنێکی بەرفراوان تێپەڕ بکرێت. ئەو هەستیارییەی ڕۆژئاوا سەبارەت بە میلۆسۆڤیچ نیشانیدا تاوەکو

بەرامبەر بەرپرسیارانی ئەو قۆناخەی دەوڵەتی تورك نیشانی نەدات، هەرگیز لەدوورویی و هاوبەشێتی کردنی تاوان رزگاری نابێت.

لەلایەنی دەوڵەت قۆناخی ۲۸ی شوبات سەبارەت بەوەستاندنی ئەم سەرشێتیە، ئەگەر سنووردارێش بێ واتایەکی ئەرێنیٚ هەبوو. ئەو زانیاریانەی بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بۆیان دەناردین لەئاستێکی واقیعی و هەستکردن بەبەرپرسیارێتی دابوو. هەرچەندە ئاگربەستی یەکلایەنە گەرەنتییەکی ئەوتۆی نییە، بەلام تەگبیرێکی راست بۆ وەستاندنی ئەو سەرشێتیە هەبوو. بەلام پێویست بوو لەمیانەی هەنگاوی بەرامبەر، خولقێنەرانە پاڵپشتی بکرێت. سەرکەوتنێکی ئەوتۆ لەمەشدا بەدینەهات. کەوتنە گەری پیلانگێری ١٥ی شوبات، بەتەواوی رەوشەکەی گۆڕی. ئیتر ئاشکراکردنی هۆکارە راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ، دەرەکی و ناوخۆییەکانی پیلانگێری و شوێن و چۆنیەتی پێشکەوتنی ئامانج و ئەنجامەکانی و بەگوێرەی ئەمەش ئەنجامدانی رێکخستنەوەیەکی نویٚ، ناچاری بوو. دەبووایە قۆناخی ئیمراڵی لەهەموو لایەنێکەوە ئەم واقیعە، واتە ئەم پیلانگێرییە، ئاشکرا بکات و بێکاریگەرکردنی بکات بەئامانج، چالاکی تۆڵەسەندنەوە و گیانبازی کە ئەنجامی بەدەست نەدەهێنا هەڵوێستێك بوو پیلانگێران چاوەڕوانیان دەکرد، راستیش نەدەبوو. بەلام هەڵوێستی دەوڵەت لەمەدا رۆڵێکی یەکلاکەرەوەی دەبینی. هەرچەندە ئەم قۆناخە پڕ بوو لەئەگەری نادیار و تەواو مەزەندە نەکرێت کە ئەنجام بەرەو کام ئاقار دەچێت، لەو باوەڕەدام ئەو خاڵەی پێی گەیشتووین، راسترە. زۆرینەی خەڵك و PKK پشتگیری لەو هەڵوێستە کردووە کە سەرۆکایەتی نیشانیداوە. ئەم هەڵوێستە تاوانەکانی وەستاندووە، رێگای لە پێش کۆتاییهێنان بە چەمکی چالاکی تاوانباری شاخ کردەوە، دەرفەتی بۆ هەنگاونان بەرەو دەوڵەتی یاسا رەخساندووە. ئەگەر بەشێوەیەکی سنووردارێش بێت زەمینەی بۆ کاری دیموکراسییانە کردەوە. هەربۆیە پێویستە ئەم هەڵوێستە بچووك نەکرێتەوە.

هەرچەندە چەند کەسێکی سنووردارێش بن، بەلام توێژێك کە بەهەمرزانی خۆی لەسەر پشتی PKK و گەل مەزن کردووە، پشتی خۆی داوەتە ئەوروپا و ئەتەوەپەرستی سەرەتایی بۆرژوا، کە تەواوی ئامانجیان رەخساندنی دەرفەت و زەمینەیە بۆ غەریزەکانیان، بەرامبەر بەم هەڵوێستە هەڵوێستیان نیشاندا و هەندیٚ ئەخشەی راکردنیان دانا و پەیڕەویان کرد. بەتایبەتیش هەوڵدراوە لەژێر کۆنترۆڵی ئەڵمانیا و گرێدراو بەئامانجە مێژووییەکانی وەکو رەوتێکی سیاسی لەنێو کوردان و پارتێکی رێکخراوی ئاژاوەچێتی و تێکدەر شێوەی پێبدرێت. بەهۆی هاوکاری بەرفراوانی پارە و پەیوەندییەکانی ژیانی ئاسودە و راگەیاندن و هەواڵگری، پێویستە ئەم مەترسییە بچووك نەبینرێت. بەشێکی گرنگی دیکەی پیلانگێری، هەوڵەکانی چەندین دەوڵەتە کە هاوشێوەی ئەوە دەخوازن PKKی دروستکراوی تایبەت بەخۆیان بخولقێنن و بخەنەگەڕ.

ئەم رەوشانە، هەرچەندە دەکەوێتە دەرەوەی بابەت و لەبەشەکانی دواتردا بەبەرفراوانی روون دەکرێتەوە، ئەوا وەرچەرخانێکی خێرای لەرێبازی چالاکی و رێکخستن و پرۆگرام و ئایدیۆلۆژیای PKK ی دەکرد بەناچاریەك. بێگومان لەنێو هەوڵە هەمەلایەنەکانی وەرچەرخاندا گرنگترینیان، پێویست بوو بەشێوەیەکی قووڵ PKK بۆ رێبازی بەرگری رەوا رەبکێشرێت، سیستەمی پاراستنی گەوهەری رێکبخات و وەرچەرخانەکانی دیکە قووڵ بکاتەوە.

ئەو هەڵوێستەی PKK وەکو وەڵامێك بۆ بانگەوازی سەرۆکایەتی پیادەی کرد پاشەکشێی بەهێزەکان کرد و پەیرەوکردنی بەرگری رەوا، پێویستە وەکو گۆڕانکاریەکی بچووك و تەکتیکی نەبینرێت. ئەم هەڵوێستە تاوەکو دوایی واتایەکی ستراتیژی هەیە و پێویستییەکی وەرچەرخانی پرۆگرام و ئایدیۆلۆژی و تەکتیکییە. هەروەکو چۆن گروپەکانی چەپی تورك و ئەو چەتە خائینانەی رایانکرد و گروپە نەتەوە پەرستە سەرەتاییەکان و وردە بۆرژواکان بانگەشەی بۆ دەکەن، ئەم هەڵوێستە نە تەسلیمیەتە و نەرێککەوتنێکە لەگەڵ فەرمانداریێتی گشتی. هەروەکو چەندین جار جەختم لەسەر کردۆتەوە، ئەگەر رێککەوتن بووایە، ئەوە وەکو بەرپرسیارێتیەکی مێژوویی شەرفمەندانە رامدەگەیاند. نابێ هیچ کەسێك ئومێدەکانی بەم بانگەشە پۆزەتیف یان نێگەتیڤانە گرێبدات. نزیکبوونەوەیەکی بەمجۆرە بەرەو ئامانجی مەترسیدار ئاراستە دەکرێت. بەڵام لەساڵی ١٩٩٨ دا کاتێك لەرۆژهەڵاتی ناوین بووم بەردەوام دەمخواست ئەو ئاگربەستەی پێشمان خستبوو جێگیرتری بکەین و جەختمان لەسەر ئەوە کردەوە پێویستە سوپای تورکیاش بەبەرپرسیارێتی و هەستیاریەوە هەڵوەستە بکات. تاج رادەیەك پێداویستیەکانی جێبەجێ دەکەن، کارێکە خۆیان دەیزانن. لەبەرئەوەی ئەم مەسەلەیە رێگای لەپێش گەلێك بانگەشەی بێ بنگە و چەواشەکاری کردەوە، روونکردنەوەیەکی بەمجۆرەم بەپێویست زانی.

سیستەمی نوێی بەرگری رەوا، هەردوو تەنیشتی گۆڕەپانی بۆتان، بادینان، زاگرۆس دەگرێتەوە، ئەگەر زۆر ناچاری نەبێت بڵاوبوونەوە لەگۆڕەپانەکانی دیکە بەبنەما ناگرێت، لەم گۆڕەپانەدا هەموو جۆرە تەگبیرێکی بەرگری رەوا رێکدەخات، پشت بەسیستەمێکی پلاننامە و خەبات دەبەستێت کە لەم چوارچێوەیەدا چەمکی چالاکی و یەکینەکانی جێگیرکردووە. ئەم رێکخستنە پەیوەستبوون بەئامانجی "ئاشتی و چارەسەری دیموکراسییانە" بەبنەما دەگرێت. هەروەها سەبارەت بەدەوڵەتە دەسەڵاتدارەکانی ناوچەکە، واتە ئێراق و تورکیا و ئێران و سوریا، ئومێد دەکات لەژێر ناوی ئاشتی و چارەسەری دیموکراسییانە دیالۆگ بەبنەما بگرن و پێشیبخەن، ئەو دانوستاندنانەی کە هەیە بەپرەنسیپ بێت و بەئاستێك بگات، کە لەم لایەنەوە ئامانجی بەدیهێنانی چارەسەری بێت. روونکردنەوەیەکی بەرفراوانی ئەم هەڵوێستە ستراتیژییە سەبارەت بە رێبازی ئایدیۆلۆژی و پرۆگرامی نوێ و خەباتی رێکخراو بایەخدارە، ئەم روونکردنەوەیە لەبەشەکانی دیکەشدا زیاتر باس دەکەین. هەروەها بۆ ئەوەی چالاکبوونێکی

کرداری بۆ ئەو قۆناخەی رەخنەدان بەدیبێت، ئەم رێکخستنە ستراتیژیە واتایەکی ژیانی هەیە. لەبەرئەوەی ئەم رێکخستنە ئەوە دەخاتەڕوو، تا چ رادەیەك PKK لەوەرچەرخاندا بەبڕیارە، واقیعییە و پێویستە سەرکەوتن بەدەست بێنێ، هەربۆیە گرنگیەکی ژیانی هەیە.

هەروەها ئەم رێکخستنە نوێیە گونجاوترین زەمینە دەرەخسێنێ بۆ ئەوەی بۆ دەوڵەتە دراوسێکان بسەلمێنن کە تا چ رادەیەك نیازیان پاکە، بۆ ئەوەی بەبێ دەستکاریکردنی سنوورەکان، لەنێو رۆحی یەکێتی دیموکراتییانە و پێوانەکانی، کێشەی کورد چارەسەربکەن. دەرفەت و هەلومەرجێکی رۆشنی وەها پێشکەش بە هەرچوار دەوڵەت دەکات، تاوەکو ئەوە نیشانبدەن "بەبێ دەستکاری کردن و تەنانەت لەسەر بنەمای بەهێزکردنی لەمیانەی یەکێتی تا چ رادەیەك بەبڕیارن و داخوازی چارەسەرکردنی کێشەی کوردیان هەیە. هەربۆیە سیستەمی نوێی بەرگری رەوا، واتە مێژوویەکەی مەزنە، لەجیاتی لەناوبردنی کوردان لەرێگای ئاوارکردنی ئابلوقەکانی خنکاندن، پردەکانی دۆستایەتی و برایەتی بونیاد دەنێ و دەرفەتی ئەوە دەرەخسێنی شەرەفمەندانەترین ئاشتی بەدیبێت کە دەسکەوتی بۆ هەموو لایەك دەبێت. ئەم هەڵوێستەی لەسەربنەمای چارەسەری برایانە بانگەوازی بۆ تەواوی کوردان و عەرەب و عەجەم و تورکەکان دەکات، پێویستە وەکو هەڵوێستێکی بەرپرسیارانە هەڵسەنگێنرێ. گەرەنتی ئەوە دەدات کە هەر لایەنێکی بەرەو چارەسەری بێت، ئەوا دەست لەچەك بەردەدات و یەکلایەنە بەکارهێنانی چەك دەوەستێنێ. هەر بەمجۆرە لەمیانەی رێنەدان بەقۆناخێکی خوێناوی لەجۆری پێکدادانی عەرەب ـ ئیسرائیل کە لەرۆژهەڵاتی ناوین بێتە ئاراوە، هەوڵدەدات بەرپرسیارێتی باڵای خۆی نیشان بدات.

لەبەر تەواوی ئەم هۆکارانە چاوەڕوانی دەکرێت ئەم سیستەمەی بەرگری رەوا وەکو سەرچاوەیەکی هەڕەشە نەبینن بەڵکو لەدڵەوە وەکو گونجاوترین رێکخستن بیبینن لەپێناو چارەسەرکردنێکی برایانەی ئەو کێشەیەی پڕ لە ئێشە و قووڵاییەکی مێژوویی هەیە.

تاوەکو ئاشتی و چارەسەری دیموکراسییانە لەلایەن دەوڵەتە پەیوەندیدارەکان پەسند دەکرێ، لەمیانەی هەستێکی بەرزی بەرپرسیارێتی، لەم پێناوەدا بۆ گەیشتن بەپلەی هێزێك کە بەهەمند وەردەگیرێ، هەموو جۆرە چالاکیەکی تەفلیبوون، رەخنەدان، لۆژستیك، سەنگەر گرتن و ئامادەکاریەکانی سەرخان و ژێرخان، بۆ گونجاوترین چالاکی یەکینە و پاراستنی گەوهەری بەشێوەیەکی سەرکەوتوو و فیداکارانە بەردەوام دەکات.

تاوەکو بەرگری رەوا ئاشتی و چارەسەری دیموکراسییانە دێنێتە ئاراوە، لەبواری چەندایەتی و چۆنایەتیەوە هێزێك دەکات بەپێویستی. هیچ ئاشتی و چارەسەریەکی دیموکراسییانە کە گەلێك یاخود هێزێك پاڵپشتی نەبێت بەسەرکەوتن ناگات، تەنانەت بەهەمندیش نابینرێ. تەنیا لەمیانەی خاوەنداریێتی هێز و دیسپلین و کارگێڕیەك ئاشتی و چارەسەریەکی راستەقینە بەدیدێت. بۆ گەیشتن بەم رەوشەش خەباتی بوارە جیاکان، رێکخستنی یەکینەکان، پێکەگرتن،

لۆژستیك و سیستەمی نهێنی هەموو جۆرە خەباتێك، رێکخستنێکی راست و بەجێی فەرمانداریێتی، پێویستە. بۆ سەرکەوتنی تەواوی ئەم تێکۆشانەش پەیڕەوکردنی پەروەردەیەکی بەهێز، ئاواکردنی زەمینەی ژیانێك کە پڕ لەرێز و خۆشەویستی هەڤاڵێتی بێتە خوڵقاندنی ژیانێکی ئازاد و بەدیهێنانی ئاشتی مەرجە، لەم پێناوەشدا پێویستە سەرەتا پێشبڕکێیەکی خوڵقکارانە لەنێو کەسێتییەکان سەقەربەر بکرێت، تەنیا جێبەجێکردنی ئەم کارانە بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە بەرامبەر بەو خراپەکاری و تاوان و هەڵانەی تاکەکان تێی کەوتوون بهێننە ئاستێك کە تاك لێی ببووردرێت. لەمە بەدەر بۆ هیچ کەسێك رەوشی لێخۆشبوون نابێت. دەبێ بزانرێ کە لەدەوڵەتەوە تاوەکو ویژدانی خودی مرۆڤە تاوەکو دوایی حیساب لەهەموو دەزگا و کەسێك دەخوازرێ، پێویستە وەکو دواترین و گرنگترین دەرفەت پەسند بکرێت بۆ جێبەجێکردنی پێویستییەکانی گرێدان بەمیادی پیرۆزترین بەهاکان و شایستەی بن و ئەم ئەرکە بەسەرکەوتوویی جێبەجێ بکرێت.

ئەم بابەتەی پێویستی بەڕوون کردنەوەیەکی بەرفراوان هەیە، بەهۆی گشتگیریەکەی پوختەیەکی وەها بەس دەبینم. جگە لەبەرگری رەوا کە هەڵوەستەی سەرەکی PKK سەبارەت بە چالاکییە، ئەوا بابەتێکی دیکەی گرنگ وەرچەرخان و نوێبوونەوەیە، ئەو مەسەلانەیە کە پێویستە بۆ سەرکەوتنی پرۆگرام و شێوەگرتنی ئایدیۆلۆژی، لەنێو هەلومەرج و زەمینەی یاسایی هەر وڵاتێکی پەیوەندیداردا کامە جۆر و شێوەی خەبات بەبنەما بگیردرێت. پێویستە ئەم بابەتە وەکو نزیکبوونەوەیەکی بەرتەسکی تەکتیکی نەبینرێ، بەڵکو وەکو بابەتێکی وەرچەرخان و دیاریکردنی رێبازی ستراتیژی تاوتوێ بکرێت و بۆ ئەوەی پراکتیزە بکرێت بەشێوەیەکی کارامە و خوڵقکارانە هەموو توانا و هەوڵێکی بۆ تەرخان بکرێت.

لەهەر چوار پارچەی کە کاریگەریەکی بەرفراوانی هەیە، دەبێ PKK ی قۆناخی نوێ وەکو پێویستیەکانی خەبات و تێکۆشانی پرۆگرامی نوێ لەچوارچێوەیەکی یاسایی و دیموکراسی جموجۆڵ بکات، راستتر بڵێین، پێویستە لەژێر سایەی شێوە یاسایی و دیموکراسیەکان قەوارەی تایبەتی خۆی ئاوا بکات و بەڕێوەیان ببات، ئەمەش بەلانی کەم هێندەی بابەتی بەرگری رەوا گرنگ و بەبایەخە. تەنانەت سەبارەت بەسەرکەوتنی شوێنگەی بەرگری رەوا، بەڕێوەبردن و سەرخستنی هەوڵە پێویستییەکانی وەرچەرخانی وڵاتەکان بۆ دەوڵەتی یاسا، دەکات بەناچارییەك. پێویست دەکات بەگوێرەی شوێنگەی واقیعی مێژوویی، کۆمەڵگا، کولتووری، سیاسی و یاسایی هەر وڵاتێك بەشداری لەڕێکخستن و چالاکی گونجاو بکات و پشتگیری لێ بکات، ئەم بابەتانە وەکو خەباتێکی سەرەکی ببینێ.

هیوادارم لەبەشی دوای ئەمەدا هەر وڵاتێك بەجیا تاوتوێ بکەین، لەمیانەی هەڵوەستەکردن سەبارەت بەڕێبازی سەرەکی باهەوڵبدەین ئەم بابەتە تەواو بکەین. شێمانەیەکی لاوازە کە PKK بەناو و پرۆگرامی تایبەتی خۆی لەم وڵاتانە خەبات بکات.

لەوانەیە ئەمە بۆ ئێراق بشێت. PKK بەناوی خۆی تەنیا لەدەرەوە وەکو ناوەندێکی سنووردار دەتوانێ بەردەوام بێت. تەنانەت پێشتر خەباتێك بەناوی PKKی باشوور هەبوو. بۆ ئێراقیش هەلومەرجەکانی رۆڵی پەکلاکەرەوە دەبینن. بەڵام لە تەواوی وڵاتەکانی دیکە، تەنانەت ئەورووپاش، لەجیاتی PKK، یان پێویستە سەرلەنوێ رێکخستنی گونجاو ئاوا بکرێت، یاخود پشتگیریکردنی ئەوانەی لەباری دەبینن، دەکات بەناچارییەك. پێویستە وەکو بابەتێکی ئاشکرا و بەبایەخ بزانرێ کە ئەو رێکخستنانەی ئاوا دەکرێن نابێ بەمجۆرە ببینرێت کەشێوەیەکی PKKن و بەرگی خۆیان گۆڕیوە، یاخود رێکخراوێکی وابەستەی ئەون. پێویستە ئەمانە وەکو پارتی و هەرجۆرە رێکخراوێکی کۆمەڵگای مەدەنی ببینرێن کە سەربەخۆن، یاسایین، پرۆگرام و کاروباری رێکخستن و تێکۆشانیان هەیە. پێویستە جەماوەر و لایەنگرانی PKK هانبدرێن بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی گونجاو لەم رێکخراوانەدا ئەرك بگرنە ئەستۆ. بەکارهێنانیان وەکو رێکخراوێکی پاشکۆ یاخود وەکو شێوەیەك کە بەرگی خۆی گۆڕیوە، زەمینەیەکی کراوە بۆ ئاژاوەچێتی دەرەخسێنێ، لەجیاتی سوود زیان بەچارەسەری دیموکراسییانە دەگەیەنێ. گرێدراو بەم هەڵوێستە سەرەکییە، پێویستە گرنگی بە بەرەی هاوبەش و رێککەوتن لەگەڵ تەواوی ئەو پارتی و رێکخراوانەی کۆمەڵگای مەدەنی بدرێت کە هەمان ئامانجی دیموکراسییانەیان هەیە. پێویستە نەکەونە نێو هەڵوێستێکی جەوتی بەمجۆرە کە ببێت بەبەڵگە بۆ بانگەشەکانی "فەرمان لە PKK وەردەگرن"، هەروەها ئاگادارکردنەوەی ئەمانەش بەبنەما دەگیرێت کە دەکەونە نێو هەڵسوکەوتێکی بەمجۆرە. پێویستە بەشێوەیەکی بەرفراوان گفتوگۆ سەبارەت بەم بابەتانە بکرێت و بە پلانێکی هەمەلایەنی تێکۆشان گرێبدرێت و پیادە بکرێت، ئەمەش دەبێ وەکو راستترین رێگا و شێوازی ئەوە ببینرێت کە هەم وەرچەرخان هەم رەخنەدانێکی بەجێ لەبواری پراکتیکیدا واتادار بێت و دەبێ سەربخرێت. سەبارەت بەئەورووپاش گونجاوترین تێکۆشان و رێکخستن و شێوەی چالاکی هاوشێوەی ئەمە بایەخێکی مەزنی هەیە.

تەنیا کاتێك کە رۆحی هەڤاڵێتی و وەرچەرخانی کەسێتی و ئاکاری ژیانی قۆناخی نوێ شێوەی گرت و جیاوازییەکەی دەرکەوتەروو، ئەوا ئەو کاتە بریار لەسەر ئەوە دەدرێت کە لەدڵەوە رەخنەدان پەیرەوکراوە و پێویستییەکانی لەبواری کردارییدا پراکتیزەکراوە. هەربۆیە کاتێك ئەم رێبازە ئایدیۆلۆژی و کردارییەی تاوەکو ئێستا هەوڵی دەست نیشانکردنی چوارچێوەکەی درا، لەکەسێتی هەڤاڵان، جیهانی هزر و رۆحیان و لەنیشانداني ژیانی هاوبەش و ئاکاری ئیرادەی ئازاد رەنگی دایەوە، لەپەیوەست بوون بە بەها پیرۆزەکان و هەڵوێستەکانی خۆشەویستی و رێزگرتن رەنگی دایەوە و واتاداربوو، ئەو کاتە دەتوانرێ باس لەسەرکەوتنی ئەم رێبازە بکرێت.

وەکو دوا پارچەی بابەتە سەرەکییەکانی وەرچەرخان پشتگوێ نەخستنی پەروەردە و ئاواکردنی دامەزراوەکانی هونەر، وەرزش، تەکنیك و تەندروستی، گرنگ و بایەخدارە. کاتێك

دهێنان و پەروەردەی جەستە و ڕۆح و هێزر هەرسێکیان بەیەکەوە بەڕێوەچوو. ئەوکاتە بەداخوازی نموونەیی دەگات.

پێویستە سیستەمی ئەکادیمیا لەخەباتی پەروەردە پێشبخرێت. پێویستە بەرلەهەموو شتێك سیستەمی ئەکادیمی بوارەکانی هونەر، زمان، مێژوو فەلسەفە، ئیلاهیات، ئازادی ژن و ڕاگەیاندن و بلاوکردنەوە سەرلەنوێ بەشێوەیەك ڕێك بخرێت کە هێز بەبنەماکانی پرۆگرام و ئایدیۆلۆژیای قۆناغی نوێ ببەخشێت. هەروەها پێویستە لەمیانەی چوارچێوەی ئەکادیمیایەکی هاوشێوە هەڵوەستە سەبارەت بەپەروەردە سەربازی و سیاسیە سەرەکییەکان بکرێت.

لەمیانەی ڕەچاوکردنی ڕاستیەکانی جیهان لەبواری دیپلۆماسی و ئەنتەرناسیۆنالیزم، ئەوا خوڵقاندنی کادیر و گەیشتن بەشێواز جێگای بایەخە.

وەکو بابەتێکی دیکەی سەرەکی، بۆ پەروەردەکردنی گەل لەبواری کولتووریدا، سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی دامەزراوەکانی ڕاگەیاندن ـ بلاوکردنەوە بەگوێرەی ڕێباز و گەیاندنی بەئاستێك بتوانێ داواکاریەکان جێبەجێ بکات، بابەتێکە ڕۆژ بەدوای ڕۆژ بایەخەکەی زیاتر دەبێت. بەشێوەیەکی سەرەکی گەل لەڕێگای ئەم دەزگایانە فێری سیاسەتی دیموکراسییانە دەبێت. هەروەها تاکە ئامرازی پێداویستیەکانی هونەر، هەواڵ و شرۆڤەکردن، کە سنووردارن، ئەم دەزگایانەن. هەربۆیە پێویستە لەئاستێکی بەرزدا کادیری پێویستی بۆ دابین بکرێ و چاودێری بکرێت. لەگەڵ ئەوەی درێژکردنەوەی ئەم بابەتانە بۆ ئەم خەباتە (بەرگرینامە) پێویست نابینم، بەلام ئاگاداری ئەوەشم کە بەواتای دەوڵەمەندێتی و هەمەڕەنگی ژیان دێت و سنووردار ناکرێت.

یەکێك لەو بابەتانەی دەخوازم لەکۆتاییدا بیخەمە سەر ئەوانەی تر، پێویستی نیشاندانی چەمکێکی ژیان و بەڕێوەبەرایەتییە. چ لەناوەوە بێت یاخود لەدەرەوە، کە هەڕەشە ئاکاتە سەر ژیان. لەمیانەی خۆشەویستی و بەیەکەوە ژیان هەڵوێست بەرامبەر خاوەنی هەر بۆچوون و هەڵوێستێ نیشان دەدات، جیاوازیەکان وەکو دەوڵەمەندێتی و سەرچاوەی وەرچەرخان دەبینێ، لەمیانەی فشار و دەسەڵاتەوە هەڵسوکەوت و جموجۆڵ ناکات، بەڵکو زەمینەیەك بۆ خەباتی ئازادانە و جموجۆڵی توانستە سروشتیەکان دەڕەخسێنێ. پێویستە ئەو هێز و توانستەتان هەبێت، جگە لەڕەوشی بەرگری ناچاری و ڕەوا، تەنانەت هەڵوەستە دوژمنکارانەکانیش لەحیاتی لەنێوبردن، لەمیانەی گۆڕینی بۆ دۆستایەتی بەلاوەی بنێن. بەلام ئەوانەی خائینانە، لەشوێنی هەستیار و ژیانی نامەردانە و لەپشتەوە هەوڵی خەنجەرلێدان دەدەن، دەبێ ئەم دەرفەتەیان پێنەدرێت؛ کاتێك سووربوون لەسەر ئەم کارەیان ئەوا مسۆگەر پێویستە لەکاتی خۆیدا زوو یان درەنگ وەڵامی شایستە و پێویستیان بدرێتەوە. ئازادی بۆ ئەو کەس و سەرچاوە و هەڵسوکەوت و هەڵوێستانە نییە کە دوژمنایەتی دەخوڵقێنن و بەردەوام

خرابەکاری و ئاژاوەچێتی و زۆرداری دەکەن و ناپێنەوە سەرڕێ. ئەگەر ڕێگایان پێبدرێت، بەواتای خیانەتکردن لەئازادی دێت. نابێ لەبیربکەین کە بێئامانترین دوژمنایەتیش کاتێك واتای پێبدرێت دەتوانرێ کۆتایی پێبهێنرێت. بەڵام سەرباری ئەوەی هیچ واتایەکی نییە، بەڵام بەردەوام ئەوانەی ئیش و کاریان خراپ کردن، ئاژاوەچێتی، لەناوبردنی ماددی و مەعنەوییە، بەتامەزرۆیی ئەم کارە ئەنجام دەدەن، ئەوا بەلاوەنانیان دەبێ وەکو ئەرکێکی مرۆڤایەتی ببینرێ و سەر بخرێ، ئەمەش پێویستییەکی ژیانی مافی مرۆڤانەی کۆمەڵگا و مرۆڤە.

کاتێك PKK بەرەو کۆنگرەی هەشتەمی ئاسایی دەچێتە لەچوارچێوەی بەرگرینامەشدا بێت بەهۆی گرنگییە مێژووییەکەیان هەوڵمدا سەبارەت بەم بابەتانە بەشداری بکەم. تاوەکو دوایی دەتوانن گفتوگۆ سەبارەت بە بۆچوون و پێشنیازەکانم بکەن و ڕەخنەی بکەن. تەنانەت ئەوانەی ئەڵتەرناتیڤی واتادار و سەرکەوتووانەتریان هەیە ئەوا ڕەخنە ئەنجامگیرەکانیان مَن دڵتەنگ ناکات، بەپێچەوانەوە دڵشادم دەکات. هەموو کاتێك قورساییم خستە سەر ئەوەی کە سەرگووتە و هەڵسوکەوتێکم پەروەردەکارانە بێت. ئەگەر بڵێم بەهەوەس خۆم سەپاند و خواستم خۆم بژێنم، ئەوا گەورەترین ناهەقی لەخۆم دەکەم. پێویست بوو کاتێکی زیاتر بۆ گەنجان، منداڵان، ژنان و پیران تەرخان بکەم؛ دەبووایە بەگوێرەی تایبەتمەندێتیەکانیان نزیکیان ببومایەوە. لەم بوارەدا خۆم قەرزار و شەرمەزار دەبینم.

لەهەڵوێستەکردن بەرامبەر ژنان تاڕادەیەك خواستم بەرەو پێشەوە بڕۆم. هەوڵمدا دوو مەسەلە بڕووخێنم کە بەدرێژایی مێژوو بووەتە کۆنکرێت و تایبەتمەندێتیەك دەرخەمە ڕوو. خواستم بەبێ ڕێزگرتن لەدەمامکە ئایینی و ئاکاریەکان ڕاستینەی ڕەگەزییان ئاشکرا بکەم کە خۆشیان دەرکیان پێنەدەکرد و وەکو ڕەگەزی چەوساوەی کۆنترین و قووڵترین جیابوونەوەی چینایەتی، ئەم ڕەوشەیان وەکو قەدەرێك دەبینی، خواستم ئەمە وەکو ئاکارێکی ئازاد بخەمەڕوو کە نابێ لە ڕەسەنایەتی و ئازادی ڕەگەزی خۆیان دوور و دوودڵ بن، بەپێچەوانەی ئەمەش نابێ ڕەگەزی خۆیان وەکو کاڵایەك بەکار بێنن. بەڵام لەلایەن چەندین ژن و پیاوی ناوخۆ یان دەرەوە بێت، هەوڵیاندا ئەم فیداکاریە مەزنە دژی من بەکاربێنن. لەمە نەدەترسام.

سەرنەکەوتنی ژنی ئازاد و ژیانی ئازاد بەردەوام وەکو کەموکوڕیەکی مەزنم بینی و بەرامبەر بەم ڕەوشە ڕق ئەستوور بووم. بەڵام تاوەکو ئەم تەمەنە شکست نەهێنانم بەرامبەر ئەم بابەتە، بۆ ئێوە و بەتایبەتیش ئەو ژنانەی کە لەدڵەوە خاوەن بانگەشەی ئازادین و بەهێزن، هەڵسەنگاندنی وەکو توانست و میراسێك بەتواناکاریەکی مەزنم لەقەڵەمدا. هەندێ جار پێشنیازێکی عەزیز پاول بەبیرمدا دێت. وەکو بژاری خۆم ئاماژەی پێناکەم، باوەڕدەکەم گووتەکەی بەم واتایە دێت: "ئاستەمە وەکو من بەتەنیا، بەبێ ژن بتوانن بژین؛ دەشێ وەکو ژن و مێردێك بەیەکەوە بژین کە لەجیاتی زیان، سوودی بۆ تێکۆشان هەبێت". ئەمە تەنیا بەبیرهێنانەوەیە کە لەم گووتەیەشدا دیارە کەسێتیەکی ڕەسەن بووە. بەڵام دەبێ ئەوە لەبیر

ـەکرێت کە لەپەیوەندییەکاندا لەسەر بنەمای دەسەڵات و هێز و تواناکاری پەنابردنە بەر ـەپاندن و فشار، پەیوەندی لەگەڵ ئەخلاقی کۆیلایەتیەوە هەیە. گووتەی "بژاری رەگەز جێی گفتوگۆ نییە" کە لەرۆژگاری ئەمڕۆمان بۆتە مۆدە، هەرچەندە گوزارشت لەهەڵوەستەیەکی ـڕەك بەئازادی بکات، بەڵام ئاشکرایە کە بواری مێژوویی، کۆمەڵایەتی، سیاسی، کولتووری، ئایینی و ئاکاری ئەم بابەتە زۆر بەرفراوانە و پێویستی بەچارەسەریەکی بنەڕەتی هەیە.

بەرێزەوە پێشوازیم لەدامەزراندنی پارتی ژنی ئازاد PJA کرد. ئەمە لەدیارکردنی چارەنووسی خۆیان بەشێوەیەکی ئازادانە هەنگاوێکی مێژووییە، دەشێ لەئاشکراکردنی ئاکۆکیەکان و چارەسەرکردنیان رۆڵی ئامرازێکی سەرەکی ببینێت. بەڵام لەمیانەی تێڕوانینێکی ئەفسانەزانی، ئایینی، فەلسەفی و زانستی بەرفراوان شیکردنەوەی کێشە لەنێو تەواوی رەهەندە مێژوویی و هەنووکەییەکان، لەم چوارچێوەیەشدا دیارکردنی رێبازێکی شێوەگرتنی ئایدیۆلۆژی، بەرنامەڕێژی، رێکخستن و چالاکی و پراکتیزەکردنی، جێگای بایەخە. ئاواکردنی ئەکادیمیای ئازادی پێویستە و لەجێگای خۆیدایە. دەشێ تێکۆشانەکانی وەقفی ئازاد و پراکتیزەبوونیان لەناو هەموو جۆرە رێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی، لەبەدیهێنانی ناسنامە و ژیانی ئازاد رۆڵێکی مەزن ببینێ. بەشێوەیەکی گشتی بینینی رۆڵی پێشەنگایەتی لە پێکهێنانی کۆمەڵگای دیموکراسییانە، پێویستییەکی پێکهاتەی واقیعیانە و بەڵگەی وەرچەرخانیانە. لەداهاتوودا هەوڵدەدەم لەمیانەی هەڵوەستە لەبوارەکانی ئەدەبی و فەلسەفیدا بەشداری خۆم سەبارەت بەم بابەتە بکەم. بەڵام ناوەڕۆك پێشکەشکراوە. هەروەکو لەهەڤاڵێتی و ژیانی ئازاد و ئایینی خوداوەندی ژن و ئەوانەی رێزیان بەرامبەر ئەشق هەیە و شەهیدە بەهادارەکانماندا سەلمێنراوە کە ئەم گەوهەرە نەمرە؛ بەم بۆنەشەوە دەخوازم هیوا و ئومێدەکانم دیاری بکەم کە، تۆڵەی خۆی لەژنی گەندەڵ و پیاوی باڵادەست و فێزەون کردۆتەوە و تاوەکو گەیشتن بەسەرکەوتن درێژەی پێدەدات و سەرکەوتن بەدەست دێنن.

لەو باوەڕەدام کە ئەم هەڵسەنگاندنانە هێز بەگفتوگۆکانی کۆنگرە دەبەخشێ، تەنانەت ئەگەر بەرلە کۆنفرانسەکانیش پێیان بگات دیسان هەمان هێز بەکۆنفرانسەکان دەبەخشێ. ئومێد و باوەڕی خۆم دیار دەکەم کە لە ناو تا دەگاتە گەوهەر، بەگوێرەی هەمئاهەنگی رەنگەکانی سروشت، بەخوڵقکارترین شێوە گفتوگۆ لەسەر هەر بابەتێك دەکەن، دەتوانن بەبڕیار و پێکهاتەیەك بگەن کە بەباشترین شێوە توانای پراکتیزەکردنی هەبێ و خاوەنی بەهایەکی هەمیشەیی بێت.

وەکو دوا گووتە دەخوازم ئاماژە بەوە بکەم، ئازادی و شەرەفتان چی بەپێویست ببێنێ، لەگەیشتن بەو بڕیارە ئازادن. هەروەکو چۆن دەبێ بڕیاری شەڕێکی بێ ئامان بێت، دەشێ بڕیاری ئاشتیش بێت. بەڵام باوەڕیم هەیە کە راستترین هەڵوێست نیشاندەدەن، ئەوە ئەنجام دەدەن کە لەبەرژەوەندی رەهای تەواوی مرۆڤایەتی و مافەکانمان دایە؛ لەگەڵ سووربوونتان

لەسەر ئاشتییەکی شەرەفمەندانە و ئازاد، تاوەکو دوێنێ بەرامبەر هێرشەکانی هێزە لەناوبەرەکان لەنێو ئامادە باشیدا دەبن، لەکوێوە و کامە هێز بن، خاوەنی هێز و بڕیارێکی شەڕی نەوتۆن لە پەلامارەکانیان و هاتنیان پەشیمانیان دەکەنەوە. لەدوای ئەمە هەموو شتێك هەڵوێستی " بەڵێنمان، دەبێتە کردارمان" یەکلای دەکاتەوە کە زۆر جار دووبارەتان دەکردەوە. هەروەها ئاماژە بەوە دەکەم کە هەموو شتێك ناچارتان دەکات ئەم گووتەیە واقادار بێت و پراکتیزە بکرێت، وەکو پێداویستییەکی بەبڕیاربوونتان، ئەوا جێبەجێکردنی هەموو ئامادەکاریەك مەرجە، پێویستە خافڵبوون و زیانی نابەجێ وەکو قەدەرێك بەلاوە بنێن.

دەخوازم تاکە تکایەك بکەم و ئەم بابەتە دابخەم، داوادەکەم هەموو هەوڵێکی رێکخستنی و چالاکی خۆتان بەگوێرەی من، بەتایبەتیش بەگوێرەی هەلومەرجەکانی دیلێتیم پێودانگ نەکەن، بەڵکو ئەوەی سەرەکیترە تەندروستی و شەرەف و رەوشی سەرکەوتنی ئێوەیە، هیوادارم ئەمە بەبناخە بگرن. پیلانگێڕەکان خواستیان ژیانی من بەرامبەرتان بەکاربێنن. لەمێژە تواناکاری مردنێکی قارەمانانە لەدەستم دەرهێنراوە. خرابوومە نێو ژیانێکی بەهەژمەت. تەواوی نەفرەتلێکراوەکانی مێژوو منیان لەخاچدا، بۆ بەختەوەری ئێوە، تەنانەت بەناستەمترین و زەحمەتترین شێوەش بێت، تاوەکو ئەمڕۆ مانەوەی من لەژیان گرنگ بوو. هەروەکو چۆن تاڕادەیەکی مەزن راستیەکان ئاشکرابوون، لەو باوەڕەدام بەڕەوشی بڕیار و چالاکیەکی راست گەیشتوون. منداڵ نین، هەڵوێستی راست و ئەو هێزەتان کە توانای بەدیهێنانی سەرکەوتنی هەیە، تەنیا بۆ خۆتان و گەل بەکاری بێنن. ئەگەر بتوانن، هەندێ شت بۆ مرۆڤایەتیش بکەن. بەڵام تەندروستی و شەرەف و سەرکەوتنتان، پێش هەموو شتێك بۆ خۆتان پێویستە. ئێوە و گەل فیداکاریەکی مەزنتان لەپێناوەدا کرد، باوەڕ دەکەم ئەمە بەسە. منیش ئیتر دەخوازم لەدڵەڕاوکێ رزگارم بێت و کەمێك گوێڕایەڵی خۆم بکەم.

بەڵام زۆر باش ئاگاداری ئەو مەسەلەیەم و سەرنجی دەدەم: لۆژیکی پیلانگێڕی، بەشێوەیەکی سەرەکی لەناوبردنی من بوو، تەنانەت ئەگەر لەناویشم نەباتە تەواوی ئەوانەی تادوایی پەیوەستدارن، گەلە دڵسۆزەکەمان، دۆستان لەسەرووی هەمووشیان ئێوە لەنێو ببات، ئەوانەی دەمێننەوەش پارچەیان بکات و بەگژیەکتریان بێنێ، بەمجۆرەش بەشێوەی لەنێوبردنی جەستەیی و مەعنەوی کۆتایی بەقەوارەی رێکخستنتان بێنێ. هەروەکو بەشێوەیەکی ئاشکرا لەتێخستنی ئەم سیستەمە رووڕەشەدا دەردەکەوێتە ئەوا دژ بەگەلی تورکیش ئەهامەتییەکی هاوشێوە کرابوو بەئامانج. تەواوی لێکدانەوەی پیلانگێڕان، بەلایەنی ئەوە بوو لەمیانەی شێوەیەکی پووچی بەرخودان، رۆڵەکانی گەل و گەلان دژ بەیەك بەکار بێنن. لەیۆنانی نەفرەت لێکراو کە بەدوای تۆڵەی مێژوویی‌دا بوو، تادەگاتە ئەو تورکانەی لایەنگری "لەسێدارەدان" بوون، تەواوی ئەو هێزانەی دەیانخواست زیاتر تورکیا بەخۆیانەوە وابەستە بکەن لەمیانەی ئاڵۆزیەك کە بەهۆی مەسەلەی من دەهاتە ئاراوە، چاوەڕوانی و هیوای

ـەرژەوەندیخوازیان هەبوو. تاوەکو مـردن بـەرخودانم بکردایـە، چوارچـوار لەیسـتۆکەکەیان ـەردەکەوت، هەوڵی زیان بدەم، دەیانگوت "تەسلیم بوو" ئەمـە ئـەو دووریانـە پـڕ لـەئێش و ـەزمەتەکە بـوو. قەبەنـەبوونی کاردانـەوەم و ئـارامیم، کاتێك هێشـتا لـەناو فڕۆکـەدا بـووم ـەرگرینامەی برایەتی هێنا ئاراوە. ئەم هەڵوێستە لەمن زیاتر بۆ ئێوە شانسێکی مەزنـە. بـەڵام ـزانم چۆن کۆتایی پێدێت.

کۆششێکی زۆرم دا بۆ ئـەوەی مـردنم تـەنیا بەخۆمـەوە سنووردار بێت. بـەڵام مردنێکـی چاوەڕوانەکراوی من یاخود ئەنجامێکی کە بەگوێرەی خۆیان پێودانگیان کـردووە، تـاکو ئێستا نەنێوبردنی ئێوە و گـەلی لـەڕۆژەڤدا هێشـتۆتەوە. دیسان بـۆ ئـەوەی بـەمجۆرە نـەبێت هـەوڵ و کۆشـش دەکـەم. بـەڵام هـەروەکو بڵێی سبەینێ مـەرگێکی بـەمجۆرە ڕوودەدات، پێویسـتە لـەنێو هـەموو جـۆرە ئامـادە باشـیەك دابـن، ئەمـەش تـەنیا بـۆ ئێـوە نییـە، بۆتـەواوی گەلـە ولاتپارێزەکـەمان و دۆسـتان پێویستە، هەربۆیـە گوتبـووم، وەکـو دیـاری پێشکەشـکردنی مـن بـەتورکیا بۆمبایـەکی لـەوەی هێرۆشیما مەترسیدارترە. هـەروەکو بڵێی سبەینێ ڕۆژی ئافـات دێت، هـەمووتان، هەرکەسێك لـەنێو ئامادەکاری دابێـت، ئەمـەش بـۆ شـەرەف و سـەرکەوتن ـەرجە. هەروەها دیسان ئومێدی خۆم بۆ ئەوە دیاردەکەم کـە ئاشـتی و برایـەتی و چارەسـەری دیموکراسییانە سەردەکەوێت، لەگەڵ باوەڕی بەوەی کە لەپراکتیکی خۆتـاندا ئەمـە دەسـەلمێنن، نەمیانەی ڕێز و خۆشەویستی هەڤاڵێتییەوە کە لەپێش هەموو شتێکەوە دێت، سڵاو لەهەمووتان دەکەم، هیوای سەرکەوتنی بەردەوامتان بۆ دەخوازم.

### ٥. بەرەو چارەسەری کێشەی کورد

ئەگەر دیاردەیەکی کۆمـەڵگا لـەنێو کێشـەیەکدا دەژی کـە ڕیشـەکەی بـۆ سـەدان سـاڵ پێشتر درێژ دەبێتەوە و بەچارەسەریەك ناگات کە بەگوێرەی سەردەمی خۆی ئاسایی دەبیـنرێت، ئـەوا لەنێو هەلومەرجـە بابـەتی و خودیـەکانی نـاوخۆ و دەرەوەدا گـەڕان بـەدوای کەموکوڕیـەکان واقیعی نابێت. هەر کێشەیەك هەلومەرجی بابەتی خـۆی هەیە، بـەڵام ئـەم فاکتەرانـە تـادوایی ڕۆڵـی کۆسـپ نانـەوەیان لـەپێش چارەسـەری نـەدیوە. تەنانـەت، هەرچـەندە هەلومەرجـە بابەتیـەکان کامڵ و لـەبار بێـت، بـەڵام بەتـەنیا چارەسـەری بـەدیناهێنێت. تەنانـەت لـەنێو خراپترین هەلومەرجیشدا، لەهەموو کاتێکدا دەشێ لەلایەکیەوە تواناکاری چارەسەری بەدەست بـهێنرێ. هـەروەها بەشـێوەیەکی بەرتەسـك گرێدانـی بێچـارەیی بەناتـەواوی هەلومەرجـە خودیەکان، واقیعـی نـابێت. ئەگـەر بگوترێ خوێنێکـی کـەمی لـەپێناو ڕژێـنرا یـاخود ئاسـتی وشیاری ڕێکخستنی لاوازە، نـابێ بەفاکتـەرێکی یـەکلاکردن و ڕوونکردنـەوە. هـەروەها هـەموو شـتێکیش بخرێتـە ئەسـتۆی هەڵـە و کەموکوڕیـەکانی سـتراتیژی و تەکتیکـەکانی سیاسـی و

سەربازی، لەوانەیە بەهەڵەداچوون بێت. لەشێوازی نزیکبوون لەچارەسەری و ئاستی واقیعیبوون و توانای پەیرەوکردنی، بەدوای هۆکاری سەرەکی بێچارەیی بگەڕێین، ئەوا هەڵسەنگاندنێکی راستترە.

یەکێتی سۆڤیەت هێزێکی زەبەلاح بوو. لەلایەنی سەربازی و سیاسییەوە هیچ تێك نەشکا. هێرشی هێزێکی دەرەکی یاخود یاخیبوونی ناوخۆییش لەئارادانەبوو، بەڵام هەڵوەشایەوە. لەگرێدان بەئامانجی خۆیدا ژێرکەوت. هۆکارەکەی سادەیە: ئاستی ئازادی تاکی سۆسیالیست و ئاستی دیموکراسییانەی کۆمەڵگا، لەدەرەوەی راستینەی سۆسیالیستی بوو. وەڵامنەدانەوەی راستینەی مرۆڤی ئازاد، بەرەو بێچارەیی بردووە. دەتوانرێ هەمان هۆکار بۆ رووخانی فاشیزم بەرامبەر کێشەکان، بگوترێت. چارەسەرکردنی کێشە هونەرێکە. لەم پێناوەشدا نزیکبوونەوەی زانستی مەرجە، بەڵام بەتەنیا تێر ناکات. پێویستە لەگەڵ ئەمەدا هونەرەکەشی بزانرێت. کلیلێك هەموو دەرگاکان ناکاتەوە. بەڵام هەموو کلیلەکان هاوشێوەن. بە تەنیا لێکچوون، بۆ کردنەوە تێر ناکات. تەنیا کاتێك کونی گونجاو بدۆزنەوە و کلیلەکەی تێ بخەن، دەتوانن دەرگای داخراو بکەنەوە، ئەگەرنا بڵێی دەرگاکان بەهیچ کلیلێك ناکرێنەوە، نزیکبوونەوەیەکی واقیعی نییە.

بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد، ئەخوێنێکی کەم رژێنرا، ئەژمارەیەکی کەمی رێکخستنیش ئاوا کران. ناتوانرێ بگوترێ " ئەو دیبلۆماسی و شەڕەی کراوە کەم بوو". ناتوانرێ ئەو بەهانەیەش پێشبخرێت کە کێشەکە لەلایەنی بابەتی کامڵ نەبوو. رەوشی پارچەیی کوردستان، تەنیا هەلومەرجی ئەرێنی پێکناهێنێ بەڵکو دەشێ هەلومەرجی ئەرێنیش پێکبێنێ؛ بەڵام کاتێك تەماشای ئاستی چارەسەریش بکەین دەبینین سانتیمەترێکیش بەرەو پێشەوە نەچووە. بۆ نموونە رووداوەکانی ئەم دە ساڵەی دوایی باشووری کوردستان، نە بە لاوازی هەلومەرجە بابەتیەکان، نەبەکەمی پارەمەتی دەرەوە، نەبەلاوازی ئاستی وشیاری و رێکخستن، روونەکرێتەوە. بەپێچەوانەوە هەموو هەلومەرجێك کامڵ و لەبارە، بەڵام بەهیچ جۆرێك بەرەو چارەسەری ناچن. هۆکاری سەرەکی ئەمە هەڵوێستی بێ رێزییە بەرامبەر بە راستی، تەنانەت بەئەنقەست کۆسپ دەخەنە پێش سانایيترین رێگاکانی چارەسەری؛ ئەو هێزانەی پێویستە ببن بەهێزی چارەسەری، بەسووربوونەوە، کۆسپ دەخەنە پێش راستینە و رێگاکانی چارەسەری. هەر کێشەیەکی پێکەوەشتبێت، رێگایەکی ماقووڵی چارەسەری خۆی هەیە. بەڵام ئەوەی بەر لە هەموو شتێك لەم پێناوەدا پێویستە، بەماقووڵیی دەرك بەراستینەکان بکرێت و تەنانەت سنووردارترین تواناکاریەکانی چارەسەریش بەهەند بگیردرێت و بەعینادەوە ئیرادە و سەبر نیشان بدرێت. تاکە فاکتەرێك کە بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد لەئارادا نییە، ئەمەیە.

بێگومان هۆکاری مێژوویی، کۆمەڵایەتی و سیاسی سەرچاوەی ئەم هەڵوێستانە پێکدێنن. ـەو فاکتەرانەی بناخەی هەر هەڵوێستێك پێکدێنێ، دەتوانرێ بەدرێژی باس بکرێت. سەبارەت ـە بابەتی چارەسەری کە هەڵومەرجە واقیعیەکان دەرفەتی پێدەدەن، لەئەنجامدا دێت پشت بەجددیەت و بەبڕیاربوون دەبەستێت. لەوانەیە ئەمە وەکو دوو وشەی سادە ببینرێ. بەڵام کاتێك ئەمانە نەبوون، ئەوا چارەسەری لەسەر سینییەکی زێڕینیش پێشکەش بکرێت، ئەوا بۆ ئەو کەسانەی جددیەت و بڕیاریان نییە هیچ واتایەك نابەخشێت. واقیعیبوون و جددیەت و بەبڕیاربوون لەچارەسەریدا، رۆڵی ئەو کلیلە دەبینێ کە قوفڵە یەکلاکەرەوەکە دەکاتەوە. ئەگەر بڵێین هەر " ئۆتۆنۆمییەکی بەدڵی خۆمان یاخود وەکو پێداویستیەکی ماڤی چارەی خۆنووسینی نەتەوەکان دەوڵەتێکی وەها دەخوازم" ئەوا بڕارە ماقووڵەکەی پێشتان نابینن، هەربۆیە دەرفەتە بێ ژمارەکانی چارەسەری لەدەستدەدەن. ئەوەی تارادەیەك لەکێشەی کورد روویداوە ئەم لۆژیکە و خواردیتنەیە.

نابێ پرەنسیپەکان و سیاسەتی واقیعی تێکەڵ بەیەکتر بکرێن. هەروەکو بڵێی بۆ ئەوەی وەکو خاوەن پرەنسیپ بمێنێتەوە سیاسەتی واقیعیانە ناکرێت، یاخود بەپێچەوانەوە لەژێرناوی سیاسەتی واقیعی دەست لە پرەنسیپ بەردەدرێت! ئەو مەیلانەی بە لارێدا چوون و نەخۆشی لۆژیکی ناو دەبرێن، ئەوانەن کە ئەم دووڕیانەیان تێپەڕنەکردووە. رۆڵێکی مەزنی ئەم دووڕیانە لەڕەوشی بێچارەیی کێشەی کورد هەیە. ئەو هەڵوێستانەی کە لەژێر ناوی پرەنسیپ دۆگماتیزم و لەژێرناوی سیاسەتی واقیعیانە خۆبەدەستەوەدان لەگەڵ خۆی دێنێ، هەروەها بەرپرسیارێتی ئەوەشی دەکەوێتە ئەستۆ کە کێشەکەی خستۆتە نێو رەوشێکی نەخۆشیدا. هەروەکو دەزانرێ فرە رەنگی لەژیاندا زاڵە. ئەوەی بخوازێ دەتوانێ رەنگی خۆی بخولقێنێ. بۆ ئەوەی رەنگی چارەسەری بۆ کێشەی کۆمەڵگاش بدۆزرێتەوە، بەر لە هەموو شتێك ئەوانەی جگە لەرەش و سپی شتێکی دیکە نابینن پێویستە لەکوێرایەتی بینینی رەنگەکان رزگاریان بێت. خۆمان لەم راستینەیە دانابڕێنین. ئێمەش کەوتینە نێو هەمان هەڵەوە. گرنگ ئەوەیە بزانی لە هەڵە رزگارت بێت.

کاتێك هەوڵدەدەین دەرك بەقۆناخەکەی چارەسەری کێشەی کورد بکەین کە لەقۆناخی داهاتوودا بەچڕی هەنگاوی بۆ دەنێین، پێویستە تەواوی ئەو بابەتانەی سەبارەت بەڕێچکە و شێواز بەرچاوان بگرین. هەروەکو مەزندە دەکرێ، چارەسەری لەمیانەی ئەنجامدانی رێککەوتن یاخود لەسایەی هەڵوێستی بەخشندەیی دەوڵەت بەدیبنایەت. واقیعی کورد دەرفەت بەو شێوازانەی چارەسەری نادات. بەڵام کاتێك بەمجۆرە نەبێت، بێچارەیی وەکو قەدەرێك نابینرێ، بەپێچەوانەوە، ئەم رەوشە ئەوە دەخاتەروو، پێویستە بۆ چارەسەری لەشێوەی دیکە بگەڕێین.

ئەزموونەکانی ئەم ٢٠٠ ساڵەی دوایی ئاشکرای کردووە کە کێشەی کورد لەرێگای نزیکبوونەوەکانی نەتەوەپەرستی بۆرژوازی و ئۆتۆنۆمیخوازی دەرەبەگایەتی چارەسەر نابێت. واقیعی نەتەوە ـ دەوڵەتە دراوسێکان، دەرفەت بەم مۆدێلە نادەن؛ ئەم مۆدێلە رێگا لەپێش ئەوە دەکاتەوە لەژێر ئابڵوقە و لەنێو دیوارێکی گۆشەگیریدا هەڕەشەی خنکانی لێ بکرێت. ئەو بێچارەییە و ئەنجامانەی هەڵوێستە نەتەوە پەرستیەکانی ئیسرائیل ـ عەرەب رێگای لەپێش ئاوالا کردووە بەرچاوانە.

ئەم مۆدێلەی پاشماوەی سەدەی نۆزدەهەمە و سۆسیالیزمی بونیادنراو بەرگێکی نوێی پێداوە، بەرپرسیارە بەرامبەر پێشخستنی لۆژیکی رەش ـ سپی. لەڕاستیدا سیستەمی دیموکراسییانەی رۆژئاوا کە لەمیانەی بەهایەکی مەزن پێی گەیشت، کلیلی چارەسەرکردنی تەواوی کێشەکانی کۆمەڵگای دابین کردووە. رۆژئاوا سەرەتا تەواوی ناکۆکیە مێژووییەکانی خۆی چارەسەر کرد؛ ئێستاکە جیهان فێر دەکات. ناتوانین بڵێین: سیستەمی دیموکراسی، رۆژهەڵاتی ناوینی لەخۆوە گرتووە. بەڵام ئەمە راستینەیەکە ئەم سیستەمە زیاتر لەدەرگاکەی دەدات. جگە لەسیستەمی دیموکراسییانە، رێگایەکی دیکەی چارەسەری کێشە زەبەلاحەکانی کۆمەڵگا دیارنییە. لەمیانەی دەرئەنجامەکانی بالابوونی بەرچاوی سیستەمی دیموکراسییانە دەردەکەوێ کە وەکو لەبارترین رێگایە و لەرێگای کەمترین زیانەوە قازانج بۆ هەموو لایەنێک بەدەست دێنی و رۆژبەدوای رۆژ بەهاکەی زیاتر دەبێ. لەگەڵ ئەوەی ئەو سنوورە سیاسیانەی لەئازادان وەکو پێدراوێک پەسند دەکات، مافی تەواوی ئەو دەوروبەر و گروپ و کولتوورانە بەدیدێنێ کە خاوەن کێشەن. دەرفەتی ئەوە دەدات بەپێی تێپەڕبوونی کات و لەمیانەی پەرەسەندن و ئاراستەیەکی یەکسانی و ئازادی، هەر دیاردەیەک لەرێگای ئیرادەی خۆیەوە پەرەبستێنێ و پێشکەوتنەکانی شایستەی خۆی بخوڵقێنێ. بەردەوام ناچاری پەروەردە و رێکخستن و هەڵبژاردن و خۆپالاوتنیان دەکات، لەمیانەی سیاسەتی دیموکراسییانەوە بۆ دەوڵەت و یاساکانی دەگوازێتەوە. کۆمەڵگاکانی رۆژئاوا سەبارەت بەبالابوونی خۆیان تەنیا قەرزاری پێشکەوتنە زانستی و تەکنۆلۆژیەکان نیین، لەمانە زیاتر، سیستەمی دیموکراسییانە ئەم بالابوونەی خوڵقاندووە. ئەوانەی لەدیموکراسی دەترسن، ئەوانەی دەڵێن سەرەتا ئابووری، دوایی دیموکراسی، لەڕاستیدا گالیسکە دەخەنە پێش ئەسپ؛ دیموکراسی راستەقینە، بۆ هەڵسانە سەرپێی ئابووریە دواکەوتووەکان، مەرجێکی لەپێشینەیە، لەژێر سایەی ئەم راستینەیە کە بەشێوەیەکی زانستیانە سەلمێنراوە و خاوەنەکانیان خەڵاتی نۆبڵ یان وەرگرتووە، ئەوا لەتەواوی رۆژهەڵاتی ناوین، بەپەلەش بۆ کێشەی کورد، لەنێو سیستەمی دیموکراسییانەدا گەڕان بەدوای چارەسەری، تەنیا یەکێک لەرێگا گونجاوەکان نییە، لەهەمانکاتدا لەنێو ئەم هەلومەرجانەی لەئارادایە لەبارترین رێگای چارەسەرییە. دووربوونی

ـەتەوە ـ دەوڵەتە دەسەڵاتدارەکان لەدیموکراسی، نابێ وەکو کۆسپێك یاخود وەکو ئامرازێکی درێبوون ببینرێ.

هەروەکو لە بەشەکانی پێشتریشدا ڕوونکرایەوە، خودی کێشەی کورد ئەم دەوڵەتانە ناچار دەکات بەرەو دیموکراتیزەبوون هەنگاو بهاوێژن. چونکە ئەو بێچارەیی و قەیرانە قووڵانەی تێیدا دەژین، سیستەمی دیموکراسییانە بۆ ئەوانیش دەکات بەتاکە بژاری ڕاست. هەربۆیە ڕووبەڕووبوونەوەی شارستانییەتی دیموکراسی هاوچەرخ و پێکهاتە بەقەیرانەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوین، بەتایبەتیش سەبارەت بەکێشەی کورد، بەرینەوە بۆ سیستەمی دیموکراسییانەی گەیاندۆتە ئاستێك بەبێ ئەو نابێت. (لەبەرئەوەی ئەم بابەتە لەبەشە پەیوەندیدارەکاندا بەرادەی پێویست ڕوونکرایەوە، پێویستی دووبارەکردنەوەی نابینم). هەروەکو چۆن لەمێژوودا شارستانییەت لەنموونەی سۆمەر لەدایك بوو، ئەوا لەڕۆژهەڵاتی ناویندا و لەمیانەی ناوەرۆکێکی نوێ لەدایکبوونی سەردەمی شارستانییەتی دیموکراسییانە دەکاتە ناچارییەك. جارێکی دیکە قەدەر ڕۆڵی کلیلی شارستانییەتی دیموکراسییانە دەداتە دەستی کوردان، کە شێوەکی شارستانییەتە، پێکهاتە بێ واتاکانی چیتایەتی تێدا بەلاوەنراوە. کوردان تەنیا بەوە ناوەستن کێشە قورسەکانی خۆیان چارەسەر بکەن، لەهەمانکاتدا شانسی ئەوەش بەگەلە دراوسێکان دەدەن، لەنێو چوارچێوەی سیستەمی دیموکراسییانەدا بەیەکەوە هاوبەشێتی لەشەرەفی برایەتی و یەکێتییەکی ئازادانەی ڕاستەقینە بکەن. کلیلی زێڕینی ئەو ئازادییە ڕاستەقینەیە و ئاشتی و خۆشگوزەرانی پێشکەش دەکات، کە بەدرێژایی مێژوو گەلانی ناوچەکە تامەزرۆی بوون. نابێ ئەم هەڵوێستە وەك خەیاڵێك ببینن. بەڵکو دەبێ وەکو پێویستییەکی واقیعیبوون و گەیشتن بەسەردەم و ڕێگای ڕاستی دابینکردنی هەموو پێداویستیەکان ببینرێ، بەرپرسیارێتی و بایەخ پێدان و بە عینادەوە ئەنجامدانی ئەرکەکان؛ پێویستە وەکو پێداویستیەکی خاوەن دەرکەوتن لەئەرکە مێژووییەکان ببینرێ.

لەژێر سایەی ئەم چوارچێوە گشتییە سەبارەت بەچارەسەرکردنی کێشەی کورد ئەنجامدرا، باهەوڵبدەین لە ئاستی بیرۆکەدا بابەتە سەرەکییەکانی سەبارەت بەشێوەکانی ئەگەری چارەسەری هەر وڵات و دەوڵەتێك دابنێین کە کورد تێیدا دەژیت.

### ١ ـ کێشەی کورد لە تورکیا و چارەسەری دیموکراسییانە

لەلۆژیکی ئاوابوون و پێشکەوتنی پەیوەندییەکانی تورك ـــ کورددا گەڕان بەدوای هۆکارەکانی ئاستەمبوونی کێشەی کورد و ڕێگای چارەسەرییەکەی، ڕاسترین ڕێڕەوە. چارەسەری بەخۆی ئەنجامێکە. کاتێك لەمیانەی هێڵە گشتییەکان سەرچاوەی مێژوویی و چۆنیەتی پەرەسەندنی ئەو دیاردانە خرایەڕوو کە بۆ سەرکەوتن پشتی پێبەستووە، دەتوانین باس لە پیادەکردنی ڕێچکەی زانستیانە بکەین. لەبەرئەوەی لەبەشە پەیوەستدارەکان بەدرێژی

تاوتوێکرا تەنیا بەپوختی بۆ بەبیرهێنانەوە ئاماژە بە هەندێ تایبەتمەندێتی رێبازەکەی دەکەین.

*أ ـ قۆناخی میرنشینی دەرەبەگایەتی و سوڵتانەکان*؛ لە ئەم قۆناخەی بەکۆچی سولتانە مەزنەکانی سەلجوقی و هۆزەکانی ئۆغوز دەستپێکردووە؛ لەپێکدادان زیاتر لەمیانەی رێککەوتنەوە بەڕێوەچووە. بەرامبەر بە ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی، رێککەوتنی باوی ئیسلامیەت بەبناخە وەرگیراوە. رێزیان لەمافەکانی یەکتری گرتووە، میرنشینەکانی کورد و تورك دانیان بەهەبوونی یەکدی ناوە. لەچەندین شەڕدا، لەسەرووی هەمووشیان شەڕی مەلازگرت، رێککەوتنیان رۆڵێکی سەرەکی لە بەدەستهێنانی ئەنجامدا هەبووە. لەکاتێکدا پادشایەتی و هۆزە تورکەکان لەبواری سیاسی و سەربازی بەهێزبوون، کوردەکان لەلایەنی ئابووری، کولتووری و کۆمەڵایەتی باڵاتر بوون. کولتووری کوردان زیاتر کاریگەری دەکات. کێشەی کە لەنارادان، سەرچاوەی خۆی لەو ململانێیانە دەگرێت کە لەم قۆناخەدا لەنێوان میرنشینەکاندا هەبوون و لەپێناو کاریگەری و دەسەڵاتی زیاتر بوو. پێکدادانەکان لایەنێکی ئەتنیکی و قەومی ئەوتۆی نییە بەئەنقەست بێت. ئەم پێکدادانانە وەکو کێشمەکێشی موڵکایەتی و سیاسی و سەربازی نێوان چینە دەسەڵاتدارەکان تێپەڕ دەبێت. هەربۆیە لەم قۆناخەدا لەپەیوەندی تورك ـ کورددا گەڕان بەدوای کێشەی ئەتنیکی و قەومی، هێندە واتادار نییە.

لەسەردەمی سوڵتانە عوسمانیەکاندا پەیوەندیەکان دەکەونە نێو سیستەمێك و ستاتۆیەك بەدەست دێنن. ئەم ستاتۆیە تا سەدەی نۆزدەهەم بەردەوام دەبێت؛ کە بەشێوەیەکی سەرەکی میرنشینە کوردیەکان لەکاروباری ناوخۆ سەربەست دەهێڵێ، دان بەو حکومەتانەیان دادەنێت کە سیستەمەکەی بنەماڵێتییە و لە باوکەوە بۆ کوڕ دەمێنێتەوە. لەنێو بونیادی ئیمپراتۆریەت و چینە دەسەڵاتدارەکاندا، دەشێ ئەمە وەکو پێشکەوتووترین ستاتۆ ببینرێ. لەزۆر لە فەرمانەکانی سوڵتانەکاندا بەئاشکرا دیارە کە ئەم پەیوەندیانەیان لەئاستی ستراتیژیدا هەڵسەنگاندووە. بەتایبەتیش زاراوەکانی هەرێمی کوردستان، حکومەتی کوردستان، میرنشینی کوردستان، کە بەخۆیان ئاوایانکردبوو، پەیوەندی لەگەڵ کوردان مۆرکی فەرمی لێدرا، ئەمە بەواتایەك جیاکاری لەخۆوە دەگرێت. رۆڵی ئەو جوگرافیایەی کوردەکان وەکو خێڵ و قەوم تێیدا نیشتەجێ ببوون، هەروەها ئەو رۆڵە ستراتیژیەی سەبارەت بە دەسەڵاتدارێتی رۆژهەڵاتی ناوین هەیانبوو، وەکو هۆکاری سەرەکی ئەم رەوشە لەقەڵەم دەدرێت. تاوەکو لەگەڵ میرنشینە کوردیەکان رێکنەکەون، ناتوانن بەرامبەر بەدەرەبەگەکانی ئێران و عەرەبستان ببنە خاوەن شوێنگەیەکی باڵا. سوڵتانە تورکەکان بەقووڵایی دەرکیان بەم راستینەیە کردبوو. میرنشینە کوردەکانیش لەمیانەی کەڵك وەرگرتن لەم پێویستیە ستراتیژیە، بەهێزترین ئۆتۆنۆمیەکانی ئیمپراتۆریەتیان ئاواکردووە. ئۆتۆنۆمیخوازی کوردان، ستاتۆی قۆناخی دەرەبەگایەتییە، هەروەکو رێگایەکی چارەسەرییە.

لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەمەوە، لەگەڵ کاریگەربوونی داگیرکاری ئەوروپا لەرۆژهەڵاتی ناوین، ئەم ستاتۆیەی پەیوەندی کورد ـ تورك دەهەژێ. دەوڵەتە سەرمایەداریە داگیرکەرەکان لەسەرووی هەمووشیانەوە ئینگلتەرا، لەو سیاسەتانەی کە لە رۆژهەڵاتی ناوین سەبارەت بە خاوەنداریکردن لە کەمایەتییە مەسیحیەکان و پاراستنی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بەرامبەر بەپەلهاوێشتنی روسەکان، مەیلێکی مەترسیدار لەشێوەی گۆشەگیرکردنی کوردان و بەکارهێنانیان وەکو قۆزێك، پێشدەکەوێت. ئەم مەیلە، وەکو کردارێکی پراکتیزەکردنی سیاسەتی پەرتکە ـ زاڵبەی ئینگلتەرا کە هیچ بنەمایەکی ئەخلاقی نییە، رۆڵێکی زۆر مەترسیدار دەبینێ. لەپێناو کاریگەریەکی زیاتر، یاریکردن لەگەڵ هەموو هێزەکان، هۆکاری راستەقینەی کوشتارەکانە. ئەو ئاشتیەی کوردان ـ عوسمانیەکان کە سەدان ساڵ بەردەوام دەبێت، تێکدەچێت. قۆناخی شەڕ و یەکترخواردنی قەومەکان دەستپێدەکات. ئەو نەتەوەپەرستییەی لەسەربنەمای داگیرکاری سەرمایەداری پێشدەکەوێت، وەکو قۆناخی پارچەبوون و ململانێ جێگای خۆی لەناو مێژوودا دەگرێت. پێویستە لەپەیوەندیەکانی کورد ـ تورك دا ئەم قۆناخە وەکو قۆناخی سەرهەڵدان و پێشکەوتنی کێشەکان بەبناخە بگرین.

ب ـ *قۆناخی نەتەوەپەرستی، یاخیبوون و قڕکردن:* ئەو قۆناخەی کە داگیرکاری سەرمایەداری ڕێگای لەپێش کردەوە، قۆناخێکە کە کێشەی کورد بە واتا هاوچەرخەکەی سەریهەڵدا و پەرەیسەند. ئەو لۆژیکەی لەژێر ئەمەدا شاراوەیە، بۆئەوەی کەمایەتیە مەسیحیەکان بەخۆیانەوە گرێبدەن کوردان وەکو درندەیەك بەکاردێنن، لەهەمانکاتدا بۆ ئەوەی بەرێوەبەرایەتی تورکەکان، دواتریش ئێران و عەرەبەکان زیاتر بەخۆیانەوە گرێبدەن، پشت بەو یاخیبوونانەی کوردان دەبەستن کە بەخۆیان ئاگرەکەی خۆشدەکەن. هەوڵدەدرێ کوردان وەکو بابەتێکی تاقیکردنەوە و ئامرازێکی وروژاندن بەکار بێنن. هیچ نیازی ئەوەیان نییە لەمیانەی رۆڵێکی شارستانییانە هەڵوەستە بکەن. ئینگلتەرا سەرکێشی ئەم سیاسەتە دەکات. دەوڵەتە سەرمایەدارە داگیرکارەکانی دیکەش ئەم سیاسەتەیان بەبنەما وەرگرت و درێژەیان پێدا. ئەو سیاسەتەی سەرمایەداری ئیمپریالیستی سەبارەت بەکورد کە تا ئەمرۆش بەردەوامە، ڕێگای لەپێش ئەوە کردەوە تەواوی گەلانی رۆژهەڵاتی ناوین، بەتایبەتیش گەلی کورد لەناو دژوارترین قۆناخدا بژین. نەتەوەپەرستی بۆرژوازی کە پارچەیەکی جیانەکراوەی ئەم سیاسەتەیە، بەهۆی چاوگەکەی لەبەرئەوەی پشت بەئامانجی پەرتکە ـ زاڵبە دەبەستێ، رۆڵێکی نەرێنی بینیوە، لەکاتێکدا لەئەوروپا رۆڵێکی ئایدیۆلۆژی بنەرەتی لەناواکردنی بازاڕ و زمان و کولتوور و دەوڵەتی نەتەوەییدا بینی، لەرۆژهەڵاتی ناوین بووە ئامرازی یەکتر قڕکردنی گەلان. لەکاتێکدا رۆڵێکی سەرەکی بینی لەپەرتەوازە بوونی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، ئەوا ڕێگای لەپێش ئەوەش کردەوە کە مۆزائیکی رۆژهەڵاتی ناوین پارچە ببێت، گەلان تەنیا بمێنن، تەنانەت هەروەکو لەنموونەی عەرەبەکان و کوردان دەبینرێ ڕێگای لەپێش ئەوە کردۆتەوە بۆ

زۆر پارچەی جیاجیا پارچە ببن و بەسانایی ببن بەنێچیر. هەروەها قووڵکردنەوەی ئەم پارچەبوونە لەلایەن نەتەوەپەرستی ئەتنیکی تەسك و نەتەوەپەرستی خۆجێیی کەدواتر بەهێز بوو، ئەم پارچەبوونانەش وەکو بەردەوامی سیاسەتی پەرتکە و زاڵبە درێژەی بەرۆڵی خۆی داوە.

نەتەوەپەرستێتی تورك، وەکو کاردانەوەیەك بەرامبەر هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، لەسەرووی ئەو نەتەوەپەرستیانە دێت کە زوو لەناوچەکەدا شێوەیان گرت. ئەم نەتەوەپەرستیەی بەنامیق کەمال دەستپێکرد و ئەگەر بەشێوەیەکی سنوورداریش بێت بەناماانجی مەشرووتیەت لەمیانەی گەوهەرێکی پێشکەوتووخوازی پەرەیسەند وەکو عوسمانیگەرایی نوێ ناوبرا، لەمیانەی کۆمەڵەی ئیتحاد و تەرەقی وەکو یان تورکێتی، لەلایەن سوڵتان عەبدولحەمیدیش وەکو یان ئیسلامیەت ناوبراوە، بەمجۆرە کراون بەزازاوە. ڕژێمی مەشرووتیەت وەکو دەسکەوتێکی ئەم نەتەوەپەرستیە دێتە ئاراوە. ئەم نەتەوەپەرستیە لەگەوهەری دیموکراسییانە بێبەشە. لەسەرەتا داکۆکیکردن لەسەر ئازادی و برایەتی، دواتر جێگای خۆی بۆ دیکتاتۆریەت و نەژادپەرستی بەجێهێشت. کاتێك لەمیانەی ئەم سیاسەتەوە کەوتنە ناو شەڕی یەکەمی جیهانیەوە بەپارچەبوونی ئیمپراتۆریەت ئەنجامگیر بوو.

نەتەوەپەرستێتی "مستەفا کەمال"ی قۆناخی کۆمار، جیاوازترە، نەژادپەرست نییە، تەواوی شارستانییەتەکانی ئەنادۆڵ بۆ خۆی وەکو سەرچاوەیەك دەبینێ و ڕێزیان لێدەگرێت. بۆئەوەی ورە و وشیاری نەتەوەیی گەلی تورك بەرزبکاتەوە کە لەلایەن عوسمانیەکان بچووك کرابۆوە دروشمی ئەوەی بڵێ من تورکم بەختەوەرە" بەکارهێنا. لێرەدا ئەوەی بەناماانج کراوە لایەنێکی نەژادپەرستی نییە، بەڵکو بەنەتەوەبوونی گەلی تورکە کە بەدرێژایی چەرخەکانی ناوین لەلایەن سوڵتانەکانەوە بەنەزانی و بچووك دەبینرا. ئەو جیاوازیەی نێوان نەتەوەپەرستی مستەفا کەمال و ئەو نەتەوەپەرستییە نەژادپەرستییەی کەدواتر پێشخرا، گرنگە.

سەرباری ئەوەی نەتەوەپەرستی ـ نەژادپەرستی قۆناخی کۆمار، نەتەوەپەرستی ئیتحاد و تەرەقی بەبنەما وەردەگرت، بەڵام لەو دواکەوتووترە. ئەو نەتەوەپەرستیەی دوای شەستەکان بەرامبەر بە زیادبوونی قەیرانی ئابووری، کۆچی گوندەکان بۆ شار و هەڵکشانی چەپ، بەرەو سیاسیبوون هەنگاوی هاوێشت و لەمیانەی ئولکە ئۆجاغلاری و MHP گوزارشتیان لێکرا، لەڕۆژگاری ئەمڕۆمان بووە بەرەوتێکی ناو دەسەڵات؛ ڕۆڵێکی گرنگی لەپاکتاوکردنی چەپدا بینیوە. ناکۆکبوونی لەگەڵ هاوچەرخێتی مستەفا کەمال، دیموکراتیزەنەبوونی و درێژەدانی بەدەسەڵاتێکی فاشیستی، لەمیانەی بناخە نەژادپەرستیەکەیەوە ڕۆڵی کۆسپ و ئاستەمکردنی دەبینی. لەگەڵ ئەوەی نەتەوەپەرستی مستەفا کەمال، لەسەرووشیانەوە CHP، هەوڵی نوێبوونەوەیان دەبینرێ، تاوەکو ئێستا قەڵەمبازی چاوەڕوانکراوی ئەنجام نەداوە. چارەنووسی

نەتەوەپەرستی مستەفا کەمال، گرێدراوی ئەنجامدانی ئەو قەڵەمبازەیە بە مەثاقاری دیموکراتیزەبووندا.

عوسمانیگەرایی کلاسیکی لەمیانەی دەوڵەتێك بەشێوەی سەنتێزی تورك ـ ئیسلام خواستوویەتی نوێبوونەوە ئەنجام بدات. ئەو ڕەوتەی پشت بە هەڵکشانی سیاسییانەی ئیسلام دەبەستێ، زیاتر وەکو مەیلی لیبراڵی بۆرژوازییەتی ئەنادۆڵ شێوە وەردەگرێت. ئەم مەیلە کە لەتورکێتی زیاتر، جەخت لەسەر ئیسلامیەت دەکات، هەوڵدەدات هێز لەمەیلە ئیسلامیەکانی ئێران و عەرەبەکان وەربگرێت، لەم قۆناخانەی دواییدا زیاتر هەوڵ دەدات وەکو پارتیە دیموکراسیە مەسیحیەکانی ئەوروپا پێشبکەوێت.

بەرەی کلاسیکی دەسەڵات کە وەکو بۆرژوازییەکانی تورکیا لە CHP جیابوونەوە و بانگەشەی لیبرالیزمیان دەکرد، دوا ئەزموونەکانی پارتی دیموکراسی، پارتی عەدالەت AP، پارتی نیشتمانی دایك ANAP ، کەوتۆتە نێو قۆناخی پەرتەوازەبوون. ئەم بەرەیە، نموونەیەکی بەبڕیار و سەقامگیری دیموکراسی پێشکەش نەکردووە. ئەوەی هەرە زێدە لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا هەوڵی بۆ دەدەن، کۆششەکانی خولقاندنی بەرەی ناوەندی پارتی دیموکراتە. هەم ناوەندی ڕاستڕەو، هەم ناوەندی چەپڕەو لەمیانەی جەختکردنە سەر دیموکراسی و مافی مرۆڤ، هەوڵ دەدەن ئەم بۆشاییە پڕبکەنەوە.

ئەو قەیرانە هەمەلایەنەی تورکیا لەئاستی جیهاندا تێیکەوتووە، بێچارەیی و بنبەستبوونی ئەو نەتەوەپەرستیەش نیشاندەدات کە مۆری خۆی لەم سەدەیەی دوایی تورکیا داوە. لەگەڵ ئەوەی ڕۆڵی نەتەوەپەرستی مستەفا کەماڵ لەناواکردنی کۆماردا مسۆگەرە، بەڵام ئەنجامنەدانی گۆڕانکاری و پێشکەوتنی دیموکراسییانە بناخەی ئەم بێچارەییەیە. هەمان نەخۆشی بێچارەیی لەسەرتاسەری ڕۆژهەڵاتی ناوین لەئارادایە. ئەوروپا کاتێك ئەو نەتەوەپەرستیە شۆڤێنیەی لەمێژوودا ژێرخاك کرد کە لەڕێگای فاشیزمی هیتلەردا گەیشتە لوتکە، ئەوا پێشکەوتووترین قۆناخی نەتەوایەتی دەستپێکرد. هەروەها بەرزکردنەوەی ئاڵای دیموکراسی ئەو مەیلە سەرەکیەیە کە مۆری خۆی لەنیوەی دووەمی سەدەی بیستەم داوە. ئەگەر بە ڕادەیەکی سنوورداریش بێت مستەفا کەمال سوودی لەقۆناخی پێشکەوتووخوازی نەتەوەپەرستی ئەوروپا بینیوە. لەم لایەنەدا هاوچەرخە. بەڵام دوای شەڕی دووەمی جیهانی هاوچەرخێتی وەکو شارستانییەتی دیموکراسییانە پێناسەکرا، بەڕێوەبەرایەتیەکانی تورك لەناوەرۆکدا دەرکیان بەم پێشکەوتنانەی شارستانییەت نەکرد، تەنانەت ئەگەر دەرکیان پێ کردبێت، لەبەرژەوەندی خۆیاندا نەیبینی و باوەڕیان پێ نەهێنا. زیاتر بەڕێوەبردنی کۆماریان لەژێر سایەی بەڕێوەبەرایەتیەکی ئۆلیگارشیانە بەگوێرەی بەرژەوەندی خۆیان بینی. دیموکراسی هاوچەرخیان وەکو هەڕەشەیەك بۆ سەر بەرژەوەندیەکانی خۆیان لەقەڵەمدا. ئەمەش بەواتای دابڕانی کۆمار لەشارستانییەتی هاوچەرخ دێت.

ئەم ڕاستینەیە بناخەی قەیرانی ئابووری پێکدێنێ. تەواوی وڵاتەکانی ئەوروپا لەدوای شەڕی دووەمی جیهانیەوە لەمیانەی سیستەمی دیموکراسییانەدا بەناستی ڕۆژگاری ئەمڕۆمان گەیشتوون، بەردەوام تورکیا دووری دیموکراتیزەبوون وەستا؛ تەنانەت وای مەزندە کرد لەمیانەی خۆشاردنەوە لەژێر سایەی دیماگۆژیەتی دیموکر سییانە دەتوانێ قەڵەمباز بکات. لەکاتێکدا وایدەزانی لەڕێگای فێڵبازی گوندێتی و خۆنیشاندانی بەنوژەنی هەموو کەسێکی خەڵەتاندووە، بەڵام تازە بەتازە دەرك بەوە دەکات کە تورکیا سەری خۆی بە بەردا کێشاوە. ئاشکرایە کە چینی بەڕێوەبەرایەتی نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم هەروەکو چۆن لەگەوهەری خۆیدا لەبانگەشەی هاوچەرخی کۆمار تێنەگەیشت، لەهەمانکاتدا میراسە سنووردارەکەشی بەخراپی بەکارهێناوە. کاردانەوەی سوپاش بەرامبەر بەمە، لەمیانەی چاودێری کردنی بەردەوامی توێژی سیاسەتمەداران و چوار کودەتای گرنگ بووە. کە بەشێوەی ڕێگرتنە لەپێش لەڕێلادانی کۆمار. بەڵام لەبەرئەوەی ئەم کودەتایانە پشتیان بە بەرنامەیەکی بەبایەخ نەدەبەست و زیاتر لەسەر بنەمای پێوانە کلاسیکیەکان پاراستنی کۆماریان بەبناخە دەگرت، کاریگەریەکەیان لەپێکوتەکردن لەجێگای خۆیان بەولاوە تێپەڕی نەکردووە، ڕێگای لەپێش ئەوە کردۆتەوە کۆمار زیاتر لەناوخۆیدا دابخرێت و بەرەو ڕەوشی موحافەزەکاری بچێت. ئەوەی لەکۆتاییەکانی سەدەی بیستەم لەئارادایە تەنیا تەنگەژەیەکی ئابووری نییە، بەڵکو لەهەموو بوارەکانی ئابووری، کولتووری، کۆمەڵایەتی و سیاسی قەیرانێکی گشتگیریە. هەنگاوێکی لەپێشتری ئەم ڕەوشە، ئەهامەتیە و هەڵئاوسانی دارایی (التضخم المالي) باڵایە ئەگەر جەخت لەسەر پیادەکردنی کۆن بکرێت، ڕوودانی ئەم ڕەوشەش دەبێتە ناچاری.

ئەوەی ڕێگای بەوەداوە مەودا لەنێوان تورکیا و شارستانییەتی دیموکراسی هاوچەرخ ببێتەوە، جولانەوەکانی دژە دیموکراسی نەتەوەپەرستی پاشفەڕۆ و بەڕێوەبەرایەتی ئۆلیگارشیانەیە. لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا تورکیا لەشێوەی قورسترین و درێژخایەنترین قەیرانی مێژووی، لەنێو دەرئەنجامەکانی ئەو ناکۆکیانەدا دەژیت. کاتێك تایبەتمەندێتی زاڵبوون و داخراوبوونی ڕژێم ڕێگا بەوە نادات دەستێوەردان لەمیانەی هەلومەرجەکانی ناوخۆ ڕووبدات، هەروەکو زۆر نموونەی لەمێژوودا بینراوە، ئەم دەستێوەردانە لەدەرەوە چاوەڕوان دەکرێت. IMF و یەکێتی ئەوروپا لەدوو کەناڵەوە هەوڵی ئەنجامدانی ئەم دەستێوەردانە دەدەن. بەڵام ترسی باوی دەوڵەت و پێکهاتەی داخراوی بەرامبەر بەفەبوونی دیموکراسییانە، کۆسپ دەخاتە پێش سەرکەوتنی دەستێوەردانی دەرەوە. هەربۆیە کاتێك تواناکاریەکانی چارەسەری ناوخۆ و دەرەوە ناستەنگ دەکرێت، ئەوا بەردەوام قەیران، تەقینەوەیەکی کۆمەڵایەتی لەڕۆژەڤدا دەهێڵێتەوە. لەکاتێکدا بەشێوەیەکی گشتی نەتەوەپەرستی تورك لەنێو قووڵترین بنبەستبووندایە، نەتەوەپەرستی ـ شۆفێنی تورك کە دەخوازێ لەڕێی فاشیزمەوە دەرەتانێك (منفذ) بدۆزێتەوە، ڕووبەڕووی سەختترین دیوارەکانی هەلومەرجی ناوخۆ و دەرەکی

دەبێتەوە. کاتێك فاشیزم کۆڵەکەیەکی پتەو بۆ هەڵگشان و دەسەڵات نادۆزێتەوە هار دەبێت و لەمیانەی لەدەستدانی هێز ئابڵوقە دراوە: تەواوی هەلومەرجە ناوخۆیی و دەرەکییەکان دووڕیانێك دەخاتە پێش هەردوو نەتەوەپەرستی، یان وەرچەرخان یان پاشەکشێ. سوپا بەقوولاییەوە دەرك بەوە دەکات کە لەڕێگای کودەتای باو شتێکی ئەوتۆ ئەنجام نادرێت. هەروەها بەهۆی رێککەوتنەکانی دەرەوە هەلومەرجەکانی ناوخۆ ئەگەری ئەوە لەئارادا نابینرێ کە سوپا لەپێناو پەیڕەوکردنی پرۆگرامێکی بەرفراوانی ریفۆرم، بەتەواوی دەسەڵات بگرێتە دەست. تەنیا ئەگەر کۆمار دووچاری هەڕەشەی پەرتەوازەبوون بێت، ئەوا دەستێوەردانێکی ئاشکرای سوپا دەکرێتە جێگای باس. تەنانەت هەروەکو دەبینرێ سوپا لەڕێگای رۆڵی کاریگەری MGK (ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی) وە چاودێری و کۆنترۆڵی بەردەوامی خۆی دەکات.

لەنێو ئەم هەلومەرجانەدا تورکیا گفتوگۆ سەبارەت بەقوولترین کێشەکانی وەرچەرخان و گۆڕانکاری دەکات. لەڕێگای رۆڵی ناوبژیوانی و گواستنەوەی ئامرازەکانی راگەیاندن، گفتوگۆ رۆژانە تاوەکو گۆشە هەرە دوورەکانی رەنگدەداتەوە. ئەم گفتوگۆیانە، بەگفتوگۆی بەرلە مەشروتیەتی رۆشنبیرە بیروکراتەکان و پێهەڵگرتنە دیموکراسیخوازەکانی ناو CHP ناچێت کە دوای شەڕی دووەمی جیهانی ئەنجامیاندا. ئەمە گفتوگۆیەکە، تەنانەت گفتوگۆی راستڕەوی ــ چەپڕەوی تورکیای ساڵانی حەفتاکانیشی تێپەڕکردووە. ئەم قۆناخە کەسیستەمی سۆسیۆ ــ ئابووری پێی گەیشتووە، بنبەستبوونی سیستەمی سیاسی، ئەو شێوەیەی کێشەی کورد پێی گەیشتووە و ئەو ناتەباییەی لەگەڵ جیهانی دەرەوە لەئارادایە، رۆڵێکی سەرەکی لەمەدا دەبینن. وەکو رابردوو کەس باوەڕی بەوە ناکات لەمیانەی هەندێ تەگبیری ئاسایی لەهەق تەنگژە و قەیران دەردەکەون: هەر تەگبیرێکی چارەسەری کە یەکلایەنە پێشبخرێت، لە قورسکردنی قەیران و کێشەکان بەولاوە هیچ واتایەکی دیکەی نییە. ئەم رەوشەش ئەمە نیشان دەدات کە رەوشی نەخۆشیەکە بەڕاستی دەستنیشان نەکراوە.

تورکیا لەمیانەی ئایدیۆلۆژیای نەتەوەپەرستیدا بەدوا قۆناخی گەیشتووە. لەڕێگای ئەم ئایدیۆلۆژیایەوە کێشەکان چارەسەر ناکرێت، ئاستەمتر دەبێت. تەواوی ئەو راستییانەی لەرۆژهەڵاتی ناوین لەئارادان ئەمە دەسەلێنن. قەیرانی تورکیا، رەوشێکی گشتی هەلومەرجی ئیمپڕیالیزمیش نیشاندەدات. لێکچوونی رەوشی تورکیا لەگەڵ رەوشی ئەرژەنتین، بەڕازیل، ئەندەنوسیا سەرچاوەی خۆی لەڕەوشی گشتی دەگرێت.

ئەگەر لەنزیکەوە تەماشای نموونەی تورکیا بکرێت دەتوانرێ ئەمانە بگوترێ: ئابووری سەرمایەداری لەڕێگای ئەو سیستەمەی لەئارادایە زیاتر پێشناکەوێت، بەپێچەوانەوە دوادەکەوێت. قۆناخی دامەزرانی کۆمار، قۆناخی بەدیهێنانی توانستی سەرمایەداری بە بەدەستی دەوڵەت و پارمەتیدان و خوڵقاندنی بۆرژوازیەتە تازەکەیە لەناو بیروکراسیدا. بەمجۆرە بناخەی سەرمایەداری دانرا. ساڵانی پەنجاکان قۆناخی پێشخستن و بڵاوکردنەوەی

سەرمایەداری بووە. سەرمایەداری کشتوکاڵی لادێکان و سەرمایەداری پیشەسازی شار، لەم قۆناخەدا هەڵمەتیان ئەنجامدا. لەپاڵ سەرمایەداری بیروکرات، قۆناخی سەرمایەی تایبەتیش دەستپێکرد. سەرمایەداری بازرگانی ـ پیشەسازی دەرده‌کەوێتە پێش. لەدوای ۱۹۸۰ هەڵمەتی سەرمایەی دارایی دەستپێکرد. لەمیانەی جێگیربوونی سەرمایەی ناوخۆ و فەبوون بەرەو دەرەوە لەرێگای پیشەسازی، هەڵمەتێکی دیکە ئەنجامدرا. سەرمایەداری تورکیا لەرێگای تەواوی ئەم هەنگاوانە، گەیشتە قۆناخێکی دیار. لەنێو هەلومەرجەکانی ئابووری پێشئەکەوتووی جیهانی سێیەمدا، بەشێوێنگەیەك گەیشت بتوانێ پێشبرکێ لەگەڵ ئەوروپا بکات. کەموکوڕیەکەی ناوا نەکردنی سیستەمی سیاسی ئەم ئابوورییە. لەمەدا بەدوودڵی هەڵسوکەوتی کرد. کۆسپی سەرەکی سەبارەت بەم بابەتەش کێشەی کوردە.

ئەگەر بەشێوەیەکی گرێدراو بەمێژووی نزیکی، کێشەی کورد تاوتوێ بکەین، ئەوا دەبینین کە، لەقۆناخی دامەزرانی کۆماریشدا رووبەڕووی رەوشێکی هاوشێوە دەبینەوە. کاتێك کۆمار بوو بەسیستەم کوردانی لەبیرکرد. بەڵام هەموو کاتێك هەستی بەترسەکەی کردووە، بەمجۆرە لەچارەسەریەکی وەها دوورکەوتۆتەوە کە کوردان لەگەڵ سیستەم رێك دەکات.

هەروەکو بانگەشەی بۆ دەکرێت، یاخیبوونەکانی کوردان، یاخیبوونێك نین کە لەسەربنەمایەکی جوداخوازی بن. یاخیبوونەکانی کوردان کە بەدرێژایی سەدەی نۆزدەهەم بەردەوام بوو، لەپێناو جیابوونەوە لەسیستەم نەبوو، لەبەرئەوەی لەسیستەم بەدەرنران، هەڵگیرسان. ئەو مەرکەزیەتەی زیاد ببوو جێگای بەکوردان نەدەدا. هەروەکو چۆن کوردان ئۆتۆنۆمییە بەرفراوانەکانی جارانیان لەدەستدا، لەهەمانکاتدا دەیانبینی لەسیستەمی نوێی مەرکەزیدا جێگایان نییە. شانبەشانی ئەوەی دەوڵەتە گەورەکان هەندێ جار بۆ ئەوەی زیاتر تورکیا بەخۆیانەوە گرێبدەن هەندێ رووداویان وروژاندووە، بەڵام هیچ کاتێك بەمانانجی جودابوونەوە هاوکاری ئەم یاخبوونانەیان نەکردووە. لەدامەزراندنی کۆماردا ئەم رەوشە زیاتر ئاشکرابووە. کوردان تەنیا ئۆتۆنۆمییەکانیان لەدەست نەدا، خۆیان رووبەڕووی نکوڵیەك بینیەوە کە نکوڵی لەتەواوی هەبوونیان دەکات. بێگومان ئەو دەوڵەتانەی بەرژەوەندییان هەبوو، لەسەرووی هەمووشیانەوە ئینگلیزەکان، بەمجۆرە کەڵکیان لەو یاخیبوونانە بینیەوە کە هاتوونەتە ئاراوە؛ لەکۆتاییدا لەگەڵ کەمالیستەکان رێککەوتوون. قۆناخی دواتر کوردان خرانە نێو قۆناخی قەدەخەکردن، رووبەڕووی رزین و لەبیرکردن بەجێ دەهێڵرێن. ئەو وەڵامەی لەمیانەی واقیعی PKK درایە ئەم رەوشە، ئەو رەوشە بوو کە لە دواچارەکی سەدەی بیستەم پێشکەوت.

کۆمار کە لەقۆناخی دامەزراندندا لەژێر بیانووی یاخیبوونی کوردان دیموکراتیزەبوونی ئەنجام نەدا، لەکاتێکدا لە گرنگترین قۆناخی هاوچەرخ بوونیشدا پێویست بوو لەرێگای دیموکراتیزەبوون سیستەمی خۆی کامڵ بکات. دیسان بەهۆی ترس و پەشۆکان لەپارچەبوون،

لەو باوەڕەدا بوو لەڕێگای سەرکوت کردنی کوردان دەتوانێ کێشەکە چارەسەر بکات. لەمیانەی هاربوون و سەفەربەری سەرتاسەری و هەموو جۆرە شێواز و ڕێچکەیەکی شەڕی تایبەت، پاکتاوکردنی کێشەکەی خستە ڕۆژەڤی خۆیەوە. بەگوێرەی هەندێ سەرچاوە ١٠٠ ملیار دۆلار، بەگوێرەی هەندێکی دیکە ٤٠٠ ملیاری بۆ ئەم کارە تەرخانکرد. ئەنجام؛ قەیرانی ئابووری کە لەئارادایە، تێکچوونی شیرازەی بواری کۆمەڵایەتی، ئیفلاسکردنی تەواوەتی پێکهاتەی سیاسییە. پشتگیریکردنی دەسەڵات کەوتۆتە ژێری لەسەدا دە. ئابوورییەك کە لەلایەن تەواوی جیهان چاوەڕوانی ڕۆژی کەوتنی دەکرێت، لەڕەوشێکدایە IMF نەبێت تەنانەت بۆ یەك ڕۆژیش ناتوانێ بەردەوام بێت. دەست لەوە بەردە کە بەربەرەکانی لەگەڵ جیهاندا بکات، ئەگەر ئەمریکا و یەکێتی ئەورووپا و دامەزراوەکانی دیکە نەبن؛ کەوتۆتە ڕەوشی کۆمارێك یەك ڕۆژ ناتوانێ بەردەوام بێت. ئەمەیە ئەو ڕەوش و شوێنگەیەی تورکیا کە نەتەوەپەرستی تورك پێی گەیاندۆوە. نەتوانییەتی کوردەکانی خۆی لەنێوببات، نە بەتەواویش توانددوونیەتەوە، بەپێچەوانەوە ڕاستینەیەکی کوردان جێگای باسە کە لەژێر ڕێبەرایەتی PKK لەنێو وەرچەرخانێکی مەزنی دیموکراسییانەدان.

بەرامبەر بەم ڕەوشە بابەتییە هەوڵدەدرێت سەبارەت بە قۆناخی داهاتوو هەنگاو بهاوێژرێت. ناوەندی چەپڕەو و ڕاستڕەو، سەرلەنوێ هەوڵی خۆرێکخستن و بەپارتیبوون دەدەن. هەر لە ئێستاوە سەبارەت بەواتەی لە ئارادان بانگەشەی کۆن بوونیان دەکرێت. هەروەکو بڵێی حکومەت گەیشتۆتە ڕەوشێك لە خولەکە زیادکراوەکانی یاریەکدا ڕۆڵ دەبینێ. زۆرینەی گەل گۆڕانکارییەکی بنچینەیی دەخوازێت. مسۆگەرە کە بژاری گەل بە لایەنی شارستانییەتی دیموکراسییانەیە. سوپا لە ڕەوشێکدایە دوورە لەوەی بیر لە کودەتا بکاتەوە؛ بە بێ فشارێکی ئەوتۆ بۆ سەر هاوسەنگییەکان، دژی ئەو وەرچەرخانە نوێیانە نییە کە لە کارەکتەری دیموکراسی و عەلمانی کۆمار ئەنجام بدرێت.PKK لە پێگەی بەرگری ڕەوا، هەڵوێستی یەکلاکەرەوەی سەبارەت بە بژاری چارەسەری دیموکراسییانە دیار کردووە.

ئاشکرایە بەرامبەر بەم تابلۆیە، کێشەکان لەمیانەی تەگبیری یەکلایەنە چارەسەر ناکرێن. سەرتاپاگیری و بەناوییەکدا چوونی چارەسەری پێویستییەکی لۆژیکە. کاتێك بینایەك ئاوا دەکرێت، تەنانەت یەك گۆشەشی بۆش بهێڵدرێ، تەواوی بیناکە بێ واتا دەکات. دیسان کاتێك لەبواری دەستوور و یاسادا گۆڕانکاری ئەنجام دەدرێت، کوردان ڕووبەڕووی لاتەریککردن بەجێ دەهێڵدرێن. هەرلە ئێستاوە زەمینەی پێکدادانێکی نوێ بەکراوەیی بەجێ دەهێڵدرێ. نەتەوەپەرستی ـ نەژادپەرستی تاکو ئێستا بەردەوام یاری بەچارەنووسی تورکیا دەکات. دیسان لەمیانەی ترس دەخوازێ ئایندەی تورکیا دیار بکات. هەربۆیە قەیران قووڵتر دەبێتەوە. دابڕان لەجیهان و تەنگەتاوبوون لەناوەوە، جەماوەر دەگەیەنێتە خاڵی تەقینەوە.

لەڕاستیدا کۆمار بەگۆڕانکاریەکی مەزندا تێدەپەڕێ. بەخێرایی بنەما کۆنەکانی بەلاوە دەنرێت. نوێبوونەوە بووە بەئومێدێکی هەرە بەهێز. ڕق و کاردانەوەیەکی مەزن بەرامبەر ئەوانە هەیە کە دژی گۆڕانکارین. ئەگەر تەنیا بەقسەش بێت، کەس نەماوە کە لایەنگری ڕێککەوتن، گۆڕانکاری و وەرچەرخان نەبێت. بەڵام تورکیا دەترسێ. تورکیا لەمێژووی نزیکی خۆی دەترسێ. بەهۆی ئەو تاوانانەوە دەترسێ کە لەبەرامبەر کوردان ئەنجامدراون. لەبەرئەو تاوانانە دەترسێت کە لەمێژووی نزیکدا بەرامبەر هێزە دیموکراسیخوازەکان ئەنجامیداوە. لەو دووڕووییە دەترسێ کە لەبەرامبەر پێوانەکانی دیموکراسی نیشانیداوە. تەواوی ئەم ترسانە، قەیران قووڵتر دەکاتەوە. لەڕاستیدا هەروەکو بانگەشەی بۆ دەکەن، قەیران یەکلایەنە نییە، بەرلەهەموو شتێک سیاسییە. تادوارادە ڕەهەندە سیاسی، سایکۆلۆژی، کۆمەڵایەتی و ئابووریەکەی لەناویەکدایە. تەواو بەو خاڵە گەیشتووە، یان چارەسەریەکی سەرتاسەری یاخود بێچارەیی. بەگوێرەی ئەوەی ئیتر هیچ کێشەیەك لەڕێگای کودەتا و سەرکوتکردنەوە چارەسەر نابێت و ڕەوشێکی بەمجۆرە لەئارادا نییە، ئیتر ناچارییە کە ئەو قۆناخەی تێیدایین جیاواز بێت. ڕەوشێکی وەها لەئارادا نییە لەڕێگای نەتەوەپەرستیەوە چارەسەر بکرێت. ئەمەترسی جولانەوەیەکی چەپڕەوی لەئارادایە کە سەرکوت بکرێت، ئەجولانەوەیەکی کورد جێگای باسە کە لەنێو ڕەوشی شەڕدا بێت. نەتەوەپەرستی بەرامبەر چی شەڕ دەکات؟ تەواوی دراوسێکان دۆستایەتی دەخوازن. گەل بەهیچ جۆرێك لایەنگری توندوتیژی نییە، بەپێچەوانەوە لەتوندوتیژی بێزاربووە، نەفرەتی لێدەکات. ئەگەر زیاتر تەنگەتاو بکرێت، لەڕێگای تەقینەوەیەکی کۆمەڵایەتی هەڕەشەی لێدەکات.

ئەمەش بەو واتایە دێت قۆناخێك لەمێژووی تورکیا بەڕێوە دەچێت کە زەمینەی ماددی نەتەوەپەرستی، یاخیبوون و نکوڵیکردن و سەرکوتکردن نەماوە و سەردەمی بەسەرچووە. قۆناخی نەتەوەپەرستی و یاخیبوون و هەڕکردن کۆتایی پێدێت. هەرچەندە هەندێ کەس نەخوازن، بەڵام قۆناخێك دەست پێدەکات ئیتر ڕۆڵی ڕەوتی نەتەوەپەرستی نەتەوەی سەردەست و نەتەوەپەرستی بۆرژوای گەلی ژێردەست و چەپڕەوێتی کۆن و ئیسلامی سیاسی نەماوە و نابێت. هەرچەندە لەم لایەنەوە سەبارەت بەتوانستی ئایدیۆلۆژی و سیاسی هەندێ کەموکوڕی هەبێت، بەڵام بەڕاستی تورکیا دەکەوێتە نێو قۆناخێکی نوێوە. مسۆگەرە کە جەماوەری گەل بەچڕی چاوەڕوانی قۆناخی نوێ دەکەن. ئەگەر دەوڵەت گۆڕانکاری ئەنجامنەدات ئەوا بەڕووتی لەم گۆڕەپانەدا دەمێنێتەوە. ئەگەر لەبواری ئایدیۆلۆژی و سیاسی و ئاکارییەوە سیاسەت سەرلەنوێ قۆناخی نوێ نەخوڵقێنێ، مسۆگەر زێر دەکەوێت. ئەگەر نەخوازن تەقینەوەی سیاسی پێ بەپێ وەکو مەترسیەك مەزن بێ و بتەقێتەوە، پێویست دەکات دەربازی قۆناخی نوێ بن. بەرامبەر بە ڕەهەندە سیاسی، سایکۆلۆژی و کۆمەڵایەتیەکانی قەیران، چەندە بڕێکی زۆری دۆلار تەرخان بکرێت، تاوەکو هەلومەرجەکانی قۆناخی نوێ

نەبێت و سەرلەنوێ ئاواکردن ئەنجام نەدرێت، ئابووری لەو قەیرانە ڕزگاری نابێت کە زیاتر قووڵبوونەوەی ناچاریەکە. قۆناخی نوێ، دەبێتە ئەو قۆناخەی کە تەواوی ئەم بنبەستبوونانە بەلاوە نرابێت، لەبواری هێزی و سەرلەنوێ ئاواکردندا گۆڕانکاری و وەرچەرخان ئەنجامدرا بێت، دەبێتە قۆناخێك کە بەڕاستی کۆمار وەکو دەوڵەتێکی یاسا و عەلمانی و دیموکراسییانە سەرلەنوێ ئاواکرابێتەوە. دەبێتە قۆناخێك کەکێشەی کورد لاتەریك ناکرێت، لەسەربنەمای یەکێتی دیموکراسییانە بەرەو چارەسەری هەنگاو دەهاوێژرێ.

***ج ـ قۆناخی سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی کۆمار و چارەسەری دیموکراسییانەی کێشەی کورد:***

تێڕوانینێکی گشتی سەبارەت بەوە هاتۆتە ئاراوە کە ئەو قەیرانەی تورکیا لەساڵانی ۲۰۰۰ تێیدا دەژی دەشێ بە دیموکراتیزەبوونی پێکهاتەکانی دەوڵەت، کۆمەڵگا و سیاسەت تێپەڕ بکرێت. نە گرژیەکی نوێ، نە دروشمەکانی یەکێتی و هەمناهەنگی نەتەوەپەرستی، گوزارشت لەئومێدەکانی قۆناخ ناکەن. گەل، بەئەندازەی پەسندنەکردنی دروشمە نەتەوایەتییەکان، هەڵوێستە دیماگۆژیەکانی پێکدادانیش پەسند ناکات. لەژێر سایەی سیستەمێکی دیموکراسیدا شانبەشانی دەوڵەتی ماف، سیستەمێکی ئابووری دەخوازێت کە خۆی لەگەندەڵبوون پاك کردۆتەوە ، لەهەڵئاوسانی دارایی ڕزگاری بووە، دەتوانێ کێشەی بێکاری چارەسەر بکات، چاودێری دابەشکردنێکی عادیلانە بکات. ئاشتی و ئازادی و دادوەری دەخوازێت، کە ئومێدێکی مێژووییەتی. لەمیانەی ئەم بەهایانەوە کارەکتەری قۆناخی نوێ شێوە دەگرێت. دەستێوەردانێکی نوێ بۆ ئەمە پێویستە. بەبنەماگرتنی ئەو ئیرادەیەی گەل کە هاتۆتە ئاراوە، سەبارەت بە دیموکراتبوونەکەی مەرجە. بۆ ئەوەی سیاسەت ببێتە خاوەنی پێکهاتەیەکی دیموکراسییانە، یاسایەکی دیموکراسییانەی هەڵبژاردن و پارتە سیاسیەکان ناچارییەکە. لەکاتێکدا دەستوور دەوڵەت دیموکراتیزە دەکات، یاسای هەڵبژاردن و پارتە سیاسیەکان سیاسەت دیموکراتیزە دەکەن. هەرچی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنییە کە لەڕێگای یاساکانەوە خراونەتە ژێر گەرەنتیەوە، سەرەکیترین ئامرازەکانی دیموکراتیزەکردنی کۆمەڵگایە. کاتێك بەتەواوی مافی ئازادی بیروڕا دەربڕین و کولتووری بکەوێتە ژێر گەرەنتیەوە، ئەو کاتە مافە سەرەکیەکانی مرۆڤیش پەیڕەو دەکرێت. هەرجولانەوەیەکی سیاسی بخوازێت بەرەو دەسەلات بچێت، تەنیا کاتێك دەرفەتی سەرکەوتنی هەیە، کە بەڕاستی گرێدراوی ئەم پرۆژەیەی دیموکراسی بێت، ڕۆژبەڕۆژ زیاتر مەیلی نوێ بەم لایەدا دەشکێتەوە. بۆ بەدیهێنانی ئەم پێشکەوتنانە، پێویستی بەشۆڕشی هێزی هەیە. کاتێك هەرکەس دەڵێ: "من گۆڕام" ئەوە نیشان دەدات کە شۆڕشی هێزی بەرەو پێش دەچێت.

ناوبردنی ئەو قۆناخەی لەپێش کۆمەڵگا و دەوڵەتی تورکیا دایە بەتورکیایەکی دیموکراتییانە واقیعییە. یەکەمین قۆناخی کۆمار (۱۹۲۰ ـ ۱۹۵۰)، بەهۆی دامەزراندن و ریفۆرم و پاراستن، بووە قۆناخی کۆماری زاڵ؛ قۆناخی دووەم (۱۹۵۰ ــ ۲۰۰۰)، قۆناخی کۆماری

تۆلیگارشیەتە، کە بەڕێوەبەرایەتی هاوبەش و ئارەزوومەندی توێژێکی سنووردار‌ی چینی سەردەستە؛ قۆناخی نوێش، قۆناخی کۆماری دیموکراسییانەیە، ئەو سەردەمەیە کە تێیدا دەژین، کە بەواتای رەنگدانەوەی ئیرادەی گەل دێت لەسەر بنەمای پێڕەوێکی دیموکراسییانە. ئەم قۆناخە لەبواری هزری و بەدەزگابووندا لەسەر بنەمای جموجۆڵێکی بەرفراوانی کۆمەڵگا پێك دێت.

چارەسەری دیموکراسیانەی کێشەی کورد هەم هۆکاری سەرەکی ئەم قۆناخەیە، هەم تەواوکەریەتی. هەردوو قۆناخی یەکەمی کۆمار، سەرباری ئەوەی لەدامەزراندندا کوردان هاوپەیمانێکی ستراتیژی بوون، بەهۆی نەتەوەپەرستی و یاخیبوونەکان، لەمیانەی لاتەریککردن و نکوڵیکردن لە کوردان بەڕێوەچووە، تەنانەت کاتێك رێبەری جولانەوە مستەفا کەمال جولانەوەکەی رێکدەخست، کورد و تورکی وەکو دوو هاوپەیمان راگەیاندبوو کە وەکو نینۆك و گۆشت پێویستیان بەیەکتری هەیە. بەبیانووکردنی ئەو یاخیبوونانەی کە بە رێبەرایەتی دەرەبەگەکان ئەنجامدران بۆ نکوڵیکردن لەکوردان، خراپترین رووداوی کۆمارە؛ رێگای لەپێش ئەوە کردۆتەوە بەناتەواوی بمێنێ و پێچەوانەی لۆژیکی سەردەمی دامەزراندن بۆتەوە؛ هەروەکو چۆن نکوڵیکردن لەکێشە و دیاردەکە نەیتوانیوە کۆتایی پێ بێنێت، نەیتوانیوە رێگا لەپێش ئەوەش بگرێت کە فورسەتر نەبێت و نەکەوێتە رۆژەڤەوە. بێچارەیی بەردەوام ترسی ناوەتەوە، ئەمەش کۆماری بەرەو وشکبوون بردووە و رێگای لەپێش دیموکراتیزەبوونی گرتووە. گەیشتنی نەتەوەپەرستی بەئاستی شۆڤێنیزم بۆتە کۆسپ لەپێش بینینی راستینە مێژووییەکان.

هەروەکو لە بەشە پەیوەندیدارەکانیشدا ئاماژەی پێکرا، کوردان لەرۆژهەڵاتدا کۆڵەکەی سەرەکی بەهێزبوونی تورکەکانن کە لە ئەنادۆڵ هەڵکشان. کاتێك ئەم کۆڵەکەیە لەدەست دەربهێنرێ، زۆر زەحمەتە تورکێتی ئەنادۆڵ بەتەنیا لەسەر پێیان بمێنێتەوە. لەتەواوی قۆناخە هەستیارەکانی مێژوودا ئەم راستینەیە بینراوە. مێژوو ئەوەی سەلاندووە کە لەهاتنی تورکەکان بۆ ئەنادۆڵ، ئەگەر کوردان نەبوونایە ئەوا مەحاڵ بوو سەرکەوتنی مەلازگرت بەدیبێت. هەروەها لەسایەی تەفلیبوونی کوردان بۆ شەڕی چالدێرانی ١٥١٤ و ئەو سەرکەوتنەی بەدەستهات، ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەئاستی رۆژهەڵاتی ناوین توانی ببێت بەهێز. زۆر لەراگەیاندن و فەرمانەکانی مستەفاکەمال، ئەوە نیشان دەدەن کە بە بێ کوردان ناتوانن لەشەڕی رزگاری نیشتمانیدا سەرکەوتن بەدەست بێنن. چەندین رووداو و گۆڕانکاری ئەوە نیشان دەدەن کە هەبوونی کوردان بۆتە هۆکاری ئەوەی ئەنجام بەلایەن تورکەکاندا بشکێتەوە.

لەکاتێکدا ئەم راستیانە لەئارادان، بەنەبوو لەقەڵەمدانی کوردان بەواتای ئەوە دێت کە تەوری لەپێی خۆیداوە. کاریگەری کوێرانەی شۆڤێنیزم لێرەدایە. هەم وەکو هاوپەیمانێك دەیبینێ کە پێویستی پێ هەیە و وەکو گۆشت و نینۆك وایە دواتریش کاتێك پێویستی پێ

نامێنێ نکوڵی لێدەکات، ئەمە بووە بەخراپترین سیاسەتی کۆمار. ئەم هەڵوێستە جگە لەوەی زەبری لەخۆی وەشاندووە هیچ ئەنجامێکی دیکەی نەبووە. هەروەکو چۆن توانینەوەی چاوەڕوانکراو ئەنجامگیر نەبوو ئەوا ئاستی تەکنۆلۆژیا و گەیاندنی ڕۆژگاری ئەمڕۆمان ئەوەی مسۆگەر کردووە کە ئیتر ئەم جۆرە ڕێچکە و شێوازانە سەردەمیان بەسەر چووە.

لەم ڕێیەوە ڕوونکردنەوەی هەندێ زاراوە سەبارەت بەبێ واتابوون و بەسەرچوونی ئەو ترسەی دەرهەق بەدیاردەی کورد هەبوو:

یەکەمین ئەو هەستیارییەیە کە سەبارەت بە یەکپارچەیی وڵات و یەکێتی دەوڵەت نیشاندەدرێت. ئەم هەستیارییە زیاتر سەرچاوەی خۆی لەو ترسە دەگرێت کە بەرامبەر مەسەلەی کورد هەیە. ترس نکوڵیکردنی هێناوە، نکوڵیکردنیش بەردەوام یاخیبوونی لایەنێک و قەیرانی لەگەڵ خۆیدا هێناوە ئەنجامیش، خۆتەفرەدان و زیانی ماددی و مەعنەوی مەزنە. هەروەکو ئاشکرایە ئەگەر کوردان لەوڵاتی دایکدا بەبرایانە و لەمیانەی هەبوونی زمان و کولتووری خۆیان بژین، ئەوا یەکپارچەیی وڵات پتەوتر ئاوا دەکرێت. لەوە دەترسن، ئەو ئازادییەی بۆ کوردان دانی پێدا بنرێت، بەجوداخوازی و بوون بەنەتەوەیەکی جیا ئەنجامگیر بێت. لەرێگای گفتوگۆیەکی ئازادانە دەتوانرێ بێ سوودی و بێ واتایی جوداخوازی بسەلمێنرێ. دەتوانرێ لەهەمەوو لایەکەوە کاریگەری دەوڵەمەندێتی ژیانێکی هاوبەش و ئازادانە، نیشان بدرێت. لەراستیدا جوداخوازی ڕەوتێکە کە نەتەوەپەرستی دوو لایەنە دەیوروژێنێ. تەنیا لایەنێك بەرامبەر ئەمە بەرپرسیار نییە، هەر دوو لا بەرپرسیارن. دژە ژەهری جوداخوازی، بڕاوی ئازادی و یەکێتی دیموکراسییانەیە. کێشەی تاکە نەتەوەیەك و بوون بەنەتەوەیەکی جودا یاخود نا، کێشەیەکە لەئەنجامی وتووێژێکی زانستیانە تێپەر دەکرێت. بانگەشەی کوردان گەیشتوون بەقۆناخی نەتەوەبوون یاخود نا، تەنانەت ئەگەر پێی گەیشتبێ هەرەشە لەنەتەوەی تورك دەکات، بانگێشەی فەناتیزمی نەتەوایەتییە. ئاشکرایە کە بەزۆر بەتورککردنی کوردان و بەتورك لەقەڵەمدانیان نەتەوەی تورك بەهێز ناکات. ئاشکرایە کە تورکەکان نەك بە زیادکردنی ژمار، بەڵکو لەمیانەی ئابووری و دیموکراسیەتێکی پێشکەوتوو بەهێزتر دەبن. هەڵسەنگاندنی کوردان وەکو دیاردەیەکی کۆمەڵناسی، لەبەرژەوەندی نەتەوەی تورك دایە. کاتێك نەتەوەی تورك هەبوونی کوردان پەسند بکات، زیاتر ڕێزگرتن و داخوازی یەکێتی لەلای کوردان چەکەرە دەکات، بەپێچەوانەوە، نکوڵی لێکردن، قەدەخەکردنی زمان و زەوتکردنی مافەکانی پەروەردە، بەردەوام ڕێگا لەپێش بندەستی و بچووك بینین دەکاتەوە. بۆ هەردوو لایەنیش، چاوەڕوانی هەڵوێستێك ناکرێ لەمە زیانبەخشتر بێت.

ئەوەی من سەبارەت بەم بابەتە دەخوازم پێشنیازی بکەم، تاوەکو ببێتە تێروانینێکی گشتی ئەوەیە، هەروەکو دەبینرێ چەندین وڵات، بەناوی وڵاتێکی یەك نەتەوە ناوی دەبرێت. بۆ نموونە هەر وەکو چۆن سویسرا، بەلژیکا، ئیسپانیا، ڕوسیا، ئەمریکا و چەندین وڵاتی دیکە

وەهایە، چەندە هەمەڕەنگی و هەبوونی زمان و کولتووریش هەبێت، هەروەکو چۆن گووتنی تاکە نەتەوەی سویسرا، بەلژیکا، ئیسپانیا و ئەمریکا دەبێ، ئەوا وەکو نەتەوە(گەل)ی تورکیاش تاکە نەتەوە دەبێت. لەجیاتی نەتەوەی تورک، نەتەوەی تورکیا واقیعیترە، لەگەڵ واقیعی کۆمەڵایەتی و مێژوویی گونجاوترە. هەروەکو لق و پۆپە جیاوازەکانی دارێك، هەر زمان و کولتوورێکیش دەتوانن وەکو لقی جیا جێگای خۆیان لەنێو یەك هەوارەدا بگرن. لەمیانەی فشارەوە حاشاکردن لەهەبوونی کولتووری و دیاردە کۆمەڵایەتیەکان کە جیهان وەکو چاوگێکی دەوڵەمەندی دەبینێ، ئاستەمە و هیچ سوودێکی نییە. کاتێك کوردانیش وەکو دەوڵەمەندێتیەك لەنێو هەمان هەوارەی نەتەوەیی وڵاتدا جێگای خۆیان بگرن، ئەوا دەتوانن هاوکارییەکی راستەقینەی نەتەوەی تورك بکەن. بەزیادەوە سەلمێنراوە کە لەڕەوشێکی پێچەوانەدا، واتە گومانی بەردەوام و پێکدادان و هێرشی سەربازی دەبنە سەرچاوەی گەورەترین زیان. هێشتنەوەی دیاردە کۆمەڵایەتیەکان بۆ گۆڕانی سروشتی لەپاڵ ئەمەشدا دەرفەتدان بەپێشکەوتنی بەها کولتوورییەکان، بەدرێژایی مێژوو بووە بە رەوڕەوەی مرۆڤایەتی. تەنیا توندڕەوترین دەمارگیرەکان هەبوونە کولتوورییەکانیان لەناوبردووە. جێگای ئەمانەش لەمێژوودا دیارە.

ئەگەر ئەم ئاڵۆزییەی زاراوەکان و نزیکبوونەوە شۆڤێنیەکان دەستی لێبەربدرێت، ئەوا کۆسپێکی ئەوتۆ نامێنێ کە نەهێڵێ کوردان ببن بەهاووڵاتی وشیار و بروستی کۆمار، چارەسەری راستەقینەی کێشەی کورد لەمیانەی ئەو هاووڵاتێتیەی کۆمار دەست پێدەکات کە بەئازادی و ناسنامەی کولتووری خۆی تەڤلی دەبێت. چارەسەری نە دەوڵەتێکی جودا، ئەنکولێکردن، ئەسەفەربەری سەربازییە، بژاری هاووڵاتییەتی کۆماری دیموکراسییانەیە، کە لەهەموو بوارێکدا خاوەن مافێکی یەکسانە، وشیار و بەرێکخستنە. ئەمەش جوداخوازی نییە، یەکێتییەکی برایانەی راستەقینەیە، لەم پێناوەشدا سوودوەرگرتنی هاوبەشە لەتەواوی مافەکان. ئەم نزیکبوونە مەترسیەکی ئەوتۆی لەدواوە نییە، کە دەڵێ با زمانی کوردی ببێتە زمانی فەرمی و فیدراسیۆنی بەدواوە بێت. هەندێ هەڵوێستی نەتەوەپەرستی و شۆڤێنی بەردەوام ئاماژە بەم دیماگۆژیەتە دەکەن. لەبەر ئەوەی تێناگەن کە دیموکراسییەتێکی راستەقینە لە دەوڵەتێکی جیا و فیدراسیۆنیش بەهادارترە و رژێمێکە مافەکان لەگەڵ خۆیدا دابین دەکات، ئەم سەفسەتانە دەردەخەنە پێش. هێزی دیموکراسیەت کە توانستە بێ هاوتاکەی چارەسەری و تایبەتمەندێتی بەدیهێنانی بەرفراوانترین بەرەی هاوپەیمانی و رێککەوتن دێت. ئەگەر دیموکراسی سیستەمێکی بالا نەبێت، لەوانەیە باس لەمەترسی جودابوونەوە و فیدراسیۆن بکرێت. کەمایەتیەك دەتوانێ بانگەشەی ئەمە بکات. لەمیانەی بالابوونی خۆیەوە ئەوەی سەلماندووە کە دیموکراسیەتی تەواو تاکە سیستەمێکە کە هەموو کاتێك گەلان، گروپ، تەنانەت چینەکانیش لەبەرزترین ئاستی سوودمەندی دەهێڵێتەوە.

ئیتر لەهەموو لایەنێکەوە ئاستەمە ڕێگا لەوە بگیرێت کە کوردان وەکو دیاردەیەکی مێژوویی، وەکو هاووڵاتی ئازاد لەمیانەی ناسنامەی کولتووری خۆیانەوە تەڤلی کۆماری دیموکراسییانە ببن. لەسەرووی هەموو شتێکەوە بەهۆی دیموکراتیزەبوون ناتوانرێ کۆسپی بخرێتە پێش، یان دەست لە دیموکراسییەت بەردەدەیت، یان تەڤلیبوونی ئازاد پەسند دەکەیت. لەمیانەی دیماگۆژیەت و سەرکوتکردنەوە ئاستەنگ کردنی ئەمە، کۆنەپەرستیەکە و، مسۆگەر چەرخەکەمان پەسندی ناکات. ئاستەنگ کردنی ئەمە نە دەتوانرێ وەکو پێویستییەکی هاوچەرخ بوون، نە بە ئاتورکچێتی ڕوون بکرێتەوە، وتەیەکی فاشیزمە و پێویستە دەستی لێ بەربدرێت. ئەوەی دەمێنێتەوە ئەوەیە، گەلان بە بەهێزترین شێوە ئیرادەی ئازادانەی خۆیان نیشانبدەن، یەکپارچەیی وڵات و یەکێتی دەوڵەتە.

هەروەکو چۆن ئەم نزیکبوونەوە بەگوێرەی ڕۆحی پەیوەندی تورك ـ کورد مێژوویە، ئەوا لەگەڵ تایبەتمەندێتیەکانی دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤی ئەم سەردەمەشمان گۆکە. ئەگەر سەرنج بدرێ دەبینرێ، لەم چارەسەریەدا باس لەگۆڕینی سنوورەکان و ئۆتۆنۆمی و لیستەیەکی جیاوازی ئابووری، کۆمەڵایەتی، کولتووری و سیاسی گەلان ناکرێت. تەنیا ئەوەی پێویست دەبینرێ، گرێدانێکی ڕاستەقینە بەسیستەمی دیموکراسی و دەستبەردان لەبانگەشەکانی فاشیزمە، هەر گروپێك بەبێ نکوڵیکردن لەسیستەمی فەرمی، ناسنامەی کولتووری خۆی و پەروەردە پەیڕەو بکات. گەوهەری چارەسەری دیموکراسییانەی کێشەی کورد ئەمەیە. لەوانەیە هەندێ ناوەندی نەتەوەپەرستی کوردان بەمە قەڵس ببن، تەنانەت ئەمە بە"خیانەت لەدۆزی سەدان ساڵەی کورد" دابنێن. بەڵام هەروەکو نەتەوەپەرستی ـ شۆڤێنی نەتەوەی سەردەست، ئەم نەتەوەپەرستییەش لەجیاتی چارەسەری بەردەوام جگە لەو دوژمنایەتی، جوداخوازی، ئێش و خوێن، زیانی ماددی و مەعنەوی، هیچ بەهایەکی دیکەی بەرهەم نەهێناوە. لەبەرئەوەی ئەمانە لەلایەن گەلەوە پشتگیریان لێناکرێت، بەرەو چارەسەری دیموکراسییانە نایەن. لەبەرئەوەی ئۆتۆنۆمیخوازی بەگوێرەی بەرژەوەندییە چینایەتیەکانیان گونجاوە، دووری دیموکراسی ڕادەوەستن.

کاتێك لەم هەلومەرجە سنووردارەدا ڕێگا لەپێش چارەسەری دیموکراسییانە دەکرێتەوە، ئەوا لەمیانەی هاوپەیمانێتی جیاوازەوە و پێ بەپێی قۆناخ ڕەهەندە یاسایی و دەستووریەکانی کێشەکە دەکەونە سەر ڕێڕەوی چارەسەری. جێگەگرتن لەنێو دەستوور و یاسادا، کێشەیەکی کات و تێکۆشانی دیموکراسییانەیە. زوو یا درەنگ بەرهەمەکەی بەدەست دەهێنرێ. دەشێ پێکهاتە و پلاننامەی کۆمەڵایەتی ـ ئابووری گونجاو بەگوێرەی ناوچە ئاوا بکرێت. چالاکی هونەری و کولتووری و ڕاگەیاندن ـ بڵاوکردنەوەی بە زمانی خۆی، پەروەردە بە زمانی زگماکی، بابەتێکن پێبەپێ و لە میانەی ئامادەکارییەکی درێژەوە بە چارەسەری دەگات.

هێندەی دیموکراسی ببێت بە کولتووریکی ژیان، ناشێ ئەم هـ موو کێشـانە بەچارەسـەرنەکراوی بمێنێتەوە.

ئاشکرایە کە ئەم چارەسەریە ماقووڵە سەبارەت بەکێشەی کـورد، بەئـەندازەی یەکپارچەیی تورکیا توانـا و هـێزێکی راسـتەقینە بەیـەکێتی دەوڵـەتیش دەبەخشـێ. ئاشـکرایە کـە ئـەم چارەسەریە لە ئەندامێتی تورکیا لەئەوروپا، تادەگاتە پەیوەندیەکانی لەگەڵ رۆژهەڵاتی ناوین، قەفقاسـیا، ئاسـیای نـاوین، بـەلکان و چـەندین دەوڵـەت، لەهـەموو بوارێکـدا کاریگەریـەکی پۆزەتیڤانە دەبینێ و رێزەکەی زیاد دەکات. تورکیایەك کە لەناوەوە تەواوی هێزی خۆی داوەتە سـەر پێشـکەوتنی ئـابووری، کێشـەکانی ناسایشـی چارەسـەر کـردووە، لەگـەڵ تـەواوی هاووڵاتییەکانی ئاشت بۆتـەوە، ناشـێ بـەخێرایی هەڵنەکشێ. ئاشـکرایە کـاتێك کـوردان بـەبێ بـەهاووڵاتی شـەرمەزار نەکرێت لە گونـد و شـار و شـارۆچکەکانی خۆیـاندا بژیـن، رۆڵێکـی بـاش لەچارەسـەرکردنی کێشـە انی ناهاوسـەنگی ژمارەی دانیشتوانی شارە گـەورەکان، گـەیاندنێکی دروست، مەزنبوونی لەرادە بەدەریان و پەروەردە و چەندین کێشەی دیکە دەگێرن. دانیشتوانی کورد کە رێگای بەرهەمهێنان و بازاریـان لـەپێش کرابێتـەوە، هەریـەخۆی بەتـەنیا، سەرچاوەی دەوڵەمەندێتییە. نابێ لەبیر بکرێت کە مرۆڤی ئازاد زیاتر بەرهەمدێنێ و کارا دەبێت. ئەمەش رێگای راستەقینەی پێشـکەوتنی ئابووریـە. تەنگـەژە و قـەیران لـەولاوە بمێنێـت، تەنانـەت بەرەوشێك دەکات چەندین ولاتی پێشکەوتوو تێپەڕ بکات، لەڕاستیدا دەبێتـە هێزی پێشـەنگی ناوچەکە. ئەم راستییانـە لەناسۆی ئەم چارەسەریەدا دەبینرێ. ئاشکرایە کە میراسی بێچارەیی چییە، خوێن، ئێش، لەهـەموو لایەنێکەوە زیـان و گەڕانەوەیـە بۆهـەمان خاڵەکانی دەستپێك. ئەگەر کۆماری تورکیا وابیربکاتەوە کە لەمیانەی نکوڵیکردن لەکێشەی کورد، لەقۆناخی دواتردا دیموکراتـیزە دەبێـت و قەیرانـەکانی خـۆی تێپـەڕ دەکـات، لـەناوەوە لەمیانـەی یـەکێتی و لەدەرەوەش رێککەوتنی بەهێز درێژە بەرێگای خۆی دەدات، لەو رەوشەی رۆژگـاری ئـەمڕۆماندا ئاشکرابووە کە ئەمە خۆخەڵەتاندنێکە. تەنانەت هەڵمەتێکی نوێی گەریلایی PKK کە تاوەکو ئێستا لەنێو رەوشی ئاگربەستدایە، بەسە بـۆ ئـەوەی یەکەمین چارەکی سەدەی بیست و یەك لەدەست بدات. هیچ کەسێك کەڵك لەمە نابینێت، لەوانەیە کوردەکان زیـاتر بـەقووولایی دەرك بەهـەبوونی خۆیـان بکـەن و کێشـەکە قورسـتر بکـەن. رۆژێـك دێـت هـەمان رێگـای چارەسـەری دیسان خۆی دەسەپێنێ.

لەڕاستییدا ئەم چارەسەریە دیموکراسـییانەی پێویسـت بـوو لەسـەرەتای سـەردەمی کۆمـاردا پێشبکەوێت، چەندە بەئێشە کە هێندە درێـژەی کێشـا و پـڕ لەئازار بـوو بـۆ گـەل و ولاتێك چ زیانێك لەخۆوە دەگرێت! هەروەکو چۆن چارەسەری مەحاڵ نەبوو، سوودی بۆ هەموو لایـەنێك و کەسێك هەبوو. بۆچی لە چارەسەری رابکرێت؟ ئەگەر لێی رابکرێت، ئەوا هـەروەکو لـەتوێژە بەرژەوەندیخوازەکان بینرا، ئەمانـە توێژێکن کە ژیـانی خۆیـان بەقـەیران و شـەڕ بەسـتۆتەوە.

بەرادەی هەرە زێدە لەرەنج دابڕاون، بێ بەزمیین، بەبێ کارکردن چاویان لەقازانج بەولاوە هیچ شتێکی دیکە نابینن. بەڵام ڕاستییەکان ئەوە نیشان دەدەن کە ئیتر کۆتاییەکانی ئەمانەش هاتووە، گەلان وشیار بوونەتەوە، کۆتایی گەمەکەش هاتووە. هەرلەبەرئەوەیە دەڵێین قۆناخی داهاتوو، قۆناخی سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی دیموکراسییانەی کۆمار و لەگەڵ ئەمانەشدا قۆناخی چارەسەری کێشەی کوردە لەمیانەی یەکێتی ئازادانەوە. ئەمەیە ئەو ئاقارەی مێژوو پێیدا دەڕوات. هەرچەندە هەندێ ڕووداوی کاتی لەرێگا ڕوویدات، بەڵام مسۆگەر لەم ڕێگایە ئامانج بەدیدێ.

دەشێ ڕەوشی بەرگری ڕەوای چەکداری PKK ببێتە کێشە. نابێ لەمیانەی هەندێ داواکاری کە جێبەجێ ناکرێتە کۆسپ لەپێش بەلاوەنانی ئەم کێشەیە بنرێتەوە. لێبوردنێکی گشتی و هەڵوێستی بەیەکەوە ژیان و تەبایی، ڕێگا لە پێش ئەوە دەکاتەوە کە بە سانایی تێپەڕ بکرێت. بەڵام پێویستە زۆر بەباشی بزانرێت، تاوەکو بەتەواوی دیموکراسی نەکەوێتە ژێر گەرەنتیەوە، دەرفەت بەوە نەدرێت کە گەلی کورد ئازادانە گوزارشت لەخۆی و هەبوونەکەی بکات و ناسنامەی کولتووری و زمانی زگماکی خۆی پێشنەخات، ئەوا نابێ بیر لە کۆتاییهاتن و هەڵوەشانەوەی PKK یاخود هاوشێوەکانی بکرێت. تاوەکو ئەم کێشە زەبەلاحانە لەئارادا بێت، هەموو کاتێک ڕێگا لەپێش ئەو ڕێکخستنانە دەکەنەوە کە بۆ هەموو شێواز و ڕێچکەیەك کراوەن.

کۆك لەگەڵ هەڵوەستەی بەیەکەوە ژیان، نزیکبوونەوەیەکی ماقووڵانەی دەوڵەتی دیموکراسییانە کە ئیتر ئەوە ببینێ تێپەڕکردنی کێشەکە گرێدراوی هەڵوێستی خۆیەتی و هەنگاو بەهاوێژێ، قۆناخی ململانێی نەتەوەپەرستی و یاخیبوون و سەرکوتکردن کۆتایی پێدێنێت، ئەوە بزانێ کە ڕاستەرێگرتنی تەواوی کێشەکان بەرەو قۆناخی ڕێککەوتنێکی دیموکراسییانە واتایەکی مێژوویی هەیە و جێبەجێکردنی پێویستیەکانی، پێداویستیەکی بەرپرسیارێتی خۆیەتی.

مێژوو پڕە لە نموونەی ئەو کەس و پارتی و دەوڵەتانەی لەکاتی خۆیدا هەنگاویان نەهاوێشت و ڕێگایان لەپێش ئازار و زیانی مەزن کردەوە. تورکیا وڵاتێکە کە بەرادەیەکی هەرە زێدە لە مێژووی خۆیدا نموونەی وەهای بەخۆیەوە دیوە. ئەگەر بەشێوەیەکی سنوورداریش بێت ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەکاتی خۆیدا هەڵوێستێکی لیبرالی وەکو ئینگلتەرای بنواندایە، ئاراستەی مێژوو جیاوازتر دەبوو. هەروەکو چۆن ئەتاتورکیش زۆر هەڵوەستەی لەسەر کردووە، لەسەردەمی دامەزراندنی کۆماردا توانستی پێشکەوتن بەئاراستەی دیموکراسی نیشاندرابووایە، ئەوا تورکیا بەئاستی ژاپۆن دەگەیشت. هەڵوێستی موحافەزەکارانەی تورکیا بەرامبەر بەکێشەکان، ڕووبەڕووی ڕەوشێکی مەترسیداری ئەوتۆی دەهێڵێتەوە زۆر لەو وڵاتانەی جەمسەری سۆسیالیستی دواکەوتووتر بمێنێتەوە کە دوێنێ ڕووخان. پێشنەخستنی

نزیکبوونەوەیەکی پۆزەتیف بەرامبەر بەکێشەکان، ناوی لەدەستدانێکە کە لەئەنجامی ئازار و زیانێکی مەزن ڕوودەدات. تورکیا لەتەنگەرێی ساڵانی ٢٠٠٠ی مێژووی خۆیدا، لەقۆناخی تاقیکردنەوەیەکدایە کە لەمیانەی حەزکردن لەهەڵەکانی و خۆگرێدان بەترسەکانی بە هیچ بیانوویەك ناتوانێ ونکردن بۆ کەس ڕوونبکاتەوە. پێویستە ببینێ کە کۆسپێکی ئەوتۆ لەپێش سەرکەوتندا نییە، ئەگەر گرێدراو بەپرەنسیپە سەرەکییەکان و ڕۆحی سەردەم بەڕێوەبچێت. ئەو ڕقەی بەرامبەر بە ئێش و زیانەکانی ڕابردوو هەیە بکرێت بەهێز و ئایندە قازانج بکرێت، دەبێتە خودی ئەم مێژووەی دەنووسرێ، دەبێ ببێت.

هەروەها ئەمەش بابەتێکە زۆرجار نموونەی لەمێژوودا بینراوە، کە لەقۆناخی بەمجۆرەدا وڵاتپارێزی و برایەتی ڕاستەقینە، داستانی بەکەسان و گەلان نووسیوە، باوەڕی و سووربوونی خۆم نیشان دەدەم بەرامبەر بەوەی کە هێزە بەرپرسیارە ڕاستەقینەکانی تورکیا و ئازادیخوازە ڕاستەقینەکانی گەلی کورد، بەیەکەوە لەمیانەی ئەم ڕۆح و پرەنسیپانەوە. سەرکەوتنی کۆماری دیموکراسییانە بەدیدێنن و بڕیاری مێژووش بەم ئاراستەیەدا دەبێت.

٢ ـ کێشەی نەتەوەیی لە ئێران و چارەسەری ئیسلامی دیموکراسییانە

هەر لەسەرەتای مێژووەوە پێکهاتەی فرە نەتەوەیی ئێران، بەڕێوەبەرایەتییەکی بەشێوە و شێوازی هەرێمی هێناوەتە ئاراوە. وڵات، لە چوار هەرێمی ئەتنیکی ـ قەومی خاوەن بنەمای مێژوویی و چەندین ناوچە پێکهاتووە کە کەمایەتییەکانی تێدا دەژین. هەرێمی فارس، باشوور و ناوەندی ئێرانە، کە گەورەترین قەوم، فارسەکان تێیدا چڕبوونەوە و ناوەندەکانی شارستانییەتیان تێدا ئاوا کردووە. هەرێمی خوراسانیش دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵات، کە لەمێژوودا بە پارتیا ناودەبرا، لەڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا چەندین ناسنامەی کولتووری لەخۆوە دەگرێت. لەباشووری ڕۆژهەڵاتیش بەلوجستانە، کە زۆر جیاوازترە، شوێنی نیشتەجێی بلوجە بەڕیشە ئاریانییەکانە. بەشێکی باکووری ڕۆژئاواش بەئازەربایجان ناو دەبرێت، هەرێمی گەلێکە تایبەتمەندێتی ئەتنیکی جیاوازتر لەخۆوە دەگرێت، لەڕۆژگاری ئەمڕۆمان بەشێوە زمانێك قسە دەکەن کە نزیکی زمانی تورکییە. گرنگترین بەشی باکووری ڕۆژئاوا، کە یەکەمین کۆنفدراسیۆنی مادی لەمێژوودا ئاواکرد، بوو بەلانکەی نەریتی زەردەشت و ئایینی مەزدا و کوردان لەخۆوە دەگرێت کە نزیکترین قەومن لەفارسەکان، ئەم هەرێمە پێشتر بە میدیا ناو دەبرا، لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا بەفەرمی ناوی کوردستانی لێنراوە. لەسەردەمی سەلجوقییەکانەوە ئەم هەرێمە لەمیانەی ناوی کوردستانەوە وەکو یەکینەیەکی سیاسی و ئیداری هەڵدەسەنگێنرێت. لەپاڵ ئەمەشدا ناوچەی خوزستانی کەمینە عەرەبەکان و چەندین ناوچەی دیکەی کولتووری و ئایینی، بایەخ بەتایبەتمەندێتی هەرێمی دراوە و وەکو پارچەی جوگرافیای کولتووری، هەریەکە وەکو ڕاستینەیەك جێگای خۆیان گرتووە. ئێران بەدرێژایی مێژووی

رابردووی خۆی ڕێزی بەرامبەر کولتوورەکان و ئەو شوێنانە نیشانداوە کەتێیدا پێکهاتوون. هێندەی بایەخ بەنکوڵیکردن و گۆڕین و توانەوەی زۆرەملێ و هەڵوێستی هاوشێوە نەداوە.

ئەم هەڵوێستە بەرێز و واقیعیانەی بەگوێرەی راستینە مێژوویی و کولتووریەکان سەبارەت بە گروپە قەومی و ئەتنیکیەکان نیشاندراوە، ڕێگای لەپێش ئەوە کردۆتەوە بەدرێژایی مێژوو دابونەریتێکی دەوڵەمەند لە ئێران پێکبێنێت. لەنێو هەموو قەوم و کولتوورێکدا بەرپۆمبەر و بنەماڵەی بەرپۆمبەرایەتی دەرکەوتوون. بایەخ بەزێدەرۆیی و قەومگەرایی و نەتەوەپەرستی نادەن، بەهەندی دانانێن. زیاتر دەرفەت و توانا‌کاری ئەوە هەیە رۆل ببینن بەگوێرەی توانست و باڵابوونی کولتووری بێت. لەئیمپراتۆریەتی پارسەوە تاوەکو کۆماری ئیسلامی رۆژگاری ئەمڕۆمان کەم زێدە ئەم تایبەتمەندێتیانە پارێزراوە. هەروەکو لە رووخانی شاهنشاهیەتە گەندەڵبووەکان سەلێنراوە، کاتێك ئەم بەرپۆمبەرایەتییانە دەکەونە رەوشێك کە شایستەی بەرپۆمبەرایەتی نیین، لە کامە خانەدان و بنەماڵە و خێزان بن، تەنانەت ئەمانە بەهێزترین شابن، ئەوا لەرێگای ئەو راپەرینانە لەرووخان رزگاریان نابێت کە زۆرینەی گەل رۆڵی تێدا دەبینێ.

ئێران کە باوەڕی مەزدا و نەریتی زەردەشتی تێدا بەهێزە، هەروەکو چۆن بووە ناوەندی لەدایکبوونی دووڕیانی رۆژهەڵات ـ رۆژئاوا، بەدرێژایی مێژوو، رۆڵی مێژوویی لەپەسندیکردن و وەرچەرخانی کولتوور و باوەڕی و بەها ئاکارییە سەرەکیەکاندا بینیوە، ئینجا ئەمانە چ هی رۆژهەڵات بن یان رۆژئاوا. نەریتی مەزدا و زەدەشتی یەکێکە لەبەرچاوترین نموونەکانی ئەم وەرچەرخانە، کە لەمیتۆلۆژیای کۆیلەداری سۆمەریەکان زیاتر، دەرفەتی بەئاکاری ئازاد و ئیرادەی مرۆڤ داوە. توانیویەتی چەندین بیروباوەڕی و فەلسەفە بەوەرچەرخان تێپەڕ بکات کە ناوەندەکەیان لەهیندستان بوو. هەروەها نەریتی شیعەگەرایی کە رۆڵێکی مەزنی لەمێژوو و ئایینی ئیسلامدا گێڕاوە، گەورەترین وەرچەرخانە کە لەسەربنەمای کولتووری ئێران لەئیسلامیەتدا ئەنجامدراوە.

تایبەتمەندێتیەکی مێژوویی و باڵابوونی ئێران ئەوەیە، کە بەبێ ئەوەی نکوڵی لەنەریتە ئایینی و فەلسەفی و قەومیەکان بکات و لەناویان ببات، بەڵام بەبێ ئەوەی وەکو خۆیان بهێڵێتەوە، بەوەرچەرخانێکی واتاداریان تێپەڕ دەکات. لەرۆژگاری ئەمڕۆشماندا دەخوازێ گەورەترین هەڵمەتی بەمجۆرە لەمیانەی پێکهێنانی ئیسلامی دیموکراسییانە ئەنجام بدات.

ئەزموونی ئیسلامی دیموکراسییانەی پێکهاتەی کۆمەڵگا و دەوڵەتی ئێران، لەلایەن تەواوی وڵاتە ئیسلامیەکان و رۆژهەڵاتی ناوین بەوردەکاری و هەستیاریەوە هەڵدەسەنگێنرێت. لەنێو کۆمەڵگای ئێراندا، بەردەوام پێهەڵگرتنی دیموکراسییانەی باو دەبینرێت. چەرخی ناوین پڕیەتی لەم جۆرە پێهەڵگرتنانە (رابوونانە). لەڕاستیدا لەسەردەمی کۆیلەداری سۆمەرەوە، بەردەوام گەل وەڵامی سیستەمە فشارهێنەرەکانی داوەتەوە. زەردەشت، مانی، مەزدەك، بابەکی

خورەمی، ئەبو موسلیمی خۆراسانی، نەریتی دوازدە ئیمام و دوا هەڵمەتی شۆڕشگێڕی شیعە، ئەڵقە سەرەکییەکانی ئەم زنجیرەیەی فەلسەفەی مبازەکان پێکدێنێت کە بە درێژایی مێژوو پێشکەوتوون. هەربۆیە دەشێ هەڵمەتی ئیسلامی دیموکراسییانە واتادار بێت.

بەشێوەیەکی گشتی ئیسلامییەت بەتایبەتیش لەگەڵ کۆچی دوایی حەزرەتی محەممەد، لەقۆناخی رەهابووندا پێشکەوتووە. لەگەڵ فەرمانڕەوایەتی بنەماڵەی ئەمەوی، هەستاریە سنووردارییە دیموکراسییەکەی قۆناخی هەرچوار خەلیفەی راشدین، جێگای خۆی بۆ سەڵتەنەتی رەها بەجێ دێڵێ. سوڵتانەکان، گوایە بەرەوشێك گەیشتوون کە لەخودا بەولا حیساب نادەن بەهیچ کەسێك. بەرپرسیارێتی بەرامبەر ئەڵلا، شێوەیەکی نەرمی جەمکی پادشای ـــ خوداوەندی سۆمەریەکانە. هێزی خۆی لەم دابونەریتە وەردەگرێت. بەهۆی زاراوەی ئەڵلا کە زۆر بەهێزکراوە، سوڵتانەکانی چەرخی ناوین زۆر لەپادشاکانی چەرخە سەرەتاییەکان بەهێزتر و زاڵترن. زاراوەی خودای چەرخە دێرینەکان لاوازە و هێندە دووری مرۆڤەکان نییە. هەرچی خوداوەندەکانی سەردەمی نیۆلیتیکە، دۆستی مرۆڤە و لەگەڵ یەکتردا دەژین. هەرچی لەچەرخی ناوینە، ئەو ئەڵلایەی کە لەمیانەی ئەوەد و نۆ خاسیەتی سەرسوڕهێنەرانە تەنیا فەرمان دەدات، لەراستیدا نوێنەرایەتی و رەنگدانەوەی کۆمەڵگای چینایەتی دەرەبەرگایەتییە کە پێشکەوتووە و گۆڕانکارییەکەی چڕبۆتەوە، زیاتر پێویستی بە رێسا و دەسەڵات هەیە. هەرچی دەسەڵاتی سوڵتانە وەکو سێبەری خودا (                ) لەسەر زەوی هەڵدەسەنگێنرێ. رەها بوون گرێدراوی گەوهەری زاراوەی خودایە، بۆ شیکردنەوەی موتڵەقیەت (رەها بوون) پێویستە زاراوەی ئەڵلا (خودا) شیبکرێتەوە. هەربۆیە دیموکراتیزەکردنی ئیسلامیەت، گرێدراوی ئەوەیە کە لە ڕەوشی ئایینی چینی دەرەبەگایەتی بالادەست دەربهێنرێت، بکرێت بەئایینی گەل. ئەمەش پێویستی بەوەیە، شیکردنەوەیەکی زانستی ــ کۆمەڵناسی سەبارەت بەزاراوەی ئەڵلا (خودا) بکرێت، لەرەوشی سەمبۆڵێکی مەعنەوی دەربهێنرێت کە دەسەڵاتی سەڵتەنەتی دەرەبەگایەتی پەنای بردبووە بەر. پێویست دەکات وەکو چەمکێکی فەلسەفی و سەمبۆڵێکی مەعنەوی روون بکرێتەوە کە لەلایەن گەلەوە دەرکی پێبکرێت.

شیکردنەوەی دیاردەی ئایین و ئەڵلا (خودا) لەبواری مێژوویی، کۆمەڵایەتی، فەلسەفی و سیاسی پێویستی بەشۆڕشێکی هزری هەیە. ئەگەر لەلایەنی زانستی ــ فەلسەفی ئایین وخودا روون نەکەینەوە، ئەوا دیموکراتیزەکردنی ئیسلام لەدروشمێکی تەفرەدان بەولاوە تێپەڕ ناکات. ئەگەر بەشێوەیەکی سنوورداریش بێت گفتوگۆیەکی بەمجۆرە لەنێوان رۆشنبیرەکانی ئێران و ئیسلامە دیموکراتیخوازەکاندا هەیە. بەلام ئایین وەکو هزرێك کە لەسەردەمی سۆمەریەکانەوە بەشێوەی هزری خودایی و خاوەنی شرۆڤەیەکی دۆگماتیکانەیە و بەسەر دەسەڵاتدا زاڵە. ئەوە هەروەکو تەواوی وڵاتانی جیهان و رۆژهەڵاتی ناوین، تادولرادە لەئێرانیش بەکاریگەرە. جیاوازی چەمکی (عەلمانی) پۆزەتیف لەگەڵ خوداناسی (تیۆلۆژیای) ئێران، بەوە سنوورداره کە

خودا ناناسیّ؛ ئەمەش بەواتای ئایینی پۆزەتیڤیستی دێت. هەربۆیە لەسەربنەمای عەلمانی پۆزەتیڤیستی کە لەئارادایە، ململانێکردن لەگەڵ ئایین، لەگەوهەری خۆیدا چەوتە و هێندە خزمەتی دیموکراتیزەبوون ناکات. تەنیا لەمیانەی شیکردنەوەیەکی راستی ئیلاهیات (خودناسی) و ئاشکراکردنی کارەکتەری باڵادەستی و چەوسێنەرانەی ئەم دەسەڵاتە، لەلایەکی دیکەشەوە لەرێگای بەدەرزگاکردنی ئەو شێوەیەی دەسەڵاتی مەعنەوی و ئاکاری کە بۆ هەر گەل و کۆمەڵگایەك پێویستە، دەتوانریّ دەسەڵاتی خودایی دەوڵەت تێپەڕ بکرێت و دیموکراتیزەی بکەین. هەربۆیە کێشەی دیموکراتیزەکردنی ئیسلام کە لە ئێران بووە بەرۆژەڤ، پێویستی بە وتووێژێکی بەرفراوانی ئیلاهیات ـ فەلسەفە و شێوەیەکی نوێی هزری و بەدەزگابوونی ئاکاری هەیە کە بنەمایەکی زانستی هەبێت و لەخزمەتی گەلدا بێت. ئەمە بابەتێکی زۆر قووڵە و پێویستی بەوەرچەرخانی ئایدیۆلۆژی و سیاسی و ئاکاری هەیە. کاتێك ئەمە ئەنجامنەدرێت، لەدیماگۆژیەتێکی ئایینی بەولاوە هیچ واتایەکی دیکەی نییە.

ئەگەر ئێران ئەم گفتوگۆیە قووڵیکاتەوە کەسەبارەت بەم بابەتە لەئارادایە، بەشداری لەوەدا بکات کە گەل بەرامبەر بەئایین بڕاوی ئازاد و وشیارانە و نەریتی ئاکاری خۆی ئاوا بکات، بەراستی ئەو هەڵمەتەی لەژێر ناوی ئیسلامی دیموکراسییانە بەرێوە دەبرێت بەهایەکی مەزن لەخۆوە دەگرێت و دەشیّ رۆڵێکی گرنگ لە رێنسانسی رۆژهەڵاتی ناویندا ببینیّ. بەڵام هەروەکو دیارە ئاستەمە کە ئیسلامیەتی باوی دەرەبەگایەتی دەرفەت بەمە بدات. بەڵام دیسان هەستیارانە هەڵسەنگاندنی ئەم ئەزموونە و لەچارەسەری دیموکراسیدا تاوتوێکردنی وەکو مۆدێلێك، هەڵوێستێکە پێویستە بەهەند دابنرێت. مسۆگەرە کە شرۆڤەی ئێران سەبارەت بەئیسلامیەت، بەرامبەر بەشرۆڤەی عەرەبەکان، گەلەری و پێشکەوتووترە. بەڵام ئەوە جێگای گفتوگۆکردنە تا چ رادەیەك وەڵامی دیموکراسیەتی هاوچەرخ دەداتەوە یاخود بەشداری تێدا دەکات. مسۆگەر پێویستی بەوە هەیە تاقیبکرێتەوە و بەناوی گەل دەسکەوت بەدەست بێنیّ. لەم چوارچێوەیەدا دەشیّ رێگایەکی نەرمتر و ئاسانتری چارەسەری ئەو کێشە قەومی و نەتەوەییانە بدۆزێتەوە کە بنەمایەکی مێژوویییان هەیە. لەمەڕ ئەم مەسەلەیە، ئێران دۆگماتیکی وشك و نکوڵی کار نییە. ئەنانەت رەوشی ئێستاکەشی، قۆناخێکی گرنگ لەرێگای چارەسەری دیموکراسییانە پێکدێنێت. ئەوەی پێویستە، لەمیانەی شرۆڤەیەکی هاوچەرخی دیموکراسییانە و هەلومەرجەکانی ئێراندا ئەمنتێزێك پێك بێنێت. لەم لایەنەوە دەشیّ کێشەی کورد لە شرۆڤەی هاوچەرخی ئێران و گەیشتن بەسەنتێز رۆڵی کلیل ببینیّ.

تا سەردەمیّ ئەزموونی PDK جووڵەوەی کورد لەئێراندا کارەکتەرێکی دەرەبەگایەتی خێڵەکی لەخۆوە دەگرێت. لەسەردەمی قادەکانەوە بەردەوامی بەم تایبەتمەندێتیە دەدات. جێگیربوونی لەبنارەکانی زاگرۆس، سەبارەت بەتامەزرۆیی کوردان بۆ ئازادی، دەرفەت و شانسیان بۆ دەرەخسێنێ. هەروەکو لەپارچەکانی دیکەشدا دەبینریّ هەڵوێستی بەکاربردانەی

ئیمپریالیزم سەبارەت بە کوردەکانی ئێران، ئەنجامێکی نێگەتیڤی لێکەوتۆتەوە. لەم لایەنەوە جولانەوەکانی شێخ عوبەیدوڵڵای کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم و سمکۆی شکاکی یەکەمین چارەگی سەدەی بیستەم پڕ لەپەند و ئەزموونن. ئەزموونی کۆماری مەهاباد کە قازی محەمەد رێبەرایەتی کرد بووە قوربانی ئەم لەیستۆکانە. رێکخراوی PDK ی ئێران کە کارەکتەری نەتەوەپەرستی سەرەتایی تێپەڕ نەکردووە، بەهۆی هەرس نەکردنی داب و نەریتی ئێران و دەرکنەکردنی بە دواگەمەکانی رۆژئاوا، دوا رێبەریان قاسملۆ شەهید بووە. هەندێ گرووپی نەتەوەپەرستی سەرەتایی و چەپەکان، لەسەردەمی شۆڕشی ئیسلامی ئێرانیش ئەوەیان نیشاندا کە توانستی چارەسەری کێشەی کوردیان نییە. لەڕاستیدا هەلومەرجەکان بۆ بەدەستهێنانی دەسکەوتی مەزن لەبار بوو. دەرفەت و شانسی شێوازێکی چارەسەری هەبوو کە بەگوێرەی واقیعی ئێران راستینەکانی دیموکراسی هاوچەرخی بەبنەما بگرتایە. ئەگەر درەنگیش بکەوێت، لەم لایەنەوە کێشەی کورد دەتوانێ لەمیانەی هەڵمەتی ئیسلامی دیموکراسییانە دەرفەتی چارەسەری بەسەرکەوتن بگەیەنێ. راستتر ئەوەیە کاتێك جولانەوەی کورد لەسەر ئەم بنەمایە خۆی نوێ دەکاتەوە، لەڕێگای چارەسەری دیموکراسییانە، هەم سەبارەت بە کێشەی کورد هەم تەواوی کێشە نەتەوەییەکانی ئێراندا رۆڵی کلیل ببینێ. دەشێ ئێرانی ئیسلامی دیموکراسییانە و فیدراڵ وەکو رێنمایی و درۆشمێکی واقادار[2] بێت. لەمیانەی رەچاوکردنی راستینەی کولتووری، سیاسی و ئیداری ئێران، بەتایبەتیش لەمیانەی شرۆڤەکردنی ئەوەی چۆن پێوانەکانی دیموکراسی هاوچەرخ لەگەڵ ئەم راستینانە دەگونجێ و گەیشتن بەسەنتێزێك، دەشێ ببێتە هەنگاوێکی گرنگی رێگای چارەسەری. ئەگەر بەشێوەیەکی سنوورداریش بێت ئازادی کولتووری، پەروەردە بەزمانی زگماکی و ئازادی راگەیاندن و بڵاوکردنەوە لەئارادایە. هەروەها بەڕێوەبەرێتی هەرێمی کوردستان راستینەیەکە. بە گەلەریکردنی ئەم زاراوە و دامەزراوانە و گەیاندنی بەگەوهەرێکی پێشکەوتووخوازی، ئاواکردنی ئەو رێکخراوانەی لەم پێناوەدا پێویستن، دەشێ رێ لەپێشکەوتنێکی زیاتر بکاتەوە. دەشێ ئەو رێکخستنانە لەچوارچێوەی دەستوور و یاسادا بکرێت بەرۆژەڤ کە گوزارشت لەقۆناغ دەکات. تەواوی کێشەکە گرێدراوی ئەوەیە کە جولانەوەی ئازادیخوازی کورد لەئێران واقیعیانە دەرك بەتایبەتمەندێتی ئێران بکاتە بەدروستی پێوانەکانی دیموکراسی هاوچەرخ پەسند بکات و لەمیانەی بەبنەماگرتنی لایەنە پۆزەتیڤەکانی و هەنگاوی ماقووڵانە بەرەو پێشەوەی ببات. ئاشکرایە ئەگەر جولانەوەی ئازادیخوازی کورد بزانێ بەرامبەر هەڵوێستی تەسکی ئۆتۆنۆمیخوازی نەتەوەپەرستی سەرەتایی و گەمەکانی دەرەوە رابوەستێ، ئەوا بەڕێوەبەرایەتی ئێران بەشێوەیەکی ماقووڵتر نزیك دەبێتەوە. زیاتر پێشخستنی ئەو دیالۆگەی لەئارادایە، نیشاندانی پەیوەندییە کولتوورییە نزیکەکانی کوردان، واتادارکردنی برایەتی باو لەرۆژگاری ئەمڕۆماندا، رۆڵێکی زیاتری لەبەدیهێنانی چارەسەریدا دەبێت. لەجیاتی قۆناخی

نەتەوەپەرستی سەرەتایی ئۆتۆنۆمیخواز، قۆناخی نوێ کە لەسەربنەمای تیۆری دیموکراتیزەکردنی ئیسلام و دیموکراسی هاوچەرخە، لەچارەسەریدا خاوەن شانسی سەرکەوتنە. ئەگەر جولانەوەی ئازادیخوازی کوردستانی ئێران لەم چوارچێوەیەدا خۆی نوێ بکاتەوە، ئەگەر وەکو هێزێکی گونجاو و بەکاریگەر خۆی ڕێکبخات و پێگە بگرێت، دەشێ ببێتە دەستپێکەری قۆناخێکی نوێ. هەروەها لەئەنجامی پەند وەرگرتن لەئەزموونەکانی جولانەوەی کورد لەپارچەکانی دیکە، بەتایبەتیش لەمیانەی سوود وەرگرتن لە ئەزموونی PKK و سیستەمی بەرگری ڕەوای کە لەئارادایە، بەخۆی دەتوانێ ببێتە نوێنەرێکی خاوەن بانگەشەی قۆناخی نوێ. ئەو وەڵام و بەشدارییەی جولانەوەی کوردی لەواقیعی خۆیدا دەیداتەوە هەڵمەتی ئیسلامی دیموکراسییانە، دەشێ زیاتر ڕێگا لەپێش پەرەسەندنی بکاتەوە.

هەڵبەتە لەبەر ئەوەی ئەو زەمینەیەی لەئارادایە پڕە لەکۆسپ و تەڵەزگە، ئەوا نابێ لەلایەنی چەمکی تێکۆشان و ڕێبازی کرداری و ڕێکخراو ئەوە پشتگوێ بخرێ کە تادوا ڕادە پێویستی بە جموجۆڵێکی واقیعی و هەستیارانە هەیە. لەڕەوشێکی پێچەوانەدا، هەروەکو زۆرجار لەمێژوودا ڕوویداوە لەوانەیە لەمیانەی پیلانگێڕی لێدانی بەر بکەوێت. بەتایبەتیش لەم چوارچێوەیەدا بەشێوەیەکی ڕاست هەڵسەنگاندنی جولانەوەی لاوان و ژنان و شێوەپێدانی تواناکاری گرنگ لەپێناو سەرکەوتن دابین دەکات. شێوە گرتنێکی دروستی پراکتیکی و ئایدیۆلۆژی جولانەوەی لاوان و ژنان، واتایەکی مەزنی هەیە. بەڵام ئەوەش گرنگە کە لەڕەوشێکی ئەوتۆ بێت بتوانێ لەگەڵ جولانەوەی پارچەکانی دیکەش هاوتەریب بێت، دەرفەت بەپێشکەوتنی یەکتری بدەن، لەناوخۆیدا دانەخرێت، بەڵام نەکەوێتە ڕەوشی پەنابەریش.

لێرەدا شێوەی ئیسلامگەرایی چارەسەری دیموکراسییانەی شێوازی تورکیا بەڕێوە دەچێت. هەربۆیە ئەگەر بەراوردێکی باش لەنێوان هەردوو چارەسەریدا بکرێتە ئەوا لەمیانەی چارەسەری کێشەی کورددا دەتوانرێ سەنتێزێکی باڵای شرۆڤەی ئیسلامی و شرۆڤەی هاوچەرخی ڕۆژئاوا بخولقێنرێ. ئەو ئومێدە مەزنە و هەنگاوە پراکتیکیە شیاوانەی لەم لایەنەوە دەهاوێشترێ لەمیانەی باوەڕی و ئاکاری ئیبراهیمی و زەردەشتی هاوچەرخ، جولانەوەی ئازادیخوازی (ماد)ی کاوەکانی هاوچەرخ، ئەو گەوهەرە بۆ شارستانییەتی دیموکراسییانە بەدەست دێنێ کە پێویستی پێیەتی، بەهێزترین دەسکەوت و بەشداری لەسەنتێزی دادوەری و ئاکار و ئازادی مرۆڤایەتی دەکات.

### ٢ ـ عەرەبەکان و کێشەی کورد و چارەسەری

یەکێك لە دراوسێ گرنگەکان کە گەلی کورد لە گەڵیدا تێکەڵ بەیەك بووە گەلی عەرەبە. عەرەبەکان ئەو هۆز و تیرە سامییانەی بیابانی عەرەبستانن کە دواترین قەڵەمبازی ڕۆژهەڵاتی ناوینیان ئەنجامدا. یەکەمین شەپۆلی کۆچ کردنیان شەش هەزار ساڵ بەر لە زایین بەرەو میسر

و میزۆپۆتامیای خواروو دەستی پێکرد. بەمەرجێکە تەقلی ئەم کولتوورە نوێیە بوون کە لەم ناوچانە پێکهاتبوون و رۆڵیان لە دەرکەوتنی شارستانییەتی میسر و سۆمەردا هەبووە. دووەمین شەپۆلی کۆچبەری سامییەکان سێ هەزار ساڵ پ.ز. دەستی پێکردووە، بەردەوام وەکو هێزی کاری هەرزان روویان لە شارستانییەتی میسر و سۆمەر کردووە. دووەمین شەپۆلی کۆچبەری سامییەکان لە سایەی سەرۆك تیرە و هۆزە بەهێز و بەتواناکان لە سالانی ۲۰۰۰ پ.ز. رۆڵێکی کاریگەریان لە گۆرانکاری خانەدانە دەسەڵاتدارەکانی سۆمەردا بینیوە، لەم بەرواره بەدواوە ئیتر جێگای خۆیان لە بەڕێوەبەرایەتی شارەکاندا گرتووە. ئەم تیرانە بە "ئامۆرییەکان" ناوزەد کراون، لەم مێژووە بەدواوە سەرەتا ئیمپراتۆریەتی بابل و دواتریش ئیمپراتۆریەتی ئاشوورییان ئاوا کردووە. ئەم تیرە و بنەماڵە سامییانە بەهۆی پێویستییان بۆ بەرهەمەکانی دارستان و کانزاکان بەرەو باکوور درێژەیان بە کاروانی خۆیان داوە و رووبەڕووی "هۆریەکان" بوونەتەوە. کە رەچەڵەکی کوردان پێکدێنن. بەگوێرەی ئەوەی کە لە مێژوودا دەستنیشان کراوە، ئەو دوو تیرەیەی کە لە ۲۰۰۰ ساڵ پ.ز. تاوەکو ئێستا پەیوەندی و ناکۆکییەکان درێژە دەکێشێ، ئێستاش پاشماوەکانیان لە میزۆپۆتامیای ناوین لە سەرووی هەمووشیانەوە لە حەڕان ماوە و لە ناو یەکتردا دەژین. یەکێك لە تێکەڵەی ئەم تیرانە، هۆز و تیرە عیبرانییەکانن کە حەزرەتی "ئیبراهیم" رێبەرایەتی دەکردن. هەروەکو دەزانرێ ئەو تیرانە خاوەن پەیوەندییەکی هاوبەشی رەچەڵەکی ئاری و سامی بوون و نوێنەرایەتی یەکەمین سەنتێزی کولتووری دەکەن. دەب و نەریتی ئیبراهیمی ئەم سەنتێزە بەرەو پێشەوە دەبات و بەمەرجێکە نوێنەرایەتی قەڵەمبازی مەزنی ئایینی تاکخودایی دەکات.

شارستانییەتی سۆمەری بە رادەیەکی هەرە زێدە لەلایەنی ئەو تیرانەوە ئابلۆقە دراوە کە نوێنەرایەتی ئەم دوو ریشە کولتوورییە دەکەن. سۆمەرییەکان لە ئاکامی ئەو پەیوەندی و رێککەوتنانەی لەگەڵ هەر دوو رەچەڵەکدا پێشی دەخات، زیاتر لە ۲۰۰۰ ساڵ فەرمانڕەوایەتی دەکەن. دوای ئەوەی لە سالانی ۲۰۰۰ پ.ز. بەدواوە سۆمەریەکان لە ئەنجامی فشاری خانەدان و هۆزەکانی ئەم دوو رەچەڵەکە هەڵوەشایەوە، ئەمە وایکرد کە ئەم دوو کولتوورە و رەچەڵەکە زیاتر بەرەنگاری یەکتری ببنەوە، لە سەردەمی بابلی و ئاشوورییەکاندا ململانێ و پێکدادانی نێوانیان دژوارتر دەبێت. هۆری و گۆتی و کاسیەکان گوزارشت لە هەمان بنەچەی کولتووری دەکەن. گەلێك زانیاری سەبارەت بەم پەیوەندی و پێکدادانە لە تاتەقۆڕینە کۆنەکانی بابلی و ئاشوریەکاندا دەبینرێ. لە سەردەمی میتان و ئورارتۆ و مادەکاندا ململانێ و پێکدادان دەگاتە لوتکەی خۆی. لە دوای ئەوەی لە ساڵی ٦١٢ دا پایتەختی ئاشووریەکان لەلایەن مادەکانەوە خاپوور دەکرێ، کۆتایی بە قۆناخێك دێنن. بەمەرجێکە قۆناخی باڵادەستی ماد ــ پارس دەستپێدەکات.

کاتێك حەزرەتی محەممەد دواترین تیرە و هۆزەکانی بیابانی لەگەڵ ئایدیۆلۆژیای ئیسلامییەت کرد بە یەك، سێیەمین شەپۆلی مەزنی پەلهاوێشتن دەست پێدەکات. بەمرەنگە لە میانەی شارستانییەتی مەزنی ئیسلامییەتەوە عەرەبەکان پایەدار و باڵادەست دەبن. هەروەکو دەزانرێ بەر لە ئیسلامییەت عەرەبەکان دواکەوتووترین تیرە و هۆزی رۆژهەڵاتی ناوین بوون. بەڵام ئاشوورییەکان و کوردەکان دوو کولتوورن کە ئاوێتەی یەکتر بوون، بۆیە لەوانەیە کۆنترین و درێژخایەنترین دراوسێی مێژوویی بن. ئاشوورییەکان ئەو تیرە ئامۆرییانەی بەر لە هاتنی عەرەبەکانن. زاراوەی زمانییان لە عەرەبەکان جیاوازترە. کولتوورەکەشیان پێشکەوتووترە. پەیوەندی عەرەب ـ کوردەکان لە سەردەمی ئەمەوی و عەباسییەکاندا زۆر پێشدەکەوێ. دوای رووخانی ئیمپراتۆریەتی ساسانییەکان لە ساڵی ٦٤٠ی زایینیدا کوردەکان دەکەونە ژێر کاریگەری شارستانییەتی عەرەبی ئیسلامی. تەنانەت بۆ ئەوەی ئیمتیازات بەدەست بێنن و مامەڵەیەکی تایبەتیان بۆ بکرێت، خۆیان بە عەرەب و ئەوەی پێغەمبەر و رەچەڵەکەکەی لەقەڵەم بدەن. بەمرەنگە کورد دەبنە چینی ژێر، عەرەبەکانیش چین سەروون. سەرباری ئەوەی هەمان بنەچەی نەژادی و ئەتنیکیان هەیە، بەڵام ئەم جیاوازییە زۆر بەربڵاو دەبێت. بزووتنەوە و جموجۆڵی شێخایەتی، سەید و مەلایەتی کوردەکان تارادەیەکی مەزن پروپاگەندە بۆ زمان و کولتووری عەرەبی دەکەن و بڵاوی دەکەنەوە. زمان و کولتووری کوردی بچووك دەبینن و سووکایەتی پێدەکەن.

لە قۆناخی باڵادەستی عوسمانییەکاندا کاریگەری عەرەبەکان خێراییەکەی وەکو جاران نامێنێ و کەم دەبێتەوە. پەیوەندی کوردان لەگەڵ تورکەکان، زۆر لەو پەیوەندییەی پێشوویان لەگەڵ عەرەبەکان، زیاتر خزمەتی پێشکەوتنی زمان و کولتووری کوردی دەکات. بە ئەندازەی لاوازی زمانی تورکی، ئەوا رۆڵێکی گرنگ دەبینن لەو هاوسەنگییەی لە پەیوەندییەکاندا هەیە.

لە سەدەی نۆزدەهەمدا ئینگلیزەکان لە ئێراق جێگیر بوون، تاوەکو رێگای بازرگانی هیندستان و سەرچاوەکانی نەوت کۆنترۆڵ بکەن، ئەمەش قۆناخێکی نوێی پەیوەندی نێوان کورد ـ عەرەب لەگەڵ خۆیدا دێنێ. ئینگلیزەکان لە میانەی تەکتیکی "پەرتکە ـ زاڵبە" هەر دوو لایەن دژ بە یەکتری بەکاردێنێ و بەخۆیانەوە گرێدەدات. هەرجارە و پشتگیری لە یەکێکیان دەکات و هەوڵدەدات بەردەوامی بە دەسەڵاتی خۆی بدات. باڵادەست بوونی عەرەبەکان بە سەر کوردانەوە، لە ئێراقدا لە سایەی ئەو پێکهاتە و بەرێوەبەرایەتییە نوێیە بوو کە لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانییەوە لەلایەن ئینگلیزەکانەوە ئاوا کرا. هەروەکو چۆن لە فەلەستین جوولەکەکانی باڵادەست کرد، لە ئێراقیش بەرامبەر کوردەکان و ئاشوورییەکان و تورکمانەکان، شێخ و سەرۆك عەشیرەت و دەرەبەگە عەرەبەکانی بە دەسەڵات گەیاند. هەروەها لەو قۆناخەدا رژێمێکی پادشایەتی دامەزراند. قۆناخێکی نوێی سەڵتەنەتی (پادشایەتی) ئیسلامی دەستپێکرد. ئەو کوردانەی نەیانتوانی ئەم رەوشە پەسند بکەن، لە سەرەتای سەدەی

نۆزدەهەمەوە دەستیان بە یاخیبوون کرد. ئینگلیزەکان هەندێ جار شاکانی ئێران، هەندێ جاریش عوسمانییەکانی بەکار دەهێنا و ئەم یاخیبوونانەی پووچەڵ دەکردەوە. بەتایبەتیش جوڵانەوەی سالانی ۱۹۲۰ی شێخ مەحموودی بەرزنجی لەلایەن ئەم مەنگەنە سیاسییەوە بێ ئەنجام دەهێڵرێتەوە.

لەدوای شەڕی دووەمی جیهانی قۆناخی PDK وەکو رێکخستنێکی نەتەوەپەرستی سەرەتایی دەستپێدەکات. ئەم رێکخستنە کە دەخوازێ دەرەبەگ و سەرۆک عەشیرەتەکان لەگەڵ رۆشنبیر و وردەبۆرژواکانی شار بکاتە یەك، ناتوانێ لە پێکهێنانی گەمەیەکی دەستی هێزە ئیمپریالیستییەکان بەولاوە رۆڵێکی دیکە ببینێ. دوای ئەوەی یەکێتی سۆڤیەت پشتگیری لە وردە بۆرژوا رادیکاڵەکان دەکات، سیستەمی پادشایەتی ئێراق دەرووخێنرێ. قۆناخی نوێ، قۆناخی هەڵکشانی نەتەوەپەرستی عەرەبییە. کاتێك بژاری یەکێتی سۆڤیەت دەبێتە مایەی لایەنگریکردنی نەتەوەپەرستەکانی عەرەب، ئەوا PDK، کە بارزانی رێبەرایەتی دەکات، لە تێکشکان و ژێرکەوتن رزگاری نابێت. بەمەرجێک بۆرژوازی نەتەوەپەرست جیادەبێتەوە و YNK بە رێبەرایەتی تاڵەبانی ناوا دەبێت. کاتێك بزووتنەوەی کوردان لە ئێراق یەکێتی خۆی لەدەست دەدات، ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی کە ببنە ئامرازێکی بەکارهێنان. بەمەرجێک کاریگەرێتی ئیسرائیل و ئەمریکا زیاتر دەبێت. بەرژەوەندی تەسك دەبێتە نەخۆشییەك کە بزووتنەوەی کوردی دەخوات. بە بەراوردکردن لەگەڵ قۆناخی کۆنی ململانێ و پێکدادانی نێوان خێڵەکان، دەکەونە نێو قۆناخێکی خراپتری بەکرێگیراوێتی. بۆیە ناتوانن ئەو دەرفەتانەی لەدوای سالانی ۱۹۸۰وە، لە شەڕی ئێران ـــ ئێراق و کەنداودا هاتە ئاراوە، هەڵیسەنگێنن و بیقۆزنەوە.

لە سالانی ۱۹۹۰ بەدواوە، لەژێر سایەی پاراستنی ئەمریکا و یارمەتی تورکیا دا دەکەونە نێو ئەزموونی حکومەتی فیدراڵی. جیاوازی داب و نەریتی باوی سۆران ـ بادینان کە لە کۆنەوە ماوەتەوە، رێگا لەپێش دوو بەرێوەبەرایەتی جیاواز دەکاتەوە. لەم قۆناخەدا لە ئەنجامی ئەو مامەڵە و لەیستۆکانەی بەرامبەر PKK پەیرەوی دەکەن، لە بوارەکانی سیاسی، سەربازی، دیپلۆماسی و ماددیدا، مەودایەکی بەرچاو لە بەدەستهێنانی قازانج و بەرژەوەندی دەگرن. بەرامبەر بەو قازانج و بەرژەوەندییانەی وەری دەگرن، رۆڵێکی سەرەکی دەبینن لە ناوزڕاندن و گۆشەگیرکردنی PKK و سەرۆکایەتییەکەی. سەرەڕای ئەوەی چەندی بڵێی هەلومەرجەکان گونجاو و لەبارن، وەلێ تاوەکو ئێستا کێشەی کورد لە ئێراق چارەسەر نەکراوە. بەرێوەبەرایەتی کوردان تاوەکو سەر ئێسقان کەوتۆتە ناو بەرژەوەندی تەسکی کەسێتی و بنەماڵەیی. لەناوخۆدا لە شێوازی دیموکراسییانە بێبەرین. چەندەی دەکرێ ناتوانن حکومەتێکی فیدراڵی هاوبەشی کوردان ناوا بکەن. وەکو سەرەڕەی سیاسەتەکانی ئەمریکا و ئینگلتەرای دەرهەق بە ئێراق لە چاوەڕوانیدا هێڵراونەتەوە. بۆ ئەوەی PKK کاریگەری خۆی لەسەر ناوچەکە زیاد نەکات،

تورکیا لە ڕێگای هێزەکانی چەکوشی ئامادەوە کۆنترۆڵی خۆی لەسەر ناوچەکەدا زیاد کردووە. بەرامبەر بەمەش PKK لە ناوچە شاخاوییەکاندا جێگیر بووە و درێژە بە کاریگەری خۆی دەدات. لە سالآنی ١٩٩٠وە تەنانەت لە ١٩٨٦وە، سەرەڕای پشتگیری چالاکانەی YNK و PDK، وەلێ دەوڵەتی تورکیا نەیتوانی بەرخودانی PKK تێکبشکێنێ. هەروەها ئاشکرایە کە ئێرانیش لەمیانەی دیالۆگی لەگەڵ هەموو لایەنەکان، درێژە بە کاریگەری خۆی دەدات و ناخوازێ دەست لە بەرژەوەندییەکانی خۆی بەربدات.

باشووری کوردستان ئێستا لە نێو ڕەوشێکدایە، کە وەکو لوبنان وایە، تەنانەت لەنێو ستاتۆیەکی لەشێوەی شەڕ و پێکدادانی فەلەستین ـ ئیسرائیل دایە. ئەو ڕەوشە قوفڵبوون و گرێکوێرەی کە لە ئارادایە، هەمە لایەنەیە. هێزە جیهانی و ناوچەیی و خۆجێییەکان تا دوارادە تێکچڕژاون و ڕێگایان لەپێش ڕەوشێکی وەها کردۆتەوە کە لە ڕەوشی پێکدادانی نێوان ئیسرائیل ـ فەلەستین ئاڵۆزترە. تاوەکو ئێستاش سەبارەت بە ڕەوشی گشتی ئێراق و ستاتۆیەك بۆ کوردان، ڕەوشێکی یەکلاکەرەوە و دیار لە ئارادا نییە. لە کاتێکدا کە ئەمریکا و ئینگلتەرا دەخوازن سەددام برووخێنن دەبینرێت بەشێکی دیکەی جیهان لایەنگری ئەمە نییە. ئابلۆقەی نەتەوە یەکگرتووەکان کاریگەری خۆی لە دەستداوە. لەسەر ئەم بنەمایەش ڕەوشێکی ئاڵۆز لە ئارادایە و بەردەوام دەبێ.

هەروەکو دیارە چارەسەری کێشەکانی ئێراق لە دوو لایەنەوە پێشدەکەون: یەکەمیان، پلاتفۆرمی نەتەوە یەکگرتووەکانە. ئەمریکا لە ڕێگای بەکارهێنانی UN درێژە بە تەنگەتاوکردنی ڕژێمی ئێراق دەدات و دەخوازێ لە ناوەوەش لە ڕێگای بەکارهێنانی کوردەکان و کۆنگرەی نیشتمانی ئێراق یۆگسلافیایەکی نوێ بخوڵقێنێ. بەڕێوەبەرایەتی "بۆش" لەم بوارەدا بەبڕیارە. ئیسرائیل هەر لە سەرەتاوە کاریگەرییەکی بەهێزی لەسەر ئەم مەسەلەیە هەیە. تورکیا بە شێوەیەکی قووڵتر و هەمە لایەنەتر لێکدانەوەی هەموو ئەگەرێك دەکات. پێ بە پێ بزووتنەوەی تورکمانەکان بە هێز دەکات و وەکو ئامرازێکی دەستێوەردان پێشیان دەخات. ئێرانیش لە ڕێگای شیعەکانی ئێراق و بەکرێگیراوەکانی لەناو جوڵانەوەی کورد، بەبێ ئەوەی هێزی خۆی لەدەست بدات، بەردەوامی بە کاریگەری خۆی دەدات. ئەورووپا، ڕووسیا، چین و وڵاتە عەرەبییەکان لە ئاست و بواری جیاوازدا لەنێو مەسەلەکەدان. تەواوی ئەم هێزانە سەبارەت بە شێوە چارەسەرییەك هاوبیرن کە لە چوارچێوەی یەکپارچەیی خاکی ئێراقدا بێت، بەلآم پەسندنەکردنی سەددام لەلایەن ئەمریکاوە، شێوازێکی بەمەرەنگەی چارەسەری یاخود ئاسایی بوونەوە، ئاستەنگ دەکات. چارەسەرییەکی بەمجۆرە تاوەکو ئێستا لە ئاسۆدا نابینرێ.

دووەمیان: ڕێگای چارەسەری دیموکراسییانەیە کە هێز و لایەنەکانی ئێراقی، ڕژێمی ئێراقیش لەنێودا بێت، لە ناو خۆیاندا پێشیبخەن. بەلآم پێکهاتەی دوور لە دیموکراسییەتی تەواوی هێزەکان، لە سەرووی هەمووشیانەوە ڕژێم، دەرفەت بە هاتنەئارای ئێراقێکی

دیموکراتی نادەن، کە گونجاوترین ڕێگای چارەسەرییە. لە ڕاستییدا دیموکراتیزەکردنی ئێراق دەبێتە وەرچەرخانێك کە ڕۆڵە مێژوویی و هەرێمییەکەی زۆر زیاتر بێت. ئەگەر لەمیانەی چارەسەرکردنی کێشە نەتەوەیی، ئەتنیکی، ئاییینی و کولتوورییەکان لە ڕێگای ئەم شێوازە و لەنێو ئاشتیدا هەنگاو بهاوێژرێ، ئەوا دەبوو بە هەنگاوێکی گرنگ و مەزن بۆ دیموکراتیزەبوونی ڕۆژهەڵاتی ناوین. پێویست بوو لە چارەسەرییەکی بەمجۆرەدا کوردان ڕۆڵی پێشەنگایەتی ببینن. ئەگەر ئەو بەڕێوەبەرایەتییە فیدراڵییانەی کە هەن، بکرێن بە یەك، ئەوا دەیانتوانی بەڕێوەبەرایەتی فیدراسیۆنی دیموکراسییانەی کوردستان ئاوا بکەن، لەسەر بنەمای پشت بەستن بە هێزی خۆیی، دەتوانن فیدراسیۆنێکی دیموکراسییانە لەگەڵ ئێراق ، ئەگەر ئەمەش زۆر ئاستەم بێت، ئەوا دەتوانن لەبن گەرەنتی دەستووریکدا بۆ تەواوی ئێراق، لەسەر بنەمای سیستەمی کۆماری دیموکراتییانە ڕێکبکەون. ئەگەر چارەسەرییەك لەسەر بنەمای ئازادی و مافە سەرەکییەکان و لەژێر سایەی گەرەنتی دەستووریکدا، کە دان بە هەموو گرووپە ئەتنیکی و کولتووری و زمانەکاندا بنێت پێش بکەوێت، ئەوا ئەمە تواناکاریەکە ناتوانرێ بچووك بکرێتەوە. بەگوێرەی هەلومەرجەکانی ئێراق، ئێراقێکی دیموکراسییانەی گەرەنتی کراو، هەنگاوێکی مەزنی چارەسەرکردنی گرێکوێرەکانە.

لە هەنگاوانێکی بەمجۆرەدا ڕۆڵی کوردان دەردەکەوێتەی پێش. ڕێبەرایەتی بۆرژوا — دەرەبەگ، وەکو پێویستییەکی بەرژەوەندی چینایەتییان دوودڵن لەوەی هەنگاوێکی بەمجۆرە بهاوێژن و سەبارەت بە چارەسەرکردنی کێشەکە لەپێناو بەرژەوەندییە چینایەتییەکانیان خۆپەرستانە دەجوڵێنەوە و جێگا بە ڕەنگدانەوەی بەرژەوەندییەکانی گەل نادەن و گیانی ڕێککەوتنی دیموکراسیانەیان تێدا نییە. بۆیە بە بێ ئەوەی دەست بۆ گەوهەری ڕژێم ببەن و قۆناخێکی دیموکراسییانە بۆ کوردستان بکەنە جێگای باس، دەخوازن لە ڕێگای ئۆتۆنۆمییەکی کوردی کلاسیکی لەگەڵ کۆمارێکی ئێراقی باڵادەست ڕێکبکەون. بە بێ دیموکراسییەت بەدوای چارەسەریدا دەگەڕێ، ناکۆکی سەرەکییان لەگەڵ PKK سەبارەت بەم بابەتەیە. وەها بیر دەکەنەوە کە ڤەبوونی دیموکراسییانە کۆتاییان پێ دێنێ. بۆیە بۆ ئەوەی ئەم قۆناخە ئاستەنگ بکات، لەنێو هەوڵ و تەقەلایەکی بەمجۆرەدایە کە لە هەموو گۆڕەپانەکاندا لە سەنگەری دژ بە PKK زیندوو و لەسەر پێیان بێت. نە بۆ خۆی هەوڵدەدات کێشەکە چارەسەر بکات، نە دەخوازێ دەستپێشخەری بکەوێتە دەست هێزەکانی گەل. ڕەوشی ئێستا بەمجۆرەیە و لە میانەی ئەو بەرژەوەندییانەی بەدەستی هێناوە لە توانایدایە تا ئەو ئاست و شوێنە بچێت. ئەوە بخەینە لایەك کە بەدوای لێگەڕینی نوێ و قۆناخی دیکەدا بێت، بەڵکو کۆسپ خستنە پێش پێشکەوتنی بەمجۆرە، بە ئەرکێکی سەرەکی خۆی دەبینێ. پەنجا ساڵ زیاترە لە تەواوی کوردستاندا مەسەلەکەی لای خۆی قوفڵ کردووە، بۆ ئەوەی ئەو بەرژەوەندییانەی بپارێزێت کە بەدەستی هێناوە، لە ڕەوشێکی وەهادایە کە بۆ هەموو هەڵوێستێك تەنانەت بۆ خیانەتیش

کراوەیە. بێگومان ژیان لەبەرامبەر هەوڵ و تەقەلای موحافەزەکاری و پاشەڕۆیەتی بەمجۆرەدا ناوەستێ. ئەو قەیرانەی لە ئارادایە، هەروەکو چۆن بۆ ئێراق بەمجۆرەیە، ئەوا بەردەوام رێگا چارەی نوێ سەبارەت بە کوردستانی ئێراق لە رۆژەڤدا دەهێڵێتەوە. بێگومان کێشەیەك کە بەردەوام جێگای خۆی لەنێو رۆژەڤی جیهانیدا بگرێت، ئەوا بە بێ خۆڵقاندنی چارەسەری وەکو خۆی بەردەوام نابێت. چونکە بەردەوام دەرفەت و تواناکاری چارەسەری دێتە ئاراوە. هەربۆیە ئامادەکاری و هەبوونی ئەلتەرناتیف بەرامبەر هەر ئەگەر و پێشکەوتنێکی شیمانەکراو گرنگ و بایەخدارە.

بەهۆی ئەم فاکتەرانەیە کە PKK لە جاران زیاتر بۆ بەدیهێنانی چارەسەری رۆڵێکی کاریگەرانە دەبینێ. بەرجەستە و بەجێکردنی PKK وەکو پارتییەکی باشووری کوردستان، بابەتێکە ماوەیەکی درێژە لە رۆژەڤدایە. بێگومان لە ئەنجامی هەزاران تەڤلیبوون و شەهادەتەوە بووە بە پارتییەکی گەلی باشووری کوردستان. نیشاندانی وەکو دیاردەیەکی دەرەوەی باشوور، ئاکارێکی ئەو پڕوپاگەندەیەیە کە هێزە بەکرێگیراوەکان لە میانەی هەموو هێز و توانایەکیانەوە، ئەنجامیانداوە. کاتێك PKK لە تەواوی ئەم هێزانە زیاتر خۆی بە هێزێکی ناوچەکە ببینێ، پێویستە لە بوارەکانی سیاسی، سەربازی، کۆمەڵایەتی و کولتووریدا ببێتە خاوەن پێگە و لە هەموو رووبەکەوە پراکتیزەی بکات. پێویستە جەخت لەسەر بەڕێوەبەرایەتییەکی فیدراسیۆنی دیموکراتییانەی کوردان بکات. دەبێ بزاری ئەوە بێ کە PDK و YNK بە یەکەوە بکێشێنێتە ناو فیدراسیۆنێکی بەمجۆرە؛ ئەگەر یەکێکیان نەبێت، لەگەڵ ئەوەی دیکەیان، ئەگەر ئەویش نەبێت، ئەوا دەبێ لە میانەی هەوڵ و کۆششەکانی خۆی، لەو گۆڕەپانانەی کاریگەرێتی لە سەریاندا هەیە خێرایی بە پێکهاتەی دیموکراسییانەی خۆی بدات و تۆکمەی بکات. لە کاتێکدا لە چوارچێوەی ئێراقدا بە گشتی رۆڵی خۆی لە پێکهێنانی بەرەیەکی دیموکراسیدا دەبینێ، کە تەواوی گروپە نەژادی و ئایینی و کولتوورییەکان جێگای خۆیانی تێدا بگرن، ئەوا هاوکات پێویستە بە سووربوونەوە بەڕێوەبەرایەتی فیدراسیۆنی دیموکراسییانە لەناو کوردان بەرز بکاتەوە. دەبێ جەخت لەسەر چارەسەری دیموکراسییانە بکاتەوە و هەموو گروپ، پارتی، عەشیرەت و تەنانەت رژێمیش و هەموو رێکخراوە بەرەییەکانیش راکێشێتە سەر ئەو رێباز و بۆچوونەی، کە سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی ئێراق لەسەر بنەمای کۆماری دیموکراسییانە لەناو ئەم چوارچێوەیەشدا جێگرتنی ستاتۆی فیدراسیۆنی دیموکراسییانەی کوردان، راسترین رێگای چارەسەرییە.

تەواوی هەلومەرجە ناوخۆیی و دەرەکییەکان وەرچەرخانی دیموکراسییانەی ئێراق دەکەنە ناچارییەك. ئەگەری ئەوە هەیە پێشکەوتنی لە جۆری یۆگسلاڤیا بێتە ئاراوە. بەڵام دەبێ لەسەر بنەمای بینینی ئەو رەوشەی کە شیمانە دەکرێت بەردەوام گۆڕان بە خۆیەوە ببینێ و بەلاوە بنرێت، تەگبیر بۆ هەموو جۆرە شێوازێکی چارەسەری وەربگیردرێت. دەبێ بە

شێوەیەکی ڕۆژانە هەڵسەنگاندن ئەنجام بدرێت. بەرەو پێش یان بۆ دواوە، هەنگاوی سیاسی و سەربازی، بە قووڵی و بەرفراوانی بهاوێژرێت. ئامادەکاری و هەبوونی ئەلتەرناتیف بەرامبەر بە خراپترین ئەگەریش ناچارییە. واتە ئەگەر ئەو سیستەمەی کە ئێستا هەیە، یاخود ئەو سیستەمەی لە دوای ئەو دێت، لەگەڵ هێزە بەکرێگیراوەکانی کوردان بێن بە یەك و هێرش بێنن، پێویستە ئامادەکاری هەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ لە میانەی دیسیپلینێکی باڵا و پتەوی شێوازی ژیان و تێکۆشانی قۆناخی نوێ بە لێهاتووترین شێواز و هەناسە بە هەناسە زاڵ بکرێت. پێویستە لە بواری چەندایەتی و چۆنایەتیدا مەزن بوون لە ئارادا بێت، بەشێوەیەك بتوانێ بەرەنگاری هەموو جۆرە هێرشێك ببێتەوە و دژەهێرش ئەنجام بدات. لەسەر بنەمای گیانی بەرپرسیارێتی بەرامبەر بە گەلە خێرلەخۆنەدیوەکەمان و هەڤاڵانی زیندان و گەم ئەندامان و شەهیدانمان، دەبێ بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە هەموو ئەو ئەرکانەی کە دەکەوێتە سەرشان جێبەجێ بکرێت. بە بێ هیچ بەهانە و خۆدزینەوەیەك، پێویستە بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە داخوازی و ئومێدی چارەسەری بۆ ئەم ناوچەیە بخوڵقێنرێ، کە خوێنێکی زۆری لێ چۆڕاوە و قوربانییەکی یەکجار زۆری داوە. کاتێك بزووتنەوە کوردییەکان لە ئێراق، PKKشی لەناودا، ئەم ڕۆڵە مێژووییەی خۆیان لە ئاستی تەواوی کوردستان و ڕۆژهەڵاتی ناویندا ببینن، نەتەوەپەرستی سەرەتایی و نەتەوەپەرستی بۆرژوای باڵادەست تێپەڕ بکەن، ئەهەق کۆسپەکانی خێڵایەتی و بنەماڵەیی و پاشفەڕۆیی بێن، ئەوا هەروەکو سەردەمی بەر:بەیانی شارستانییەت، جارێکیتر شارستانییەتی دیموکراسییانە بەشێوەیەکی سەرکەوتوو لە بەرەبەیانی ڕۆژهەڵاتی ناوین هەڵدێت. ئەو کاتە بەدەستخستنی شەرەفی هێزی دەستپێشخەری سەردەم و قۆناخی نوێ لە هەموو شتێك بەهادارترە. ئەوانەی لەمیانەی ئەم چەمکە مێژوویی و شەرەفمەندییەوە بژین، ناشێ بیر لەوە بکرێتەوە کە لەو ئەرکانەی دەکەوێتە سەرشانیان سەرکەوتوو نابن. تاکە هۆکار و بەهانەی ژیانمان ڕەچاوکردنی پێشکەوتنێکی واتاداری بەمجۆرەی مێژوو و چاوەڕوانکردنی سەرکەوتنەکەیەتی.

**٤. کێشەی کوردەکانی سوریا بۆ بەدەستهێنانی ناسنامە و چارەسەری تەفلیبوونی دیموکراسییانە**

هەروەکو چۆن پارچەی عەرەبەکان ( ئاشوریەکان) بۆ ناو کوردەکان درێژ بۆتەوە، ئەوا کوردەکانیش پارچەی وەهایان هەیە کە بۆ ناو عەرەبەکان درێژ بۆتەوە. کوردەکانی سوریا لەسەرووی ئەمانەوە دێت، لەلایەنی کولتووری و جوگرافییەوە پارچەی بەمجۆرە پێکدێنن. بەدرێژایی مێژوو درێژ بوونەوە و بەناو یەکداچوونی وەها لەنێو گەلان لەئارادا بووە. تەواوی جیهان، بەتایبەتیش ئاسیا و ئەوروپا بەردەوام ڕووبەڕووی دیاردە و کێشەی بەمجۆرە بۆتەوە. هەڵوێست و مەیلە نەتەوەییەکان ڕەوشی کەمایەتی بەمجۆرەیان کردووە بە بیانووی

توندوتیژی و رێگایان لەپێش چەندین شەڕ کردۆتەوە. لەگەڵ سەقامگیربوونی سیستەمی دیموکراسییانە، ئەم جۆرە کێشانە لەناو سنووری هەمان دەوڵەت و وڵاتدا، لەرێگای دانان بەهەبوون و مافە کولتووریەکانی کەمایەتیەکان و وەکو بابەتی جیاجیا بەجێکردنی تەفلیبوونی دیموکراسییانە لەنێو مافەکانی مرۆڤ و دەستوور، سەرکەوتووانە چارەسەر بووە.

بەشێکی مەزنی کوردەکانی سوریا، تایبەتمەندێتیەکی بەمجۆرەی هەیە کە لەوانە پێکدێت کە لەئەنجامی یاخیبوون، شەڕی خێڵایەتی و بێ یاسایی بەدرێژایی مێژوو، لە ناوچەی جیاجیا کۆبوونەتەوە. مێژوو ئەمە نیشان دەدات کە لە دەرکەوتنی حەزرەتی ئیبراهیم لەئورفا تاوەکو دوا پێهەڵگرتن و کۆچی PKK ، لێشاوێکی بەمجۆرە بەرەو ناوچەکانی دەریای سپی لەسەرووی هەمووشیانەوە سوریا، چڕبۆتەوە. هەروەها ئەوەش دەبینرێ کە عەرەبەکان (ئاشوریەکان) لەئاکامی هۆی هاوشێوە، لەئەنجامی کاریگەری گەرما و بەنامانجی بازرگانی بەرەو ناوەوەی کوردستان و ئەنادۆڵ کۆچیان کردووە. بەدرێژایی مێژوو دەبینرێ کە کۆچێکی بەردەوام و نیشتەجێبوون و دانوستاندنی دوولایەنەی کولتووری و بازرگانی لەم نێوانە (گۆڕەپانە)دا ئەنجامدراوە. ئەمانە رۆڵێکی گرنگی گۆڕانکاری و وەرچەرخانی نێوان کولتوورەکانیش دەبینن. دواتر ئەرمەنی و تورکمانەکانیش بەچڕی تەفلی ئەم قۆناخە بوون. هەربۆیە هەمەرەنگیەکی کولتووری، زمان، ئایینی دەوڵەمەند دێتە ئاراوە. بەشێوەیەکی سەرەکی سوریا وەکو وڵاتێکی خاوەن دەوڵەمەندیەکی بەمجۆرە شێوەی گرتووە. بوونی بە زەمینەیەکی لەبار بۆ رێککەوتنی دیموکراسییانە و بەیەکەوە ژیان، هۆکارەکەی بۆ ئەم پێکهاتە مێژووییانە دەگەڕێتەوە. کێشە سەرەکیەکانی تەواوی گروپەکانی سوریا، کوردانیش لەنێو ئەم راستینە مێژووییەدا، لەمیانەی پاراستن و پێشخستنی ناسنامەی کولتووری خۆیان، پەروەردە بەزمانی زگماکی، دابینکردنی مافەکانی راگەیاندن ـ بڵاوکردنەوە و وەکو هاووڵاتیەکی ئازاد و یەکسان پەیڕەوکردنی ماف تەفلیبوونی ژیانی سیاسی، چارەسەر دەکرێت.

هەرچەندە لەم لایەنەوە دان بەهەندێ ئازادیەکانی نرابێت، بەڵام چەندین کێشەی تاوەکو ئێستا چاوەڕوانی چارەسەری دەکەن. ئەمانەش بابەتەکانی سەبارەت بە هاووڵاتییەتی، پەروەردە بەزمانی دایك، مافە سیاسیەکان و ماف راگەیاندن ـ بڵاوکردنەوەیە. لەگەڵ ئەوەی کۆسپ نانەوەیەکی بەدژواری لەئارادا نییە، بۆ ئەوەی ئەم مافانە لەژێر گەرەنتیدا بەکار بهێنرێن پێویستی بەستاتۆیەکی سیاسی هەیە. ئەنجامگیر بوون و سەرکەوتنی تێکۆشانی یاساییبوون دەبێتە دەسکەوتێکی مەزنی دیموکراسییانە، رۆڵ و بەشداریەکی بەهێزیشی لە دیموکراتیزەبوونێکی گشتی سوریادا دەبێت. لایەنگر و جەماوەرێکی بەرفراوانی PKK لەم ناوچەیەدا هەیە. ئەرکی سەرەکی ئەم جەماوەرە ئەوەیە، لەچوارچێوەی ئەم مافە یاساییانە لەرێگای پرۆگرامێکەوە تێکۆشان و رێکخستنی یاسایی و دیموکراسییانە لەگەڵ هەڵمەتی

ولاتپارێزی گشتی و دیموکراتیزەبوونی سوریا بکاتە یەك و پشتگیری و هاوكاری تێکۆشانی ئازادی ئەو ولاتانە بکات کە لێیەوە هاتوون.

تەواوی ئەو کوردانەی لەئەنجامی هۆی جیاواز لەتەواوی جیهان بلاوبوونەتەوە لەسەر هەمان بنەما ئەرك و بەرپرسیارێتیان دەکەوێتە ئەستۆ. ئەو کوردانەی لەهەر ولاتێکەوە هەن، لەسەرووی هەمووشیانەوە ئەوانەی لەشارە گەورەکانی ئەو ولاتانەن کە بەیەکەوە تێیدا دەژین، ئەوانەی ناوچەکانی کۆچی زۆرەملێیان بۆ کراوە، ئەرکیان ئەوەیە، هەبوونی کولتووری خۆیان بپارێزن، بەدەستهێنانی مافی هاوولاتیتی، پەروەردە بەزمانی زگماکی، مافەکانی راگەیاندن و بلاوکردنەوە، لەسەربنەمای مافەکانی مرۆڤ و پێوانەکانی دیموکراسی چالاکانە تەڤلی ژیانی سیاسی ببن و سەرکەوتووانە ماف و ئەرکەکانی خۆیان جێبەجێ بکەن. بۆ ئەمەش پێویستە لەسەرووی هەموو شتێکەوە لەبواری هونەر و هەموو بوارەکانی کۆمەلایەتی، وەرزش، پەروەردە و تەکنیکی خۆیان پێبگەیەنن و لەمیانەی ژیانێکی چالاکانە هەبوونی کولتووری خۆیان بپارێزن و بەرەی پێبدەن. لەم چوارچێوەیەشدا هاوبەشێتیکردنی تێکۆشان و ژیانی گەلانی دیکەیە لەسەربنەمای شەرەفمەندی و یەکسانی و ئازادی. بەشداری و هاوكاری و پشتگیریکردنیەتی لەتێکۆشانی ئازادیخوازی ولاتی دایك بەپێی توانا و هێز.

خالی کۆتایی، کێشەی یەکێتی تەواوی کوردەکانە. لەرابردوو بەردەوام دروشمی "کوردستانێکی سەربەخۆ و یەکگرتوو سۆسیالیستی" دەگووترایەوە. ئەم دروشمەی سەرچاوەی خۆی لە نەتەوەپەرستیەوە دەگرێت، هەم لەلایەنی ئایدیۆلۆژی، هەم لەلایەنی سیاسی — پراکتیکی واقیعی نییە. ئەگەر لەلایەنی یۆتۆپیاوە لەگوێی مرۆڤدا خۆشیش بێت، راستتر ئەوەیە دروشمی ولاتپارێزی و ئەنتەرناسیۆنالیزم لەسەر ئەم بنەمایە بێت واقیعی ترە: "ولاتی دیموکراتی، نیشتمانی دایکی ئازاد" کە بۆ هەموو ئەو دەوڵەت و ولاتانە گونجاوە کە کوردی تێدا دەژین، سەبارەت بەتەواوی رۆژهەلاتی ناوینیش "رۆژهەلاتی ناوینی دیموکراسییانە، نیشتمانی دایکی یەکگرتوو". ئەم دوو دروشمە سەرەکیە بۆ تەواوی گەلانی رۆژهەلاتی ناوین لەجێی خۆیدایە. عەرەبەکان بۆ زیاتر لەبیست پارچە دابەشکراون. رەوشی پارچەبوونی تورکەکانیش تابلێی بەرفراوانە. ئێرانیش خۆی لەنێو رەوشێکی پارچەبووی هاوشێوەدا دەبینێ. رەوشی پارچەبوونی کوردان رەهەندێکی جیاوازتری هەیە و تایبەتمەندێتی جودای هەیە. ئەگەر هەر پارچەیەکی گەلێکی دابەش و پارچەکراو تەنیا سەربەخۆ، بکەوێتە نێو شەرێك لەپێناو نەتەوە و ولاتێکی یەکگرتوو، ئەوکاتە رۆژهەلاتی ناوین سەرتاسەر دەبێتە گۆرەپانێکی شەر و پێکدادان. لەمیانەی جیاوازیە جوگرافی، کۆمەلایەتی و ئاینیەکان زیاتر پارچە پارچە بووە و رەوشێکی ئالۆزی وەها لەئارادایە رزگاربوون لێی سەختە. هەموو لایەکی، وەکو پێکدادانی عەرەب — ئیسرائیل ی لێدێت. ئەم چەمکانەی نەتەوەی یەکگرتوو یاخود ولاتی یەکگرتوو سەرچاوەی خۆیان لەنەتەوەپەرستی وەردەگرن و رێگایان لەپێش شەرەکانی

هەردوو سەدەی خوێناوی ١٩ و ٢٠ کردەوە. لەمیانەی شێوازی نەتەوەپەرستیەوە ورووژانی پێکدادانەکان لەرۆژهەڵاتی ناوین، بەواتای ئەوە دێت سەرتاسەری سەدەی ٢١ میش پڕ لە شەڕ و کوشتار و جینۆساید تێپەڕ ببێت. هەربۆیە ئەمە شایستەی وڵاتپارێزی و ئەنتەرناسیۆنالیزم و مافپەروەری هیومانیزم نییە و لێیان ناوەشێتەوە.

هەڵوێستی راست ئەوەیە، سنووورە سیاسیەکانی ئێستای رۆژهەڵاتی ناوین وەکو پێدراوە (معطیات) بەبناخە بگیردرێت، لەنێو یەکێتی تەواوی دەوڵەت و وڵاتەکان تێکۆشانی سەرەکی دیموکراسییانە بکرێت و یەکسانی ماف و یەکێتی ئازادانە بەدیبهێنرێت. هەر وڵاتێکی دیموکراتیزە دەبێت، هەنگاوێکی دیکە نزیکی رۆژهەڵاتی ناوینی دیموکراسییانە دەبینەوە. رۆژهەڵاتی ناوینی دیموکراسییانە لەگەڵ خۆیدا لەمیانەی پێکهاتەیەکی لەجۆری یەکێتی ئەوروپا لەنێو ئازادیدا دەتوانێ ببێتە وەڵام بۆ ئومێدەکانی یەکێتی تەواوی گەلان. گۆڕانکاریەکانی دەوڵەتە عەرەبی و تورکیەکان زیاتر مەیلی وەها دەسەلێنن. ئەوە سەلێنراوە کە شێوازەکانی پان تورکیزمی ئەنوەر پاشا و پان عەرەبیزمی جەمال عەبدولناسر لەواقیع دوور بوون و جەربەزە (          ) بوون.

ئەو رۆڵە دەگمەنەی مێژوو بۆ کوردانی رەخساندووە، هەر پارچەیەک لەمیانەی چارەسەری دیموکراسییانە ئەو وڵات و دەوڵەتە بۆ شارستانییەتی دیموکراسییانە راکێش بکات کە تێیدایە. ئەم رۆڵەش، لەگەیشتن بەشارستانییەتی دیموکراسییانەی رۆژهەڵاتی ناویندا، گونجاوترین و واقیعیترین رێگایە بەگوێرەی نەریتی مێژوویی و جوگرافیا و ئابووری و واقیعی کۆمەڵایەتی کوردان.

وەکو ئەنجام، کێشەی کورد لەوە دەرچووە کە لەمیانەی نزیکبوونەوە و شێوازەکانی سەردەمی نەتەوەپەرستی چارەسەر بکرێت. ئەو نەتەوەپەرستیەی شۆڕشی فەرەنسا بەرزی کردەوە، هەڵوێستێکی ئایدیۆلۆژی چینی بۆرژوایە کە سەبارەت بەدیاردەی نەتەوە و کێشەکانی پەیڕەوی کردووە. رۆڵێکی ئایدیۆلۆژی سەرەکی لەدەرکەوتنی دەوڵەتی نەتەوەیی و سەرکوتکردنی دیموکراسیەت و تێکۆشانی چینایەتی، یەکتر فڕکردنی نەتەوەکان پێکدادانە ئەتنیکیەکان و سیاسەتی داگیرکردندا بینیوە. رۆڵی شۆڤێنیزمی نەتەوەپەرستی بۆرژوا لەوەدا یەکلایی کەرەوەیە کە سەدەی ١٩ و ٢٠ خوێناوی تێپەڕ بێت. ئەوروپا کە سەرچاوەی لەدایکبوونی نەتەوەپەرستییە، لەمیانەی ئەم پەند و ئەزموونانەی لەو شەڕ و پێکدادانانەی وەرگرت لەنیوەی دووەمی سەدەی بیستەم نەتەوەپەرستی خستە پلەی دووەمەوە، پێوانە دیموکراسیەکانی لەسیستەمی سیاسی خۆیدا بەبنەما گرتووە. سیستەمی دیموکراسییانە بەرامبەر بەتەواوی سیستەمە سیاسیەکان، سۆسیالیزمی بونیادنراویشی لەناودا، باڵابوونی خۆی سەلماند، لەکۆتاییەکانی سەدەی بیستەم لەگەڵ رووخانی سۆسیالیزمی بونیادنراو لەجیهاندا بووە بەسیستەمی یەکەمین.

هەم نەتەوەپەرستی نەتەوەی سەردەست، هەم نەتەوەپە،ستی سەرەتایی خۆجێیی سەبارەت بەکێشەی کورد لەقووڵکردنەوەی بێچارەیی و هاژۆتنی وڵاتەکانیان بۆ نێو بنبەستبوونێکی قووڵ بەولاوە ڕۆڵێکی دیکەیان نەبینیوە. داکۆکیکردن بەسەر ئەم هەڵوێست و شێوازانە، قووڵبوونەوەی قەیرانەکان و یاخیبوون و سەرکوتکردن و کوشتاری بەکۆمەڵە. ئەم دوو جۆرەی نەتەوەپەرستی لەگەڵ پێشکەوتنی شارستانییەتی دیموکراسی هاوچەرخ ناکۆکە، بوونە بەئایدیۆلۆژیای پاشڤەڕۆ و پاشماوەکانی سەدەی نۆزدەهەم. ئەم ڕاستینەیە ئەوە دەخاتەڕوو کەپێویستە سەبارەت بەکێشەی کورد پێوانەکانی شارستانییەتی دیموکراسییانەی هاوچەرخ بەبنەما بگیردرێت. کوردان لەم قۆناخە نوێیەی مێژوویاندا، لەمیانەی بینینی ڕۆڵی پرد لەنێوان سێ نەتەوەی مەزن، بەهۆی هەلومەرجە جوگرافی، مێژوویی و کۆمەڵایەتییەکانیان خاوەنی ئەو هێز و تێکۆشانە دیموکراسییەن کە هەم خۆیان هەم گەلانی دراوسێ ڕاکێشی ناو قۆناخی چارەسەری دیموکراسییانە دەکەن. کوردان بەبێ ئەوەی لەپێناو سنوورەکان بکەونە نێو ململانێی خوێناوی، لەمیانەی ئەو تێکۆشانە دیموکراسییانەیەی لەهەر پارچەیەکدا بەدەستی دێنن، لە بەدیهێنانی یەکێتییەکی ڕاستەقینەی گەلانی ڕۆژهەڵاتی ناوین و برایەتی و ئازادی، گەرەنتی بنەڕەتی سەرکەوتنن.

## بوون بە جەنگاوەری ئازادی گەلێك كە لەنێو گەمارۆی پیلانگێڕیدایە

### دەروازە

شیكردنەوەی رووكاری ناوەوەی پیلانگێڕییەكەی دژ بە عەبدوڵڵا ئۆجـ ئالان، بۆ تێگەیشتنی تراژیدیای ئەو گەلـەی لـەچوارلاوە گـەمارۆ دراوە و لـەناوخۆش خیانـەتكاری یـەكجار زۆرە، رۆشنكەرەوە و پڕ لەئەزموونە. تەنیا بەرپرسیارێتی خستنە سەر ساویلكەیی دۆستان و لاوازی هەڤالان، دەبێتە هەڵوەسـتەیەكی بەرتەسـك. هـەروەها روونكردنـەوەی ئـەم پیلانگێڕییـە وەكو دەستێوەردانێكی ئیمپریالیزم لەسەرەوە، نابێتە روونكردنەوەیەكی تێروتەسەل.

چاوەڕوانی دەكرا سەبارەت بەم بابەتـە ئاڕاسـتەیـەكی مـەزن و ئاستێكی بڵنـد قـووڵ ببمـەوە، هـەر ئاواشـم كـرد. كاتێك ئەمـەم ئـەنجامدا بینیـم مێـژوو بـە حەشـامەت زینـدوو دەبێتـەوە و شـەپۆل شـەپۆل بـەلامدا دێـت. راسـتینە بنەڕەتیـەكان زینـدوو دەبوونـەوە. ئـەو بوونـەوەر و دیاردانـەی ئەگـەر هـەزار ساڵ لـەدەرەوە ژیابووامایـە لێـی تێنەدەگەیشتم، یـەك یـەك واتـادار دەبوون. نەك تەنیا زمانی زگماكی كۆمەڵگا و لۆژیكەكەی، بەڵكو زۆر بەئاسانی دەمتوانی زمانی تـەواوی سروشت شیبكەمەوە و چارەسـەربكەم. دەركـم بـەوەش دەكـرد ئـەو راسـتینەیەی بـە ئەفسانە نـاودەبرێت خـودی راستییە، ئـەو راستینەی بـە هەنووكە و رۆژانـەیی نـاو دەبرێـت، كوێرانەیە. چەندە لەچۆنیەتی لە سەرپێیان رۆیشتنی یەكەمین مـرۆڤ و یەكـەمین چەكـەرەی هـزر و شێوازی موعجیزەیی یەكـەمین وشـە تێبگەیشتبووامایە، هـەروەها زیـاتر دەركـم بـەوە بكردبایە كە جۆش و خرۆشی دروستكردنی یەكـەمین نـان كـە بەرهـەمی چاندنـە، بـە واتـای جەژن دێت و دۆستایەتی ئاژەڵ ئارامی و ئاسوودەیی لەگەڵ خۆیدا هێنا، هەروەها زیاتر دەركـم بەوە بكردبووایە كە بۆ یەكـەمین جار هۆشمەندبوونی كۆمـەڵگا و ناسینی خـۆی سـەرچاوەی هــەموو جــۆرە زاراوەیــەكی خودایــە، هــێزە سروشــتییەكان بــۆ ئاســتی خوداییبــوون بەرزكراونەتـەوە، هـەروەها گەوهـەری خوداوەنـدی دایك و ئـەو ژیانـەی ئـەونكاری و خـانووی لەبـەرد دروسـتكراو و داهێنـانی دەسـتاڕ و جووتكـردن تێبگەیشـتبووام كـە لـە چـواردەوری خوداوەندی دایك پێشكەوت و بەواتای شۆڕشێكی مـەزن دێت، كەمێك لـە هەژمـەتی دوا سـاڵی سەدەی بیستەم رزگارم دەبوو كـە پیلانگێڕی دژی مـن ئامـادەكرد. مەسـەلەی واتـاپێدان زیـاتر پێشدەخەم. هەروەها دەستم بە شیكردنەوەی واتای سووڕانەوەم بەسەر ئەو خاكـە كردبـوو كـە لێی لە دایك بووم و وەكو چەرخ و فەلەك وابوو. ئەوكاتە بـەهای ئـەوەش تێدەگەیشـتم كـاتێك بە تەوژمی غاردانی ئەسپ رووم لەچیا دەكرد و دایكیشم سێ جار بەشێوەی لەسێدارەدانێكی

نیوەچڵ سزای دەدام. دەبووایە زۆر باش لە گووتەی " هیچ کەسێك تەقلی ئەم جۆرە کارکردنەی تۆ نابێت، هەموو کەسێك سوودت لێ دەبینێ و بە تەنیا دەمێنیتەوە" تێبگەم، کە ئەو دایکەی بە ئەزانم دەبینی زۆر باش منی ناسیوە. هێشتا تەمەنم دە ساڵان بوو. دەبووایە ئەو هەڵوێستەش بە یادی خۆم بێنمەوە، کە بەبێ ئەوەی ئاوڕ بدەمەوە و تەماشای دایکم بکەم گووتم "قەیناکە، سوورم لە سەر ئەوەی بەتەنیا بڕۆم". کاتێك بەمجۆرە دەرکم بە خۆم دەکرد ئەو خاکەم شیدەکردەوە کە تێیدا لەدایکبووم. ئەو کاتە دەمزانی کاتێك سەدەی بیستەم بە قورسایی هەموو هێز و توانای خۆی هێرشم دێنێتە سەر، تۆڵە لەچی دەسێنێتەوە. کاتێك دەرکم کرد ڕووبەڕووی هێرشێکم کە لەو هێرشە دەچێت لەمیانەی ئەو دەوڵەتەی زادەی ڕاهیبە سۆمەرییەکانە کراوەتە سەر خاکی بەپیتی خوداوەندی دایك، ئەوکاتە خۆشم لەخۆمم ڕادەکرد و دەمبینی کە لە چەند دڵۆپێکی واتا بەولاوە هیچ شتێکی دیکە نەماوە. کاتێك وەکو گلگامێش بەدوای ژیانی نەمریدا دەگەڕام، دەرکم بەوە دەکرد ڕووبەڕووی هێرشێك بوومەتەوە و ئەمەش لەلایەن ئەو هێزانەوە ئەنجام دەدرێت کە بە ملیۆنان جار لەوانەی ئەو قۆناخ بەهێزترن، هەروەکو بڵێی لەهەر چوارلاوە هێرش دەکەنە سەر چەقی هەمان بازنە و لەمێژە بەگوێرەی ئەمە ئامادەکارییان کردووە و ژیانی خۆیان بەمە پابەند کردووە. ئەوکاتە چەندەی ئەو ئەژدیهایە مەزن بێت کە بەشارستانییەت ناودەبرێت، تێدەگەیشتم کە مرۆڤ مەترسیدارترین ئاژەڵە. بەجۆش و سەرسوڕمانەوە دەمبینی کە چۆن ئەو خوداوەندانەی ئەفسانەکانی ڕاهیبەکان بوونە بەخاوەنی سیستەمی سەیری کۆیلەداری. دەرکم بەوە دەکرد پێغەمبەرەکانی لەسەر پێڕەوی ئیبراهیمی باپیرەمانن، لەڕێگای بەرزکردنەوەی ئەم خوداوەندانە بۆ ئاسمان، ویژدان ـ ئایین یان خولقاندووە. بەڵام بە حەزەوە ئەو باوەڕییەی خۆم مسۆگەر و پتەوتر دەکرد کە ئەو داهێنانانەی سۆمەر ـ بابل کە بە Allah،Ellah،Ilah ناو دەبرێت، داهێنان و خولقێنەری سیستەمی کۆیلەدارین. کاتێك تێگەیشتم ئەو هێزانەی لەتەمەنی دە ساڵان خواستیان من دیل بکەن ئەو خوداوەندە تۆقێنەر و خولقێنراوانەن کە گەوهەوی خۆیان لە دەستداوە، لە ڕێگای ئەم چەمکەوە بۆ یەکەمین جار بەرامبەر خۆم ڕێزدار بووم. بەردەوام مەراقم سەبارەت بە پەرستگای ڕاهیبە سۆمەریەکان زیادی دەکرد.دەرهەق بەم پەرستگایانە دەگەیشتم بەو حوکمە مسۆگەرە؛ دەرکم بەوە دەکرد کەخاوەنەکانی سیستەمی کۆیلەداری کراونەتە خوداوەند، بۆ ئاسمان بەرزکراونەتەوە و شکۆمەند کراون، مرۆڤە کۆیلە ـ بەندەکانیش وەکو خزمەتکاری ڕەبەن و بێچارە ژێر خاك کراون و ناچاری هەموو کارێکی قورس کراونەتەوە، ئەو دیاردەی بە جیابوونەوەی چینایەتی کۆمەڵگا ناو دەبرێت، لە ناوەندی خۆیەوە وەکو سەمبۆلێك دەوڵەتی قیت کردۆتەوە، پەرستگاکان بوون بە سەرچاوە و مندالدانی ئەم کارە. دەمبینی ئەو کارەی ئەنجامیانداوە چەندە سەمەرەیە، هەموو شتێك، تەواوی مێژوو، تەنانەت ڕۆژگاری ئەمڕۆمان و منیش کۆنترۆڵ دەکەن. ئیتر گومانم لەو

کارەیان نەدەکرد کە بە ئیلاهی ناو دەبەن. لە ناکامی ناسینی خوداوەندەکانم حەسابوومەوە. لەبەر ئەوەی بە جددی باوەڕم پێنەهێنان و نەمپەرستن خۆم مافدار دەبینی و ڕێزم لەخۆم دەگرت.

ناوم عەبدوڵڵایە، واتە بەندەی خودا، بەڵام باوەڕیم بەوە هێنابوو لە ڕێگای جێنەدان بە بەندێتی، لەدڵەوە بەرامبەر خۆم بەڕێز بووم، هەربۆیە چەندەی ئەم هێزە خوداییانە هێرش و پەلامارم بێننە سەر ، داکۆکیکردنم لەسەر مرۆڤی ئازاد سەروەرییەکی هەرە مەزنە. بەشێوەیەکی بەهێزتر سەرلەنوێ لەدایك دەبووم . بەرامبەر بە لەدایکبوون لەو دایکەی لێی ڕازی نەبووم و ئەو هەوڵانەی لەدایکبوونی نوژەن کە هیچ جارێك باوەڕیم بە جددیبوونەکەی نەهێنا ، دوای تەواوی لەنێوبردنەکان ئەو لەدایکبوونەی سێیەمم بە جددی دەگرت و حەزم لێی بوو کە بەخۆم خۆمم خولقاند. دیسان پێویستیم بە هەڤاڵاتی بەسەرهاتەکانی رابردوو نەدەبوو. ئیتر تەواوی هەڤاڵانم لە ئەفسانەکان دەبینیەوە. کاتێك بینیم ئەوەی زیۆسی پیلانگێڕ لە رابردوو بەرامبەر پرۆمەتا و هکتۆر ئەنجامیداوە، لەگەڵ ئەو کە نەوەکانی ئەسینا ئەمڕۆ ئەنجامیانداوە بەرامبەرە، باشتر هەڤاڵانی خۆم دەناسی. هەڤاڵێتی لەگەڵ پرۆمەتا و هکتۆر دەبووە جێگای شانازی. لەبەر ئەوەی شایستەی ئەمە بووم ، بۆ من جێگای شانازی بوو.

تاوەکو مۆخی ئێسقان دەرکم بەو راستینەیە کردبوو کە راهیبە سۆمەرییەکان عەشتاری ژنی ئەشق و خوداوەندیان بۆ پەرستگا گواستەوە، لەوێشەوە بۆ کۆشکی پادشا، کاتێك بردیانە لای پادشای ـ خوداوەند، لەگەڵ مردنی ئەم پادشایە بەزیندوویی لەگەڵیاندا زیندە بەچاڵ کران. تەنانەت ئەگەر پادشا ـ خوداوەندەکانیش بوونایە، هیچ کاتێك پەسندم نەدەکرد کە ژنان بکەن بە پارچەیەکی رازاندنەوەی مێزی رابواردن و کەیف و سەفا. بەڵام کاتێك تا رۆژگاری ئەمڕۆمان زۆر وردەکارانە پارچە بە پارچە واتای خوداوەندی ژن و ئەشقیان خوارد، لەژێر ناوی هاوسەرێتی دوولایەنەی ژن ـ مێرد پێشکەش بە کۆیلەکانیان کرد، دەرکم بەوە کرد بەشێکی کەمیشیان بۆ پیاوە کۆیلەکان هێشتۆتەوە. چەندەی وەکو پیاوێك ئەم دیاریانەم پەسند نەکرد و باوەڕیم بەوە هێنا کە دەبم بە کوڕێکی باشی خوداوەندی دایك و ژنی ئەشق، ئەوا پڕ لەخۆشەویستی و شانازی دەبووم. بەمجۆرە بۆ یەکەمین جار لەقووڵایی مێژوو دەرکم بەخاکی دایك دەکرد، ئەو ناکۆکیانەم چارەسەر دەکرد کە بە هەزاران ساڵە گرێکوێرەی لێدراوە و دەمبینی کە لەدایکبوونی ئەمجارە جیاوازترە. باوەڕیم بەوە هێنابوو پەیامی ئەوە بەو دۆستانە بدەم کە تائێستا باوەڕییان بەمنە، ئەوانەی مردن دەسەپێنن و سەدەی بیستەم و تەواوی پیلانگێڕان، هەرکێیەك بن دەتوانم بەرەنگاریان ببمەوە. کاتێك شیمکردەوە و دەرکم بەوە کرد، منیان کردبوو بە بۆمبایەکی ئامادەکراو و ئەوەی دەیسەپێنن زۆر لە هێرۆشیما مەترسیدارترە، ئەڵقەکەیم راکێشاو تەواوی کەرەستەکانم بەرووی خوڵقێنەرانی بۆمباکە داداوە، ئاسوودە بووم. لایەنگری مرۆڤایەتی بووم، بۆ جارێکی دیکە خوداوەندەکانی زۆرداری

ژێرکەوتبوون.

دیالەکتیکی مێژوویی کورد، پشتی بە رزگاربوون لە گەمارۆیەکی پەرژینکراو دەبەست. لەسەردەمی شارستانییەتی سۆمەریەکانەوە تاوەکو سیستەمی نێودەوڵەتی رۆژگاری ئەمرۆمان ، دیاردەی کورد بەردەوام دووچاری پەلاماردان و فشار هاتووە و خوازراوە ژێردەست بکرێت و بتوێنرێتەوە ، لە ولاتی هێزە دەسەلاتدارەکان وەکو کەرەستەیەك وابووە چۆنی بخوازن بەکاری بێنن. گەلی کورد تۆزقالێك دژی ئەم ستاتۆیە دەربکەوێت، خاوەنەکانی سیستەم تەڵەزگەکانی خۆیان دەخەنە گەڕ، ئەوانەی وەکو پاشماوەکانی لێدان و سەرکوتکردنەکان دەمێننەوە، هەندێکیان دەستگیر دەکات و هەندێکی دیکەیان لە ڕێگای پەیڕەوکردنی شێوازی برسیکردنەوە دێنێتەوە سەر ڕێی خۆی، جارێکی دیکە دەیانخەنەوە نێو گەمارۆی ئەو سیستەمەی خۆیان دەیخوازن. بۆ ئەوە هەڵسەنگاندنێکی گشتیمان ئەنجامدا تاوەکو ئەم دیلێتیە گەمارۆ دراوەی مێژووی کوردان لەناو مێژووی شارستانییەت روون بکەینەوە، دووبارەی ناکەمەوە. بەتایبەتیش مێژووی ئەم دووسەد ساڵەی دوایی، لە راستیدا مێژووی گەندەڵترین پیلانگێڕیەکانە. پیلانگێڕی بووە بەناوی سیاسەتی کارامەیی و دیپلۆماسیەت. وەکو گەلێك دەتوانین بڵێین کەس نییە وەکو دۆست نزیکی بووبێتەوە. هەرچی ئەوانەن کە بانگەشەی نوێنەرایەتی کردنی گەل دەکەن، ئەو زیانەی بەخۆیان و بەگەلیان گەیاندووە، لە خراپەکاری و زیانەکانی پیلانگێڕان کەمتر نییە. سیستەم لەرێگای کۆڵەکەکانی ناوەوە و دەرەوە پیلانگێڕی کردووە بە شێوازێکی ژیان. ئەمە وەکو نەخۆشیەکی بۆماوەیی بڵاودەبێتەوە.

کاتێك هێشتا لە ئەنقەرە بووم، بزافی چەپ کە دەبووایە نوێنەری یەکسانی و ئازادی و بەرهەمەندی مرۆڤ بووایە، لەکەسایەتی ئێمەدا، گەنجە کوردەکانی وەکو ئامرازێکی تەکتیکی سادە بەکار دەهێنا. لەبەردەوامیەکی وردکارانەی تەکتیکی چینی دەسەلاتدار بەولاوە تێپەڕی نەدەکرد. کاتێك ئەم رەوشە رێگای لەپێش کاردانەوە کردەوە، هەروەکو دیاردەی کورد و چارەنووسی کێشەکەیەتی، بەواتای کەوتنە نێو تۆڕێکی بەرفراوانتری پیلانگێڕی بوو. تەمەنی جەنگاوەرێکی ئازادی چەند ساڵێك نەبوو، بەرد شەقی بردبووایە چەند مانگێکی تێپەڕ نەدەکرد. بەرلەوەی بکەوێتە ناو تۆڕی دەوڵەتەوە، دابونەریتەکان و پاشماوە هەنووکەییەکان، تۆڕی بەناو دۆستەکان و هەڤاڵان بە ئەنقەست بێت یاخود غەفڵەت ، بەسە بۆئەوەی لەماوەیەکی کورتدا کۆتایی بەم مەسەلەیە بێنێت.

کاتێك تاڕادەیەك لەمیانەی لاوچاکیەوە ، تاڕادەیەکیش لەمیانەی یاوەری بەخت، جەنگاوەرێکی ئازادی بە بانگەشەی خۆی بەرەو رۆژهەلاتی ناوین کۆچی کرد، رووبەڕووی ئاستی پسپۆری هونەری پیلانگێری دەبۆوە. هاتبووینە ئەو شوێنەی دەکەوێتە نێوان شام ــ بەیروت ــ حەلەب کەلە مێژوو وەکو رێکخەر و رۆحی بازرگانی لەدایك بووە. سیاسەت شێوەیەکی ناسکتری بازرگانی بوو. هەموو شتێك لە رێگای شێوە وردەکەی بازرگانی واتە

لەمیانەی سیاسەت پێوانـە دەکرا، ئـاخۆ چـەندە پـارە دەکات. لەڕاستیدا سیاسـەت و یەکـەمین شـێوازەکەی لـە چـەرخی نـاویندا کـە ئایینـە، بـەدرێژایی تەمـەنی لەگەوهـەری خۆیـدا ئایدیۆلۆژیایـەکی بازرگانانـە، لـەو گوزارشـتەی خـاوەنی نـاوەڕۆکێکی پیرۆزییـە، بەئـەندازەی بەهاکەتان جێگاتان هەیە. چـەندەی بەهـەرزانی خۆتـان خـەرج نەکەن و بەکارنـەهێنن، ئـەوا باشتر بەهای خۆتان دەزانن. نوێنەرەکانی پێکهاتەی هـزری باڵادەستی تەنانـەت فریشتەش بـن کە تا ئەم رادەیە شێوەی بە پیرۆزی ئایین دا، ئەو سیاسەتمەدارانەی لە ڕێگای شکۆمەندییەوە ئـەو هـزرەی باڵادەسـتییان تێپـەڕکرد، هـەروەکو زۆر جـار لاقی بـۆ لێـدەدرێ چـاوەڕوانی نزیکبوونەوەی دۆستانە و برایانەیان لێدەکرا، تەنانـەت هـەندێ هەڵوێست و نزیکبوونـەوەی مرۆییانەی سنووردارێش لەهەڵوێستی کاتی و دەگمەن بەولاوە تێپەڕی نەدەکرد.

لـە چـوونم بـۆ رۆژهـەڵاتی نـاوین تەنانـەت یـەك چرکـەش رۆحـم بـێ ئەندێشـە نـەبووە. هەروەکو ئەوەیە بە هەزارو یەك زەحمەتیەوە لەخاکێکی مین رێژکراو بەرێوە دەچیت،بەگشتی مرۆڤی کورد، بەتایبـەتیش یەکەکەییـەکان لەناو ئـەم هەسـت و سـۆزەدا نـەژیاون . چونکـە بـەرێوەچوون لـەو رێگایـەی کراوەتـەوە و شوێنەوارەکەی دیـارە و ئاشـکرایە، بـەردەوام جێگـای باوەڕییـە. سـەرباری ئـەوەی بەشـێوەیەکی زۆر سەرسوڕهێنەرانە بانگەوازی و هاوارم دەکـرد ، تاکە ئاقڵمەندێکیش ئەو کات و تواناکارییە پێویستەی بەدەست نـەهێنا، لەهەمووشیان گرنگتر بە هۆشمەندی پێویست نەگەیشت و رۆڵی خـۆی نـەبینی. لەرۆژهـەڵاتی نـاوین هـەوڵێکی مـەزن درا لـەپێناو خوڵقاندنی تواناکارییـەکانی پچڕاندنـی پیلانگێڕی و توانستی گرنـگ خوڵقێنـرا . بـەڵام پێکهاتـە نـەفرەت لێکراوەکانی کەسایەتی بە هیـچ جۆرێـك دەرفـەتی بـەکارهێنانی ئـەم توانستانە نادات. ئەم دووبارە کردنەوە مەزنانـەم ئـەنجامگیر نـەدەبوو. هـەروەکو بڵێی تـەواوی هەڵمەتـەکان بـەر دیـوار دەکەوت و دەگەڕایـەوە. بۆئـەوەی باشـتر لـەم راسـتینەیە تێبگـەین، پێویست دەکات لەنزیکەوە رواڵەتی ناوەوەی پیلانگێڕی و پێکهاتەکەی پێناسە بکەین.

پیلانگێڕی جولانەوەیەکە جگە لە قۆناخـە ئاسـاییەکانی رووداوەکـانی کۆمـەڵگا، تـەنیا لەئاکامی هێزەکانی بەرامبـەرت نییـە، بـەڵکو تەنانـەت لەئـەنجامی هەڵوێسـتی بـە ئەنقەسـت یاخود غەفڵەتی ئـەو کەسـانەی هاوسـەنگەری تـۆن و دەبـن بەیـەك، لەئاکامی لێدان و کودەتا هێزی ئەو کەسایەتی، گروپ و پارتی و یاخود گەلەی کردوویانە بە ئامـانجی پێکان دەبخات و بەرەو رەوشی نائاسایی دەبات.

سـەبارەت بـەو کەسـایەتی، گـروپ، گـەل یـاخود ئامـانجی بـەرزتری کۆمـەڵگا، پیلانگـێڕان بەردەوام نەخشە دادەڕێژن و لەتەواوی خاڵە هەستیارەکاندا هێزی خۆیان ئامادە دەکەن، کاتێك دەرفەت ببینن نێچیرکردنی ئامانجەکەیان بەبنەمادەگرن.

کاتێك جولانەوەی ئازادی گەلی کورد هەنگاوێکی هەرە بچووکی هاوێشت، لەهەموو وڵاتێکدا لەوە زیاتر کـە لەڕێگای یاسا و بنـەما سیاسـیەکان و تەنانـەت بـەگوێرەی یاسـاکانی شـەڕی

سەربازی بەدوایدا بچن، لەپشت پەردەوە پیلانییان لەناو تاریکایی پێشخست. لەمیانەی بەکارهێنانی هەموو شێوازەکانی فرکردن، پلیشاندنەوە، تۆقاندن، وروژاندن، رفاندن،تەسلیمگرتن، نەشکەنجە، بەندکردن، ئیفلاسکردنی ئابووری، یاریکردن بە بەها نەخلاقییەکان، سەپاندنی ژیانی ساختە، بەکارهێنانی لاوازییەکانی، پارە، بەکارهێنانی تەواوی رێگاکانی نانەوەی ناکۆکی کە ناکەوێتە ناو چوارچێوەی هیچ یاسایەك، جولانەوەی ئازادی بەلاوە دەنرێت. ئەگەر سەرنج بدرێ دەبینرێ کە تەنانەت لۆژیکێکی ئاسایی شەڕیش پەیڕەو ناکرێت. پیلانگێڕی کردارێکە زۆر لە شەڕی تایبەت و قرێژ گلاوترە. چونکە هەقاڵی غافڵ و ئەوانە جێگای خۆیان تێدا دەگرن کە گوایە دۆستن. هەربۆیە لەهەمانکاتدا تاوتوێکردنی مێژووی جولانەوەی ئازادی گەلی کورد وەکو مێژووی پیلانگێران بەمزێدەرۆیی دانانرێت، بەپێچەوانەوە زیاتر بەرەو راستیمان دەبات. چونکە لەناو مێژوویەکی هاوشێوەی گەلانی تر نازین.

لایەنێکی ترسناکتری پیلانگێری، غەفڵەتی ئەوانەیە گوایە دۆست و هاورێن و لەکاتی خۆیدا ئەرکەکانیان جێبەجێ ناکەن و بەگوێرەی بەڵێنەکانیان بەرێوە ناچن. چەندە خاوەنی نیازی باش بن و کۆشش بکەن. بەلام لەئەنجامی ئەم رەوش و شوێنگەیان هەستیارترین زەمینە بۆ سەرکەوتنی نەخشەی پیلانگێران پێکدێنن. رووداوی بێ ژماری لەجۆری خیانەتی یەهودا ئیسکاریۆت کە عیسای بەرەو لەخاچدان برد و کوشتنی خەلیفەکان کە رێگای لەپێش رێڕەوی خراپی مێژوو کردوە، روویانداوە. ئەوەی سەبارەت بەگەلی کورد جێگای ئێش و هەژمەتە ، یەکە یەکەی رووداوەکان نییە، بەڵکو ئەوەیە کە تەواوی مێژووەکەی لەرێگای جموجوڵی بەمجۆرە ئاراستەیان وەرگرتووە. ئەوەی لەژێر ناوی دۆستایەتی لای خۆت هێشتۆتەوە، لەو شوێن و بەو شێوازەی چاوەڕێی ناکەی پێتدا دەکێشێ. ئەوەی پێشەنگایەتیتان بۆ دەکات، کاتێك بەئەنقەست یان بەنەزانی بەرەو هەڵدێرتان دەبات، وادەزانی رێچکەی راستی گرتۆتە بەر، لەو شوێنە و بەو شێوازەی چاوەروانی ناکەن، لەوانەیە بکەون و لەناو بچن. زەمینەی جولانەوەتان بەتەواوی گۆڕەپانێکی مین رێژکراوە. رووبەڕووبوونەوەی سەختیەکی زۆر بۆ باوەڕ کردن بەخۆتان و هاوسەر و براتان هەروەکو بڵێی قەدەرێکە.ناتوانن بڵێن هەموویان بەئەنقەست وادەکەن. ئەو کەسایەتییەی پێنەگەیشتووە لەهەلومەرجی سەختدا تەواوی هاوسەنگی خۆی لەدەستدەدات و تاوەکو دوایی بێ خێرە و حوکمی ئەو مێژووە نەفرەت لێکراوە بەردەوام دەبێت کە بەدەستی مرۆڤ پێکهێنراوە. هەرچی ئەوەی کەسایەتی رێبەر دووچاری دێت هەروەکو بڵێی دیمەنی "قوربانیکردنی پادشا" ی میتۆلۆژیەکانە. لەو قۆناخەی هێشتا پادشای زۆردار و چەوسێنەر دەرنەکەوتبوو، تەواوی نەفرەت و بێخێری کۆمەڵگا لەرێگای قوربانیکردنی ئەو کەسایەتییەی رۆڵ و جێگای رێبەرایەتی لەناو گەل و کۆمەڵگا هەیە بەلاوە دەنرا. ئەگەر لەنێو کوردان دا رێبەر نەکوژراوە ، تەسلیم نەبووە و شێت

نەبووە ، تائێستا لەسەر هۆشی خۆیەتی و شەرەف پارێزراو بێت، ئیتر ئەوەی چاوەڕوانی دەکات یان ئازادی یاخود "رێوڕەسمی کوشتنی پادشا" یە. لایەنی هەرە سەیری ئەم مەسەلە ئەوەیە، کە ئەو رووداوە میتۆلۆژیانەی بەر لەمێژوو راستینەیەکە و تاوەکو ئێستا لەناو کوردان دەژیت. هەربۆیە ئەفسانە و میتۆلۆژیا لەناو کوردان دەبێتە راستی، هەرچی را ستییە کوێر و کەڕولاڵ دەبێت.

جێگرتن لەناو گەلێکی وەها زۆر بە ئێشە، هەرچی راکردنە نامەردییە. هەرچی رانەکردنە واتای بەرگەگرتنی لۆژیکی بێبەزەییانەی پیلانگێڕانە کە کردەوەکانیان هیچ پاسایەك ناناسێ. چەندەی بەرگە بگریت و ببیتە قوربانی، ئەو نەفرەتەی خراوەتە ئەستۆت هێندە پاك دەبێتەوە . تاوەکو ئەم نەفرەتە نەوەستێنریێ هەموو شتێك حەرامە. ترپەی دڵی، زۆر لەترپەی دڵی ئاژەڵێك بێ نرخترە. لۆژیکەکەی بەتەواوی خیانەتکردنە لەراستی. هەروەکو بڵێی لەهەموو لایەکیەوە کێم دەچۆڕێ. هەموو کەسێك لێتان رادەکات. تاکە رێگای رزگاربوون لەم رەوشە یان ئازادی یان مردنە. جگە لەمە تاکە وشەیەکتان نییە کە بە دایك و باپیر و دۆستانی بڵێن و تەنانەت بۆ جارێکیش دەستی جەلاّلەکەتان بگرن.

هێشتا کاتێك منداڵ بووم هەستم بەو نەخۆشییەی کۆمەڵگا کردبوو. کاتێك منداڵ بووم بە گووتەی "ئایا دەزانی لەئەنجامی ئەوەی منت هێنا دونیا تا چ رادەیەك رێگات لەپێش ئازار کردۆتەوە؟" ئەو دایکەم تاوانبار کردبوو کە پێویست بوو ببێتە یەکەمین پەناگەم. دەرکم بەو ژیانە کردبوو کە هەر هەنگاوێکی پڕ لە هەزمەتی مەزنە. بەلاّم خیانەتم لەژیان نەدەکرد. بەبێ ئەوەی بێزار و ماندوو ببم، دونیا لەلایەك، من لە لایەکی دیکە، لەرێگای کاروانی مەزنی تەنیایی قەدەری سەپێنراوم پارچە پارچە کرد، یەك بەدوای یەك دەمامکەکانی خوداوەندەکانم دادەماڵی. دەزانم کە رێگام لەپێش ئێشی مەزن کردۆتەوە. بەتایبەت بەرامبەر ئێش و بوێری و ئازایەتی سنوورنەناسی ئەو قارەمانانەی ئاگریان لەجەستەی خۆیان بەردا، دەبوایە دیسان هێزی ژیان بەدەست بێنم. مێژووی پیلانگێڕی و ژیانی نەفرەت لێکراو لە کەسایەتی مندا ئێشی مەزنی دەسەپاند. لەئەفسانەکاندا یەکجار حەزرەتی ئیبراهیم بە مەنجەنیق فرێدەدرێتە نێو ئاگر، ئاگرەکەش دەبێتە ئاو. بەلاّم تەواوی ئەمرووە هاوچەرخەکان (سەرۆکەکان)، لە رێگای تەواوی نەفرەتەکانی سەدەی بیستەم، ئەو ئێش و ئازارانەی لە کەسایەتی مندا بەسەر گەلەکەمانیاندا سەپاند، تەماشاکردنی ئەو لەپستۆکانەی رێکیان خستبوو، تەنانەت بێ هاوتاترین شانۆگەری تێپەڕ کردبوو و بۆ خۆیان بەمەرجێکی دەسەلاّتە بێ سنوورەکەی خۆیان دەبینی. تەنانەت پێناسەیەکی راستیان دەرهەق بەو شەڕە نەدەکرد کە بەهاوئاهەنگی پەرێوەیان دەبرد و پاساکانیان پێشێل دەکرد. بەلاّم تەواوی تاوانەکانیان دەخستە ئەستۆی من، جارێکی دیکە دەیانگووت " تۆ هیچی " نکۆڵیان لە گەلی کورد دەکرد و فرێیان دەدایە لایەك. تیرۆریستێك لەبەرامبەریان بوو کە هەرەشە لەو دونیا

زەبەلاحە دەکات. پێویستە بەردەوام لەسەر تەختی سێدارە چاوەڕوان بێ، بەر لەسێدارەدان دڵی بوەستێ و مێشکی تێك بچێ. ئەمەش دواترین داهێنانی ئەشکەنجەی پۆست مۆدێرنیزمە. دوا قوربانی ئاڕانای هاوچەرخ بووم، ئەوەی نیرۆن ئەنجامی داوە لە بەرامبەریدا سفری لای دەستە چەپە.

بەرامبەر بەو پیلانگێڕییەی دوا ساڵی سەدەی بیستەم دژ بەو هەنگاوە ئەنجامدرا کە دەیخواست گەلی کورد ببێتە خاوەنی ئازادی و شەرەف کە بەردەوام بۆتە قوربانی مێژووی پیلانگێڕان، کاتێك تێپەڕی سەدەی بیست و یەکەم دەبووین هێشتا هەوڵی بەردەوامکردنی ژیانم دەدا. هەر لەبەر ئەوەی ئەو دڵ و چەند دڵۆپ واتایە بە ملیۆنان کەسی کردۆتە یەك و ئەو ژیانەی لەناو تابوتدا پەسندم کردووە، لە خاوەنەکانی جیهان بەدووری دەگرتم بە شەرەفمەندی و شانازییەوە پێشوازیم لێکرد.

## ١. مێژووی پیلانگێڕییەکان و ئەو وانانەی پێویستە لێیەوە هەڵبهێنجێنرێن

### أ - پیلانگێڕی چەرخی یەکەم و ئەفسانە خەڵەتێنەرەکان

لەبنچینەدا پیلانگێڕی دیاردەیەکی کۆمەڵگای چینایەتییە. لەڕێگای شێوازی ورد و درشت، بێکارگەرکردنی ئەو هێزانەی کۆمەڵگا بەئامانج دەگرێت کە لەدژی چەوساندنەوە و گوشاری دژواری چینایەتی دا لەبەرخودانداں. هەمیشە دوو شێواز بەکاردەهێنرێت: خەڵەتاندنی ئایدیۆلۆژی و سیستەمەکانی فشاری قەبە. بەگوێرەی شوێن یەکێکیان یاخود ئەوەی دیکەیان، لەزۆربەی کاتیشدا هەردووکیان بەیەکەوە بەکاردەهێنرێت. ئەگەر هاتوو سیستەمی ئایدیۆلۆژیانە ڕۆڵی باوەڕی پێدەر و خەڵەتێنەری خۆی بەتێر و تەسەلی بگێڕێت، ئەوا سەرەتا ئەویان هەڵدەبژێرێت، کاتێکیش ئەمە تێری نەکرد و دژبەر سەریهەڵدا و سیستەمی باوەڕی خۆی سەپاند، ئەوا هەوڵدەدرێت قۆناخی گوشاری دژوار وەکو دوا شێواز و بەخستنەگەڕی هەموو ئامرازەکانیەوە ئەنجامگیر بێت.

ئەوەی ئەم کردەیەی خستە ڕوو و وەکو زۆربەی سەرەتاکان پێشکەشی مێژووی کرد، دیسان شارستانییەتی سۆمەرە. گرنگترین کار کە لەپەرستگا هەوڵی سەرخستنی دەدرێت، پەیوەستی چۆنیەتی پەسندکردنی سیستەمی چەوساندنەوەیە وەکو باشترین سیستەم بە مرۆڤایەتی. لەم ڕووەوە ئەو میتۆلۆژیایەی ڕاهیبەکانی سۆمەر ئافراندیان ڕەنگە گەورەترین پیلانگێڕی بێت کە بۆ مرۆڤایەتی تەنراوە. شێوەیەکی هزری ئەوتۆ دەئافرێنرێت کە وا پێدەچێت هەموو ئەو مرۆڤانەی دەکەونە ژێر کاریگەرییەوە بە بەندەیی لەدایك ببن. بەرزاڵکردنی ئەو خوداوەندانەی هەموو لایەکیان گەمارۆ داوە، بەسەر زەینی مرۆڤدا، هەروەها لەڕێگای

بەخزمەتکارکردنی دڵخوازانەی مرۆڤەکان بۆ خوداوەندەکان، گەورەترین لادان و جیابوونـەوەی چینایـەتی کۆمـەڵگای ناسـراو لـە مێـژوودا پـەیرەو دەکرێـت و بەپەسـندکردن دەدرێـت. خوداوەندەکانی سیستەمی ئاسمانی رێکوپێك دەکەن و خۆشیان وەکو نوێنـەری ئـەوان لەسـەر زەوی و پاشانیش راستەوخۆ وەکو پادشا ـ خوداوەندەکان رادەگەیـەنن؛ ئەربابـەکیان لـەنێو ئەوپـەڕی پـارێزراویدا وەکـو راسـتینەیەکی خوداوەنـدی نیشـاندەدرێن و بەسـەر هـزردا زاڵ دەکرێن، بەواتایـەك لـەواتاکان مێژوو وەکو پێشکەوتنێك بـە شێوەی هەقایـەت و سـەربردەی وەرچەرخانی ئـەم خەڵەتاندن و پیلانگێڕییە یەکەمین و مـەزنترین شـێوەگرتنە بـەگوێرەی هەلومـەرجی دیاریکراو و جێگـیربوونی ئـەو و بڵاوبوونـەوەی لـەنێو هـەموو کۆمـەڵگاکاندا. هەڵبەتە وەکو مێژووی باڵادەستی و چەوسێنەران شێوە دەگرێت.

لەم چوارچێوەیەدا هەڵسەنگاندنی پەرستگای سۆمەر وەکو یەکەمین بڕیارگەی پیلانگێڕی، واقیعبینانەیە. لـەم رووەوە دەربڕینی میتۆلۆژیانـەی خوداوەندەکـان و بـەندەکان یـەکێك لـەو بابەتانەیـە کـە پێویستی هـەرە زۆری بـە لێتوێژینـەوە و شـیکردنەوە هەیـە. بەتایبـەتی شیکرنەوەی ئـەنکی وەکـو کـارگێڕ (کۆردیناسـیۆنی) و ئاقڵمـەندی خوداوەندەکـان ئـەزموون بەخشە. وەك بڵێی ئەنکی پسپۆڕی بەتام و چێژی پیلانگێڕییـەکان بێـت. یـەکێك لەگرنگترین بەشەکانی ئەو پیلانگێڕییەی لە پەرستگادا پێکدێت خستنی رەگەزی ژنـە. سـەرنج راکێشـترین تێگەیاندنـەکان سـەبارەت بـە پێشـکەوتنی تێکەڵکێشـی جودایـی چینایـەتی ـ رەگەزایـەتی، تایبەتمەندییەکی گرنگی میتۆلۆژیـای سۆمەرە. ئـەم تایبەتمەندییـە میتۆلۆژییـە سـەبارەت بـە ئافراندنی یەکەم کۆمەڵگای چینایەتی لەلایـەن ئەوانـەوە و بـەرێگای خستنی ژن وەکـو رەگـەز، ئەو هەڵسەنگاندنانە دەسەلێنێ کە ژن رووبەڕووی کۆنـترین جیابوونـەوەی چینایـەتی بۆتـەوە. پێکهاتـەی کۆیلایـەتی رەگـەزی و چینایـەتی لـە قۆنـاخی دوو هـەزار سـاڵەی باڵادەسـتیدا وەکـو ئاوێنـە لـەمیتۆلۆژیادا رەنـگ دەداتـەوە. لەبەرئـەوەی کـە هـەوڵدان بـۆ خستنی ژن لەسـەرەتای خۆیدایە، رادەی هێزی کۆنی ئەویش بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ دەرکـی پێدەکرێت. هەوڵەکانی خەڵەتاندن لەبەرامبـەر ژن، لـەمیتۆلۆژیادا بـەرادەی هـەرە زۆر لەشـەڕ و تەبایـیـەکانی نێـوان خوداوەنـد ئـەنکی و خوداوەنـدە ژنـی چیـا نینهورسـاك، پاشـانیش شـێوەی هـاڵیکراو و وەرچەرخاوی ئـەو، واتـە ئینانا، دەبینـرێت. وەك بڵێی خوداوەنـدە ژنـی قۆنـاخی نیۆلیتیـك هەنگاو بە هەنگاو لەلایەن کۆمەڵگای باڵادەستی پیـاو کـە ئـەنکی سـەمبۆلیزەی کـردووە، قووت دەدرێ. بەڵام تێکۆشانی ئینانـاش کە بەسانایی خۆ بەدەستەوە نادات و تـەواو و ئاقڵمەندانەیـە، سەرسووڕهێنەرە.

لەکۆتاییدا بەشێوەیەکی گشتی پێکهاتنی کۆیلایـەتی مـرۆڤ و کۆیلایـەتی ژن وەکـو خـاڵی سـەرەتا لـە کۆمـەڵگای سـۆمەردا، لـە پەرسـتگای راهیبـەکان و کۆشـکی پادشـاکاندا وەکـو بنچینـەییترین دۆزراوەی مێـژووی شارسـتانییەت سـەرکەوتن بەدەست دەهێنێت. وەکـو بڵێـی

خستنی زاییندیانەی ژن و پاشان خودەکەیشی تێری نەکردبێت، ئەم جارەیان لەبەردەوامی سیستەمدا کاتی ئەوە دێت وەکو یەکێك لە بنچینەییترین ئامرازەکانی خستن بەکاربهێنرێت. ئەو کچانەی بەرێگای هەڵبژاردن و پەروەردەکردنەوە دەناخنرانە نێو پەرستگاکانەوە، وەکو بەکاریگەرترین ئامراز بۆ ڕاوکردنی پیاوانی سیستەم ڕۆڵ دەبینن. بەمجۆرە کۆمەڵگا هەم دەکەوێتە ژێر بەڕێوەبەرایەتی پەرستگاوە، هەم لەلایەن کەوتووەکانەوە دەخرێت. گڵاوترین پیلانگێڕی بۆ یەکەمجار بەم جەشنە ڕێکدەخرێت. بۆ یەکەمجار لەپەرستگادا *سەگبازی* دوو ڕەگەز هێزێکی مەزن بە سیستەم دەبەخشێت. پاشان ئەم سیستەمە لە پەرستگاوە بۆ یەکەمین ماڵی گشتی دەگوازرێتەوە. لەمێژوودا دەبینین یەکەمین ماڵی گشتی وەکو ناوەندی کولتوور و باوەڕی لە شاری شکۆداری نیپوور دامەزرا. ئیدی ماڵی گشتی ناسراو بە موسالقەتیم ڕۆڵی زەلکاوێك دەبینێ سەرجەم کۆمەڵگای پیسکردووە. کۆمەڵگا بە ڕەگەزی کەوتوو و چینی کۆیلەوە بێ ئەوەی توانای ڕزگاربوونی لەم زەلکاوە هەبێت لە پەلەقاژەدایە. ئەوەتا ئەو تەڵەزگەیەی کە شاعیر دەڵێت "هەرگیز سەرم لە بەلا ڕزگاری نابێت"، لەگەوهەری خۆیدا سەرنج ڕاکێشترین گوزارشتی خۆی لەم کەوتنەدا دەبینێتەوە. تۆڵە لە خوداوەندە ژن و مرۆڤی سروشت و ئازاد وەرگیراوە. لەکاتێکدا ئەربابەکانی کۆمەڵگای پیاوسالاری بە پلەی خوداوەندی دەگەن، بەندەکانیش سەرەتا لە پەرستگادا و دواتریش لە سۆزانیخانەکاندا، تا ئەو ڕادەیە نغرۆی زەلکاو دەکرێن کە هەرگیز سەریان لە بەلا ڕزگاری نەبێت. لەڕاستیدا مێژووی شارستانییەت وەکو پێشکەوتنی ئەم دوو دامەزراوە بەردەوام دەکات. لەکاتێکدا پەرستگای گاهینی بۆ دامەزراوەی وەکو حەورا، کڵێسە، مزگەوت وەردەچەرخێ؛ ئەوا سۆزانیخانە لەرێگای جیابوونەوەی لەجۆری ماڵی تایبەت، ماڵی گشتی، ماڵی خانەدان، ماڵی لادێ، ماڵی شاری، درێژە بەخۆی دەدات.

کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی و سەرمایەداری منداڵی کۆمەڵگای سۆمەرن، بۆهێڵی (جینەتی) سەرەکییان لەوێ وەرگرتووە. شێوە پوختەکانی پیلانگێڕی پەرستگا و کۆشك، وەك سەرچاوە و بنەچە لە کۆمەڵگای سۆمەردا پێکهاتوون. بەخۆڕایی نەمانگووت گرنگترین داهێنانی مێژووییانە.

چەند بەنێشە کە دەبینرێت یەکەم پەیڕەوکردنی پیلانگێڕی سۆمەری لەبەرامبەر دەرەوەش لەدژی گروپە ئەتنیکیە کوردەکانە کە لەوێوە هاتوون و بۆ یەکەمجار بەزمانی سۆمەری وەکو کورتی (کور = چیا، لەگەڵ پاشگری: تی، دەبێتە چیاییەکان) ناودێریان کردووە. لە داستانی گلگامێشدا کە یەکەم داستانی نوسراوەی مرۆڤایەتیە، دیتنی ئەم بابەتە زۆر سەیر و سەرنج ڕاکێشە. خودی گلگامێش پادشای فارەمانی ئورگ کە لە یەکەمین دەوڵەتە شارەکانە. پێداویستی ئەو سەرەتا بە کەرەستەی دارستان و کانزا و بەرد، گلگامێش بەرەو سەفەری دارستان هاندەدات، بۆ ئەمەش پێویستی بە یارمەتیدەرێك هەیە کە بەباشی دارستان بناسێ.

بۆ ئەم مەبەستە ئەنکیدۆ وەك رێنیشاندەر و بەکرێگیراو، لەچیا، لە دارستان دەدۆزێتەوە و راوی دەکات. هەروەها سۆزانیەکانی پەرستگاش بۆ ئەمە بەکاردێنێ. بەشێکی گرنگی داستانەکە گرێدراوە بەم بابەتەوە: خستنی بەکرێگیراو لە رێگای زایەندی ژنەوە. کچە باش پەروەردەکراوەکانی پەرستگا تا دوارادە لەم کارەدا بەکاریگەرن. لەماوەیەکی کورتدا ئەنکیدۆ لە شاخ دادەبەزێنن و فێری شاری دەکەن. جارێکی دیکەش ئەنکیدۆکان سەریان لە بەلاّ رزگاری نابێت. ئیدی کلیلی کردنەوەی ولاّتی دارستان دەستکەوتووە. کەوی نێچیرکراو لەشاخ خزاوەتە قەفەسێکەوە، بۆ راوکردنی کەوەکانی دیکە بەکاردەهێنرێ.

گلگامێش لە سەفەرە بەناوبانگەکانی بۆ شاخ لە چوونی بەرەو زنجیرە چیای زاگرۆس وەك نزیکترین چیا، ئەنکیدۆش لەگەلّ خۆیدا دەبات. لە رەوتی داستانەکەدا تا دوارادە بەباشی دەرك بەوە دەکرێت کە ئەنکیدۆ نوێنەرایەتی یەکەم کوردی بەکرێگیراو دەکات. ئەنکیدۆ، گلگامێش دەباتە سەر خاوەنەکانی ولاّتی چیای دارستان، قەومی خۆی راو دەکات. لە راستیدا ئەوەی یەکەمجار چاویان پێیکەوت، بە پاسەوانی دارستان ناویان بردووە و وەك درندە نیشانیانداوە، واتە خەمبابا، سەرۆك عەشیرەتە. نیشتمانەکەی دەپارێزێت. بەلاّم لەبەرامبەر گلگامێشی خاوەن چەك و تفاقی رێکخراو و بەکاریگەر، لەشکست رزگاری نابێت. بەمجۆرە یەکەم جەنگاوەری ئازادی کورد کە نێوی لە مێژوودا دێت، بەدیل دەگیرێت. گلگامێش خوازیارە خەمباباش بکاتە بەکرێگیراو. بەلاّم ئەنکیدۆ کە خواستوویەتی بالاّدەستی خۆی لەدەست نەدات یاخود لەترسی ئەوەی جێگاکەی بگرێتەوە، بۆئەوەی ئالتەرناتیفی نەبێت گلگامێش بە کوشتنی ئەو رازی دەکات. گلگامێش بە کوشتنی خومبابا قۆناخی خوێناوی دەستپێدەکات. لەراستیدا داستانەکە پەیوەندی و ناکۆکییەکی دیالەکتیکی درێژخایەنی بەمجۆرە لەخۆوە دەگرێت. چیا ــ دەشت ــ عەشیرەت ــ شار ــ پادشا ــ یاخی ــ نیشتمانپەروەر ــ بەکرێگیراو و مۆتیفەکانی هاوشێوەی ئەمانە ئەو چیرۆکانە دەکەن بە داستان کە ئەوە بە ئەوە هاتووە. ئەوەی سەبارەت بە بابەتەکەمان گرنگە، ئەوەیە کە لەیەکەم داستانی تۆمارکراوی مرۆڤایەتیدا هەقایەتی بەفێلی کورە بە سەرداپۆشراوی تێپەردەبێت و مێژووی کوردان بە پیلانگێری دەستپێدەکات. ولاّتەکەیان کە تاوەکو بەکرێگیراوێکی کەوتووی ناوخۆ نەبێت هەرگیز کەس ناتوانێ بێتە ناویەوە، ئەوا لە رێگای رێنیشاندەری ئەو خائینانەی کە زۆربەیان بە زایەندی ژنەوە لەکۆمەڵگای شاردا خستراون، دەکەوێتە دەستەوە. لەو رۆژەوە تا رۆژگاری ئەمڕۆمان ئەم مێژووە چڕ دەبێتەوە و پەرە دەسێنێت و بەردەوام دەکات. ئەوەی دەرخەت دەرژێنێ و دەخات بە ئەرزا ئەو کرمانەیە کە لەنێو دارەکەدا نەشونمایان کردووە. لە خاڵە بەرچاوەکانی پێچدانەوەی مێژوودا هەمیشە ئەم شێوانەمان بەرچاو دەکەوێ. ئەوەی لەکەوتنی دەوڵەتی هۆری ــ میتانیدا رۆڵ دەگێرێت شازادە ماتیزاوا ی بەکرێگیراوە. لە کەوتنی خانەدانی ماد دا کۆرشی پارسی خوارزایان رۆڵی سەرەکی دەگێرێت.

لە تەواوی ئەو رووداوانەی شوێنپەنجەی خۆیان لەمێژوودا بەجێهێشتووە، پیلانگێڕییەکان بەردەوامن و دەردەکەون. دیسان خستنی شاری تروادەش لەڕێگای پیلانگێڕییە، کە لەڕێگای ئەنادۆڵەوە رۆڵێکی سەرەکی بینیوە لە گواستنەوەی بەهاکانی شارستانییەت بۆ کیشوەری ئەوروپا. هیکتۆر ی قارەمان پارێزگاری لە تروادە دەکات. بەهیچ جۆرێك ناتوانن ئەم شارە بخەن. لە داستانی ئیلیادەی هۆمەرۆس ئەم ساتە لەنێو تەواوی تابلۆ پڕ لەنێشەکانی دەگێڕێتەوە. خوداوەندی چینی سەردەستی تازە هەڵکشاوی هێلینیەکان بابا زێوس و ئەسینای کە لەنێو چاوانی خۆی خولقاندی، ئەومیان بە ئەقڵدا دێت کە تەنیا لە رێگای پیلانگێڕی دەتوانن ئەم کارە چارەسەر بکەن. ئەسینا دەکەوێتە کەوڵی دیفۆبۆ ی برای هیکتۆر و متمانەی سەرکەوتنی پێدەدات لە شەڕی بەرامبەر ئاخیلیۆس و بەم چەشنە لە شوێن و کاتی جەوتدا هیکتۆر هانی شەڕ دەدات. هیکتۆر دەکوژرێ و تروادە دەخرێت. دەروازەی ئەنادۆڵ بۆ هێلینیەکان لەسەر پشت دەکرێتەوە. قۆناخی سێ هەزار ساڵەی باڵادەستی کولتووری هێلینی دەستپێدەکات. لە باڵادەستی رۆژئاوا بەسەر رۆژهەڵات و هەروەها ئەوروپا بەسەر ئاسیاشدا، دیسان ئەو پیلانگێڕیانەی پشت بە بەکارهێنانی زایەندی ژن دەبەستن، رۆڵی گرنگ دەبینن. زمانی میتۆلۆژیا راستیەکان وەك خۆی ناگێڕێتەوە، بەڵام یەکێك لە سەرچاوە گرنگە مێژووییەکانە گوزارشت لەوقۆناخە دەکات کە بەربڵاون و هەروەکو بڵێی بووە بە دیاردەیەك. لەم واتایەدا ئەم گووتەیە زۆر بەجێیە کە دەڵێ لەبن هەر ئەفسانەیەکدا راستییەك هەیە.

بەناوبانگترین و ناسراوترین پیلانگێڕی سەردەمی کلاسیك کوشتنی جولیۆس قەیسەرە. بەشێکی زۆری ئەوانەی رۆڵیان تێدا بینیوە دەورووبەرە نزیکەکەیەتی. گوایە رۆمایان لە دیکتاتۆریەتی قەیسەر رزگار دەکرد. گێڕانی بە ئێشترین رۆڵی پیلانگێڕییەکە لەلایەن برۆتۆس ی خوارزای، جارێکی دیکە رێسایەکی ئەم مەسەلەیەمان لەبەرامبەر قیت دەکاتەوە. تاوەکو هەندێ کەسی زۆر نزیك بە کەسایەتیەك، پارتییەك و گەلێك نەخرێنە دەست، وا بەسانایی پیلانگێڕییەکان بەسەرکەوتن ناگات. پیلانگێڕی دژ بە قەیسەر دواتر بەشێوەی زنجیرەیەك بەسەر زۆر لەئیمپراتۆر و پادشا دێت. دەسەڵات و پیلانگێڕی زۆر گرێدراوی یەکترن. لانی کەم هێندەی شەڕ لە مەسەلەی دەسەڵاتدا رۆڵ دەبینێ.

هێنانەوەی دوانموونە، گرێدراو بە مێژووی ئیسرائیل و عیبرانیەکان، ئەزموون بەخش دەبێت. لە ئینجیل دا هاتووە: تیرە عیبرانیەکان کاتێك قۆناخی دوای موسا هەوڵیانداوە شارەکانی ئەمرۆی فەلەستین ــ ئیسرائیل بخەن، لەناو شاردا رەهاب ی سۆزانی بەکاردێنن؛ هەروەها رۆڵەکانی ئیسرائیل خۆیان بە سیخوڕ و قەومی بژاردەی خوداوەند پاهۆڤا دەبینن. لای ئیسرائیلیەکان سیخوڕی پیشەیەکە لەلایەن خوداوەندەوە پێیان بەخشراوە. هەربۆیە لە سەرتاسەری دونیا لەبواری سیخوڕی بەهێزن. هەروەکو دەزانرێ ئەوەی عیسا دەداتە دەست یەهودا ئیسکاریۆتە کە دوانزدەمین حەوارییە و گرێدراوی سەرۆکی کاهینانە. تەواوی مێژوو

نووسەکان لەسەر ئەوە هاوبیرن کە ئەگەر عیسا دەستگیر نەکرابووایە و لە خاچ نەدرابووایە، ئایینێك بەناوی مەسیحیەت نەدەهاتە ئاراوە. زۆر بەوەگەمەن نموونەیەکی پیلانگێڕی هاوشێوەی دەستگیرکردنی عیسا دەبینرێت بەپێچەوانەی داخوازیەکانی پیلانگێڕەکە ڕۆڵ لە پێشکەوتنێکی مێژوویدا ببینێت.

پێویستە بە شێوەیەکی بەرجەستە دەرك بە پەیوەندی ئەم دیاردە نەفرەتلێکراوەی کۆمەڵگای چینایەتی چەرخی یەکەم بکرێت لەگەڵ چەوساندنەوە و دەسەڵات. پیلانگێڕی لە نیاز خراپی یاخود خۆش نەویستنی خوداوەندەکان بۆ مرۆڤەکان سەرچاوە ناگرێت. کەمەیەکی مرۆڤە بەدڕەوشتەکانیش نییە. میکانیزمێکی دەسەڵاتە کە بەرادەی نینۆك و گۆشت پەیوەستی پێکهاتەی کۆمەڵگای چەوسانەوەیە. ئەوەی گرنگە ڕووی شاراوەی دەسەڵاتە نەك ڕووخسارە بەرچاوەکەی. دەسەڵاتی ڕاستی لەم ڕووە ڕۆڵ دەبینێ کە لە گەل و کۆمەڵگا شاراوەیە. زۆربەی جارانیش ناوی ئەم گەمەیە پیلانگێڕییە.

لە دیاردەی کۆمەڵگای کوردەواریدا وەکو تایبەتمەندییەك ڕۆڵی کرمی دار دەبینێ کە هەر لە چەرخە سەرەتاییەکانەوە ڕیشەی خۆی بەقووڵی داکوتاوە. کرمەکان زۆرن و بۆ ئەوەی بژین ناچار لە هەرلایەکەوە ئەو دارە بخۆن و بجوون کە خودی هەبوونی کۆمەڵگایە. لە خۆڕایی نییە تراژیدیای کورد و هەروەها داستانە بەنێشەکانی کە گوزارشتێکی فۆلکلۆری ئەم تراژیدیایە یە، هەمیشە ئەم جەشنە خیانەت و لاوازییانە باس دەکات. چونکە کرمەکانی ناو داری ئازادی کۆمەڵگا دەخۆن. ئەمەش بەوتای گوزمرانی ژیانێکی پڕ لەئێشی بەردەوام دێت. داستانەکەی، ئاوازەکەی هاواری ئەوە دەکات.

لە هەلومەرجی چەرخی ناویندا پیلانگێڕی هارتر دەبێت. توانائکاریەکانی چەوساندنەوە کە لە گەشەسەندندان و هەروەها ناوەندەکانی دەسەڵات کە پەرە دەسەنن هونەر و پسپۆڕی پیلانگێڕیش پێشدەخەن.

ب ـ چەرخی ناوین و پیلانگێڕی پەردەپۆشکراو بە ئایین

رەخنەنەکردنی ئایین وەکو شێوەیەکی هزر، کەموکوڕیەکی مەزنە بۆ جیهانی ئیسلامی. چەندە نکوڵیکردن لە ئایین ڕاستی بەلاوە دەنێ، ئەوا بەو ئەندازەیەش پابەندبوونێکی مونمیانە ئایین لە جیهانی ڕاستیەکان دادەبڕێنێ. چۆنیەتی نزیکبوونەوە لە ئایینی ئیسلام ڕۆڵێکی مەزنی لە پێشنەکەوتنی هزری زانستیانە لە ڕۆژهەڵاتی ناویندا هەیە. ئایین، بریتییە لە شێوەی وەرچەرخێنراوی میتۆلۆژیای چەرخەکانی یەکەم و وەکو ڕێساکانی باوەڕی وشك پێشکەشکراوە؛ کۆی ئەو هزرە گشتییانەیە کە کۆمەڵگا پەرەسەندووەکە دەرهەق بە سروشت و ڕاستینەی خۆی پێیگەیشتووە. ئەو باوەڕی و خەیاڵانە پێکدێنێت کە دەرهەقی ڕابردوو، ئەمڕۆ و ئایندەیە. لەگەڵ دەرکەوتنی کۆمەڵگای چینایەتی، بەرادەی هەرە زێدە دیاردەکانی دەسەڵات،

دەوڵەت و پادشایەتی لە هێزی ئایینی تاکخودایی گوزارشتی لێکراوە و ڕەنگی داوەتەوە. کاتێک ئەم دەزگا و دامەزراوانە خواستوویانە خۆیان بەسەر زەهندا زاڵ بکەن و بسەپێنن، سەرەتا لە ڕێگای میتۆلۆژیا، کاتێک ئەمە تێری نەکرد، هەوڵیانداوە لە ڕێگای ئایینی تاکخودایی ئەم پێویستییە جێبەجێ بکەن. لەم ڕەوشانەدا لە ڕەنگدانەوەی هێزەکانی سروشت زیاتر، خوداوەندەکان، ڕەنگدانەوەی هێزەکانی کۆمەڵگا پێک دێنن. هێزی مەعنەوی پادشاو چینی بەڕێوەبەر سەمبۆلیزە دەکات کە فەرمان دەدەن. لە پێناسەی گشتی کۆمەڵگاوە بەرەو پێناسەکردنی پادشا و چینی بەڕێوەبەر ڕێگا لە پێش خزانی واتا دەکەنەوە. خودی خودا بەشێوەیەکی کاریگەر گەورەترین پارسەتێنەری چینی بەڕێوەبەر و دەسەڵاتە تاکڕەوێتیەکەیەتی کە ئەویش سوڵتانە. خاسیەت و تایبەتمەندێتیە چینایەتی و سیاسیەکانی لە زیادبووندایە تۆکمەتری دەکات. هەرچی خودایە کە پێناسەیەکی گشتی سروشت و گەردوون و کۆمەڵگایە، گرێدراو بە هەبوونی هێزی فەلسەفی و زانستی، لە میانەی ڕاستیە تیۆرییەکان بەرەو یەکبوون دەچێت.

بۆیەوە ئەم جیاوازییە دەکەین: چەرخی ئاوین کە چەرخی پیلانگێڕییەکانە، بانگەشەی ئەوە دەکات تەواوی تاوان و لەیستۆکەکانی دەسەڵات و تەفانەت چەوساندنەوە رووت و ئاشکراکەشی بەناوی خوداوەند ئەنجامداوە. دەمامکی ئایینی و خوداوەند دەکرێتە بەهانەی چەوسانەوە و فشارەکانی سەر کۆمەڵگا. هەموو شتێک لە پێناو خودا و ئایینە. ئەگەر بێتو ناوەڕۆکی ئەم دوو زاراوەیە بکرێتەوە دەبینرێ کە هەموو جۆرە فشارێک، دەسەڵاتە چەوساندنەوە و خەڵەتاندنی لەناودا شاراوەیە. ئایین کە وەکو شێوەیەکی نوێی ئایدیۆلۆژیا پێکهاتووە، لە میتۆلۆژییەکانی چەرخەکانی یەکەم زیاتر ڕۆڵێکی مەترسیدارتر و بەندکردن دەبینێ. ئەو ئەرماییەی لە میتۆلۆژیادا هەیە، لە ئارادا نامێنێ. باوەڕیەکی ڕەها بەرێساکانی ئایین و قاڵبەکانی باوەڕی مەرجە. بەمجۆرە ئەو پاشماوەی ئازادیش لە ئارادا ناهێڵرێ کە لە مرۆڤدا مابوو. مرۆڤ دەکەوێتە ژێر فشاری سزا توند و دژوارە پیادە کراوەکان. پاکتاوکردنی مرۆڤی ئازاد گرنگترین چالاکی مێژوویی چەرخی ئاوینە کە لەرێگای ئایین تێیدا سەرکەوت. نابێ ڕۆڵی ڕۆشنگەری و پێشکەوتووخوازی ئایینی نوێ لە پاکتاوکردنی شێوە کۆنەکانی ئایین نکۆڵی لێبکرێت. بەڵام نەبینینی ئەو تاریکاییەی لەگەڵ خۆیدا هێناو ڕێگای لە پێش کردەوە، بەواتای بێ ڕێزی و نکوڵیکردن لە مرۆڤی ئازاد دێت.

بەتایبەتیش لەو قۆناخەی پاشەڕۆ بووە، دۆگمای ئایینی بە تەواوی سیستەمێکی پیلانگێڕی لەسەر کۆمەڵگا پێشدەخات. ئەم قۆناخەی لەگەڵ خانەدانەکانی موعاویە و عەباسی دەستپێیکرد، گەلێک عیبرەت بەخشە. کاتێک موعاویە بەخۆی بەرەو ژێرکەوتن ئاراستەی گرت، قورئان بەسەری ڕم گرێدەدات و شەڕ دەوەستێنێ. بەڵام دوایی دەبێتە بکوژێکی بێبەزەییانەی سەرجەم ئەندامانی ئەهلی بەیت . لەوانەیە لەمێژووی هیچ ئایینێکدا هێندەی

ئیسلامیەت پیلانگێڕی تێدا نەبێ، لە چوار خەلیفە سێیانیان بە پیلانگێڕی کوژران. ئەوەی مەسەر دوانزە ئیمامدا هاتووە زۆربەی پیلانگێڕییە.هەروەها ئیسلام ڕێسای ئەمەشی دیارکردووە. وەکو زاراوە تەقیەگەرایی خودی پیلانگێڕییە. لە ڕێگای پەیڕەوکردنی ئەم پرەنسیپە تاوانی بێ سنوور ئەنجامدراوە.

ئەمە ڕووداوێکە پەیوەستی گەوهەری ئایدیۆلۆژیای ئایینە. دوای ئەوەی ئەوانەی دەرەوەی خۆی بە کافر زادەگەیەنێ و مرۆڤەکانی دووچاری جیابوونەوەیەکی دژواری بەمەرەنگە کرد، ئەوا تەواوی ڕێگا و ڕێچکەکانی پاکتاوکردنی ئەمانە، لەژێر ناوی خودا وەکو شکۆمەندی و گەورەترین سەروەری پێشکەش دەکات. ئەوکاتە سەرتاسەری چەرخی ناوین پڕ لە ئاغاکانی شەڕ دەبێت. خودا (ئەڵڵا) ی چەرخی ناوین وەکو هەبوونێکی تاک و تەنیا، هیچ هاوبەشێتییەك (شەریك) بۆخۆی پەسند ناکات. لەڕاستیدا ئاراستەگرتنی بەرەو پادشایەتی ڕەها (موتڵەق) ئەمارادایە. هەبوون و تاقانەیی خودا، لەڕاستیدا جگە لە سەمبۆلیزەکردنی ئیرادەی پادشا (خەلیفە) وەکو بالاترین بوونەوەر و یەکێتی، نرخێکی دیکەی کرداری نییە. تاکانەیی دەسەڵاتی پادشا، پێویستی بە یەکبوونێکی مسۆگەری خودا (ئەڵڵا) هەیە. دوای ئەوەی بەمجۆرە سەڵتەنەت هێزی بەدەستهێنا، مرۆڤێك ناهێڵێت کە نەخرابێت. تەنیا مرۆڤ دەتوانێ لە تەکیەی جیاکان و تەریقەتە سۆفیگەراییەکان یاخود یاخیبوونە ئاشکراکان هەوڵی پاراستنی ئازادی خۆیان بدەن. ئیتر بوون بە بەندەی خودا بەگرنگترین سەروەری لەقەڵەم دەدرێت. هەروەکو بڵێی بۆڕی هەناسەی خوداوەندە ژنی دایك براوە.

بەگوێرەی تێڕوانینی خوداوەندی چەرخی ناوین ژن بووونەوەرێکی ناتەواوە. بۆ پاشکۆ و ئەندامێکی زۆر بێکاریگەری پیاو داخراوەتە نزمترین ئاست. کۆیلایەتی ڕەگەزی گەیشتۆتە بێ وەقاترین شێوەکانی خۆی. بەشێوەیەکی بێ سنوور ژن دیاریەکە پێشکەش بە پیاو کراوە. لەجیاتی مرۆڤ، وەکو موڵکێك هێندەی بخوازرێت دەگۆڕدرێت، دەفرۆشرێ، بەکاردەهێنرێ. تەواوی ئایینەکانی دیکەی چەرخی ناوین لەگەڵ یەکتر لەنێو پێشبڕکێ دان بۆئەوەی ئەم پیلانگێڕییە لەسەر مرۆڤایەتی پەیڕەو بکەن. بە ڕەوشێکی وەها گەیشتوون کە دەڵێن: خۆزگە و هەزار ڕەحمەت لەچەرخی یەکەم. لە مەسیحیەتدا ئەنکیزاسیۆن، لە ئیسلامیشدا داخستنی دەرگای ئیجتهاد (اجتهاد)، بەرفراوانترین تیرۆرە لەسەر پێکهاتەی زهنی مرۆڤ. لەلایەکی دیکە پیلانگێڕی کۆشك لە گەشەدارترین سەردەمی خۆی دابوو. باوەڕی پەرستگا لە کۆشکەکان لە ڕێگای پیلانگێڕییەوە ئەنجامگیر دەبێت. هەردووکیان یەکتری دەخولقێنن و دێننە ئاراوە.

بەئەندازەی ئەوەی بالادەستی پشتبەستوو بە ئایین لەکۆمەڵگای چەرخی ناوین پەرەدەسێنێ، نامۆبوونی گەلان سەبارەت بە ناسنامەی ئازادی خۆیان زیاد دەکات. پەرەسەندنی بالادەستان لەرووی چەندایەتی و چۆنایەتی، یەکبوونیان لەگەڵ ئایدیۆلۆژیای ئایینی نوێ، گەل ناچار دەکات بەتەنیا لەمیانەی هەبوونی ئەتنیکی و کولتووری نوێ بژیت. چینە

باڵادەستەکانی خۆیان وەکو هەڵگرانی ناسنامەی خودایی کە گەل دەرکی پێناکات، رۆڵێکی خەڵەتاندن دەبینن. بە ناسنامەی ئایدیۆلۆژی نوێ چەوسانەوە و دەسەڵات لەسەر رێڕەوی خۆی بەجێدەکەن، بەقووڵایی و فراوانیش بڵاوی دەکەنەوە. کاردانەوەی گەل بەشێوەی تێکدانی ئایین و مەزهەبە باتینییەکانە.بەرامبەر ئەو پیلانەی دووچاری هاتووە، بەردەوام گەل لەژێر ناوی تەریقەت بەدوای رێگای نوێدا دەگەڕێت. هەڵبەتە تەریقەت بەواتای رێگا دێت، ناوی ئەو پێهەڵگرتنانەیە کە بەردەوام بوون. ئەو گۆڕەی لەچەرخی ناوینیدا سەری کوردانی پێ داخرا بەشێوەی پەردە و دەمامکی ئایینی یە. ئەو بەکرێگیراوێتییەی لەچەرخی یەکەم ماوەتەوە، بەخێرایی لەگەڵ ئایینی نوێ دەبێتەیەك و نامۆبوونی خۆی قووڵتر دەکاتەوە. رۆڵی باشترین گروپ و توێژی پادشاکان دەبینن. هەرچی گەلە لە رێگای ئەو ژمارە زۆرەی مەزهەب و تەریقەتەکان بەرخودانی خۆی دەکات. لەمیانەی ئەو دیوارانەی لە چواردەورەی شارستانییەتی رۆژهەڵاتی ناوینی بەرزکردۆتەوە دەکەوێتە نێو ژیانی بەندیخانەیەکی ئاسایی.

تەواوی ئەو کارانەی باڵادەستەکان ئەنجامی دەدەن کە هەوڵدەدات لەنێو شا و سوڵتانەکان جێگایەك بەدەست بێنن، بەناواخنکردنی خیانەتە. زەمینە بۆ پیلانگێڕی ئامادە دەکەن. باڵادەستەکان کە لەمێژەوە یەکێتی زیندوویی گەل لەبیر دەکەن، لەئەنجامی پێکدادانی ئایینی و ئەتنیکی نەزۆك، ژیان دەخەنە نێو رەوشێك کە بریتییە لە تووش هاتنی پیلانگێڕی، هەڵکەندنی بیر بۆ یەکدی لە سەرووترین واتە لە بنەماڵەی سوڵتانەوە تا ژێرین، واتە خوڵام و لادێییەکان پەیڕەو دەکرێت، ئەنجامێکی سروشتی ئەخلاقی دەرەبەگایەتی بەمێژگابوونی خیانەتە.

ئەو نامۆبوونەی تەواوی گەلانی رۆژهەڵاتی ناوین لە چەرخی ناوینیدا دووچاری هاتن، پابەندی ئەو وەرچەرخانەیە کە لە ئامرازە ئایدیۆلۆژییە پاشەڕۆکانی کولتووری راهیبی سۆمەر روویداوە. شێوەی فەرمی سوننیگەرایی ئایین کە سێیەمین شێوەی وەرگیراوی ئەم کولتوورەیە، لەنێو بازنەیەکدا گەلانی لەنێو رەوشێکدا بەجێهێشتووە کە لەهەموو ئاستێکدا لەگەڵ خۆیان لەنێو شەڕدا بن. ئەوانەی لەم رەوشە سوودمەندن، دەستەیەکی سنووردای دەوروبەری کۆشك و ئاغاکانی شەڕن کە هیچ پرەنسیپێکیان نییە و بەکرێگیراون.

گەلی کورد مەحکومی ئەوە کراوە کە بەشێوەیەکی قووڵ و گەمارۆدراو لەهەر چوار لاوە لەنێو ئەم دیاردەیەدا بژیت، خراوەتە رەوشی گەلێك کە لەنێو ئارانادا ( ئارانا، ئەو مەیدانەیە کە لە سەردەمی کۆیلایەتییدا مرۆڤیان دەرخواردی شێر دەدا ـــ و) بێت. هەروەکو چۆن یەکەمین مەسیحییەکانی فرێدرانە ناو ئاراناکان لەلایەن شێرەوە پارچە پارچە دەکران، راستینەی گەلی کوردیش لە چەرخی ناوینیدا بەمەرجێکیە، لەسەرەتاوە تاوەکو کۆتایی لەژێر دەستەی بەکرێگیراوەکانی کۆشك و ئاغاکانی شەڕ پارچە پارچە کراون. تەنانەت ئەوەی لە ئەفسانەی کاوەی ئاسنگەریش باسی لێوە دەکرێت کە زوحاك رۆژانە سەری دوو لاوی کورد

دەبڕێ و مێشکیان دەخوات و بەمجۆرە دەتوانێ درێژە بە تەندروستی و ژیانی خۆی بدات، لەگەڵ گەوهەری خۆیدا ئاماژە بەو راستینەیەی گەل دەکات. لە راستیدا ئەو زوحاك و ئەمروودانەی ناوەرۆکەکەیان پڕکردۆتەوە، سەرباز و فەرمانبەرە کرداری و ئایدیۆلۆژییەکانیان، هەموو رۆژێك مێشکی گەل، واتە هزری ئازادی و هەبوونە کولتوورییەکەی، تواناکارییەکانی بەرهەمهێنانی لە چنگ دەردێنێ و دەیخوات و بەمجۆرە بەردەوامی بەژیانی خۆیان دەدەن. زوحاك یەکێك نییە کە لەمێژووی کۆندا تێپەڕ بووبێت. هەم ژمارەیان، هەم بەکرێگیراوەکانیان زیاد بوونە، ئەمانە نەك تەنیا مێشکی دوو گەنجمان دەخۆن، هەموو ساتێك مێشکی تەواوی لاوەکانمان و گەلەکەمان دەخۆن. لە رۆژگاری ئەمڕۆشماندا بە بەربلاوی و قاڵبۆوەوە بەشێوەی لاشەخۆر و قەلەڕەشەی برسی رووبەڕوومانن.

بەم چەشنە پێویستە میراسی پیلانگێڕی و چەواشەکردنی ئایدیۆلۆژی و کرداری و ئایینی فەرمی چەرخی ناوین، ئیسلامیەتی سونیگەرایی بۆ پیلانگێڕی سەرمایەداری پێناسە بکەین و کاریکاتۆرییەی بکەین، ئەمەش پێویستی رێزگرتنمانە بەرامبەر راستی.

### ج - نەتەوەپەرستی سەرمایەداری و فاشیزم گەشەکردووترین پیلانگێڕییە

نەتەوەپەرستی سەرمایەداری بە جولانەوەی عەلمانییەوە، رۆڵی ئایینی نوێ دەبینێ کە جێگای ئایدیۆلۆژیای ئایینی دەگرێتەوە. جیاوازی نێوانیان ئەوەیە کە نەتەوەپەرستی هەندێ زاراوەی زانستی نوێ بە بنەما دەگرێت. هەوڵدەدات سوود لەو پێدراوە زانستیانە وەربگرێت کە هەرە دوایی سەبارەت بە چەمکەکانی نەتەوە، دەوڵەت، کۆمەڵگا و بەڕێوەبەرایەتی دەرکەوتووە. لە شۆڤێنیزمی عەشیرەت و ئوممەت واتە لە شۆڤێنیزمی گروپی ئایینی هاوبەش جیاوازتر، جۆرێکی هاوچەرخی شۆڤێنیزمە کە پەیوەندییەکی پتەویان لەنێواندا هەیە. دەتوانرێ شۆڤێنیزم وەکو ئەو هەستەی پەرستن و واتایە پێناسە بکرێت کە کۆمەڵگاکان لەو رۆژەی خولقاون بەراستینەی خۆیان داوە و بەرامبەری نیشانیانداوە. لەقۆناخی کۆمۆنەی سەرەتایی تیرە بەرابیەکان خۆیان لەمیانەی ئەو سەمبۆلانە پێناسە دەکەن کە تەوتەم یان پێدەگووترێت، دواتر کاتێك کۆمەڵەکان پەرەدەسەنن بەردەوام گۆڕانکاری بەخۆیەوە دەبینێ و بە پێناسەی نوێ دەگات. کۆمەڵگای نیۆلیتیك، کۆمەڵگای دایکسالاری پێشکەوتووتر، رێگا لەپێش ئایینی خوداوەندە دایك دەکاتەوە. پەرستنێك پێشدەکەوێت کە دایك و ژن لەناوەندەکەی دایە. تایبەتمەندێتیەکانی مێینە لەناو کۆمەڵگادا زاڵ دەبێت. خوداوەندە ژنەکان دەبنە سەمبۆلی ئەم راستینەیە.

دیاردەی زاڵی کۆمەڵگای کۆیلەداری دەوڵەتە. دەوڵەت لە دەوروبەی ئەو پەرستگایە پێك دێت کە سەمبۆلەکانی دەوڵەت و پێناسەکانی واتاکان پێشدەخات، بەهۆی گرنگیەکەی بەردەوام شکۆدار دەکرێت. ئەو چینە دەسەڵاتدارەی لە دەوروبەری پێکدێت هەوڵدەدات ئەو خەیاڵە

کۆنەی بەدەستیهێناوە، جیاکاریە نوێیەکان سەمبۆلیزە بکات و وەکو ئاینێکی نوێی زاڵ بەسەر کۆمەڵگادا پێشکەشی بکات. میتۆلۆژی وەکو پەرسەندووترین گوزارشتی ئەم هەوڵانە رێکدەخرێت. کۆمەڵگای چینایەتی لەگەوهەری خۆیدا حەشارداوە و هەوڵدەدات چینی نوێی بالادەست و دەوڵەتەکەی، لەمیانەی ئەو زاراوانەی دەیکات بەهەموو شتێکی پیرۆز و هەرە سروشتی، بالای بکات.هەروەها پێرەوێکی دیکەی سەرەکی ئەم میتۆلۆژیانە ئەوەیە کە توێژە زەحمەتکێشەکانی کۆمەڵگا بۆ خزمەتکاری خوڵقێنراون، شایستەی هەموو سزایەکن و پێویستە بچووك و ئەزان ببینرێن. لەئەنجامدا ئایدیۆلۆژیای زاڵ بەشێوازی شۆڤێنیزم کە هەست و شێوە ئەو پەرگرییەکەی دەبێ وەکو ئایین بناسترێ، وەکو بالادەستێك بەسەر کۆمەڵگادا رۆڵی مەزنترین راستی پێدەدرێ. ئەم شۆڤێنیزمە میتۆلۆژییە هێز و هەستی تەواوی کۆمەڵگا داگیر دەکات. ئەم رەوشە هێزێکی بێ سنووری بەرێوەبەرایەتی بە چینی بالادەست دەبەخشێ. هەر بۆیە گرنگی پەرستگاکان زیاد دەبێت. یەکەمین کاری دەوڵەتی شار کە تازە ئاوادەکرێتە دروستکردنی پەرستگایەکی رێکوپێکە وەکو شوێنێکی پیرۆز، هیچ دەزگایەکی دیکەی گرنگ نییە کە وەکو پەرستگا بەرێوەبەرایەتی ئاسوودە بکات. زیندان، ماڵی گشتی و هونەریش گرنگە. بەلام هیچ کاتێك رۆڵەکانیان ناگاتە ئاستی رۆڵی پەرستگا.

ئوممەت کۆمەڵگای ئایینی چەرخی ناوینە: هاوتای چەمکی میللەتی رۆژگاری ئەمرۆمان دەبینرێ. کۆمەڵگای ئیسلامی، کۆمەڵگای مەسیحی و کۆمەڵگای موسەوی لەهەمانکاتدا میللەتەکانی ئیسلام، مەسیحی و یەهودی پێکدێنێ. ئوممەت پێکهاتەیەکی ئایدیۆلۆژییە. جگە لە یەهودییەکان یەکێنەی ئەتنیکی دیکەی موسەوی نییە. بەلام لەبەرئەوەی ئایینی چینی سەردەستە، جیاوازی ئەتنیکیش لەنێوانیاندا پێشدەکەوێت. دەمارگیری (التعصب) ئایینی شۆڤێنیزمی زمانی عەرەبییە. وەکو پێویستیەکی گەوهەرەکەی، لەتەواوی ئەو ئایدیۆلۆژیانەی رێزگرتن بەرامبەر بە زانست بەبناخە ناگرێت، بەتایبەتیش لەوانەی کارەکتەری ئایینیان هەیە، دەمارگیری زاڵە.ریشەکەیان بۆ بنەچەی نموونە رەسەنەکانی سۆمەر و میسر دەگەرێتەوە. بەلام هێندەی کۆمەڵگا و شوێن بگۆرێت، لەئەنجامی ئەو وەرچەرخانەی روویداوە رەوشێکی وەها دەردەکەوێت، هەروەکو بڵێی هیچ پەیوەندییەکیان لەگەڵ نموونە رەسەنەکە نییە.تەنانەت بۆ پەردەپۆشکردنی لایەنە لەیەکچووەکان نکوڵیکردن لە رەسەنەکە رێسایەکە. لە رەوشێکی پێچەوانەدا ئاستەم دەبێت خۆیان وەکو شتێکی نوێ و جیاواز بە دووروبەر بە پەسندکردن بدەن.

ئەو زەمینە مێژووییەی نەتەوەپەرستیش پشتی پێدەبەستێت هەمان شتە. بەهۆی ئەو بازارەی هەلومەرجی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری خوڵقاندوویەتی لایەنە جیاوازەکەی دەرکەوتنەپێشی راستینەی نەتەوەییە. لەجیاتی ئەوتەمی تیرە و هۆز و خێڵ، ئەوتەمی نەتەوە، واتە خوداوەندی نەتەوەپەرستی یاخود ئایینەکەی جێگای دەگرێتەوە. لە ئوممەتێکی

بەرفراوان تێپەڕی ئایینی نەتەوەیی و نەتەوەپەرستی دەبن. نەتەوەپەرستی بەواتای کلاسیکی ئایین نییە. بەڵام پەیوەندییەکانی نێوانیان زۆر ڕوون و ئاشکرایە. پێشکەوتنی هەلومەرجەکانی بەرهەمهێنان و گۆڕەپانە زانستیەکان، ئەوە دەکاتە پێویستیەك کە پێهەلگرتنی ئایینی نوێ ببێتە خاوەن ڕەنگی نەتەوەپەرستی.

هەروەکو هەموو دەرکەوتن و سەرهەڵدانی ئایینەکان لەقۆناخەکانی سەردەمی سەرهەڵدانیدا دەشێ نەتەوەپەرستیش ڕۆڵێکی پێشکەوتووخوازی ببینێ. ئەو گەلانەی لەسایەی پەنجەی گشتگیری ئوممەت ناسنامەی خۆیان لەدەست دا، کاتێك لەژێر کاریگەری نەتەوەپەرستی زیندووبوونەوەی کولتووریان بەخۆیانەوە بینی، ئاشکرایە کە ئەم ڕۆڵە نەرێنییە. هەڵبەتە ئەم دیاردەیە لە بەدەستهێنانی پەرەسەندنێکی خێرا شاراوەیە. بەڵام پێکهاتنی سەرمایەداری و ئاراستەگرتنی بەرەو چەوساندنەوە، نەتەوەپەرستیش تایبەتمەندێتیەکی شۆڤێنی بەدەستدێنێ و ئەمەش ڕێگا لەپێش بچووك بینینی نەتەوەکانی دیکە دەکاتەوە. لە ڕەوشێکی بەمجۆرەدا لەوە دەردەکەوێت کە ئایدیۆلۆژیای گەلێك یاخود نەتەوەیەکی ژێردەست و چەوساوە بێت، دەبێتە ئامرازی ئەو هێزانەی لە قۆناخی پەلهاوێشتن و بڵاو بوونەوەدان . وەکو هێزێکی دیماگۆژی دەکرێتە بەهانەی هەموو جۆرە پیلانگێڕی و پێکدادن و شەڕێك. لەبەرئەوەی بەسانایی کاریگەری لە کۆمەڵگا دەکات و دیماگۆژیەتەکەی بەهێزە، کاریگەری پیلانگێڕیەکەی بەهێزتر دەکات. بۆ نموونە ئەم تایبەتمەندییانە لە هیتلەر و مۆسۆلۆنی زەق و بەرچاون. لە ڕێگای نەتەوەپەرستی ئەڵمانی گەورەترین پیلانگێڕی لە مێژوودا ئەنجام دەدات. نەتەوەپەرستی یەهودیش لایەنە هاوشێوەکانی ئەوەی بەهێزە. یەهودیەکان باوەڕیان وایە کە وەکو قەومی هەڵبژاردە لەلایەن خوداوەندەوە خولقێنراون. ئەم باوەڕیە ڕێگا لەپێش شۆڤێنیزم دەکاتەوە و دەبێتە هۆی ئەوەی تەواوی کۆمەڵگاکانی دیکەی مرۆڤایەتی لە خۆیان بچووکتر ببینن. لەگەوهەری تەواوی ئەم شۆڤێنیزمانەدا چەمکی "تەوتەمی من لە هی تۆ بەهادارترە" شاراوەیە. هەربۆیە ئاشکرایە کە پشت بە پاشکەوتوویی دەبەستن. هاوچەرخبوونی نەتەوەپەرستی بەو واتایە نایەت کە پشت بە سەرەتاییبوون و پاشکەوتوویی نابەستێ. تەنیا ئەوە نیشان دەدات کە شێوەی هاوچەرخی پاشکەوتوویی و تەوتەمە؛ هەروەکو لێکەڕینەکانی ئایین بۆ باڵا بوون، دیسان هەروەکو چۆن لە چەرخەکانی یەکەمدا زۆر بەر بڵاو بوو، چەمکی " بتی من لە هی تۆ باڵاترە" نیشان دەدات و ڕەنگدەداتەوە. کاتێك باس لە کارەکتەری ئایینی نەتەوەپەرستی دەکەین، مەبەستمان ئەم لایەنانەیە، ئەمانەش دەستنیشانکردنی لەجێی خۆیدایە.

پێویستە باش دەرك بەوە بکرێت کە چەمکی نەتەوەیی پشت ئەستوور بە وڵاتپارێزی و هەبوونی کولتووری لە لایەنی چۆنایەتیەوە لەگەڵ ئەو هەڵوێستە جیاوازە، تەنانەت دژێتی. وڵاتپارێزییەکی باش و ڕێزگرتن لە قەوارە کولتوورییەکان بناخەی چەمکێکی ڕاستی

مرۆڤپەروەریشە. بەپێچەوانەوە ئەو مرۆڤەی هەستی وڵاتپارێزی و ڕێزگرتنی لە بەرامبەر قەوارە کولتوورییەکان لەدەست دابێت، واتە لەمێژوو و ڕاستینەی کۆمەڵگا دابڕاوە. زەحمەتە ئەمانە بەهای واتادار بخوڵقێنن و گوزارشتی لێبکەن.

دانانی پەیوەندی نەتەوەپەرستی لەگەڵ پیلانگێڕی هێندە ئاستەم نییە. هیتلەر کاتێك شەڕی دووەمی جیهانی ئامادەکرد، بەتەواوی پەنای بردە بەر شێواز و ڕێچکەکانی پیلانگێڕی. لەهاتنە سەر دەسەڵات و دەستپێکردنی شەڕدا، ڕێچکەی سەرەکی بەردەوام بە شێوەی پیلانگێڕی پێشدەکەوێت. لەناوەوە بۆ خەڵەتاندنی کۆمەڵگا، لەدەرەوەش بۆ پەردە پۆشکردنی تەماعکاری فراوانخوازی خۆی بەردەوام پەنا دەباتە بەر چەمکی پیلانگێڕی نەتەوەپەرستی. پیلانگێڕی بەکاریگەرترین چەکی بەڕێوەبردنێکی هەرزانە. تاکو ئێستاش کاری میتۆلۆژی ڕاهیبە سۆمەرییەکان بەشێوەی نەتەوەپەرستی بەرهەمی خۆی دەدات. بەردەوامی دواتری ئەم بەرهەمە ئایدیۆلۆژیای سۆسیالیزمی بونیادنراوە. تەنانەت ئایدیۆلۆژیای سۆسیالیزمی بونیادنراو زۆر لە ئایدیۆلۆژیای پەرستگای سۆمەرییەکان دەچێت. وەکو ئایدیۆلۆژیایەکی چڕی دەوڵەت ـ کۆمەڵگا، هەردووکیشیان سۆسیالیزمی دەوڵەتی واتە کۆیلایەتی دەوڵەت پێکدێنن. تاوەکو دەوڵەت هەبێت، ئەوا هەموو شێوەکانی بەرهەمهێنان کە لەدەوروبەریدا هەن، لە سۆمەرییەکان تاوەکو سۆڤیەت لە نوێنەرایەتیکردنی هەمان گەوهەر ڕزگاریان نابێت. لەوە بە دوا ناکەوێت هەمان کاریگەری بەکۆیلەکردن بکاتە سەر کۆمەڵگا. لە چوارچێوەی واتای چینایەتیدا نابێت دەوڵەت و سۆسیالیزم بەیەکەوە لە ئارادابن. ئەگەر یەکێکیان هەبێت، ئەوی تریان نابێت یاخود ناچارە بەرەو وەرچەرخانێکی ڕیشەیی تێپەڕبێت. تاوەکو سۆسیالیزمی بونیادنراو جەخت لەسەر سۆسیالیزمی دەوڵەت بکات، ئەوا لە قۆناخی هەڵوەشانەوەیدا، بەشێوەیەك کە باوەڕکردنی زەحمەتە، دەرکەوتووە کە ڕژێمێکی پیلان و گەمەی چۆن بووە لەسەر کۆمەڵگا. شێوازی دەوڵەتی ڕاهیبی سۆمەر لەژێر بناخەی ئەم ڕاستینەیەدا شاراوەیە. لە لایەنی ئایدیۆلۆژیشەوە دیسان میتۆلۆژیای ڕاهیبی سۆمەر بناخەی هەموویان پێکدێنێ.

جیاوازییەکانی نێوان قاڵبە ئایدیۆلۆژییەکانی سۆسیالیزمی بونیادنراو و میتۆلۆژیای ڕاهیبی سۆمەر لەگەوهەردا نییە، بەڵکو لەشێوەدایە. تەواوی ئایدیۆلۆژیاکانی ڕیشەکەیان بۆ ئەمە دەگەڕێتەوە بۆئەوەی بەسانایی کۆمەڵگا و تاك بەڕێوەببەن لەسەر بنەمای خەڵەتاندن بەدوای زاڵبوونی هەست و هزریدا وێڵن. کاتێك یەکێکیان لەئەوەی دیکەیان زیاتر بەکاردێنێت فەلسەفە و زانست، پێڕەو و کاری بناخەیی و لێکچوویان لەبەین نابات. تەنانەت ئەو ئایدیۆلۆژیایەی زیاتر زانست بەکار دێنێ لەهەمووان مەترسیدارترە. هیچ کاتێك میتۆلۆژیای سۆمەر لە فاشیزمی هیتلەر تێکدەرتر نەبووە. ئایدیۆلۆژیای نەتەوەپەرستی شێرپەنجەی چەرخەکەمانە. ئەگەر بەشێوەی شۆڤێنیزم بێت یاخود سۆسیال ـ شۆڤێنیزم، هەر کۆمەڵگایەکی دەیخاتە ژێر کاریگەری خۆی تووشی نەخۆشیەکی بکوژی دەکات. چارەسەری ئەم

نەخۆشییە، بەکارهێنانی بە ڕادەی کەم یاخود زۆری نەتەوەپەرستی نییە، بەڵکو دەستبەردانێکی ریشەییە. نەك تەنیا دەستبەردان لەم شێوە هەست و شێوازە هزرە، پێویست دەکات تێکۆشان لە بەرامبەریان بکرێت. جیهانێکی ڕۆح و هزر کە گیرۆدەی ئەم نەخۆشییە بووبێت، تەنیا لەڕێگای تێکۆشانێکی مەزنی پاکژی و یەکلابوونەوە دەتوانێ خۆی و کۆمەڵگاش ساخ بکاتەوە. ڕێگای ئەمەش، وڵاتپارێزییەکی بە پرەنسیپ، ڕێزگرتن لەقەوارە کولتوورییەکان و مرۆڤپەروەرییەکی قووڵە.

لەکاتێکدا هێشتا گەلی کورد لە تەڵەزگە ئایینی و میتۆلۆژیاکانی چەرخەکانی یەکەم و ناوین ڕزگاری نەبیبوو، تەنانەت لەگەڵیدا لەنێو ململانێدا بوو، دووسەد ساڵی دوایی خۆی ڕووبەڕووی تەڵەزگەکانی پیلانگێڕی نەتەوەپەستی دۆزیەوە. لەکاتێکدا دیگووت با لە باران ڕابکەم، تەواو کەوتە ژێر تەرزە و گەردەلوول. ناوەندە نەتەوەپەرستیەکانی لە ناوەوە و لە دەرەوە باڵا دەکات بۆ بەدەستخستنی قەرمانی کوشتنی لەگەڵ یەکتر لەنێو پێشبڕکێدان. هەروەکو بڵێی لەدەرەوە بەکرێگیراویتی نەتەوەپەرستی ئینگلیز و فەرەنسا و ئەڵمان و نەتەوەپەرستی تورك، عەرەب و فارسی هەرێمە نزیکەکان تێری ناکات. لەناو خۆشیدا ڕووبەڕووی پیلان و گەمەکانی نەتەوەپەرستی سەرەتایی ئەرمەنی و ئاشووری و خۆیان بوونەتەوە. دەتوانی بەرەنگاری کامەیان بێتەوە؟ چەرخی کارەسات بەشێوەیەك خراپ و چاوەڕوان نەکراو یاری لەسەر دەکات. لەکاتێکدا نەتەوەپەرستیە باڵادەستەکان دەڵێن "تۆ تەنیا دەتوانیت ببیتە تورك، فارس، عەرەب"، نەتەوەپەرستی کەمایەتییەکان دەڵێن: "خاوەنی ڕاستەقینەی ئێرە، ئێمەین". بەردەوام چاوی نەتەوەپەرستی نەتەوە گەورەکان لەسەر ئەوەیە "لەکوێ و چۆن دەتوانین وەکو قۆزێك بەکاریان بێنین؟". هەرچی نەتەوەپەرستی سەرەتایی خۆجێیە، هەموو دەردەکەی ئەوەیە کە گەل وەکو دوامولکی کە لەدەستی ماوەتەوە بە پێنج فروشێك بفرۆشێ. گەلێك دووچاری کارەساتێکی لەمە قورستر نابێتەوە. لەوانەیە دووچاری نەفرەتێك هاتبێ کە نموونەکەی لەمێژوودا نەبینراوە.

دەتوانین لەمیانەی چەند قۆناخێکەوە باشتر سەردەمی پیلانگێڕی نەتەوەپەرستی ڕوونبکەینەوە:

١ـ **قۆناخی ١٨٠٠ ـ ١٩٤٠**؛ لەم قۆناخەدا کە لەلایەن میرنشینەکان، سەرۆك خێڵ و شێخەکان نوێنەرایەتی دەکرێت و کاریگەری نەتەوەپەرستیەکی سەرەتایی خۆجێیی لاواز دەبینرێ، گەمە لەنێو گەمەدا دەبینرێ. ئیمپریالیزمی ئینگلیزی بۆ ئەوە هەوڵدەدات کە بنکە و بەڕێوەبەرایەتیەکی بەکرێگیراوی پابەند بەخۆی لەناوچەکەدا بخولقێنێ. بۆئەوەی کەمایەتییە مەسیحیەکان، عەرەبەکان و باشووری ئێران بەخۆیەوە گرێ بدات سیاسەتی پەرتکە و زاڵبەی خستۆتە گەڕ. میرنشینە کوردیە وروژێنراوەکان، خێڵ و شێخەکانیان هەم بەڕێوەبەرایەتی عوسمانی و ئێرانی، هەم کەمایەتی مەسیحی ئەرمەنی و ئاشووری تەنگەتاو دەکەن. ئینگلتەرا

لەمە سوودمەند دەبێت، زیاتر بەڕێوەبەرایەتی عوسمانی و ئێرانی بەخۆیەوە گرێدەدات، خۆشی بە پارێزەری ئەرمەنی و سوریانیەکان نیشاندەدات. مەسەلەکە بەسەری کوردانـدا دەتەقێ. چەندە یاخیبوون رووبدات، بەو ئەندازەیەش سەرلەنوێ داگیرکردن، دەستدرێژی و دەربەدەری دێتە ئاراوە. رێبەرە یاخیبووەکان یان دەکوژرێن یاخود بەخۆیانەوە گرێدەدەن. گەلیش تێنەگەیشتووە چی بووە و چی روویداوە. لەهەموو لایەك خۆی لەنێو گەمارۆ و تاڵان دەبینێتەوە. لە یاخیبوونی عەبدولڕەحمان پاشای بابانی ١٨٠٦ی سلێمانی باشوری کوردستان تاوەکو یاخیبوونی سەید رەزا ی سەرۆك عەشیرەتی عەباسان لە دێرسیمی باکووری کوردستان لە ساڵی ١٩٣٨، ئەو راپەڕینە یەك لەدوای یەکە بێ پلان و بێ رێکخستنەکان، بەگرانی لەسەر گەلی کورد دەوەستێ. تەنانەت ناتوانرێ حیساب بکرێت کە چەندە زیانی لێکەوتۆتەوە. راپەڕینەکان پشت بەهیچ پلان، ستراتیژ و چەمکی رێکخستن نابەستن. پیلانگێڕی بەرفراوان لەدەوروبەری بەڕێوە دەچن. لەکاتێکدا هەر هێزێکی پەیوەندیدار بەدوای سوود و بەرژەوەندی خۆیدا دەگەڕێ، مێشکێکی کوردان لەئارادا نییە. میرنشین زۆرن، بەڵام مێشکیان نییە. بەرامبەر بەم بووبەرە گەل جگە لەدەردی گیان خاوەنی هیچ بژارێکی دیکە نییە. رەوشی کۆمەڵگایەکی پەرتەوازە بووی هەیە کە پارچە بووە، دووچاری کۆچ و نیشتەجێبوونی زۆرەملێ هاتووە و ئاوارەیە. چینە سەردەستەکانی خۆیان بەهیچ کێشە و گیروگرفتێکیانەوە خەریك نابن. باڵادەستەکان بەدوای بەرژەوەندیە بنەماڵەیی و کەسێتیە باوەکانی خۆیاندان.

نەتەوەپەرستی تورك، عەرەب و فارسی گرێدراو کە تازە لەرۆژهەڵاتی ناوین هەڵدەکشێ، بە بەراورد کردن لەگەڵ نەتەوەپەرستی سەرەتایی کورد خاوەنی گەلێك تواناکاریە. ئەگەر سەرەتاییش بێت هێزی دەوڵەتیان بەدەستەوەیە. خاوەنی پارتی نەتەوەپەرستی بەهێزن. چینی بۆرژوازی بچووکی نەتەوەپەرست گەشەدەکات، ناوەندەکانی نەتەوەپەرستی سەرەتایی کوردان زۆر لاوازە. هێزە خێڵەکییە باوەکان هێزی خۆیان لەدەست داوە. میرنشینە بەهێزەکانی رابردوو لەئارادانەماوە. کاتێك دەگەینە کۆتاییەکانی ئەم قۆناخە، قوربانیەکانی پیلانگێڕی نەتەوەپەرستی رووبەڕووی بەئێشترین قۆناخی پاکتاوکاری مێژووی خۆیان بوونەتەوە. بزاڤی نەتەوەپەرستی ئەرمەنی دوای کوشتارە بەرفراوانەکان بەشێکی زۆری خاکی دایکیان بەجێهێشت و دووچاری پەرتەوازەبوونێکی مێژوویی هاتن. هەروەها چارەنووسی ئاشوورییەکان کە یەکێك لەکۆنترین گەلانی ناوچەکەیە، هەمان شت دەبێت، لەئاکامی گوشار و کۆچپەرێتیدا دەکەوێتە رەوشی گەلێکی تاراوگە.

بەهەمان شێوە رۆمەکان ئەنادۆڵ بەجێدێڵن کە سێ هەزار ساڵ شوێنی نیشتەجێ بوونیان بووە، هەرچی کوردانـن لەگەڵ نیشتەجێ بوونێکی زۆرە ملێ، وەکو کۆمەڵگایەکی پەرتەوازە بوون، بەڵام بە جەستەیی لەشوێنی خۆیان دەمێننەوە. لەوانەیە تاکە خێری موسڵمانێتی ئەوەیە کە رێگای لەپێش مانەوە لەشوێنی خۆی کردۆتەوە.

لەڕاستیدا رەوشی گەلانی دیکەش هێندە پڕشنگدار نییە. تورك و عەرەب و گەلە موسڵمانەکانی دیکەی ئێران، هێندەی لەشەڕەکاندا هێز و توانایان لەدەستدا کەوتنە رەوشێکی نەدارییەوە. بەتایبەتی نەتەوەپەرستی ئیتحاد و تەرەقی بەملیۆنان رۆڵەی گەلانی رۆژهەڵاتی ناوینی بەگژ یەکترەوە نا، بوو بە بەرپرسیاری گەورەترین تێکدان و وێرانکاری لەناوچەکەدا. نەتەوەپەرستی عەرەب ـ ئیسرائیل لەنێو رەوشی هەوێنکردندایە. نەتەوەپەرستی وەکو پەڵە هەورێکی رەش لەسەر ئاسۆی ناوچەکە وەستاوە و دەسوڕێتەوە. لەکاتێکدا لەم قۆناخەدا چەندێك لە گەلە کۆنەکانی مێژوو پاکتاو دەبوون، کوردان لە رەوشی گەلێکی زۆر زامدار دان. گەلەکانی دیکەی تورك، ئێران و عەرەب لەنێو رەوشێکی زۆر پەرێشاندا دەژین. میراسی نەتەوەپەرستی بۆ گەلان ئەم راستینە بەئێش و خوێناوی و پاکتاوکاریانە بووە.

٢ ـ **قۆناخی ١٩٤٠ ـ ١٩٧٥ ی PDKکان:** چینی سەردەستی کورد کە لە هەلومەرجەکانی شەڕی دووەمی جیهانی لەپای سوود وەرگرتن و بەدەستهێنانی هێز و بەرژەوەندی بوو. کاریگەری پێشکەوتنەکانی سەرتاسەری جیهانی کرایە سەر و لەدواییدا هەوڵدەدات خۆی وەکو رێکخستنێکی نەتەوەپەرستی بۆرژوازی بچووك رابگەیەنی کە ئامانجی ئۆتۆنۆمییە. ئەو دەوروبەرانەی بەشداری ئەم رێکخراوە دەکەن لە تێکەڵاوی دەرەبەگایەتی و وردە بۆرژوا پێکهاتوون و قورسایی هێزە دەرەبەگەکان زاڵە. لەناواکردنی رێکخستنێکی نوژمنی نەتەوەپەرستی سەرکەوتوو نابن. لە سەرەتادا بە پشتبەستن بە بلۆکی سۆفیەت هەوڵدەدەن ئۆتۆنۆمی بەدەست بێنن، کە ئەو کاتە ئەم بلۆکە لە سەرتاسەری جیهان لە قۆناخی پرشنگداری خۆیدا بوو. بەڵام وەکو پێویستیەکی پێکهاتەی چینایەتییان، کەوتنە ژێر کاریگەری کۆنترین هێزە ئیمپریالیستەکانی ناوچەکە، ئینگلتەرا و ئەمریکا، دەبێتە ناچاریەك. دەکەونە ژێر کۆنترۆڵی ئیسرائیلیش کە وەکو هێزێکی تازەیە. لەبەرئەوەی لەم قۆناخەدا ئیمپریالیزم لە پارتیە بەکرێگیراوەکانی سۆسیالیزمی بونیادنراو و رەوتە رادیکاڵە نەتەوەپەرستیە چەپەکان وەڕسە، ئەوا دانی کۆنترۆڵی وزەی شاراوەی کوردان بەو پارتیانەی بەناوی PDK بەگوێرەی بەرژەوەندییەکانی خۆی دەبینێ. هەروەکو بڵێی PDK کان بۆ قووتدانی وزەی شۆڕشگێڕی رۆڵی بروسکەگر دەبینن. ئەمانە هیچ کاتێك جولانەوەیەکی شۆڕشگێڕی لەبەرژەوەندی خۆیاندا نابینن کە لەناوجەرگەی گەلی کورد بژێت. PDKکان وەکو باڵترین ئامراز هەم بۆ پەروەردەکردنی کوردان و خستنە ژێر کۆنترۆڵی خۆی، هەم بۆ لەژێر کۆنترۆڵ هێشتنەوەی وڵاتە دراوسێکان سەبارەت بە کێشەی کورد و لەپێناو سوودوەرگرتن لێیان بەکاریان دێنن. لە قۆناخی وشیاربوونەوەی نەتەوەیی گەلی کورد لەسەرەتادا خواستیان لە بنەماڵە کۆنەکانی عەشیرەت و بەگەکان ئەربابی (ئەفەندی) بۆرژوازی ئامادە بکەن. گەوهەری پیلانی نوێ پشت بەوە دەبەستێ کە لەڕێگای ئەربابە (ئەفەندیە) بۆرژوا دروستکراوەکان کوردان بخەنە ژێر کۆنترۆڵەوە. بۆئەوەی کەس حیساب لە خۆیان و

بەکرێگیراوەکانیان نەپرسێ بێبەشکردنیان لە رێبەرایەتی گەلەری شۆڕشگێڕ، یەکێك لە ئامانجە هەرە سەرەکیەکانی ئەم هەڵوێستە پیلانگێڕییەیە.

هەر بۆیە رێبەری شۆڕشگێڕی کوردانی ئێران سولێمان موعینی، رێبەری چەپی شۆڕشگێڕی کوردانی تورکیا سەعید قورمزی تۆپراغ لەو پیلانگێڕیانەدا لەنێودەبرێن کە بەرێبەرایەتی بارزانی ئەنجامدەدرێت. بۆ ئەوەی رێکخستن و رێبەرێکی سەربەخۆ و شۆڕشگێر دەرنەکەوێت، لە تەواوی پارچەکانی کوردستان بەشێوەی سیخوڕی دەکەونە گەڕو نێچیر دەکەن. سەرباری ئەوەی لەم قۆناخەدا رێبەرایەتییە شۆڕشگێڕەکان لە سەرتاسەری دونیا لە تێکۆشانی رزگاری نیشتمانی دیموکراسیدا نموونەی سەرکەوتوویان پێشکەش کرد، بەهۆی ئەو پیلانگێڕیانەی کە PDK کان رۆڵی سەرەکییان لە ـ بەڕێوەبردنیاندا بینی رێبەرایەتیەکی نیشتمانی شۆڕشگێڕی کوردان پێك نایەت. ئامانجی راستەقینەی گەمە و پیلانگێڕیەکانگەلی کورد لەژێر کۆنترۆڵی PDK کانی کوردایەتی ساختەدا بمێنێتەوە، هەربۆیە بەبێ بەشی هێشتنەوەی لە رێکخستن و رێبەری نیشتمانی ـ شۆڕشگێر، وەکو پارچەیەکی سروشتی ئەمەش، ئامانج بێکاریگەرکردنی رێکخستنی سۆسیالیزمی بونیادنراوە. پارچەیەکی گرنگی ئەو رۆڵەی پێیان دراوە ئەمەیە.

دەشێ بگووترێ " دەڵێ نە من خۆم ئەرکی نیشتمانی ـ دیموکراتی ئەنجام دەدەم، نە دەهێڵم کەس ئەنجامی بدات". بە کرێگیراوانی کورد هەندێك تایبەتمەندێتی تایبەت بە خۆیان هەیە. تەنیا بەجێبەجێکردنی فەرمانەکانی هێزێك ناوەستن. بەر لە دوژمنانی لە رێگای هەموو جۆرە پیلانگێڕییەك پاکتاوکردنی ئەو هێزانە بە ئەرکی خۆیان دەبینن کە ئەگەری ئەوەی هەیە حیسابیان لێ بپرسن. بوونیان بە پاشڕەوترین گروپەکانی رۆژهەلاتی ناوین، بە هۆی ئەم تایبەتمەندێتیانەی پێکهاتەکەیانە. شەڕکردنیان دژ بە PKK گرێدراوی ئەم تایبەتمەندێتیانەی پێکهاتەکەیانە. هۆکاری سەرەکی ئەو شەڕەی لە دژی PKK هەڵیان گیرساندووە، بۆ ئەم ترسەیان دەگەڕێتەوە کە لەحاڵەتێکدا رووی راستەقینەیان بۆ گەل ئاشکرا بێت ناتوانن حساب بدەنە گەل. رزگاربوونی گەلی کورد لە هزر و هێزەکانی پیلانگێڕی هەزاران ساڵە، لە نزیکەوە گرێدراوی هەڵسەنگاندنێکی راستی ئەنجامی شەڕە و بەراستی دەستنیشانکردنی بژاری ئازادییە.

٢ ـ قۆناخی ١٩٧٥ ـ ٢٠٠٠: ئەم قۆناخە کاتی بەرەبەرەکانی PKK و ئازادییە. دەتوانرێ بگوترێ هیچ جولانەوەیەکی کۆمەلایەتی هێندەی PKK لە ناوەوە و دەرەوە دووچاری پیلانگێڕی نەهاتووە. ئەو شەڕەی لە رێگای ئایدیۆلۆژیاکانی نەتەوە پەرستی سۆسیال ـ شۆڤێنی بەڕێوە براوە تایبەتمەندێتی سەرەکی ئەم قۆناخەیە. ئامانجی سەرەکی پەیوەندی بە وەلامدانەوەی پێویستی رێبەرایەتی گەل هەیە. کاتێك بینیان یەکەمین جارە لە مێژوودا کۆنترۆڵی گەلی کوردیان لەدەست دەرکەوت، هێزە جیاجیاکان لەسەرتاسەری جیهان پەنایان بردە بەر گەمە سیاسیەکان. ئەو تێکۆشانەی لە گۆڕەپانی ئایدیۆلۆژی ئەنجامدراوە، ناسنامەی

ئەو هێزە دیاردەکات کە بەرەو گەل دەچێت و ڕێبەرایەتی بۆ دەکات و ئەوەش دەستنیشان دەکات کە پێویستە چۆن بێت.

لەم قۆناخەدا نەتەوەپەرستی نەتەوە باڵادەستەکانی هەرێمەکە بەردەوام هێزە بەکرێگیراوەکانی کوردان وەکو هێزێکی یەدەگ لەلای خۆیان رادەگرن. هێز بەوە دەدەن کە باڵادەستی هزری پاشماوەکانی چەرخەکانی ناوین لە ڕێگای تەریقەتەکانەوە بەردەوام بێت. بەو رادەیەی بەکاریگەر دەبن، لە سەرووی هەموویان پارتییەکانی سیستەم، تەواوی دەزگاکانی هونەری، وەرزشی، ئابووری، کۆمەڵایەتی، سیاسی هاوچەرخ بۆ ئەوەی گەل نەبێتە خاوەن هزری ئازادیخوازی، بە ئامانجی لەرێ دەرخستن و گەندەڵکردن بەکاردەهێنرێ. یەکێك لە ئامانجە سەرەکییەکانیان ئەوەیە لەمیانەی پیلانگێڕی هەمەلایەنی نەتەوەپەرستی سەرەتایی خۆجێیی و نەتەوەپەرستی نەتەوەی سەردەست ئەگەری یەکێتی هزری ئازادانەی گەل پووچەڵ بکەنەوە.

هێزە جیهانگیرییەکانی وەکو ئەمریکا و یەکێتی ئەورووپا، لێکدانەوەی ئەوە دەکەن لەمیانەی کارتی کوردان تا چ رادەیەك دەتوانن بەکاریگەربن و بەگوێرەی ئەمەش سیاسەت دیار دەکەن. کاتێك زنجیرەی پیلانگێڕی لە ئاستی جیهانی دژ بە PKK تەواو بوو، هێزە مێژوویی و هەنووکەییەکان بەمجۆرە لە دەوروبەری دیاردەی کورد ڕیزبوون و هەروەکو لاشەخۆرە بەوە خەریکن کە دەنووکیان تاوەکو کوێ و چۆن لێی دەدەن.

#### ٢ ـ ڕاستینەی ئەو پیلانگێڕیەی PKK دووچاری هاتووە

ئەو ڕێکخستنانەی بناخەی کۆمەڵایەتییان هەیە بە باوەڕ و وشیاریەوە دەست بە دانانی بناخەکەیان بکەن، ئەوا جارێکی دیکە مێژووی ئەو کۆمەڵگایە زیندوو دەبێتەوە و لەمیانەی ئەو پەیوەندی و ناکۆکیانەی لەناراداپە لەژێر هەلومەرجی نوێدا هەوڵدەدات بژێتەوە. لەم واتایەدا هەر ڕێکخستنێك دەستێوەردانێکی کۆمەڵایەتییە. لەو قۆناخەی تێیدا لەدایك دەبێت، سەرەتا لێپرسینەوە و دادگایی سەبارەت بە تەواوی ئەو فۆرمانەی ژیان دەکات کە لەناراداان. لەکاتێکدا ئەوانەی واقیعین بۆ خوڵقاندنی فۆرمی نوێ یەکدەگرن، لەگەڵ ئەو فۆرمانەی شانسی ژیانیان نییە تێکۆشانێکی هەمەلایەن و ئەپساوە دەستپێدەکات. دەشێ تێکۆشان لەبواری ئایدیۆلۆژی بۆ گۆڕەپانی سەربازی بخزێت و چەند گۆڕەپانێك بگرێتەوە. لەبەرئەوەی قۆناخ قۆناخی مانەوە و مردنە، بەتایبەتی لە هەلومەرجەکانی دەستپێکردندا تێپەڕبوونی بەشێوەیەکی خوێناوی و پڕ لەئێش ناچارییە. شەڕێکی ماندووکردن لەدواییدا ئەوە یەکلا دەکاتەوە کە چ تواناکاری ژیانی هەیە و چ ئەو تواناکاریەی نییە. ئەو قۆناخەی بە ڕۆژگاری شۆڕشگێڕی ناو دەبرێت ئەگەر تێکۆشان بەقوولایی پێویست و شێوەی ڕاست کرابێت، ئەوا ئەو لایەنانەی پێویستیان بە رووخان هەیە بەشێوەیەکی گشتی تێپەڕکراوە. دوای ئەوە قۆناخی

نوێبوونەوەی کۆمەڵگا دەستپێدەکات. ئەم قۆناخە هەستیارترین کات و ساتە، بە راستی هەڵسەنگاندنی بایەخێکی مەزنی هەیە. ترازیدیترین هەڵەکانی مێژوو، تەنانەت ژێرکەوتنەکانی لەم سات و کاتەدا روودەدات. بەهەمان شێوە وەکو خۆی درێژەدان بە رێساکانی قۆناخێك، وەڵامنەدانەوەی هەلومەرجە نوێکان، بەشێوەیەکی لەخۆوە گیراو و تەریقەتی پاشەرۆ و رەنگدانەوەی دەبینێتەوە. تەنانەت ئەگەر رێکخراوی شۆڕشگێڕیش لەرەوشێکی وەهادا وەڵامێکی ئەرێنی نەداتەوە، لە گۆڕان بۆ هەمان مارژینالی و بوون بە تەریقەت رزگاری نابێت. تەواوی ئەم قۆناخانە، بەواتای ئەوەش دێت کە ئەو راستییانەی بەدرێژایی مێژوو کۆمەڵگا تێیدا ژیاوە بەشێوەیەکی دژوار و لەماوەی ساتێکی زۆر کورتدا بە فارەمانێتی و هیچ و پووچیەکەوە، بەدەستنیشانکردنەکانی راستی و پیلانگێڕیەوە، بەجوانی و فرێژەکانیەوە سەرلەنوێ جارێکی دیکە هەروەکو بڵێی لە گۆڕستان هەڵدەستێتەوە ودەگووترێتەوە.

ئەم پێناسە گشتییەی سەبارەت بە دەستێوەردانەکانی کۆمەڵگا، لە راستینەی کۆمەڵگای رۆژهەڵاتی ناویندا لەمیانەی گوزارشتی جۆنایەتی تایبەت پێناسە دەکرێت. هەروەکو خۆی گواستنەوەی شێوەکانی رێکخستنی شارستانییەتی سەرمایەداری ئەوروپا بۆ ئەم کۆمەڵگایە، مەترسی نەگەیشتن و کۆك نەبوون لەگەڵ ریشەکەی لەخۆوە دەگرێت. هەروەکو چۆن هەر خاکێك هەموو بەرهەمێکی لێ نارووێت، هەر کولتوورێکیش دەشێ بەرهەمی کولتووری گۆڕەپانی جیا هەرس نەکات. گواستنەوە، چاندن و بەدەستهێنانی بەروبووم، لەحاڵەتێکدا بەدیدێت کە گەلێك تایبەتمەندێتی تایبەت بەرچاو بگیردرێت و پێویستیەکانی جێبەجێ بکرێت.

هەروەکو چۆن لەچوارچێوەی فراوانی هەڵسەنگاندنەکانماندا دەرکی پێدەکرێت، کۆمەڵگای رۆژهەڵاتی ناوین وەکو ئەو ماددە وایە کە لەزۆر ناوێتەی جیاواز پێکهاتووە: سەرباری ئەوەی بنەچەی کولتووری دونیایە، بەڵام کولتوورێکە لەم هەزار ساڵەی دوایی خوڵقاریەکەی مردووە. هەرچی ئەوروپایە، بەتایبەتیش لە ساڵانی ١٥٠٠ بەولاوە، وا لەخۆی رازییە هەروەکو بڵێی دونیا بەو دەستیپێکردووە، بە هەڵوێستێکی خۆسەنتەردیتن سەری رێی گرتووە. بەگوێرەی خۆی بەهەشت و دۆزەخی نوێ دەخوڵقێنێ، هەروەکو نموونەی ئەو هەرزەکارە مێردمناڵانەی تازە پێدەگەن و نرخی باپیرەیان نازانن، هەروەکو چۆن ریشەکەی خۆی لە رۆژهەڵاتی ناوین ناناسێ، لەکامپانیای بچووك کردن و بەنەزان بینین و بە خراپ نیشاندانی دوور نەوەستاوە.

هێندەی ئەوروپا خۆی بخوڵقێنێ و بە دەزگا بکات و لە دونیا بڵاوبێتەوە و باڵادەست بکات، لێکدانەوەی ئەوەی دەکرد کە پەسندکردنی ئەم ریالیتەیە وەکو خۆی ئەرکێکە دەکەوێتە ئەستۆی هەمووان. دەشیا ئەم تێڕوانینە بۆ هەموو شوێنەکانی دیکەی دونیا لە جێگای خۆیدا بێت. بەڵام ئاستەم بوو بەم رەنگە بۆ کۆمەڵگاکانی رۆژهەڵاتی ناوین پەیرەو بکرێت.ئەگەر

بەستە بالأش بووبن، بەلاّم خولقێنەرەکانی شارستانییەت هێشتا لە شوێنی خۆیان بوون. تەنانەت هەمووشیان لە نێو ببرێن، ئەوا ئەو کوولتورەی پێشکەشی هەموو لایەکیان کردووە رەسەنێتی و تایبەتمەندێتی خۆی دەسەپاند. ئەوروپا کە شەپۆل بە شەپۆل پەلاماری هێنا سەر ناوچەکە، نەیدەتوانی بالأدەستی خوازراو بەدەست بێنێ. لە تێکشکان و پارچەبوون و بەمجۆرەش لە لێکدانەوەیەکی چەوت سەبارەت بە هێزی کولتووری ناوچەکە رزگاری نەدەبوو. رۆژهەلاّتی ناوین بە هێزی سەربازی، سیاسی، کۆمەلاّیەتی، ئابووری کۆمەلگاکەی بەرخودانی نەدەکرد، یاخود ئەگەر بەم هێزانە بەرخودانیشی کردبووایە شانسی سەرکەوتنی نەبوو، ئەوەی بەرخودانی کرد لایەنەکانی کولتوور و شارستانییەتی کۆن بوو کە هەروەکو بڵێی بووە بە خاوەنی تایبەتمەندێتی بۆهێلّی(جنینی). هەمان ئەنجام بۆ بلاّوبوونەوەی سیستەمی سۆسیالیزمی بونیادنراویش لە جێگای خۆیدابوو. هیچ سەرکەوتنێکی رۆژهەلاّتی ناوینیش لە ئارادا نییە. چۆن وەکو ژاپۆن و چین نییە، رەوشێکی وەهاشی نییە ببێتە ئەفریقیا، ئوسترالیا و باشووری ئەمریکا. تاکە سەرکەوتن و قازانجی ئەوەبوو دانان بەوەبوو کەخاوەن رەسەنێتیە، تەنانەت ئەگەر داخوازیشی هەبێت ناتوانێ لێی رزگار ببێت. شەڕی عەرەب ـ ئیسرائیل، ئێران ـ ئێراق و ململانێی هەرکەسێك لەگەلّ کوردان گوزارشتی جیاوازی راستینەی ئەم دانپیانانە بوو.

هەروەکو تەواوی شێوە گرتنەکانی کولتووری ئەوروپایی، لە کاتێکدا بلاّوبوونەوەی کولتووری ئایدیۆلۆژی و سیاسی راستڕەو ـ چەپڕەو لە رۆژهەلاّتی ناوین زۆر بێکاریگەر و بێ وەلاّم مایەوە، جۆرەکانی ئیسلامیەتیش کە وەکو کاردانەوەیەك بەرامبەر ئەم کارتێکردنە بەرەیان سەند و زیاتر لەمیانەی تێکەلّکردنی زاراوەی سەرمایەداری لەگەلّ ئیسلامیەتی دەرەبەگایەتی چەرخی ناوین دەخوازێ ببێتە وەلاّم، زۆر دوورن لە وەی ببنە وەلاّمێکی رەسەن. ئەوەی روودەدات زیاتر لە ئەزۆکی و لاساییکردنەوەیەکی هەرزان تێپەڕ ناکات. لەگەلّ ئەوەی مانەوە بە رەسەنێتی پێویستی بە پێکهێنانی دژە تێز هەیە بەرامبەر بە تێزەکانی شارستانییەتی رۆژئاوا، ئەوا خولقکاریەکی نوێی دەکرد بە ناچارییەك. لەو خاکانەی کە سەرچاوەی پیلانگێڕیەکانی تەواوی ئەو قۆناخانەیە، رێککەوتنی سەرمایەداری لەگەلّ تەلّەکەبازترین بەکرێگیراوەکانی، ناچاری بوو بە شێوەیەك رەنگ بداتەوە کە تا دوارادە ئالّۆز، پێناسەکردنی زەحمەتە، راستینەی کەسایەتی و رێکخستن و جولاّنەوەیەکی وەهایە کە بە ئاسانیی دەستنیشان ناکرێت دۆستە یان دوژمن، تەنانەت وەکو حەربا بەگوێرەی جێگا رەنگی خۆی دەگۆڕێ، بێ ئاوەڕۆکە، تەلّەکەبازی و پیلانگێڕیەکەی لەڕادە بەدەرە.

لەنێو هەلومەرجێکی وەهادا لەسەرەتادا گووتنی "بەشێوەی هێلّێکی راست بەرەو پێشەوە دەرۆم"، لە رێگای خۆخەلّەتاندن یاخود هەروەکو زۆرجار نموونەکەی بینراوە لە ئاکامی بوون بەئەندامێکی کوێرانەی تەریقەتێك بەدیدێت. تەنانەت لەدەستنەدانی هاوسەنگی و توانای

لەسەرپێ مانەوە، تاوەکو دەتوانرێ کاری ژیرییە. بەتایبەتی دەستبەرنەدان لە تایبەتمەندێتییە سەرەکییەکانی ئەو بوونەوەرەی مرۆڤی پێ دەگووترێت، مەیدان خوێندن بۆ هەموو فرێژیەکانی بوارەکانی رەگەزی و چینایەتی شارستانییەتە دەبێ بگووترێ "ئەم خاکانە لانکەی مرۆڤایەتین" و بوون بە خاوەن بانگەشەی "لەراستیدا ئەوەی مرۆڤە نابێ لە کچ و کورەکانی بێبەش بمێنێ " پێویستی بە توانکاری و هێزێکی بەرگەگرتنی وەهایە کە زۆر لە دەرەوەی پێوانەکانی سەردەمە.

لە مەسەلەی PKK دا، هەرچەندە هێندە هەستی پێنەکرێت، بەڵام بە گوێرەی گەوهەرەکەی بەردەوام لە گۆشەیەکیدا بانگەشەیەکی مرۆڤایەتی بەمجۆرە هەیە کە خوازراوە بە شاراوەیی و پتەوی بمێنێ، بەبناخەگرتنی دیاردەی کورد لەو بانگەشەیەی PKK دا واقیعی و لە جێگای خۆی دابوو. ئەگەر راستینەی کورد بژێنرێ، مسۆگەر ئەمە بەشێوەیەکی بەرفراوان لەمیانەی خۆنوێکردنەوەیەك بەدیدێت کە لەشێوەی مرۆڤی نوێ بێت. لەو دیاردەیەی بەکورد ناودەبرێت مرۆڤ لەسەر بنەمای چینی باڵادەست و چەوسێنەر لەنزمترین خاڵی کەوتندایە. ئەمە هەڵوێستەیەکە ئاستی لەوە نزمتر نییە. هیچ شتێکی نەماوە لەدەستی نەدابێت. تەنانەت لەبەرنەوەی زنجیرەکانی کۆیلایەتیش سنوورەکانی تێپەڕکردووە، بەهۆی ئەو حوکمەی کە دەڵێ ـ ئەگەر زنجیریش نەبێت، وەکو کەر لە کۆیلایەتیدا دەژیت ـ تەنانەت زنجیری کۆیلایەتیشی لەدەست دەرهێنراوە. ئەگەر بەشێوەیەکی راست و دروست خەریکبوون و پەیوەندیدار بوون لەگەڵ ئەم مرۆڤە بکرێت، ئەگەری ئەوە هەیە کە نەکەوتبێتە نێو فرێژی و پیسایی رەگەزی و چینایەتی، تەنانەت ئەگەر تێیکەوتبێ رەوشی مرۆڤێکی وەهای لێ دروست دەبوو کە بەبێ دووڵی بۆ پاکژبوونەوە رازی بێت.

کاتێك PKK ئاواکرا، خاوەن بانگەشەیەکی وەهابوو کە لەمیانەی راستینە هاوچەرخە زاڵەکان ئەو بوویەرانەی راستینەی گەلێك کە بووە بەلانکەی لەدایکبوونی شارستانییەت، بەڵام لەژێر دەستی رزگاری نەبووە ، لە رێگای پەیوەندی و ناکۆکیەکانەوە لە کەسایەتی خۆیدا بەرجەستەی بکات، چارەسەری بکات. لە هەڵسەنگاندنەکانی تاکو ئێستا ئەنجامەمان داوە هەوڵماندا ئەگەر بەشێوەیەکی سنوورداریش بێت دیاریبکەین کە چ واتایەك دەبەخشێ. بەڵام ئەوەی سەرنج راکێشترە لەسەردەمی ژیانی PKKدا دەردەکەوت. مێژوو و سەردەم، تەواوی تایبەتمەندییەکانی سەبارەت بە دیاردەی کورد، ئامانج و کردەوەکانی، نیازە باش و خراپەکانی، رووی جوان و فرێژی، راستی و چەوتییەکانی، دڵسۆزی و پیلانگێڕیەکانی ناچار دەبوو جارێکی دیکە لە راستینەی PKK دا بژیت. یان وەکو گەل و مرۆڤێکی ئازاد دەکەوێتە سەر رێگای ژیان یاخود دەمرد. هیچ چەمك و هەڵوێستەیەکی دیکە نەیدەتوانی ژیانێکی لە لاشەیەکی کەوتووی پیستر و نەفرەت لێکراوتر خاوێن بکاتەوە. لەم چوارچێوەیەدا هەڵسەنگاندنی مێژووی PKK پڕ لە پەند و ئەزموون دەبێت.

**١ـ لەدایکبوون تاوەکو راگەیاندنی بەفەرمی:** ئەم قۆناخە ساڵانی ١٩٧٠ ـ ١٩٧٨ دەگرێتەوە، بە پشتبەستن بە دوا پاشماوەکانی مرۆڤایەتی کە لەخۆیدا هەیە، بە بانگەشەی "منیش هەم" گوزارشت لەنیازی پەیڕەو کردنی پرەنسیپەکانی پێشکەوتووخوازی هاوچەرخ دەکات لەسەر قەوارە و هەبوونی کۆمەڵگای خۆی. کاریگەری ئەو کەسایەتی و رێکخراوە بەرچاوانەی دەکرێتە سەر کە لەتورکیای ئەو قۆناخەدا لەژێر ناوی زەحمەتکێشان دەجولانەوە. لەم زەمینەیەدا گوێبیستی بانگەشەکانی نەتەوەپەرستی سەرەتایی کوردان دەبێت. ئەم ساڵانە قۆناخێکە تێکۆشانی ئازادی گەلان لە سەرتاسەری جیهان گەیشتۆتە لوتکە. چەوساوە بێت و شانسی ئازادی تاقی نەکەیتەوە، هەروەکو خیانەتکردن لەمرۆڤایەتی دەبینرێ. بەڵام ئەگەر ئەو راستینەیەی دەچەوسێنرێتەوە و سەرکوتدەکرێت دیاردەی کورد بێت، هەروەکو گۆڕەپانی ناوی بەبێ پشتگیری مانەوەی پێویستیەکی سروشتەکەیەتی. بەدرێژایی مێژوو پیلانگێڕیەك، خیانەت و بەکرێگیراوییەك نەماوە کە تاقی نەکرابێتەوە. دروشمی ئازادی چەند گەنجێك تا چ رادەیەك دەیتوانی رزگاری بێنێ؟ سەبارەت بە مەسەلەی ئازادی لە ئاستی جیهاندا خراوەتە رەوشی کۆمەڵگای هەرە بێ بڕیار، خراپتریش ئەوەیە کە چینێکی بەکرێگیراوی پیلانگێڕی کە بەدەگمەن هاوتاکەی بینراوە لەهەر گۆشەیەك دا ئەرکی پێدراوە و جێگیر کراوە. لەژێر هەر بەردێکدا مار و دووپشکێك هەیە. سەرباری ئەمەش، لە هەنگاونان بەرەو جولانەوەیەکی هاوچەرخی عیسای مەسیح دوو دڵ نەبوو. لە راستیدا لایەنە لێکچووەکان زەق و بەرچاوە، جولانەوەی ئەسەنی سەردەمی عیسا و جولانەوەی زەحمەتکێشان تایبەتمەندێتی لێك نزیك لە خۆوە دەگرن. بەحیای واعیزکار و پروپاگەندەچیەکانی سۆسیالیست زۆر لێك دەچن. لایەنی سەیر و سەرنج راکێشی مەسەلەکە، گروپی سەرەتای ئاواکردنی PKKش ژمارەیان نزیکەی ١٢ کەسە. لەوانەیە سیخوڕێك یان دووانیش لە ریزەکانماندا بن.

گروپ زۆر بەرێکخستن و زانا نییە. دڵسۆزی و بنەچەی هەژاری لایەنە بەرچاوەکانیانە. کۆمەڵگا بەها بەم لایەنەیان دەدات و بنگە پێکدێنێ. ئەو لایەنەی قورسایی و مۆری خۆی لە شێوازی تێکۆشانیان داوە پڕوپاگەندەی زارەکییە. هەوڵیاندەدا بەشێوەیەکی سنووردار بەیاننامە و نامیلکە بڵاوبکەنەوە. ئەگەر لەساڵی ١٩٧٧ ئەندامە هەرە دڵسۆز و فیداکارەکەی گروپمان هەڤاڵ حەقی قەرار ی بە ڕەچەڵەك تورکی دەریای رەش لەناکامی پیلانگێڕی شەهید نەکرابووایە، گروپ یەکسەر بەرەو رادیکالیزم نەدەچوو. لێرەشدا لێکچوون زەق و بەرچاوە. هەروەکو چۆن لەخاچدانی عیسا حەوارییەکانی کردە خاوەن باوەڕیەکی مەزنتر و ناچاریکردن لەهەموو لایەك بڵاوببنەوە و زیاد ببن. کوشتنی حەقی قەراریش رێگای لەپێش ئەنجامێکی هاوشێوەی ئەوە کردەوە. بە بڕیارتر بوون و بڵاوبوونەوە لەهەرلایەك زیادبوون، بووە پێودانگی سەرەکی پابەندبوون بە یادی شەهید. لەگەڵ ئەوەی پیلانگێڕیەکان تایبەتمەندێتی پەرتەوازەکردنیان هەیە، کاریگەری لەسەر رادیکالیزم بوون بچووك ناکرێتەوە و زۆرینەیە.

یەکەمین پیلانگێڕی لەسەر مەسەلەی PKK، ڕۆڵێکی مێژوویی گێڕا لەلایەنی بانگەشە، جددیەت و مەزنبوون. ئەگەر ئەم پیلانگێڕیە ڕووینەدابووایە، جێگای گفتوگۆیە کە گروپ چ شێوەیەکی دەگرت. پرۆگرام و ناوی PKK وەکو خاوەن دەرکەوتن لەیادی حەقی قەرار نووسرا و ڕاگەیەنرا.

کاتێك حەقی قەرار ساخ بوو هێشتا پرۆگرام و ڕاگەیاندنی پارتی و پرۆفسیۆنالبوونی تەواو لەرۆژەڤدا نەبوو. خۆڕسکی لایەنی قورسی بوو. لەبواری شێوەدا جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ گروپەکانی دیکە نەبوو. تەنانەت تێکەڵاوتریش بوو. لەڕەوشێکی وەهادا بوو کە تەنانەت هێزەکانی ئاسایش و چەندین گروپی چەپ بەگاڵتەوە پێشوازیان لێدەکرد. تەنانەت ئەوەشمان بەبیردێت کە یەکەمین دزەکردنی جددی کە فرۆکەوانی خەڵکی ئاگری نەجاتی قایا بوو گاڵتەی پێدەکرد. ڕووداوەکەی حەقی قەرار کۆتایی بە قۆناخی گروپێکی وەها سست هێنا، سەرەکیترین پەرەسەندنە کە ڕاگەیاندنی بە پارتیبوونی کردە ناچارییەك. ئەمجارە پیلانگێڕیەك ڕێگای لەپێش ئەوە کردەوە کە جوولانەوەی مێژوویی گەلەری هەنگاوێکی وەها بهاوێژێ گەڕانەوەی بۆنەبێت. حەزرەتی محەمەدیش تا دواسات ئەگەر مەترسی کوشتنی لەئارادا نەبووایە، نیازی ئەوەی نییە مەککە بەجێ بێڵێ. کاتێك زۆر بە ڕوون و ئاشکرایی پیلانی کوشتن خۆی سەپاند، کۆچکردن بۆتە ناچارییەك. یەکێك لەبەردی بناخەی مێژووی ئیسلام هیجرەتە. ئەگەر هیجرەت نەبووایە، ئەوا مەسەلەی پەرەسەندن و پەرەسەندنی ئیسلام جێگای گفتوگۆ بوو. ڕاستینەی لەخاچدانی عیساش گفتوگۆیەکی هاوشێوە لەگەڵ خۆی دێنێ.

لە دیاردەی کورددا بەشێوەیەکی باو پیلانگێڕی قازانج بۆ ئەم لایەنە دەهێنێ کە ئەنجامیداوە. زیاتریش ڕێگا لەپێش قۆناخێکی تۆڵە سەندنەوەی خوێناوی دەکاتەوە. کاریگەری پووچەڵکردنی پیلانگێڕی وەکو ڕێگایەکی بەکاریگەربوون لەناو کۆمەڵگا بیری لێدەکرێتەوە. پیلانی کوشتنی خەلیل چاوگون لەساڵی ١٩٧٨ لە حیلوان دیسان لەم چوارچێوەیەدا خرایە گەڕ. ئامانج پەرتەوازەکردن و سڕینەوەی گروپ بوو لە حیلوان کە تێیدا پێشکەوتنێکی مەزنی بەدەستهێنابوو. یەکسەر دەمەوێ ئاماژە بەوە بکەم کە ڕاستەوخۆ بوون یا نەبوونی دەوڵەت لەپشت ئەم پیلانگێڕیە کاریگەرییەکی جیاواز ناکاتە سەر ئەنجامەکەی. بەڵام ئەوە دەستنیشانکردنێکی ڕاستترە کە هەڵوێستی دەوڵەت ئاستی بەدواداچوون (تعقیب) ی تێپەڕ نەدەکرد. هەروەکو چۆن لە مردنی حەزرەتی عیسادا زیاتر کاهینە خۆجێییە پاشڤەڕۆ و بەکرێگیراوەکان بەرپرسیارن، ئەوا بەرپرسیارێتی پاشڤەڕۆیەتی خۆجێیی لەئەنجامدانی ئەم دوو تاوانەدا بەرچاو و زەقترە. لەسەردەمی ئاواکردنی PKK دا پاشڤەڕۆیەتی ناوخۆ لەسەرووی هەموو شتێکەوە ڕۆڵی هەڵوێستی چەتەگەرێتی و پیلانگێڕی بینیوە. ئەم چەتە خۆجێییانەی هەندێکیان وەکو فاشیستی ڕاستڕەو و هەندێکیشیان خۆیان وەکو سۆسیال ـــ شۆڤێنی چەپڕەو نیشاندەدا بۆماوەیەکی درێژ کێشمە کێشیان لەگەڵ PKK دەکرد. هێشتا

ـحوێمەت بە هەڵوێستێکی روون و ئاشکرا دەرنەکەوتووە. بەکرێگیراوێتی خۆجێیی لە رەوشێکی ـێجهـادان بۆئـەوەی کۆنترۆڵیـان لەدەسـت دەرنەکـەوێ، تـاوانیش لـەناودا، ئامـادەن پـەنا بـۆ ـەکارهێنانی هەموو جۆرە رێچکەیەك ببـەن. رێگای دەرنەکەوتنی گـەل لـەژێر کۆنترۆڵیـان بـە ـەرکردن لەدژی رێبـازی PKK تێپـەڕدەبێت. PDK لـەم کارەدا بەئەزموونـە، لەخستنەگەڕی ـێوانـەکانی خـۆی دواناکـەوێت. هـەروەکو دەزانرێـت ئـەو گروپـەی **عەلائەددین قەپان** کە بـە "پێنـج پارچـە" نـاودەبرێن وەکـو گروپێکـی ملیتـانی گرێـدراوی PDK دەناسـرێن. "KUK رزگاری نیشتمانی کوردستان" کە بەتاوانکاریـەکی بـەرفراوان دەستیپێکرد، کاتێك یەکـەمین چالاکی خۆیان دژی PKK ئەنجامدا، دیسان PDKیان لەپشتەوە بوو.

PDK بۆئەوەی بەناوی هێزە ئیمپریالیستەکان و بەڕێوەبەرایەتی نەتـەوە سەردەسـتەکانی هـەرێم گۆڕەپـان لـەژێر کۆنـترۆڵی خۆیـدا بـهێڵێت، لەسەرتاسـەری پارچـەکانی کوردسـتان و ـەرێگای رێکخـراوی سـیخوڕی هاوشـێوە سـەرکوتکردنی دەرکـەوتن و پێهـەڵگرتنی گروپـە شۆڕشگێڕە ـ وڵاتپارێزەکانی وەکو ئەرکێکی سـەرەکی ئـەم قۆناخـە دیارکردبوو. لە تـەواوی پارچەکانی کوردستان دەرفەت بە دەرکەوتنی گروپە شۆڕشگێڕە دیموکراتـەکان نـادات. شێواز و ێڕەوی سەرەکی لەهەموو لایەك بەشێوەی پیلانگێڕی دەبێت بـە رۆژەڤ. لەئـەنجامی ئەمـەدا بەهەر جۆرێك بێت لەتەواوی پارچەکان پێهەڵگرتنە شۆڕشگێڕ ـ دیموکراتـی و وڵاتپارێزەکـان نەیانتوانی بێنەوە هۆش خۆیان. یان تەنگەتاو کراون، یان ناچاری بەکرێگیراوی کـراون. یـاخود پاکتاو بوون. بۆ یەکەمین جار لە کەسایەتی PKK دا بەرامبـەر بـەم رەوشـە هەڵوێستەیەکی سـەربەخۆ و بـەبڕیار نیشـاندراوە. ئـەو کۆنـترۆڵ و چاودێریـە تێکشـکێنراوە کـە هـێزە سـەرکوتکەرەکانی نەتەوەپەرستەکان و ئیمپریـالیزم دەیانخواسـت بەدەسـتی PDK ئـەنجامی بدەن؛ لەسەر راستەڕێی وڵاتپارێزی و شۆڕشگێڕی ـ دیموکراتی رێکخستنی، ئایدیۆلۆژی، سیاسـی و کـرداری هاتوونەتـە ئـاراوە. ئەمـەش بـەواتای دەرکـەوتنی رەوشـێکی نـوێ دەهـات. ئیـتر کـاتی هاوێشتنی دووەم هەنگاو هاتبوو.

**٢. ١٩٧٨ ـ ١٩٨٨ پیلانگێڕی ناوەوە و تەسفیەچێتی:** کـاتێك یەکـەمین شاڵاوی پیلانگێڕی و گـەمارۆی کۆنەپەرسـتی خۆجێیـی پووچەڵکرایـەوە، بەفـەرمی بـەرەو راگـەیاندنی PKK هەنگاونرا و بۆ یەکەمین جار لە مێـژوودا بـە نـاوی گـەل بـە بڕیـاری ئـەوە گەیشتبوو لەسـەر رێبـازێکی شۆڕشگێڕی و وڵاتپـارێزی بـەڕێوەبچن. ئاسـایی بـوو کـە دەوڵەت لـە نزیکـەوە بـەو پەرسەندنانەوە پەیوەنـدیدار بێت. ئیتر دەوڵەت تەنیا بـە بـەکرێگیراوە خۆجێیی و رێکخـراوە ماشـەکان سـنووردار نـەدەما. هـەندێ جـار ئـەم جـۆرە رێکخراوانـە بـۆ دەوڵـەت هـەبوونیان لــە نەبوونیان باشتر بوو. هەرچەندە بەشێوەیەکی بەرفراوان شێوازی پێکدادانی گروپە چەپەکانی لەناو یەکتردا و بەگژیەکداکردنی گروپـە راسـتڕەو و چـەپڕەوەکان بـەکار بهێنرێـت، بـەڵام ئـەو ئاستەی PKK پێی گەیشتووە زۆر دووری ئەم خاڵەیـە کـەبتوانرێ لەلایـەن ئـەو رێکخراوانـەوە

تەسفیە بکرێت کە ماشەن. لەلایەن دەوڵەتەوە زیاتر ئەوە دەکەوێتە رۆژەف کە لەناوەوە بە پارچەکردن و ئارادەیەکیش بەرێگای بەکرێگیراوەکان بخرێتە ژێر کۆنترۆڵەوە.

PKK ی ئەم قۆناخە لە ئەنجامی چالاکیەکانی حیلوان ــ سیڤەرەك بەسەر ناوەندەکانی پاشەڕۆیی خۆجێیی زاڵ بووە، بە گەلەری بووە و بەرەو رۆژهەلاتی ئاوین کراوەتەوە. ئاستەمە و دەوڵەتیش ناتوانێ بە تەواوی بیخاتە ژێر کۆنترۆڵەوە. فشاری راستەوخۆ و دەستگیرکردنی رووداوی چاوەڕوانکراو بوون. هەربۆیە کودەتای ١٢ی ئەیلول و ئەو رژێمە سەربازیەی لەم پێناوەدا هاتبووە ئاراوە، لەسەرتاسەری تورکیا رەشبگیریەکی بەرفراوانی ئەنجامدا، لە ئاکامی ئەمەدا PKKش زیانێکی گەورەی بەرکەوت. بەلام کراوەبوونی رێگاکانی چیاو دەرگاکانی دەرەوە، دەرفەتی پاراستنی هەندێ لە هێزەکانی رەخساندووە. هەربۆیە شالاوی سەرەکی دەوڵەت بەشێوەی ناچارکردنی زیندانیان بۆ پاکانە و دانپیانان و بێکاریگەرکردنی گروپەکانی دەرەوەی ولات بووە.

دوو ناو کە رۆڵی کلیلیان لەم بارەیەوە دەبینی کەسیرە یلدرم و شاهین دۆنمازن. شاهین لە ناو زیندانیەکان، کەسیرەش لە سەر ئەوانەی لە دەرەوەی ولاتن، کارتێکردنە سەریان و کۆنترۆڵکردنی رێکخستنیان وەکو ئەرکێکی خۆیان دەستنیشان کرد بوو. لە نزیکەوە ئەنجامدانی هەڵسەنگاندن و شیکردنەوە سەبارەت بەم دوو ناوە پڕ لە پەند و ئەزموون دەبێت. عەبدوڵڵا ئۆجەلان کە بەشێوەیەکی سروشتی رۆڵی رێبەرایەتی گروپ دەبینێ، لە نزیکەوە لەگەڵ ئەم دوو ناوە پەیوەندیدار بووە. هەردووکیشان خەڵکی شاری دێرسیمن. شاهین لە بنەماڵەیەکی پاشماوەی یاخیبوونی دێرسیم دێت کە تا دوارادە داڕووخێنراوە. هەرچی کەسیرەیە، بە پێچەوانەوە سەر بە بنەماڵەیەکە لەسەردەمی یاخیبوونەکاندا شانبەشانی هێزەکانی ئاسایش کاری کردووە و تاگەیشتۆتە ئاستێك لە بەرزترین ئاستەکانی کۆمار، لەلایەن ئینۆنۆ سوپاسنامەی پێشکەش بکرێت و لەم چوارچێوەیەدا لە ناوچەکەدا زۆر بە باشی دەناسرێت. هەردووکیشیان لە دەوروبەرەکانی زانکۆ وەکو چەپڕەو دەناسران. لەکاتی دابڕان لە چەپی تورك پەیوەندی لەگەڵ هەردووکیان بەسترا، بۆ تەقلیبوون بەو گروپەی بەناوی کوردستان ئاواکراوە گونجاو بینراون و رازیکران. *

ئەم پێکهاتەیە ئەندامەکانی دیکەی گروپی نارەحەت دەکرد.کەسایەتی لۆمپەنیزمی شاهین و بنەماڵەی کەسیرە کە رۆڵی لە یاخیبوونەکانی کوردان باش دەناسران، هۆکاری سەرەکی بوون . بەلام باوەڕبوون بە کەسێتی تاك و گوێنەدان بە بنەماڵەگەریتی تایبەتمەندییەکی سەرەکی گروپی نوێمان بوو. هەروەها ئەندام وەرگرتن لەهەموو توێژ و ناوچەکاندا، پێویستیەکی ولاتپارێزی و یەکێتی بوو. تەنانەت لە رێگای ئەندامی لە پێشینەی بەریشە تورکی وەکو حەقی و کەمال پیر هەرلەسەرەتاوە هەوڵدراوە برایەتی نێوان گەلان گەرەنتی بکرێت. رەوشی کەسیرە، بەگشتی سەبارەت بە واتادانی ئازادی و یەکسانی رەگەزی ژن و بەتایبەتیش باوەڕی و

متمانەدان بە لاوانی چەندین بنەماڵە، تادواڕادە وەك هەنگاوێكی گونجاو دەبینرا، بۆ سەرەتا نیازی باش پێویستیەكی دەست لێبەرنەدراو بوو.

ئەم تایبەتمەندیانە سەبارەت بە یەكێتی ڕەگەزی، ئایدیۆلۆژی و سیاسی عەبدوڵڵا ئۆجەلانی بەرەو هەڵسەنگاندنێكی نزیك لە واقیعی و تەنانەت لەگەڵ كەسیرە بەرەو ئەزموونی پێكەوەنانی خێزانی برد. لەگەڵ ئەوەی ئۆجەلان لە هەست و هزرەكانیدا شێلگیر بوو، بەڵام سەبارەت بە كەسیرە تاوەكو ئەمڕۆش بە ڕوونی و ئاشكرایی دەرنەكەوتووە كە ڕاستی چییە. بەلانی كەم ئەم پەیوەندیە هێندەی ڕووداوی حەقی قەرار كاری لە PKK كردووە. هەڵسەنگاندنی پەیوەندی كەسیرە وەكو سیخوڕێكی سادە دەبێتە هەڵوێستێكی ناتەواو. هەروەكو دەزانرێ ئەم كەسە گرفتێكی وەهای نەبوو بڵێ "ئیللا تەفلی گروپ دەبم". زۆر بە باشی بینراوە كە لە مەسەلەی هاوسەرێتیدا ئارەزوومەند نەبوو، ڕێبازێكی مردووی پەیڕەو دەكرد. دەتوانرێ ئاماژە بەوەش بكرێ كە ڕۆڵی سیخوڕێكی ئاسایی نەبوو. سەرباری ئەوەی یەكێكی ژیر و خاوەن تێڕوانینی ڕاست بوو، چالاكانە بۆ گروپ كاری نەدەكرد، بەرامبەر بە كەسایەتیە گرنگەكانی گروپ لە سەرووی هەمووشیان بەرامبەر ئۆجەلان هەڵوێستی زراف و وروژاندنی نیشاندا، بە شێوەیەكی گشتی كەوتە نێو هەڵوێستێك وەكو سارد و سڕی مار وابوو، بەچەمكێكی نارازی پەیوەندی دەجولایەوە، هەڵوێستێكی پەیڕەو كرد تەنانەت بژاردەترین پیاویش مسۆگەر بۆ ماوەی ٢٤ كاتژمێر تەحەمولی نەدەكرد، سەرباری ئەوەی تواناكاریە هزریەكەی بەرفراوان بوو، لەڕێگای جۆشی شۆڕشگێڕیەوە ئەمەی نیشان نەدا، كاتێك ئەمەش بێنینە بەرچاوان كە ئاستی گشتیش بەگوێرەی خۆی خاوەنی تایبەتمەندێتی وروژاندن بوو، مسۆگەر دەرهەق بەم كەسایەتیە پێویستی بە هەڵسەنگاندنی قووڵ هەیە. هەروەها بۆ یەكەمین جار لە ناو ڕێكخستندا شاهین گەنجێكی بەناوی جەلالی مەلاتیای بەشێوەیەكی دڕندانە كوشت، هەروەها لەبەر ئەوەی كچی موختارێكی پازارجك بەناوی عایشە لەگەڵ كوڕە گەنجێك كەوتبووە نێو پەیوەندیەكی نابەجێ، كەسیرە لە بیقاع تاوەكو مردن بەندی كردبوو، تەنانەت دواتر ئەم هەڵوێستە لەناو PKKدا بوو بە ڕێبازێك.

هەروەكو دەزانرێ شاهین پێشەنگایەتی ئەو ئەشكەنجە كردنەی دەكرد كە لەسەر زیندانیان پەیڕەو دەكرا. هەروەكو دەزانرێ ئەم هەڵوێستە ڕۆڵێكی دیاریكراوی هەبوو لەوەی كە كادیرەكانی ئاستی ڕێبەرایەتی وەكو مەزلوم، خەیری، كەمال پیر و فەرهاد كورتای و چەندین كادیری دیكە بە مانگرتن تا مردن و ئاگرلەخۆبەردان كۆتایی بەژیانی خۆیان بێنن. وەكو پیلانگێڕیەكی ناوخۆش ڕۆڵی لە پاكانەكردنی سەدان كەسی دیكەش دا هەیە. ئەم ڕەوشە ململانێیەكی دوولایەنەی لەگەڵ خۆیدا هێناوە و ڕێگای لەپێش ئەوە كردۆتەوە بەشێوەی بەرخودانی زیندانی دیاریبەكر وەڵامبدرێتەوە. ئەوەی سەپێنرا پیلانگێڕیەكی كلاسیك بوو. ئامانج تەواوی زیندانیان و ڕەنگدانەوەكانی دەرەوەی بوو. ڕۆڵی سەرەكی لەوەدا بینی دەوڵەت

بکەوێتە سەر ڕێگایەکی بێبەزەییانە. بەڵام تەنانەت دوای بیست ساڵیش بەرخودانی زیندانی دیاربەکر وەکو دابونەریتێکی زیندوو بەردەوام دەکات، ڕۆڵی مێژوویی خۆی لە گۆڕانی سیاسەتی زیندان بینیوە. وەکو گوزارشتێکی سەمبوڵی هەڵوەستەی پتەو و دروست جێگایەکی مێژوویی لە ڕێبازی ئازادیخوازی گەلەری PKKدا گرتووە. ڕۆڵێکی دیاریکراوی مانگرتن تا مردن لە هەنگاونان بەرەو هەڵمەتی ١٥ی ئاب هەبووە. ئەگەر ئەم مانگرتن تا مردنە نەبووایە، ئەوە ئەنجامدانی هەڵمەتێکی بەم شێوەیە نەدەکەوتە ڕۆژەڤەوە. هەروەکو چۆن یادی حەقی قەرار ئێمەی بەرەو ڕاگەیاندنی PKK برد، ئەوا پابەندبوون بە یادی بەرخودانانی زیندانی دیاربەکریش ئێمەی بەرەو ڕاگەیاندنی هەڵمەتی ١٥ ی ئاب برد.

لەراستیدا ئەم نموونانە پڕ لەپەند و ئەزموونە سەبارەت بەوەی ئەو دوو پیلانگێڕیە چۆن کاریگەرییان کردۆتە سەر مێژوو. ئەگەر لەژێر ناوی دەوڵەت کارەکان بە مانگرتن تا مردن نەگەیەنرابایە و هەندێ تەسلیمکار بەئامانجی وروژاندن بەکار نەهێنرابووایە، هەرحاڵێ زیاتر ڕەوشی دیموکراتی و ئاشتی لە وڵات تێکنەدەچوو؛ بەڵکو ئەگەر لەسەر بنەمای قازانجکردن هەڵوەستە کرابووایە، ئەوا هەر زوو دەوڵەت و دیموکراسی بەسوودمەند دەردەکەوتن. ئەوا هەردوو لایەنیش دووچاری هێندە ئێش و ئازار و زیان نەدەهاتن. سیاسەتی باوی قڕکردن لە ڕۆژهەڵاتی ناوین، بێبەشی لەتەبایی و ڕێککەوتنی دیموکراتییانە، زۆر بە گرانی لەسەر دەوڵەت، گەل، لەسەر ڕێکخستنەکان لەسەرووی هەمووشیانەوە PKK وەستاوە.

کاریگەرییەکانی کەسیرە لەو قۆناخەدا زیاتر پێویستی بە هەڵسەنگاندن هەیە. دەبێ ئەنجامێکی هەناسەبڕینی بنکەکەمان لەدەرەوەی وڵات و گەرمنتێکردن و پتەوکردنی کاریگەری ڕێبەرایەتی خۆی بێت. هەمان ئەو ڕەوشەی لەئەورووپاش بەردەوام بوو، دواتر خوازرا بۆ پارچە بوون بگۆڕدرێ. ئەو پەیوەندییەی لەگەڵ پارێزەر حوسێن یلدرم پێشیخستە هەڵوێستی یلدرم لە زیندان، هەڵوێستیان بەرامبەر سەرۆکایەتی، پڕن لەو لایەنانەی پێویستییان بە ڕۆشنکردنەوە هەیە. ئاشکرایە کە هەوڵیاندا ڕۆڵێکی گرنگ لە پاکتاوکردنی PKK دا ببینن. بەڵام ئایا ئەمەیان لەپێناو دەسەڵاتخوازی ئەنجامدا یاخود بۆ ئاواکردنی PKK یەکی دیکە یان وەکو سیخوڕێك ئەنجامیان دا، سەرباری چەندین سەرەداوی کە هەن، ئەمانە بابەتێکن پێویستییان بە لێکۆڵینەوە هەیە.

دەتوانرێ هەمان شت دەرهەق بە عەلی چەتینەر، محەمەد شەنەر، سەلیم چەرو قایاش بگووترێ. هەروەکو بڵێی چەتینەر شێوەی پیاوێتی کەسیرە بوو. سەرباری ئەوەی تواناکاری هەبوو، هەڵوێستی موحافەزەکار و بەگومانی، لەسەردەمی تاوانی پاڵمە هەردووکیان بەیەکەوە لەگەڵ یلدرم بەڕێوەبەرایەتی ئەورووپابوون، سەرباری ئەوەی ڕۆڵێکی فەرمی PKK لەم ڕووداوەدا نەبوو، بەڵام هێشتنەوەی مەسەلەکە بە گومان و تەمومژاوی ئەوا پێشکەشکردنی بەهانە بە تێزی "شوێنپەنجەی کوردان"، لایەنە تاریکەکانیان پێکئێنێ. سەلیم چەروقایا و

شەنەر هەروەکو بڵێی هەڵوێستی شاهین دۆنماز و یلدرم مەرکیت یان نیشانداوە؛ لەجیاتی ئەوەی لە بەرەی بەرامبەر هەڵوێست بەرامبەر رێکخستن نیشانبدەن. خواستوویانە لە ناوەوە دەست بەسەر رێکخستندا بگرن و ئەمەیان زۆر بە رق و کینەوە ئەنجامداوە. بەشێوەیەکی بابەتی روون و ئاشکرایە لەژێر ناوی PKK یەکی جیاواز بەرەو پاکتاوکاری ئاراستەیان گرتووە. ئەو لایەنەی پێویستە بزانرێ، لەگەڵ هەڵوێستی تەسلیمکارانەی شاهین لەزیندان، ئەوەیە کە ئەم دووانە چۆن و تا چ رادەیەك خواستوویانە درێژە بە رۆڵی تەسلیمکاریەکی نهێنی و شاراوە بدەن. ئەو پەیوەندیانەی لە رێگای وڵاتانی ئەوروپا بەرێوەیان دەبرد، ئەو پرسەش لەگەڵ خۆیدا دێنێ ئاخۆ گرێدراوی کێ بوون. ئاشکرایە گەلێك لایەنیان هاوشێوەی ئەو رێبازەیە کە چەتین گۆنگۆر بەرێوەی دەبرد. بەشێوەیەکی مێژوویی لەهەوڵ و کۆششەکانی ئەڵمانیا بۆ زاڵبوون و کاریگەربوونی لەسەر کوردان و رۆژهەڵاتی ناوین و تورکیا بەتایبەتی، دەبینرێ کە لەئاستێکی بەرزدا لەم جۆرە کەسایەتیانە خاوەن دەرکەوتووە و دەستی گرتوون. پێ بە پێ روونبۆتەوە کە ئەم هەڵوێستە هیچ پەیوەندییەکی بە مافەکانی مرۆڤ و هەڵوێستی دیموکراتییانەوە نییە، بەڵکو کارێکە وەکو لقێکی پارچەکانی تێکۆشانی خۆی رێکیخستووە.

زۆر بەسانایی دەرك بەوە دەکرێت کە ئەڵمانیا دەخوازێ بەرەیەکی کوردان لە PDK و PSK و پاشماوەکانی PKK (ئەوانەی دابڕاون) پێکبێنێ و تەنانەت لەچوارچێوەیەکی ئاشکراشدا نیشانی بدات. سروشتیە کە سەبارەت بەم بابەتە لەگەڵ تورکیا و دەوڵەتەکانی هەرێمیش رێکبکەوێت. هەربۆیە کاتێك دەرکی بەوە کرد چۆنی دەخوازێ ناتوانێ PKK کۆنترۆڵ بکات، هەوڵ و کۆششێکی مەزنی لەپێناو قەدەخەکردن و هەڕاجکرن و لەخۆوەگرتنی دا. لە سەرووی ئەم وڵاتانەوە دێت، کە لەم قۆناخە بەدواوە بەرادەی هەرمزێدە هەڵوەستە لەسەرPKK دەکات و لەرێگای فشار خستنە سەری دەخوازێ ئەنجام بەدەست بێنێ. گرنگترین یارمەتی دەداتە ئەوانەی دژی PKKن و رکابەرایەتی دەکەن. تواناکاری مەزن بۆ ئەو گروپە کوردیانە دابین دەکات کە نزیکی خۆیەتی. بەشێوەیەکی گشتی لەسەر رێبازی باڵادەستی مێژوویی لەسەر رۆژهەڵاتی ناوین، میزۆپۆتامیا و تورکیا دەجوڵێتەوە. هەروەها بەر چاوە کە بەپرەنسیپ هەڵوەستە سەبارەت بە مافەکانی مرۆڤ و دیموکراتیزە بوون ناکات و زیاتر وەکو ئامرازێك بەکاری دێنێ.

هەروەها ئەمریکا و ئینگلتەراش دەخوازن رێبازێك و بلۆکێکی کوردانی پابەند بەخۆیان پێك بێنن. YNK وەکو هێزێکی جێبەجێکرن رادەگرن.لەبەر ئەوەی پێشکەوتنی PKK لەگەڵ بەرژەوەندیەکانی ئەم لقەش کۆك نییە، بەتایبەتی لە ۱۹۹۰کان بەولاوە بەدواداچوونێکی چڕیان پەیڕەو کرد، کاریگەرییەکانی خۆیان لەسەر ئاستی جیهان لەم پێناوەدا بەکارهێنا و ئەمەش لە تەسلیم کردنەوەی سەرۆکایەتی PKK بە دەوڵەتی تورکیا زۆر بە ئاشکرایی

دەرکەوتەڕوو. کاتێك دەوڵەتانی هەرێم نەیانتوانی PKK کۆنترۆڵ بکەن، ئەمریکا و دەوڵەتە لەپێشەکانی ئەورووپا کە لێکدانەوەیان لەسەر ناوچەکە هەیە ناچاری هەڵوێست نیشاندان. هەربۆیە دوودڵیان لە پێشکەشکردنی یارمەتی ماددی و دیپلۆماسی بۆ ئەوانە نەکردووە کە رکابەرن یاخود لەنێو PKKدا تەسفیەکاری دەکەن. دەستیان لە هەوڵەکانیان بەرنەداوە بۆ ئەوەی رێکخراوێکی دروستکراوی خۆیان لە جێگای PKK بەجێبکەن. وەکو ئەنجام لەم قۆناخەدا سەرنەکەوتنی سەرکوتکردنی PKK و خولقاندنی ئەنجامێکی وەها لە رێگای هەڵمەتی ١٥ی ئاب کە تورکیای تێپەڕ دەکرد، وایکردووە گەلێك لە وڵاتان کە لێکدانەوەیان لەسەر جولانەوەی کوردان هەیە هەڵوێست بەرامبەر PKK نیشان بدەن. هێزە جیاوازەکان گرنگیان بەوە دەدا کە ئیرادەیەکی ئازادی کوردان دەرنەکەوێت.

دەوڵەتانی هەرێمیش لەجیاتی دانان بە ئیرادەی ئازادی کوردان، هەوڵێکی مەزنیان لەپێناو کۆنترۆڵکردنی دا. پەیوەندییە تاکتیکییەکان لە ناوچەکە بەدواوە دەرفەتی بە PKK نەداوە. ئەگەر نەکەوتوونەتە نێو هەڵوێستێکی دژوارتریش، بۆئەوە دەگەڕێتەوە کە بەرژەوەندییەکانیان رێگای پێنەداوە. ئەگەرنا نەتەوەپەرستییەکی پشت بەستوو بە نکوڵیکردن لەلایەن هەموویانەوە بە بنەما گیراوە. هەر دەوڵەتێکی دراوسێی کوردان، بەبێ ئەوەی دان بەئازادییەکەی بنێن، گرێدانی"کوردی خۆی" بەشێوەیەکی توندوتۆڵ بەخۆیەوە وەکو سیاسەتێکی سەرەکی درێژە پێداوە. بەرادەی هەرزێدە ئەم سیاسەتانەش لە هەڵوێست بەرامبەر PKK دا دەردەکەوێت.

سەرباری تەواوی ئەم پیلانگێڕییانەی ناوەوە و تەسفیەچێتی و ئەو فشارەی لەدەرەوە پشتگیری لێدەکرێت و سیاسەتەکانی سەرکوتکردن و پلیشاندنەوە، نەتوانراوە ئیرادەی ئازادی PKK سەرکوت بکرێت. سەرەڕای ئەوەی هەژێنراوە، یاری بەهاوسەنگییەکەی کراوە و هێزی لە دەست داوە، بەڵام PKK شانسی بوون بەئیرادەی ئازادی گەلی کوردی بەزیندوویی هێشتۆتەوە. بەرخودانی قارەمانانەی زیندان ئامانجی پاراستنی کەرامەتی مرۆڤ بوو. ١٥ی ئاب واتای سووربوون لەسەر ئیرادەی ئازاد لەخۆوە دەگرێت. بۆ یەکەمین جار خۆ سەپاندنەکانی ناوەوە و دەرەوەی رێکخراو و کەسایەتییە بەکرێگیراوەکان پووچەڵکراوەتەوە و هەوڵەکانی پلیشاندنەوە و کۆنترۆڵی دەوڵەتە بچووك و مەزنەکان پووچەڵکراوەتەوە، وەکو ئیرادەی ئازادی گەل لەسەرپێیان ماوەتەوە. ئەم ئیرادە ئازادەی بەهاکەی بووە زیان و ئێشی یەکجار مەزن، وەکو مەزنترین دەسکەوت لەم قۆناخەدا جێگای خۆی لە مێژوودا گرتووە.

٣ـ ١٩٨٨ ـ ١٩٩٨ چەتەگەرێتی و دەستێوەردانی ئیمپریالیستی لەئاستی جیهاندا، سەرباری هەموو داسەپاندن و فشارەکانی ناوەوە و دەرەوە بەردەوامکردنی ئیرادەی ئازادی گەلی کورد لەژێر پێشەنگایەتی PKK، تێکۆشانی دژوارتر کردووە. ئەو مەیلانەی لە ناوەوە بەرەیان سەند و خواستیان تێکۆشانی چەکداری لەدژی رێباز و ئەخلاق و بەگوێرەی هەڵوێستە ئارەزوو

مەندانەکانیان و ئاخوازیە سیاسیەکانیان بەکاریان بێنن، ئیتر سەریان هەڵدەهێنا، ئەو کادیرەی بە گوێرەی پێویستییەکانی تێکۆشانە پەرەسەندووەکە خۆیان پێ نەگەیاندبوو، تایبەتمەندێتیەکانی کۆمەڵگای باشفەرۆ و ئەو کەسایەتیانەی بە سەرەرۆیی چینی باڵادەست چەوسانەوەیان دەکرد و تازە وشیار دەبوونەوە، هەڵوێستە پیلانگێریەکانیان کردبوو بە شێوازێکی سەرەکی لەناوبردنی ئاستی سیاسی و ئایدیۆلۆژی رێکخستن. لە بەکارهێنانی کاریگەری دڕندەگەرایی شاخ و ئاستەمی چاودێری و بەکارهێنانی چەك بۆ هەڵوێستە نارەزوومەندییەکانیان هیچ سنوورێکیان نەناسی. لە جیاتی بە سوپابوون لە پێناو چەتەگەرێتی پێشبڕکێیان دەکرد. بەبێ ئەوەی جیاوازی لە نێوان تاوانبار ـ بێتاوان بکەن، بەبێ ئەوەی بکەونە نێو سیستەمی شەڕ، شێوازێکی چالاکی بوو بە شێوەی سەرەکی کە لە جیاکردنەوەی زەحمەتی تێدا بینرا. رەوشێکی گەندەڵی وەها هاتەناراوە کە بەهیچ شێوەیەکی شەڕ ناچێت. هەمان رەوش لەلایەن ئەو هێزانەش پەیڕەو دەکرا کە دژی گەریلا بوون و بە کۆنتراگەریلا ناودەبران.

تەنیا پابەندکردنی ئەم پەرەسەندنانە بە بەکرێگیراویتی باو و کاریگەرێتی نوێنەرەکەی کە PDK یە، دەبێتە روونکردنەوەیەکی ناتەواو. دوو هۆکار رۆڵی گرنگ لەوەدا دەبینێ: یەکەمیان، ئەو بنکەی شەرڤان و کادیرە دڵسۆزانەی کە بەرامبەر ئەرکە سەختەکان بەپێی پێوست خۆی پەروەردە نەکردووە؛ دووەمیان، هەوڵەکانی تەڵەکەبازی وردەبۆرژوا کە ئەمەی وەکو هەلێك بینی و خواستی PKK بکاتە رێکخستنێکی جیاواز، هەروەکو خۆیان مەزەندەی دەکەن لادێیەکان دەرفەتی ئەوەیان دەست کەوتووە دەسەڵات لەدەستی رۆشنبیران دەربێنن.

کاتێك نەتوانرا وەڵامی ئەو ئەرکانە بدرێتەوە کە لەقۆناخە زەحمەتەکاندا قات بە قات قورستر ببوو، ئەوا پێویستە دەرکەوتنی رەوشی بەمجۆرە لەهەموو دەزگایەکدا چاوەڕوانی بکرێت. بەتایبەتی لەو زەمینانەی شێوێنراوە و بەشێوەیەکی بەرفراوان پیلانگێریەکانی تێدا دووبارە دەبێتەوە، ئەوا دەرکەوتنی ئەم جۆرە چەتە و رێگرانە راستینەیەکی دەست لێبەرنەدراوە. تەنیا پەروەردەیەکی سەربازی و ئایدیۆلۆژی مەزن دەتوانێ ئەم قۆناخە تێپەڕ بکات. بەڵام دیسان ناتوانرێ رۆڵی هەوڵە بە ئەنقەستەکانی پیلانگێری و یارمەتی بەردەوامی هێزە بەکرێگیراوەکان و رۆڵی PDKکان لەمەدا بچووك بکرێتەوە. دەکرێ لەگەوهەری خۆیدا ئەمە وەکو تێکۆشانێکی چینایەتیش ببینرێ. چەتەگەرێتی و PDK سەبارەت بە کۆسپ خستنە پێش بە سوپایی بوونی گەریلا رۆڵیان لە تەواوی هێزەکانی دیکە زیاترە. لەسەدا نەوەدی زیانەکانی ناو شەڕ و پێکدادانەکان کە بێ واتا و نابەجێ بوون ئەنجامێکی ئەم لەرێ لادانەیە. تێکۆشانێك توانای قازانجکردنی هەبوو، بەلایەنی کەم تێکۆشانی ئازادی کە لەساڵی ٩٢ دا دەیتوانی رێگا لەپێش هەنگاوی دیموکراتییانە بکاتەوە. کراوەتە قوربانی ئەو چەتەگەرێتیەی کە لەهەردوو لایەن رێگای لەپێش زیان و ئێشی مەزن و بێ واتا کردۆتەوە. لە

خراپەکاریەکانی ئەو ساڵانەی دەوڵەت و PKK ش لە رێگای خۆیان دەرکەوتبوون، رۆڵی چەمك و کرداری چەتەگەرێتی یەکلاکەرەوە بووە. دەوڵەتیش هێز و بوێری لەمە وەرگرتووە و وایزانیوە سەرکەوتنی بەدەست هێناوە و کەوتۆتە نێو پێشێلکاریەکانی یاسا و بەلانی کەم لەقۆناخی حکومەتی چیللەر دا بەپێی زەهنیەت لارێیی و پێشێلکاری یاسا کراوە، کە لەهیچ قۆناخێکی مێژوودا نەبینراوە.

لەکاتێکدا لەنێو پێکهاتە چەکدارەکەی PKK دا ئەم پیلانگێری و لارێیانە لەئارادا بوو، چەتە تاوانبارەکانی بە دەمامکی حزب الله بەردەپۆش کراون لەسەر سەری گەلی وڵاتپارێزدا بالأدەست کراون. بەهەزاران تاوانی درندانە لەرێگای ئەم چەتانەوە ئەنجامدراون. نزیکەی ٤ هەزار گوند و کوێستان چۆڵکراون، لەرێگای برسێتی و تاوانەکان هەڕەشە لەگەل کراوە، هەوڵدراوە کوردستان چۆڵ بکرێت. ئەم تاوانانەی بە نهێنی بەڕێوەبراون و بەشێکیان لەلایەن کەسانی تایبەتەوە و تاڕادەیەکیش بەبێ ئاگاداری دەوڵەت بەڕێوەبراون، درندانەترین لایەنی پیلانگێری نیشاندەدەن. کاتێك شوێنپێی ئەسپ و سەگ لەمەدا تێکەڵ بەیەکتری بوون، زەحمەتە بەشی هەریەك لە دەوڵەت، هێزەکانی ناوخۆ و ناوەندە خۆجێیە پاشڤەڕۆکان دەستنیشان بکرێت. بەڵام مسۆگەرە ئەمە یەکێك لەقۆناخەکانی ئەو پیلانگێڕییە پێکدێنێ کە دژ بە گەلی کوردی وڵاتپارێز و دڵسۆز پیادە کراوە. ئەو قەیرانەی تاوەکو ئێستا لەتورکیا قووڵ دەبێتەوە و بەردەوام دەکات بناخەکەی بەرهەمی ئەو قۆناخەیە.لەرێگای ئابووری شەڕی تایبەت، هێزی بەرژەوەندیخوازی، ئەو پیلانگێڕیانەی هیچ بەرپرسیارێتیەکی کۆمەڵایەتیان نییە. قۆناخێك بەفیڕۆ چوو کە لەڕاستیدا دەکرا لەمێژوودا بکرێتە قۆناخی برایەتی گەلان و ئازادی. قۆناخی ٢٨ ی شوبات کە وەکو کاردانەوەیەك بەرامبەر ئەو قۆناخە پێشکەوت، لەڕاستیدا هەنگاوێکی رەستۆڕاسیۆنە کە نیوەچڵ مایەوە و بەتەواوی پراکتیزە نەکرا، جموجۆڵی راکێشانی دەوڵەتە بۆ سەر رێبازی رەوا کە لەرێ دەرکەوتبوو. لەو قۆناخەدا لەرووی ئایدیۆلۆژیش دەوڵەت دەبوو بە کۆماری تەریقەتەکان. کۆمار دەکەوتە رەوشێك بەتەواوی ئەو پرەنسیپەی عەلمانی لەدەست بدات کە بەخۆیشی ناتەواوە. زۆر لەپرەنسیپی عەلمانی و مافپەروەری دوورخرابۆوە. بێگومان ئابووری لە قۆناخی قەیرانێکی هەمیشەیی قووڵدا بوو.

بەناوی PKK وەڵامدانەوەیەکی ئەرێیانە بۆ هەنگاوە ئەرێیەکانی ٢٨ی شوبات هەڵوێستێکی لەجێی خۆیدا بوو. ئەگەر دیالۆگ پێشبکەوتبووایە، دەشیا زۆر بەخێرایی ئاساییبوونەوە بەدیبێت. ئەمجارە ئەو کێوماڵانەی لەسەر ئاستی جیهان رێکخران و بەئامانجی خنکاندنی PKK و سەرۆکایەتیەکەی بوو دەرفەتی ئەمەی نەدا. لەڕاستیدا بۆ جارێکی دیکە تورکیا بۆ رێبازی ١٩٢٥ راکێش دەکرا. بۆ ئەوەی ئێراق ببێتە بەشی ئەمریکا و ئینگلتەرا، هەروەکو لەساڵی ١٩٢٥ ئەنجامدرا، سەرەتا زێدەڕۆیی لە مەزن نیشاندانی بزاڤی کورد دەکرێ و وەکو هەڕەشە نیشاندەدرێ، دوای ئەوەی هەموو قەرەبوویەك لە ئەنقەرە وەردەگیردرێتە ئەوا

نەهێشتنی و قڕکردنی بزاڤی ئازادی گەلی کورد PKK و سەرۆکایەتیەکەی و تەواوی جەماوەرە وڵاتپارێزیەکەی چاوی لێ دەپۆشرا. ناوەندی کوردانی بە کرێگیراو کە دەخوازرا لەجێگای ئەوە دابنرێت، YNK و PDK لە سەر هێڵی ئەنقەرە ـــ واشنتۆن پەروەردە دەکران و ئامادە دەکران.

لە راستیدا پیلانگێڕی زۆر بەرفراوان بوو، گومان لەوەدا هەبوو کە لە بەرژەوەندی تورکیادا بێت. هەروەکو دەزانرێ لە رێگای ئاگربەستی یەکلایەنە PKK ئامادە بوونی خۆی بۆ رێککەوتن دیار کردبوو. دەتوانرا لە رێگای دیموکراتیزەبوون و بەبێ ئەوەی لە رێگای میانەی ئیراقەوە تورکیا تەنگەتاو بکرێت هەنگاو بۆ چارەسەریەکی برایانە بهاوێشترابووایە. ئەم هەڵوێستە لەگەوهەری خۆیدا بەگوێرەی بەرژەوەندی ئەو توێژانەش نەبوو کەلەسەر بنەمای بەرژەوەندیخوازی شەڕ ژیانی خۆیان بەسەر دەبرد. ئیسرائیل بۆ ئەوەی تورکیایەکی تەنگەتاو بەخۆیەوە پابەند بکات، ئادوارادە دژی PKK کەوتەکار. تورکیا بە تێڕوانینێکی پڕ لە هەست و سۆزداریانە تەماشای PKK ی دەکرد. وەکو گەورەترین هەڕەشە و مەترسی دەزانی، خۆی گەیاندبووە خاڵێك هەموو قەرەبووێك بدات. ئەو ناوەندانەی لەناوەوە و دەرەوە پشتیان بەبەرژەوەندیخوازی دەبەست هێندە وێڵی ئەم سیاسەتە ببوون و تێیەوە گلابوون، لە شەوێکدا بانکەکان پڕ دەبن، لەهەمانکاتدا هیچی تێدا نامێنێ و بۆش دەبێ. پەنا برابووە بەر ئابووری تالانکاری. هیچ حکومەتێك بەبێ ئەوەی لەمە نەخوات، نەیدەخواست دەست لەم شەڕە بکێشێتەوە. زەمینە و رەوشیش بۆ ئابووریە بەهێزەکان و دەوڵەتە بەهێزەکانی رۆژئاواش لەباربوو کە دەیانخواست تورکیا بەخۆیانەوە گرێبدەن. PKK و گەلی کوردی وڵاتپارێز کە دەکرا بە قوربانی بەرامبەر قازانجە شیرینەکەیان هیچ نەبوو. کوردانیان بە مرۆڤ لەقەڵەم نەدەدا تاوەکو مافیان هەبێت. بە تیرۆریست راگەیەنرابوون. رۆژئاواش پشتگیری لەمە کردبوو.

بەکرێگیراوە باوەکان و نەتەوەپەرستی بۆرژوای سەرەتایی کە بەرامبەر PKK لەنێو پاشەرۆیەتییەکی مەزندا بوون، ساتێك زووتر چاوەڕوانی لەناوچوونی PKK بوون. ئەمریکا و ئیسرائیل، بە پیلاننامەیەك کە ناوەندەکەی بریتانیا بوو لەسەرتاسەری دونیا کەوتبوونە ئینزارەوە. کاتێك بەرەو ساڵی ۲۰۰۰ دەچووین لە دوا پیلانگێڕی دژ بە عەبدوڵڵا ئۆج ئالان لە بوارەکانی ئابووری، هەواڵگری، دیپلۆماسی و سەربازی خستبووە گەڕ. ئەمجارە لە کەسایەتی عەبدوڵڵا ئۆج ئالان وPKKدا کۆتاییهێنان بە ئیرادەی ئازادی کوردیان خستبووە مێشکی خۆیانەوە.

دەتوانرێ بە شێوەیەکی قووڵتر ئەم پیلانە روونبکرێتەوە. بەڵام لە قۆناخەکانی دوایی ئاشکرا بووە کە لایەنێکی ئامانجی ئەمەش تێوەگلانی تورکیا بوو بۆ نێو قووڵایی قەیرانێك. کاتێك ئەو هەڵوێستە چاوەڕوانکراوەی یاخیبوون نیشاننەدرا، بە پێچەوانەوە هەڵوێستێکی هەرە نەرمی ئاشتی برایانە و رێککەوتنی دیموکراتییانە نیشاندرا، وایکردووە ئەم پیلانگێڕیە

ئیمپریالیستیانە بەسەرکەوتنی تەواو نەگات.

ئەو پیلانگێڕیە سەرتاپاگیریەی دژی PKK و گەلی کوردی وڵاتپارێز و عەبدوڵڵا ئۆجەلان ئەنجامدرا، دواترین و گەورەترین پیلانگێڕی سەدەی بیستەم پێك دێنێ. لەسەر ئاستی جیهان رێکخراوە. دەرك بەوە کراوە کە یەکێك لە ئەنجامە هەرە گرنگەکانی تەختکردنی تورکیایە. جولانەوەیەك کە وڵاتپارێزە و برایەتی گەلانی وەکو هەڵوێستێکی سەرەکی دیارکردووە، ناهێڵێ وەکو کەرەستەیەکی ئەم گەمانە بەکار بهێنرێ. بەپێچەوانەوە ئازادی و برایەتی گەلان چی پێویست بێت ئەوە ئەنجام بدات، پێویستیەکی رێزگرتنە لە گەوهەر و پابەندبوونە بە گەل. تاوەکو PKK لەو ئەشکەنجە و تەسلیمکاریەکانی زیندان و پیلانگێڕی و چەتەگەریتی لە ریزەکانیدایە رزگاری نەبێت، رێزگرتن بەرامبەر خۆی بەدەست ناهێنێ.

PKK بۆ ئەوەی لەهەمانکاتدا لەو رێبازە دوور بکەوێتەوە کە خزمەتی جوداخوازی دەکات، لەرێگای ستراتیژیەکی پشت ئەستوور بە یەکێتی خاکی وڵات و یەکێتی دەوڵەت، لە سەربنەمای رێبازی بەرگری رەوا لەنێو چەمکێکی تەکتیکی پاراستندا پێویستە لە پێناو ئاشتی و رێککەوتنی دیموکراتییانەدا بەجدیەتەوە هەموو پێداویستیەکانی بەرپرسیارێتی جێبەجێ بکات. ئەم قۆناخەی لە ۲۰۰۰ەکان دەستپێکردووە بە قووڵایی بەردەوام دەکات. دەبێ دەوڵەتیش ئەم قۆناخەی تاڕادەیەك ئارامییە باش هەڵبسەنگێنێ؛ بۆ ئەوەی نەکەوێتە نێو نەتەوەپەرستیەکی کوێرانەی هاوشێوەی فەلەستین ـ ئیسرائیل، چاچانستان ـ روسیا، پێویستە هەرچیەکی دەکەوێتە سەرشانی جێبەجێی بکات و رۆڵ ببینێ. دەبێت ئەو ئەرکەی دەکەوێتە سەرشانی جێبەجێی بکات بۆ ئەوەی PKK و ئیرادەی ئازادبووی گەلی کورد لە تورکیادا بکرێتە هێزی دیموکراتی عەلمانییەت و دەوڵەتی مافپەروەری. ئەم رەوشەی سادە و بچووك دەبینرێ لە راستیدا واتادارترین چارەسەری ئاشتی و برایەتی گەلان لە خۆوە دەگرێت.

ئومێدەوارم لە کۆنگرەی هەشتەمدا کە PKK ئامادەکاری بۆ دەکات لەم بارەیەوە کامڵتر و واقیعیانەتر هەنگاو بهاوێژێ. بەمجۆرە PKKیەك کە واقیعیانەتر دەجوڵێتەوە و بەواقیعی خۆی وەڵامی هەلومەرجەکانی دەداتەوە و لەرێگای وەرچەرخان خۆی دەسەلمێنێ، لەهەمانکاتدا بەشێوازێکی هەرە بەهێز هەنگاو دەهاوێژێتە نێو ئەو قۆناخەی کە خۆی نوێکردۆتەوە. لە دوای ساڵی ۲۰۰۰ کوردان و گوزارشتی وشیاری و رێکخستەیی ئیرادەی ئازادییان PKK، کەوتۆتە نێو قۆناخێك کە لەهەموو لایەکەوە پێویستی بە نوێبوونەوە هەیە. جێبەجێکردنی پێویستیەکانی ئەم قۆناخە لە خۆیەوە بەدینایەت. لە میانەی وەرچەرخانێکی رێکخراوانە و وشیارانە بەدیدێت کە لە تەوقی سەر تاوەکو پەنجەی پێیەکان بگرێتەوە. هەربۆیە پێویست دەکات لەمیانەی رێبازێکی رێکخراوەیی و چالاکی بەرجەستە بکرێت کە پشت بە هەڵسەنگاندنێکی بەرفراوانی رەخنەگرانە ببەستێ و مسۆگەر لە بواری کرداریدا گوزارشتێکی تەواو ببینێتەوە و هەموو بوارەکانی ئایدیۆلۆژی، تیۆری، پرۆگرامی، ستراتیژی و تەکتیکی

ـگرێتەوە.

تاوەکو پەندو وانەی پێویست لە رابردوو وەرنەگیرێ و بە شێوەیەکی یەکلایی و بەگوێرەی پێویست ئەرکەکانی قۆناخی نوێ جێبەجێ نەکرێت، ئەوا قۆناخی نوێ لە زاراوەیەکی بێواتا بەولاوە تێپەڕناکات. ئەو ئەرکانەی کە پێویستە PKK پێکیبێنێ و ئەو پەند و ئەزموونانەی ئەمێژووی رابردووی وەربگرێت کە پڕ لە ئێش و زیانی بێواتا، تراژیدیا، کەوتوویی، تەسفیەکاری و پیلانگێڕی و لەدەستدانی دەرفەتی ئازادی، قارەمانێتییە. ئەگەر بەشێوەیەکی کورت و رێبازە گشتیەکانیشی بێت دەتوانین بەمجۆرە ریزبەندی بکەین:

١ـ تاوەکو لەپێناو ئەو ئەرکانەی کە کەوتۆتە سەرشانی، خۆپڕچەککردنێکی ئایدیۆلۆژی پێویست ئەنجام نەدرێت، ئەوا ئەو کارپێسپاردن و بەرپرسیارێتییەی لەبەڕێوەبەرایەتی دیاردەکرێت گەندەڵی و لەرێ لادانی مەزن لەگەڵ خۆیدا دێنێ. ئەو کەسایەتی و یەکینانەی رێکخستن کە حاکمیەتی ئایدیۆلۆژی، یەکلابوونەوەی رێباز، رەوشی ویژدان و ئەخلاق، توناکاری پلاننامە و هێزی بەڕێوەبردن و چاودێری نییە، نابێ ئەرك و بەرپرسیارێتی پێبدرێ. لە کاتێکدا ئەرك و بەرپرسیارێتی پێبدرێ، ئەوا دەرکەوتنی رەوشی خیانەتکاری هەرە خراپ و خراپەکاری کە چاوەڕوان ناکرێت دێتە ئاراوە. هەربۆیە سەرەکیترین ئەرکی ئەم پەندە دەخاتە ئەستۆمان، کە پێویستە هەر ئەرك و دەسەڵاتدانێك بەشێوەیەکی یەکلاکەرەوە سەبارەت بە بابەتەکانی، سروشتی کار، چۆن و تاکەی پێکدێت، پێویستی بە چ تواناکاریەك هەیە، بەچەند کەس پێکدێت و بەرامبەر کێ بەرپرسیارە و بە فەرمانی کێ بەڕێوەدەچێ، پلاننامە دابنرێت و پراکتیزە و چاودێری بکرێت.

٢ ـ سەبارەت بەو چالاکیانەی بەشێوەی تێکۆشانی چەکداری و سەرهەڵدانن و رێگا لەپێش ئەنجام و رووداوی مەزن دەکاتەوە، پێویستە هەزار جار بیر بکرێتەوە، یەکجار ئەنجامبدرێت. لەحاڵەتێکدا بەبێ ئەوەی سافبوون و یەکلابوونەوەیەك سەبارەت بەوە نەبێت کە بۆچی و بەکامە ئامانج، بەرامبەر بە کێ، لە ماوە و فراوانیەکی چۆندا، بەرامبەر بە کێ و چۆن بەڕێوەدەبرێت، پەنا ببرێتە بەر تێکۆشانی چەکداری، ئەوا ناتوانرێ رێگا لە تاوانکاری، گەندەڵبوون و ژێرکەوتن بگیردرێت. تەنیا کاتێك تەواوی رێگا رەواکانی ئازادی و ژیان لەمیانەی توندوتیژی دابخرێت، یاسا و مافپەروەری پێشێل بکرێت، ئەگەر لەبواری کولتووری و کەسێتیدا مردن بەسەر گەلدا بسەپێنرێ، ئەوا نەك تەنیا وەکو پێویستییەك پەنا دەبردرێتە بەر تێکۆشانی چەکداری، بەڵکو مافێکی بەرگری رەوا بەکاردەهێنرێت کە لەیاسای گەردوونی و هەموو دەستوورێکدا دانی پێدانراوە. ئامانجی ئەو شەڕانەی بە شێوازی گەریلا و سەرهەڵدانی چەکدارین، تاوەکو پێویستیەکانی یاسای گەردوونی جێبەجێ دەکرێت، واتا مافی تاك و گەلان جێبەجێ دەکرێت کە بە "مافی سێ ئەوە" ناودەبرێت و گوزارشتی دەستووری یاسای گەردوونیە و لەنێو یاساکانی نەتەوە یەکگرتووەکان جێگیرکراوە و پێویستە لەلایەن تورکیا و

گەلێك وڵاتی دیکەوە گوێڕایەڵی و پراکتیزە بکرێ، ئەوا وەکو شێوەی تێکۆشانێکی ڕەوا بەکارهێنانی ماڤی بەرخودانی پیرۆزی گەلە کە خاوەنی ماڤی دیموکراتی و هاووڵاتییەتی ئازادە. لە کاتێکدا پەنا نەبردرێتە بەر ئەم بەرخودانە؛ لە گەوهەری خۆیدا بەواتای ئەوەدێت کە پێویستیەکانی مافپەروەری جێبەجێ نەکراوە و باوەڕی بە دیموکراسیەت نییە، واتا بەرامبەر بە دەوڵەتی مافپەروەری دیموکراتییانە ئەرکەکان جێبەجێ ناکرێت. پێویستە لەم چوارچێوەیەدا ڕەخنەدان پێشبخرێت.

٣ـ ڕێبازی گەریلایی و یاخیبوونی PKK کە لە ڕابردوودا پەیڕەوی کرد، هەم لە ڕێبازی سیاسی، هەم لەلایەنی ستراتیژی و تەکتیکی سەربازی ماڤی بەرگری ڕەوای تێپەڕ کردووە. واتای ئەمەش ئەوەیە کەوتۆتە ڕەوشێك ئەگەر لە گەوهەریشدا نەبێتە لە ڕواڵەتدا وەکو ستراتیژیەکی سەربازی و پرۆگرامیکی کراوە بۆ جوداخوازی، گەیشتۆتە ئاستی هێرشکردنە سەر هەندێ ئامانجی تەکتیکی کە دەبوایە لە بەرامبەریدا بەرپرسیار نەبێ.

ئەو ڕەوشەی ڕەخنەدان کە پێویستە سەبارەت بە پرەنسیپبوونی ئایدیۆلۆژیەکەی بەرامبەر ئەم ڕەوشە بیداتە سەرلەنوێ بونیادنانەوەی پرۆگرامەکەیەتی بەگوێرەی یەکێتی و یەکپارچەیی خاکی وڵات و دەوڵەت. دروشم و گوزارشتی هەرە سەرەکی ئەمە، پێکهاتەی بەرنامەیەکە سنووری سیاسی هەر وڵاتێك بەبنەما بگرێت کە پارچەکانی کوردستانی تێدایە، لەچوارچێوەی ئەم سنوورانەدا یەکێتی ئازاد بە ئامانج بگرێت. "وڵاتی دیموکرات، پارچەی ئازاد" گوزارشتی بەرنامە و بیانووی سیاسی ماڤی بەرگری ڕەوایە.

هەروەکو چۆن گەیشتن بە چەمکی پرۆگرامیکی بەمجۆرە پێویستیەکی ڕەخنەدانە، ئەوا لە بواری سەربازیشدا پێویست دەکات دەربازی ڕەوشی بەرگری ڕەوای ستراتیژی بێت. ئەو ڕەوشەی ماڤی بەرگری ڕەوا کە تا ئاستێکی گرنگ بەدیهاتووە، پێویستە بە پرەنسیپتر و بەئامادەکاری و پرچەکتر بێت، دەبێت ڕێکخستن هێزێکی وەهای هەبێت کە ئاشتی و دیموکراسی و دەوڵەتی مافپەروەری تۆکمە و پتەوتر بکات. پێویستە ئەوە لێکبدرێتەوە و ڕەچاو بکرێت کە ڕەوشی چەندایەتی و چۆنایەتی، پێگە گرتن، لۆژستیك و پەروەردەکەی، ڕێکخستن و شێوازی فەرماندارێتیەکەی هێندە بەهێزبێت بتوانێ وەڵامی ئەگەری هەر هێرشێك بداتەوە، لەسەر ئەم بنەمایە دەبێ ئەم مافە بەکاربهێنرێ.

هێزی بەرگری ڕەوا نابێتە هێزێك کە کوشتاری بەکۆمەڵ ئەنجام بدات. ئەمە تەنیا دەبێتە هێزی لەناوبردنی خۆی. لەڕابردوو زۆرجار کەوتبوونە نێو ڕەوشێکی وەها. ئەگەر یەکینەکان خاوەن ڕەوشێکی چەندایەتی و چۆنایەتی گونجاو و پێگەگرتن و فەرماندارێتی و لۆژستیك نەبێت و ڕێگا لەپێش لەنێوچوون بکاتەوە، یان دەبێت خۆی بکات بە سڤیل و کۆتایی بەم ڕەوشە بێنێ، یاخود پێویستە پاشەکشێی دەرەوەی سنوورەکانی بکات. هەروەکو چۆن زۆرجار لەڕابردوو ئەنجامدرا بەبێ ئەوەی پێویستیەکانی جێبەجێ بکرێت، ئەوا بڵێن "ئەم گونە هی

من، ئەو گوندەش هی تۆ"، لەم شاخە یاخود تەپۆلکەیەدا جولانەوە وەکو یەکینەی شاوارە مسۆگەر نابێتە شێوەی بەرگری رەوا. ئەم هەڵوێستە هۆکاری لەسەدا نەوەدی خراپەکاری و زیانەکانە. ئەو یەکینانەی دەخوازن لەسەر بنەمای بەرگری رەوا لەناو وڵات جێگیر ببن، ناچارن هەموو مەرجەکانی ئەمە جێبەجێ بکەن. لەرەوشێکی پێچەوانەدا، بەناوی PKK لێی بەخاوەن دەرناکەون و پارەمەتی و پشتگیریان ناکرێت. کاتێك ئەمجۆرە یەکینە و کۆششانە لەنێودەچن، پێشکەشکردنی هەلودەرفەت بۆ ئەو ناوەند و دەوروبەرانەی بەرژەوەندییان لە ئاشتی و دیموکراتیدا نییە، ئەوا تێکۆشانی ئاشتی و دیموکراتییانەی گەل دەخاتە نێو تەنگەتاوی و رەوشێکی زەحمەتەوە.

بەڵام تاوەکو دوایی سیستەمی بەرگری رەوا لە دەرەوەی سنوورەکان نامینێ. هەلومەرجەکانی رۆژگاری ئەمرۆمان دەرفەت بەمە نادات کە بە خێرایی دەگۆڕێت، ئەگەر هەبێت، گەلێك خراپەکاری لەگەڵ خۆیدا دێنێ. هەربۆیە بۆ ماوەیەکی ماقووڵ دەتوانرێ سەبارەت بە هەر پارچەیەك لەپشت سنوورەکان بمێننەوە. لەسەر بنەمای بەرگری رەوا لەگەڵ دەوڵەتی پەیوەندیداردا بەدوای ئاشتی و رێککەوتنی دیموکراتییانەدا دەگەڕێن. ئەگەر وەڵام نەبێت یاخود بەشێوەیەکی پەلامارهێنان بێت، بۆ ئەوەی ئاشتیەکی شەرەفمەندانە و رێککەوتنێکی دیموکراتییانە بەدیبێت، لەو چوارچێوەیەی دیاریکرا بە تێکۆشانی (شەڕی) چەکداری، جێگرتن بەشێوازێکی راست، پاراستنی گەل، بەشداری و رۆڵی خۆی لە بەدیهێنانی ئاشتی و دیموکراتیدا دەبینێ. بەرامبەر بە تەواوی دەوڵەت و هێزە پەیوەندیدارەکان ئەم رەوشە جێی باسە. پایەخدان بەوەی تەنیا دڵۆپێك خوێنیش بە نابەجێ نەرژێت، بەڵام تاوەکو "ماق سەرەکی سێ ئەوە" بەدی نەبێت کە بۆتە پێوانە و رێسای یاسای گەردوونی، ئەوا وەکو ماق بەرخودانی پیرۆز، لەپێناو سەرکەوتنی شەڕی بەرگریدا جێبەجێکردنی هەموو پێویستیەك، پێداویستیەکی سەرەکی رەخنەدانی قۆناخی نوێیە. رەخنەدان واتای ئەوەیە کە بە شێوازێکی سەرکەوتووانە بەو رەوشە دەگەی. لە رەوشی پێچەوانەدا دڵۆکیکردن لەسەر رابردوو هەیە. ئەنجامەکانی کەوتنە نێو رەوشێکە کە بۆ هەموو پیلانگێڕیەك کرابەوە ئەوا لە خیانەت زۆر خراپترە.

٤ ـ ئەگەر بەناوی PKK بێت یان بە ناوی دەوڵەتەکان و هێزەکانی دیکە، لە رابردوو بەشێوەیەکی نهێنی یاخود ئاشکرا بێت، ئامارێکی بەرفراوانی ئەو گەریلا و سەرباز و ژن و منداڵ و پیاوە بێتاوانانە بکرێ کە لە ئەنجامی ئەو چالاکیانەی بەشێوازی یاسایی یاخود پیلانگێڕی و چەتەگەرێتی بەرێوە براون، کوژراون، یەکێك لە ئەرکە سەرەکیەکان ئەوەیە کە دیاربکرێ بەرپرسیارەکانیان کێن، سەبارەت بە چۆنێتی دادگاییکردنیان لە یاسای نەتەوەیی و نێونەتەوەیی و رێکخراوی مافیمروەری و پێویستی سزادانیان، رەخنەدانی پێویست پێشبخرێت و پەندونەزموونی لێ وەربگیردرێت.

تەنیا بە جێبەجێکردنی پێویستیەکانی بەرپرسیارێتی و جددییەت بەرامبەر ئەم ئەرکانە بەدیدێت. تاکو لەلایەن هەموو هێزە پەیوەندیدارەکان ئامارێکی ئەو هەڵوێست و هەڵسوکەوت و چالاکیە تاوانبارییانە نەکرێت کە تەنیا زیانی بەخۆی گەیاندووە و هەموو چەمکێکی ئایینی و ئەخلاقی و سەربازی و سیاسی تێپەڕکردووە، حیسابی ئەو بەشە نەدرێت کە دەکەوێتە سەر ئێمە، تاوەکو حساب لەتەواوی هێز و کەسایەتی و ئاستە دیاریکراوەکان نەخوازرێت کە لەبواری کرداریدا بەمەسەلەکە پەیوەندیدار بوون؛ ناتوانرێ باس لەوە بکرێ کە بەرامبەر مێژوو، گەل، مرۆڤایەتی، یاسا و دیموکراسی بەشێوەیەکی ڕاست خاوەن لە ئەرکەکانمان دەرکەوتین. ئەنجامدانی ئامار و حیساب پرسین لەسەرەوە تا ژێر لەو ڕووداو و کاربەدەستانەی تەنانەت خودی دەوڵەتی خۆشیان خەڵەتاند، کردیان بە چەتە، بردیانە دەرەوەی ڕێبازی یاسا و تاڕادەیەکیش بەشێوەیەکی سنووردار لەلایەن یاسای نەتەوەییەوە بەرەو دادگاییکردن بران، پێویستیەکی ڕێبازی بەرگری ڕەوایە. هەروەکو چۆن نابێ تاوانبارێک لەژێر ناوی PKK جموجۆڵ بکات، ئەوا ئەوانەی بەناوی دەوڵەتیش تاوانیان کردووە نابێ ئاسوودە بن.

ئەگەر یاسای نەتەوەیی ئەو هێزەی نەبێت بەفەرمی حیساب بخوازێت، ئەوا بەناوی یاسای گەردوونی و بەرخودانی پیرۆزی گەل حیساب بپرسین لەو بکوژ و تاوانبارانە پێویستیەکی بەرپرسیارێتییە. حیساب نەخواستن هیچ پەیوەندییەکی بە ئاشتی و دیموکراتییەوە نییە. بەتایبەتی بەرامبەر هەر کەسایەتی، پلە و پایە و هێزێک کە خاوەنی هەڵوێستی "لەسێدارەی بدەین، پارچەی بکەین، لەناوی ببەین"، لەژێر هەر هەلومەرجێکدا، لە هەر شوێن و کاتێکدا پێویستیەکانی بەرگری ڕەوا، چەکداریشی لەناودا بێت، جێبەجێ بکرێت بەڵام لەپێناو سەرکەوتنیش هەموو شتێک بە لایەنە هەرە وردە کارەکانیەوە لێکبدرێتەوە و ئەنجامبدرێ. پێویستیەکی ڕێبازی بەرگری ڕەوای قۆناخی نوێیە. تەنیا بەمجۆرە دەتوانرێ خاوەن لە دەوڵەتی یاسای دیموکراتییانە و کۆمار دەربکەون. ئەگەر لەڕەوشێکی وەهادا نەمێنێت ئەوا دەتوانرێ بۆ بەدیهێنانی هەموو پێوستیەکانی جێبەجێ بکرێت. بەپوختی پێشخستنی ڕەخنەدان بەرامبەر تەواوی هەموو جۆرە خراپەکاری و ڕەوشەکانی تاوانباری کە لەلایەن هەموو هێزەکان ئەنجامدراوە، تەنیا لەڕێگای جێبەجێکردنی پێوستیەکانی ئەمە لەرووی شێواز و کرداریدا بەدیدێت.

٥ ــ ڕێبازی بەرگری ڕەوا لەنێو گەلدا پێویستی بە تێکۆشانێک هەیە کە بەگوێرەی سیاسەتی دیموکراتییانە بێت. جگە لەو پێکگرتنانەی قایمن و دەشێ بپارێزرێن، ئەوا هەروەکو ڕابردوو لەقۆناخی نوێشدا جولانەوە و هەڵسوکەوتکردن بەناوی PKK و بەڕێوەبردنی خەبات و چالاکی سیاسی، جگە لەو شوێنانەی هەلومەرجی دژە دیموکراتی تێدا پەیڕەو دەکرێت، نابێتە هەڵوێستێکی ڕاست. چالاکی و دەزگا بەرفراوانەکانی کۆمەڵی مەدەنی کە بەگوێرەی پێویستیەکانی مافپەروەری و دیموکراسیە، دەبێ وەکو گونجاوترین کار و خەبات

ڕێکبخرێت و بەڕێوەببرێت. لەڕەوشێکی پێچەوانەدا ڕەوشی شێواندن و تێکدان دێتە ئاراوە. وەرچەرخانی PKK بەرەو ئەم گۆڕەپانە، پێویست دەکات بەگوێرەی هەلومەرجی یاسایی، کولتووری و سیاسی هەر وڵاتێك، لە ناو تا دەگاتە پرۆگرام و کردارەکەی پێویستی بە پێکهاتەی سیاسی، کولتووری، ئەدەبی، هەموو لقەکانی هونەرە جوانەکان، ژینگە، ئابووری، کۆمەڵایەتی، سیاسی و ڕەگەزی هەیە. ئەوکاتە وەرچەرخان مسۆگەر دەبێت و بەدیدێت کە ئەم پێکهاتانە ئاوابکرێن، کارابن، دەوڵەتی یاسایی دیموکراتییانە سەربخرێ و پێویستیش بکات بۆ سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی بکرێتە زامنی سەرەکی. بۆئەوە پێویست دەکات تواناکارییەکانی فۆرماسیۆنی کرداری و سیاسی و ئایدیۆلۆژی بەدیبێت، کە ناچارییە، ئەوە دەکاتە پێویستیەك کە توانستی ئەخلاقی، باوەڕی و هێزی وەڵامی ئەمە بداتەوە. لەم بارەیەوە بەئەندازەی دەرفەت نەدان بەدیماگۆژیەتەکانی چارەسەری مەزهەبگەرایی چەمکی چەپی کلاسیکی تورك، ئەوا ڕێنەدان بە ڕەخساندنی زەمینە بۆ دیماگۆژیەتەکانی نەتەوەپەرستی کوردی وروژێنەر و هەنگاوەکانی لاڕێکردن، یەکێکە لە ئەرکە دیموکراتیە گرنگەکان. خاوەن دەرکەوتن لە ئەرکە دیموکراتیەکان و ئاشتی و یەکێتی ئازادانەی گەلان، لەم بارەیەوە ئەنجامدانی ئەوەی دەکەوێتە سەر شان پێویستیەکی شۆڕشگێڕێتییەکی بەرپرسیارە. ئەگەر بەمجۆرە نەبێت، ئەوا لایەنی دژە شۆڕشگێڕی ڕۆڵ دەبینێ، نەك شۆڕشگێڕێتیەکی تەریقەتگەرایی ڕاستڕەو و چەپڕەو. سەبارەت بەم بابەتانەش ئەوکاتە ڕەخنەدان پێشدەخرێ و جێگای خۆی دەگرێت کە بەشێوەیەکی ڕاست خاوەنداریتی لەم ئەرکانە بکرێت و بۆ ئەم ئەرکانەش لەڕێگای ئامادەباشیەکی پێویست ڕێبازی سەرکەوتن جێگیر دەکرێت.

٦ ـ لەسەر ئەم بنەمایانە، لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیدا وەرچەرخان سەرلەنوێ خەباتێکی ڕاست دەخاتە ڕۆژەڤەوە. لەمیانەی پێوانە دیموکراتیەکانەوە بەرامبەر نەتەوەپەرستە بەکرێگیراوەکان گەڕان بەدوای چارەسەری، زیاتر خزمەت بە یارمەتی و هاوکاری دەکات. ئاشتی لەڕێگای ئەم ڕێبازەوە پشتگیری تەواوی ئەوروپا، ئەمریکاشی لەناودا، تەنانەت پشتگیری تەواوی گۆڕەپان و وڵاتەکان بەدەست نەهێنێ. ئەگەر پشتگیری بەدەست نەهێنێ ئەمە بۆ کەموکوڕی تێکۆشان و نوێنەرایەتییەکی ناتەواو دەگەڕێتەوە. لە ئەمریکا و ئەوروپا دەوروبەرە پیلانگێڕەکان سنووردارن و بۆ سەرکەوتنەکانیان فەرزاری هەڵوێستەکانی پێشێلکردنی یاسا و چالاکیە نهێنیەکانن. بەلەبەر چاوگرتنی ئەم ڕاستیە، بەتایبەتی ئاشکراکردنی بەرپرسیارانی پیلانگێڕیەکان و لەپێناو بەلاوەنانی ستەمکاریەکان دەبێ ئەم ڕووداوانە لەلایەنی تەواوی ناوەندەکانی مافی مرۆڤ و ئەنجوومەنە دیموکرات و حکومەتەکان، تەنانەت لەلایەن تەواوی دەزگا و دامەزراوە نێودەوڵەتییەکان لەسەرووی هەمووشیانەوە نەتەوە یەکگرتووەکان و یەکێتی ئەوروپا ڕوونبکرێتەوە، سەبارەت بە چارەسەری مافپەروەری دیموکراتییانە. داواکردنی یارمەتی و هاوکاری، سەبارەت بە تێپەڕکردنی کۆن و ئامادەکردنی سەرکەوتنی قۆناغی نوێ

بایەخێکی گرنگی هەیە. خستنەڕووی ئەوەی کە بەسووربوونەوە لەلایەنی کێ درێژە بەتیرۆریزم دەدرێت و کامە هێز و دەوڵەت نایەنە سەر ڕێگای ئاشتی و چارەسەری دیموکراتیانە، هەروەها دەرخستنەڕووی ئیرادەی ئازادی گەلی کورد و دەزگاکانی کە نوێنەرایەتی دەکەن و تا دوارادە رەوان و پشتگیریان لێدەکرێت و کارا کردنیان، یەکێکە لەو ئەرکە سەرەکیانەی پێویستە جێبەجێ بکرێت. لەم بوارەدا تێپەڕکردنی رابردوو و پێشخستنی رەخنەدان، تەنیا لەحاڵەتێکدا بەدیدێت کە بەشێوازێکی راست و تۆکمە و سەرکەوتووانەی کرداری وەڵامی ئەم ئەرکانە بدرێتەوە. لەمیانەی ئاواکردن و پێشخستنی بەرەی رەنج و هاوکاری گەلان بەرامبەر چەوساندنەوەی جیهانگیری، لەڕێگای دەنگی بەهێز و رەسەنی دادوەری و ئازادی و یەکسانی لانکەی مرۆڤایەتی بۆ مرۆڤپەروەری و ئەنتەرناسیۆنالیزمی قۆناخی ٢٠٠٠ کان بەدیدێت.

٧ ــ سەبارەت بە تەواوی ئەم بابەتە ژیانیانە تەنیا لەڕێگای پەروەردەیەکی بەهێزەوە رەخنە و رەخنەدان واتادار دەبێت. چارەنووسی گەل و ڕێکخستن تەسلیم بەوانە ناکرێ کە لەڕێگای فەلسەفەی مێژوویی و دیالەکتیکی مێشکیان بەکارناهێنن، تەواوی بەهاکانی جوانی و باشی و خۆشەویستی مرۆڤایەتی لە ویژدانی خۆیدا بەجێ ناکات و پێکهاتەکانی قۆناخی نوێ ئاوا ناکات و جێبەجێیان ناکات.

ئامانجی دەست لێبەرنەدراوی پەروەردە ئەوەیە کە لەسەر بنەمایەکی خۆبەختانە بێت و تەنانەت ڕێگا لەپێش گەورەترین زەحمەتیش بکاتەوە پێویستیەکانی جێبەجێ بکرێت. لە ئەنجامی کارامەیی و هەوڵ و کۆششێکی مەزنی هاوشێوەی راهیبەکانی سۆمەر کە تاوەکو رۆژگاری ئەمرۆمان شارستانییەت ئاراستە دەکات، مسۆگەر پێویست دەکات لە ڕێگای پەروەردەیەك لەشوێنە پیرۆزەکانمان هێزێك بخوڵقێنین کە تیژی نوێی کولتووری رۆژهەڵاتی ناوینی تێدا رەنگ بداتەوە و رۆڵ لە پێشکەوتنی شارستانییەتی دیموکراتیدا ببینێ. ئەوەی راهیبەکانی سۆمەر لە شارستانییەت و دەوڵەت تێیدا سەرکەوتن، دەبێ ئێمە ئەمە وەکو رێبەرێك بۆ سەرکەوتن لە ڕێگای درێژخایەنی شارستانییەتی دیموکراتی و نەمانی دەوڵەتدا ببینین. شێوازی شارستانییەتی نوێمان کە لە لانکەی پیرۆزی مرۆڤایەتیدا دیسان خوداوەندە ژنە بەهێز و جوانەکان باڵای گرت، هەنگاو بەهەنگاو کۆمەڵگای پیاوسالاری چەوساندنەوە بەلاوەدەنرێت و مرۆڤایەتی راستەقینە یەکتر ئامێز دەکەن، بەگوزارشتی هەنووکەیی وەکو لانکەی زایینی شارستانییەتی دیموکراتی کراوە بۆ پێشکەوتن، لەمیانەی تینوێتیەکی مەزن، جۆش و خۆشەویستی و باوەڕی و بوێریەوە، بەهەزر و ئیرادەیەکەوە لە ئەرکە مێژوویەکانمان خاوەن دەردەکەوین کە سەرکەوتن بەدیدێنێ. نەك تەنیا لەپێناو گەل و ڕێکخراوی خۆمان، بەڵکو لەپێناو سەرخستن و بوون بە ئومێدی ئێش و ئازاری رابردووی تەواوی گەلان و مرۆڤایەتی، خستنەڕووی هەموو شتێکمان؛ پێویستییەکی شایستە بوون بەرەنج و ئومێدەکانی داهاتوو و خاوەن دەرکەوتن لەیادی بەها مەزنەکان و چەمکی پیرۆزی ئەرکەکانمانە.

PKK کە تەواوی فشارەکانی قڕکردنی هێزە ئیمپریالیستیەکانی پارچە کرد و نوێنەری ئیرادەی ئازادی گەلە، لەئەنجامی ئەم راستینە مێژووییانەدا کەوتۆتە نێو قۆناخێکی بەرفراوانی وەرچەرخان، بەرامبەر تەواوی ئەو پیلانگێڕییە ناوخۆ و دەرەکی و تەسفیەچێتی و چەمك و کردەوەی چەتەگەرێتی کە لە کەسایەتی ئەودا بەسەر گەلەکەی و مرۆڤایەتی سەپێنراوە، لەمیانەی ئەم شێوەگرتنە نوێیە وەلأم دەداتەوە و ئەو هەڵوێست و هێزەی هەیە کە بەسەرکەوتووانە لە جیهانی شارستانییەتی دیموکراتی هاوچەرخ بەرێوە بچێت.

٢- ئەو پیلانگێڕیانەی بەسەر سەرۆکایەتی PKK دا سەپێنراوە دانناتە بەو ترسەی بەرامبەر ناسنامەی ئازادی گەل هەیە

ئەو هەنگاوانەی تەسفیەچێتی و پیلانگێری کە وەکو کەسێتی دژ بە من و دەزگای سەرۆکایەتی PKK سەپێنراوە لەوە زیاتر کە لەلایەنی سیاسی و ئاسایشەوە شیبکرێتەوە، تەنیا بەشێوەی رۆمان دەتوانرێ بەسانایی باسی بکرێت. بێگومان لایەنی ئایدیۆلۆژی، سیاسی و هەوالگری بەدواداچوون و تەسفیە زۆر گرنگە. بەلأم تەنیا پەیکەرەکەی دەتوانێ راستی روونبکاتەوە. هەرچی باسکردنی بەرجەستە و زیندووەکەیەتی، لەمیانەی بەکارهێنانی نزیکبوون و هەڵوێستەکانی میتۆلۆژی، ئایینی، فەلسەفی و زانستی لەناویەکدا، بە تەفلیکردنی بەراوردکاریە مێژووییەکان و یۆتۆپیا و شیکردنەوەی بەشێوەی رۆمانی هەمە جۆر، راستر دەبێت و پەند و ئەزموونی زیاتری لێدەکەوێتەوە.

ئەم راستینەیە واتایەك لەخۆوە دەگرێت کە وەکو دەزگا PKK و کەسێتیش عەبدوڵڵا ئۆجەلان تێپەڕ دەکات. ناشێ رەوشی گەلی کورد بە زاراوە تیۆریەکانی کۆمەڵناسی و پێوانەکانی زانستی سیاسەتی هاوچەرخ شیبکرێتەوە. خودی دیاردەکە بە تایبەتمەندێتیەکانی قۆناخەکانی میتۆلۆژی و ئایینی پەردەپۆشکراوە یاخود خنکێنراوە. لەوانەیە بەشێوەیەکی جەستەیی گەلێك لەبەرمان وەستابێ. خۆی بە مرۆڤیش دادەنێ. بەلأم کاتێك بەپێوانە هاوچەرخەکان تەماشامان کرد، ئەوا دەبینرێ کە لەرەوشێکدایە هێندەی تیرەی زۆلۆی باشووری ئەفریقیا ناناسرێت، بێ ناسنامەیە، لەتەواوی مافە سروشتیەکان بێبەشە، تەنانەت ناتوانێ ئازادانە زمانی خۆشی بەکاربێنێ. ئەمە رەوشێکی سەرسوورهێنەری وەهایە لەنێو هیچ پێودانگێکی مرۆڤایەتیدا جێگای نابێتەوە. هەم هەیە، هەم نییە؛ هەم مرۆڤە، مرۆڤیش نییە؛ هەم گەلە، گەلیش نییە. مرۆڤ دەتوانێ ئەم هەمەهەمانە زیاد بکات. هەروەکو دەزانرێ سیاسەتە فەرمیەکان زۆر بەئاشکرایی ئاماژە بەم شێوازە دەکەن و پراکتیزەی دەکەن.تەنیا بەرپرسیار بینینی حکومەت و سیاسەتە هەنووکەییەکان بەرامبەر ئەم رەوشە، دەبێتە باسێکی ناتەواو. تەنانەت بە گووتەی " ئەنجامێکی بەرژەوەندییە هەرێمی و نێو دەوڵەتیەکانە " روون بکرێتەوە، تەنیا دەبێتە سەرنج راکێشان بۆ سەر لایەنێکی سنووورداری راستی.

کودەتاکانی هێزە جۆربەجۆرەکان لەتەواوی قۆناغە گرنگەکانی مێژوودا کاریگەریان کردۆتە سەر دیاردەکە. لەچەندین ناوچەی دیکەی جیهانیش رەوشی هاوشێوەی ئەمە روویداوە. بەڵام تایبەتیبوونی دیاردەی کورد نە بەشێوازی وەك خۆی و نە بەشێوازی خەڵکانی دیکە بووە کە خۆیان دەسەپێنن. هیچ کاتێك لە رەوشی مانەوە لە نێوان دوو لادا رزگاری نەبووە. تەواو دەرك بەوە نەکراوە پاکیزەییەکە یاخود سۆزانی. ئەوەی هاتووە خراپی خۆی تێوەنەگلاندووە، نەیتوانیوە فەتحی بکات. لایەنی سەیر و سەمەرەی مەسەلەکە ئەوەیە کاتێك بەرامبەر خاوەن بانگەشەکانی لەجۆری "گەلێکی بەمجۆرە بوونی نییە یاخود لە پارچەیەکی فلانە شوێنی من دروست کراوە." بگووترێ گەوالتە ئەگەر پارچەیەکی تۆ بێتە لاشە یەکپارچەیە، بۆچی وەکو پارچەیەکی شێرپەنجە بەجێی دێڵی؟ بە تەواوی بێ وەڵام دەمێننەوە. لەو دونیایەدا رێکخراوێك هەیە کە UNای پێ دەگووترێت. بەناوی نەتەوە و گەلانی جیهان خاوەنی دەسەڵاتیکی بەرفراوانە. بۆ دواکەوتووترین هۆزەکانی ئەفریقیا بڕیار دەسەنێ، گەلێك بە ناو دەوڵەتی ژمارەی دانیشتوانەکەی ملیۆن تێپەڕ ناکات وەکو ئەندام پەسند دەکات. بەڵام کاتێك دیاردەی کورد ببێتە جێگای باس، دیسان هەبوونی ئەم گەلە دەبێتە جێگای گفتوگۆ کردن. مافەکانی بە نەبوو دادەنرێ. ریشەی تەواوی ئەم راستییانە لە مێژوودا شاراوەیە. تەنیا کاتێك بە تەواوی زەمانی ئەفسانە و ئاینەکان شیبکەینەوە و تێبگەین، هەندێ زانایانی بە ئەخلاق و بە شەرەف سەفەربەر بکەین، لەوانەیە پارچەپارچە لێی تێبگەین.

لەم لایەنەوە درێژە بە راڤەی تیۆری نادەم. تەنیا بۆ شیکردنەوەی سەرۆکایەتی و سەرنج راکێشان بۆ ئەو زەمینەی تێیداین، پێویستی ئاماژەپێکردنم بینی. بە ساڵان خەریکی خۆم بووم. وەکو تاکێك کە لە نێو رەوشێکی زۆر زەحمەتدا هاوسەنگی رۆح و دەروونی پێکهات. پێکهاتەیەکی وەهام هەبوو گومانم لە گەردیلەی تۆزیش دەکرد. شیکردنەوەی بابەتێکی وەها تێکەڵاو و ئاڵۆز و خستنەسەر رێگای گونجاوی خۆی، واتە گۆڕینی راستینەی ئەم گەلە زۆر لە سەرووی هێزی من بوو. ئەگەر پێغەمبەریش نەبم، بە ئەنجامدانی بانگەوازییەك بەمڵاوە کاریگەری دیکەم نەدەکرد. بەڵام ئەم کێشەیە هەروەکو ئەو کونە رەشەی گەردوون کە تەنەکان رادەکێشێ، منی بەرەو تاریکایی خۆی رادەکێشا. دواییەکەی لە رەوشێکی وەها رزگارم نەدەبوو کە زۆر بەدەگمەن نموونەکەی بینراوە، لەوانەیە نەتوانرێ بە هیچ پەرتووکێك روونبکرێتەوە کەمرۆڤ نووسیویەتی و دەینووسێ.

مەسەلە هێزی مێشك و هەستەکانم نەبوو. یەکێکم کە هێشتا تەمەنم دە ساڵان بوو پێشبینی چارەنووسی خۆم دەکرد، وەکو بڵێی حیساب بخوازم بەدایکم گووت "بۆچی منت هێنا دونیایەك کە لە بەرگەگرتنیدا زەحمەتی دەبینم؟". گوایە بە مەعریفەتی سەرۆکی ئەو ئەمریکایەی کە شێوە هەرە نوێکانی فشار و چەوساندنەوەی لە دونیا پێشخستووە، ئەو

کوشتارە بەکۆمەڵانەی سپی پێستەکان بەرامبەر هیندۆ سوورەکانیان ئەنجامداوە وەکو پێشکەوتووترین شارستانییەت دەرخواردی جیهانی داوە و ئاگاداری ئەوە نییە کە چۆن لەناو کولتووری دڕندانە و ناهاوسەنگی کابۆییدا دەژیت، هەروەکو بڵێی بەشێوەیەکی زۆر ستەمکارانە لە سەراکانی قەرەمدا، دوا هیندۆ سوورە نێچیردەکات، هەم بە یارمەتی و گەمە هەرە گاڵاوەکانی ئەو بەکرێگیراوانەی بەدۆستم دەبینین، منی دەستگیر کرد، شیکردنەوەی لۆژیك و ویژدانی ئەم تەسلیمکردنەوەیەم، کارێکە تەنانەت بلیمەترین ڕۆماننوسیش ناتوانێ تێیدا سەربکەوێ. دیسان پێویست دەکات کەمێك ئەمە ڕوونبکەمەوە.

تورکەکان خواستیان دەستگیرکردنی من بە ڕووداوێکی دڵخۆشکەرانە و گرنگترین بوویەری مێژووی خۆیان هەڵبسەنگێنن. بەڵام ئەوەی سەرکەوتنیان لێ بەدەستهێنا، لەوە بەولاوە نەبوو کە هەبوونی جەستەیی من لەنێو تابووتێکدا بەند بکەن، کە لەلایەن خاوەنی هزرێکی بێ وێنە و ویژدان ڕەشەکان لەخاچدرام و وەکو دیاری پێشکەش کرام. بەگوێرەی ئەوەی لە ئینجیل باسکراوە کاتێك عیسا لەخاچ دەدرێت لەدوا گووتەکانی دەڵێت" ئەی خودایە بۆچی منت بەتەنیا هێشتەوە؟". وەکو زهنیەت و هەڵسوکەوتی ڕۆحی، لە ڕەوشێکی وەهادا نەبووم بەرامبەر هیچ کەسایەتی و دەزگایەك سەرزەنشتێکی بەمجۆرە بکەم. بەڵام پێویستی بە پابەندبوونێکی مەزنی ئێش و ئازارە مەزنەکانی ڕووداوەکە و یادەوەری ئەو مرۆڤانە هەبوو کە بەسەدانیان خۆیان کوشت و سووتاند. لەوەش گرنگتر پەیوەندی و ڕووداوی بێ ژمار هەبوون کە بەناوی مرۆڤایەتی پێویستی بە خاوەن دەرکەوتن هەبوو. جولانەوە و کەسایەتیەك بەرەو خنکان دەبران کە بەتەواوی گوزارشتیان لە ڕەوشێکی پێچەوانەی ئەو تاوانباریانە دەکرد کە دەرهەقیان دەکران. ڕەسەنترین جولانەوەی بەناوی برایەتی گەلان بەرێوە دەبرا نکۆڵی لێدەکرا،گڵاوترین بێ ویژدانی و زهنیەتی بەرژەوەندیخوازی دەیخواست ئەنجام بەدەست بێنێ. ئەوەی ئەم ڕەوشە خولقاندوویەتی، پێویستی ئەوەی دەرخستە ڕوو کە بەناوی مرۆڤایەتی بژیت. بۆئەوەی پیلانگێڕی زیان بە گەوهەری ناسنامەی ڕۆژهەڵاتی ناوین و گەلەکانمان نەگەیەنێ، دەبووایە هێز و توانای پێویست نیشان بدەم. ئەوروپا و منداڵە شوومەکەی، ئەمریکا، بە هێزەکانی شارستانییەت تا بڵێی منی بچووك بینیبوو. لەوە واقم وڕمابوو بۆچی هێندە بێ ڕێزیان کرد. بەڵام لەشەڕدا تەکتیکێکی زرافیان پیادە کردبوو. سەرباری ئەوەی بەشێوەیەکی زۆر بێ بەزەیی و بێ ڕێز هەروەکو لەچەند سەدەی ڕابردوو ئەنجامیانداوە کاتێك منیان لە خاچدا، گەلەکەمان و PKK ئەمەیان دەخستە ئەستۆی تورکان. ڕووداوی من ئاشکرابوو. سەرباری ئەوەی هەموو شتێك لەلایەن ئەوروپا و ئەمریکا و ناسنامەی باڵادەستی یۆنان ئامادەیان کرد، ڕۆڵی جەلادیان بە تورکان دەدا. ئەم تەکتیکەی "پەرتکە ـ زاڵبە" شێوەی هەرە دڕندانەی "بەگژیەکدابردنی سەگ بوو". دەمامکی باڵادەستی تورکیان بە خراپ بەکاردەهێنا. چەندە زەحمەتیش بێت، هەڵوەشانەوە و تێکدانی ئەم گەمەیە

لەلایەن منەوە، دەبووە ڕەسەنترین هەڵسوکەوتی ئەم سەدانەی دوایی.

هیچ کەسێك لەمیانەی هزری شۆفێنی تورك نەڵێ گەل ناناسێ و نازانێ برایەتی چییە، یاخود بەمجۆرە من تاوانبار بکات کە کەم جەنگاوم، یاخود لەئەنجامی هەڵوێستی ئاشتی و ڕێککەوتنی دیموکراتییانەی زانراو من بە تەسلیمکار یاخود ملکەچ لەقەڵەم بدات. گەورەترین بەرخودان لەم هەڵوێستە نوێیەدا شاراوەیە. لە ڕێگای ئاشتییەکی شەرەفمەندانە و ڕێککەوتنێکی دیموکراتییانەی ڕاستەقینە بەشداریکردن لە یەکێتی گەلەکەمان، بە کاریگەرترین وەڵامە بەرامبەر پیلانگێڕی. بەلانی کەم تەواوی ئەو هەڵوێستانەی دەرەوە بەگوێرەی من، لەنێو ئەم لاسەنگیە مەزنەی هێزدا، خزمەتکردن بوو بە ئومێدی ئەو کەسانەی بێ شەرمانە چاوەڕوانی شەڕ بوون. ئەو خاڵەی هەرە زێدە پێی خەمناك بووم ئەو حەقیقەتە بوو کە لە کەسایەتی مندا بەرامبەر گەلی کورد ئەنجامیاندا، دەیانتوانی من لەناوببەن. بەڵام هەر هیچ نەبێ بیانتوانیبووایە لەو گەلە تێبگەن! سەرچاوەی ژیانی گەلێك بووم کە بێ کەسە تەنانەت خاوەنی ڕۆڵەیەکیش نەبوو کە بزانێ سەرکەوتن بەدەست بێنێ. چاوەڕوانی ئەم گەلە لەو پیاوەی کە لە خاچ دراوە و لەنێو تابووت دایە، بەردەوام دەبوو. چاوەڕوانی مامانێتی لەدایکبوونی ژیانیان لەو پیاوە دەکرد کە لەدایکبوونی خۆی بەهۆی گەورەترین تاوانباری دادەنا. هیچ کاتێك فەرمانی ئەوەم بە PKK و گەلی کورد نەدا کە بەدوای مندا بێن. لەبەرئەوەی هیچ کەسێکی دیکەی نەبوو، ناچار بووم دوای ۲۰۰۰ ساڵ هەڵوێستێکی زۆر لەوەی عیسا زەحمەتتر بگرمە ئەستۆ. ڕۆڵی کاوەی شۆڕشگێڕیشم خستە ئەستۆم. پڕۆژەیەکەی حەزرەتی ئیبراهیمیشم هاوچەرخ کردەوە.

بووم بە مەم و دەورێشی عەبدی هەموو زین و عەدولەکان. لە دوا ئاخی مەلی و مەزدەك و بابەکەوە بگرە تا دەگاتە تەنیایی حوسێن لە کەربەلا بوومە هەڵگری ئەشقی ڕاستی مەنسووری حەللاج، پلەی دۆستایەتی یوسوڵتان. هاوڕێی عەزیز و ئیبراهیم و ماهیر بووم. جەنگاوەری تۆڵەسەندنەوەی مەزلوم، خەیری، کەمال و فەرهاد بووم. بەمجۆرە دوانموونەی ئەو کەسانە بووم کە لە هەر سەردەمێکدا بە هەزاران کەسی کردە یەك و وشیاری کردنەوە. ئەم ئەڤیندارانەی مرۆڤایەتی تەنیا دۆزی بەرخودان و شەڕیان نەبوو، بەڵکو داواکاری ئاشتییان هەبوو کە دەرفەتی بەدیهێنانیان نەبوو. ئەم بەرگرینامەیە هی من نەبوو بەڵکو بەرگرینامەی ئەوانە سەبارەت بە ئاشتی کە ئەم لایەنەی بە ناتەواوی مابۆوە. خواستم ئەم کەم و کوڕیە نەهێڵم. باوەڕدەکەم کە بەشێوەیەکی ڕاست پێناسەی مرۆڤایەتی، مێژوو، سەردەم، چەوساندنەوە، زۆرداری، بەرخودان، ئازادی و ئاشتی کراوە. ڕێگایەك بۆ مێژووی گەلان کراوەتەوە. هەروەها باش دەزانم ئەوکارەی ئەنجامداوە سەرۆکایەتی نییە، خاوێنکردنەوەی پیسی و قرێژی ئەو کەسانەیە بەهەزاران ساڵە دەریدەکەون و بانگەشەی سەرۆکایەتی دەکەن. قرێژی مێژوو خاوێن دەکەمەوە. ئەوەش ئاشکرا دەکەم کە کێ بەماوی

چی و بەچ واتایەك پیسی کردووە. هیچ کاتێك چاوم لـە پلـەو پایـەی دەوڵـەت، تەنانـەت سەرۆکێتی ژنێکی ساویلکە نەبوو کە بەهەر شتێك رازی بێـت. بـەبێ ئـەوەی جیاوازی لـەنێوان ژن و پیـاو و نەتـەوە بکـەم، لەگـەڵ هەرکەسێکی مـەیلی هەیـە هـەڤاڵێتیم لەسـەرووی هـەموو شتێکەوە دانا. لەوانەیە هیچ کاتێك بە خـەیاڵی هـەڤاڵانمدا نـەهاتووە کـە مـن لـەنێو ڕەوشێکی وەهادا ببینن. جارێکی دیکە ڕاستیەکانم بۆ ڕوونکردنـەوە. ئەگـەر رازی بـن و بەڕاستی ببینـن، ئەوا تراژیدیای من گەورەترین سەرچاوەی هێزە بۆیـان. ئەگـەر تـاوەکو ئێستا زۆر بـە مـەزنی کاربکەن بەڵام نەتوانن سەرکەوتن بە دەست بێنن، کەواتە لـەنێو ڕەوشـی خـۆ خەڵەتاندن دان. دەڵێم بادەستی لێبەربدەن.

لە بەشی کۆتـایی بەرگرینامەکـەم دا ناسـنامەی خـۆم زیـاتر ڕووندەکەمـەوە. لـەم بەشـەدا هـەندێ لـە هەڵوێستەکانم بەرامبـەر پیلانگێڕی و چەواشـەکارییەکانی هاوشێوەی ئەمـە دیـار دەکەم. مەسەلە ئەوە نییە کە بە قارەمانێتی بمـرم. ژمارەیـەکی لـەبن نـەهاتووی قارەمانـان بـە هـێزێکی بـێ سـنوور سـەرکەوتووانە ئـەم ڕۆڵـەیان پێکـهێنا. ئـەوەی ناتـەواوە ئـەنجامدانی پێناسەیەکی بەهێزی ژیانێکی شایسـتە بـەم قارەمانانـە و کۆسپکردن و داخستنی هـەموو ئـەو ڕێگا و پردانەی کە زۆردار و ساختەکارەکان دەخوازن بـۆ بـەخراپی بـەکارهێنانی میراسەکەیان بیگرنـە بـەر. وەکو پێویستیەکی پابەندبوون بەسـەرۆکایەتی هێشتا بـەردەوامی بـەم ئەرکـە دەدەم.

ڕاستە کە دەڵێن سەرۆکایەتی هونەرێکە، ناتوانرێ بگووترێ من بەباشـی نوێنەرایـەتی ئـەم هونەرەم کرد. بەڵام لەو باوەڕەدام کە بەگشتی و بۆ کوردانیش تایبەتمەندێتیـەکانی کەسایەتی و دەزگاکەم تاڕادەیەك شیکردەوە. لەوانەیە سـاختەکار و زاڵمـەکانم نـەڕووخاندبێت. بـەڵام بەشـداری و ڕۆڵێکی گرنگم لەخستنی دەمامکـەکانیاندا هـەبوو. کـاتێك گـووتم قرێژەکانیـانم پاککردەوە مەبەستم ئەوە بوو. بۆ ئەو کەسانەی کە تێدەگەن ڕوونمکردەوە کە ئەوانەی خۆیان لەژێر دەمـامکی خـودا حەشارداوە تادەگاتـە جـۆری دیماگۆژە زانستیەکان چـین و چ مـاڵێکن. بەتایبەتیش لە کەسایەتی خۆمدا لەمیانـەی دانـان بەڕاستی و پلیشاندنەوەی پیاوێتی ئـەوەم ڕوونکردەوە کە بۆچی سەرۆکایەتی جەخت لەسەر ئەم مەسەلەیە دەکاتەوە و ئەو پیاوێتییـەی خـۆی لەسـەر پشتی ژنـان و چەوسـاوەکان بـە پیـاو نیشاندەدات واتـای چییـە. هەوڵمدا ئـەوە نیشانبدەم کە ئەو دەزگایەی سەرەتا ڕۆڵی خوداوەندێکی تـەواوی بـەخۆیدا، دواییش ڕۆڵـی نیـو خوداوەندێکی بینی نموونەیەکی سەرەتایی دەوڵەت بووە و ئەگەر بانگەشەی ڕۆڵی سەرۆکایەتی گەل بکرێت، سەرەتا پێویست دەکات ئەم ناسنامە دێوەزمە شیبکرێتەوە و بڕووخێنرێ. بـەڵام بەمجۆرە شێوازی نوێی سـەرۆکایەتی تـەنیا وەکو کۆردیناسیۆنی گشتی کاروبـاری گـەل واتـادار دەبێت. هەوڵمدا پێشکەوتنە تیۆرییەکانی لەم لایەنەوە بەدەستمهێناوە لەڕاستینەی گەلی کورددا پراکتیزەی بکەم.

سەرباری تەواوی هاوکاری و یارمەتیەکانم، کاتێك بینیم لەبەرپەرەوکردنی شێوازێکی نیو ئاغایەتی بەولاوە شتێکی دیکە لەناوەوە و دەرەوەی رێکخستن پێشکەش ناکەن، وەکو ناچاریەك بەرامبەر ناولێنان و سیستەمی لەجۆری "رێبەر" و "سەرۆك" بەرێز بووم، ئەمە داخوازی گەل و ئەو کەسانە بوو کە خۆیان لەپێناویدا بەخت دەکرد. نەمدەتوانی بێ رێزی بکەم. بەو رادەیەی توانیم ئەنجامی بدەم تا دەرکەوتنی ئەو کەسانەی لەهەموو بوار و گۆڕەپانەکاندا تواناکاریان هەیە، لە رۆڵی "سەرۆکایەتی گشتی" رام نەکرد. لەڕاستیدا ئەمە بارێك بوو تێگەیشتنی زەحمەت بوو. بۆشاییەکی گەورەی مێژوویی، سیاسی، کۆمەڵایەتی و سەربازی لەئارادا بوو. هەرهەموو گۆڕەپانەکان پێویستیان بەوە بوو بۆیان ببمە وەڵام. بەبێ ئەوەی شیکردنەوەی تیۆری ئەم ئەرکە پشتگوێ بخەم، کە تەنانەت زەحمەتە رۆژێکیش بەرگەی بگیردرێت و پێویستی بە تواناکاریەکی بەرفراوان هەیە، لەبواری پراکتیکیشدا لەرێگای نیشاندانی شێواز و خێرایی پێویست خواستم ببمە وەڵام. خۆم رێساکە و شێوازی پراکتیزەکردنم هەڵدەبژارد. چونکە لەم لایەنەوە هیچ شتێك لە ئارادا نەبوو کە بۆ سەپاندنی رێسا ببێتە نموونە. لە رۆیشتن بە دارستانێکی وەحشی دەچوو، دارستان پڕ لەدڕندە بوو. سەرباری ئەوەی ئەمە دەزانرا، وەکو پێویستیەکی رێز لێگرتن لەگەل و باوەڕهێنەکان، دوورەپەرێز نەمام لەوەی کاروانێکی وەکو گلگامێش بگرمە بەر. لەدارستاندا گلگامێش رێبەرایەتی گەلی تێکشکاند و رێگای رێبەرە ـ پادشاکانی دەکردەوە. هەرچی من بووم دەمخواست پادشاکانی دارستان تێکبشکێنم و مافی بەڕێوەبەرایەتی بدەمەوە ئەو گەلەی کە بە هەزارویەك فێڵ و تەڵەکەبازی و ستەمکاریەوە ئەو مافەی لەدەست دەرهێنرا بوو. بەدوای ئەوەدا وێڵ بووم کە رێگا بۆ رێبەرەکانی گەل بکەمەوە. لەکاتێکدا گلگامێش لە رێگای ئەو ژنەی لەپلەی خوداوەندێتی بۆ سۆزانی داخراوە بە کرێگیراوەکەی خۆی ڕاو دەکات، بەپێچەوانەی ئەمە ئەنجامدەدەم. هەوڵدەدەم ئەو ژنەی خراوەتە نێو رەوشێکی زۆر خراپتر لە سۆزانی بیکەم بە خوداوەند، بەمجۆرەش پیاو، واتا جارێکی دیکە ئەنکیدۆ بکەمە رێبەرێکی وشیاری گەلەکەی. خوداوەندێتی ژن لەمیانەی گەوهەرە هەرە پتەو و یەکسانیخواز و ئازادیخوازی دەزگای رێبەرایەتی گەل، دەیتوانی پیاو پەروەردە بکات. بەڵام تەنانەت ئەو ئەنکیدۆیانەی وادیارن کە زۆر پابەندن بە بێ ورەییەکی مەزن و پاخیبوونێکی بابەتی وەڵامیان دایەوە. خۆیان لەگێلی و نەزانی دا. بەرامبەر بە تەواوی ئەو هاوار و بانگەوازیانەی کردم دەیانگووت "نەمبیست، نەمدیت، نازانم". نەك خوداوەندە ژن، بەڵکو سۆزانیەکی تایبەت یاخود گشتییان دەخواست. لێرەشدا شەڕێکی مەزنم بەرامبەر راستینەی رێبەرایەتی پیاوسالاری کرد کە وەکو دامەزراو بەهایەکی مەزنی هەیە و لەبواری کرداریش دا بەهاکەی کەم نییە.

ئەوانەی پێنج هەزار ساڵە هەموو گۆشەیەکی دارستانی جیهانیان گرتووە، بەتایبەتیش

ئەورووپاییە زاناکان، بەهیچ جۆرێك منیان نزیك بەخۆیان نەبینی، تۆڕە تەنکەکانی خۆیان بۆ دەستگیرکردنی من دەکردەوە. شتێکی ئەوتۆ نەبوو بتوانرێ ئەنجامبدرێ. ڕاکردن یاخود خۆکوشتن زیاتر لەبەرژەوەندی ئەواندا بوو. ئەوەی دەمتوانی ئەنجامی بدەم تاوەکو دواهەناسەی خۆم ئازادی دڵم بپارێزم. لەمیانەی ئەو دڵۆپانەی واتابەخشین کە پێشیدەخەم بەرێزێکی مەزنەوە بەردەوامی بە ژیان بدەم. ئەوان بەشێوەیەك قوربانییەکەی خۆیان هاوێشتە نێو ئارانا کە حەوت بەرد بە نیرۆنەکان دا دەدەن، لەنێو جۆش و خرۆشی دەرخواردانی ئەو شێرەی بەخۆیان بەخێویان کرد، بەدڵخۆشیەوە وەکو چەند دیمەنێکی ڕابواردن و سەیرکردن، لەنێو هاوارە بەترسەکانی بەرامبەر دەیانخواست چارەنووسەکە ببینن. گوایە مەسیحین و تەنانەت ئەرسۆدۆکسین! بەڵام هەروەکو چۆن خۆیان زۆر پێشتر نووسیویانە، ئەوان ئەو نوێنەرانەی ڕۆما بوون کە هەزاران جار سەرلەنوێ عیسایان لەخاچدا. ئەم کولتوورەی لەخاچدان لە بۆهێڵە (جینات) کانیاندا هەبوو. دەرککردنم بەوە زەحمەت نەبوو. عیسا لەئێمە بوو، دراوسێی دەرگا بە دەرگامان بوو. بەشەرەف و شانازیەوە خاوەن دەرکەوتن لێی پێویستی دراوسێتی بوو. بەهەزاران کێومالی لەخاچدان و دەرخواردانی شێر لەسەر ئەو و شوێنکەوتەکانی ئەنجامدران. دوا قوربانی من بووم. هەم بەرخودانی شکۆمەندانەی خێڵایەتی باپیرانمان کە پابەندی گەوهەری مرۆڤایەتییە، هەم دابونەریتی ئاشتی پێغەمبەری باپیرەمان حەزرەتی ئیبراهیم و حەزرەتی عیسا، بەشێوەیەکی زۆر سەیر لەمندا دەبوو بەیەك. مەزنبوونێکی خودایی ناچاری بوو. خوداوەندم شیکردەوە و، ڕامگەیاند کە کێیە. بەڵام بەرامبەر پیرۆزی خودایی گەلان، ژنان و منالان و ئەو بەساڵاچووەی لەنێو زەحمەتیدایە بەرێز بووم. لەنێو تایبەتمەندێتیە پیرۆزەکانی ئەوان و مەزنایەتی خوداوەندا بووم. لەڕاستیدا ئەم مەزنبوونە لەنێو پیرۆزیە مەزنەکەی گەلدا بەس بوو. مردن لەنێو ئەو شێوە و هەلومەرجەی تێیدا بووم، دەبوو بەناوی شکۆمەندیەکی زۆر مەزنتر. ئیتر ئەم ڕاستیە نەك ترس، بەڵکو ڕۆژ بەدوای ڕۆژ بژاری ڕەسەنی ئاشتی مرۆڤایەتی خوڵقاند. ئەگەر شەڕوقڕکردن بسەپێنن، ئەوا تا دوایی بە بەرخودانێکی ئاشتیخوازانە و شەڕی بەرگری ڕەوا؛ ئەگەر داخوازیشیان هەبێ ئەوا هێزی ئەوەم هەیە لەمیانەی دادوەر و شەرەفمەندانەترین ئاشتی وەڵامبدەمەوە. درێژەپێدەری ڕێبازی قارەمانەکانی بەرخودان و ئاشتی بووم؛ وەکو پێویستیەکی وەسیەتەکان لەڕێگای بەرگرینامە بۆ تەواوی جیهان ڕاگەیەنرا. مردن هەرچۆنێك دێت بابێت کۆتاییەکەی ئەم ڕاستییە بوو کە مرۆڤایەتی و گەلانمان سەردەکەون.

### أ ـ سەردەمی لەدایکبوونی ڕێبەرایەتی لەپێناو گەل (١٩٧٠ـ١٩٨٠)

بەرێوەچوون لە کێڵگەی گەلی کورد کە سەدان ساڵە زەمینەی ڕێبەرایەتی بە پیلانگێری و خیانەت مینرێژ کراوە، هەر لەسەرەتاوە پێویست بوو هەموو ساتێك پارچەبوون بەرچاوبگیردرێت. تەنیا ئەو مینە جەستەییانە نییە کە لە توندوتیژی دەوڵەت پێکهاتووە،

بەڵکو ئەو مینانەی بەشێوەیەکی کاریگەر لە دونیای هزر و رۆحیدا بەجێکراوە بەهەزاران قات لەو مەترسیدارترن. جۆرێکی وەهایە کە هەرساتێك دەتوانێ مێشك و دڵ پارچە پارچە بکات. هەربۆیە ئەم زەویە، واتە راستینەی گەلی کورد بێخێر و وەکو خاکێکی بێ خێر بەجێهێشتراوە. هەروەکو مینرێژکراوەکانی سەر سنوور ئەگەر خاکێکی بەپیتیش بێت، لەبەرئەوەی بە سەدان ساڵە ناچێنرێت بووە بە بیابان. ئەگەر بەبێ ئامرازەکانی مین هەڵگرتنەوە و پسپۆران دەستپێبکەیت، واتە کار بۆ موعجیزە ماوەتەوە.

هەندێ تواناکاریم هەبوو، ئومێدەوارم لەبەشی تایبەت بە ناسنامە تاوتوێی بکەم. مێشکێکی پڕ بەگومانم و هەروەها ئەو دڵەی بەردەوام لەپێناو ئازادی لێیدەدا، رۆڵی خوداوەندەکانی منیان دەبینی. بەردەوام ئەم خوداوەندانە هێزی بەدواداچوونی راستی و ئازادی هەبوو کە رۆڵەکەیەتی. هێندە بەمەعینادبوون، ئەگەر ئامادە نەبن، لێگەڕێن دەکات، لەدایکنەبووبن، دەیانهێنێتە دونیا.

لەئەنقەرەی ساڵانی حەفتاکان دەنگی لاوانی شۆڕشگێڕ بڵند و بێ ترس بوو. هەست بەوە دەکرا کە لەگۆڕەپانێکی پڕ لەتەڵەزگە بێ ترسی هەبوو. بەڵام ئەگەر ئەوان هێندە بوێر و بەجەسارەت بن کە لەهەبوون و رەسەنێتی من بەخاوەن دەربکەون، ئەگەر هەستێکی سنووورداری شەرمەزمەندیش لەمندا هەبێت، ئەوا نەمدەتوانی لە بەردەوامکردنی رێبازی ئەم لاوانە دوابکەوم. شەهیدبوونی ماهیر چایان و هەڤاڵانی لە قزلدەرە، لەسێدارەدانی دەنیز گەزمیش و هەڤاڵەکانی، وەکو هەواداره بەشەرمەزەکان ئەرکی درێژەدان بە بیرەوەری ئەوانی پێسپاردبووین. ئیتر خوێنن ببووە بەهانەیەك. مسۆگەر بوو کە بەناوی گەل دەجوڵێمەوە، بەڵام لەسەرووی هەموو شتێکەوە پێویست بوو ئەوە بزانرێ گەلەکەی من، کە لەسەر سەکۆی لەسێدارەدانیش هاوار بۆ ناوەکەی کراوە، گەلی کورد چۆن گەلێك بوو؟ بەمجۆرە دەستم بۆ کێشەی نەتەوەیی برد.

ئەمە مەسەلەی پێشووتریشی هەبوو. کاتێك هێشتا لەقوتابخانەی سەرەتایی بووم کوردێتی وەکو پاشکۆیەك بەمنەوە نووسابوو. نەتەوەپەرستی سەرەتایی کورد هەروەکو چۆن ماسی لەناوی شێلودا دەگرێت، دەیخواست ئێمەش نێچیر بکات. تەواوی ئەمانە هەریەکە وەکو کونێکی رەش منی بەرەو ناسین و ئاشنابوون لەگەڵ کێشەی کورد دەبرد. لەم سەردەمانەدا بۆ لاوێکی خاوەن کولتووری رۆژهەڵاتی ناوین، شتێکی نزیك بەمەحاڵ بوو زهنیەتی دۆگماتییانە تێپەڕ بکات. دوای ئەزموونێکی یەکجار مەزن دەردەکەوت کە بژارێکی لەجۆری ئەگەر ئیسلامیەت نەبێت، یا سۆسیالیزم بێت، بۆ رزگاربوون لە دۆگماتیزم تێری ناکات. هەروەها لەم قۆناخەدا درك بەوە دەکرا تاوەکو زهنیەتی دۆگماتییانە تێپەڕ نەکرێت ئەوا جیاوازیەکی ئەوتۆ لەنێوان دووبارە کردنەوەی شتە گشتیەکانی سۆسیالیزم و بیرکردنەوە بەپێی ئایەتەکان لەئارادا نییە. لەسەر بنەمای باوەڕی بە سۆسیالیزمی بونیادنراو و سۆسیالیزمێك کە خۆی لە زهنیەتی

دۆگماتیانە تێپەڕ نەکردووە، پەیڕەوکردنی لەسەر کێشەی کورد وەکو ئەرکێك خستۆتە سەر شانی قوتابیەکی خاوەن زهنیەتی دۆگماتیانە. خودی کێشە و موخاتەبەکەی بەتەواوی یەکتریان دۆزییەوە. دەشیا شتێك دەربکەوێتە مەیدان. ئەمەش ئاپۆچێتی بوو.

لەنێو ئەو کێشەیە کێشەی ساڵانی ۱۹۷۵ ی نێوان چەپڕەو و راستڕەوەکان کە سەرۆکایەتی ADYOD (کۆمەڵەی باڵای خوێندکارە شۆڕشگێڕەکانی ئەنقەرە) م دەکرد، زەمینەی پێویستی بۆ گروپ ئامادە کردبوو. لەنێو ئەو هەلومەرجانەی کە DEV-GENC (فیدراسیۆنی لاوانی شۆڕشگێڕ)، دووچاری تەسفیەچێتی هاتبوو، هەروەها نەتەوەپەرستی سەرەتایی کورد دیموکراسی DDKD (کۆمەڵەی کولتووری شۆڕشگێڕی دیموکراتی) لەجیاتی DDKO (کۆمەڵەی کولتووری شۆڕشگێڕی رۆژهەڵات) بەجێ بکات، بەڵام بێکاریگەر بوو، زەمینە و هەلودەرفەت بۆ ئەنجامدانی پێهەڵگرتنێك و هەنگاو هاوێشتن کراوە بوو. لەنێو ئەم هەلومەرجەدا لەدایکبوونێکی نوێ، ئاپۆچێتیمان پێکدەهێنا و پەرەمان پێدەدا. لەو هەلومەرجانەدا دۆگماتیزم لەولاوە بمێنێ، لاوان سۆزداری بوون. گروپەکەمان لە دەستەیەك لاو پێکدەهات کە بەریشە هەژار و زەحمەتکێش بوون. بەشێکیشیان بەریشە تورك بوون. هەروەکو کەمال پیر دەیگووت: "رێگای رزگاری تورکیا بە ئازادی گەلی کورددا تێپەڕ دەبێت"، بەچەمکێکی ئەنتەرناسیۆنالیستی بەمجۆرە ئەقڵی ببوون. ئەوەی جیاواز بوو کەسیرە یلدرم بوو. لەبنەماڵەیەکی یەکرێگیراوی بەناوبانگ دەهات. ئەمە لە یەکرێگیراوێك بەلاوەتر، بنەماڵەیەکی CHP (پارتی گەلی کۆماری) بوو کە ملیتانێتی رژێمی ئەنقەرەی کردبوو. مەیلی سروشتی بۆ چەپڕەوی، تایبەتمەندێتی CHP ی ئەم قۆناخە بوو.

روونکردنەوەی ئەم کێشەیە هەرچەندە وەکو مەسەلەیەکی تاکەکەسێتی دیار بێ، لەبەرئەوەی شێوەیەکی وەهای گرتووە کە ئەنجامی کولتووری، سیاسی، کۆمەڵایەتی و مێژوویی قووڵی هەیە، لەڕاستیدا کارەکتەرێکی وەهای هەیە کە گرێ پێکدێنێ. گەلێك شت سەبارەت بە کەسایەتی کەسیرە یلدرم گووترا. زۆر گفتوگۆ لەسەر ئەوە کرا کە نێردراوێکی دەوڵەتە یان نا. زێدە ناکەومە نێو ئەم لایەنە، زیاتر هەوڵدەدەم ئەو پەیوەندییەی شیبکەمەوە کە لەگەڵ گروپدا هەیبوو.

پشتبەستنی کەسیرە بە گروپ بەواتای نیشانەی بوەستە دەهات. هەڵوەستەیەکی وەهای هەستی پێدەکرا هەروەکو بڵێ "دەبێ کێشەی کورد، کێشەی چەپ، لەنێمە بپرسن، ئێمە خاوەنی ئەم کێشەیەین". تا بڵێی زیرەك بوو، ژنێکی سەرنج راکێش و رازاوە بوو. لەبواری جەستەییەوە هەڵگری تایبەتمەندێتیەکانی کوردان بوو. نازانم کە تا چ رادەیەك دەگووترێ رێکەوتە، بەڵام بەنداوێك لەپێشم قووتبۆتەوە کە ئەزموونی ژیانم سەروبن دەکات، رۆژبەدوای رۆژ دەرکم بەوە دەکرد کە لەکەسایەتی کەسیرەدا نوێنەرایەتی ئەم بەشە دەکرێت. هەرچەندە بەشێوەیەکی زۆر وشیار و هۆشمەندانەش نەبێت هەڵوێستەکانم هەندێ لایەنی گرنگی

لەخۆوەدەگرت. دەتوانرا لەنێو ئەم هەلومەرجە نوێیەدا ڕەوشی بنەماڵە بۆ خاڵێکی ئەرێنی و بەسوود بگۆڕدرێ. لاو بوو، دەشیا ببێتە سۆسیالیستێکی باش. ئیتر کێشەی کورد کێشەی دەرەبەگەکان نەبوو، بەڵکو کێشەی زەحمەتکێشان بوو. وەکو گەنجێکی سۆسیالیست دەتوانرا خاوەندارێتی لێبکرێت. هەروەها خەڵکی دێرسیم بوو. لەمیانەی هەڵوەستەیەکی ڕاستی بەرامبەر کێشەکە هەم بۆ یەکێتی گەل، هەم بۆ گۆڕان و وەرچەرخانی گەلێك کەسایەتی هاوشێوەی خۆی دەیتوانی ببێتە نموونە. ئازادی ژنیش لەڕۆژەڤدا بوو. دەکرا بۆ ئەمەش ببێتە مۆدێلێك. ئەم تایبەتمەندییانە پەیوەندی بە لایەنە سیاسی و ئایدیۆلۆژییەکانی مەسەلەکەوە هەیە. هەروەها لە ڕووی سۆزدارییشەوە نزیکبوونەوە بەدیدەهات. کاتێك تەواوی ئەم ئامانجانە بوونە یەك، هەروەها لەمیانەی کاریگەری کولتووری بنەماڵەیش، هەر زوو هەزر و داوای "هاوسەرێتی"م پێشخست. بابەت هەستیار بوو. ساتێك بوو کە زەنگی مێژوو بەئێشەوە لێدەدرا. ئەم مەیلە بووە کێشەکێشێکی مەزن. دەشێ بەگوێرەی خۆی داواکارییەکەی منی بەشێوەی کۆنترۆڵکردن و بێکاریگەرکردنی خۆی شرۆڤە کردبێت یاخود ئەو بۆ ئەوەی من پێوانە بکات ئاڤیکردۆتەوە. کاتێك ئالێرەدا کەوتینە نێو قۆناخی، "یان لەگەڵ من یاخود لەگەڵ هەر یەکێکی گروپ ئەڵقە ببەستە" گروپی ڕووبەڕووی پەرتەوازە بوون هێشتبۆوە. لەبیرمە جارێکیان کەوتمە نێو هەست و سۆزی دەستبەردان لەگروپ. ژن هێزی خۆی نیشان دەدا. ئاستەم بوو تێبیگەم کێ لەپشتە.

مارەییەکی ساختە کە دەبووە ماڵ بەسەر ئەندامیکمان، تەواو گێرەشێوێنییەك بوو بەگوێرەی قۆناخ. ئەو تایبەتمەندێتییە ڕواڵەتیانەی کە دەتوانم بە عیناد و نامووسی کوردی ناو ببەم، منی ناچارکرد دەستی لێبەرنەدەم. مارەییە ساختەکەم تێکدا و مەسەلەکەم بە هاوسەرێتییەکی فەرمی ئەنجامگیر کرد. ساڵ ۱۹۷۸ بوو. دواتر چوومە دیاربەکر، لە کۆتاییەکانی هەمان ساڵیش لەئەنجامی ئەو کۆبوونەوەیەی لەگوندی فیس ئەنجامدرا PKK بەفەرمی ڕاگەیەنرا. سۆزداری و دۆگماتیزمم دەکردە قوربانی کێشەکە. ئەوەی چاوەڕوان دەکرا سەرکەوتن نەبوو. بەڵکو ڕێوڕەسمی پێناسەکردنی ئەو کێشەیە بوو کە خۆی گەورەتر کردبوو. بەڵام دیسانیش زۆر گرنگ بوو. ئایا دەوڵەت خەوتبوو؟. ئەم بابەتە گفتوگۆیەکی زۆری لەسەر کرا. ماوەیەکی کورت دوای ئەوەی ئۆغور مومجو خواستی بە بانگەشەی ڕوونکردنەوەی ئەم بابەتە پەرتووك بنووسێ بووە قوربانی پیلانێك. پەیوەندی نێوان پەرتووك و بابەتەکە هیچ دەرکی پێنەدەکرا. عەلی یلدرم ی باوکی کەسیرە خزمەتکارێکی بەئەزموونی دەوڵەت بوو. هێندەی بەبیرم بێت لەساڵی ۱۹۸۵ لە ڕۆژنامەیەکدا بینیم کە گووتبووی "ئێمە بۆ ئەوە ڕازی بووین کچەکەمانی بدەینێ تاوەکو لەدەوڵەتی نزیك بکەینەوە". بەڵام دەشێ ئەمە تێری ڕوونکردنەوەی هەڵوێستی دەوڵەت نەکات.

گرنگی مێژوویی مەسەلەکە ئەوەیە: سەرۆکایەتی و بنەماڵەگەرێتی و پیلانگێڕی

لەقۆناخێکی هەستیاری مێژوودا دەکەوتە ڕۆژەڤ. پەیوەندییەکی پێویست بوو وەکو پەیوەندییەکی تایبەتی خێزان تەماشای بکرێت، پێ بە پێ دەبووە قەیرانێکی کۆمەڵایەتی، سیاسی و ڕێکخستنی. ئەو قۆناخەی دیاربەکر کە نزیکەی ساڵێك بوو، هەروەکو دۆزەخ وابوو. پەیوەندی نێوان ژن و مێردێك لەو لاوە بمێنێ، نمایشی وروژاندن لەلایەن ژنێکەوە لەئارادا بوو کە دەرك پێکردنی و بەرگەگرتنی زەحمەت بوو، تەنیا ئەوانەی دەتوانن رووخسار بخوێننەوە لێی تێدەگەیشتن. شەهیدی مەزنمان محەممەد خەیری دورموش ڕۆژێکیان ببووە شاهیدی ئەم شێوە پەیوەندییە. جەمیل بایکیشی لەگەڵدا بوو. ئەو ئەنجامەی هەڵیانهێنجابوو بەشێوەی "مافی ئەوەی نییە وابکات" بوو. دوایی باسی ئەوەیان دەکرد کە مەیلی لەنێوبردنیان لەلا گەڵاڵە بووە. کەمال پیریش لەبەیروت بووە شاهێدی هەمان ڕەوش و کاتێك بەرەو شەهادەت دەچوو دەگووترێ تەنانەت بەشێوەی "با سنوورێك بۆ کردەوەکانی ئەم ژنە دابنرێت" وەسیەتی هەبووە. ڕاست بوو، پەیوەندییەکی پیاوێکی ئاسایی تەنیا ٢٤ کاتژمێر ناتوانێ بەرگەی بگرێ، سەرباری ئەوەی زۆربەی هەڤاڵانمی تەنگەتاو دەکرد، تاوەکو ساڵی ١٩٨٧ بەرێوەم برد.

زۆر بەسانایی ئەوەمان بۆ دەرناکەوێت کەسێرە تا چ ڕادەیەك نێردراوە یاخود بابەتییە. بەڵام لایەنە گرنگەکە ئەوە نییە. دەیتوانی بەناوی دەوڵەت ژنێتی خۆی بەشێوەیەکی پۆزەتیڤیش بەکاربێنێ. بەشێوەیەکی گشتی شێوازی پەیڕەوکراو ئەمەیە. بەڵام ئەوەی بە شێوەیەکی بابەتی بەسەر مندا سەپێنراوە بە شێوەی ـ یان تەسلیم بە، یاخود هەموو شتێکت بەسەردا دێت ـ بووە. ڕەوشی" بە سەرتدا دێت" زیاتر بەواتای ئەم هارکردنە دەگووترێت. ئەگەرنا ئەوە بەواتای "مەترسە ژەهر خواردەت ناکەم" هەڵناسەنگێنم کە لە قۆناخی ڕۆژانی نزیك بەجیابوونەوە گوتی. لەوانەیە لەلای هەندێك کەس ئەمە سەیر بێ، بەڵام بۆ ئەوانەی دەخوازن بەقووڵایی لە دیالەکتیکی کوردان تێبگەن، هەروەکو مەزندە دەکرێ ڕزگاربوون لەم تەڵەزگەیە هێندە سانایی نییە. کوشتنی زۆر سانایی بوو، بەڵام ئەمە چارەسەری نەبوو. ئەگەر بەشێوەیەکی بابەتی یان خۆیی، تەنانەت داسەپاندنێکی دەوڵەتیش بێت، چارەسەرکردنی گرفتەکە لەرێگای توندوتیژی واتای کەوتنە نێو گەمەکە بوو. سەرباری تەواوی ئەم هاندان و وروژاندنانە، لەو باوەڕەدا بووم چەندەی بەرگەی بگیرێت هێندە بۆ گروپ و PKK پێویستە.

کاتێك تەماشای مێژوو بکرێ دەبینرێ کە تەواوی ئەزموونەکانی سەرۆکایەتی بە شێوەیەکی بەهێز بە بنەماڵەگەرێتی کاریگەر بوون. لەچەرخەکانی یەکەمین و ناوینتا ئەمە تایبەتمەندێتیەکی بەربڵاوە. هەرچی لای کوردانە ڕۆڵێکی هێگجار بکوژانەی بینیوە. خێزان وەکو دەزگایەکی سۆسیۆلۆژیك، لە تەمەنێکی زوودا لە تەمەنی نێوان ١٥ ـ ٢٠ ساڵیدا پیاوانی کورد دەگرێت و وەکو دڕندەیەکی بێکاریگەرکردن وایە. هەروەکو دەزانرێ ئەگەرچی لەئاستی باب و باپیراندا بێت یاخود ئاستی ژندا بێت ئەوانەی دووچاری ئەم پەیوەندییە دەبن هێندە

خێریان تێدا ناهێڵێ. تەنانەت تەواوی کات و وزەی خۆی بۆ ئەم کێشەیە بەکاردێنێ. ئەنجام، هاربوونێکی نیوەچڵ، شێتایەتی و کەسایەتییەکە لەلایەنی کۆمەڵایەتی و سیاسی هیچ واتایەکی نەمابوو. ئەمە لایەنە گشتییەکەی مەسەلەکەیە. فۆرمی سەرەکی سیستەمی کولتووری و کۆمەڵایەتی کوردانە کە تاك فووت دەدات. ئەگەر لەو گۆڕەپانەی لەناستی مێژوودا دەوڵەت و سیاسەت پەیوەندیدار دەکات هەنگاو بهاوێژێ، واتە بە شێوازی گرتنی ئەنکیدۆ لە بۆسەدا گیرایت. بەبێ ئەوەی پێویستی بە سۆبژەکتیڤی هەبێت، ڕۆڵی ژن، ئامرازێکی خستنە کە ناقۆڵاترین و شیارترین سیخوڕ تێپەڕ دەکات. هەر لەسەردەمی سۆمەرییەکانەوە لە سیستەمی دەوڵەتی ڕاهیبەکان، ژن بوونەوەرێکی سەرەکی ماڵیکردن و پابەندکردنی پیاوە بە سیستەم و سیاسەت و دەوڵەت. ئەگەر لەبیرمان بێ چۆن ئەنکیدۆ پەروەردە کرا، ئەوا دەرك بە گەوهەری سیستەم دەکەین.

لەو ڕووداوەی مندا کەسیرە بەتەنیا ڕۆڵی دەوڵەتی دەبینی. کاتێك بەشێوەیەکی بابەتی هەڵیسەنگێنین دەبینین کە ئاغا ژنێك بوو، کە هێزی لە پەیوەندی خێزانی بۆرژوای نیو دەرەبەگ و دەوڵەت وەرگرتووە. یەکێکی وەها ئاسایی نەبوو، خاوەنی زۆربەی ئەو تایبەتمەندێتیانە بوو کە لەئاستی بەرزدا یاری بە پیاو بکات. دەشێ هیچ بۆ دەوڵەت پێویست نەبێ . وەکو ئاغا ژنێك، ئاشکرا بوو کە وەکو ئێمە نەدەبوو بەکەسێك کە پارچەکانی گوندێتی سادە فووت بدات. لەخۆ بەگران فرۆشتن بەولاوە، سروشتییە کە لەمنیازیدا نەبێ دەست لەئارەزووی باڵادەستی و تامەکەی بەربدات. بێگومان وەکو پێویستی کارەکتەرێکی چینەکەی لەبەرئەوەی لە دەزگایەك دەهات کە لە نێوان کوردان و دەوڵەتدا یاری دەکرد، بەمەرجی شێوازێکی بابەتیانە، ئاشکرا بوو کە هەردوولا بەکاردێنێ. چاوەڕوانی ئەوە دەکرا کە بە ئاسانی دەست لە ڕۆڵی ڕێبەرایەتی بەرنادات. دەشێ ئەم هەڵوێستە واقیعیانەتر بێ. ئەگەر وەکو ملیتانێك کە باش کار دەکات، من بخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆی، بۆخۆی ڕێگای لەپێش تواناکاری مەزن دەکردەوە. شیمانەیەکی مەزن ئەوەیە کە مەسەلەی هاوسەرێتی بەم ئامانجە لێکدراوەتەوە. تامەردن لەسەر ڕێبازی خۆی بەرێوەدەچوو. لە ئەنجامی بە قورسایی وروژاندنی گروپ و گۆڕانی لەدایك بوونی PKK بۆ دیوەزمەیەك و پەشیمان کردنەوەی من لەوەی هاتوومەتە دونیا، تاوەکو دوایی ڕۆڵی خۆی دەبینی. چینی بەکرێگیراوی نەتەوەیی لەنێو سارد بوونی ماردا بە داکۆکی کردنێکی مەزن تاوەکو دوایی درێژەی بە هەڵوێستی خۆی دەدا.

باشە من لێکدانەوەی چیم دەکرد؟ بەر لەهەموو شتێك دەرکم بەوە کردبوو کە کێشەکە کێشەیەکی بچووکی خێزان نییە و کارەکتەری موحافەزەکارانەی ڕاستینەی خێزانم ناسی. بە ئێشێکی مەزن دەرکم بەوە کردبوو کە لە ڕاستینەی کورددا کاتی هەستە شکۆدارەکان نەهاتووە. لەیەکەم هەنگاودا خەیاڵی سەبارەت بە لە وڵاتێکی ئازاددا ڕۆیشتن لەگەڵ ژنی ئازاد وەکو گەورەترین بەڵا بەسەر سەر و دڵمدا تەقیەوە. موخاتەبەکەم ژنێکی ئاسایی نەبوو.

نموونەی هەرە پاڵاوتەی ئاغازنی شێوەی بە کرێگیراوی بنەماڵەی کوردان بوو کە هەزاران ساڵ پێشتر پاڵێورا بوو. ئەگەر بەردیش شەقی بیردبایە لە رەوشێکی وەهادا نەبوو ئێمەمانان لە نۆکەرێك جیاوازتر لە ماڵی خۆیاندا پەسند بکەن. بەڵام منیش نوێنەرایەتی ئەو کوردە نوێیەم دەکرد کە تازە لەدایك ببوو، رۆڵی ئەوەم دەبینی. موخاتەبەکەم زوو هەستی بەمە کردبوو. ماوەیەك بەردەوام لە دەوروبەری خۆیدا رۆژ بە رۆژ گووتنێکی وەهای پێشدەخست:"ئەمە لە هیچ یەکێکتان ناچێت" ئەوەی مەبەستی ئەوانەی تر بوو وەکو نێچیرێکی ئاسایی وابوون.

پێ بە پێ ئاشکرا دەبوو کە خاوەنی نیشانەکانی مێردایەتی کلاسیك نیم. ئەمەش ژنەکەی شێت و هار دەکرد. شیمانە دەکرێ ئەم تایبەتمەندێتیەم ئەو هۆکارە بێ کە تەواوی پیلانەکانی ئەوی تێکدەدا. دایکم منی بە زنجیر بەند نەکردبوو. کەچی ئەویش لە خۆشی ئەوەدا بوو کە ئەمە ئەنجام بدات. شەڕی من لەپێناو ژن هەر لەمێژەوە دەستی پێکردبوو. هەرچی ئێستایە بە هەستیارترین لایەڕەیدا تێپەڕدەکەم. ئایا دەبووم بە ئەنکیدۆ؟ یاخود جارێکی دیکە خوداوەندە ژنم لەسەر تەختی خۆی دادەنا و دەمتوانی ئەنکیدۆکان لەدەست سۆزانیە تایبەت و گشتیەکان رزگار بکەم؟ لەڕاستیدا کێشەکە مێژوویی بوو و چارەسەریەکەشی زۆر زەحمەت بوو. قووڵبوونەوە و درێژخایاندن و بەردەوامبوونی ململانێکە، لەنزیکەوە پابەندی رەوشی هەردوو لایەنەی هێزەکان بوو. لەو رەوشانەی بەمجۆرەن لەناوبردنی جەستەیی بەهایەکی ئەوتۆی نییە. شیکردنەوەی پەیوەندیەکە، بەهایەکی مێژوویی هەبوو. هیچ کاتێك گومانم لە ڕاستی شێوازەکانی خۆم نەکرد. مەسەلە ئەوە بوو تا چ رادەیەك دەتوانم شیبکەمەوە و بەرگە بگرم. تا چ رادەیەك دەمتوانی گروپ و PKK لەو بەڵایە بپارێزم کە بە زەحمەتیەوە تازە هەوڵی هەنگاو هاوێشتنی دەدا؟ ساتی مردن و ژیانی پیلانگێڕیە بابەتیەکان، ئەگەر هەشبێت خۆییەکان، لەئارادا بوو. باس لە مردنی ماددی و جەستەیی ناکەم. باس لەمردنی شێوازەکەی ئەنکیدۆ دەکەم. دەشیا لە تەنگەبەری خێزان و ژن فووت بدرێم. قەدەر و پیلانیش پێویستی بەمە دەکرد.

لە بەرامبەر مێژوو دەتوانم ئەوە بڵێم کە لەگەڵ دەرکەوتن بۆ دەرەوەی وڵات لەیەکەم هەنگاودا سەرکەوتووو بووم. بەبێ داڕووخان لەبواری ماددی و مەعنەوی رزگاربوون لەم پەیوەندیە، بابەتێکە بەپێی پێویست نرخ و بەهاکەی شینەکراوەتەوە. بەڵام لە دیالەکتیکی مێژووی کورددا بەواتای کۆتاییهێنان بە قۆناخێك و هەنگاونان لەقۆناخێکی نوێدا بایەخێکی مسۆگەر و یەکلاکەرەوەی هەبوو. کاتێك بەتەواوی سەیارەت بەم بابەتە دەرك بە هەڵوێست و چاوەڕوانیەکانی دەوڵەت کرا، ئەوا دەتوانرێ هەڵسەنگاندنی واقیعیانەتر دەرهەق بە قۆناخ بکرێت.

رەهەند و بوارێکی بەرزتری بابەتەکە، دوای ساڵی ١٩٨٠ لە خەباتی رۆژهەڵاتی ناوین و

ئەورووپا ڕەنگی دەدایەوە. لە لقی دووەمدا هەوڵی هەڵسەنگاندنی دەدەم.

لەقۆناخی لەدایکبوونی گرووپ و PKK دا گرێدراو بە پێشکەوتنی پێشەنگایەتی هەڵسەنگاندنی هەندێ پەیوەندی کە شایانی باسکردنە جێگای بایەخ و گرنگی پێدانە. ئەمانەش خۆدەرخستنە پێشی شاهین دۆنماز و شەهیدکردنی حەقی قەرار و پەیوەندییەکانی نەجاتی قایای فرۆکەوان بوو کە وەها باوەڕدەکرا ئەرکی پێ سپێردراوە. حەقی قەرار سەمبۆلی بوێری و فیداکاری گرووپ بوو. هەروەکو ڕۆحی شاراوەی من بوو. بەردەوام تێگەیشتنی زیانە کورت و واتادارەکەی و گەیاندنی برایەتی، یەکێتی و ئازادی گەلەکانمان، پێویستە هەم وەکو سەرەکیترین سەرچاوەی ئیلهام هەم وەکو ئەرکێکمانی بزانین. سەرباری ئەوەی ئەو گێرەشێوێنییەی بنەماڵەکەیان لەسەرووی هەمووشیان باقی قەرار ڕۆڵی تێدا بینی زیانێکی مەزنی لێکەوتەوە، دیسان بەردەوام بەهای ئەم بیرەوەرییە بەشکۆمەندی دەمایەوە. بەڵام لەوانەیە چالاکیە تاوانکاریەکەی عەلائەددین قەهپان ی سەر بە پێنج پارچە خوازەکانی گرێدراو بە نەتەوەپەرستە سەرەتاییەکانی PDK نەخشە بۆکێشراو بێت. ئەمە بە تاوانێکی تەسلیمکار و گێرەشێوێن دەچێ. لەڕەوشێکی وەهادا شرۆڤەیەکی بەمجۆرە ڕاستە کە خواستیان لەدەستی ڕاستەم بێبەش بکەن. ئەگەر کوشتنەکە نەخشەی بۆ کێشرابێت، ئەمە کراوە بە ئامانج. حەقی لەژێر چاودێری نزیکی نەجاتی قایاشدا بوو. بەڵام بەشێوەیەکی خاوەن دەرکەوتنی گرووپ لەبیرەوەری شەهید کرابوو بە سەرچاوەی بەهێزبوون. ئەنجامێکی پێچەوانەی ئەنجامە چاوەڕوانکراوەکانی لێکەوتەوە.

لەوانەیە فرۆکەوان نەجاتی قایا نموونەی بۆیەکەمجار کەوتنەگەڕی سوپا بێت. هەندێ پێشنیازی کە ڕاستەوخۆ سەبارەت بە چالاکی گێرەشێوێنانە بۆ مەی کرد، هەندێ پەیوەندی دیکەی، زوو ڕێگای لەپێش ناسینی ئەو کردەوە. کوردێکی خەڵکی ئاگری بوو. هیچ کاتێک دونیا ڕاستەقینەکەیم نەدەزانی. من دەرگەم بە ئامانجە سەرەکییەکەشی نەکرد کە سەبارەت بە من هەیبوو. ئەوەم لەبیرە جارێکیان لەو بینایەی لێی دەماینەوە گووتی:" کاکە تەنیا تۆ فەرمان بدە، دەتوانم لە نهۆمی چوارەمی ئەم بینایە خۆم فڕێدەمە خوارەوە، دەتوانم هەر بانکێك رووتبکەمەوە و هەر فاشیستێك بکوژم". بەڵام فەرمانم نەدا. باسیان کرد کاتێك چووەمە دەرەوەی وڵات هاربیوو. دواتر بیستم کە لە ڕووداوی فرۆکەیەکی دەرمانکردنی کێڵگەکاندا مردووە. وەکو پیاوێکی ئەرك پێسپێردراو هەردەم لەپشتمەوە بوو. دەیتوانی ببێ بە سەرهەنگ ئەلیاس ئایدنێکی دیکە کە لەگەڵ ماهیر چایان و هاوڕێکانی چالاکی ئەنجام دەدا. تەنانەت ئەگەر شیمانەیەکی لاوازیش بێت، پرسیاری ئەوەم لەخۆم دەکرد ئایا نابێ بە هەوادارێکیش. بەشێوەیەکی بابەتی ڕۆڵێکی زۆری لەوەدا هەبوو گرووپەکەمان لە ئەنقەرە بەهێز بێت. ئەندامێکی گرووپ نەمابوو بەخێوی نەکردبێت.

ملیتانی بەرچاوی ئەم قۆناخە شاهین دۆنماز بوو. ڕۆڵی پارەمەتیدەری مەی دەبینی. بەڵام

لەناوخۆدا یەکەمین تاوانی دڕندانەی بەرامبەر هەڤاڵی خۆی ئەنجامدا. داخوازی خۆ بەهێز نیشاندانی لەڕێگای ئەم دەستپێشخەریانە لایەنی لەپێشی بوو. ئاڵۆزی کەسایەتیەکەی سەرچاوەی خۆی لەپێکهاتەی بنەماڵەکەیەوە دەگرت. لایەنێکی لاوازی لەدایکبوونی رێبەرایەتی بوو. زوو تەسلیمبوونی لە لێپرسینەوەی پۆلیسدا، رێگای لەپێش ئەوەدا گردەوە زوو بەرەو رۆژهەڵاتی ناوین ئاراستە بگرم. ئەگەر تەسلیم نەبووایە ئاراستەی مێژوو زۆر جیاواز دەبوو. هەروەها گوشاری بۆ ئەو هەڤاڵانەی نەهێنابووایە، کە شەڕی پاراستنی کەرامەتییان دەکرد و ناچاری مانگرتن تا مردنی نەکردبووانایە، لەوانەیە قۆناخی ١٥ی ئاب بەم شێوەیەی کە هەیە پێشنەکەوتبووایە. نوێنەرایەتی ئەو کەسایەتیەی کوردانی دەکرد کە لە هەلومەرجە سەختەکاندا بەسانایی ڕیز دەگۆڕێ. هەرچی لەڕۆژانی ئاسوودەیی و ئاساییدا، ئەمانە خۆیان وا نیشان دەدەن کە لەپێشەوەی هەمووانن.

شیمانەی هەرە مەزن ئەوەیە دەوڵەت لە ڕێگای کەسیرە و ئەجاتی خواستی گروپ، بەتایبەتیش من، بخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆی، دەتوانم بڵێم کە خواستی بەڕێگای شێوازی باو واتە بە پارە و ژن ئەمە ئەنجامبدات. ئەگەر هەڵەی مەزنم بکردبووایە، ئەوا بەرلەوەی PKK لەدایك بێت، واتە لەقۆناخی گروپدا پاکتاو دەبوو. پارە و ژن کە بەردەوام کەسایەتی کورد لەبەرامبەری تێکدەشکا، وەکو دوو چەکی بەکاریگەر بەکارهێنرا بوو. لەلایەك ئەو تاوانەی ئەنجامدرا، لەلایەکی دیکەش تەسلیمکاری پێشوەخت، ئەوەی لەگەڵ خۆیدا هێنا هەنگاوێکی وەها بهاوێژم کە ئاراستەی مێژوو بگۆڕێ. بۆ یەکەمجار بوو لەقۆناخی کۆماردا ئیرادەی ئازادی گەل ڕووبەڕووی بە دەزگابوونێکی مێژوویی ببێتەوە. کەسایەتیم قۆناخێکی قورس و ئاستەمی تێپەڕ کردبوو. وڵاتپارێزی، رزگاربوون لەگەمارۆی خێزان، بەبێ داڕووخان دەرکەوتن لە ئەخۆشیە سۆزداریەکەی گەنجێتی، بەدەستهێنانی ناسنامەیەکی نوێ بەناوی PKK لەم قۆناخەدا بۆ یەکەمین جار لەسەر شانۆی مێژوودا دیار دەبێت. ئیتر ئەلتەرناتیڤی گەل لەدایك دەبوو. پیلانگێڕیە باوەکان ئەنجامێکی پێچەوانەیان لێکەوتبۆوە. کۆچکردنم بۆ رۆژهەڵاتی ناوین، بایەخەکەی لە نموونە مێژووییەکان کەمتر نییە. لەسەرۆکایەتیدا نوێنەرایەتی وێستگەیەکی نوێی دەکرد.

### ب ـ پارچەبوونی سۆسیۆلۆژی کەسایەتی و سەرلەنوێ ئاواکردن

قۆناخی ١٩٨٠ ـ ١٩٩٠ سەبارەت بە پەرەسەندنی پێشەنگایەتی سەردەمی دڕاندنی کەسایەتی خۆجێیی و سەرلەنوێ ئاواکردنیەتی. سەرباری هەندێ زیان کۆچکردن بۆ دەرەوە بەشی سەرەکی گروپی رزگارکردووە. لەشڵەژاوترین سێگۆشەی هاوسەنگی جیهان قەرارگا ئاواکراوە. سێگۆشەی ئیسرائیل ـ لوبنان ـ سوریا لەسەرووی گۆڕەپانی کۆچە باوەکانی خەڵکانی میزۆپۆتامیا دێت. هاوسەنگی و پێکدادانی رۆژهەڵات ـ رۆژئاوا لەم گۆڕەپانەدا لەناو گەرمترین

قۆناخ و رۆژانی خۆیدا بوو. یەکێك لەقۆناخە گرنگەکانی پێکدادانی مێژوویی ناوخۆی ئیسلام، شەڕی ئێراق ـ ئێران (١٩٨٠ ـ ١٩٨٨ ) دەستی پێکردبوو. پێکدادانی عەرەب ـ ئیسرائیل لەیەکێك لەقۆناخە هەرە گەرمەکانی خۆیدا بوو. نەتەوەپەرستی کوردان لەنێو لێکەڕینی نوێدایە. نەتەوەپەرستی سەرەتایی هەوڵدەدات سوود لەو هەلومەرجە نوێیانە وەربگرێت. لەم هەلومەرجانەدا ئیرادەی ئازادی گەلی کورد بەدەزگا ببوو و خاوەنی شانسی بڵاوبوونەوە بوو. توێژێکی گرنگی کۆچبەران کەڵەکە ببوو. گرووپێکی ٣٠٠ کەسی بەبڕیار پێکهاتبوو. کوردەکانی سووریا و لوبنان ریزەکانی خۆیان بۆ شۆڕش کردبۆوە. شۆڕشی ئێران تواناکاری مەزنی خوڵقاندبوو. گەرمایی تێکۆشانی وڵات بەردەوام بوو. بە هۆی مەترسی دەرکەوتنی گۆڕانکارییەکان لەژێر کۆنترۆڵی تورکیا، رۆژئاوا رژێمی ١٢ی ئەیلولی ئەرێ کردبوو. هەڵوێستی فەلەستینیەکان پڕبوو لە لۆژیکی بازرگانان. کاتێك لەسایەی هەبوونی ئێمە هەندێك قەرەبوویان لە ئەنقەرە سەند، دۆستایەتیەکی بەهەندیان لەگەڵ ئێمەدا نەمابوو. سورییاییەکان وەکو یەدەگێکی درێژخایەن و بەتەدبیر نزیك دەبوونەوە. سەرۆکی YNK کە نەتەوەپەرستێکی کوردە و بووە بە گورگ، هەروەکو چۆن گەلێك کەسایەتی هەرزەکار و بێ ئەزموونی بەکارهێنا، بەهەمان شێوە نزیکی سەرۆکایەتی PKKش بۆوە. لەهەموو لایەکەوە رەوش گۆڕابوو. بۆئەوەی رۆڵی مێژوویی ببینرێ دەبووایە هەڵەی مەزن نەکرێت. هەروەها نەدەبووایە ببێتە تاراوگەیەك کە بۆنی کۆچبەری گرتبێت. پێویست بوو بەرامبەر کاریگەری گەندەڵی ئەورووپا وشیار بین. پێویستی گەڕانەوە بۆ وڵات لەکاتێکی گونجاودا، سەرەکیترین خەبات بێت.

لە رەوشێکی وەهادا بووم بتوانم تەواوی ئەم مەسەلانە هەڵسەنگێنم. گێرەشێوێنیەکانی کەسیرە و نەبوونی بانگەشەی ئەو هەڤاڵانەی کە دەبووایە پارەمەتیدەربن لەسەرووی هۆکارەکانی تەنگەتاوبوونم دەهات. یەکبوونی کاریگەری هەردووکیان هێزەکەمی دەخوارد و بێکاریگەری دەکردم. محەمەد قەرەسونگور بەشێوەیەکی زۆر ساف لە بەهاری ١٩٨٢دا بووە قوربانی پێکدادانەکانی YNK و PDK. گرووپە چەپەکانی تورك و گرووپە کوردییەکانی خاوەن زهنیەتی بۆرژوای بچووك ـ دەرەبەگ کە هاتبوونە گۆڕەپانی رۆژهەڵاتی ناوین جگە لەبوون بە کۆت و بەندەکانی بەرپێیان هیچ واتایەکی دیکەیان نەبوو. هەر لەبەهاری ١٩٨٠دا جارێکی دیکە گرووپەکانمان بەرەو ناوەوە ئاراستەیان گرت. دەستگیرکردنە بێوەخت و نابەجێیەکەی کەمال پیریش ئەنجامی ئەوە بوو. لەڕاستیدا یەکێکی وەها بوو کە ببێتە دەستە راست. بەردەوام بەمجۆرە خۆزگەم دەخواست بمابووایە و سەرجەم کارەکانی ملیتانی و کردارییمان بۆ ئەو دانابووایە! هەڤاڵێك بوو کە هەرە زێدە هەست بەبۆشایی جێگاکەی دەکرا. هەڤاڵێکی هێندە خۆش و ژیر بوو، تەنانەت کاتێك دواهەناسەی خۆشی دەدات سەبارەت بە مەسەلەی سەرۆکایەتی سەرنج رادەکێشێ و دەرهەق بە کەسیرە و جان یوجە و وشیارمان دەکاتەوە،

وەسیەتی خۆی دەکات. هەرچەندە لەناوەوە گرتنێکی بەرفراوان هەیە، هەروەکو چۆن سەرکەوتووانە دەردەکەوێتە دەرەوەی وڵات، سەرلەنوێ یەکەمین هەنگاوەکانی چوونە ناوەوەی ئەنجامدەدا لەو کات و زەمینەیەی بەدەستهێنرا بوو سەربەخۆیی، رەسەنێتی و خاوێنی رێبەرایەتی گەلی کورد لەسەرووی هەمووشتێکەوە دەهات. دەشیا ئەمە بۆتەواوی گەلانی رۆژهەڵاتی ناوینیش ببێتە ئومێدێك. ئەوەی باوەڕیان بەمە هێنابوو بەخێراییەکی بەردەوام ژمارەیان مەزن دەبوو. هەلومەرجەکانی زیندانی دیاربەکر و مانگرتن تا مردن جموجۆڵێکی زووتری پێشوەختی دەکردە ناچاریەك. ۱۲ ی ئەیلول کەوتبووە قۆناخێکی نوێ. بۆئەوەی نیشانبدرێ شۆڕشگێڕێتی کۆتایی پێنەهێنراوە و چیتر ناتوانرێ بەرامبەر ئەشکەنجە بێ کاردانەوە بمێنن، هەروەها پێویستیەکی پابەندبوون بە رێباز، هەنگاوی ۱۵ی ئاب گونجاو بینراوە. بەشێوەیەکی کرداری قۆناخی نوێ دەستپێکردبوو. ئەگەر شەهیدەکانی چالاکی مانگرتن تا مردن نەبووایە، لەوانەیە بەشێوەیەکی جیاواز بمابوواین. توندوتیژی بانگی توندوتیژی دەکرد. ئیتر مێژوو لەنێو بازنەی توندوتیژی دەخولێتەوە و رێگا دەگرێتەبەر. هەروەها لەهەمانکاتدا وەڵامێك بوو بۆ ئەو وەسیەتەی مەزلوم دۆغان کە دەیگووت" دەبێ دونیا بانگەوازیەکەمان ببیسێ".

چەندین پەرتووکی وەکو پرسی کەسایەتی لە کوردستان، ژیانی پارتی و تایبەتمەندیەکانی خەباتکاری شۆڕشگێڕ و رۆڵی زەبر و زەنگ لە کوردستان و سەبارەت بە رێکخستن و راپۆرتی سیاسی کە بەناوی سەرۆکایەتی پێشکەش بە کۆنفراسی یەکەمی (۱۹۸۱) کرا و ئەو نووسینانەی لە رۆژگاری ئەمڕۆمان بەهایەکی کلاسیکی هەیە لەم رێککەوتەدا نووسرابوو. هەموویان لە ماوەی نێوان ۱۹۸۰ ــ ۱۹۸۵ نووسرابوون. چەندین ئاخافتنی درێژ کە بۆ کۆمیتەی ناوەندی کرابوو هەریەکەو بەهای پەرتووکێکی هەبوو. رۆژنامە و گۆڤارەکان بە زمانی جیاجیا بڵاودەکرایەوە. بە سانایی کێشە و گرفتە ماددیەکان و خۆ پڕچەککردن چارەسەر دەکرا. ئەبوونە پراکتیکی و تیۆریەکان هێندە دەوڵەمەند بوو کە رێگا لە پێش هەر سەرکەوتنێك بکەنەوە. هەنگاو بۆ رێبازێکی مێژوویی چالاکی هاوێشترا بوو. بەرامبەر بە ۱۲ی ئەیلول کە رووی بۆ ئاشتی و رێککەوتنی دیموکراتییانە کراوە نەبوو و مەزەندە نەدەکرا کە ئەم قۆناخەی تاوەکو کوێ و چۆن و چ کاتێك ئەنجامگیر دەبێ، شێواز و بەبڕیاربوون و خێرایی کار لە ئاستێکی شایستەی رێبەرایەتی گەل بوو. بێبەشی لە پارەمەتیدەرە بەهێزەکان، لەو قورساییەدا نەبوو قۆناخ دووچاری دابڕان بکات.

بەڵام ئەو لاوازیانەی لە قۆناخەکانی پێشووتر دەرنەکەوتبوون ئیتر سەریانهەڵدەدا. هەندێ گۆڕەپانی جیاواز سووربوون لەسەر ئەنجامنەدانی گۆڕان و وەرچەرخان؛

بەرلە هەمووشتێك خۆسەپاندنی کەسیرە لە دەرەوەی سنوورەکانی تەحەموول کردندا بوو. گوڕی بە پیلانگێڕیەکانی دەدا. لە هەستیارترین شوێن و خاڵدا بە رووی هەندێك دەوروبەری

دۆستان و هەڤاڵانی دەکێشا. هیچ کەسێك وەکو ئەو واتای ئەوەی نەدەزانی کە ئیتر بە شێوەیەکی مێژوویی کۆتاییەکەی کولتووری بنەماڵەی بەکرێگیراو هاتووە. جیهانێکیان هەبوو، هەڵدەوەشایەوە. جیهانێکی نوێی گەل دەکرایەوە. بەهیچ جۆرێك لەلایەنی نیاز و رۆحدا نەیدەخواست خۆی بەگوێرەی ئەمە ئامادەبکات. هەروەکو بڵێی دەیخواست بسەلمێنێ کە گەلان دونیایەکی ئازادی و جوانی وەهایان نابێت کە هی ئەوان تێپەڕبکات. هێندەی جیهانی گەل لەکەسێتی مندا دەکرایەوە، رەنگی ئەو کاڵ دەبۆوە. ئەگەر بەشێوەی کاریکاتێرێکی زۆر سادەش بێت ئەم هەڵوێستەیەی بەردەوام کیلیۆپاترای بەبیردەهێنامەوە کە لە فیلمێکدا بینیبووم. بۆ ئەو، کۆشکە کۆنەکانی میسریەکان گرنگ بوو، نەك ئیمپراتۆری رۆمای قەیسەر. تاکە کۆشکێکی فیرعەونی بە جیهان نەدەگۆڕیەوە. کەسیرەش کۆشك و خانەدانێکی هەبوو، ئەویش بنەماڵەکەی بوو. تەنانەت ئەگەر دونیای گەل بەهەشتیش بێت، ئەو تەنیا پێی تەنگەتاو دەبوو.

کاتێك بەرەو سێیەمین کۆنگرەی PKK ی ساڵی ۱۹۸٦ دەچووین دەیخواست دواترین و گەورەترین گێرەشێوێنی خۆی بتەقێنێتەوە. لەبەرئەوەی خۆم لەخراپەکانی بەلاوە دەدا، لەدواوە بەدواداچوونی کۆنگرەم گونجاوتر بینی. لەنێو کین و نەفرەتێکی وەهادا بوو هەروەکو بڵێی هەزار ساڵە شەڕ دەکەین. هێشتا دۆڕاندنی پەسند نەدەکرد. هەروەکو بڵێی چینە تواوەکەی سەردەستی کورد لەکەسایەتی ئەودا دوا هەناسەی خۆی دەدا. تەنانەت من تا دوا ساتیش هەموو پێویستیەکانی هاوسەرێتی، دۆستایەتی و هەڤاڵێتیم پێشکەش کردبوو. بەڵام بەردەوام ئاماژەم بەوە کرد کە تەنانەت من خۆشم بم دەرفەت بەکەس نادەم دژی رێبەرایەتی گەل بێت، ئەوەی راستە جیهانی ئازادی گەلانە، یەکبوونمان لەم پێناوەدا بەهایەکی مەزن لەخۆوە دەگرێت. بەڵام داکۆکی لەسەر هی خۆی کرد. رێکخراو لایەنگری ئەوە بوو کە بە مردنێکی رەها سزابدرێت. ئەویش مردنی دەخواست. ئەمە بەردەوام منی بەرەو تێفکرین برد. ئەو کاتە گوتبووم گەورەترین سزا ئەوەیە بهێڵین بژیت. هەروەها لەرەگەزێکی چەوساوە و کورد بوو. ئەنجامی مێژوویەکی نەفرینی هەزاران ساڵە گەیشتبووە ئەم خاڵە. سەرباری ئەمانەش تۆڵەسەندنێکی قەبە لە جێگای خۆیدا نەبوو. گرنگتریش ئەوە بوو کە پەیوەندی من هەر لەسەرەتاوە بەدوای رێککەوتنەوە بوو. بەو ئامانجەش پەیوەندیم بە بنەماڵەکەی ئەو بەست. ئەمە نیازی رێککەوتنێکی سیاسی دیموکراتیانە بوو. خیانەتکردن، شایستەی راستینەی سەرۆکایەتیم نەبوو. بەڵام ئەو پەیوەندیەی تەنیا لەرێگای دێرە قووڵەکانی زۆمان رووندەکرێتەوە، دوای قۆناخێکی گڕگرتووی دەساڵە، لە پاییزی ۱۹۸۷دا هەروەکو چۆن لەتاریکییەوە هاتبوو، بەبێ دڵی و خواحافیزی لە تاریکیدا نقووم بوو.

تاقیکردنەوەیەکی ئەشق زۆربەگرانی لەسەر من و گەل دەوەستا. هەربۆیە راپێچکردنی هەندێ لەهەڤاڵانم تاخۆکوشتن، بەردەوام منی دەئێشاند. بەڵام تاوەکو تێکۆشانە کۆمەڵایەتی و

نەتەوەییەکان، پەیوەندی دیالەکتیکی زاڵ بەخۆیەوە نەبینێ و وەرنەچەرخێ بەرێوەنەدەبرا. رووخانی تراژیدیانەی هەندێ پەیوەندی بۆ ئاواکردنی پەیوەندی نوێ دەبووە ناچارییەك. ئەمەش شتێکی هاوشێوەی ئەمەبوو. تاوەکو ئەم گرێکوێرە پارچە نەبووایە، بە هیچ جۆرێك خوداوەنـدە ژنـی ئەشـق نەدەناسـرا و ژنم نەدەناسـی. ئـەوەی لەپەیوەندیـەکدا شـیکرایەوە، چینایەتی و مێژوویکی زەبەلاح بوو. پـەیوەندی ئاماژەپێکراو، کۆنـترین پەیوەندی کۆیلایـەتی بوو. زۆر دووری مێژووی گەلێك و راستینە کۆمەڵاتیەکەی بوو. هەرچەندە ئێش و زیانـەکانی مەزنیش بێت، بەمجۆرە شیکردنەوەی ئەو پەیوەندیە منی لەژن دوور نەخستەوە، بەرامبەریان رق نەستووری نـەکردم. بەشێوەیەك رێگای لـەپێش ئـەوە کـردەوە کە بکەومـە نێو قووڵایـی راستینەی ژن لەوانەیە بەنەسیبی هیچ رۆشنبیرێك نەبوو بێت. بەمجۆرە تۆڵەی ئەو لەیسـتۆگە ترسناکە و پاریکردن بە غرورم دەسەندەوە. بەبڕیاربووم ئەو ژنێتییەی ئەو و پیاوێتیەی خۆم بکوژم کە رێگایـان لـەپێش ئـەم پەیوەندیـە کـردەوە. تـەنیا بـەمجۆرە دەمتوانـی بـە نـاوی مرۆڤایەتی، وڵاتپارێزی، یەکسانی و ئازادی وەڵامی بدەمەوە. لـەو ساڵەوە تـا ئـەم رۆژگـارە، زۆر نووسـینم سـەبارەت بـەژن کـرد، بەرامبـەریان کرامــەوە. مەزنایـەتی ئـەوانم بیـنی، هـەروەها بچووکایەتی خۆم و ئەو پیاوەی کە لە هەقیان دەرناکەوێت و پەیوەندییـە قێزەونـەکانی ژنـانم شیکردەوە. تەواوی رواڵەتی ناوەوەی ژیانی ماڵی گشتی و مـاڵی تایبـەتم روونکـردەوە. بـە هەڵـە تێنەگەن؛ پەیوەندیە ئاواکراوەکانی خێزان تاوانبـار ناکـەم. بـەڵام لەبـەر ئـەو رێـزە گەورەیـەی بەرامبەر ئەشق هەمە، بەرامبەر بەوانەی ئومێدی مەزنیان بـە منـەوە گرێـداوە و بەسـەدانیان بە ئاگرلەخۆبەردان خۆیان سەلماندووە، ئەمە وەکو ئەرکێك دەزانم. دەبووایە ئەشق لەم خاکەدا بژیت. لەم پێناوەشدا دەبووایە شەڕی پێویست بکات.

ئـەو شـەڕە مـەزنـەی بەهایـەکی زۆرم پێـدەدا پـەیرەو کـراو ئەشـق تێیـدا سـەرکەوت. ئیـتر داهاتوو بۆ سەروەری ژن و پیاوی رەسەن مابۆوە. ئیتر ببووین بە رۆڵەی شایستەی خوداوەنـدی ژنی ئەو خاکەی کە تەواوی بەهاکانی شارستانییەتی، لەسەرووی هەمووشیانەوە ئەشقی، تێدا هەڵگشابوو. تیۆری و کرداری ئەشـق بەشـێوەیەکی راسـت پـەیرەو کرابـوو. ئەوانـەی مەشخەڵی سەرکەوتنی ئازادییان بەدەستەوە بوو دەیـانتوانی نزیکی خوداوەنـدە ژنـی ئەشـق ببنـەوە. لـەو خاکانەی کە بە رەنجی خوداوەندە دایك بۆ چـاندن و ئـاژەڵداری کرایـەوە، ئەوانـەی شایسـتەی بوون مافی ئاشق بوونیان هەبوو. یاسایەکی ئەشق هەبوو، پەیرەودەکرا.

هەموو جۆرێکی شەڕ لەگۆڕەپانی گەلاندا زەحمەتـە. ئەگـەر زۆر ئاسـتەم و تەنانـەت لـەنێو زەحمەتیشدا بێت، ئەگەر بەم چەشنە ژنێکی بـەمجۆرە بەرامبـەر سـەرۆکێك بخەیتـە هـێرش، لەمیانەی گەمەکانی زایەندی بخـوازی بیخـەیت کـە هـەزاران سـاڵە پـەیرەودەکرێت، ئـەوا دەبـێ پەسـندیش بکـەیت کـە وەڵامی بەرامبـەری وەهـا دەبێـت. بەرامبــەر کاریگـەرترین ئـامراز و شێوازەکانی پیلانگێرییە مێژووییەکان، بەناوی مرۆڤ و شکۆمەندی و ئەشقەکەیەوە وەڵامێکی

وەهای دراوەتەوە. هەنگاوی دواتریش بۆ کۆششی ڕەسەن و سەرکەوتنی ئەوانە ماوەتەوە کە سەبارەت بەم بابەتە خاوەن پەیمان و بەبڕیارن.

نەبوونی پارمەتیدەریش زەحمەت بوو. لەهەڵکشانەکانی سەرۆکایەتیدا کاتێك پارمەتیدەرەکان هێز و توانای پێویستیان نەبێت، تەنانەت کاتێك خیانەتکاریان لەناودا دەرکەوێت، ڕێگای لەپێش تراژیدیای مەزن کردۆتەوە. هەموو کاتێك دەڵێم: ئەگەر سێ ـ چوار کەس هەبووایە کە بەتەواوەتی خۆیان گەیاندۆتە شێوازی سەرۆکایەتی، ئەوا ئێش و ئازارەکان هێندە گەورە نەدەبوو، شەڕیش نەدەکەوتە نێو ئەم زەحمەتیەوە. ئەو تەنیاییە مێنی مەزن کرد. بەڵام هەڤاڵان و گەلی دووچاری چەندین ئێش و زیانی نابەجێ کرد. لەم بارەیەوە بەردەوام حەزرەتی موسام دێتەوە یاد. حەزرەتی موسا بۆئەوەی قەومی نەفرەتلێکراو بکات بەیەك چل ساڵ لەچیا و بیابان هاوار دەکات. دە فەرمان دەئافرێنێ. بەڵام دیسان قەوم وەکو خۆی دەکات. مێژوو نووسیەتی کە بەتەنیا فەرماندەیەکی بەناوی یەشوو لەدوای خۆی بەجێدێڵێ. هەندێ چیرۆك باس لەوە دەکەن کە قەومەکە بەخۆیان کوشتیان. تەنیایی موسا خەمگینە. تا رادەیەکیش مێژوو وەهای پێویستە. هەروەها دەزانم کە کەسانی وەها هەبوون کە هەزار قات لەمن فیداکارتر و بوێرتر بوون، ژمارەشیان بە هەزاران بووە. بەڵام کاتێك مێژوو دەخوڵقێنرێ، بوون بە خەلیفە و پارمەتیدەر پێویستی بە تایبەتمەندێتی زۆر جیاواز هەیە.

گۆڕانکاریەکی گرنگ کە بەدەزگابوونی سەرۆکایەتی چەواشە کرد، گوایە لەژێر ناوی ڕێبەرایەتی گوندێتی، هەوڵی لەخۆڕا دەرکەوتنی گروپێکە کە لە ئایدیۆلۆژیا و دیسپلین ڕادەکەن. هەلومەرجەکانی شاخ کە مرۆڤ دوادەخات، لاوازی کۆنترۆڵ، ڕێگای لە پێش ئەوە کردۆتەوە شانس و دەرفەتی پێشکەوتنی کەسایەتی دووڕوو و دوور لە پەروەردەی سەرۆکایەتی دەرکەوێتە مەیدان. بەربڵاوی کۆنگرەی سێیەم و خاوەن دەرنەکەوتنی کۆمیتەی ناوەندی لە پارتی، تادوایی زەمینەی بۆ ئەوانە کردوە. ئەو پێکهاتەیەی بە چوارچێتەی ناودەبەین، بەرهەمی ئەم هەلومەرجانەیە. ئەم مەیلە، لەلایەك بنکەی فیداکار و خاوەن باوەڕی تێکدەشکاند، لەلایەکی دیکەشەوە هەوڵەکانی سەرۆکایەتی دەهاوێشتە بیرێکی بێبن و پووچەڵی دەکردەوە. ئەمانە لەو پەروەردە و ئەخلاقە بێبەش بوون کە بتوانن پێهەڵگرتن و قەڵەمبازی سەرۆکایەتی شرۆڤە و پراکتیزە بکەن. کوشتنی ژنان و منداڵان کە لە دەرەوەی ڕێبازی ئێمە بوو، بەشێوەیەکی سەرەکی لەسەر ئەم سەرچاوە دەژیا. ئەمانە بناخەی گەندەڵییەکی جددییان دادەنا. ئەو جۆرە کەسایەتیانەی شەهید مەعسوم قۆرقماز سەرنجمانی بۆ ڕاکێشا بوو، تا ئەو ئاستە چوون کە ئەو ملیتانە هێژایانەی پارتیش بکوژن کە وەکو کۆسپ لە پێش خۆیان دەبینن. تەنانەت ڕۆڵی ئەمانە لە شەهید کردنی هەڤاڵ مەعسومدا جێگای لێپرسینەوە و بایەخ پێدانە.

محه‌مه‌د شه‌نه‌ر و سه‌لیم چروقایا که دوای شاهین له ناو زیندان وه‌کو ته‌سلیمکار رۆڵیان ده‌بینی، به‌لام له‌ریگای دیماگۆژیه‌تیکی تیژ به‌ریوه‌یان ده‌برد، وه‌کو ئه‌ده‌رهسیك رکابه‌رایه‌تیان کرد به رۆڵی خۆیان. خواستیان له‌ریگای دیماگۆژیه‌تەوه و به‌کارهینانی شه‌هاده‌ته‌کانی مانگرتن تا مردن و خۆسووتاندن ئه‌نجام به‌ده‌ستبینن. شیوازی دیماگۆژیه‌تی رکابه‌رایه‌تیان بۆ به‌رده‌پۆشکردنی رزگاری که‌سیتی خۆیان هه‌ڵبژارد. له خراپ به‌کارهینانی ئه‌و تواناکارییه زیادانه‌ی له‌ئارادابوو دووده‌ڵییان نه‌کرد. که‌سایه‌تییه‌کی دیکه‌ی جیاواز دلاوه‌ر یلدرمه. له‌ئه‌نجامی چه‌ند ره‌خنه‌یه‌کی ئاسایی تۆقی و خۆی کوشت، قۆناخێکه پێویستی به شیکردنه‌وه هه‌یه. پێکهاته‌ی بنه‌ماڵه‌که‌یان که هاوشێوه‌ی بنه‌ماڵه‌ی که‌سیره بوو، به‌پێچه‌وانه‌ی چاوه‌روانییه‌کان، له بواری پراکتیکیدا به‌هیچ جۆرێك کۆششێکی پۆزه‌تیڤانه‌ی نیشاننه‌دا، له‌لایه‌کی دیکه‌شه‌وه به‌رده‌وام نه‌خشه‌کردنی مۆدێلی سه‌رۆکایه‌تی، ره‌وشه‌که‌ی زۆر سه‌یر کردبوو. شێوازی ده‌رکه‌وتنه ده‌ره‌وه‌ی وڵات و به‌یه‌ککه‌یشتنی له‌گه‌ڵ سه‌رۆکایه‌تی وه‌کو هه‌ڤاڵێکی به‌رپرسیار دیار نه‌بوو. یه‌کێکی خاوه‌ن وزه‌ی شاراوه بوو. به‌ئومێد بووین. ئه‌گه‌ر له‌دڵسۆزیه‌وه به‌ره‌و مه‌رگ چووبێت، مه‌خابن و حه‌یفه. بابه‌تێکی شایسته‌ی لێکۆڵینه‌وه‌یه.

له‌م قۆناخه‌دا هه‌ندێ هه‌وڵی تیرۆر روویدا. گه‌لێك لێپرسینه‌وه ئه‌نجام دران. به‌لام به‌هۆی زهنیه‌تی دۆگماتیانه و چه‌ندین تاوانباری دروستکراو ئه‌گه‌ر و شێمانه‌ی رووداني هه‌ندێ سزادان هه‌یه. له‌و باوه‌ڕه‌دام که گرنگترین که‌موکوریم له‌م قۆناخه‌دا له‌وه سه‌رچاوه ده‌گرێت که متمانه‌یه‌کی زیاده‌م به راستیه گشتیه‌کان هه‌بوو، له ژێرناوی بابینه خاوه‌ن ئه‌زموون وردکاریه کرداریه‌کانم بۆ به‌رپرسیاریتی که‌سایه‌تی ساده و ئاسایی به‌جێهێشت. ده‌بێ ئاماژه به‌وه بکه‌م که به‌شی خۆم له‌و نه‌خۆشیه قووڵه‌ی سۆسیالیزمی بونیادنراو وه‌رگرتووه. دانانی راستینه‌ی دارنراو له‌جێگای راستینه‌ی مرۆڤی ئاڵۆز، داهێنانێکی زیاری راهیبه‌کانی سۆمه‌ره. له‌ژێر ناوی راستییه گه‌ردوونیه‌کان، راستییه خوداییه‌کان، پرەنسیپه فه‌لسه‌فی و راستییه زانستییه‌کان، راستینه‌ی به‌رجه‌سته له‌پلان و ریزی دووه‌مدا مایه‌وه. ئه‌وه‌ی دۆگماتیزمی به‌خێوکرد، ئه‌م خووره‌وشته هزریه بوو، دوای ئه‌وه‌ی راستیه‌کان ده‌گووترێ هه‌روه‌کو بڵێی ده‌که‌وێته نێو هه‌ستێك که خزمه‌تی خودایی راهیبی پیرۆز به ته‌واوی پێکهێنراوه. هه‌ڵه لێره‌دا بوو.

ده‌توانم بڵێم سه‌بارەت به‌م بابه‌ته ره‌خنه‌دانێکی بوێرانه‌م پێشخست. هه‌رچه‌نده دره‌نگیش که‌وتبێت، تا راده‌یه‌کی گرنگ ئه‌م ره‌خنه‌دانه له‌م به‌رگرینامه‌یه‌دا ره‌نگی داوه‌ته‌وه. له‌و باوه‌ڕه‌دام هه‌م زه‌حمه‌تی و هه‌م به‌هایه‌کی مه‌زنی هه‌یه.

وه‌کو ئه‌نجام سه‌بارەت به پێشکه‌وتنی پێشه‌نگایه‌تی ئه‌م قۆناخه هه‌نگاوێکی پێشکه‌وتوو پێکدێنێ. به‌نداوه راسته‌وخۆ و ناراسته‌وخۆیه‌کانی ده‌وڵه‌ت تێپه‌ڕکراوه. ئه‌و شێوازه کلاسیکیانه‌ی ده‌وڵه‌ت بێکاریکه‌ر کراوه که شۆڕشگێڕان و کورده یاخیبووه‌کانی بێکاریگه‌ر

کردبوو. ئیتر بە قازانجکردنی دۆستانە بێت، یاخود نزیکبوونەوەکانی بەشێوەی ورووژاندن، نەکەوتینە نێو گەمەکانی ئەنجامدانی هەڵەی مەزن. هەروەکو هەوڵەکانی بەرامبەر PKK، وەکو کەسایەتیش ئەو هەوڵانەش پووچەڵ کراونەتەوە کە خواستوویانە بەرامبەر نوێنەری سەرۆکایەتی ئەلتەرناتیف پێش بخەن. کۆنەپەرستی ناوخۆی کوردی کلاسیك، ئەو کەسایەتیەی ئیفلاسی کردووە، بەشێوەیەکی چاوەڕواننەکراو و بەجورئەت لە پووچەڵکردنەوە ڕێگای لەپێش زیانی هەرە زێدە کردۆتەوە. هەندێ هەوڵی تیرۆرکاری پووچەڵکرانەوە. راکێشانی جولانەوە بۆ ئەوروپا و ماڵیکردنیشی، دوای ئەوەی زانیمان دەزگاکانی سیخوڕی و هەواڵگری ئەوروپای بەدواوەیە پووچەڵمان کردەوە.

تایبەتمەندێتی بەرچاوی ئەم قۆناخە، ئەوەیە کە دەوڵەتانی هەرێم کۆنترۆڵکردنی سەرۆکایەتی PKK یان بەبناخە گرتووە. سیستەمی ئیمپریالیستی لەجیاتی ئەوەی راستەوخۆ بکەوێتە نێو مەسەلەکە ماشە بەکاردەهێنێ. بەتایبەتیش نیازەکانی ئەڵمانیا لەسەر ناوچەکە و تورکیا. هەر لەسەرەتاوە بەئامانج گرتنی سەرۆکایەتی PKK پێویست دەبینێ. ئەو هەوڵ و کۆششانەی لەرێگای رێکخراوە دەستکەلاکان بەرێوەدەبات بەهۆی PKK ناستەنگ کراوە. سەرۆکایەتی بەرامبەر ئەمە بەرپرسیار دەبینێ. لەوە دەترسێ ئەو لێکدانەوانەی لەسەر کوردانی کردووە سەرنەگرێ. هەر لەسەرەتاوە یان PKKیەکی بەگوێرەی خۆی یان پارچەبوونی لە رۆژەڤی خۆی داناوە. گرتنەکانی ١٩٨٧ تاقیکردنەوەی خولقاندنی ئەلتەرناتیڤی سەرۆکایەتی PKKیە. لەپشتەوەی هەموو پرۆگرامەکانی شەڕی تایبەتی تورکیا بووە. بەلام کۆك نەبوونیان سەبارەت بە هەندێ خاڵ و زیادبوونی هێز، لەنێوانیاندا رێگای لەپێش ناکۆکی کردۆتەوە. دابڕانی یاخود ملکەچکردن بە سەرۆکایەتی لە ئەوروپا، هەر لەسەرەتاوە ئەو سیاسەتەی بووە کە بەبڕیاربوون و سووربوونەوە پیادەی کردووە. ئەمریکا و ئینگلتەرا خواستوویانە لەسەر YNK بەکاریگەر بن. ئێران و عەرەبستانی سعودیا گرووپە ئیسلامیەکانیان سەپاندووە. هەروەکو چۆن لە دەوروبەری PKK پەیڕەوکرا، هەنگاو بە هەنگاو هەوڵدراوە گۆڕەپانی جموجۆڵی سەرۆکایەتی تەسك بکرێتەوە. بەلام سەرەرای کۆنترۆڵی دەوڵەتانی ناوچەکە، مەوداگرتنی بەرەو سەرۆکایەتی گەل پێشکەوتنێکی مێژووییە. بەتایبەتیش لەم قۆناخەدا بەهای راستەقینەی تێکۆشانی رۆژهەلاتی ناوین دەرکی پێنەکراوە. پێویستە بەئاشکرا بڵێم کە تاوەکو ئێستا منیش بەتەواوی کردنەوەی ئەم بابەتە لەجێگای خۆیدا نابینم. بەلام دەبێ بزانرێ کە تێکۆشانی سەرۆکایەتی لە رۆژهەلاتی ناوین بە نێو شەرێکی دەروونی مەترسیدار تێپەڕبووە. گەورەترین بەرخودان لەپێناو لەدەستنەدانی رۆحی ئازادی ئەنجامدراوە. تەنیا لەمیانەی رۆمانی بەرفراوان و تێروتەسەل دەشێ ئەم بابەتانە بەواتای راستەقینەی خۆی بگات. تاوەکو خەباتی من لەرۆژهەلاتی ناوین دەرکی پێنەکرێت،

ئەوا لەو قۆناخە ناگەن کە بەرەو پیلانگێڕی ١٥ی شوبات رۆیشت. تاوەکو ئێستا سەبارەت بەم بابەتە بەتایبەتیش لەبواری شەڕی سایکۆلۆژیدا بەنەزانی ماوەتەوە. ئەزموون وەرگرتن لەرووداوەکان، بۆ بەلاوەنانی کەموکوڕییەکانی قۆناخ دەشێ ڕێگا لەپێش ڕەخنەدانێکی راستەقینە بکاتەوە. مسۆگەر پێویستە بەتەواوی دەرك بە سەرۆکایەتی ئەم قۆناخە بکرێت.

٤ـ چۆن دەرك بە رووی ناوەوەی پیلانگێڕی سەدە بکرێت؟

لـ پیلانگێڕییە مێژووییەکان پێشکەوتنەکان ناوەستێنێ، خێرای دەکات

قۆناخی دوای ١٩٩٠سەبارەت بەجیهان، ناوچەکە، وڵات، PKK و منیش قۆناخێکی نوێیە. بەفەرمی وەکو قۆناخی هەڵوەشانەوەی کرداری سۆسیالیزمی بونیادنراو پەسند دەکرێ. سیستەمی سۆڤیەت بە هەڵوەشانەوە و پەرتەوازەبوون قەرەبوو و وەڵامی بنبەستبوونی ناوخۆ، ئەنجامنەدانی گۆڕانکاری لە کات و شوێنی خۆیدا دایەوە. ئەو رێسایەی بۆ هەموو دیاردەیەکی کۆمەڵگا پەیڕەودەکرێت، جارێکی دیکە دەسەلمێنرێ. ناکۆکی نێوان ئامانج و بەدیاردەبوون، بۆ ماوەیەکی درێژ بە ڕێگای توندوتیژی بەڕێوە نابردرێت. یان لە ڕێگای ریفۆرم یاخود لەڕێگای شۆڕش بەرەو پێشەوەبردن و گەیاندنی بەقۆناخێکی بەرزتر ناچارییە. ئەگەر ئەمە ئەنجامنەدرێت، ئەوا پووکانەوەی ناوخۆ و پەرتەوازەبوون، لە ڕێگای توندوتیژی، کەلە رۆژگاری ئەمڕۆمان بە فاشیزم ناودەبرێ دووچاری رەستۆراسیۆن دێت. رەستۆراسیۆن، وادەکات هەمان بینا بە کەرەستەی نوێوە لە رابردوو بەهێزتر دیاربێت و بەردەوام بێت. بەڵام لەبەرئەوەی دینامیکیەکانی کۆمەڵگا جموجۆڵ ناستەم دەکات، ئەم بینایانە دەکات بە مۆزەخانەیەك کە کەسی تێدا نیشتەجێ نابێت. سیستەمی سۆسیالیزمی بونیادنراو و فاشیزم کە بەرهەمی شۆڕش و دژەشۆڕشن، کاتێك بۆ قۆناخی ئاسایی بوونەوە نابنە وەڵام و بەرامبەر ئەنجامدانی ریفۆرمی پێویست بەرخودان بکەن، لە رووخان رزگاریان نەبووە. لە کاتێکدا دوای شەڕی دووەمی جیهانی، دونیا بووە شاهێدی رووخانی فاشیزم، ئەوا سۆسیالیزمی بونیادنراویش کەبەرهەمی شەڕە، لەدوای ١٩٩٠ هەڵوەشانەوەی ناوخۆ و پەرتەوازەبوونی بەخۆیەوەبینی. ئەو قۆناخەی هەنگاوی بۆ نراوە، سەردەمی باڵابوونی سیستەمی شارستانییەتی دیموکراتییانەیە کە راستڕەو و چەپڕەو گۆڕانکاریان بەسەردا هاتووە، وەرچەرخانیان بەخۆوە بینیوە و بەیەکگەیشتوون. بەفورسایی رێگاچارەی چارەسەرکردنی کێشەکان، بەپێوانە باڵاکانی سیستەم ئەنجامگیردەبێت. لەسەر ئەم بنەمایە سیستەمی نێودەوڵەتی چاوێك بە پرەنسیپ و دامەزراوەکانی دەخشێنێ و ئەو سەرلەنوێ رێکخستەبوونە ئەنجام دەدات کە وەڵامی هەلومەرجە نوێکان دەداتەوە. ئەو وەرچەرخانەی لەسەرتاسەری جیهان لە ئارادایە لەسەر ئەم راستەڕێیە دایە. لەسەدەی بیستەمەوە هەنگاونان بۆ سەدەی

بیست و یەکەم، زیاتر دەتوانرێ لەمیانەی ئەم دیاردە سەرەکییە پێناسە بکرێ. سەدەی بیست و یەکەم، خۆی بەچەرخی شارستانییەتی دیموکراتی و مافەکانی مرۆڤ ناودەبات.

ئەو شەڕ و ئاشتییەی رۆژهەڵاتی ناوین کەمبۆ سەدان ساڵ پێش ئێستا دەگەڕێتەوە و نەتەوەپەرستی پاشڤەڕۆ بناخەکەی پێکدێنێ بەتەواوەتی لە قۆناخی بنبەستبووندایە. وزە و توانای گەلان لەناکامی کردەوەکانی پاشڤەڕۆیی نەتەوەپەرستی قووت دەدرێت. کێشەکان چارەسەر ناکرێت، لەلایەن گروپێکی بەرژەوەندیخوازی نێو قەیران دەکرێتە شێوازێکی ژیان. لەئەنجامی زێدەڕۆیی رەوشی بێچارەیی قۆناخ رێگا لەپێش دەرکەوتنی ئایدیۆلۆژیا و تەریقەتگەرایی پاشڤەڕۆتر دەکاتەوە.

لەبەرئەوەی تورکیا یەکێکە لە وڵاتە سەرەکییەکانی ناوچەکە، لەمیانەی ئەو قەیرانانەی بەردەوام دووبارە دەبنەوە، بە بەرفراوانترین شێوە لەنێو بنبەستبووندا دەژی. ئەیتوانیوە هەنگاو بۆ گۆڕانکاری زهنیەت و وەرچەرخانی پێکهاتەکانی بهاوێژێ. شەڕی تایبەت کە بووە بە سەفەربەرێکی گشتی، دەوڵەتیشی لەرێبازی یاوی خۆی دەرخستووە، بەرەو گۆڕەپانێکی نایاسایی کرداری وەهای بردووە کە چەتەکان خولقاندوویانە.

PKK ش لەنێو رەوشێکی هاوشێوەی ئەمەدا دەژی. بەشێوەیەکی بەرجەستە گۆڕانکارییەکانی سەرتاسەری جیهان و پێکهاتەکانی نێو بونیادی خۆی هەڵناسەنگێنێت. چەمك و هەڵوێستە کۆنەکان، لەمێژە لە رێبازی ئایدیۆلۆژی، سیاسی و رێکخستنی خۆی دەرکەوتووە، رێکخراوی بۆ گروپەکانی چەتەگەری گۆڕیوە. پێکهاتەی بەمجۆرە، لەمزۆر لەگۆڕەپان و ناوچەکانی شەڕی چەکداری، لەئەنجامی شێوازی چالاکی و ژیانی دوور لە رێساکان، PKK ی بۆ شێوەیەکی زۆر پاشڤەڕۆ تەنگەتاو کردووە. کادیران و کۆمیتەی ناوەندی کە دەبووایە بەرپرسیاربن، هەروەکو بڵێی لە خۆڕا بێڵ لەپێش تەوژمەکە دێنن و دەبەن.

لەبەرامبەر ئەم راستینانەدا، رۆڵی سەرۆکایەتیم پێ بەهێ لە گۆڕەپانێکی سنووردار دا پەنگ دەکرێت. ئەو هەڵمەتانەی بەتایبەتی هەوڵماندا لەناوەوەی وڵات لەپێناو راکێشان بۆ رێباز و وەرچەرخان ئەنجامی بدەین، لەلایەن چەمکەکانی چەتەگەرێتی پووچەڵکرایەوە. هەروەك چۆن لەناو دەوڵەت روویدا، لەناو PKK شدا بەکرداری قۆناخی گروپە لادەرەکان لەئارادابوو. ئەم رەوشە رێگا لەپێش بێ واتاترین چالاکی دەکاتەوە، بەئەندازەی هەرەس ئێش و زیانە تراژیدییەکان مەزن دەکات. ئەو دووبارەکردنەوە بەردەوامەی لەپێناو بەلاوەنانی رەوشەکە دەکرێت، دەزگای سەرۆکایەتیش بێ رۆڵ دەکات. بەمجۆرە لەبارترین زەمینەی پیلانگێڕی و پاکتاوکاری دەرەخسێ. لەسەرەتاکانی ۱۹۹۰ بەرەو ۲۰۰۰ کان، بەئەندازەی ئەو هەوڵ و کۆششانەی لەپێناو رووخانی ئەنجامەدا پێبەهێ پیلانگێڕی لقەکانی خۆی لەهەموو لایەکی من دەئالاند.

هەر لە سەرەتاکانی ئەوەدەکاندا هەروەکو بڵێی دەنگی پێی پیلانگێڕییەکانی ناوخۆ و

ـەردەوە کە بەردەوام زیادی دەکرد، دەڵێ"من دێم" لە ۲۵ی ئۆکتۆبەری ۱۹۹۰ کوشتنی کۆنترین هەڤاڵی منداڵێتیم حەسەن بیندال، گوایە بەفیشەکی قەزا بووە، لەراستیدا رووداوێکە گەلێك نهێنی لەناوخۆیدا حەشارداوە. ئەم تاوانە پیلانگێرییەك بوو شیمانەی هەرەلەپێش ئەوەیە، ـیەکەوە لەلایەن ساری باران و محەممەد شەنەر و شاهین باڵیج نەخشەی بۆکێشرابێت. ئەگەر رووداوەکەم فووت بدابووایە، ئەوا دوای ماوەیەکی زۆر کورت لەوانەیە کێومال بە لەنێوبردنی من تەواو ببووایە. لەو رۆژانەی بەخۆم لەرێگای Star TV بینیم کە دوو سیخوڕ بەئەرکی تەصفیەکردنی من پەیوەندیدار دەبن، بەرامبەر ئەو تاوانانەی ناراستەیان دەکرا، وابزانم بە ئەمانجی پاراستنی جەم ئەرسەڤەر دەیانگووت "ئێمە ژێرکەوتوونین، ئەگەر بمانخواستبایە دەمانکوشت، بەڵام دەخوازن بە زیندوویی بیگرین" ئەمەش دانانێك بوو کە ئەمە شێوازێکی بەردەوام بووە. لایەنی راستی خۆی هەبوو. زۆر بەسانایی دەتوانرا ئەمە لە رێگای ئەم چەتانەوە ئەنجام بدرێت کە لەناو PKK دا تارادەیەك مەودایان بریبوو. بەڵام بۆئەوەی کۆنترۆڵی رێکخراویان بەدەستەوە بمێنێ، گەوهەری ستراتیژیەکەیان ئەوە بوو، سەرەتا مـن بەزیندوویی بمێنم، دوای ئەوەی رێکخراو بەتەواوی بکەوێتە ژێر کۆنترۆڵی چەتەکان لەنێوم ببەن. دەبووایە تەواوی رێکخراو بخەنە ژێر کۆنترۆڵ. هەربۆیە پێویست بوو تەواوی کادیرە پابەند و دڵسۆزەکانی کە وەکو مەترسییان دەبینن لەژێر ناوی قەزا لەنێوببردرێن. شەمدین، کۆرجەمال، هۆگر و شاهین باڵیج لەگەڵ مردنە پڕ لەگومانەکەی مەعسوم قۆرقماز لە ساڵی ۱۹۸٦ بەدواوە هەنگاویان بۆ ئەم قۆناخە هاوێشتووە کە ئێستا دەرك بەوە دەکرێ ئەوانەی لەژێر ناوی قەزا، یان لەژێر ناوی ئەوەی "سیخوڕ بوو" بەسەدان کادیر و مرۆڤی وڵاتپارێز هەن کە سزا دراون. بۆ ئەوەی هێزا و بەهادارترین پێکهاتەی کارامە و کادیرانی پارتی پاکتاو بکەن، بەئەنقەست لەژێر ناوی چالاکی بۆ مردنیان دەنێرن. هەربۆیە سەبارەت بە دەستپێشخەری فەرماندەیی زۆر هەستیارانە هەڵسوکەوتیان دەکرد. چونکە چەندەی دەسەڵاتی فەرماندەیی هەبێت، ئەوا بەم واتایە دێت کە تا ئەم رادەیە هێزی پیلانگێڕی و تاوان بەدەستدێنێ. ناڵێم دەوڵەت هەمووی، بەڵام هەروەکو لە رووداوی جەم ئەرسەڤەر دەردەکەوێ کە هێشتا رۆشن نەکراوەتەوە، شیمانەیەکی مەزن ئەوەیە کە ناوەندێك راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ لەگەڵ ئەم چەتەگەرێتیەی نێو PKK لەپەیوەندیدا بوو. هەروەکو دەزانرێت لەم قۆناخەدا زەحمەتی دەبینرا لە کۆنترۆڵکردنی ئەو چەتەگەرێتیەی لەبونیادی دەوڵەتدا هەبوو. هەروەها لەم قۆناخەدا PDK لەسەرووی هەموویان بەشێکی KUK، چەندین عەشیرەت و کارمەندی تایبەت بەشێوەیەکی بەرفراوان لەم قۆناخەدا ئەرکیان پێ سپێردرا.

هۆکاری ئەوەی ئەم قۆناخەیان بەتەواوی نەگەیشتە سەرکەوتن، ئەوەیە کە سەرۆك چەتەکان ناسران و ئاشکرا بوون. سزادانی شاهین باڵیج بە مردن، راکردنی ساری باران و محەممەد شەنەر و هۆگر، پێشتر سزادانی کۆرجەمال و کۆنترۆڵکردنی شەمدین، تارادەیەکی

مەزن کاریگەری چەتەکان شکێنرا. گرنگی مەزنی رووداوی حەسەن بیندالْ، ئەوەیە کە سەرداوی تەواوی نیازی چەتەکان و ئەگەری پەیوەندییەکانیان بەدەستەوەدا. ئەگەر ئەم رووداوە شینەکرابایەوە و ئاشکرا نەکرابا، ئەوا سەرۆکایەتی بۆنەوان دەمایەوە و هەوڵیاندەدا چۆنی بخوازن بەکاری بێنن. زەحمەتە بڵێین ئەمانە هەموویان بەئەنقەست سیخورییان دەکرد. بەلام پەیوەندی هەندێکیان لەگەڵ ناوەندەکانی چەتەگەریتی دەوڵەت مسۆگەرە. وەکو سیخوری ناونووسکراو و خاوەن فایل ئەم رۆڵەیان نەبینی، لەسەر بنەمای بەرژەوەندییەکانی بنەماڵێتی و تاکەکەسی کە بە بەربلاوی لەنێو کوردان پەیرەو دەکرێت، بەشێوەی سازشی رێژەیی بەرێوەیان بردووە. ئەمانە جۆرە کەسایەتییەك بوون کە لەپێناو دەست بەسەردا گرتنی یەکینەکانی رێکخراو هەموو شێواز و رێچکەیەکیان تاقیدەکردەوە. ئەم رەوشە، بەوشێوازەی رێبەری حزب الله دەچێت کە بەرامبەر PKK دەوڵەتی بەکارهێنا. هەندێ گروپی PDK وKUK ، چەندین عەشیرەت و رێکخراو کە ناوی جیا جیایان هەبوو لە رێگای ئەم شێوازەوە راوو رووتێکی زۆریان کردووە و تاوانیان ئەنجامداوە. ئەوەی بە (پاداشتی ئاپۆ) ناوزەد دەکرێ سەرچاوەیەکی گرنگی بەرژەوەندیخوازییە، ئەگەر بەئەنقەستی یان لەخۆیەوە بێت تاوەکو ناو PKK درێژببۆوە و وەکو نەخۆشی بلاودەبۆوە.

بە باوەری شەخسیم، هەوڵی تیرۆری دژ بە ئۆزال و مردنی ئوزال، کوشتنی هەندێ فەرماندەی فەرماندارێتی گشتی ژەندرمەیان داوە، رۆڵی ئەمجۆرە چەتانە هەیە کە کەتوونەتە نێو دەوڵەت، گوایە فەرماندەکان و ئۆزال بە ژێرکەوتوو دەبینێ، یاخود ناتوانرێ ئەم شیمانەیە بچووك بکرێتەوە.

ساڵی ۱۹۹۳ ئەو مێژوویە کە لە مێژووی دەوڵەت و PKK دا شکاندنەوەیەکی گرنگ و لادان لەرێبازی فەرمی بەرفراوان بوو. پێکهاتەی کراوەی تورگوت ئۆزال بۆ دیالۆگ، رێگای لەپێش ئەوە کردەوە ببێتە قوربانی ئەو هێزانەی نەیتوانی کۆنترۆڵیان بکات. لەم رێکەوتەدا مردنی فەرماندەی گشتی ژەندرمە ئەشرەف بەدلیسی بە قەزایەکی فرۆکە، زۆر سەیرە. دوای ئەوە ئەو تاوانانەی رۆژ بەدوای رۆژ لەژێر دەمامکی حزب الله زیاد دەبوو، چۆڵکردنی هەزاران گوند، ئەوکێوماڵانەی چڕ و بەرفراوان کرابوون وەکو سەفەربەری قڕکردن دەرکی پێکرا. تاکتیکیەکانی PKK کە ماقووڵ نەبوون، جگە لە زیادکردنی زیانەکان و بنبەستکردنی قۆناغ رێگای لەپێش شتێکی دیکە نەکردەوە. گەریلا بۆ چەمك و پراکتیکێکی راستی بەرگری رەوا راکێش نەدەکرا. بەرێوەبەرایەتی سیاسی و سەربازی قۆناغ تاڕادەیەکی مەزن تیرۆری بۆ دەرەوەی رێبازی یاسایی گواستبۆوە. لەرێ دەرکەوتنی دەوڵەت خێرا ببوو.

گرنگترین پیلانگێری و هەوڵی تیرۆرکردن لەم قۆناخە، تەقینەوەی ئەو ئۆتۆمبێلە بوو کە نیو تەن ماددەی تەقینەوەی TNTی لێ بارکرابوو لە شام لە نزیك ماڵە فەرمانگەکەمان دانرابۆوە. لەبەر ئەوەی لە تەلەفۆن گوێ بیستم بوون، وایانزانیوە لەم کاتژمێرەدا لەوێم و

ئۆتۆمبێلەکە دەتەقێننەوە. ئەو پیلانگێرییەی تانسۆ چیللەری سەرۆك حكومەتی ئەوكاتە ئەرێگای دراوی شاراوە بە ٥٠ ملیۆن دۆلار فینانسی کرد، رەهەندی هەمەلایەنی هەیە. لەمیدیاکاندا باس لەوە کرا مەحمود یلدرم که نازناوی یەشیلە، هەندێ کەس لەبنەماڵەیەکی کوردی سوریا و سەرۆکی ئەوکاتەی شارەوانی وێرانشار لەگەڵ ئەوانەی بە چەتەکانی سوسورلوك ناودەبرێن لەنێو ئەم پیلانگێرییەدا هەبوون. لەکاتی لێپرسینەوە ئەوانەی بەناوی سەربازەکانەوە قسەیان دەکرد دەیانگووت و جەختیان لەسەرئەوە دەکردەوە کەئەم دەستەیە رۆحی بەرپرسیارێتی نییە و نوێنەرایەتی ئەوان و دەوڵەت ناکەن. دەیانگووت، ئەگەر بمانخواستبووایە ئەوا بە مووشەك ئەم کارەمان زۆر سەرکەوتووانە جێبەجێ دەکرد. هەروەها ئەمە دەزانرێ کە دوو هەڵوێستی جیاواز لەناو دەوڵەتدا هەیە. لەگەڵ ئەم رووداوەدا، لەسەربنەمای خۆبەختانە چالاکییە گیانبازەکان و خۆتەقینەوە پێشکەوت. گەردەلولی توندوتیژی زیاتر پەرەی سەند.

لە رێ دەرکەوتنی دەوڵەت گۆرانکاریەك بوو هەموو کەسێك بە ئەندێشەوە بەدوایدا دەچوو. چالاکییەکانی (خولەکێك تاریکی لەپێناو روناکی) گرێدراوی ئەم قۆناخەیە. لادانی بەگور لە کارەکتەری عەملانی دەوڵەتدا روویدەدا. ئەو قۆناخەی لە مێژوو بە ٢٨ی شوبات ناودەبرێت، زیاتر وەکو جولانەوەیەکی رەستۆراسیۆن کەوتە رۆژەف. لەرێگای ناراستەوخۆوە بەناوی ئاسایی بوونەوە PKKشیان بانگی بەرپرسیارێتی دەکرد. بە ئەرێنیەکی بەتەدبیرەوە لێی نزیك بووینەوە. بەلانی کەم کوشتنی مرۆڤی بێ تاوان و چۆڵکردنی ناوچەکان دەوەستێ و گەمارۆ سنووردار دەبێ، بەو چەمکەوە هەنگاو بۆ ئەم هەڵوێستە نرا کە ئەگەر شەر بەردەوامیش بێت، هەرنەبێت بەگوێرەی رێساکانی شەر بێت.

ئەو رێککەوتنانەی تورکیا لەگەڵ ئیسرائیل کە لە ١٩٩٦ گەیشتە ئاستێکی ستراتیژی دەرفەتێکی مەزنی بۆ هەواڵگری دەرەخساند. هەواڵگری و کۆنترۆڵی ئیسرائیل لەسەر ئاستی جیهان، راگەیاندنی PKK وەکو "رێکخراوێکی تیرۆریست"، بەدواچوون و چاودێریکردنی سەرۆکایەتی بۆ تورکیا سانایی تر دەکرد. هەروەها زانیاریەکی دیکەی کەدواتر بیسترا ئەوەیە سەرۆك وەزیرانی یۆنانی سمیتیس که دوای پاپاندریۆ هاته سەر دەسەلات، لەساڵی ١٩٩٦ لەگەڵ سەرۆکی ئەمریکا کلینتۆن سەبارەت بە بابەتی رێنەدان بەیاسایبوونی سەرۆکایەتی PKK و ئەگەر دەرفەت هەبێت تەسلیم بگیردرێت، هاوبیربوونە، تەسککردنەوەی ئەو گۆرەپانە یاساییەی دەوروبەری PKK زیاتر دەبوو. لەسەرووی هەموویانەوە ئەڵمانیا و فەرەنسا و ئینگلتەرا بەئامانجی سیاسی بۆ دەستگیرکردنی لایەنگرانی PKK کامپانیایەکی بەرفراوانی گرتنیان دەستپێکرد.

رێبەرایەتی PDK و YNKی باشووری کوردستان وەکو کۆڵەکە سەرەکیەکانی کامپانیای دژ بە PKK، لەساڵی ١٩٩٦ هاوشێوەی رێککەوتنی ئیسرائیل، کەوتبوونە نێو پەیوەندییەکی چر

کە ئەنقەرە، لەندەن و واشنتۆن ناوەندەکەی بوون. لەسەر ئەوە ریککەوتبوون کە لەرێگای باکووری ئێراق سەرۆکایەتی PKK گۆشەگیر بکەن و هەموو جۆرە یارمەتییەك بەکێوماڵەکان بدرێت. سوریا وەکو دوا ئەڵقەی پیلانی تەسفیەکردنی PKK و سەرۆکایەتیەکەی مابۆوە. میسریشیان بۆلای خۆیان راکێشا و ئەو شەڕە دەروونییەی لەرێگای سوریا پەیڕەویان کرد لەماوەیەکی کورتدا بەرهەمی خۆی دا. سوریا، ملکەچکردنی بۆ ئەم فشارانە و ریککەوتن سەبارەت بە مەسەلەی PKK ی بەگوێرەی بەرژەوەندییەکانی خۆی بینی.

بەرلەوەی لەسوریا دەربچم، هەڵوێستی کەناڵێکی سوپا زۆر سەیر بوو کە بەدرێژایی هاوین بەناوی سوپا زانیاری ناڕاستەوخۆی بۆ دەناردم. لەگەڵ ناگربەستێکی واتادار، هیوای قۆناخێکی نوێ دەکرا. هەڵوێستی واقیعی سەبارەت بەم بابەتە جێگای باس بوو. ئەو ناگربەستە یەکلایەنەی لە کۆتاییەکانی ئابی ۱۹۹۸دا بەئاگاداری تەواوی رێکخراو پێشخرا بۆ ئەم زانیاریانە دەگەڕایەوە. بەڵام بچڕانی ئەم ناگربەستە لەنێوەدا هیچ واتایەکی ئەوتۆی پێنەدرا. ئەگەر ئەم دیالۆگە ئەرێنییە ناڕاستەوخۆیەی گەیشتبووە هێزی بەکارهێنانی بەرگری رەوا و لایەنە باشەکانی لەپێش بوون، بەفەرمی دەستی پێکرابووایە، ئەوا قۆناخ زۆر پۆزەتیڤانە بەرەی دەسەند. باوەڕدەکەم ئەمە رەوشێك بوو پەیوەندی بەو قۆناخانەوە هەبوو کە هەنگاوی ۲۸ی شوبات پێیدا تێپەڕبوو.

تەواو گەیشتبووینە دووڕیانێك. ئیتر دەرك بەوەکرابوو کە بەشێوەی پێشوو ناتوانین گۆڕەپانی رۆژهەڵاتی ناوین بەکاربێنین. ئەوەی دەبوو بکرێ، وەکو سەرۆکایەتی یان گۆڕەپانی شاخ وەکو بڕیارگا هەڵدەبژارد، شەڕ بۆ ئاستێکی بڵندتر بەرزدەکردەوە و چالاکیەکەکانی نێو شارانمان زیاد دەکرد، یاخود لەنێو هەلومەرجەکانی ئەوروپادا بەشێوەیەکی گەرمتیکراوی زیاتر لێگەڕینەکانی ریککەوتنمان پێشدەخست. رەوشی بنبەستبووی شەڕ و گەیشتن و وەستانی لەگرێکوێرەدا، بەو هێزەی کە لەرەوشێکدا من لەشاخ بم ئەگەری بەکارهێنانی هەموو جۆرە چەکێك دێتە ئاراوە و رەوشی منیش فورسایەکی زیاتر لەگەڵ خۆیدا دێنێ. هەڵنەبژاردنی ئەم رێگایە لەجێی خۆی بینرا. شەڕێك لەدەوروبەری مندا چڕبێتەوە لەهەموو لایەکەوە مەترسی مەزنی لەخۆوە دەگرت. لەلایەنی ئەخلاقییەوە راست نەبوو خۆم بکەم بەبار. هەروەها رێبەرایەتییە بەکرێگیراوە کوردەکان بۆ هەموو جۆرە خراپ بەکارهێنانێك کراوەبوون. ئەمە راستییەکی زانراوە زۆر بەخراپی هەبوونی منیان بەکاردەهێنا. ریککەوتنی واشنتۆنی ۱۷ ی ئەیلولی ۱۹۹۸ نیشانەیەکی ئەمە بوو. سەرباری ئەوەی زەمینەی ئەوروپا پڕلە مەترسی بوو، ئەگەر بەشێوەیەکی رێژەییش بێت متمانە بە چەمکی دیموکراتی و کولتووری و سیاسی و مافیەروەریەکەیان دەکرا. هەرچی حکومەتی یۆنانە، هیچ بەمجۆرە مەزەندەم نەدەکرد و بەبیرمدا نەدەهات کاتێك کە لە ۹ ـ ۱۰ ـ ۱۹۹۸دا هەنگاوم بۆ ئەم وڵاتە هاوێشت هێندە بچووك بێتەوە و ساختەکاری بکات.

لەکۆتاییەکانی سەدەی بیستەم، دوای قۆناخێکی ئامادەکاری درێژخایەن بۆ پیلانێك کە لەسەرتاسەری جیهان دژبە ئیرادەی ئازادی گەلی کورد پیلانگێڕی و کودەتا ئەنجام بدرێت، هەنگاو بەهەنگاو پراکتیزە دەکرا. ئەگەر جارێکی دیکە فیلمەکە بۆ دواوە بگەڕێنینەوە و تەماشای بکەین، دەبینین کە لەراستیدا ئەم پیلانە لە سەرەتای ئەوەدەکان لەلایەن لەندەن گونجاو بینراوە و خواستراوە لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی پراکتیزە بکرێت. لەگەڵ ئەوەی کەم تا زۆر لایەنەکانی پیلان سەبارەت بەتورکیا دەزانرێ، رەهەندەکانی لایەنی ئەمریکا و ئەوروپا بەتەواوی و ئاشکرا دەرکی پێنەکراوە. ئەگەر رەهەند و لایەنە نێودەوڵەتییەکانی نەبینین، هەڵسەنگاندنەکانمان بە ناتەواوی دەمێنن. هەرچەندە دووبارەش بێت، ئەگەر پێویستی بەکورتکردنەوە بێت بەمجۆرەیە:

١ ـ کوشتنی پاڵمە: لەگەڵ ئامانجەکانی دیکە، بۆ ئەوەی رژێمی ١٢ی ئەیلول و دوای ئەوە تورکیا گرێدراوی دەرەوە بهێڵن و هەروەها وەکو ئامرازێکی خۆپاراستن لەشۆڕشی ئازادی گەلی کورد بپارێزن. لەبەر ئەوەی پاڵمە پشتگیری لەجولانەوەکانی وڵاتەکانی وەکو ڤێتنام و باشووری ئەفریقیا کردبوو و بەرۆحی بەیەکەوە ژیان هەڵوێستی بەرامبەر نیشاندابوون، سوێدی کردبوو بە ناوەندێك چونکە سەرۆك وەزیران بوو. دەشیا سوێد ببێتە ناوەندی جولانەوەی ئازادی کوردیش. پاڵە دژی ئەوە بوو کە جولانەوەی ئازادی کورد مۆرکی تیرۆریستی لێبدرێت. لەگەڵ کوشتنیدا پێشخستنی تیۆری "شوێن پەنجەی کورد" و هەوڵەکانی بەتیرۆریست لەقەڵەمدانی PKK و قەدەخەکردنی، لەنزیکەوە پەیوەندی بەنەهێشتنی ئەم رۆڵە ئەرێنییەی سوێدەوە هەیە. رۆژێك دێت پەیوەندی گلادیۆ GLADIO لەگەڵ ئەم پیلانگێڕییە و هاوشێوەکانی رۆشن دەبێتەوە، کە ئەو کاتە رێکخستنێکی بەهێزی ناتۆ بوو لە ئەوروپا و هێشتا ئاشکرا نەببوو. یەکسەر دوای چالاکیەکانی ١٥ی ئابی ١٩٨٤ ، دوای ئەوەی ئەڵمانیاش قورسایی خۆی خستە سەر، رێککەوتن لەگەڵ حکومەتی تورکیا بەدیهات. لەئەنجامی رەخساندن و پێشکەشکردنی هەندێ بەرژەوەندی ئابووری لەتەواوی ئەوروپا قۆناخێکی گۆشەگیرکردن لەدژی PKK دەستپێکردووە. ئاژاوەچێتی و گێرەشێوێنییەکەی مەسەلەی پاڵمە یەکێك لە گرنگترین ئەڵقەکانی ئەم قۆناخە بوو. پارچەکردنی PKK مەسەلەیەکی دیکە بوو کە ببووە رۆژەڤ. رۆڵی سەرۆکایەتی بەگروپێك درابوو کە چەتین گونگور سەرکێشی دەکردن. هەروەکو بڵێی هاندانەکانی کەسیرە بەرهەم دەدات. چەندین رۆشنبیر و مرۆڤی وەکو مەحمود باکسی و شڤان پەروەر دوورخرابوونەوە. ناتوانرێ ئەمە تەنیا بەهەوڵەکانی تورکیا روونبکرێتەوە. لەراستیدا بڕیارێك پراکتیزە دەکرا کەلەناوەندی ئەوروپا دەرچووبوو. هەر لەزووەوە لەم رێگایەوە چەپی تورك خەسێنرابوو. پیلانی هاوشێوەی جولانەوەکانی ئازادی دیکەی جیهان پراکتیزە دەکرا.

هەروەها دەستگیرکردنی کادیرەکانی ناوەندی PKK لەلایەن ئەڵمانیاوە، پارچەیەکی

نەخشەبۆکێشراوی ئەم پیلانە بوو. ئامانج پارچەکردن و کۆنترۆڵکردنی بەشە گرنگەکە بوو. لەسەرەتاکانی ۱۹۹۰ لەسەردانێکی سەرۆکی ئەرکانی گشتی سوپای تورکیا دۆغان گورەش بۆ لەندەن گوتبووی "پیلانەکەمان پەسندکرا" و ئەمەش جێگای خۆی لەهەڵسەنگاندنەکانی میدیادا گرتبوو. دەرك بەوەکرابوو کە لەندەنیش وەکو ئەڵمانیا سەبارەت بە تەسفیەکردن ئەرکی گرتبووە ئەستۆ. هەروەها سکرتێری YNK جەلال تاڵەبانی لەساڵی ۱۹۹۱ لەڤیەننای پایتەختی نەمسا بەنهێنی سەبارەت بە تیرۆریست لەقەڵەمدانی PKK لەگەڵ وەزیری دەرەوەی تورکیا حیکمەت چەتین رێککەوت. ئەم هەڵوێستەی تاڵەبانی بەتێکەڵاوی لەگەڵ هەڵوێستی ئەڵمانیا، فەرەنسا و ئینگلتەرا رۆڵی سەرەکیان سەبارەت بە تیرۆر لەقەڵەمدان بینی. ئەو یەکێتیە چەمك و هزریەی لەئاستی ئەوروپا پێی گەیشتن، ئامانج جولانەوەیەکی کوردی بێ PKK بوو. جولانەوەیەکی کوردی بێ PKK کارتێکی زۆر پێویست بوو بۆ ئەوەی لە چوارچێوەی رۆژهەڵاتی ناوین بەکاربێنن.

۲ ـــ دوای ئەوەی لەساڵی ۱۹۹۳ ئەزموونەکەی ناگربەست لەگەڵ ئۆزال ئەنجامەدا سەرنەکەوت، ئەم جارە ئەو تاکتیکەی لەرۆژەڤدا بەجێبوو، شێوەی "بەڵێ بۆ PKK، نەخێر بۆ ئاپۆ"ی بەخۆوە گرت. کاتێك هەوڵەکانی پارچەکردن و بەتەواوی دژایەتیکردنی PKK ئەنجامی بەدەستنەهێنا کە بۆتە خاوەن بنگەیەکی جەماوەری چەند ملیۆنی، ئەوا ئاراستەگرتن بەرەو تاکتیکێکی بەمجۆرەی لەگەڵ خۆیدا هێنا. هەر دەوڵەتێك هەنگاوی نا کە بەگوێرەی خۆی کادیرانی PKK پێبگەیەنێ. لەرۆژهەڵاتی ناوین تا دەگاتە ئەوروپا و روسیا هەنگاوی وەها هاوێشترا.

ئەدرێسی "پیاوی دووەم" بۆ شەمدین ساکیك دۆزرایەوە. تەسفیەکردنی ئاپۆ بریاری لەسەر درابوو، لێکدانەوە لەسەر قۆناخی دوای ئەو دەکرا. بۆ ئەوەی رۆڵێکی وەها بە کانی یەڵماز بدەن بۆ نێو قۆناخێکی بێواتای بەندکردنیان راکێش کرد. ئامانج ئەوە بوو تەسلیم بگیردرێ و دوای ئەگەری تەسفیەکردن وەکو رێبەرێکی PKK بەکاربهێنرێ. مۆسکۆ کاری لەسەر نومان ئۆچار دەکرد.

لەرۆژهەڵاتی ناوینیش ئەمە لەهەڵوێستی چەندین دەوڵەتدا دەبینرا. YNK و PDK گەمەکانی خۆیان لەسەر PKK چڕکردبۆوە. لەبونیادی HADEP یشدا کێومالێکی هاوشێوەی ئەمە بەرێوەدەچوو. لەکاتێکدا خەتیب دیجلە و لەیلا زانا و ئەندام پەرلەمانتارەکانی دیکەی تەسلیمنەبوون ئاخنرانە زیندانەوە، رێکخراوی DEP دادەخرا. هەروەها کێشمەکێشێك لەسەر HADEP لەئارادابوو. کوردستان چۆڵدەکرێت، بەهەزاران وڵاتپارێزی دڵسۆز و بێتاوان لەژێر دەمامکی حزب الله بەشێوازی ئۆفێنەرانە دەکوژرێن. پەرلەوەی نێو گاتژمێر بەسەر تەقینەوەی ئەو بۆمبایەدا تێپەرببێت کە لە ٦ی گوڵانی ۱۹۹٦ وەکو پیلانێك دژی سەرۆکایەتی ئەنجامدرا، ئەو هەواڵانەی سەرچاوەکەیان لە لەندەن بوو بەجیهانیان راگەیاند کە عەبدوڵڵا

نۆچ ئالآن یان کوژراوە یان بۆمباران کراوە. پێشتر دەیانزانی چی ئەنجام دەدرێت.

٢ـــ رێککـەوتنی ١٩٩٦ی نێـوان تورکیـا ـــ ئیسـرائیل و پەیوەندییـەکانی نێـوان تورکیـا و رێکخراوە کوردی و تورکمانـەکانی باکووری ئێراق کـە لـە هـەمان رێکەوتدا پێشکەوت لەیـەك چوارچێوەدا بـوون. گرنگـترین مـاددەی رێککـەوتنی کوردانــی سـەبارەت بـەئۆتۆنۆمی لـە ١٧ی ئەیلولی ١٩٩٨ لە واشنتۆن، هەڵوێستی بەرامبەر PKK بـوو. هـەروەکو سـاڵی ١٩٢٥ بەرامبـەر ئـەو زنجیرە بەردەوامەی فەرمبووکانی تورکیا دابووی، لە بەرەو ساڵانی ٢٠٠٠دا دیسـان رێککەوتنێکی هاوشێوەی ئـەو ئـەنجامدرابوو. ئەمـەش لەلایەکـەوە واتـای نوێکردنـەوەی لۆزان بـوو. PKK و جولانەوەی ئازادی گەلی کورد بەتەواوی گۆشەگیر دەکرێت، بۆئەوەی سەرۆکایەتیەکەی دەستگیر بکرێت هـەموو جـۆرە بـەڵێنێك دەدرێـت، هـەروەها لامپـی سـەوز بـۆ کێومـاڵ دژبـە گـەریلا پێدەخـرێ و کـوردە بـەکرێگیراوەکان و تـەکنۆلۆژیای ئیسـرائیل و پسـپۆرەکانی لـەم پێنـاوەدا دەخرێنە گەڕ، ئەمە پیلانێکی پاکتاوکاری سەرتاسەری بوو.

لەگـەڵ ئـەو هەڤاڵانـەی هێشـتا مەسـەلەی چەتـەکانی نێـو خۆیـان چارەسـەر نـەکردووە، سـەبارەت بـە سـەرلەنوێ بـەجێکردنی هێزەکـاندا خەمساری دەکـەن و هێشـتا لەشـێوازێکی ساختەی بەرێوەبەرێتی و فەرماندارێتی رزگاریـان نـەبووە و لەسـەر پشتی سـەرۆکایەتی فێری ژیانێکی هەرزان بوونە، لەسەرووی هەموو شتێك هێشتا دوورووییی گوایـە دۆسـتە سوریایی و یۆنانیـەکانمان دەرگـی پێنـەکراوە، هـەروەها بەرامبـەر ئـەو هەڵوێستانەیان کـەتا دوایی پـڕ لـە بـەرژەوەندیخوازی و ترسـە، ئـەوەی کەوتـە سـەر سـەرۆکایەتی PKK کاروانێکی بـەترس بـوو بەرەو ونبوون، بەداشکانەوەیەکی ناوخۆ ماجەرای ٩ی ئۆکتۆبەری ١٩٩٨ دەستپێدەکرد.

کـاتێك دەرکـەوتنی ٩ی ١٠ ی ١٩٩٨ هەڵدەسـەنگێنین، پێویسـتە لـەدڵ و بەشـێوەیەکی پتـەو ئەمە شیبکەینەوە کە زەمینەی رۆژهەڵاتی ناوین چ واتایەکی هەبوو. پەیوەندی و تێکۆشـانێکی بێ سنوورم پێشخست. پێشکەوتنی وەها هاتنە ئاراوە کـە گرنگـی مێژووییـان هـەبوو. مسۆگەر پێویستە لەهـەموو لایەنێکـەوە دەرك بـەوە بکرێـت کـە ئـەم پێشـکەوتنانە بەکامــە دەروون و رۆحێکی پەیوەندیدار بەمنەوە ئەنجامدراو چۆن بەرگەم گـرت. لەسـەرووی هـەموویان بنکەی PKK و چـەندین نـاوەند هـێزێکی تێگەیشتنی گـەورە و رۆحکێشـەکەی نیشـان نـادەن، تـەنیا رووخسارە فەرمیەکەی دەبینن کە گوزارشت لـە هیـچ شـتێك ناکات. هـەروەکو بڵێـی لەبـەرەی پێشکەتووخوازە ئاساییەکاندا بە شان و شکۆ ژیـاوین و تێکۆشـان کـراوە و سـەرکەوتن بەدەست هاتووە. شتێکی بـەمجۆرە لـەئارادا نییـە. بێگومـان روونکردنـەوە بـەگوێرەی شـرۆڤەی هـەرزان، رەحـەتیان بـۆ دابـین دەکـات. سیاسـەتی دۆگماتییانـە و چەمکـەکانی رێکخسـتنیان تـێر دەکـات. کـاتێك ئـەم هەڵوەسـتە تـێر ناکـات، ئـەمجارە بەپەنابردنـە بەرچەمکـەکانی پـیرۆزی بـاو، بەتایبەتمەندێتیـە "نائاساییەکانی" کەسـایەتیم روونیدەکەنـەوە و دەخـوازن بـە هـەرزانی لـە بەرپرسیارێتی رزگاریان ببێت. هەربۆیە کەس بەلای ئەوەدا نەچوو ئەو پراکتیکـەی مـن تێیـدا

ژیام بەتەواوی واتا مێژووییەکانی میتۆلۆژی، فەلسەفی، ئایینی و زانستی شیبکاتەوە. گەلێك پەرتووك نووسرا، منیش نووسیم. ئێستاش لەوەوشێکی وەهادا نیم ئەو راستیانە بنووسم کە تێیدا ژیاوم. هەربۆیە پێویست دەکات بوار و گۆڕەپانەکانی ئازادی پێشبکەوێت. بەڵام لەسەرووی هەموویانەوە ئەو کەسایەتی و دەزگایانەی خۆیان بەهەڤاڵ دادەنێن، بەڵام هەلومەرجەکانیان لەبارە و مەسەلەی تێگەیشتن بۆ گەشەکردنیان مەرجە و تێیدا سەرناکەون، لەراستیدا بەم هەڵوێستە خۆیان مەحکومی پێشنەکەوتن و ژێرکەوتن دەکەن. ئەگەر لەتوانادا بێت ئەمانە شیکردنەوەی ئەم ساڵانە بکەن و ئەوە بکەن بەئەرکێکی سەرەکی کە بۆ مێژوو و ئاییندەی مرۆڤایەتی، کوردان و رۆژهەڵاتی ناوین چ واتایەك دەبەخشێ. چونکە لەدەرەوەی ئەم هەلە، ناتوانن لەرێگای ژیانی ئازاد، لەمێژوو و سەردەم، لەراستینە بەرجەستەکانی رۆژگاری ئەمڕۆمان شیبکەنەوە و پێش خۆیان رۆشنبکەنەوە. ئێستا تاکە رێگا ئەمەیە، بە رەنجێکی مەزن پێویستی بەتێگەیشتن و پراکتیزەکردن هەیە.

ئەگەر بەشێکی بچووکی ژیانم لەرۆژهەڵاتی ناوین لەمیانەی هێڵە گشتیەکانی، لایەنی پەیوەندیدار بە سیاسەت و دیپلۆماسی هەڵسەنگێنم بەمجۆرەیە؛

دوای ئەو هەموو ساڵە بەساخی دەرکەوتن لەناو ئەو پێچاوپیچ و تەنگەبەریانەی لەسەردەمی سۆمەریەکانەوە راخرابوون، گارێکە بە هەڵوێست و کەسایەتیەك بەدیدێت کە بەواتای وشە پێغەمبەرانە بێت. ئەم قۆناخە تەنیا وای نەکرد دەرك بە دەزگای پێغەمبەرایەتی بکەم، بەڵکوبە گەوهەری خۆی نیشانیدام کە بە پراکتیکی چۆن دەتوانرێ خاوەندارێتی لەمرۆڤایەتی بکرێت. ئەمەش بەو واتایە دێت کە هەرپێغەمبەرێك لە پەرەسەندنی کۆمەڵگادا هەڵگشانی واتایە. چەندەی زمانەکەی ئیلاهی بێت، ئەوا گەوهەرەکەی رێگا لەپێش تۆمارکردنی قۆناخێکی کولتووری جیاواز دەکاتەوە، کە ئەمەش سەبارەت بەگەلێك بابەتی سەرەکییە و لە سەرووی هەمووشیان واتای کۆمەڵگای گەشەسەندوو و بیرەکەی، دابونەریتی، ویژدانی، ئازادی و یەکسانیەکەی لەخۆوە دەگرێت. گەل ئاگاداری ئەم مەسەلەیەیە و دەیزانێ، واقم ورِما کاتێك گووتیان" ئەوەی ئەنجامتداوە، خوڵقاندنی ئایینێکی نوێیە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە بۆ ئایینی چوارەم کاردەکەیت" مەبەستی سێ ئایینە سەرەکیەکەیە، دوای ئەوە تێگەیشتم کە دەخوازن چی بڵێن.

هەرچەندە بگووترێ کە دوای ئیسلام رێگای پێغەمبەرایەتی و ئایینێکی نوێ گیراوە، ئەمە پاراستنێکە بۆ ئەوەی هەر چەرخێك خۆ بە ئەبەدی شرۆڤە بکات. بەبێ شیکردنەوەی ئەو دەرئەنجامانەی لەئاکامی کاریگەری کولتووری ئایینە کۆنەکان لە رۆژهەڵاتی ناوین رەنگدانەوەی خۆی لەهەموو بوارەکانی کۆمەڵگادا کردووە لەسەرووی هەمووشیانەوە بواری سیاسی و ئایدیۆلۆژی کە تا رۆژگاری ئەمڕۆمان هاتووە، ناشێ دەرك بە شارستانییەتی ئەوروپا بکرێت، هەروەها ناتوانرێ شەڕێکی رزگاری ناوخۆیی و دەرەکی سەرکەوتوو واتادار

بەڕێوەببردرێت. مێژوو حوکمی خۆی جێبەجێ دەکات. عەلمانیەتی ڕووکەشی ناتوانێ ئایین بتوێنێتەوە و ناتوانێ کۆمەڵگایەکی نوژەنیش بخولقێنێ. هەرچی ئەزموونەکانی نوێکردنەوەی نەتەوەپەرستی ئەم دوو سەد ساڵەیە لەبەرچاوانمانە، ئەگەر داکۆکی لەسەر ئەم ڕێگایە بکرێت، ئەوا هەروەکو لە نموونەی بنبەستبوونی عەرەب ــ ئیسرائیل دەبینرێ، دەتوانرێ مەزەندە بکرێ کەرێگا لەپێش ئێش و ئازار و دارووخانێکی چۆن دەکاتەوە. چارەسەری ئەوەیە سروشتی مێژوو شیبکرێتەوە و لەوێشەوە دەرفەتێکی ئازادی بخولقێنرێ.

هیچ واتایەکی نابێت کەلەم سەردەمەدا ئەم جولانەوەیە بە "ئایینی چوارەم" ناوببرێت. بەڵام پێناسەکردنی ئەم جولانەوەیە وەکو ڕێنسانسی ڕۆژهەڵاتی ناوین کە لەسەر بنەمای پەرەسەندنی دیالەکتیکانە ئاسۆی شارستانییەتی دوای سەرمایەداری و ریشەی شارستانییەتی خۆی کردۆتە سەنتێز و بەرێنسانسی ئەورووپای ساڵانی ۱۵۰۰ دەچێت، واتادارترە و دەبێتە وەڵام بۆ پێویستی مێژوویی. ئەگەر بڵێین ئەمەمان خولقاند، دەبێتە زێدەڕۆیی. ئەوەی هەوڵدراوە ئەنجام بدرێ ئەوەیە کە بەشێوەیەکی گونجاو لەگەڵ گەوهەری کولتووری ئەم خاکە و بەبێ ئەوەی دیلی پاشڤەرۆیەتی چەرخ ببینن، گەوهەرە ئەرێنییەکانی پەسند کراوە و ڕۆڵ و بەشداری لە جولانەوەی ڕەسەنی ئازادی ڕۆژگاری ئەمرۆمان کراوە. باوەڕیم تەواوە بەوەی کەئەمە لەمێژوودا واتادار دەبێت و دەبێتە نوخبەیەکی بەهێز و هەمیشەیی قەڵەمبازێک کە بە مەشخەڵەیەک بەرەو ئامانجەکانی ئازادی دەچن کە ناکوژێتەوە. هیچ کاتێک ئومێد و باوەڕیم بەوە لاواز نەبووە، هەرچەندە کەموکوڕی و قرێژی هەبێت، ئەوا نوێنەرە بەهێزەکان ئەم نوخبەیە پاکژتر دەکەنەوە و بەهێزی جولانەوەی دەگەیەنن، هەنگاو بە هەنگاو بەئامانجە گونجاو و واقیعیەکانیان دەگەن. بە پێچەوانەوە، لەبەرئەوەی ئەم جوگرافیایە بەئەندازەی نان، ناو و هەوا بەو هێزە ڕۆحی و هزریەش گەیشتووە کە پێویستی پێیەتی، ئەوا واتای ژیان لەو بنبەستبوون و تاریکاییە دادەماڵێ کە هەزاران ساڵ پێش ئێستا تێیکەوتبوو، ئەوا بەجۆش لەڕێگایەکی ڕاست و ڕۆشنکراوە بەرەو پێشەوە دەچێت و بەئامانجەکانی دەگات. خولقاندنی ژیانێکی واتاداری بەمجۆرە لەهەموو شتێك بەهادارترە و دەبێ بەو ئەندازەیەش نرخ و بەهاکەی بزانرێ. پابەندبوون و ڕیزگرتن لەخاوەنەکانی ئەو قارەمانێتی و ئێش و فیداکارییەی کەهاوتاکەی لەمێژوودا نەبینراوە، یەکسانە بە خۆرزگارکردنمان لەو ڕاستینەیە نەفرینەی هەزاران ساڵ و پیرۆزکردنی. مەگەر هەر واتای ئایینێکی نوێ بەمە بدرێت، دەبێ ئەم خاڵەش ببینرێ. پیرۆزییەکی هەیە، ئەویش ئەو گەوهەرەیە کەهەوڵی ڕۆشنکردنەوەی درا. ئەم بەرگرینامەیەم ئەوە ڕووندەکاتەوە کە ئەو ژیانە هاوچەرخەی لە نەفرەت ڕزگاری بووە و پیرۆزکراوە چ واتایەك دەبەخشێ.

بەراوردکردنی چوونم بۆ ئەورووپا لەگەڵ هەندێ نموونەی مێژوویی بەهەڵە شرۆڤە دەکرێت. بەڵام ئەگەر مێژوو و هەنووکە لەگەوهەری پیرۆزیدا بەڕێوەبچێت، ئەوا ئەم

لێچواندنە ناچارییە و ڕاستیشە. بەڵام مێژووی چەواشەکراو و پشت ئەستوور بەنکوڵی ، لەوانەیە بەربەست بێ لەپێش ڕاستینەی لێکچوونی بەها پیرۆزەکان. تەنانەت ئەم ڕەوشەش مەگەر پەردە پۆشکردن بێ. ئەوەی ڕاستییە جولانەوەی یەك بەدوای یەکی پیرۆزییە.

باسی عەزیز پاوڵ ی مەزن دەکەم کە بەتایبەتی لقی ئەوروپای مەسیحیەتی خوڵقاند. سەرەتا دوژمنایەتی بەرامبەر حەواریەکان دەکرد. لەرێگای شام لەئاکامی پەرجوویەك تەڤلیبوونی بۆ ریزی حەواریەکان، وەکو ڕووداوێك باس دەکرێت کەمێژووی گۆڕیوە. سەر بە بنەماڵەیەکی یەهوودییە کە لە تەرسوس لەدایك بووە. لە ئەنتاکیا دەست پێدەکات چەند جارێك سەفەر بۆ ئەنادۆڵ، یۆنانستان و ئیتاڵیا دەکات. پروپاگەندەچییەکی مەزن و بەباوەڕە. ئەگەر ئەو نەبووایە بەمجۆرە مەسیحیەت بۆ ئەوروپا نەدەگواسترایەوە. لەرۆما کوژرا.

ئەو کاتدرائیانەی ساینت پاوڵ کە لە هەر لایەکی ئەوروپا بۆ بیرەوەری ئەو ناواکراوە، لەخۆرا هێندە شکۆمەندیە پیشان نادەن. چونکە ئەخلاقی ئەوروپا و گەیشتنی بەو قۆناخەی ئەمرۆ، هەوڵ و کۆششەکانی عەزیز پاوڵ بۆ مرۆڤایەتی بناخەکەی پێکدێنێ. ئەوروپا بەنیوەی تری ساینت پاوڵ دادەنرێ. هەرچەندە لەزۆر لایەنەوە دووچاری خیانەت هاتبێت و خوازرابێت بکرێتە ئامرازی سەرچاوەی خراپەکاریەکان، بەڵام ئەم ڕاستییە ناگۆڕێ. ئەوەی سەیرتر ئەوەیە، هێندەی دۆستە باشەکانی لە یۆنان چاوی پێکەوتن، چەندین دۆستی هەڵگەڕاوە و ساختەش هەبوون. سکاڵا لە خەمساردی هەندێك لە دۆستانیش دەکات.

لە ٩ی ١٠ی ١٩٩٨ دەرکەوتنم لەشام ئەم دیاردە مێژووییە دێنێتەوە یاد. ژمارەیەکی زۆری دۆستان هەیە. گەلێك بانگهێشت لەلایەن پارتە دەسەڵاتدارەکان کراوە. پەرلەمان بە زۆرینەیەکی وەها منی بانگهێشت کردووە کە دەتوانێ دەستوور بگۆڕێ. بەرلەوەی بچین وەرگێڕ ئایفەر قایا کە لەگەڵ کۆستاس پادافۆسی دۆست قسەی کرد و ئەویش کۆنەوەزیرە و ئێستاش پەرلەمانتەرە، سەبارەت بەچوونمان لەرێگای تەلەفۆنەوە نزیکەی دە پشتگیری وەرگرتووە.

کاتێك گەیشتم" پادافۆسی دۆست " نەبینرا. ئەوەی پێشوازیکردنی ستافراکیس ی سەرۆکی هەوالگری و ڤەلاندەریس بوو کە ڕۆڵی یەهودا ئیسکاریۆت ( ئەو حەواریەی ئیخباری لەعیسا کرد )ی هاوچەرخ دەبینێ و ناوی خۆشی کردۆتە عەگید. هەڵوێستیان هیچ جیاوازیەکی لەگەڵ هەڵوێستی هێلینییەکانی سێ هەزار ساڵ پێش ئێستا نییە. هەڵوێستێکی هێلینیەکان کەلەم ڕۆژەوە تا ئێستا نەگۆڕاوە ئەوەیە کە ئەوانەی دەرەوەی خۆیان و کە بەگوێرەی بەرژەوەندیەکانیان نین بە بەربەر ناو دەبەن، ئەوەی لەدەرەوەی دونیا بچووکەکەی ئەوانە بەبیانی دەبینن، ئەمەش هەستێکی ڕیشەییە. بەڵام ئەم هەڵوێستە گوزارشت لەتەواوی ڕاستی ناکات، لەلایەنێکەوە لەوانەیە بواری سۆزداری و ئەخلاقی مەسەلەکە ڕوونبکاتەوە. ڕاستینە سیاسی و دیپلۆماسیەکان زۆر جیاوازترە.

سوود لەبینینی ئەم راستینە هەیە: جوڵانەوەی ئازادی گەلی کورد بەرێبەرایەتی PKK، بەواتایەك وەکو بەلشەفیکی هاوچەرخ دەبینرێ. هەڵبەتە لێدانی مۆرکی" ستالینی وشك " ئەم تێروانینە نیشاندەدات. هەرچەندە تایبەتمەندێتی گەلێك جیاوازیشی هەبێت، هەڵوێستەکانیان هاوشێوەیە. سیاسەتی فەرمی و سیستەمی دەوڵەتان، PKK و بەشێوەیەکی گشتی یاساییبوونی جوڵانەوەی ئازادی کوردان ناخوازن. هەرچی چەندین وڵاتن، بەرەو نایاسایی بوونیان راکێشاوە. وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا وشکترە. دەوڵەتەکانی رۆژهەڵاتی ناوینیش لەناو هەمان هەڵوێستدان. مسۆگەر PKK لەدەرەوەی یاساییبوون لەقەڵەم دەدەن. ئەوانەی دۆستیشن لەنێو هەڵوێستێکی کەسێتی و نافەرمی دان. سوریای کە هەرە زێدە وەکو وڵاتێکی دۆست و پارێزەر دەناسرێ، هیچ کاتێك رێبازی رادیکاڵی نەتەوەپەرستی عەرەبی تێپەڕنەکردووە. لەبەرئەوەی وەکو کەسێتی هەڵوێستی سەرۆك دەوڵەت حافز ئەسەد جێگای بایەخە، بەچەند رستەیەك دەتوانین هەڵیسەنگێنین. حافز ئەسەد بەهۆی ئەو دەسەڵاتە مەزنەی و ئەو هەلومەرجانەی پێیدا تێپەڕبوو، بەگوێرەی من لە ناوەڕاست لە نێوان دەوڵەتی دەسپۆتی کلاسیك و دەوڵەتی دیموکراتی شۆڕشگێڕی وەستا بوو. پێیەکی دەوڵەتی ئیلاهی بۆ ناو گەل راکێشابوو. بە پێچەوانەی مەزنەدەکان، بەشێوەیەکی سادە ئاڕادەیەك دەوڵەتی پیرۆز و دەستڕۆی خستبووە خزمەتی گەل. بەڵام ئەم راستییە کە بەشێوەیەکی سەرەکی چەمکی دەوڵەتی راهیبی سۆمەری پاراستووە، ناسنامەیەکی رۆژهەڵاتی ناوین بوو کە نیوەی رووناکی و نیوەکەی دیکەی تاریکی بوو. دوژمنی جوڵانەوەی ئازادی گەلی کورد نەبوو. بەڵام چەمکی دەوڵەت و ئایدیۆلۆژیای باو، نەتەوەپەرستی و دیپلۆماسییەتی هاوچەرخ، دۆستایەتی نێوان هێزەکانی ئاستەنگ دەکرد. مەزنترین جوامێری ئەوە بوو، لەبەر خاتر و داخوازی هەندێکی دیکە دوژمنایەتی کەسی نەدەکرد. بەڵام لەو دوارۆژانەی ئیتر لەوێ جیا دەبووینەوە، ئەوەی فیرعەون سەرۆکی میسر موبارەك ئەوەی دیارکردبوو کە ئەو هێزەی نییە بیرۆکراسیەتی دەورووبەری تێپەڕ بکات. لەرەوشێکی وەهادا نەبوو بەشێوەیەکی زێدەڕۆیی نەتەوەپەرستی تەنگەتاو بکات.

لەلایەنی منەوە ئەوەی پێویست بوو رەخنە بکرێ سوریا نەبوو، رەوش و شوێنگەی خۆم بوو. لەسەرەتای ١٩٩٠ەکان، تەنانەت لەسەرەتاکانی ١٩٨٠ لە گۆڕەپانی عەرەبەکان جیا بووامایەوە لەوانەیە ئاراستەی مێژوو زۆر جیاوازتر بووایە. جێگیربوونم لەزنجیرە چیای زاگرۆس بەهەمەندترین بژاربوو. بەڵام نەدەزانرا کە هەڵوێستەکانی ئێران و بەکرێگیراوە کوردەکان چی لەگەڵ خۆی دێنێ. دووەمیان، هەڤاڵی وەها هەبوون کەمزۆر بەسانایی و سەرکەوتووانە بتوانن ئەم رۆڵە بگێڕن. چاوەڕوانیەکی وەها لەمندا زاڵ بوو دەمگووت با ئەوان ئەم مافە بەکاربێنن. بەڵام هێندە بچووك دەرکەوتن، خۆیان وا نیشاندا بستە باڵایەکی وەهان تەنانەت خۆیان لە دۆڵێکی تەنگیشدا دەخنکێنن. هیچ کاتێك ئەو دەرفەت و خزمەتە مێژووییە تێنەگەیشتن کە بۆم رەخساندبوون. هەروەکو بەرەڵا و میراسخۆر یارییان بە تواناکاریەکان کرد. خۆیان و ئەو

رەنجە سەیرەی منیان بە شێوەیەکی خافڵانە بەکارهێنا و لەخۆڕا خەرجیان کرد کە بەهایەکی مەزنی هەبوو. ئەو بابەتەی پێویستە هەرە زێدە رەخنە بکرێت و راکێشی رەخنەدان بکرێت ئەمەیە. بەڵام تاکو ئێستاکەش باوەڕیم وایە کاتێك لە ۹ ی ۱۰ ی ۱۹۹۸ هەنگاوم هاوێشت، ئەم بژارەم هەڵنەبژارد هەڵوێستێکی راست بوو. چونکە لەرەوشێکی وەهادا شەر دەبووە شەڕی کەسێتی، تەواو دەگۆڕا و دەبووە شەڕی تۆڵە سەندنەوە. بەتەواوی دەرفەت و ئەگەری ئاشتی و بژاردەتی لەدەست چوو. سەرباری ئەوەی چوونە شاخ خەونی چل ساڵەم بوو، تاکە هۆکاری ئەوەی لەخەمگینی و لەداخان نەتەقیم ئەوەبوو کە ژیان و ئازادی مرۆڤ هێندەی کونی دەرزی دەرفەتێکی ئاشتیانەی هەبێتە بژاردی تاقیکردنەوەی ئەمە بەهادارتر بوو. بۆیە تەنانەت تاکە هۆکاری ئەوەی لەنێو ئەو تابووتەی ئێستاشدا ورە بەرزم ئەوەیە کە ژیانم لە پێناو ئاشتیەکی شەرەفمەندانە بەهاکەی لەشەڕێکی رەسەن کەمتر نییە.

تێگەیشتنی گەوهەری ئەم هەڵوێستەی حکومەتی سمیتیس بایەخدارترە. شیمانەی ئەوە هەیە کە ئەم هەڵوێستە لەچوارچێوەی ئەرێکردنی ئەمریکا و ئینگلتەرا و تەنانەت ئەڵمانیاش دا بێت. هەروەها خاوەن دەرنەکەوتنی بادڤۆس لە بانگێشتەکەی خۆی جێگای تێفکرینە. بێگومان دەیتوانی چوونی ئێمە پەسند نەکات. هێندە بەساویلکەیی مانەوەی یەکێك کە وەزیر بووبێت، دوورە لەوەی دەرکی پێبکرێت. شیمانەی هەرە گرنگ ئەوەیە، بەئەنقەست دەخوازن پێیەکانم لە رۆژهەڵاتی ناوین جیابکەنەوە. لەوانەیە ئیستخباراتی ئینگلتەرا رۆڵێکی سەرەکی لەمەدا بینیبێ. ئەوە دوورنیە کە چەندین هێز کەوتبنە جوڵەوە. گۆڕانکاریەکانی دواتر ئەم راستیە نیشاندەدات، ئەگەری هەرە بەهێز ئەوەیە ئەخشەی ئەوەیان داناوە دوای ئەوەی بۆ ئەورووپام رادەکێشن و کەرامەتم دادەڕووخێنن، ئەوا وەکو ئامرازێکی ماڵێکراوی دەستیان، لەسەرووی هەموویان بەرامبەر تورکیا و تەواوی رۆژهەڵاتی ناوین و هاوسەنگییەکانی بەکارم دێنن. هەرچۆن هەنگاوم بۆ یۆنان هاوێشت تێگەیشتم کە یاسا، مافەکانی مرۆڤ و رێساکانی کۆمەڵگای دیموکراتی بۆ من بوونی نییە، بەرژەوەندیە ئابووری و سیاسیە وشکەکان بەبنەما وەرگیراوە. ئەگەر بڵێم ئەو هەڵوێستەی لە یۆنانەوە دەستیپێکرد لەترسی تورکیا بووە یاخود بەرێککەوتن ئەنجامدراوە واقیعی نابێت. بەپێچەوانەوە لەو باوەڕەدام لەسەرەتا لەسەرووی هەموویانەوە سەرۆك کلینتۆن، سیستەمی رۆژئاوا لەبەرزترین ئاستدا زۆر پێشتر و بە وردکارانە لێکۆڵینەوەیان سەبارەت بەهەڵوێستی تورکیا کردووە. هەروەها دەبێ ئاماژە بەوە بکەم کە لەپێناو بەرژەوەندیەکانی خۆیان لە تەقاندنەوە و بەکارهێنانی دیاردەی عەبدوڵڵا ئۆجەلان و PKK بەسەر سەری تورکیادا زۆر کارامە و زانابوون. ستراتیژ و تاکتیك ئەمە بوو؛ بۆ ئەوەی هەم PKK و گەلی کورد، هەم تورکیا و گەلی تورك بەکاربێنی، پێویست بکات بۆ تێوەگلاندنە نێو شەڕێك پەنجا ساڵ بەردەوام بکات، لەم پێناوەدا سوودم لێ ببینێ، تەنانەت لەنێوبردنی من بەدەستی تورکیا، بەلانی کەمیش ئەمانە بەدەستی توێژە پاشڤەڕۆیەکانی

گرێدراوی خۆیان ئەنجام بدەن. بەمجۆرە زیاتر گرێدانی تورکیا بەخۆیان و لەژێر رەوشی پەنابەرییەکی بێشەرمانە کوردان موحتاجی خۆی بکات، ئەمەش وەکو پارچە سەرەکییەکانی ستراتیژیەکە دادەنێ. ئەو ماجەرا (مغامرة) چوار مانگییەی لەئەوروپا روویدا، گەوهەرێکی وەهای هەیە کە ئەم مەیلە دەسەلمێنێ.

٦ دەبێ ئاماژە بە مەیلی دۆستایەتی خۆم بکەم. تەنانەت ئەگەر منداڵێکی پێنج ساڵانیش بێت، کاتێك وەکو دۆست دەستنیشانم کرد، تادوارادە باوەڕهێنانم پێی، بۆ من تایبەتمەندێتیەکی کەسایەتی و کارەکتەرە. لەوانەیە لاوازترین لایەنی من لە ژیان (تاوەکو ئێستاکەش وەکو باوەڕیەکی باتڵ لای من بەمجۆرەیە کە نابێ بە هیچ جۆرێك مەرجەکانی متمانەی هەڤاڵێتی و دۆستایەتی پێشێل بکرێت) هەستێکی بەمجۆرەی متمانەیە. باش دەزانم کە لەژێر ناوی هەڤاڵێتی و دۆستایەتی بەشێوەیەکی مەترسیدار ئەم لایەنەی من بەکارهێنراوە. بەڵام دڵنیام کە سەرەکیترین بەهای مرۆڤانەیە و پێویستە دەستی لێ بەرنەدەم. بەگوێرەی من یاریکردن بە هەڤاڵێتی و دۆستایەتی وەکو ئەوە وایە کە دایك و هاوسەرەکەت بفرۆشی. لەبەر ئەوەی پەیوەندی هەڤاڵێتی و دۆستایەتی لە کەسێتی سەدەی بیستەم گەورەترین زیانی بەرکەوت، ئەوا من دەبوومە دواترین و تراژیدیاترین قوربانیەکەی. لەم واتایەدا پێویستە باس لە زۆرانبازییەکەم بکەم لەگەڵ سەدەی بیستەمدا. ئاماژەکردن بەوەی سەرەتا لە یۆنان، دواتریش لە روسیا کە وەکو وێستگەی دووەمە و بەناوی ئەگەری دۆستایەتی رووبەڕووی تێکردبووم، بەسەر دۆستایەتی هاتووە، ئەزموون بەخش دەبێت.

لەکۆتایی دووچار ڤاڵبوونەوەم، ئەگەر بەشێوەیەکی سنووردارییش بێت دەرفەتی ئەوەیدا کارەکتەری یۆنان شیبکەمەوە. ئەوەی باسمکرد، کارەکتەری زاڵی یۆنانە. مسۆگەر گەلی هەندێ تایبەتمەندێتی کارەکتەری تایبەت و جیاواز لە باڵادەستانی هەیە. لەسەردەمی خوداوەند دیونیسۆس وە تایبەتیبوونی گەلی یۆنان راستییەکە. بەجۆش و دۆستانەیە. بەڵام هەروەکو لەتەواوی وڵاتانی جیهان دەبینرێ، ئەم کارەکتەرە تێکشکێندراوە و تەنیا گریانی لەدەست دێت. هەموو گەلانی جیهان لە دۆستایەتی خاوەن دەرناکەون. دوای ئەوەش دەگرین. کاتێك لەنێوخۆشیاندا دەبنە هەڤاڵ و دۆستی یەکتری وەها دەکەن. جیابوونەوەیان، ونبوون و بەیەکەوەبوونیشیان لەنێو گریان و خۆشەویستی هەرزان نقووم بووە. ئەگەر رێزیش بگیرێت، ئەمە بەهایەکی ئەوتۆی نییە. یەکێك رێزگرتن و خۆشەویستیەکی دۆستایەتی و هەڤاڵێتی نەپارێزێت، تەنانەت دایکیشم بێت، بەبچووك و نەزانم بینی. خۆشەویستی و لێبوردنێکی دوولایەنم نیشان نەدا. هەروەکو بڵێی قەدەر پێم دەڵێ: "گریان بۆ ئەو دۆست و هەڤاڵانەت لەجێگای خۆیدا نییە کە بەهایەکی زۆرت پێدان". ئەوەی بەرامبەری دەرکەوتم دۆستایەتی و هەڤاڵێتی نەبوو. بەپێچەوانەوە ئەو کەسە ساختە و پەرێشانانە بوو کە نەیاندەزانی ببنە دۆست و هەڤاڵ و بەهای سەرکەوتنیان پێنەدەدا.

کاتێك تەماشای مێژووی چینی سەردەستی یۆنان بکرێ، دەبینین کە بەگوێرەی ئەو شێوازە هزرەی لە ساڵانی ١٦٠٠ پێش زایین ی سەردەمی میکانیەکان کە شێوەی میتۆلۆژی وەرگرتووە، خوداوەند زیۆس دەتوانێ هەمووجۆرە زۆڵێتی و خیانەتکاری بکات. دەتوانێ هەر ژنێك لە رێگا دەرخات کە دەیبینێ، لەنێوچەوانی و رانی و هەموو شوێنێکی دەتوانێ لەسەرووی هەموویان ئەسپنا و چەندین خودای بچووك بخولقێنێ. درۆ و خەڵەتاندن تایبەتمەندێتیە ئیلاهییەکانێتی. چۆن فارمەمانی تراوەدە هکتۆری خەڵەتاند، تەنانەت هۆمەرۆس کە باوەڕی پێهێنا حەسرەتی کێشا و چۆك دادەدات. دەڵێ هەرچی دەبێ با لەبەرژەوەندی هێلینیەکان بێت. لەلایەنێك وەکو یاهۆڤای خوداوەندی ئیسرائیلە، لەبەرئەوەی هێلینیەکان و نەوەکانی ئیسرائیل قەومی هەڵبژێردراون، ئەوا بەرامبەر مرۆڤەکانی دیکە، واتە بەرامبەر بەربەرەکان چیبکەن مافی خۆیانە و خوداوەندەکەیان بەمجۆرە فەرمانیان پێدەدات. ئەم راستینە میتۆلۆژییە، دواتر دەگۆڕێ و دەبێتە راستینەی ئایینی و سیاسی. نابێت بڵێین میتۆلۆژی و تێپەڕ ببین. ئەوەی تاوەکو ڕۆژگاری ئەمڕۆمان لە بناخەی ئایین و سیاسەت شاراوەیە راستینە میتۆلۆژیەکانە.

ئەم تایبەتمەندیە میتۆلۆژیانە باس لەوەدەکات کە چینی سەردەستی یۆنان چۆن لە دایك بووە. سەرچاوە سەرەکییەکەشی میتۆلۆژیای سۆمەرە. هەروەکو دەزانرێ هێلینیەکان هەم لە بواری میتۆلۆژی، هەم وەکو کۆمەڵگای ماددی لەسەر ئەنادۆڵ، فینقی و میسرییەکان ژیاون. ئەم کارەکتەرە نەتەوەیی و چینایەتییەی ئەو رۆژە بەدواوە نەگۆڕاوە بەتەواوی رووتیەکەیەوە بەرامبەرم دەردەکەوێت. زەهنیەت و ئەخلاقێکی فێڵباز و چەواشەکارە، لەپێناو بەرژەوەندیەکانی نرخ و بەها بە هیچ مرۆڤێك نادات، لەدەرەوەی خۆی هەموو کەسێك بە بەربەر و هیچ دادەنێت. ئەو راستینەی مرۆڤایەتی و گەل و مێژوو کە نوێنەرایەتیم دەکرد، رووبەرووی راستینەیەکی کولتووری، سیاسی و مێژوویی جیاواز بۆوە کە لە گەوهەردا شایستەی نییە. لەواتایەکدا ئەمە بەردەوامیەکی بچووکی ئەو رووبەرووبوونەوەیەی رۆژهەڵات ــ رۆژئاوایە کەلە سەردەمی مادەکان و پارسەکانەوە بەردەوامە. هێندە بە سانایی دەرگای رۆژئاوا مۆڵەتی بە فەلەمبازی رۆژهەڵات نەدەدا تێپەڕ بێت کە لە کەسێتی مندا نوێنەرایەتی دەکرا، ئەمێنا لێکدانەوەی جیاوازتریشی هەبوو. هەموو هەڵوێستەکانی ئەوە بوو، بەرامبەر مەترسی تورکان، بەهەر شێوازێك سوود لە هەموو کەسێك ببینرێ ــ بێگومان بەشێوەیەکی دۆستانە ـ چاویان نەدەبڕی کە سوود لە کەسێتی من ببینن. لایەنگری ئەوەبوون بۆ سوود وەرگرتن، بەشێوەیەکی سیاسەتی ئینگلیز "سەگ بەگز سەگەوە بنێ" مەسەلەکە تاوتوێ بکەن. دەرك بەوە دەکرا کە دۆستایەتیەکەیان تەنیا خەڵەتاندنە.

بەرامبەر بەو زەحمەتیانەی لەئەنجامی دەرکەوتنە بێ پلانەکەمان هاتە ئاراوە، روسیا لەسەرووی ئەمانە هات کە پێویست بوو تاقیبکەینەوە. قۆناخێکی قەیراناوی لەئارادا بوو کە

دوای سۆسیالیزم لەئەنجامی قۆناخی گەندەڵبوون دەرکەوتبوو. سەرۆك وەزیران پریماکۆف و سەرۆك یەڵتسین خیانەتکارە گەورەکانی سۆسیالیزمی بونیادنراو بوون. بەهۆی پەیوەندییە بەرژەوەندیخوازەکانیان لەگەڵ هەوالگری نهێنی و فرێژ و ئابووری، چەندەی شوێنگەکەم ستراتیژیش بێت، لەو قۆناخە بۆ هەراجکردنی زۆر ئامادە بوون. چاوەڕوانیکردنی رێز لە واتەی ئەم سیستەمە زەبەلاحەی سۆفیەتیان هەراجکرد، خۆخەڵەتاندن بوو. ئەو پەیوەندیانەی لەگەڵ IMF ، ئەمریکا، ئیسرائیل و تورکیا بەرێوەبران، ئەوەی یەکلاکردبۆوە کە هەڵوێستێکی ناپاساییانە بەرامبەر من نیشاندەدرێت. هەروەکو دەزانرێ پەرلەمانی دوما بە ٣٩٨ دەنگی ئەرێ بەرامبەر ١ رکابەر سەبارەت بە دانی پەنابەری سیاسی بە من بڕیارێکی سەندبوو. بەڵام لەلایەن دەوڵەتی سەرەرۆ ئەمە واتایەکی نەبوو. بەزۆر دەیانخواست بەسەر ئاسمانی تورکیا من لە فویرس دابنێن. شیمانەی مەزن ئەوەیە بەشێوەیەکی هاوبەشانە هەر لەو رۆژانە لەوانە بوو پیلانی تەسلیمکردنەوەم ئەنجام بدرێ.

ئەمە بڕارێك نەبوو بەقەناعەتەوە هەڵبژاردبێت. بەڵام بەمجۆرە دانیشتنی رژێمێکی گەندەڵی وەها لەسەر بانگەشەکانی یەکسانی و ئازادی کە هێندە خوێنەی لەپێناو رژێنراو ئێش و ئازار چەشترا، لەراستیدا لاڕێبوونە قووڵەکانی سۆسیالیزمی بونیادنراوی نیشاندەدا. ئەم رەوشە دەسەلێنێ کە لەسیستەمی باوی چەوسانەوە و فشار دانەبڕابوو، ئەوەی دەهێنا بیرم کە زۆر لە سۆسیالیزمی پەرستگاکانی راهیبەکانی سۆمەریش دواکەوتووتر بوون. نموونەیەکی ئەوە نیشاندەدرا کە شۆڕشگێڕێتی روسیا ئاسۆی دەرەبەگایەتی و سەرمایەداری تێپەڕ نەکردووە، سەرمایەداری دەوڵەت ناتوانێ سۆسیالیزم بخوڵقێنێ، هەربۆیە ناتوانێ بەرامبەر سەرمایەداری لیبرالی هاوچەرخ خۆی لەسەر پێیان بگرێت. بەتایبەتی بینینی ئەمە رێگای لەپێش ئەوە کردەوە باشتر رووێکی سەدەی بیستەم بناسم. سەدەی بیستەم زۆر لە سەدەیەکی خیانەت دەچوو، سەدەی شۆڕش و ئازادیەکان، بەرلەوەی کۆتایی بێت، پاڵی بە ٢٠٠٠ وە ناوە کە سەدەیەکە لەریشەوە پابەندی هیچ بەهایەکی مرۆڤایەتی نییە و بەرژەوەندی ماددی هەموو پرەنسیپێکی دیلکردووە. تێپەڕبوونی بەشێوەیەکی هێندە خوێناوی بەڵگەیەکی هۆڤێتیەکەیەتی نەك شکۆمەندی. ئەوەی بەسەر گشتیدا زاڵ بوو، نەتەوەپەرستی سەرەتایی و ماتریالیزمی قەبە بوو. بەرفراوانترین دژە شۆڕش بەرامبەر تەواوی تایبەتمەندێتیە شکۆدارەکان و خاوەن گەوهەرە دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤە کە بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتی هەبووە.

رووبەڕوی ئەنجامێك ببووینەوە کە ناچاری دەکردین سەرلەنوێ شۆڕش و دژەشۆڕش پێناسە بکەین. بەراوردکردنی پرەنسیپەکانی لەگەڵ ئەو شێوازە ژیانەی بۆ رۆشنکردنەوە کە لە رۆژانەیدا نقووم بووە. خۆ خەریك نەکردن و بەهەڵواسراوی نەمانەوەم بەرامبەر هەندێك قالبی سەمبۆلیك، زانابوون و بوێری منی سەبارەت بەوە زیاد دەکرد کە ئیتر پێویست دەکات

ئازایانە دەمامکەکانی مرۆڤ و خوداوەند (گوزارشت لەهەمان راستینە دەکەن) پارچە بکەم. دەبووایە بتەکانی سەدەی بیستەم بشکێنرێن. هەبوون و مافەکانی تاك پێویستە بەر لەهەبوون و مافەکانی کۆمەڵگا بێت یاخود بەلانی کەم پێویست دەکات خاڵێکی ناوینی نێوان هەردووکیان بەبنەما بگیردرێ. بەجێهێشتنی بابەتی کەسێتی تاك و مافەکانی بۆ ویژدانی سەرمایەداری خەڵەتاندنێکی شووم بوو. هەر کۆمەڵەیەکی هەبوونی تاك و گەشەسەندنی ئازادانەی بەبناخە نەگرێت، لە راستیدا شێوازی راهیبی سۆمەر بوو و مەحکومی نافراندنی چینی سەردەست و چەوسێنەر بوو. لەراستیدا دروشمی "هەموو شتێك لەپێناو کۆمەڵگا" دروشمی کۆنترین کۆمەڵگای چینایەتی بوو. هەرچەندە "هەموو شتێك لەپێناو تاك" ناکۆکیش دیاربێت، دروشمی پێشکەوتووترین کۆمەڵگای چینایەتیە، کە ئەویش سەرمایەدارییە. بەبێ ئەوەی بەرامبەر دروشمەکانی هەردوو پرەنسیپەکە تێکبشکێی، ڕێگای سەرەکی پشتبەستن بوو بە بانگەشەی مرۆڤایەتی و ئازادی و یەکسانی. ئەگەر سۆسیالیزمی زانستی بیێتە دیاردەیەك دەبێ خۆی لە دۆگماتیزم و سۆسیالیزمی پەرستگا رزگار بکات. هەموو تێکۆشانێك لەپێناو دەوڵەت، پێچەوانەی سۆسیالیزم بوو. لەجیاتی ئەو، لێگەڕێن گەوهەری سۆسیالیزم بوو. ئەو دەوڵەتەی هەیە، فۆرمیلی دیکتاتۆرێتی پرۆلیتاریاش بێت، جگە لە ئامرازێکی نوێی کۆیلایەتی ئەنجامێکی دیکەی نەدەدا. تیۆری و پراکتیکی سیاسی کە لەسەر بنەمای تێپەڕاندنی سیستەمی فشار بێت، لەمیانەی ئەو تواناکاریانەی کە لەرێگای ئازادی رەنجی هاوبەشی کۆمەڵگا و بەرزکردنەوەی ئایدیۆلۆژیای یەکسانی و زانستی و تەکنۆلۆژیا رێگای لەپێش کردەوە و لەسەرووی هەمووانەوە تاك بەبناخە دەگرێت، دەتوانێ هۆڤێتی چینی سەردەست تێپەڕبکات و ئەو یۆتۆپیا کۆمەڵایەتیەی بۆی تامەزرۆین بە گوزارشتی واقیعی خۆی بگەیەنێ.

هێندە خێرابوونی هەڵبوونەوەی ئایدیۆلۆژیم لەئەنجامی سەفەرەکەم بۆ مۆسکۆ، سەرەکیترین وەڵام بوو کە بیدەمەوە یادی ئەو کەسانەی کە باوەڕییان بە یۆتۆپیای سۆسیالیزم هێناوە و رەنجێکی مەزنیان لەپێناوی داوە. مۆسکۆی سەدەی بیستەم هێندە بچووك ببۆوە، هێزێکی وەها نەبوو تەنانەت خەیاڵێکی ئەرێنیش زیندوو بکاتەوە. ئاشکرا بوو کەبەلانی کەم هێندەی راستینەی یۆنان، هەڵوەستەکردن لەسەر راستینەی روسەکان پێویست بوو. لێرەشدا ئەمە بەئاشکرا دەرکەوت کە هەڵوێست نیشاندان لە میانەی سووتانی هەندێ بت، سەبارەت بە گەیشتن بە راستینەکان ناچاری دەست لێبەرنەدراوە.

له ١٢ی ١١ی ١٩٩٨ چوونم بۆ رۆما، لەبەرئەوە بوو کە تاکە پایتەختی وڵاتانی ئەورووپا بوو کە بتوانم بۆی بچم. بە یارمەتی ئەندام پەرلەمانتەری گرووپی "سەرلەنوێ ئاواکردنەوە" ی پارتی کۆمۆنیست رامۆن مۆنتالفیانی گەیشتمە رۆما. ئەمەش هاوکات بوو لەگەڵ ئەو چەند مانگەی حکومەتی ماسیمۆ دالیما. هەڵوێستەکانی زگزاکی بوو. هەڵوێستێکی یەکلابۆوەی سیاسی و یاسایی نیشانئەدا. وروژاندنی فورسی ناوەندە مەزنەکانی سەرمایەی ئیتالیا، نەبوونی

پشتگیری وڵاتەکانی ئەوروپا، بەتایبەتیش لەژێر فورسایی هەڵوێستی خۆسەپاندن و هەژاندنی کەسایەتی ئەڵمانیا نەیدەتوانی خاوەن دەستپێشخەری بێت. هەڵوێستی لەسەرخۆ دوور خستنەوە پێشدەکەوێت. لەرێگای ئەو پۆلیسانەی بەباشترین شێوە پەروەردە کراون، فشارێکی سایکۆلۆژی چڕدانرا. هیچ دەرفەت بەوە نەدرا کە لە ژوورەکە دەربکەوم. ئەگەر رفاندن یاخود سووربوون لەسەر مانەوە بکرابووایە، ئەوە دەسەپێنرا کەبە کۆنترۆڵێکی زۆر وشك و چڕ رازی ببم. ئاشکرا بوو یەکێك کە خاوەن بەرپرسیارێتی قورس بێت، دەبووایە لە یەکەمین دەرفەتی برەخسێ لەوێ جیا بێتەوە. تەنیا ئەوە مابوو بە فشار و گوشار بەدەرم بنێن. پێشکەشکردنی پارە بەچەندین وڵات و هەوڵدانیان بۆ ئامادەکردنی شوێن نیازە راستەقینەکانی نیشاندەدان. هەڵوێستی یاسای دیموکراتییانە نیشاننەدرا.

نیازم راکێشانی کێشەی کورد بوو بۆ پلاتفۆرمێکی دیموکراتییانە. ئەگەر پشتگیری هەبووایە، زەحمەت نەبوو تورکیاش بێتە سەر ئەم هەڵوێستە. روونبۆوە کە ئەوروپا لایەنگری چارەسەریەکی جددی کێشەی کورد نییە. خەریککردنی تورکیا بەکێشەکە زیاتر بەگوێرەی بەرژەوەندییەکانی خۆیان دەبینی. ئەمە لە هەڵوێستی یۆنانیش دەرکی پێدەکرا. لەوانەیە لە ئەوروپا سیاسەت کۆتایی بەشەڕ بێنێ. ئەمەش لەگەڵ ستراتیژی رۆژئاوا، ئەمەریکاشی لەناودا ناکۆك بوو. هەڵوێستی ئەڵمانیا ئەوەبوو ساتێك زووتر رێگای شاخ بکرێتەوە. ئاشکرابوو کە بەشێوەیەکی درێژخایەن بیردەکەنەوە. ئالۆزی رۆژهەڵاتی ناوین کەپشت بەکوردان ببەستێ، زیاتر بەگوێرەی داخوازیەکانیان بوو. هەربۆیە دەرکەوتنێکی چاوەڕواننەکراوی من، رەوشێکی دەرەوەی تاکتیکەکانیان بوو. تەواوی ئامادەکاریەکانیان پشتی خۆی بە کەسایەتی کوردە بەکرێگیراو و ماڵیکراوەکان دەبەست. PKK بەتایبەتیش هەبوونی من، ئەو کارتەی دەستیانی لەکار دەخست کەبەدەیان ساڵ ئاراستەیان کردبوو و لەرێگایەوە سەرمایەیەکی زۆریان کۆ کردبۆوە. یان زۆر دەیهەژێنن و دەیخەنە رەوشی یەکێکی بێ کەسایەتی، یاخود بەدەریانەوە دەنا. مەیلی ئەمەریکاش لەمەدا دەکەوتە نێو لێکدانەوەکان. فشارێکی زیاترم کردبووایە دەمتوانی بمێنمەوە. زەحمەت بوو لەو ناوەندە بەدەرنرێم کە یاسای رۆمای تێدا لەدایکبوو. بەڵام مەترسیە سیاسیەکانی ئەمە قورس بوو. پێویست بوو هەموو جۆرە هەڵوێستێکی مەترسیدارانەی دەوڵەتێك لێکدانەوەی لەسەر بکرێت کە تا ئەم رادەیە تەنگەتاو ببوو. جیابوونەوەم لەیەکەم دەرفەتی کە دەرەخسێ ببووە ناچاریەك.

ئەوچوار مانگەی لەسێ پایتەختی مێژوویی ئەوروپا بەسەرم برد هەندێ راستینەی گرنگی ئاشکرا کردبوو. دیموکراسی و یاسا نیازی نەبوو مافی ئیرادەی ئازادی گەلی کورد بدات. ئەوروپا سیاسەتێکی مرۆڤانەی سەبارەت بە کوردان نەبوو. تەنیا سەبارەت بەداخوازیەکان لە تورکیا وەکو سەری رم بەکاریان دەهێنا. لەراستیدا سیاسەتەکانی ئەم دوو سەدەی دوایی پیادە دەکرا. بۆئەوەی بەرێوەبەرایەتی ئێران، ئێراق و تورکیا لەرۆژهەڵاتی ناوین بەگوێرەی سیاسەتەکانی

خۆیان ئاراستە بکەن کوردان وەکو گونجاوترین ئامراز دەبینران. هەڵوێست نیشاندەدانیان سەبارەت بەچارەسەرییەکی بەپەلە، هۆکارە سەرەکییەکەی بۆ ئەمە دەگەڕێتەوە. پێویستیان بە دیاردەیەکی کورد هەبوو کە بۆ ماوەیەکی درێژخایەن کێشەیان بۆ بخولقێنێ. بەلام چارەسەرکردنی کێشەکە کەرەستە و ئامرازێکی بەکارهێنانی لەئارادا نەدەهێشت.

ئەم هەڵوێستە سەبارەت بە ڕێکخراوە بەکرێگیراوەکانی باکووری ئێراقیش لەجێگای خۆیدایە. تورکیایەکی بەکێشە و گیروگرفت پێویستی پێیان دەبوو. هەربۆیە بەردەوام مانەوەی PKK وەکو کێشەیەك، لەپێناو بەرژەوەندییە سیاسیەکان بۆ هەموویان پێویست بوو. لەجیاتی ئەوەی لەگەڵ مندا بەرەو چارەسەری بچێت، بیری لەیەکێك دەکردەوە کە بەگوێرەی داخوازیەکانیان هەڵسوکەوت بکات و لەخزمەتی سیاسەتە درێژخایەنەکانیاندا بێت. لەگەڵ راسپاردە و چوارچێوەی سیاسەتی دووسەد ساڵە ئاکۆك دەبینرام. ڕەوشێك نەبوو کە کارەکتەری ئازاد و دەستپێشخەری بڕیاری سەربەخۆ پەسند بکەن. پەسندکردنی ئەمە، بەواتای لەدەستدانی ئەو کوردە بەکرێگیراوانە دەهات کە بەدەیان ساڵە بەخێویان دەکەن. ئیتالیا دەیخواست دەرفەتی زیاتری بەجێکردنی سەرمایە و بازرگانی لە تورکیا بەدەست بێنێ. هەربۆیە رادیکالترین هەڵوێستی نیشاندەدا. بەلام هەروەکو لە بواری کرداریش بینرا رەوشی من ئەم لێکدانەوەیەی تێکدەدا. بەرژەوەندییەکانیان لەگەڵ هەڵگرتنی کەسایەتی من کۆك نەبوو. وەکو دیاربوو دیموکراسی و مافپەروەری ئەورووپا لەسنوورەکانی کێشەی کورد دەوەستا. تەنیا هەڵوێستی کورد سەبارەت بەوە جێگای باس بوو کە وەکو هێزێکی کاری هەرزان بەکار بهێنرێ و بۆ ماوەیەکی درێژخایەن وەکو ئامرازێك بۆ سیاسەتەکانی سەبارەت بە رۆژهەلاتی ناوین بەکاربهێنرێت. هەرچەندە بەمجۆرەش بێت، بەلام دیسان دوور بوو لەوەی وەکو سیاسەتێك شێوە بگرێت. ئەو لایەنەی دەردەکەوتە پێش، هەروەکو لە چەندین کێشەی گشتیدا دەبینرێ ـ بەڵکان لەسەرووی هەموویانەوە ـ سەبارەت بەکێشەی کوردیش سیاسەتێکی ئەورووپا نەبوو کەشێوەی گرتبێت. هەر دەوڵەتێك لەمیانەی ناوەندەکانی پۆلیس و ئیستخباراتەوە نزیك دەبێتەوە، لەرێگای دەزگاکانی کۆمەڵی مەدەنیش هەوڵی دزەکردنی دەدا.

وابزانم کاتێك لەرۆما بووم، تەنانەت لە مۆسکۆ بووم هێزێك کە بەردەوام بە مەسەلەی من پەیوەندیدار دەبوو مۆساد بوو. پێبەپێ ئاشکرا دەبوو کە بەو رادەیەی بڵێ" خاوەنی سەرەکی مەسەلەی کورد منم" هێزێکی سەرەکی بوو کە تۆڕی چاودێری و ئیستخباراتی پێشخست.

ئەمریکا، ئیسرائیل و ئینگلتەرا وەکو کەناڵێکی جیاواز بەجێدەبوون. هێشتا ئەورووپا بلاوەبوو. بێگومان سەبارەت بەکێشەی گرنگی بەمجۆرە لەسیاسەتێکی هاوبەش بێبەش بوو. دووسەد ساڵە ئینگلتەرا رێبەرایەتی دەکرد. بەبێ ئینگلتەرا ناتوانرێ بیر لە ئەگەری سیاسەتێکی سەبارەت بەکوردان بکرێتەوە. لەگەڵ ئاواکردنی ئیسرائیل کۆنترۆڵ و چاودێری لەرێگای مۆسادەوە بەڕێوەدەبردرا. لەگەڵ تاڵەبانی و بارزانی و چەندین سیستەمی کوردەوە

گرێدراو بوو. بەڵام رەوشی PKK ئەو سیستەمە تێکدەدات کە خوڵقاندوویانە، هەرچەشەی لەو هاوسەنگییە دەکرد کە خوڵقێنرا بوو. هەربۆیە منیان بەرپرسیار دەبینی، لەمیانەی سیاسەتێکی ریسواکردن و گۆشەگیر کردنەوە بەندیان دەکردم. رێککەوتنەکانی ساڵی ۱۹۹٦ لەگەڵ تورکیا، رێگای لە پێش ئەوە کردەوە رۆڵی کێومالی بگرێتە ئەستۆ. زۆر بەباشی لێکدەدانەوەی ئەم رەوشە کەموکورییەك بوو. کاتێك لە رۆما بووم هێشتا بەهەندوەرنەگرتنی ئەمە، سەرچاوەی خۆی لە کەموکوڕی لێکدانەوەی ئیسرائیل دەهات. دوایی دەرك بەوە دەکرێت کە ئەوەی سەبارەت بەمن مۆسکۆی لە نێو دەستەکانی خۆیەوە گرت ئیسرائیل بوو. رۆڵی ئیسرائیل لە تاقیبکردنی من و خستنە نێو رەوشی بێکاریگەرکردن یەکلاکەرەوەیە. بێگومان ئەمە لەمیانەی پارەتی دارایی و دیپلۆماسی مەزنی ئەمریکاوە بەرێوەبراوە. بۆئەوەی لە مۆسکۆ نەمێنم، قەرزی ۸ ملیاری دۆلاری IMF بەکارهێنراوە. دیسان بەهەمان ئامانج پرۆژەی رەوتی شین لە تورکیا سەندرا، چەپەڵانەترینیان ئەوەبوو کە بەبێ ئەوەی هیچ شتێك بدەن، لەمیانەی بەکارهێنانی رەوشی تەنگەتاوی من، گەلێك قەرەبوویان لەیەکتری دەسەند. سیستەمی بەرژەوەندیخوازی لە تورکیا کە بە" پاداشتی ئاپۆ" ناودەبرێ، لە گۆڕەپانی نێو دەوڵەتیدا بەشێوەیەکی بەرفراوانتر پیادە دەکرا. تەواوی بیرۆکراتە ئەوروپایی، روسیایی و ئەمریکایی و تەنانەت کینیاییەکانیش پاداشتەکانی خۆیان وەردەگرت. لە کەسایەتی مندا بەمجۆرە لە میانەی بەرژەوەندیە مادیەکانیان هەراجکردنی داخوازییەکانی ئازادی گەلێك، زۆر چەپەڵانە بوو.

لە ئیتاڵیا شەڕی دەروونی ئەنجامی بەدەست دەهێنا. ئامادەکاریم دەکرد لە بچووکترین دەرفەتدا ئەوێ بەجێبێڵم. ساویلکەیی گوندێتی نومان ئۆچاری نوێنەرمان لە مۆسکۆ، پارەتیدەر بوو بۆ قووڵبونەوە و بەردەوامکردنی پیلانگێڕی. رەوشی بێبەرپرسیارێتی و بێکاریگەری نوێنەری ئیتاڵیاش ئەحمەد، دوور بوو لەوەی رووداوەکان تێبگات، هەموویان لەمێژبوو لەنێو دونیا بچووکەکەی خۆیان کۆتاییان پێهاتبوو. دوای دەرکەوتن لە ئیتاڵیا هەم من، هەم سەرۆك وەزیران دالیما ئاسوودە ببوو. دالیما تاقیکردنەوەیەکی خراپی دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤی دابوو، لەبەرامبەر سەرمایەی ئیتاڵیا بەترس بوو. ئەگەر بیوویە دەنگی رەسەنی مافپەروەری و دیموکراسی، ئەوا رۆڵ و بەشداری لە مێژووی ئازادیدا لەبیر نەدەکرا.

کاتێك دووبارە گەڕامەوە مۆسکۆ، شیمانەی مەزن ئەوەیە دوا پەردەی گەمەکە دەزانرا و ئامادە کرابوو. دەرخستنم لە ئیتاڵیا لە ئەنجامی هێزی تاریکی هەر دوو لایەن و هەڵوێستی ساکارانەی نوێنەرەکانی PKK بەدیهات. قۆناغ، قۆناغی ئامادەکردنی خاچ یان تابووت بوو. ئەوانەی مۆسکۆ بەتوندی بزماری یەکەمیان لێدەدا. بۆ یەکەمین جار لە رووخساریاندا ئاشنای دیمەنێك دەبووم کە جێگا بە دۆستایەتی نادات. دیارە کە بڕیار لەئاستی سەروو هاتبوو و مسۆگەر بوو. ئەوەی بۆ چارەنووسی زانراو کەوتبووە ئەستۆیان بەجێیان دەگەیاند. بە

لەیستۆك و فشار سواری فڕۆکەیەکی بارهەڵگر کرام، دواتر دوای هەفتەیەك دەستبەسەرداگرتنم لە گوندێکی پایتەختی تاجیکستان بیشکەك دیسان لەنێو هەمان ستاتۆ لەرێگای پترۆگراد، نوێنەری ئەسینا ئایفەر لەگەڵ ناکازاکیەری کە وەکو دۆست دیاربوو دەگووترا کە ژەنراڵێکی خانەنشینە و بەیەکەوە بە فڕۆکەیەکی تایبەت هاتن و بەرەو ئەسینا کەوتینە رێ. ئاشکرا بوو کە فڕۆکەکە پەیوەندی بە دەوڵەتەوە هەیە. سەرەتا خواستیان لە رۆمانیا دابەزین. ناگازاکیس بانگەشەی ئەوە دەکات کە لەگەڵ سمیتیس بڕیاری ئەوە درابوو کە تەسلیمکردنم لێرە رووبدات. لەوانەیە راست بێ. کاتێك پەسندم نەکرد، بەناچاری لە ئەسینا دابەزین. هەمان کرپارەکانی دۆزەخ، دیسان ستاڤراکیس و قەلاندەریس چاوەڕوان بوون. بەڵام ئەمە دوای رۆژێك بوو. یەکەمین رۆژ چۆن هاتم بەرێگای VIP تێپەڕین و لەماڵی خەسووی ناکازاکیس دا مامەوە کە ژنێکی لە میللەت و دۆست بوو، لێم پرسی : دەشێ پانگالۆس خیانەت بکات؟ زۆر بەدڵنیایی گووتی: نەخێر، لەمە باشتر دەرفەتێك بۆ هەڵبژاردن نابێت.

پانگالۆسی وەزیری دەرەوە پەنای بردە بەر فێڵێکی ئاشکرا. لە بەرزترین ئاستدا دەستەیەکی ئیستخباراتی بۆ ئەو ماڵە ناردبوو کە بەشێوەیەکی فەرمی بە ئامانجی چاوپێکەوتن بانگ کرابووم. بەشێوازێکی هەڕەشە ئامێزانەی دوور لە دۆستانە گووتی" تاوەکو کاتژمێر چواری بەیانی ماوەت پێ دەدەین، لەرەوشێکی پێچەوانەدا ئەوەی دەخوازین بەفشار ئەنجامی دەدەین". ئەمە هەڵوێستێکی دوژمنکارانە بوو. رووی راستەقینەی خۆیان نیشاندەدا. ئاشکرا بوو کە پێشتر رێککەوتوون. ئەوەی مابۆوە ئەوە بوو هێشتا ئەو باوەڕەی من بەدۆستایەتی کە بەردەوام بوو، بەکاریان دەهێنا و بەو لایەیان رادەکێشا کە دەیانخواست. زۆر پێشتر بەیەکەوە لەگەڵ CIA کینیا ئامادە کرابوو. دواتر دەرکم بەوە دەکرد. قەلاندەریسی زۆر باوەڕیم پێی هێنا، سوێندی لەسەر شەرەفی یۆنان خوارد، گووتی وەکو شوێنێکی دوور لە مەترسی دوای ۱۵ رۆژ مانەوە لە کینیا کە یۆنانیە کۆنەکان تێیدا بەکاریگەرن، لەرێگای ئەو پاسەپۆرتەی باشووری ئەفریقیا کە وەزارەتی دەرەوە ئامادەی دەکات چارەسەری دەدۆزرێتەوە. لەبەرئەوەی متمانەکردن بەدۆست بەبنەما دەگیرا، نەدەبوو پەسند نەکرێ. یەکێکی وەهام لانەبوو بەجددی ئاگادارم بکاتەوە. ئەو وەرگێڕەی بەتەواوی لێی تێنەگەیشتم مەلسا، بەشێوەیەکی سڕکراو هەڵسوکەوتی دەکرد. دەیتوانی دۆستایەتیە ساختەکەیان تێبگات. دەستیان بەسەر ئایفەر دا گرتبوو. لەراستیدا گۆشەگیر کرابووم.

لەم قۆناخەدا هەندێ جموجۆڵم بینی کە دەیانخواست بەرێگایەکی ناراستەوخۆ باسی خیانەت بکەن. شوفێر بەتوندی ئوتۆمبێلەکەی بەو فڕۆکەیەدا کێشا کە دەبووایە سواری ببم. لەو باوەڕەدام ئەم هەڵوێستە بەئەنقەست بوو. فڕۆکەکە هەڵنەفڕی. بەڵام دوایی لەو شوێنەی کە گومانم دەکرد لەرێی سوێندەوە بێت، فڕۆکەیەکی زۆر تایبەت چاوەڕوانی دەکردم کە گروپەکەی یۆنانی نەبوون. شیمانەی ئەوە لەپێشە فڕۆکەی CIA یاخود ئیستخباراتی

ئینگلتەرا بوو بێت. بەرلەوەی سواربم شوفێری تاکسی دەجار هاتوچۆی کرد، نەیدەخواست بەفرۆکەکە بگەین. ئەنجامێکم لەوەش بەدەست نەهێنا. هێندە باوەڕم کردبوو کە خیانەتی وەها لە پەڕتووکی دۆستایەتیدا نییە، تەنانەت ئەوکات یەکێك پێی بگووتمایە "دەڕفێنرێی"، بەتوندی وەڵامم دەدایەوە. چونکە جێگای ئەمە لەپەرتووکی مرۆڤایەتیدا نەبوو.

دواتر روونەبۆوە کە هەموو شتێك بەرنامەڕێژکراو بوو. باڵیۆزی یۆنان لە کینیا کۆستۆلاس زۆر بەسانایی منی لە فڕۆکەخانە وەرگرت. یەکەمین قسەی واتادار بوو. خواستی ئەو هەستە لای من دروست بکات کە، لەوانەیە کەمێ شەرەفی ئینگلیز و ئەڵمانیەکان هەبێت، بەڵام یۆنانیەکان شەرەف و کەرامەتیان نییە. مەحاڵ بوو ئەنجامێك لەم قسانەی بەدەست بهێنرێ. بەزۆر نیازی ئەوە بوو من لە کۆبوونەوەی UN بەجێبێڵێ. هیچ شتێك لەمەش تێنەگەیشتم. دوایی وازی لەوەش هێنا نانم لەگەڵدا بخوات. هەوڵیدەدا لەگەڵم دانەنیشێ. دیار بوو کە رۆژانی دوایی بەسەر دەبرد. بەگوێرەی ئەو راسپاردەیەی لە ئەسیناوە هات مسۆگەر دەیانخواست لە باڵیۆزخانە بەدەرم بنێن. چوار کەسی ئەرك پێدراویان ناردبوو. کاتێك پێمان گووتن بەرخودان دەکەین، وازیان لەمە هێنا. لەئاستی وەزارەت لە وەزارەتەکانی دەرەوە، گشتی، دادوەری و ئیستخبارات، تاوەکو بەیانی داکۆکیان لەسەر ئەوە دەکرد پێویستە لە باڵیۆزخانە بەدەربنرێم و لەمەشدا بەبڕیاربوون. کۆستۆلاس پێی راگەیاندم کە لە کۆبوونەوەیەکدا کە کوڕی سەرۆکی ئیستخباراتی وەزارەتی دەرەوەی کینیا ئامادەبووە، دەرکەوتووە کەهەموو شتێك دەزانرێ، تەنانەت وێنەشیان گرتووم، ماوەی دراوە تا ٥ی شوباتە، بڕیاری ئەوەیان گرتووە ئەگەر دەرنەکەوێت ئەوا بەفشار ئەمە جێبەجێ دەکەن. ئەگەر ٥ی شوبات دەرنەکەوین، شیمانەی هەموو شتێك، تەنانەت کوشتنیش هەیە. هەربۆیە ئەم رۆژە ناچاری بوو دەرکەوین. ئەگەر بمێنین، ئەوا هێرش دێنن، ئەوکاتە دەڵێن بەرخودانی کرد و پێکدادان دەرکەوت و کوژرا. دوا خیانەتی گەورەی ڤەلاندەریس ئەوەبوو. گووتی" قسەم لەگەڵ سمیتیس کرد، گەرەنتی ئەوەی پێدام کە دەتوانین لەرێگای میسرەوە بەرەو هۆڵەندا بچین" . جگە لە پەسندکردن هیچ بژارێکی دیکە نەبوو. پێشتریش لە رێگای پایتەختی بیلاروسیا مینسك بیر لەسەفەری هۆڵەندا کرابۆوە. لەراستیدا ئەمەش رێکخرابوو. شیمانەیەکی مەزن ئەوەیە کەهەر لەکاتی دەرکەوتنم لەشامەوە هەموو شتێك بەگوێرەی پێویستییەکانی پیلانی CIA و ئیستخباراتی ئینگلتەرا و یۆنان ئاراستەکراوە کە رووی ناوەوەی نازانرێ. گومانم لەوەدا نییە کەئەم پیلانە وەکو یەکێك لە گەورەترین گێرەشێوێنیەکانی مێژوو ئامادەکراوە. بەڵام مەحاڵە بتوانم بڵێم سەبارەت بە رووی ناوەوەی هەمووشتێك دەزانم. تەنیا خۆیان ئەمە دەزانن. ئەوەی دەبێ بیکەین، پێشخستنی شرۆڤەیەکی راستە سەبارەت بەو گۆڕان و پەرەسەندنانەی هاتۆتە ئاراوە. پۆلیسی کینیایان تاوەکو ناوەوەی باڵیۆزخانەکە هێنابوو. بەئاشکرایی ئەوەیان نیشاندام ئەگەر نەچم، ئەوا پەلامار دەدەن. کاربەدەستەکە لەمیانەی چەند رستەیەکەوە دەیگووت:"

ئێمە ناخوازین خوێن لە وڵاتی ئێمەدا بڕژێ". شیمانەی ئەوە هەیە لەم ناوەدا دەرمان و ماددەی هۆشبەریان بەکار هێنابێ. بەشێوەیەکی رەها کارمەندەکانی چێشتلێنان گرێدراوی خودی باڵیۆزخانە بوون. رەوشەم هەروەکو نیو خەوتوو- نیو وشیار وابوو. هەربۆیە شیمانەیەکی لەپێش ئەوەیە کەبۆ ئەوەی لەم کاتەدا نەهێڵن بەشێوەیەکی دروست بیربکەمەوە بەپێی پێویست دەرمانیان بەکارهێنابێ. لەوانەیە ئەم دەرمانە سڕکەرانە یەکێك لەو هۆکارانە بێت کە نەمتوانی ئەو رەوشانەش شیبکەمەوە کە بەئاشکرایی جێگای گومان بوون.

هەستم بەوەکرد کە لەدەوروبەری ئەو فڕۆکەیەی ئامادەکراوە پیاوی چاوشین و قژزەرد و باڵابەرز کە تفەنگی ئۆتۆماتیکیان بەدەستەوەیە تەدبیریان گرتووە. شیمانەیەکی مەزنە ئەوانە ئەندامی CIA ، MOSSAD بوون.

شیمانەیەکی مەزن ئەوانەی لە باڵیۆزخانەش وێنەیان کێشام سەر بە مۆساد بوون. لەناو فڕۆکەدا ئەندامانی تیمی تایبەتی تورك خۆیان فڕێدا و منیان درێژکرد. هەموو شتێکی لام بوو بردیان، بەباند هەموو شوێنێکیان گرێدام. بە هەمان باندی ئەستوور چاوەکانمیان گرێدا و منیان لەدواوەی فڕۆکە بەجێکرد. فڕۆکەکە هی جاوید چاغلار بوو. رووداوێك بوو ناوەڕۆکی حکومەتی پارتی رێگای راستی (DYP)ی نیشاندەدا. فڕۆکەکە دووجار نیشت. شوێنێکیان میسر بوو، ئەوەی دیکەشیان ئیسرائیل یان قوبرس بوو. کاتێك بە کەشتی منیان بردە دوورگە بەیانیەکەی ١٦ی شوبات بوو. کاتێك یەکەمجار لەناو فڕۆکە چاوەکانمیان کردەوە ئەو پەیامەی خواستم بیدەم بەمجۆرە بوو:"ئەم سەرکەوتنە هی ئێوە نییە، ئەوانەی دەڵێن دۆستایەتیتان لەگەڵ دەکەین، بەدروستی هەڵوێست نیشان نادەن، دەخوازن ئەم گەمەیە لەسەر هەر دوو لا پەیڕەو بکەن. هیچ کاتێك من دوژمنایەتی گەلی تورکم نەکرد، تەنانەت لە لایەنی دایکەوە پەیوەندی خوێنمان لەگەڵ تورکان هەیە. ئاشتی و برایەتی تاکە رێگای راستە. مسۆگەرە لەمە بەدواوە لەسەر ئەم بنەمایە درێژە بەخەباتی خۆم دەدەم". لەراستیدا هەڵوێستی یەکەمم ئەوە بوو تاوەکو دوایی هیچ قسەیەك نەکەم. بەڵام یەکسەر دەرکم بەوە کرد کە ئەم هەڵوێستە رێگا لەپێش ئەوە دەکاتەوە کە پیلانگێڕی وەکو خۆی بەنهێنی بمێنێتەوە. بۆ ئەوەی پیلانگێڕی رۆشن بکەینەوە درێژەدان بە ژیان هەڵوێستی هەرە راست بوو. لەرێگا کاتێك منیان لەفڕۆکە دابەزاند و کەمێك بۆ رۆیشتن پاڵیان پێوە نان، کاتێك گووتم"چییە بۆ کردەوەیەکی بکەری نادیارم دەبەن؟" لەبیرمە کە گووتیان" ئەم شانسە بە تۆ نادەین، دەمت داخە، ئەگەرنا ئێمە دایدەخەین".

یەکەم کەسی لەدوورگە پێشوازی لەمن کرد فەرماندەیەکی بە پلەی سەرهەنگ بوو کە گووتی "من نوێنەرایەتی سەرۆك ئەرکانی گشتی دەکەم". پوختەی قسەکانی ئەمە بوو:" گەلێك گەمە لەناو ئەم مەسەلەیەدا هەیە، ئێمە دەخوازین بە برایانە چارەسەری بکەین، دەرفەت بەم لەمیستۆکانە نادەین." ئەمە هەڵوێستێك بوو چاوەڕوانیم نەدەکرد. لەرەوشێکی

وەهادا نەبووم کە هەڵیسەنگێنم قسەکە جێی باوەڕیە یان نا. لەگەڵ خەڵەتاندنی تاکتیکی، لەوانەیە ئاماژەی بە سیاسەتێکیش کردبێت. جگە لە چاوەڕوانی و تەماشاکردن هیچ بژارێکی دیکە نەبوو. ١٠ رۆژ لە ژوورێکدا مامەوە کە هەلومەرجەکانی زۆر قورس بوو. ئاسایش، میت، ژەندرمە و ئیستخباراتی ئەرکانی گشتی، لەچوار لاوە لێپرسینەوەیان بەڕێوە برد. فشارێکی قەبە و جنێودان نەبوو، بەڵام هەلومەرجی مەعنەوی و دەروونی بۆ من زۆر قورس بوو. بەرگەگرتن موعجیزە بوو. بەدرێژایی دە رۆژ ئەوەی بە راستم بینی باسم کرد. هەڵوێستم نیشاندا. بەشێکی قسەکانم لە چاپەمەنی بڵاوکرایەوە. بەشەکەی دیکەیشیان بڵاونەکرایەوە. مسۆگەر بوو کە رووبەڕووی رووێکی دیکەی دەوڵەت بووینەتەوە. ماقووڵانە هەڵسوکەوتیان دەکرد. زەحمەت بوو تێبگەم تا چ رادەیەك جێگای خۆیان لەنێو گەمەکان دەگرن یاخود لەدژی دەوەستن. ئەو هەڵوێستەی پەیڕەوم کرد، بەباوەڕی و وشیاری و بڕیاربوونەوە پاراستنی رێبازێك بوو کە لە سەرەتاوە تا دوایی لەنێو ئاشتی و برایەتیدا دەرفەت بە بەیەکەوەژیانی گەلان بدات. ئەم رەوشە لەگەڵ رێبازی ئایدیۆلۆژی و سیاسیم دا ناکۆك نەبوو. لەبەرئەوەی هەڵوێست دیاری‌کردنم بەرامبەر جوداخوازی و ئەو توندو تیژیەی بەرگری رەوا تێپەڕدەکات پێویستیەکی هێڵی ئایدیۆلۆژیم بوو. زۆر بەئاسودەیی درێژەم بەهەڵوێستی خۆمدا.

دادگاییەکەی ئیمراڵی هیچ بنەمایەکی رەوا و پێویستی گەردوونی و پەیمانی مافی مرۆڤی ئەورووپای نەبوو. رفاندن و پیلانگێڕیەکی قورس لە بناخەی مەسەلەکەدا هەبوو. دەبوو‌ایە دادگاییکردن لەژێر ئەم هەلومەرجانە ئەنجام نەدرابایە. تەنیا پێشکەشکردنی ئەم بەشەی شانۆگەری جێگای باس بوو کە سەمبۆلی بوو، بەگشتیش لە دەرەوەی نووسینی سیناریۆنووس و بەڕێوەبەران بوو. بەگوێرەی من پێشکەشکردنی بەرگرینامە وەکو"پەیامی ئاشتی و یەکێتی دیموکراتییانە" راسترین هەڵوێست بوو. بۆ ئامادەکردنی بەرگرینامەیەکی بەرفراوان کات، کەرەستە و لەبواری سایکۆلۆژیەوە رەوشێکی لەبار نەبوو.

گەلێك لێدوانم سەبارەت بەقۆناغی ئیمراڵی کردووە. ئومێدەوارم ناوەڕۆکەکەی وەکو خۆی بەشێوەی پەرتووکێك بڵاوببێتەوە. دیسان دووبارەکردنەوەی ئەوانەی پێشوو هێندە واتادار نابێ. ئەم بەرگرینامەیەم تەواوی بناخەی ئایدیۆلۆژی، سیاسی و ئەخلاقی دیالۆگەکانم لەگەڵ پارێزەرەکانم دیار دەکات و دەبێ وەکو تەواوکردنیان ببینرێ. هەندێك دەوروبەر چ لەناوەوە دەبێت یاخود لە دەرەوە، خواستیان هەڵوێستەکەم چەواشە بکەن. ئەمەش مەترسیدارترین رەوش بوو. بەردەوام خواستم ئەم لایەنانە روونبکەمەوە کە لە ژیان و مردنی من گرنگتر بوو. ئەو پروپاگەندەیەی بەشێوەیەکی بەرفراوان کرا ئەوەبوو کە"لەگەڵ دەوڵەتی ژێر زەمین و سەرۆك ئەرکان رێککەوتم، سازشکاریم کرد یاخود تەسلیم بووم" . ئەمە بەئامانجی پروپاگەندەکردن بوو، هەم لایەنەکانی ناوەوە، هەم دەرەوە لەمیانەی ئەم پروپاگەندانە دەیانخواست رووی راستەقینەی خۆیان بشارنەوە. ئەگەر رێککەوتنێك بووایە، ئەوا راگەیاندنیم .

بەشەرەفێك دەزانی. بەردەوام جەختم لەسەر ئەوە کردەوە، رەوشێکی وەها لە ئارادا نییە. هەرچی مەسەلەی ئاگربەستە لەساڵی ۱۹۹۳وە هەڵوەستەی لەسەردەکەم. وەکو پابەندبوون بەو ئاگربەستە یەکلایەنەی کە هێشتا لە شام بووم لە ۱ی ئەیلولی ۱۹۹۸ رامگەیاند، ئەوا بە بڕیاری واقیعیترکردنی ئاگربەست و زیاتر رەخساندنی هەلومەرج بۆ ماوەیەکی ماقووڵ و دیاریکراو هێزەکانمان بۆ دەرەوەی سنوور راکێشا و ئەمەش هەنگاوی دووەم بوو. ئەو رەوشەی لەئارادایە، بەهۆی هەندێ هەلومەرجی ناچاری، هێزێکی سنووردار لەناوەوە، بەشی هەرە زۆریشی لەدەرەوە لەسەر بنەمای بەرگری رەوا بەجێبووە، ئەمەش بەشێوەی پێکەگرتنێکی چاوەڕوانی"دیالۆگە لەپێناو ئاشتی و رێککەوتنی دیموکراتییانە".

ئەمە دەزانرێ کە بەرپرسیارێتی گەڕان بەدوای چارەسەری دەکەوێتە ئەستۆی سیاسەت و حکومەت و پەرلەمان، رەوشی هەنووکەش لە هەموو لایەنێکەوە مەترسی لەخۆوە دەگرێت. ئەگەر لەسەر بنەمایەکی پۆزەتیڤانە ئەم رەوشە تێپەڕنەکرێت، ئەوا مەترسی ئەوە دێتەئاراوە کە بازنەیەکی توندوتیژی مەزن و درێژخایەنتر دووروبەر بتەنێتەوە. رێککەوتن لە پەیڕەوکردنی گەوهەری "کۆماری دیموکراتی و عەلمانی"دا دەبینرێ و بەدیدێت. باش دەزانرێ کە لە تەواوی ئەو قەوارە سیاسی-و دەوڵەتانەی بەدرێژایی مێژوو تورکەکان لە ئەنادۆڵ ئاوایان کردووە، رۆڵی کوردان هەبووە، دوا نموونەشی ئاواکردنی کۆماری تورکیا و شەڕی رزگاری نیشتمانی بوو کە پێشتر بەرێوەبرا. لەحاڵەتێکدا دەست لەو سیاسەتانەی نکوڵیکردن بەربدرێت کە بەهۆی یاخیبوونەکان تاوەکو رۆژگاری ئەمرۆمان بەشێوەی جیاواز بەردەوام بووە، ئەوا باوەڕدەکەم و چاوەڕوانی دەکرێت دەرفەتەکانی چارەسەری بێتە ئاراوە. کاتێك کوردان وەکو گەلێك و هاووڵاتی ئازاد رەچاوبکرێن و پێوانەکانی یاسا ـــ مافپەروەری گەردوونی بەبنەمابگیردرێت، ئەوا یەکبوونی لەگەڵ کۆمار بە هەڵوێستێکی ستراتیژی دەبینرێت.

ئەم هەڵوێستەی لە پرۆگرام و ستراتیژ و تاکتیکی قۆناخی نوێی PKK رەنگ دەداتەوە، لەبەرئەوەی لە بەشە پەیوەستدارەکانی بەرگرینامە بەفراوانی روونکراوەتەوە، پێویستی دووبارەکردنەوەی نابینم. ئەوەی پێویستە سیاسەت و هەڵوێستی خۆی نیشان بدات، ئاستی بالای دەوڵەتە. ئەم راستینەیە تەنیا بۆ کوردەکانی تورکیا نییە، بۆ کوردەکانی تەواوی پارچەکانی دیکەش وەکو هەڵوێستێکی ستراتیژی دەبینرێ.

سەرباری ئەوەی راستی هێندە ئاشکرا بوو، بەلام دیسان بەشێکی زۆری ئەو هەڵوێستانەی بەرامبەر PKK ، بۆئەوەی رووی ڤێزەون و خائینانەی خۆیان بشارنەوە کە ئاشکرا ببوو و شڵەژا بوو بەشێوەی تاوانباری "ئاپۆ مەسەلەی کورد لە ئیمرالی ژێر خاك دەکات" بوو. زۆر چاك بەدواداچوونی ئەمانە و حیساب لێخواستنیان، بایەخێکی مەزنی هەیە.

بەتایبەتیش لەو دە ساڵەی دوایی کەلە ئەنجامی سەپاندنی خیانەتێکی بێ ئامان، هەم لە لایەن بەکرێگیراوەکان لە باشووری کوردستان، هەم لە لایەن ئەوانەی پەنایان بردۆتە بەر

ئەوروپا، لەهەموو لایەنێکەوە بە ئەوروپا گرێدراوە، هیچ بەهایەکی ئەخلاقی ناناسن و هەموو ژیانی خۆیان بەدژایەتیکردنی ئاپۆچێتی پابەندکردووە، ئەوا ئەو کامپانیایەی تاوانباری و ریسواکردنی کە بەڕێوەی دەبەن ناتوانێ رزگاریان بکات. PKK لەمیانەی هەڵوێستی شەڕ و ئاشتی لەمەیدانە. هێز و شەهیدان و جەماوەرەکەشی لەبەرچاوانە. ئەمانە لەکوێن؟ ئەگەر دڵسۆز بن گۆڕەپان کراوەیە، لەچیا، دەشت، شار، گوند، ناوەوە و دەرەوە با نوێنەرایەتی مەسەلەی کورد بکەن. ئامادەیی بەرخودان بکەن و نموونەیەکی وەها نیشانبدەن، تاوەکو بسەلێنن کە ساختەکار و تۆمەتکار نین.

١٠ ساڵە بەکرێگیراوەکانی باشوور لەسەر پشتی PKK بەخەیاڵی ئۆتۆنۆمیەوە دەژین. هەم YNK و هەم PDK لەرێگای هێزە گرێدراو و ئاراستەکراوەکەیان هەڵوێستی مەترسیداریان بەرامبەر PKK پێشخست. دوو رێگا بۆ ئەوان هەبوو؛ یان لەرێگای رەخنەدانێکی دروست دێنە سەر رێگای ئاشتی و رێککەوتنی دیموکراتییانە، یاخود دەست لەو ئۆتۆنۆمیە بەردەدەن کەشایستەی نین و بەبێ PKKش بەدینایەت. ئەو سیاسەت و دیپلۆماسیەی چل ساڵە ئەمانە بەرێوەیدەبەن لە دەسەڵاتی چوارهەزار ساڵەی بیانییان زیاتر ژیانی بەگەلی کورد گەیاندووە. هەر هیچ نەبێت با لەمەبەدواوە بزانن بێنە سەر رێبازی ئاشتی و دیموکراسی و دروست بن. لەرەوشێکی پێچەوانەدا دەبێ ببینن کە تەنانەت دونیاش بێت لەو رەوشە رزگاریان نابێت کە تێیکەوتوون. نابێ لەبیر بکەن کە بڕیاری تەواوی شەهیدان، هەڤاڵان، گەل و هی منیش بەمجۆرەیە.

قۆناخی ژیانی من لە ئیمرالی بەگوێرەی رۆحی ئەم بەرگرینامەیە بەردەوام دەکات. هەڵوێستم بەمجۆرەیە؛ هەروەکو بڵێی سبەی بەدیدێت بەردەوام بۆ ئاشتی و رێککەوتنی دیموکراتییانە ئامادەم، تاوەکو دوایش وەستان لەدژی شەڕێکی قڕکردن کەسبەی لەمنەوە دەست پێدەکات و هەموو کاتێك وەڵامدانەوەیەتی لەرێگای باوەڕی و بڕیاربوون و ئامادەباشیەوە. لەدەرەوەی ئەمەش نە ژیانم ناسیوە، نە لێشی تێدەگەم. هەرچەندە کەموکوری مەزنیشیان هەبێت، ئەوانەی هەموو کاتێك ئومێد و پابەندبوونی خۆیان بەمن دیاردەکەن، پێویست دەکات لەهەموو لایەنێکەوە تێبگەن کە ئەم راستینە چ واتایەك دەدات. بەپێی ئەو هەلومەرجانەی تێیدان پێویستیەکانی ئەنجامبدەن، ئەمە بۆ خۆشیان کێشەیەکی ژیانە. ناسینی چۆنیەتی پابەندبوون و جولانەوە بەگوێرەی پێوانەکانی ئادوارادە گرنگە؛ پێویست بەوە دەکات بەرامبەر هەموو جۆرە گۆڕانکاری و پەرەسەندنێك بەتەواوی ژیان رێکبخرێت و ئامادەبکرێت.

لەو باوەڕەدام لەرێگای ئەم بەرگرینامەیەم وەڵامی بەرفراوانی ئەو لایەنانەم داوەتەوە کە بە ناتەواوی مابۆوە و جێگای پرسیارکردن بوو. بە بەرفراوانترین شێوە وەڵامی پرسیار و چاوەڕوانی گەلەکەمان و هەڤاڵان و تەواوی گەلانی دراوسێ، لە سەرووی هەمووشیانەوە گەلی

تورك و دۆستان، لە جیهان دەدەمەوە كە بەلانی كەم زۆر مەراقی ئەو هەلومەرجە فورسەی ئیمرالی دەكەن كەتا ئێستاش تێیدا دەژیم، بەمەش فەرزی خۆم دەدەمەوە. هەروەها دەبێ لەژێر هەمان بەرپرسیارێتی پێشخستنی رەخنە و جێبەجێكردنی پێویستییەكانی رەخنەكانیان لێ چاوەڕوان دەكەم و مافێكی منیشە. پیلانگێڕی ٩ی ئۆكتۆبەر ــ ١٥ی شوبات، كەپارچەیەكی جیانەكراوەی ئەو هەوڵانەی بەكۆلۆنیكردنە كە لە سەردەمی سۆمەرییەكانەوە دژ بە گەلەكەمان پێشدەخرێت و وەكو بەرفراوانترین پیلانگێڕی پشتبەستووە بەو هێز و كەسایەتییە بەكرێگیراوانەی خۆیان بەدۆست نیشاندەدەن، بەپێرەوكرا، لە گەیشتن بە ئەنجامە خواستراو و نەخشە بۆ كێشراوەكەی خۆی دوورە. گۆڕین و وەرچەرخانی ئەم پیلانگێڕییەی كەتەواوی خیانەتكار و بەكرێگیراوانی سەدەی بیستەمی لەژێر چەتری بەرزترین ئیرادەی ئیمپریالیستی كردە یەك، بۆ ئاشتییەكی مێژوویی ئەنادۆڵ و میزۆپۆتامیا وەكو ئەركێك دەكەوێتە سەر شانی گەلەكانمان و تەواوی هێزە بەرپرسیارەكان. خاوەن دەركەوتن لەم ئەركە، هەم بۆ بەهێزی یەكپارچەیی وڵات و هەم بۆ یەكێتی گەوهەری كۆماری دیموكراتی و عەلمانی، تاكە هەڵوێستی راستە. ئەمە لەهەمانكاتدا رێگای ئەو یەكسانی، ئازادی، برایەتی و ئاشتییە شەرەفمەندانەیە كە بەدرێژایی مێژوو خواستراوە.

ب ــ دەتوانرێ پیلانگێڕی ١٥ی شوبات بۆ گەلان بكرێتە ئاشتی و دیموكراسییەتێكی هەمیشەیی

كاتێك لەرووی مێژووییەوە پیلانگێڕی ١٥ی شوبات شرۆڤە بكەین تایبەتمەندێتی گرنگ دەردەكەوێتە روو:

١ ــ دەبینرێ كە بە شێوەیەكی گشتی پیلانگێڕی لەسەر رێبازی پێكهاتەی رۆژهەڵات ــ رۆژئاوا ئەنجامدراوە. من وەكو خاڵی لاوازكردنی ئەنادۆڵ و توركیا هەڵدەسەنگێنن. منداڵە بێ عارەكەی رۆژئاوا و وەكو خاڵی لوتكەی، سیاسەتی یۆنان بەردەوام خواستوویەتی من لە رەوش و پێگەیەكی بێ پرەنسیپ و وەهادا ببینێ كە بەردەوام زیانبەخش بێت. بەپێچەوانەوە كاتێك دەبینن پەیوەندییەكانم زیانیان پێدەگەیەنێ ئەوا لەوە دوودڵ نابن كە بمهاوێژنە ناو ئاگرەوە. بەڵام رۆڵی لەدوا پیلانگێڕیدا، بەشێوەی بەكرێگیراوێتییەكی خائینانەیە كە دۆستایەتی خراپ بەكاردێنێ. خۆی هێزی نەخشەكێش و پراكتیزەكردن نییە، بەڵكو ماشەیە. ئاشكرایە كەبەرامبەر ئەم رۆڵەی خۆی لەداهاتوو سەبارەت بەمەسەلەی قوبرس و ئیگە چاوەڕوانی قەرەبوو دەبێت. لە پەرەسەندنەكانی دواتردا ئەم بابەتە بەباشی روونبۆتەوە. لەلایەن بلینكن ی نوێنەری تایبەتی سەرۆكی ئەمریكا بۆ میدیا راگەیەنرا كە ئەوەی فەرمانی تەسلیمكردنی منی داوە كلینتۆن خۆیەتی. روونكردنەوەی ئەمە وەكو هەڵوێست دژ بە تیرۆریزم دەبێتە هەڵوێستێكی تەسك. مسۆگەرە كە ئیسرائیل لە پشت ئەم مەسەلەیەیە. پەیوەندی لەگەڵ ئەو بەڵێنە بەهێزە كە راسترەوە ئەوپەڕگرە شەڕخوازەكانی ئیسرائیل بە توركیایان دابوو. سەرۆك

وەزیرانی ئەو کاتەی ئیسرائیل سەرۆکی لیکوود و بەرەی ڕاستڕەو بنیامین ناتانیاهۆ بوو. ئیسرائیل بۆ ئەوەی لە هاوسەنگی ستراتیژی ڕۆژهەڵاتی ناوین تورکیا لە تەنیشت خۆی ببینێ لەئەنجامدانی پیلانگێڕیدا ڕۆڵی ئەکتەری سەرەکی دەبینێ؛ بەڵام بەتەنیا نییە. هەروەها مەزەندە ناکەم پەیوەندی لەگەڵ دیموکراتی چەپی ئیسرائیل واتە پەیوەندی لەگەڵ ڕێبازی شەمعون پێرێز هەبێت. نابێ لەبیر بکرێت کە تیرۆرکردنی ئیسحاق ڕابین پەیوەندی بەراستڕەوە ئەوپەڕگرەکان هەیە. کاتێك ئامادەکارییەکانی پیلانگێڕی چڕبۆوە، کلینتۆن لەرێگای مەسەلەی مۆنیکاوە بێکاریگەرکرا و لەرەوشێکدا بوو لۆبی ئیسرائیلی چی گووتبایە جێبەجێی دەکرد. لێرەدا سەبارەت بەبابەتی تورکیا هاوکاریەکی کاتی لەنێوان ستراتیژی ئیسرائیل و یۆنان دێتەئاراوە. کلینتۆن ئەمە کۆردینە (تنسیق) دەکات. بناخەکانی کۆردینەکردن لە لەندەن دانراوە، لێکدانەوەی ئەوە زۆر بەهێزە کە من گۆشەگیر بکەن و کوردان و PKK بخەنە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە. شوێنگە و ڕۆڵی سەرۆکایەتی من ئەو سیاسەتە باوەی ڕۆژئاوا دەهەژێنێ کە لەسەر کوردانی پەیڕەو دەکات. گەوهەری بویەرەکە بۆ ئەم ڕاستینەیە دەگەڕێتەوە. هەربۆیە ئەورووپا پاکتاوکردنی منی بەگوێرەی بەرژەوەندییەکانی خۆی بینیوە. چونکە ئەو سیاسەتەی ماوەیەکی درێژە لەسەر کوردانی پەیڕەوکردووە بەهۆی من پووچەڵ دەبێتەوە. تایبەتمەندییەکی دیکەی گشتی کە دەرهەقی دەبن بەیەك، ئەوەیە کە نەیانتوانیوە کولتووری ڕۆژهەڵات لە کەسێتی مندا لێکهەڵوەشێننەوە.

٢ ــ ئەمەش بیانووی کولتووری و سایکۆلۆژی تەسلیمکردنەوەی منی پێکهێناوە. لەبەرئەوەی کولتووری ڕۆژئاوا خاوەن پێکهاتەیەکی وەها نەبوو بتوانێ من بتوێنێتەوە، لەوەدا کاریگەر بوو کە من وەکو کەسایەتیەکی نەخوازراو ببینێ. لەگەڵ ئەوەی بەرژەوەندییە ماددی و ئابووریەکان ڕۆڵێکی دیاریکراویان هەیە، ئەوا نابێ بنەمای کولتووریش ڕەچاو نەکرێ. ئەو هەوایەی ئەورووپاییەکان لەوەدا بەکاریگەر بووە؛ گوایە ناخوازن دووەمین لینین یاخود خومەینی دروست بکەن. بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا ئەمە دەرکەوتووە کە ئەوەی بەکرێگیراو یاخود لاساییکەرەوەی کولتوورەکەیان نەبێت ، یەکێك خۆی بە بچووك نەبینێ و ئەوان بە باڵا و پایەدار نەبینێ، بەهیچ شێوەیەك بەگیانی لێبووردن و بەیەکەوە ژیان هەڵوەستەی لەگەڵدا ناکەن. لەم ڕووداوەدا ڕێبازی جیاوازی شارستانییەت ـ بەرپەرچیان پاراستووە. ئاشکرابوو کە بۆ ماوەیەکی درێژ تێڕامانیان سەبارەت بەکەسایەتی من کردووە. خۆم لەنێو ڕەوش و کەشێکی وەهادا بینی کە لەمێژەوە بڕیاریان لەسەرئەوە داوە کە لەگەڵ چەمکەکانیان ناکۆکم. ئەم کەشە ڕەوشێك بوو بەئەنقەست خوڵقێنرابوو.

٣ ــ لەگەوهەردا ئەورووپا گرێدراوی ئەو سیاسەتە ماوەتەوە کە ئەم دوو سەد ساڵەی دوایی سەرمایەداری دەرهەق بەکوردان پەیڕەوی کرد. ئەوەی بناخەی ئەم سیاسەتە پێك دەهێنێ ئەوەیە، کەبۆ ئەوەی لەسەرووی هەموویانەوە تورکەکان، ئێران و عەرەبەکان گرێدراوی خۆیان

بهێڵن، کوردان وەکو ئامرازێکی هەرەشەکردن بەکاربهێنن. من ئەوەم دەردەخستە پێش کە بەرێگای ئاشتی بێت یاخود شەڕ دەبێ کێشەی کورد بە چارەسەرییەکی هەمیشەیی بگات. هەرچی ئەوان بوون بەردەوام دەیانخواست ئەم کێشەیە وەکو کارتێك بۆ خۆیان بەکاربهێنن. لەدەست دەرهێنانی ئەم چەکە هیچ بەگوێرەی بەرژەوەندییەکانیان نەبوو. نەیانەدەخواست دەست لەوە بەردەن کە وەکو پاشماوەیەکی ڤێژەونی سیاسەتی چەوسانەوەی باو هەڵیسەنگێنن. زۆر بەروون و ئاشکرایی ئەو هەڵوێستە دەبینرا کەتاوەکو لێکدانەوەکانی خۆیان لەگەڵ ئێراق، ئێران و تورکیا یەکلا نەکەنەوە دەخوازن کارتی کورد بەشاراوەیی لەدەست خۆیان بهێڵنەوە. ئەمەش هەڵوێستێکی هاوشێوەی هەندێ توێژی تورکیایە کەبەرژەوەندی خۆیان لەبەردەوامکردنی رەوشی چارەسەرنەکراوی کێشەکەدا دەبینن، ئەمەش سیاسەتی "مەمرە، مەژی"یە سەبارەت بەکوردان. هەڵوێستێکی هۆڤانەی وەهایە کە هێندە لێی بەخاوەن دەردەکەوێ نەمرێ، بەو رادەیەش لەهەڵدێریدا دیلێتەوە کە نەژی. تۆزێك پارەتیان بدابووایە، ئەوا دەشیا لە سەر بنەمایەکی راست تا دوا رادە هەلومەرجی ئەرێنی بخولقێ. بۆ نموونە ئەگەر ئەو هەڵوێستەی ئەمڕۆ سەبارەت بەکۆسۆڤۆ و مەکدۆنیا نیشانیدەدەن، بە داکۆکیکردن سەبارەت بەکوردانیش نیشانیبدەن، ئەوا لە زووەوە کێشەکان دەکەوتنە سەر رێگای چارەسەری. رەوشێکی هاوشێوەی ئەمەش سەبارەت بە عەرەب و ئیسرائیلیەکان، روسیا و چاچانیەکانیش لەجێگای خۆیدایە. بەرژەوەندیەکانیان لە درێژخایاندنی کێشەکاندا شاراوەیە. بەڵام کاتێك ناوخۆی ئەوروپا و نزیکی ئەو پەیوەندیدار بکاتە ئەوا بەخێرایی و چڕی هەڵسوکەوت دەکەن و چارەسەری پێشدەخەن. لەبەر ئەوەی هەلومەرجی سیاسی رەوشی من ئەم چارەسەریە بەگوێرەی بەرژەوەندیەکانیان رێك ناخات ئەوا بەلاوەنانی دەکردە رەوشێکی ئاسایی.

ئـ ـ پاکتاوکردنی جولانەوەی ئازادی کوردان و سەرۆکایەتییەکەی ئامانجێکی بەرچاوی تەسلیمکردنەوە بوو. ئەو پەیوەندیانەی بەساڵان لەگەڵ کوردە بەکرێگیراوەکان بەرێوەبراوە لەمیانەی ئەم پاکتاوکردنەوە خواستراوە بخرێتەگەڕ و چالاك بکرێت. گوایە رێبەرایەتیەکی لیبرال ـ دیموکراتی کوردان دەخولقێنرێ، ئەو کەسایەتیە کوردانە دێنە ئاراوە کە هەر دەوڵەتێك بۆ خۆی ئامادەی کردووە، رێکخراوی جیاوازییان لەناو ئەو بۆشاییە ئاوادەکرد کە دێتە ئاراوە. سەبارەت بەم بابەتە ئەڵمانیا سەرکێشی دەکات. خولقاندنی گروپی تورك، کورد، عەرەب و ئێرانی لایەنگری ئەڵمانیا، سیاسەتێکی کۆنی ئەڵمانیا لە رۆژهەڵاتی ناوین، ئەم سیاسەتە لەسەردەمی ئەنوەر پاشاوە بەکاریگەربووە. لەکاتێکدا کوردەکانی ئێراق بوونەتە گورگی ئەم سیاسەتە، لەقۆناخەکانی دوایی خواستراوە لەتورکیاش هەنگاو بەرەو پێش بهاوێژێت. دەرەوشانەوە لەژێر سایەی پاراستنی هێزە دەرەکییەکان بووە بە شێوازێکی گۆزەران.

پاکتاونەبوونی جولانەوەی ئازادی کوردان، جارێکی دیکە رێگا لە پێش ڤورسایی دانە سەر

هەوڵەکانی پاکتاوکردن و پارچەکردن دەکاتەوە، یاخود پەرتەوازە دەبن و لەئارادا نامێنن. هەروەها هەوڵدەدەن ئەو هەلومەرجەی ئاشتی بەخراپ بەکاربهێنن کە بە شێوەیەکی سنووردار پەرەیسەندووە، کاتێك جولانەوەی ئازادی کۆمەڵی مەدەنی ئازاد نەخولقێنێ هەوڵەکانی خراپ بەکارهێنان زیاد دەبێت. هەربۆیە بە ئاگابوون سەبارەت بەرێکخستنە پاشڤەرۆییەکان شێوازی تەریقەتی کۆن و دەزگا ساختە و بەکرێگیراوەکانی کۆمەڵی مەدەنی و دەرفەت نەدان بە خەڵەتاندنی گەل گرنگییەکی مەزنی هەیە.

٥ ــ تەرخانکردنی قۆناخی ئیمرالی بۆ زیندووکردنەوەی ئاشتی نێوان هەر دوو کولتووری برای ئەنادۆڵ و میزۆپۆتامیا لەشەڕ سەختترە، هەرچی ئەنجامەکانیەتی شۆڕشگێڕانەتر و بەرهەمهێنە. ئاشتیەك لەسەر بنەمای بەکارهێنانی ئازادانەی فەواره و هەبوونە کولتوورییەکان بێت، ئەوا دەبێتە راستترین وەڵام بۆ رێنسانسی میزۆپۆتامیا و ئەنادۆڵ و گەوهەری شۆڕشگێڕانەی کۆماری تورکیا. بە لەبەرچاوگرتنی پرەنسیپی هەر شەڕێك ئاشتیەکی هەیە، هەوڵەکانی ئاشتی بەگوێرەی بەرژەوەندی گەلان، تادوارادە پێویست و بایەخدارە. ئەوانەی شەڕەکانیان بە ئاشتی ئەنجامگیر نەکەن لەلایەن هێزەکانی دیکەوە دژ بە خۆشیان بەکار دەهێنرێن و لەرەوشێکی وەها رزگاریان نابێت.

لێگەڕین بەدوای ئاشتی، ئەگەر سنوورداریش بێت پێشخستنی، هەرگیز بەواتای ئەوە نایەت کات بەکاری پووچ بەسەر دەبردرێ. ئەوانەی شەڕ دەکەن ئەگەر رێگای واقیعیانەی شەڕ پێش نەخەن، تەنانەت ئەگەر لە لایەنی سەربازی سەرکەوتنیش بەدەست بهێنن، ئەوا لە کۆتاییدا لە پووچەڵکردنەوە رزگاریان نابێت. لێکدانەوەیەکی چەوت سەبارەت بە مەسەلەی ئاشتی تەنانەت دەسکەوتە سەربازیە گرنگەکانیش بێ واتا دەکات. رێبەرە بەرپرسیارەکان بەرامبەر گەل و سەربازەکانیان کەسایەتیەکن بەلایەنی کەم هێندەی کێشە سەربازیەکان لێکۆڵینەوە سەبارەت بە کێشەکانی ئاشتیش دەکەن و دۆزینەوەی چارەسەری واقیعی دەکاتە ئامانج. ئەو رێبەر و فەرماندانەی نەتوانن ئەمە ئەنجامبدەن لە شکست رزگاریان نابێت.

ئەگەر تەماشا بکرێ کە ئەو هەڵوێستانەی دژ بە هەوڵەکانی ئاشتی قۆناخی ئیمرالی نیشاندرا لەچ کەسانێکەوە سەرچاوە دەگرێ، دەبینرێ کە ئەوانەی بەردەوام گەندەڵبوون، مارژیناڵبوون، حیزبچێتی و دوژمنایەتییان بۆ خۆیان کردۆتە هونەرێك رۆڵیان لەمەدا بینیوە. چونکە ئاشتیەکی واتادار و بەهەند، ئەو دێوەزمە ساختەی خزمەت بەکۆمەڵگا ناکات و تاك مەزن ناکات لەئارادا ناهێڵێ، رێگا لە پێشێلکردنی یاسا دەگرێت، گوزەرانی رەوا و شێوازی ژیانی سیستەم زاڵ دەکات. ئەوانەی تواناکاری و شێوازی ژیانیان بەگوێرەی ئەمە نییە و لەکاتی خۆیدا ناگۆڕێن، نە لە ئاشتی تێدەگەن و نە دەشیخوازن. ئەمانە لەتێش و زەحمەتیەکانی شەڕیش تێناگەن. سەرباری ئەمەی پێویستە جددیەتی قۆناخ ببینرێ. ئەگەر بەسەرکەوتنی تەواو بگات، یاخود پێی نەگات، ئەم قۆناخە بایەخدارە. تەنانەت شەڕێکی دوای ئەمەش

پێشکەوێت لەهی جاران جیاوازتر دەبێ. درێژخایەنترین قەیرانی مێژوویی کۆماری تورکیا، ئەنجامی شەڕی رابردووە. تا بەشێوەیەکی راست دان بەمەدا نەنرێت و بۆ ئاشتییەکی دادوەرانە وەرنەچەرخێ قەیران کۆتایی پێنایەت. چونکە ناخوازن بەشێوەیەکی راست هۆکارەکەی دەستنیشان بکەن. لەحاڵەتێکی وەهادا تیمارکردنیش راست نابێت. لەساڵانی ٢٠٠٠دا تورکیا لەنێو ئەم ناکۆکییەدا دەژی. یان لەرێگای شەڕێکی نوێ و خوێناویتر، یان لەرێی ئاشتییەکی دادپەروەر و شەرەفمەندانە ئەم تەنگژە کۆتایی پێدەهێنرێ. لەرەوشێکی پێچەوانەدا بەشێوەیەکی رۆژانە رزگاربوون لەو دێوەزمە کۆمەڵایەتییە بەدینایەت کە لە ئارادایە.

٦ ـ قۆناخی ئیمرالی سەبارەت بەگەلی کورد و وەکو دەزگایەکیش سەبارەت بەمن قۆناخی سێیەمین لەدایکبوونە. قۆناخی یەکەم لەدایکبوونە لەنێو هەلومەرجەکانی کۆمەڵگای کشتوکاڵی گوند کە لەگەڵ سەدەی بیستەم ناکۆکە و تاماوەی تێپەڕبوون بۆ مۆدێلی کۆمەڵگای فەرمی دەگرێتەوە. ئەم قۆناخە بەناو کەموکوڕی و واتای مەزنی قۆناخی دابڕانی تێپەڕبوو کە مێژووەکەی ١٥ هەزار ساڵ دەبێت. تۆوی ژیانی پێش ١٥ هەزار ساڵ و دواتریش شینەکراوەتەوە. ئەم بێچارەییە رێگای لەپێش شەڕی کۆمەڵایەتی ناوخۆی خێزان و گوند کردەوە. یاخیبوونێکی گوند بووم. ئەم یاخیبوونە تاوەکو تێپەڕبوون بۆ کۆمەڵگای فەرمی بەردەوام بوو. دواتر لە قوتابخانەی سەرەتاییەوە تا سەردەمی یاخیبوون بەرامبەر کۆماری ئۆلیگارشی بەردەوام بوو و بە گەلێك قۆناخی جیاواز تێپەڕی. دووەمین قۆناخی خوڵقاندنی هاتە سەر. ئەو قۆناخەی بە هێرشەکەی دۆنکیشۆت بۆ سەر ئاشی با دەچێت، رێگای لەپێش ئاشکرابوونی کێشەکان و زیاتر قورسبوونی کردەوە. تایبەتمەندێتیەکانی سەرمایەداریش هاتە سەر ناکۆکییەکانی نیۆلیتیك و کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی. لەبەرئەوەی شێوازی شۆڕشگێڕی لە ئارادا نەبوو کەش و هەوایەکی ئاڵۆز زاڵ بوو. ئەو یاخیبوونەی دەستپێکرابوو تەنانەت ئەو پاشەڕۆیەتیەی ناوخۆشی چارەسەرنەکرد. ئەم قۆناخەی یاخیبوون کە نزیکەی ٢٠ساڵ بەردەوام بوو، دوای ئەوەی لەئاستی ناوچەکە و جیهان رێگای لەپێش کاریگەری خۆی کردەوە، وەکو ئەنجامی ئەو بنبەستبوون و کۆسپانەی کەوتنە پێشی بۆ قۆناخی ئیمرالی گۆڕابوو.

هەلومەرجەکانی ئیمرالی نەك تەنیا بۆ کەسێتی من بەڵکو سەبارەت بە گەل و کۆمار بە واتای سێیەمین لەدایکبوون دێت. وەکو پێویستییەکی یاسای یەکێتی دژەکان کە لە هەر دیاردەیەکی سروشت و کۆمەڵگا پەیڕەو دەکرێت. ئەو قۆناخەی دژایەتیکردنی کۆماری ئۆلیگارشی کەلەسەر بنەمای توندوتیژی درێژەی خایاند، جێگای خۆی بۆ کۆماری دیموکراتی و عەلمانی بەجێدەهێشت کە لە رێگای دیموکراتیزەبوونەوە بەدیدێت. هەروەکو چۆن بەبێ ناکۆکی پێشکەوتن بەدیناێیت، ئەوا لەولاوە بمێنێت کە لە ئاکامی زۆرانبازی لەگەڵ ناکۆکییە پووچەکان پێشکەوتن بەدینایەت؛ تەنیا تێکدان و رووخان و قەیرانەکان دێنەئاراوە. لەبەر

ئەوەی تورکیا لەتێگەیشتنی ناکۆکییەکان درەنگ کەوت و لەکاتی خۆیدا چارەسەری نەکرد، بەشێوەیەکی سروشتی کەوتۆتە نێو قۆناخی قەیران و چەندەی دەکات ناتوانێ لێی دەرکەوێت.

سەبارەت بەتەواوی هێزەکانی قۆناخ لەدایکبوون و شێوەگرتنێکی نوێ دەکاتە ناچارییەك. لە دەوڵەتەوە تا ئابووری، لەسیاسەت تا یاسا، لە ئەخلاق تاوەکو دەگاتە هونەر هەموو گۆڕەپانێك دەهەژێت، لەگەڵ شێلوبوون و قەیراندا بەدوای چارەسەریدا دەگەڕێت. قۆناخی ئیمرالی بەواتای دەستپێکردنی ئەم راستینەیەش دێت. هەروەکو چۆن قۆناخی پێشتر وەکو دیاردەی "من و شەڕ" واتاداربووە، ئەوا ئەم قۆناخە نوێیەش وەکو دیاردەی "من و ئاشتی" واتادار دەبێت. وەکو دەزگایەك پارچەیەکی سەرەکی هەبوونی من، هۆشمەندی و ئیرادەی ئازادی کوردە. ئەم وشیاری و ئیرادەیەی لەرێگای شەڕ بە تاقیکردنەوەدا تێپەڕ بوو، ئێستاش بە قۆناخی ئاشتیدا تێپەڕ دەبێت. لە کاتێکدا لە قۆناخی شەڕدا خۆی بەشێوەی دژە ـ دەرەبەگ و دژە ـ کۆماری ئۆلیگارشی فۆرمیلە کرد، ئەوا لە قۆناخی ئاشتیدا وەکو "کۆماری دیموکراتی و عەلمانی" لە گەوهەر و ڕواڵەتدا بەشێوەی نوێبوونەوە گوزارشت لەخۆی دەکات. جوداخوازی و توندوتیژی ناخوازرێ، ئەگەر تەنانەت بەتەواوی بخوازن لەسیستەمی بەدەر بنێن، ئەوا پێویستە بەفشار نکوڵی لەو رەنجەی کوردان نەکرێت کە بەدرێژایی مێژوو لە قۆناخی دەوڵەتبوون و نەتەوە بوون لەگەڵ تورکەکان داویانە و نابێ بەلاوە بنرێن. ئاشتی و سیاسەت و مافپەروەری ئەوە دەکاتە مەرجێك کە کوردان چۆن دەخوازن بەئازادانە لەنێو هەبوونی کولتووری خۆیاندا بژین و جێگا بەوەبدات لەگەڵ کۆماردا ئاوێتە ببن. کۆمارێك کە لەسەر بنەمای نکوڵیکردنی ئیرادەی ئازادی کورد بێت ئۆلیگارشییە و ئەمەش جوداخوازی و توندوتیژی دێنێتە ئاراوە. کراوەبوونی بۆ یەکێتی ئازاد و رێککەوتنی دیموکراتییانە، واتای بەیەکەوەژیانە لەنێو ئاشتی و یەکێتیدا. جێبەجێ نەکردنی ئەمە، بۆئەوە دەگەڕێتەوە هێشتا تێکۆشانی نێوان کۆماری دیموکراتی و کۆماری ئۆلیگارشی ئەنجامگیر نەبووە. هەربۆیە وەکو سەمبولێك قۆناخی ئیمرالی ئاماژە بە گۆڕانکارییەکی مێژوویی دەکات. ئەم قۆناخە یان ئاشتی دەئافرێنێ، یاخود ئەگەر سەرکەوتن لەمەدا بەدەست نەهێنرێ و کۆماری ئۆلیگارشی درێژە بە سیاسەتی نکوڵی و قڕکردن بدات، ئەوکاتە ئەمە جگە لەوەی توندوتیژییەکی چڕ و بەرفراوان لەگەڵ خۆیدا دێنێ، لەهەمانکاتدا دەبێتە قۆناخی قووڵبوونەوەی جوداخوازی.

ئەم راستینەیە بناخەی ئەو قەیرانە پێکدێنێ کە یەکەمین جارە تورکیا لەمێژووی خۆیدا بەم قووڵاییە دووچاری دێت. حکومەت و ئەنجومەن کە دیاردەی سیاسەتن و گۆڕەپانی چارەسەرین، لەبەرئەوەی بەشێوەیەکی واقیعی و لەکاتی خۆیدا تاوتوێی نەکردووە و ئەو ئەرکەی سەرشانی جێبەجێ نەکردووە، پەردەپۆشکردنی کێشەکان و بەجێهێشتنی بۆ پووکانەوە و بێچارەیی، هەروەکو بە بەرفراوانی لە دەزگاکانی میدیا تاوتوێ دەکرێت ئەوە نیشاندەدات کەسەرچاوەی تەنگژەکە سیاسەتە. سیاسەت بڕیاری لەسێدارەدان وەکو شمشێری

دیموکلیتس لەسەرم دەھەژێنێ و وادەزانێ ئەنجام بەدەست دێنێ، مەزنترین هەڵەش لێرەدا دەکات. ئەم هەڵوێستە تورکیا مەحکومی سیستەمێك دەکات کە لەناوەوە و دەرەوە بەسەر تورکیادا دەسەپێنرێ و لە گەوهەری خۆیدا پشت بە بازرگانانی شەڕ و چەتەکان دەبەستێ، ئەمەش مەحکومی تەنگژەی دەکات، هەموو ساڵێك تەنانەت هەر مانگێك بەملیاران دۆلار زیانی ماددی پێ دەگەیەنێ. لەلایەنی مەعنەویش وڵات لەناو نێش و زەحمەتی ریشەیی دەخنکێنێ. مادام ئاماری گشتی شەڕی ١٥ساڵ بریتییە لەمردنی ٤٠ هەزار کەس و زیانێکی ماددی بەسەدان ملیار دۆلار، لە حاڵەتێکی وەهادا ئەوەی پێویستە ئەنجام بدرێت لەنێو تەواوی هەلومەرجە مێژوویی و کۆمەڵایەتی و نێودەوڵەتییەکان ئەم دیاردە تاوتوێ بکرێت و بە پێناسەیەك و چارەسەریەکی راست بگەیەنرێت. تاوەکو ئەمە ئەنجام نەدرێتە ئەوا لەگەڵێك لایەنەوە قەیران باڵا دەگرێت.

وەکو کەسێتی و دەزگای سەرۆکایەتی قۆناخی ئیمرالی ئەوە دەکاتە پێویستی کە لەم چوارچێوەیەدا کێشەکە هەڵسەنگێنرێ. کاتێك لەرێگای هێزی بەرژەوەندیخواز و بە هەرزان خەرجکردن بەدینەهات، ئیتر چ لەلایەنی ناوەندە فەرمییەکانی دەوڵەتەوە بێت، یان ناوەند و دەوروبەرەکانی کوردە بەکرێگیراوەکان، ئەوا لوتکەی ئەو هەڵوێستە نکوڵیکارە و تاوانباری فرکردنەی پێشخراوە لەسەر بنەمای بنبەستبوون قۆناخێکی شەڕ دەسەپێنێ. بۆئەوەی نەکەوینە نێو ئەم گەمەیە جگە لەوەی پێویستە زۆر بەوردی و وشیارانە هەڵسوکەوت بکرێت، دەبێ بزانرێ کە گۆڕانکاریەك لە ئیمرالی کە لەسەر بنەمای پاکتاوی مەعنەوی و ماددی من بێت بەواتای پاکتاوکردنی هێزەکانی ئیرادەی ئازادی کوردان و تورکان دێت، هەروەها بۆ ئەوەی شەڕی ئازادی دژ بە داخوازی گەلەکانمان ئەنجامگیر نەبێ، هەروەکو بڵێی سبەینێ شەڕ روودەدات، ئەوا بەشێوەیەکی تۆکمە بەڕێوەبردنی تەواوی ئامادەکاریەکانی شەڕی بەرگری رەوا، یەکێك لە هەلومەرجە هەرە سەرەکییەکانی سەرکەوتنی قۆناخە. ئەمە واتای مێژوویی ئیمرالییە سەبارەت بە دەوڵەت، کۆمەڵگا، گەلەکەمان، PKK و سەبارەت بەمنیش.

٧ـ پیلانگێری ١٥ی شوبات سەبارەت بە ئەوروپا، ئەمریکا و پەیمانی ماڤ مرۆڤی ئەوروپاش واتایەکی هەیە کە پێویستی بە پێناسەکردنێکی راست هەیە. رەوشی بنچاوکردن و دەستگیرکردنم، کە بەرامبەر ئیرادەی ئازادی کوردان ئەنجامدراوە و مسۆگەرە کە پێشێلکاری یاساییە و لەگەڵ پەیمانی ماڤ مرۆڤی ئەوروپا ناکۆکە، لە کۆماری تورکیا زیاتر، هەم لە لایەنی یاسایی هەم لە لایەنی سیاسی دامەزراوەکانی ئەمریکا و یەکێتی ئەوروپا بەرپرسیار دەبینێ، چونکە هەروەکو چۆن بەبەرفراوانی لە بەرگرینامەدا روونمکردەوە، هێز و دەزگا ئاماژە پێکراوەکان لەمیانەی چەمکێکی سیاسی داگیرکاریەوە پەیمانی ماڤ مرۆڤی ئەوروپایان پێشێل کرد و لە ئەنجامی هەڵوێستێکی دژبە یاسا ئەم رەوشەیان خوڵقاند. هەربۆیە کاتێك دەچینە دادگای ماڤ مرۆڤی ئەوروپا، نەك تەنیا رەوشی ناکۆکی کۆماری تورکیا لەگەڵ پەیمانی ماڤ

مرۆڤی ئەوروپا، بەشێوەیەکی سەرەکی لە دادگایکردنندا بەرچاو گرتنی ئەو بەرپرسیارێتیەی لەو پێشێلکاریە یاسایی و ئەخلاقیانەی ئەمریکا و یەکێتی ئەوروپا لە کەسایەتی مندا دژی ئیرادەی ئازادی کوردان ئەنجامیدا لەریزی یەکەمین و پێشەوەی هەموو شتێك دێت.

لەهەرسێ پایتەختە گرنگەکەی ئەوروپا بزمار لەو تابووت یان خاچە دراوە کە دەخرێمە ناوی یان پێیەوە هەڵدەواسرێم. دواتر لە ئەنجامی لەیستۆکێکی تەڵەکەبازی سەرمایەداری بەدەستی هۆڤەکانی ئەفریقیا فرێدرامە فرۆکەی تورکان.

یەکەمین شوێنی لەخاچدرام ئەسیناى پایتەخت بوو. ئەگەر بەهۆی پەشۆکاوی بێت یاخود لەرێی ئیلهام وەرگرتن لە تۆڵەسەندنەوەیەکی کوێرانە بە کولتوورێکی کۆنەپەرست و ڕۆحێکی ترسنۆکانە، خواستوویەتی ئێشی ئەو باڵادەستیە سێ هەزار ساڵیەکەی سەر ئەنادۆڵ دەربخات کە لەدەستیداوە، بەرامبەر تورکێتی ئەنادۆڵ چاوەڕوانی سەرکەوتنێکی هەرزان و بێ پرەنسیپانەی لەمن کردووە. کاتێك تێگەیشت ئەمە مەحاڵە، هەروەکو بڵێی ئەوان خاوەنی منن، بەرامبەر بەهەندێ قەرەبوو سەبارەت بە مەسەلەی قوبرس و ئیگە، وەکو دیاریەك یان وەکو قۆچی قوربانی منی پێشکەشی حکومەتی تورکیا کردووە، خیانەتێکی بێ هاوتای لە مێژوودا ئەنجامداوە و بێ شەرمەفیەکی وەهای نیشانداوە کە لە هیچ پەرتووکێکی دۆستایەتیدا نییە؛ وەکو ئەندامێکی یەکێتی ئەوروپا، بەرامبەر پەیمانی مافی مرۆڤی ئەوروپا، تاوانی پێشێلکردنی یاسای ئەنجامداوە. بەبێ ئەوەی بتوانن هیچ بیانوویەکي بەرامبەر پێشبخەن، ئەوا بێ ئەخلاقیە مەزنەکەی و تاوانەکەی بەرامبەر یاسا روون و ئاشکرایە. پێویست بکات دەتوانرێ لە میانەی هێندە شاهید و روونکردنەوانە بسەلمێنرێ.

لەمێژە رۆماننووسی یۆنانی کازانزاکیس رۆمانی "لەنوێوە لەخاچدانی عیسا"ی نووسیوە. بەڵام رەوش و شوێنگەی من، هی تاکەکەس نییە. کرداری لەخاچدانی دەرهەق بەهەزاران کوردی خاوەن ئیرادەی ئازادیش بەرێوەبراوە کە تا مردن بەسەرۆکایەتی خۆیانەوە گرێدراون. لەوانەیە لەسەردەمی خوداوەند زیۆسەوە یۆنانیەکان خۆیان بەفێڵباز لەقەڵەم بدەن. خوداوەندە ژن ئەسینا کە کچی خوداوەند زیۆسە و کە لەنێوچەوانی خۆی خوڵقاندووە، بەفێڵەوە خۆی دەخاتە رووخساری برای هێکتۆری قارەمانی ترواده دیالۆبۆس و دەیهاوێژێتە نێو ئاگری شەڕ و لەنێوی دەبات. بەمجۆرە دەتوانێ دەرگای ئەنادۆڵ بکاتەوە. ئەم ڕاستینەیە لە میتۆلۆژیادا هەیە. بەڵام ساڵێك بەرلە ۲۰۰۰. کاتێك لەسەدەی بیستەم دەژیام خرامە نێو ئەم تەڵەزگەیە. ئەگەر لەرێی پیلانێکیش بێت خۆیان منیان بکوشتایە و بیانگووتبایە قەزا بوو، خەمم نەدەخوارد. دەبووە پێویستیەکی کولتوورەکەیان و کۆتایی پێدەهات. بەڵام بەشێوەی دیاریەکی پاکێتکراو، کە لە هیچ پەرتووکێکی مرۆڤایەتی و لە ناو هیچ پرەنسیپێکی ئەخلاقی جێگای نابێتەوە، چۆن دەتوانن لەناو ئێشی ۳۰ هەزار شەهید و فرمێسکی دایکان و هەستیارترین دایك کە تاکو ئێستا چاوەڕوانی شتێك لەمن دەکات و منیش هیچ ئامادە نەبووم،

منیان تەسلیمی تیمەکانی شەڕی تایبەتی تورکان کردەوە؟ سەرۆکی ئەمریکا کلینتۆن یان لەپشتەوەبووە، ئەو فەرمانی داوە، حکومەتی یۆنانیش یاری بە دۆستایەتی کردووە و ئەمەی جێبەجێ کردووە.

لەو قۆناخەدا کلینتۆن لەژێرفشاری دادگای سەناتۆ دایە کە سەبارەت بە سکانداڵی مۆنیکا بوو. هاوسەرەکەی هیلاری و دۆستەکەی مۆنیکا، هەردووکیان دوو ژنە سیخوڕی بەڕیشە یەهودی بوون کە پێشتر ئامادەکرابوون و خزێنرابوونە ناو کۆشکی سپی. یەهودیەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە خوداوەند سیخوڕێتی وەکو هونەرێك پێشکەش کردوون. هەروەکو چۆن لەباسی ئینجیل سەبارەت بە عیبرانیەکان تێپەڕدەبێت و بە پیاهەڵدانەوە باسی ژنە سیخوڕ و سۆزانی ڕاهاب دەکات، کلینتۆنیش ئەو پیاوە پێست سپییەی ڕاوچی هیندەسوورەکانە و دوا نوێنەری کولتووری کابۆی سنوورنەناسە. تەنیا بۆ ئەوەی بە هەرزانی لەو سکانداڵە ڕزگاری بێت کە مۆنیکا پێشیخست، نیشاندانی ئیرادەی تەسلیمکردنەوەی من کە مۆساد کردی پەمەرجێك، ئەمە نەدەبوو بەئەرکی حکومەتی یونان. هەموو شتێك ئەنجامدرا بۆ ئەوەی پشتگیری سەرۆکی ئەمریکای مەزن بەدەست بهێنرێ.ئەگەرنا بەجۆرێکی دیکە نەدەتوانرا بێ ئەخلاقی پیلانگێڕی و پێشێلکردنی یاسا ڕەچاوبکرێت.

ئیسرائیل بۆ ئەوەی لەڕێگای تورکیاوە هاوسەنگییەکی ستراتیژی ئاوابکات، نەدەبووایە ماڤی ئەوە لەخۆیدا ببینێ من بکاتە قوربانی. تەنانەت باپیرەی هاوبەشمان حەزرەتی ئیبراهیم، پێغەمبەرێکە لەیەکەم ئایینیدا بە قوربانیکردنی مرۆڤی لەئارادا نەهێشت. بۆ یادکردنەوە و پێویستییەکی ڕێزگرتن لە ئایینەکەی، دەبووایە مۆساد نەکەوێتە نێو ئەم چالاکیەی بەقوربانیکردن. پێویستە سنوورێکی ئەخلاقی لە پێناو بالابوون هەبێت. هەرهیچ نەبێت دەبووایە حکومەتی یونان نەبێتە ئامرازی ئەم لەیستۆکە قرێژە. لە ئەنجامی ئەم لەیستۆکە زرلڤانەی سەبارەت بە تورکیا لەنێوان خۆیاندا ڕێککەوتن و دەبووایە کوردێکی وەکو منیان بە شێوەی بۆمبایەکی ناوکی زیندوو بەکار نەهێنابووایە، کە لەو باوەڕەدابوون بێ ئەقڵە. پێویست بوو لێکدانەوەی ئەوەش بکەن کە ڕۆژێکیان هۆشی دێتەوە سەر و تۆڵەسەندنەوەی خۆی ڕێکدەخات. تەنانەت لە هەزاران یەکێش بووایە پێویست بوو لێکدانەوە لەسەر ئەم شیمانەیەش بکەن. دەبووایە لەناوەندی مەسیحیەتی ئۆرتۆدۆکس تاوانی سەرلەنوێ لەخاچدانی ڕۆحی عیسای مەسیح بەم هەرزانیە ئەنجام نەدرێ. نەدەبووایە ببنە چەشنێکی هاوچەرخی یەهودا ئیسکاریۆت. خراپتریش ئەوەیە، لەمیانەی لێدوانی ساختەکارانەوە دەخوازن ئەم بێ ئەخلاقی و تاوانکاریە مەزنە پەردەپۆش بکەن. زێدە درێژی ناکەم. چەقاندنی یەکەم بزماری خاچەکەم یاخود تابووتەکەم لە ئەسینا واتا مێژوویی و مرۆییانەکەی لەم چوارچێوەیەدایە. ئەگەر هەڵوێستی ڕاست یە بنەمابگیرێت، ئەوا مسۆگەر پێویست دەکات هەم لایەنی سیاسی هەم یاسایی بەرچاوان بگیرێت.

دووەم بزمار لە مۆسكۆ چەقێنرا. هیچ واقم ورنەما و لام سەیر نەبوو. سكاڵاكردنێش واتادار نابینم. هیچ ئەگەری ئەوەم دانەنا كە ئەو روسیاییانە و حكومەتەی تەنانەت بە چەپەڵترین شێوە رەسەنترین بەهاكانی پشتگوێ خست هیچ بەرپرسیارێتییەكی مرۆیی و ئەخلاقی هەبێت. لەم قۆناخەدا روسەكان بە زیادەوە ئەوەیان سەلماند كە هیچ بەهایەك نییە نەیكەنە قوربانی پارە. روسیا وەكو ئەندامی كۆنسەی ئەوروپا، گرێدراوی پەیمانی مافی مرۆڤی ئەوروپایە. هەربۆیە ئەو بڕیارەی دومایان پشتگوێ خست كە بە ۲۹۸ دەنگ مەسەلەی پەنابەری سیاسی پەسندكرد، بەزۆر بەدەرنانم لە روسیا پێشێلكردنی یاسایە. ئەمەش یەكێتی ئەوروپا و دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپا پەیوەندیدار دەكات.

سێیەمین بزماری لە پایتەختی پیرۆزی ئەوروپا رۆما چەقێنرا، لەپێش چاوی پاپا ئەنجامدرا. هەرچەندە مرۆڤی مەزن عەزیز پاوڵ یەكەمین مەسیحی بێت كە لە رۆما كوژرا، دەبووایە قۆناخێكی لە مردن خراپتر بەسەرمندا نەسەپێنرێ. ئەوروپا و رۆما كە خاوەن بانگەشەی نوێنەرایەتیكردنی شارستانییەتی هاوچەرخ بوون. دەبووایە ساڵێك بەرلە ۲۰۰۰ رۆما جاری دووەم ئەو كردەوە دووبارە نەكاتەوە كە بەرامبەر ساینت پاوڵ ئەنجامدرا. بەهەمان شێوە وەكو ئەو منیش لە شامەوە هاتبووم. هێندەی زمانم بگەڕێ سەبارەت بە شارستانییەت هەندێ راستی باس دەكەم. بۆچی كەوتنە رەوشێكی وەها كە پەسندنەكەن؟ هەروەكو بڵێی ٦٦ رۆژ منی لەنێو قەفەسێكی ئاسنین بەندكردووە، پۆلیسی تایبەتیان لەهەموو شوێنێكی دەوروبەرم بەجێكرد. من باسی داخوازییەكانی ئازادی و هەبوونی كۆنترین گەلی مێژووم دەكرد كە دان بەهیچ مافێكی مرۆییانەی دانانرێت، تەنانەت ناوەكەشی پەسند نەكراوە. ئاشكرایە كە بەگوێرەی بەها سیاسی و یاساییەكانی ئەوروپا ئەمە مافێكە و داخوازییەكی دیموكراتییانەیە. هیچ رێزێك لەم مافە نەگیردرا. هەموو شتێك لە پێناو رفاندنم ئەنجامدرا. تەواوی كاروبارە سایكۆلۆژییەكانی لە خاچدان جێبەجێكراو پۆستەكرام. دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپا لەسەر ئەم لایەنەی راستی بوەستێ، پێویستە حیساب بخوازێت بۆچی لە رۆما رەوشێكی بەمجۆرە هاتە ئاراوە كە شێوە و رۆحی بە یەكێتی ئەوروپا داوە، هەروەها پێویستییەكان رەچاو بكات.

رفاندنم لە پایتەختی كینیا بە تەواوی لەئەنجامی ئیرادەی هاوبەشی ئەوروپا و ئەمریكا جێبەجێكراوە. چەپەڵترین رۆڵیشیان بە حكومەتی یۆنان بەخشیبوو كە منداڵە لاسارەكەیانە. چیرۆكی ئەمە درێژە. ئاراستەیەك باسكرد. ئەگەر پێویست بكات راستینەی رفاندنم و تەسلیمكردنەوەم لە باڵیۆزخانەی یۆنان لە كینیا بەشێوەیەكی درێژ و زارەكی پێشكەشی دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپای دەكەم و هەمووی دەسەلێنم. یەكێك لە كارە هەرە قێزەكانی پیلانگێری ئەوەبوو كە ئەركی گەیاندن بە پەتی سێدارە و لەخاچدان و خستنە نێو تابووت بەدەستی ئەو كینیاییە هۆڤانەی ئەفریقیا ئەنجامدرا كە زۆر بەباشی پەروەردەیان كردبوون. گوایە ئەوروپا خۆی پاكژ دەرخست، كینیا تاوانبارییەكەی ئەنجامدا. ئاشكرایە كە سەبارەت بە

بەگژ یەکترەوەنانی گەلان ئەوروپا ئەزموونێکی زۆری بەدەستهێناوە. لێرەشدا رۆڵی جەلادێکی سیاسی بچووکی بینیوە. لەبەر ئەوەی لە رای گشتی و یاساکان رایان دەکرد، کەمێکیش ئەم تاکتیکەیان خستۆتەگەڕ. واتە هەرگیز لە ئەوروپا کاری فرێز ناکرێ، ئەگەر ببێت لەناو هۆڵەکان روودەداتە!

رۆڵی ئەمریکا لە کینیا ئاشکرایە. هەروەکو دەزانرێ سەرۆکی ئەمریکا لەرۆڵی خۆی، واتە لە فەرمانی تەسلیمکردنەوە خاوەن دەرکەوت. بەگوێرەی من ئیستخباراتی یۆنان و CIA لەبەرخاتری چاوی رەشی تورکیا ئەم چەرخەیان نەسوڕاند. گومانم لەوەدا نییە ئەنجامدانی کوشتنی من بە دەستی تورکان وەکو ئامانجێکی ستراتیژی پەسندیان کردبوو. لەو بڕوایەدام هەڵوێستی ئینگلیزەکانیش بەم شێوەیە بوو. بەگوێرەی من لەبەرئەوەی تاڕادەیەك بە بەرخودانێکی قەبە دوژمنایەتی تورکانم نەکرد، هەندێکیش بە تەدبیر جموجۆڵکردنی ئەرکانی گشتی، رێگا لەوە گیراوە وەکو چۆن چاوەڕوانیان دەکرد لەکەسایەتی مندا ئەو بۆمبایە بتەقێتەوە کە گیانی هەزاران کەس لەگەڵ خۆی ببات. رێگا لەوە گیراوە سەدەی بیست و یەکەم ببێتە سەدەی پێکدادانی کورد ـ تورك. بەڵام ئاشکرایە کە ئەم گەمەیەی بەرامبەر هەردوو لایەن، هەم بەرامبەر کوردان هەم بەرامبەر تورکان لەمێژ ناو و دەمامکی دۆستایەتی ئەنجامدرا لەیستۆکێکە هاوتاکەی لە مێژوودا نەبینراوە، لە گەمەکانی بێزەنتییەکانیش خراپترە، پیلانگێڕیەکی چەپەڵانە و بێ شەرمەنانەیە. لەو باوەڕەدام مسۆگەر پێویستە کوردان و تورکان ئەم لایەنەی پیلانگێڕی ببینن.

ئیسرائیل رۆڵێکی دیاریکراوی لەوەدا بینی لەسەرتاسەری دونیا گۆشەگیر بکرێم و تەسلیم بکرێمەوە. دەرکەوتنی من بۆ رۆژهەڵاتی ناوین و پێشخستنی رێبازێکی نوێ لە جولانەوەی کورددا لەلایەنی ستراتیژیەوە بۆ خۆی وەکو رەقیبێك و مەترسی بینیوە. بەشێوەیەکی باو کاتێك دەگووترێ جولانەوەی کورد، هێزە بەکرێگیراوە کوردەکانی ئێراق بۆ خۆی بەبناخە دەگرێ، لەمیانەی پەیوەندی هەمەلایەن و بەرێگای ئەوانەوە هەوڵدەدات، تەواوی کوردان بخاتە نێو تۆڕێکی ستراتیژی. پارچەکردنی ئەم تۆڕە و تایبڵێی بەسەربەخۆیی جولانەوەم، هەروەها بەردەوام تەسککردنەوەی گۆڕەپانی جموجۆڵی بەکرێگیراوان و بۆماوەیەکی درێژ مانەوەم لە گۆڕەپانی عەرەبەکان، رێگای لەپێش ئەوە کردەوە لەسەر ئاستی دونیا ستراتیژی دەرهەق بەمن پێشبخەن. وابزانم لە عەرەفات زیاتر، لەلایەن ئیسرائیل من لەرەوشێکی نەخوازراودام. ئەم فاکتەرانە رۆڵی سەرەکی دەبینێ لەوەی دەرهەق بەمن لەگەڵ تورکیا بە رێککەوتنێکی ستراتیژی بکەن. لەگەڵ ئەوەی هیچ گومانێکم لەوەدا نییە کە ئەم رێککەوتنە ستراتیژیە بۆ راستڕەوانی ئیسرائیل دەگەڕێتەوە، ئاشکرا نەبووە رێبازی شەمعون پێرێز کە نوێنەرایەتی چەپ دەکات تاچ رادەیەك پەسندیان کردووە یان نا.

بەرلە ٩ی ئۆکتۆبەری ١٩٩٨ ئیسرائیل دەستدرێژی سەبارەت بە من کردووە. ئاگادار و تەنانەت پشتگیری بۆ تەقینەوەکەی ٦ی گوڵانی ١٩٩٦ هەبووە. تاج رادەیەك یۆنان وەکو ماشەیەك بەکارهێنراوە بابەتێکە شایەنی لێکۆڵینەوەیە و بایەخدارە. دوورخستنەوەی من لە مۆسکۆ لەلایەن پریماکۆف ی سەرۆك وەزیرانەوە مسۆگەر پەیوەندی بە ئیسرائیل و لۆبی یەهودییەوە هەیە. لەبیرمە کە دواجار ئاریەل شارۆن سەردانی ئەوێی کرد. ئەوەی لەرێگای ئەمریکاوە ئیتاڵیای تەنگەتاو کرد ئیسرائیلە. شیمانەیەکی بەهێز ئەوەیە ئەو هێزەی لەپشت ئەوە بوو کە لە لەندەن، ئەوروپا وەکو پیاوێکی نەخوازراو هەڵوێستی بەرامبەر نیشان بدرێ مۆسادە. دیسان ئەوەی ئەمریکای ناچارکرد سەبارەت بە تەسلیمکردنەوەی من فەرمان بدات راستینەی یەهودی یە. من بەردەوام ئەم هەڵوێستەی ئیسرائیل وەکو ئەو رەوشە دەبینم کە لەسەرەتای دەرکەوتنندا بەسەر موسایان هێنا، بەڵکو خۆشیان کوشتبیان. بەردەوام دەخوازم جێگای گەلی یەهودیش لەرۆژهەلاتی ناوینی دیموکراتییانەدا هەبێت. دیسان رێزم بۆ هێزی یەهودیەکان گرت لەبواری زانست، هونەر و فەلسەفە. رۆژ بەدوای رۆژ زیاتر تێ دەگەن لەئەنجامی ئەوەی بەسەر منیان هێنا زیانێکی زۆریان بەخۆیان گەیاندووە. هێندەی کوردان ئەم راستی یە ببینن زیاتر وشیاردەبنەوە، بەهێزی خۆیان دەگەن و دەسەلێنن کە دەتوانن دادوەری بەدیبێنن.

## ئایا یاسای ئەورووپا تواناکاریەکی چارەسەری بۆ کێشەی کورد دەخوڵقێنێ؟

دانانی کێشەی کورد و ئەو ڕووداوانەی لە دەوروبەری من پێشدەکەوێت لە چوارچێوەی مافپەروەری یەکێتی ئەورووپا، لەگەڵ ئەوەی دەرفەتێکە بۆ دابینکردنی تواناکاریەکانی چارەسەری سیاسی یەکێك لە کێشە گرنگەکانی کە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆمان لە ئارادایە، لەهەمانکاتدا مافێکیشە. هەروەکو چۆن کۆماری تورکیا نوێنەرایەتی بەشێکی ئەم یاسایە دەکات، تاوەکو ئێستاکەش بەگەلێك ڕێککەوتنامەی پۆزەتیف گرێدراوە. دەستڕۆیی پەیماننامەی مافی مرۆڤی ئەورووپا و دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپای پەسند کردووە. تاوەکو ئێستاکەش پێویستی بە تێپەڕکردنی ئەو ترسە سنووردارانە هەیە کە پێوەی دەناڵێنێ. لەسەر ئەم بنەمایەش کێشەی کورد کە گرنگترین کێشەی سەرەکی تورکیایە دەکەوێتە چوارچێوەی ئەو دەسەڵاتەی بە دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپا دراوە. بە هەزاران سکاڵای سەبارەت بەم کێشەیە بۆ دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپا گوازرایەوە و بڕیاری سەبارەت وەرگیرا و مافی تاکە کەسی منیش بۆ پەنا بردنە بەر ئەم دادگایە لەم چوارچێوەیەدا تاوتوێ کرا. بابەتەکە لە چوارچێوەی ناکۆکی لەگەڵ هەندێ بەندەکانی پەیماننامەی مافی مرۆڤی ئەورووپا تاوتوێ کراو دوای لێ وردبوونەوە پەسندکرا. لەبەر ئەوەی من لایەنێکم لە کێشەکەداو تاکە شاهێدێکم سەبارەت بە زۆربەی مەسەلەکان ئەوا بەرگرینامەی نووسراو و زارەکی من بایەخێکی زۆری هەیە. بێگومان شوێنگەی سەرۆکایەتی کە وەکو پارچەیەکی جیانەبۆوەی کەسایەتی گەلەری من دەبینرێ، ئەوە دەکات بە پێویستییەك کە لە بواری سیاسی و کۆمەڵایەتییەوە کێشەکە بایەخێکی گرنگی پێبدرێت. هەروەکو چۆن لە کەسایەتی مندا ئیرادەی ئازادی گەلی کورد گوزارشت دەکرێت، ئەوا هەوڵدەدات لە نێو مافپەروەری جێگای خۆی بدۆزێتەوە و بە دوای مافی خۆیدا دەگەڕێ.

یەکسەر دەخوازم ئاماژە بەوە بکەم، کاتێك وەکو تاك بەدوای مافەکانی خۆمدا دەگەڕێم، ئەمە بەبناخە دانانێم؛ ئەوەی لە ڕێگای ئەمەوە بە شێوەیەکی سەرەکی پێویست دەکات، کۆتاییهێنان بە پێشێلکردنی مافەکانی بەملیۆنان کوردە کە لە ڕەوشێکدان زۆر لە ڕەوشی من ئاستەمترە و زیاتر ستەمی لێکراوە، هیچ نەبێت بەشێوەیەکی ڕاست پێویستییەکانی ماف ڕاست پێناسە بکرێت و لەلایەنی مافی پۆزەتیڤەوە هەندێکیان پەیڕەو بکرێت. هەربۆیە وەکو دەزگایەکی سەرەکی مافی گەردوونی ڕێزم لە دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپا ناو، گواستنەوەی دۆزەکەم بۆ ئەوێ لە جێگای خۆیدا بینی. هەروەها باوەڕی خۆشم سەبارەت بەوە دیار دەکەم

کە دادگا لەم چوارچێوەیەدا راستەوخۆ و ناراستەوخۆ و ئەو بابەتانەی پەیوەندییان بەمن هەیە رەچاودەکات و لێی دەکۆڵێتەوە و بڕیاری دەرهەق دەدات. چەندین ناوەند هاوبیرن لەوەی ئەو ئەنجامەی دەردەکەوێت واتایەکی مێژوویی دەبێت. ئەم واتایەش وەکو تاکێك زۆر لەولاوەتری شوێنگەی منە. ئایا کێشەی کورد لە ڕێگای یاسای دیموکراتی و ئاشتیخوازی بە ڕێککەوتنێك ئەنجامگیر دەبێ، یاخود هەنگاو بۆ کەش و زەمینەی شەڕێکی قورستر دەهاوێژرێ، لە نزیکەوە گرێدراوی ئەو بڕیارانەیە کە دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپا دەیدات و لەوەش گرنگتر تا چ رادەیەك هێزی پراکتیزەکردنی هەیە.

دەرفەتی ئەوە هەیە بڕیارەکانی دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپا ڕۆڵ لە ئاشتی و ڕێککەوتنی دیموکراتیدا ببینێ. هەربۆیە بە ئەندازەی ئەوەی پێویستە بڕیارەکان ناوەڕۆکی پۆزەتیڤانەو رۆحی یاسای یەکێتی ئەورووپا بە بناخە بگرێت، ئەوا نیشاندانی هێزی پراکتیزەکردنیشی لە سەرووی هەموو شتێکەوە دێت. لە رەوشێکدا بڕیارێکی سنووردارو ناتەواو و پراکتیکێکی ناتەواو بێتە ئاراوە، ئەوا ڕێگا لە پێش سەرهەڵدانی قۆناخێك دەکاتەوە، بە لایەنی کەم هێندەی بۆسنا، کۆسۆڤا و مەکەدۆنیا، ئەورووپا بەخۆیەوە خەریك دەکات. هەرچی لە رەوشێکدا کە بە پۆزەتیڤی ڕۆڵ ببینێ، ئەوا ڕۆڵێکی مەزن دەبینێ لە ئاواکردنی پردێکی دۆستایەتی نێوان ئەورووپا و ڕۆژهەڵاتی ناوین و کۆچبەری کوردان و چالاکیەکانی نارەزایی لە ئەورووپا دەوەستێ. هەروەکو چۆن ڕۆڵ لە پەیوەندیەکی دۆستانەی نێوان کولتووری ڕۆژهەڵات ـ ڕۆژئاوا دەبینێ، بە تایبەتیش دەبێتە خاوەن کاریگەرییەکی پۆزەتیڤ لە سڕینەوەی شوێنپەنجەی ئەو ڕۆڵە نێگەتیڤەی سیاسەتی داگیرکاری دووسەد ساڵەی دوایی ئەورووپا لە ناوچەکە و بەدیهێنانی تەبایی و ڕێککەوتن لە نێوان ئیسلامیەت و مەسیحیەت.

لەبەر تەواوی ئەم هۆکارانە لەو بەرگرینامەیەی پێشکەش بە دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپام کردووە، لە چوارچێوەی شارستانیەتی مێژووییدا شیکردنەوە و پێشخستنی دوولایەنەی ڕۆژهەڵات ـ ڕۆژئاوا و ئەو پەیوەندییە سەرەکیەی نێوان ڕۆژهەڵاتی ناوین و ئەورووپام بە بناخەگرت. هەروەها هەوڵمدا بابەتی پەیوەندی نێوان کورد ـــ تورك روونبکەمەوە کە پەیوەندیەکی بە گرێمە و کێشەی لەگەڵ ئەورووپا هەیە. باوەڕیم بەوە هەیە کە تەنیا لە میانەی ڕۆشنایی ئەو راستینە مێژوویی، سیاسی و کولتوورییانە باشتر دەرکی پێدەکرێت و ڕۆڵ دەبینێ. هەر بۆیە هەرچەندە درێژخایەن و بێ خەمیش دیاربێ، ئومێدەواری ئەوەمکرد دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپا بە چەمکێکی راست پێشوازی لەم هەڵوێستە بکات. لەم بەشەشدا سەبارەت بە چۆنیەتی پەیڕەوکردنی مافپەروەری دیموکراتی ئەورووپا و دۆزەکەمان دەرهەق بەکێشەکانی گەلەکەمان هزرو بۆچوونی داواکاریەکەمان دیار دەکەین.

د. دەرکەوتن و پەرەسەندنی یاسا

کاتێك دەچینە نێو گۆڕەپانی یاسا و مافپەروەری، پێناسەکردنی و تێگەیشتنم سەبارەت بەم زاراوەیە بە پێویست دەبینم. یاسا بەمانای ئەو رێسایانە دێت کە بەزەحمەتی بە دیهاتووەو پێویستە لە نێو کۆمەڵگا پەیرەو بکرێت. دەشێ نووسراو یاخود زارەکی بێت. لەو قۆناخانەی کە کۆمەڵگا لە هۆزو تیرە بەرایییەکان پێکهاتبوو ناتوانرێ باس لە یاسا بکرێت. هەر لە خۆیانەوە ئەو رێسایانە پەیرەو دەکەن کە نەریتی پێدەگووترێت و لەلایەنێکەوە دەتوانین وەکو یاسایەکی سروشتی پێناسەی بکەین. ناوەکەی دیکەی دابونەریت، ئاکارە. جیاوازی نێوان یاساو ئاکار ئەوەیە، یەکێکیان بە هێزو سزایەکی دیاریکراو پەیرەو دەکرێت، بەڵام ئاکار بەبێ سزادان پێویستە پەیرەو بکرێت، واتە لە رێگای هێزەوە پەیرەو ناکرێت.

یاسا سیستەمی ئەو رێسایانەیە کە لە چارەسەری ئەو کێشانە دەگەرێت کە لەگەڵ هاتنەکایەی کۆمەڵگای چینایەتی و جیابوونەوەی کۆمەڵگا بۆ چینی جیاواز دەرکەوت، ئەمانەش لە سەر تەختە بەردینی جیاواز نووسراون، تاوەکو هاووڵاتییەکانی دەوڵەتەکانی شار پێشتر ئاگادار بن، بەم جۆرەش ئاسانکاری لە بەردەوامی رژێم بەدیدێت.

هەر لە سەردەمی دەرکەوتنیەوە دەبینین کە دووگۆڕەپان هەن مافپەروەری و یاسا رێکیان دەخات. ئەو بەشەی رێکخستنی دەوڵەت دیار دەکات و پەیوەندیەکانی لەگەڵ هاووڵاتیەکان شیدەکاتەوە بە " مافی گشتی" ناو دەبرێت، ئەو بەشەی رێساکانی هەڵسوکەوتی نێوان هاووڵاتیان رێکدەخات بە " مافی کەسێتی" ناودەبرێت.

ئەو ئیرادەیە بەڕێوەبەرایەتی دەوڵەت دەخولقێنێ و حوکم دەکات و بەسەر سەرچاوەکان زاڵدەبێت. ئەمە پادشا بێت یاخود ئەنجوومەن هیچ لە گەوهەرە چینایەتیەکەی ناگۆڕێ. لەگەڵ گۆڕانی کۆمەڵگا بۆ کۆمەڵگای چینایەتی دەبینین کە دابونەریتە کۆنەکان بووە بە سەرچاوەیەکی رێساکانی مافپەروەری. ناوەندە شارەزاکانی بە یاساوە خەریکن رێسا پێکدێنن.
هەندێك جار دانانی رێسا لە لایەن ئیرادەیەکی دەرەکی وەکو سەرچاوەی یاسا رۆڵ دەبینێت.

کاتێك سیاسەت یاخود نوێنەرەکە، پادشایە لە حاڵەتێکدا خۆی بکات بە خودایی، فەرموودەکانی وەکو یاسای خودایی هەڵدەسەنگێنرێت. لەرەوشی وەهادا فەرموودەکانی خوداوەند دەبێتە کراسی ئەو ئیرادە سیاسییەی بە رەهایی بووە. لە راستیدا یاسای خودایی، یاسایەکی یەکجار نایەکسانە. هەر گووتەیەکی پادشای ــ خوداوەند کە پشت بە هیچ جۆرە گفتوگۆو تەبایییەك نابەستێ و هەموو هێزێکی لە خۆیدا کۆکردۆتەوە وەکو یاسایەك پەیرەو دەکرێت. هەر بۆیە تەنیا سەرچاوەیەکی یاسا پەسند دەکات. ئەم قۆناخە کە لەگەڵ سۆمەریەکان دەستپێکردووە بۆ ماوەیەکی درێژخایەن مۆرکی خۆی لە شارستانیەت داوە، بە تایبەتی لە کۆمەڵگاکانی رۆژهەڵات، لە ژێر ناوی یاسای سەرچاوەی خودایی، بەڕێوەبردنی لەلایەن دەسەڵاتی رەهای پادشایەتی لەگەڵ خۆیدا هێناوە. دەشێ یاسای خودایی وەکو

دواکەوتووترین شێوەی یاسا ــ مافپەروەری نیشانبدرێت. چونکە هیچ تایبەتمەندێتییەکی ڕێککەوتن و دابونەریتی نییە. دەسەڵاتی پادشا وەکو تاکە سەرچاوەی یاسا دەبینێ کە لە ناو کۆمەڵگادا بەرز بۆتەوەو هێندەی خوداوەند شکۆمەند کراوە. کاریگەری ئەمجۆرە چەمکەی یاسا ــ ماف رۆڵێکی گرنگ دەبینێ لە دواکەوتنی کۆمەڵگاکانی ڕۆژهەلات و شێوازی سەرەڕۆیی بەڕێوەبەرایەتی و بەسانایی گەشەنەکردنی دیموکراتیزەبوون.

له دایکبوونی ڕاستەقینەی یاسا و مافپەروەری لە ساڵانی ۷۵۰ پێش زایین لەگەڵ گۆڕانی کۆمەڵگای ڕۆما بۆ دەوڵەتی شار دەستپێدەکات. هەر لەسەرەتاوە لە ئیرادەی پادشا زیاتر یاسا لەلایەن ئەو نوێنەرانە پێکدەهێنرێت کە وەکو نوێنەری کۆمەڵگا هەڵبژێردراون. ئیرادەی پادشاش یاسا دەخولقێنێ؛ بەڵام هەر لە سەرەتاوە وەکو پێویستیەك بەتایبەتی هاووڵاتیەکانی رۆما لە ڕێگای ئەو یاسایانە بەڕێوەدەبەن کە لەلایەن نوێنەرەکانیان دیاریکراوە. تاوەکو قۆناخی جونستینی ئیمپراتۆری ڕۆمای ڕۆژهەلات(٥٦٥ زایینی) پش ئەوەی مۆری خۆی لە چەرخە داوە یاسای ڕۆمایە، بە چەندین قۆناخدا تێپەڕبووە و وەکو بناخەی یاسای هاوچەرخ ڕۆڵی بینیوە. لایەنە گرنگەکانی ئەوەیە کە سەرچاوەی یاسا خودایی نابینێ، وەکو یاسایەك گەشە دەکات کە بەتایبەت هاووڵاتیان ڕێکیان خستووەو کارەکتەرێکی عەلمانی هەیە. جیاوازی نێوان ئەم چەمکانەی یاسای ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا هۆکارێکی گرنگە لە بالابوونی شارستانیەتی ڕۆژئاوا بەرامبەر شارستانیەتی ڕۆژهەلات. یاسای عەلمانی، هاووڵاتێتی و وشیاری کەسێتی تاك پێشدەخات، هاووڵاتی بەرامبەر دەوڵەت و کۆمەڵگا زیاتر دەپارێزێ و بە هێزی دەکات.

له چەرخی ناوین دا، لە کاتێکدا یاسا لە کۆمەڵگاکانی ڕۆژهەلاتدا هێشتا درێژە بە ڕەوشی سەرچاوەی خودایی دەدات، لە کۆمەڵگاکانی ڕۆژئاوا چینە نوێیەکان لە سەپاندن و پەسندکردنی ئیرادەی خۆیان بەسەر دەسەڵاتی پادشاکان، هەنگاوی نوێیان دەهاوێشت. لە سەدەی سێزدەهەم بەولاوە لە میانەی ماگناکارتا پێشەنگایەتی ئیرادەی چینی بۆرژوای کۆمەڵگای دەکرد، کە تازە گەشەی کردبوو. یاسا درێژەی بە دابونەریتی ڕۆما دەدا. ئەو کاتە هیچ نوێبوونەوەیەکی یاسایی پێکنەهاتبوو کە نوێنەرایەتی هەڵەمبازێکی ئیرادەی هێزێکی نوێی کۆمەلایەتی کۆمەڵگاکانی ڕۆژهەلات بکات. لە میانەی ئەو شرۆڤە جیاوازەی بە ئیجتهاد ناو دەبرێت، دەرگای پێشخستنی ئەو یاسایەش دادەخرێت کە لە دەستی دایە. شەریعەت لە بەیانکردنی یەکلایەنەی ئیرادەی یاسایی پادشا بەو لاوە هیچ واتایەکی دیکەی نییە.

له یاسا ــ ماف دا گرنگترین لایەنی ئەوەیە، کەستانۆی هەیی و سیستەمی سیاسی هەر هێزێکی کۆمەلایەتی یاخود جوڵانەوەیەك تەنگەتاو دەکات و جێگا بۆ خۆی دابین دەکات. ئەو هێزانەی ئیرادەی خۆیان لە یاساکان نیشان نادەن، هەرچەندە بە کرداری بوونیان هەبێ، ئەوا بێبەش دەبن لەوەی بەشێوەیەکی فەرمی ببنە خاوەن ماف. بەیاساکردنی مافەکان، واتە بەیاساکردنی جاڕدانی ئیرادەی ئازادی تاك و کۆمەڵگا، ئەمەش لە سەرووی کێشە سەرەکیەکانی

تەواوی سیستەمەکانی یاسا دێت. رێگای سەرەکی چارەسەرکردنی بێزاری کۆمەڵایەتی و چالاکیەکان، بەجێکردنێتی لە چوارچێوەی گوزارشتێکی یاسایی. ئەم رێگایە، دیموکراتیزەکردنی یاسایە.

لەگەڵ زاڵبوونی شێوەی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری تا دوارادە پێکهاتەیەکی ئاڵۆزی کۆمەڵگای خوڵقاند. ئەدەشیا چینی بۆرژوازی پێشەنگ لەگەڵ یاسای مۆنارشی دەرەبەگایەتی بگونجێ. بۆرژوازی بۆ ئەوەی یاسای خۆی بخوڵقێنێ سەر لە نوێ یاسای رۆمای زیندووکردەوە. بەتایبەتیش یاسای مەدەنی نوێکردەوە، وەکو بناخەی تەواوی سیستەمی یاسایی هەنگاوی بۆ قۆناخی جولانەوەی دەستوور هاوێشت. دەستوورێکی جیاواز بۆ هەر دەوڵەتێکی نەتەوەیی، بوو بە ئامانج. دەستوورەکان رۆڵی رەمزی وەرچەرخانی نوێی کۆمەڵگاکانیان دەبینی.

هاوچەرخبوون لە هەمانکاتدا گوزارشت لە زاڵبوونی مافپەروەری و یاسا دەکات. لە گۆڕەپانی نەتەوەیی و نێونەتەوەییدا بە یاسایی نەبوونێکی بەرفراوان و دەستبەرنەدان لە پەیوەندی بێ رێسایی زاڵە. دیموکراتیزەبوونی سیستەمە سیاسیەکان بناخەی یاساش بەرفراوان دەکات. قۆناخێکی نوێ کە هەموو مافەکانی هاووڵاتییان دەخاتە ژێر گەرەنتیەوە، وەکو مافەکانی مرۆڤ دەردەکەوێتە پێش. پێناسەی نوێی شارستانیەتی رۆژئاوا وەکو چەرخی یاسای دیموکراتی ناو دەبرێت.

## ٢. رۆڵی یاسا لە چارەسەرکردنی کێشەکانی کۆمەڵگا

بە درێژایی مێژوو تەواوی کێشە گرنگەکان بە رێگای سەربازی و سیاسی چارەسەر دەکران. بە هێزبوونی توێژی سەربازیش پشتی خۆی بەم راستینەیە دەبەستێ. ئەوەی ماف دیار دەکات هێزی سەربازییە. ئەوەی دەکەوێتە ئەستۆی سیاسەتیش بەدەستهێنانی باشترین ئەنجامە بە گوێرەی هێزی سەربازی. لە پێناو دادوەری پرەنسیپێکی گەردوونی لە ناو کۆمەڵگادا جێگای باس نییە. دادوەری لە رێگای شمشێرەوە دیاری دەکرێت. یاسای هاوچەرخ لە میانەی شەڕکردن بەرامبەر ئەم چەمکە گەشەی کرد. گرێدانی سیاسەت و سەربازی بە هەندێ رێسای سەرەکی، گرنگترین سەرکەوتنی پێشکەوتنی یاسای هاوچەرخە. دەزگا گرنگە نێودەوڵەتییەکان، لە سەرووی هەمووشیانەوە نەتەوە یەکگرتووەکان و یەکێتی ئەوروپا، سنوورە نەتەوەییەکانی یاسایان تێپەڕاندووە و نموونەی پرشنگداری بەدەستهێنانی رەهەندی گەردوونین. ئەمانە سیستەمێکی ئارام و جێگیری جیهان ئاسانتر دەکەن.

ئیتر هەم لەنێو سیستەمی نەتەوەیی هەم نێونەتەوەیی چارەسەرکردنی کێشەکان لە چوار چێوەی یاسادا دەبێ بە شێوازێکی هاوچەرخانە. پشتگوێ خستنی تواناکاریەکانی یاساو راستەوخۆ پەنابردنە بەر رێگا سیاسی و سەربازیەکان، وەکو هەڵەیەکی جددی شێواز

هەڵدەسەنگێنرێ. راستتر ئەوەیە کە بۆ چارەسەرکردنی تەواوی ئەو رەوش و بووییەر و پەیوەندییانەی دەبنە کێشەوگرفت، تا دوارادە یاسا تەنگەتاو بکرێت. ئەگەر رێگای ئەمە نەدۆزرێتەوە و بە تەواوی رێگای یاسا داخراو بێت، ئەوکاتە پەنابردنە بەر رێگا سیاسی و سەربازییەکان رەوا دەبێت.

بەتایبەتیش وڵاتەکانی ئەوروپا کە شەڕی نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی و ئایینی مەزنیان بە خۆیانەوە بینی، لە دوای هەر دوو شەڕی جیهان بە چڕی هەڵوەستەیان لەسەر سیستەمی یاسای دیموکراتی کرد. رێگرتن لە دوژمنکاری سیاسی و ئەو شەڕانەی رێگایان لە پێش کاولکاری و ئێش و ئازارێکی مەزن کردۆتەوە، ئاراستەکردنی کێشەکان بە ئاقاری چارەسەری دوور لە خوێن رشتن، تەنیا لە میانەی یاسایەك بەدیدێت کە پێشکەوتووە و تا دوارادە پێویستییەکە. گرنگترین تایبەتمەندێتی یاسای ئەوروپای هاوچەرخ؛ تەنیا بە پێشخستنی پێوانەکانی یاسا ناوەستێ، بەڵکو بالأبوونێکی وەهای هەیە کە لە رێگای چەمکێکی دینامیکی یاسا و لە میانەی یاسای پۆزەتیڤەوە پێشتر چارەسەری هەر رووداوێکی داناوە. لەگەڵ ئەمەدا رۆڵێکی سەرەکی (یاسا) مافپەروەری ئەوە نییە کە دەوڵەت بەرامبەر بە هاووڵاتی بپارێزێ و بە هێزبکات، بەڵکو بەپێچەوانەوە دەبێ بەرامبەر بەهێزی دەوڵەت لە میانەی مافە سەرەکییەکان تاك پڕچەك بکات و بەرامبەر هێزی دەوڵەت بیپارێزێ. ئەوەی پێویستی بە پاراستنە دەوڵەت نییە، بەڵکو تاکە، هاووڵاتییە. کولتوور و کەمایەتییەکانیش کە پێشتر سیستەم لەسەرکوتکردنیاندا هیچ کێشەیەکی نەدەبینی، ئیتر لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا بەرەو پێش چووە و هەستیارییەکی مەزن سەبارەت بە لەخۆوەگرتنیان و پاراستنیان لە چوارچێوەی یاسادا نیشاندەدات. کێشەی کولتوور و کەمایەتییەکان رۆژبەرۆژ زیاتر جێگای خۆی لە نێو یاسادا دەگرێت و پێویستی چارەسەری بە بنەما دەگرێت. بەمجۆرە گەلێك بابەتی پێشووتر کە بناخەی یاخیبوون و شەڕ و دوژمنایەتی کۆمەڵایەتی پێکدەهێنا، ئیتر جێگای خۆی لە چوارچێوەی ماف ـ یاسا دەگرێت و بە ئامرازی پێویستی چارەسەری دەگات. ئەو ئەنجامەی ئەوروپا لە میانەی ئەزموونی مێژووە بەرفراوانەکەی پێی گەیشتووە، بۆ تەواوی جیهان بووە بە نموونە. بەرجەستەترین گوزارشتی سیستەمی یاسای دیموکراتی ئەوروپا پەیمانی مافی مرۆڤی ئەوروپا و دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپایە کە دەزگای کردارییە. هەنگاونان بەرەو دەستوورێکی یەکێتی ئەوروپاش لە رۆژەڤدایە.

لەنێو ئەم هەڵسەنگاندنە کورتە مێژوویی و پێناسە هاوچەرخەدا هەڵوەستە کردن بەرامبەر کێشەی کوردو هەڵسەنگاندنی یاسا وەکو تواناکارییەکی چارەسەری سانایتر دەبێ.

۲ ـ پاسای ئەوروپا، کۆماری تورکیا و کێشەی کورد

کۆماری تورکیا لە نێو پەیوەندی و ناکۆکی لەگەڵ ئەوروپادا، دامەزراوە. کەمالیزم وەکو فاکتەرێکی دامەزراندنی کۆمار، مۆدێلێکی شارستانیەتی ئەوروپایە. مستەفا کەمال ئەتاتورکی دامەزرێنەر بۆشارستانییەتی هاوچەرخ بەپەرۆشە. ئەو رێککەوتنانەی کۆماری هێنا دونیاوە، رێککەوتنی لۆزانە کەلە سەرووی هەموویانەوە لە میانەی ئیمزای دەوڵەتەکانی ئەوروپا ئەرێ کرا. لە بواری فەلسەفە و بەدەزگابوون شارستانیەتی ئەوروپا کراوە بە نموونە، چەندین دەقی پاسایان وەکو خۆیان بردووەو بەجێیان کردووە. لە دوای نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم بەولاوە بووە بە ئەندامی دەزگا سەرەکیەکانی. ئەندامێکی سەربازی لە پێشینەی ناتۆیە. لە سەرەتای سالانی ۱۹۵۰ جێگای خۆی لە کۆنسەی ئەوروپا دا گرتووە کە رێکخراوێکی سیاسی سەرەکییە. ئەندامی رێکخراوی OECDشە کە رێکخراوێکی ئابوورییە. ئیستاش بەرئەندامی یەکێتی ئەوروپایە.

لەگەڵ ئەوەی تورکیا خاوەنی گەلێك هەلومەرجی رووکەشی دیموکراتیزە بوونە، بەلام سەبارەت بە هاوێشتنی هەنگاوە پێویستەکانی سەبارەت پاساو گەوهەری دیموکراسیەت، بە موحافەزەکاری هەڵسوکەوت دەکات. دەخوازێ بە کۆمارگەرایی سەدەی نۆزدەهەم سنووردار بمێنێ. ئەمەش رێگا لە پێش ئەوە دەکاتەوە کە لەگەڵ ئەوروپای هاوچەرخدا کۆك نەبێت. ئەو ترسەی بەرامبەر کێشەی کورد هەیە، سەرەکیترین هۆکاری شاراوەی ئەم رەوشەیە. تاوەکو رۆژگاری ئەمرۆمان ئەم ترسە لە رێگای نکۆڵیکردن یان شێوازی سەرکوتکردن کێشەکەی راپێچی نێو بێچارەیی کردووە. بەمجۆرە وایزانیوە لە میانەی ترسەوە کێشەکە لە بیردەکرێت. بەلام لەمیانەی ئەو چالاکیانەی بە رێبەرایەتی PKK تەقیەوە کێشەکە بووە بابەتی سەرەکی رۆژەڤ. بەهۆی بێچارەییەوە تەواوی کێشەکانی تورکیای بەخۆیەوە گرێداوەو رێگای لەپێش قۆناخێکی قەیراناوی وەها کردۆتەوە رزگاربوون لێی ئاستەمە. سەرباری ئێشی مەزن و کۆچبەری و مردنی زیاتر لە چل هەزار کەس، بەلام تاوەکو ئێستاش سوورن لەسەر ئەوەی کە کێشەکە وەکو " کێشەی تیرۆر" ببینن و ناچنە نێو ناوەرۆکی مەسەلەکەوە. ئەم رەوشەش بووە بە قۆناخێکی قورسی مێژووی کۆماری تورکیا کەهەموو بوارێکی گرتووەتەوەو بووە بە قەیرانێك. ئیتر کێشەی کورد سەبارەت بە کۆمار بووە بە فاکتەرێك یان لە رێگای چارەسەری بەرەو پێشەوەی دەبات، یاخود لە رێگای سەرکوتکردنی زیاتر دەبێتە هۆکاری رزین و پووکانەوەی کۆمار. قەیرانی سالانی ۲۰۰۰ ی تورکیا زۆر لەوە قووڵترو بەرفراوانترە کە مەزەندە دەکرێت. لەبەرئەوەی بواری دارایی بەشێوەیەکی رۆژانە چینی ناوینیشی لە خۆوە گرتووەو هەژاندوویەتی، بووە بە رۆژەڤی راگەیاندن. لەبەرئەوەی گووتەبێژەکانیان زۆرن، دەبێتە هۆکاری ئەوە وەکو کێشەی یەکەم تاوتوێ بکرێت. لایەنی دارایی قەیران تەنیا پارچەیەکی قەیران و تەنگەژەی گشتیە. هەروەها هۆکار نییە، بەڵکو قەیرانی ئەنجامێکە. سەرباری ئەوەی

چەند مانگێکە لە سەرتاسەری جیهان ئەو پارەمتییە دارایییەی دەخوازرێ پێشکەش دەکرێتە دیسان بەردەوامکردنی ئەم رەوشە ئەوە دەسەلێنێ کە قەیرانی ئەنجامێکە.

ئەم رەوشەی کۆماری تورکیا زۆر لەو قەیرانە دارایییە دەچێت کە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە ٧٠ ساڵی دوایی تەمەنی خۆیدا تێی کەوتبوو. لەبەر ئەوەی لەکاتی خۆیدا بەشێوەیەکی گەوهەری و لەمیانەی دینامیکی ناوخۆ ریفۆرمی پێویستی ئەنجامنەداوە، کۆتاییهێنان بە دەسەڵاتی سوڵتان سەلیمی سێیەم و بە رووکەشی مانەوەی ریفۆرمەکانی سوڵتان محەممەدی دووەم، هەروەها لە دەستدانی هێزێکی مەزن لە ئەنجامی شەڕو پێکدادانەکان، رێگای لە پێش لە دەستدانی دەرفەتێکی مێژوویی کردەوە. ئەو ریفۆرمانەی ئیمپراتۆریەتی ئەڵمانی و روسی لەو ساڵانە لە بونیادی خۆیاندا ئەنجامیان دا، ئەنجامی سەرکەوتووانەتریان بەدەستهێنا. کارەکتەری زاڵبوونی سوڵتان محەممەد و هێندە کاریگەرنەبوونی بە کولتووری ئەوروپا، دەرفەتی بەوە نەداوە بەلانی کەم وەرچەرخانێکی بە شێوازی ژاپۆن روویدات. هەروەها لە قۆناخی سوڵتان عەبدولەجید کە دوای ئەو هات، فەرمانی رێکخستن بەخێرایی راگەیەنرا، بەڵام لەبەرئەوەی بێناوەرۆك بوو، لە مەعریفەتی چەند بیروکراتێکی رۆژگاری ئەمڕۆمان جیاوازتر نەبوو، ئەنجامێکی جێگیری بەدەستەوە نەدا؛ دەرگای لە پێش ئەوە کردەوە کە بکەوێتە رێگایەك بە لەدەستدانی شانسی وەرچەرخانی ئیمپراتۆریەت کۆتایی پێ بێت. بۆ یەکەمین جار لەگەڵ شەڕی قرم بەرامبەر بە ئەوروپا کەوتونە نێو قۆناخی قەرزاری. هەروەکو رۆژگاری ئەمڕۆمان دەبینرێ ریفۆرمەکان لە پێناو بەرژەوەندی گەل و نیشتمان نییە، بەڵکو بۆ دۆزینەوەی پارە وەکو قۆزێك بەکارهێنراوە. شتێکی سروشتییە کە چەمکێکی ریفۆرمگەرایی دووڕوویی و بێناوەرۆکی بەمجۆرە، قەیران و هەڵوەشانەوە قووڵتر دەکاتەوە. ریفۆرمەکان لەپێناو چارەسەری نییە، بەڵکو بەرامبەر بە بەرتیل ئەنجام دەدرێت. هەروەکو بڵێی دەڵێن "چەندە پارە بدرێت، هێندە ریفۆرمیش دەکرێت" لە رەوشێکی بەمجۆرەدا لە ئیفلاس و پەرتەوازەبوون رزگاری نابێت. بە ئامانجی رێگرتن لە پەرتەوازە بوون، بە تایبەتیش لەگەڵ ئەو فشارانەی لە سەرەوە سوڵتان عەبدولحەمید پەنای بۆ برد و ئەو گۆڕانکاریە ناچاریانەی ئەنجامدران نەیتوانی رێگا لە هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆریەت بگرێت. سیاسەتە هاوشێوەکانی ئیتحادیەکانیش کە لەمیانەی دەمارگیری میللیگەرایی پەیڕەویان کرد، هەمان چارەنووسی بە خۆیەوە بینی. هەربۆیە رژێمی " کەنەو کاتە کەوتە گەر لەگەڵ نوێنەرانی سندوقی دراوی نێودەوڵەتی IMFی رۆژگاری ئەمڕۆماندا لێك دەچن.

هەلومەرجەکانی دەمەزراندنی کۆمار و کەسایەتی مستەفا کەمال، هەرچەندە لە سەرەوە لەنێو دەوڵەت و کۆمەڵگادا قورسایی زیاتر بیرۆکراتەکان بن، وەلێ رێگای لە پێش ریفۆرمێکی رادیکاڵانە کردەوە. ئەم ریفۆرمگەرایییە لە رووی مێژوویییەوە رادیکاڵترین هەنگاوە کە لە کۆمەڵگاکانی رۆژهەڵاتدا بینراوە. بەڵام لەو قۆناخەی دوای شەڕی دووەمی جیهانی هەنگاوی بۆ

هاوێشترا، قووڵنەکردنەوەی ریفۆرمە کۆمەڵایەتیەکان و لە جیاتی وەرچەرخانی تەواو بەرەو دیموکراسیەت، هەڵبژاردنی سیستەمی ئۆلیگارشی، ڕێگای لە پێش لەدەستدانی شانسی ریفۆرمی هەمیشەیی کۆمار کردەوە. بە هۆی کاردانەوەی دژواری چینایەتی ئۆلیگارشی و قووڵکردنەوەی پێکدادانی ڕاست ـــ چەپ، بە تایبەتمەندێتیە ریفۆرمخوازەکانی دەستووری ٣٧ی گوڵان پووچەڵکراوەتەوە، هەروەکو قۆناخێکی لێکچووی قەرزاریی دوای ساڵانی ١٨٥٨ ی عوسمانیەکان، دوای سەدساڵ دیسان لە ژێرکۆنترۆڵی IMFدا بەشێوەی ١٨ ڕێککەوتن پەنابردنە بەر سیاسەتی قەرزکردن بووە بە سیاسەتێکی ناچاری. لەبەرئەوەی پرۆگرامە کۆمەڵایەتی ـــ ئابووریەکانی دوای ئەم قۆناخە هەنگاوی بۆ هاوێشترا لەگەڵ دیموکراسیەت گونجاو نەبوو، لەبەرئەوەی بە گومان و بە چاوی گەمەیەکی سیاسی تەماشای دیموکراسیەت کراوە کێشەو پێکدادانەکان زیاد بووە، شانسی بوون بە کۆمارێکی عەلمانی و دیموکراتی شێوازی ڕۆژئاوا بە فیڕۆ و لە دەستدراوە. لە ساڵانی ٢٠٠٠دا لە هەموو بوارێکدا ڕووبەڕووی ئیفلاس، پووکانەوە و بنبەستبوون و قەیرانێکی بەرفراوان بۆتەوە.

ئیتر تورکیا ڕووبەڕووی دووڕیانێکە دەرفەتی مانۆڕێکی وەهای نییە. یان بژاری شارستانیەتی دیموکراتی لە ڕێبازی یەکێتی ئەوروپا هەڵدەبژێرێ یان بژاری شارستانیەتی دیموکراتی وەکو داخوازییەکی ستراتیژی بەلاوە دەنێ، هەندێ جار ئەگەر بە گوێرەی بەرژەوەندیەکانی بێت وەکو ئامرازێکی تەکتیکی بەکاری دێنێ. هەروەکو "سەردەمی تەنزیمات" شوێنگەی ستراتیژی خۆی بەرامبەر ڕۆژئاوا هەڕاج دەکات، لە ژێر سایەی سیستەمێکی گەندەڵدا بە هەڵواسراوەیی بەڕێوەدەچێت. لە ڕەوشێکی بەمجۆرەدا بە ئەندازەی ڕابردوو گەمەی دیموکراسی پەیڕەو ناکات، ئەوا لەنێو زەمینەی قەیرانی دژواردا، قۆناخێکی تەقینەوەی پێکدادانەکان دەبێتە ناچاریەك، لە لایەنێکەوە دەکەوێتە نێو ڕەوشی وڵاتانی وەکو یۆگسلافیای کۆن، ئێراق، کۆریا، پاکستان و هتد. بەڵام ئەو ڕاستینە جیۆستراتیژی و کێشە قورسە سیاسی و سۆسیۆ ئابووریەی پێیەوە دەناڵێنێ بۆ ماوەیەکی درێژ ئەم ڕەوشە هەڵناگرێت. هەربۆیە جیابوونەوەی ڕێبازی یەکێتی ئەوروپا و ڕێبازی بەرامبەرو ئەنجامەکەیان بە قۆناخێکی چارەنووسساز گەیشتووە. دواخستنی چارەسەری کێشەکان، هەر ڕۆژێك بە واتای لەدەستدان و زیان دێت. لەبەر هۆکارە زۆر و زەبەنەکان تورکیا ناچارە بژاری مێژوویی خۆی دیار بکات.

واتای هەنووکەیی بژاری یەکێتی ئەوروپا پراکتیزەکردن و جێبەجێکردنی پێوانەکانی کۆپنهاگنە. ئەمەش لە میانەی بڕیارێکی تەواو و بە پرەنسیپی دەوڵەت و کۆمەڵگا بەدیدێت بۆ هەنگاونان بەرەو سیستەمی دیموکراتی. بە درێژایی مێژوو تورکیا بەهۆی لە پەلوپۆکەوتن و ستاتۆکەی ئەم بڕیارەی نەداوە. هەربۆیە ئەو توانستانەی هەن بەفیڕۆ دەچن. ڕەوشێکی وەها لە ئارادایە، یاخود دەسەپێنرێ، کە خۆی دادەڕووخێنێ. ئەم ڕاستینەش سەرچاوەی خۆی لە

ئابووری بەرژەوەندیخوازی و شەڕی ئاست هێوری بەردەوام وەردەگرێت کە پێیەوە گرێدراوە. ئاگربەستی یەکلایەنەی PKK بەواتای کۆتاییهاتنی شەڕی ئاست هێوری بەردەوام نایەت؛ بەواتای راوەستانی دێت. سیستەم هەروەکو خۆی بەردەوامە؛ تاوەکو سیستەم هەڵنەوەشێتەوە ناتوانرێ لە میانەی پێوانە ئاساییەکان دەست بۆ هیچ کێشەیەك ببرێت. کاتێك تاوتوێش نەکرێت، لە میانەی کاریگەرییە یەك لە دوای یەکەکان رەنگدانەوەی لە سەر هەموو بوارەکان دەبێت و دەبێتە قەیرانی ئایدیۆلۆژی، دەوڵەت، سیاسەت، ئابووری و کۆمەڵگا. بەم رەوشەوە یەکێتی ئەورووپا نەدەتوانێ تورکیا پەسند بکات، نەدەتوانێ رەتیبکاتەوە. بەدەرنانی تورکیا لە بواری ستراتیژیدا رێگا لە پێش روودانی هەندێ خراپەکاری دەکاتەوە کە کۆنترۆڵ ناکرێت. کێشەی نوێتریش دەکەوێتە سەر ئەو کێشانەی کە ئێستا لە بەڵکان، قەفقاسیا و رۆژهەڵاتی ناوین لە ئارادان، دەرفەت بۆ زەمینەی ئاڵۆزی و پێکدادان لەبارتر دەکات. هەر بۆیە ئەگەرچی یەکێتی ئەورووپا بە جیاکاری هەڵوەستە دەکات، بەلام لەبەرئەوەی تورکیا هەنگاوە پێویستەکانی تەفلیبوونی نەهاوێشتووە ناتوانێ رۆڵێکی بەکاریگەر لە چارەسەرکردنی کێشەکان ببینێ. هێزە ناوخۆییە میللیگەراییە شۆفێنیەکانی تورکیا لەم لایەنەوە لە میانەی موحافەزەکارییەوە بنبەستبوون بەهێز دەکەن، لە ئەگەری رەوشێکی ئاڵۆزی و پێکدادان و زەمینەکەیدا پشت بە بەهێزبوونی سیاسی دەبەستن و خۆراکی خۆیان لە پێکدادان وەردەگرن و هەوڵدەدەن شوێنگەی خۆیان لە نێو کۆمەڵگا و دەوڵەت بەهێزبکەن. دیموکراتیزەبوونی تەواو لەسەر رێبازی یەکێتی ئەورووپا وەکو کۆتایی هاتنی سیاسەتی خۆیان هەڵدەسەنگێنن.

رۆڵی پێکهاتە و چەمکی نوێنەری میللیگەرایی نەژادپەرستی تورکی ناوخۆ لە دژوارکردنی قەیران لە قۆناخەکانی دواییدا یەکلاکەرەوەیە.ئێستاش بەدوای رێبازی ئەنوەر پاشاوەن، کە سەردەمی بەسەرچووە. هەرچەندە بۆماوەیەکی درێژخایەنیش ئایینی سیاسی لە گرژکردندا، رۆڵێکی لە موحافەزەکاری هەبێت، لە قۆناخەکانی دواییدا جیابوونەوەو گۆڕانکاری زەهنیەت و هەڵوێست بەرەو دیموکراسیەت وەکو پێشکەوتنێکی پۆزەتیڤانە دەبینرێ. بێگومان ئەم مەیلە بۆ ئەوانە لە جێگای خۆیدایە کە لە دەرەوەی زەهنیەتی تەقیەگەرین. خۆ نوێ نەکردنەوەی زەهنیەتی کەمالیستی لە چوارچێوەی شارستانییەتی دیموکراتییانەدا وەکو گرنگترین کەموکوڕی دەبینرێ، بۆ کۆماریش جدیترین رۆڵی بەهەڵەداچوون دەبینێ. پارتەکانی سیستەمی ئۆلیگارشی بەرژەوەندیخواز لە نێو ئیفلاسبوونێکی تەواوەتیدا دەژین، بەخێرایی کۆمەڵگا لێیان دوور دەکەوێتەوە، هەموویان کەوتوونەتە ژێر بەنداوەوە.

وەکو ئەرێتێکی باو لە رەوشی بەمجۆرە، تورکیا هەوڵیدەدا لە رێگای سوپاوە قەیران تێپەڕبکات. بەلام رەوشی سیاسی ناوخۆ و دەرەوە و تاقیکردنەوە هەمەلایەنەکان، هەنگاوەکانی سوپای خستۆتە نێو رەوشێکی زۆر بەترس. ئێستا سوپا بە کۆنترۆڵێکی چڕ و چاودێریکردن سنووردارە. ئەمەش بەواتای بەستەڵەکی و بێخەمی سوپا نایەت. بە پێچەوانەوە دەزگایەکە کە

سەبارەت بەهەمووو مەسەلەیەك خاوەن لێکۆڵینەوەی بەرفراوان و پلان و پەکێنەکانی سیاسەتە. هەروەکو پارتێکی پۆست مۆدێرنیزم ستراتیژی و تاکتیکی تایبەت بەخۆی بە قووڵایی پراکتیزە دەکات. جگە لە بڵاوکراوەکان، بە ئاشکرا یاریکردن گونجاو نابینێ. تەواوی ئەم راستیانەش جیاوازی رەوشی تورکیا لەگەڵ ئەرژەنتین، بەرازیل و ئەندەنۆسیا دەخاتەڕوو. ناچاری کۆنترۆڵی نێودەوڵەتی لە رێگای ئەمریکا و یەکێتی ئەوروپاش، سەرچاوەی خۆی لەم راستینە وەردەگرێت. لەکاتێکدا ئەمریکا هەوڵدەدات لە رێگای کۆسپ نانەوە، پێش لە داڕووخانی ئابووری بگرێت و تورکیا بە خۆیەوە گرێبدات، یەکێتی ئەوروپا هەوڵدەدات شانبەشانی ئابووری رێگا لە پەرتەوازەبوونی ئەو توانستە دیموکراتیە بگرێت کەلە ئارادایە و بەمجۆرە لە دەست خۆی بهێڵێتەوە. ئەم هەڵوێستانەش ئەگەر لە رێگای تورکیاشەوە بێت کێشمەکێشی نێوان ئەمریکا ـ یەکێتی ئەوروپا لەگەڵ خۆیدا دێنێ.

نابێ هەبوونی هێزەکانی لایەنگری یەکێتی ئەورووپاش بچووك بکرێتەوە، لەماوەکانی دواییدا ئەم هێزانە هەوڵدەدەن بەکاریگەر بن. ناوەندەکانی سەرمایە لەسەرووی هەمووشیانەوە کۆمەڵەی پیشەکارو کارسازانی تورکیا TUSIAD بۆ یەکەمین جارە بژاری دیموکراتییانەی خۆیان دیار دەکەن، تەنانەت لەم لایەنەوە بە گوێرەی سەندیکا بەکرێگیراوەکانی کرێکاران خاوەنی هەنگاوی پێشکەوتووترن. ئەو چەپەی بەرامبەر پێشخستنی ئەلتەرناتیفی زەحمەتکێشان بەرپرسیارە لە ژێر کاریگەری سۆسیالیزمی بونیادنراو و نەتەوەپەرستی خۆجێیی رزگاری نەبووە. ناوەندێکی راستڕەوی لیبراڵ و سۆسیال دیموکراسیەکی هاوچەرخ بەتەواوی پێکنەهاتووە و دوورە لەوەی ئەم بۆشاییە پڕبکاتەوە.

تورکیا بەرامبەر بەم راستیپانە توانای کاری ئەوەی هەیە بەتەواوی بکەوێتە رێگای دیموکراسیەت. بەپێچەوانەوە یەکەمین جارە هەلومەرجە ناوخۆیی و دەرەکیەکان بەیەکەوە بژاری دیموکراتی دەکەن بە ناچاریەك. هەربۆیە شانسی ئەوە بڵندە کە هەڵەمبازی دیموکراتی بۆ رزگاربوون لەم قەیرانە بەدیبێت کەلە ئارادایە. بەمجۆرە بۆ بەتەواوی جێگیربوونی لە نێو سیستەمی یاسای دیموکراتی یەکێتی ئەوروپا، هەلودەرفەت دەرەخسێ. لە رووی توانستەوە سەبارەت بەم مەسەلەیە تورکیا بەهێزو دەوڵەمەندە. کێشە تێپەڕکردنی خاڵە هەستیارەکانە. کێشەی کورد نەك تەنیا لە بونیادی خۆیدا، بەڵکو لەنێو تەواوی تورکیاو پێکهاتەی رێککەوتندا جێگای سەرئێشەیە و کاریگەری لەهەموو گیروگرفتێك دەکات. توێژە راستڕەو و نەتەوەپەرستە باوەکانی تورکیا، تەنانەت پەسندکردنی کوردان وەکو زاراوە، بەخیانەتکردن لەوڵات لەقەڵەمدەدەن. تەنانەت هەبوونی کوردان وەك وشەیەك بە پارچە کردن و هەڕەشەکردنی ئاسایشی نەتەوەیی هەڵدەسەنگێنن. لەگفتوگۆکانی قۆناخەکانی ئەم دواییەدا تا دوارادە ئەم راستینەیە ئاشکرابوو.

بێگومان ناشێ لەمیانەی ئەم هزرەدا جێگای خۆی لە نێو دیموکراسی و یاسای یەکێتی ئەورووپا بگرێت. تەنانەت دان بە بچووکترین و سادەترین مافی کوردان دانانێ، کە خۆی لە دەرفەتەکانی ئازادی ڕاگەیاندن ـ بلاوکردنەوە دەبینێ و بەواتای مافی تاکەکەسی و پەروەردە بەزمانی زگماکی دێت. گەلێك ناوەند هەن کە ئەم مافانە لەچوارچێوەی پارچەکردنی وڵات هەڵدەسەنگێنن. شایانی باسە تەنانەت لە دەوڵەتی وەکو ئێراق و ئێران کە بەدوور لە دیموکراسی لەقەڵەم دەدرێن و خاوەن ڕژێمی جیاوازن، لەمێژووەوە پەروەردەو ڕاگەیاندن بەزمانی کوردی پراکتیزە کراوە. تورکیا لەو لایەنەوە نامۆترین وڵاتە بە سیستەمی ئەورووپا. کاتێك دەرك بەوەکرا کە تەکتیکی فەوتاندنی کوردانی نەتەوەپەرستە شۆڤێنییەکان جێگای خۆی نەگرت، ئەمجارە ئەو سیاسەتەی پەنایان بۆ برد بە شێوەی هەڕەشەکردنە سەر ئاسایشی نەتەوەیی بوو. بەمجۆرە خودی ئەم چەمکە کێشەیەکی زۆر بەسانایی لەڕێگای ڕێککەوتنی دیموکراتییانە چارەسەر دەکرێت، دەیکات بەسەرچاوەی هەڕەشەیەکی پلە یەك. لە ناوەندی ڕۆژهەلاتی ناوین نکۆڵی لە کۆنترین گەلەکەی دەکەی، لە میانەی هەموو شێوازێك پاکتاوکردنی بە ئەرکێکی نەتەوەیی دادەنێت، بێگومان ئەوکاتە کوردان دەبن بە گرنگترین سەرچاوەی هەڕەشە. ئاشکرایە کەسیستەمێکی فشار کەتا قەدەخەکردنی زمان چووە و نموونەی لە جیهان و مێژوودا نەبینراوە بەردەوام زەمینەی جوداخوازی و توندوتیژی ئامادە دەکات و بەرهەمدێنێ. هەروەکو بڵێی تورکیا کەوتۆتە نێو تەڵەزگەی دووروبەر و بانگەوازی هزری جوداخوازی و ئامرازەکانی توندوتیژی دەکات. لەڕاستیدا ئەم دووروبەرە بەرتەسکە. بەلام لەبەرئەوەی ژیانی باو و هێزی خۆی بەگوێرەی ئەم هەڵوێستە ڕێکخستووە، لەنێوخۆیدا زۆر بەچڕی ڕێکخراوە و تەڵەکەبازە، وەستایە لە بنبەستبوون و ئاستەنگ کردنی هەڵمەتە پێشکەوتووەکان.

چەندین نموونەی ئەم هەڵوێستە لە مێژوودا هەیە. هەوڵی تیرۆرکردنی تورگۆت ئۆزال و مردنە پڕ لەگومانەکەی و هەوڵەکانی تیرۆرکردنی بولنت ئەجەوید و تاوانەکانی بکەری نادیارو هەوڵەکانی بە گرژی هێشتنەوەی کەش و ڕەوش، لەنزیکەوە گرێدراوی ئەم ناوەند و هێزانەیە. وەکو یەکتر بینینی ئەم ناوەندانە لەگەڵ سوپا و دەوڵەتی قووڵ خەڵەتاندنە. بەپێچەوانەوە ئەگەر ئەمانە لەنێو سوپاو قوولایی دەوڵەتدا بەهێزبن، دوودڵ نابن لە پەیڕەوکردنی فاشیزمێکی چواربەچوار ئەم هێزانە بەشێوەیەکی سەرەکی کۆمەڵگا و سیاسەتیان تەسلیم گرتووە. تاکە کەموکوڕیان، لاوازبوونیانە لەنێو سوپا و هەندێ دەزگای هەستیاری دەوڵەت. هەر لەبەر ئەم هۆکارەشە لەلایەن هەندێ ناوەندەوە نیشاندانی خاڵە هەستیارەکانی دەوڵەت و سوپا بە تێکەڵە لەگەڵ پێکهاتە چەتەگەرییەکان بە هەڵەدا چوون و چەواشەکاری مەزن لەخۆوە دەگرێت. لەم خاڵەدا هەردوو ناوەندی دژ ڕۆڵی پەردەیەکی مژاوی

دەبینن لە پێش شیکردنەوەیەکی راستی دەوڵەت و سوپا، دیمەنێکی چەوت و مژاوی بەراستی نیشان دەدات.

بۆماوەیەکی درێژخایەن پێشنەخستن و نەخستنەگەڕی ستراتیژی رێککەوتنی دیموکراتییانە لەلایەن بزافی ئازادیخوازی کوردان، بەشێوەیەکی بابەتی رێگای لە پێش ئەوە کردۆتەوە کە ناوەندە دەمارگیریە نەتەوەپەرستەکان و ئایینی و شەڕخواز و دژە دیموکراتیەکان بەهێز ببن. ئەمە زیاتر سەرچاوەی خۆی لە کەموکوڕی هەوڵەکانی ئاشتی و رێککەوتنی دیموکراتییانە دەگرێت کەلە هێزە چەپە ـ دیموکراتیخوازەکان چاوەڕوان دەکرا.

زیاتر پێشخستنی ئاگربەستی یەکلایەنەی PKK لەگەڵ قۆناخی ئیمرالی، بەتەواوی ئەو ناوەندانەی خستۆتە نێو بۆشاییەوە کە گرێدراوی ئابووری بەرژەوەندیخوازین، لێدانێکی توندی لەو رۆڵەیان داوە کە بۆماوەیەکی درێژ وڵات ببەستێنن و بە بارمتەی بگرن. سەرباری هەموو جۆرە هەوڵەکانی وروژاندن، داکۆکی لەسەر ئەم هەڵوێستە کراوە، ئەم هێزە فەرمی و نافەرمیانەی بێکاریگەر کردووە کە لە نێو کۆمەڵگا و دەوڵەتدا زەنگیان گرتووە. ئەم ناوەندانە بەسووربوونەوە دەستیان لە هەڵوێستی بانگەوازیکردنی شەڕ بەرنەداوە. بەڵام لەماوەی رابردوودا رووی راستی خۆیان ئاشکرا کردووە، کاتێك هۆکاری بە زیندوویی هێشتنەوەی زەمینەی پێکدادان، رۆڵەکەیانی لە ئابووری بەرژەوەندیخوازی و چەتەگەری روونکردەوە، بەخێرایی کەوتوونەتە رەوشی گۆشەگیریەوە. ئەو کاتە دەرفەتی گفتوگۆکردنێکی راست سەبارەت بە کێشە و راستینەکانی تورکیا رەخساوە. ئەوەش بینراوە کە دەشێ کێشەی کوردیش بە رێککەوتنی دیموکراتییانە بکات، دەرك بەوە کراوە کە ئاسایشی نەتەوەیی راستەقینە بەچارەسەری دیموکراتییانەی کێشەی کورد تێپەڕدەبێت. ئەو پێشکەوتنانەی ئاماژە بە وەرچەرخانێکی رادیکاڵ دەکەن، ئەگەر بەشێوەیەکی هێدیش بێت ئەمەی دیارکردووە کە رێگای چارەسەری و زەمینەکەی گرێدراوی چییە، بەشێوە راستەکانیەوە ئەوەی نیشانداوە کەچۆن ئەم قەیرانە لەئارادا نامێنێ کە هەر رۆژ قووڵ دەبێتەوە و رەهەندی زیاتر بەخۆیەوە دەگرێت.

ئەم پێشکەوتنانە ئەوەش دەخاتە روو کە ئەم دوو هەڵوێستە دژ بەیەکەی سەبارەت بە کێشەی کورد نیشاندراوە مانایەکی مێژوویی لەخۆوە دەگرێت. چارەسەری دیموکراتییانەی کێشەی کورد شوێنگەیەکی یەکلاکەرەوەی هەیە لەوەی تورکیا بکەوێتە سەرڕێی یاسا و دیموکراسیەتی یەکێتی ئەوروپا. هەربۆیە بە قۆناخێکی پێشکەوتن گەیشتووە کە لەنزیکەوە یاسای یەکێتی ئەوروپا و بەشێوەیەکی بەرجەستەش پەیمانی ماف مرۆڤی ئەوروپا پەیوەندیدار دەکات. پراکتیزەکردنی پاراستنی ماف مرۆڤی ئەوروپا، بایەخێکی ژیانی هەیە لە چارەسەرکردنی کێشەی کورد و هەنگاونانی تورکیا بۆ دیموکراسیەتێکی تەواو. لەلایەنێکەوە کێشەکە دەکەوێتە سەرڕێی چارەسەری یاساییانە. بەمجۆرە ئەو مافە یاساییەی بۆکوردان دانی

پیادەنرێت رۆڵێکی مەزن لەوەدا دەبینێ کە هەنگاو بۆ قۆناخێك بنرێت کە هەم ئەورووپا، هەم تورکیا ئاسوودە دەکات. بەپێچەوانەوە لەحاڵەتی جێبەجێنەکردنی پەیمانی مافی مرۆڤی ئەورووپا، لەگەڵ ئەوەی رێگا لەپێش ئەوە دەکاتەوە وڵاتەکانی یەکێتی ئەورووپا رووبەڕووی گەلێك کێشە ببێتەوە، لەسەرووی هەمووشیانەوە هێزی کوردان، ئەوا تورکیاش دەخزێتە نێو زەمینەی پێکدادان، رێگا لەپێش ئەوە دەکاتەوە لەهەموو رووێکەوە لە یاساو دیموکراسیەت دوور بکەوێتەوە. ئەو ئەنجامەی رەوشێکی بەمجۆرە لەگەڵ خۆی دێنێ زۆر قورستر دەبێ لەو کێشەو گیروگرفتانەی دوای هەڵوەشانەوەی یۆگسلافیا هاتە ئاراوە.

هەروەکو چۆن یەکێتی ئەورووپا کێشەکانی بۆسنا، کۆسۆڤۆ و مەکەدۆنیا دەخاتە رۆژەڤی خۆیەوە، ئەوا ناچارە بەگوێرەی پەیمانی مافی مرۆڤی ئەورووپا بەئامانجی چارەسەرکردن کێشەی کوردیش بخاتە رۆژەڤەوە کە گرنگترین کێشەی تورکیایە، تورکیاش ئەندامی چەندین دەزگای یەکێتی ئەورووپایە. تاوەکو ئێستا یەکێتی ئەورووپا سیاسەتی باتێك و دوو هەوای پەیڕەو کرد؛ لەمیانەی واقیعە سیاسیەکان سەبارەت بەم بابەتە یاساکانی خۆی پەیڕەو نەکردووە. ئەم هەڵوێستەش تورکیای سەبارەت بە بابەتەکانی یاساو دیموکراسی بێ خەم کردووە. بەسوودترین یارمەتی بۆ تورکیا بکرێت، ئەو هەنگاوانەن کەسەبارەت بە دەوڵەتی یاسای دیموکراتییە. ئەو رۆڵەی دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپا و پەیمانی مافی مرۆڤی ئەورووپا لەم لایەنەوە دەیبینن سنووردارە. لەدۆزەکانی پەیوەندییان بەکوردانەوە هەیە تەنیا بەدانەوەی قەرەبوو سنووردار دەبن، ئەنجامنەدانی زۆربەی زۆری ئەو گۆڕانکارییانەی دەبووایە بەگوێرەی پێویستی بڕیارەکانی دادگاو مافی مرۆڤی ئەورووپا ئەنجامی بدات، دووڕیانێکی یاسایی خوڵقاندووە. تەنانەت پێویست بوو بەسەدان دۆزی کوردان بەهەمندێ ئەنجامی یاسایی گرنگ بگات. پێویست بوو بەسووربوونەوە هەڵوەستە بکات دەربارەی بەلاوەنانی ماددە دژەدیموکراتی و کەموکوڕییەکانی یاسای تورکیا و ئەنجام بگرێت. بەتایبەتیش کۆنسەی ئەورووپا، کە بەرپرسیارە بەرامبەر چاودێریکردن یاخود پەیڕەوکردنی فەرمان و بڕیارەکانی پەیمانی مافی مرۆڤی ئەورووپا و دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپا، سەبارەت بەبینینی رۆڵی خۆی بەرامبەر بە تورکیا زۆر بە سازشکاری هەڵوەستە دەکات، بەگوێرەی قورسایی کێشەکە تاوتوێ ناکات و بۆ دەزگا بە دەسەڵاتەکانی ناگوازێتەوە. نزیکەی ٤٠٠٠ گوند و کوێستان چۆڵکراوە. بەشێکی هەرە مەزنی بەشێوەیەکی نایاسایی تێکدراوە. ئەمەش بەتەواوی لەگەڵ پەیمانی مافی مرۆڤی ئەورووپا ناکۆکە. بێگومان دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپا گەلێك بڕیاری سەبارەت بە مەسەلەی چۆڵکردنی گوندەکان وەرگرتووە. ئەمەش زۆر بەروون و ئاشکرا دیاردەکات کە کێشەکە هی تاکە کەس نییە ، گەوهەرێکی گشتی هەیە، تەواوی چین و توێژەکانی گەل پەیوەندیدار دەکات.

ئەو کاتە ئەمەش دەسەلێنێ کە کێشەکە لە مەسەلەی تاکە کەس دەرکەوتووە و بە ئاستێك گەیشتووە چارەنووسی تەواوی گەل پەیوەندیدار دەکات. لەم بارەیەوە "بەکارهێنانی تیرۆری

PKK" وەکو بەهانەیەك، سەبارەت بە پرەنسیپەکانی یاسای دیموکراتی ڕاست نابێ. ئەو ستەمەی دەرهەق بە هەبوونی کوردان دەکرێت تەنیا دەربازکردنی لەمیانەی چوارچێوەی مافەکانی مرۆڤ وەکو مەسەلەیەکی کەسێتی و تێپەڕاندنی بە قەرەبووی چەند هەزار دۆلارێك، بابەتێکە پێویستە لە ئاستی ڕووداوێکی مەزن هەڵسەنگێنرێ. لەپەیمانی مافی مرۆڤی ئەوروپادا، سێ جۆرە مافی سەرەکی ڕێکخراوە. پارچەیەکی ئەم مافانەش، ئازادانە دیاریکردنی چارەنووس و ئازادانە گوزارشت کردنە لەژیانی کولتووری. سەبارەت بەکوردان، لەسەرووی هەموویانەوە ئەم مافانە، بەشێکی مەزنی مافەکانی دیکەش پەیڕەو ناکرێت، بەشێوەیەکی بەربڵاو ڕەوشی ناکۆك لەگەڵ ئەم پەیمانە ڕوودەدات. ئارادەیەکی مەزن کوردان لەدەرەوەی ماف بەجێهێڵراون. لەکاتێکدا وەکو تاك بەشێوەیەکی ڕێژەیی خراوەتە چوارچێوەی مافە وەکو گەل و قەوارەی کولتووری لەماف بێبەش ماوەتەوە. لەهیچ یەکێك لە وڵاتەکانی ئەندامی کۆنسەی ئەوروپا ڕەوشێکی بەم جۆرە لەئارادا نییە.هیچ کاتێك ئەو بڕیارانە بەهەمند وەرنەگیراوە کە ناوە بەناوە لە پەرلەمانی ئەوروپا سەبارەت بەم بابەتە دەردەچێت. هەروەکو چۆن لە تورکیا نکوڵی لە کوردان دەکرێت و تەنیا وەکو تورك دەکەونە چوارچێوەی یاسا، سەبارەت بەیاسای ئەوروپاش هەڵوێستێکی هاوشێوەی ئەمە جێگای باسە.ئاشکرایە ئەم هەڵوێستەی دەتوانین بەشێوەی "بەڵێ وەکو تاکێك، نەخێر بۆ گەل و کولتوور" فۆرمیلەی بکەین لەگەڵ یاسای ئەوروپا و پێوانە دیموکراتیەکانی ناکۆکە.

بەشێوەیەکی جیدی هەڵنەسەنگاندنی خراپی کۆماری تورکیا لەم لایەنەوە و نەگەیشتن بە بڕیاری پێویست، فاکتەرێکی گرنگی ئانەم ڕادەیە قووڵبونەوەی کێشەی کوردو قەیرانە هەمەلایەنەکان و بەردەوامبوونیانە. ئەمەش بەشێوەیەك لە شێوەکان سیاسەتێکی باوی داگیرکاریە کە لەڕێگای کێشە ناوخۆییەکان وڵاتەکان بەخۆیانەوە گرێدەدەن.

کاتێك بەرگرینامەکەم پێشکەش دەکەم ئامانجی ئەوە لەخۆوە دەگرێت کەگرنگی بەرەوشی کەسێتی من نەدرێت و ئەم هەڵوێستە نێگەتیڤە بەلاوە بنرێت. وەکو تاکی گەلێك کە لەرەوشێکی زۆر ترسناك دایە، تەواوی هەبوونی ڕەتدەکرێتەوەو وەکو گەلە هاوچەرخەکان پەسندناکرێت، باوەڕیم وایە کە بەجێکردنم لە چوارچێوەی یاسادا بەبڕیار و پرەنسیپ نابێت. باوەڕیم وایە تاوەکو دان بە مافە سەرەکیەکانی گەلێك دانەنرێت، تەنانەت مافی تاکەکانی ئەم گەلەش دانی پێدابنرێت، ئەمە واتایەکی ئەوتۆی نابێت. تەنانەت بەسووربوونەوە هەڵوێستەکردن بەرامبەر کێشەکان وەکو "لەمیانەی یاساوە خاوەن دەرکەوتن لە ئەندامی ڕێکخراوێکی تیرۆر کەناهەقی لێکراوە" زۆر ترسناکە. ئەمە لەژێر ناوی یاسا، بوونە بەئامرازی ناهەقیەکی مەزن. سەبارەت بە بابەتی دۆزە پەیوەندیدارەکان بەکوردان ئەم دووانەیە مەترسیدارە، لەئارادایە. لێرەدا ئەم لایەنانە بەئەقڵی مرۆڤدا دێت: ئایا یاساو دیموکراسیەتی ئەوروپا دەخوازێ کوردان لەچوارچێوەی گەلێکدا ببینێ؟ ئەگەر دەخوازێ، بۆچی ئەم

هەڵوێستەی سەبارەت بەکێشەی گەلانی دیکە دیار کردووە، سەبارەت بەکوردانیش نیشانی نادات؟ ئایا کوردان وەکو ئەو باڵندانە هەڵنەسەنگێنێ کە ڕەچەڵەکەکەیان بنبڕ بووە؟ ئەو مافانەی کەلە زووەوە کەوتۆتە چوارچێوەی مافپەروەری و لەمیانەی پەیمانەکانی نەتەوە یەکگرتوەکان بووە بە یاسا، چ کاتێك بۆ کوردانیش پەیڕەو دەکرێت؟ گەلێك کێشەی هاوشێوەی ئەمە پێویستی بەوەڵامدانەوە هەیە. لەکاتێکدا دۆزی من لە ستراسبۆرگ لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکرێ، لەمیانەی هەندێ دروشمەوە داخوازیەکانی کۆمەڵەی گەلێك تاوەکو تەلاری دادگا گواستراوەتەوە، کەسەدان هەزارانی تێپەڕکردووە. دەبێ ئەم دەنگانە ئامازەیان بە ڕاستیەك کردبێت.

لەکاتێکدا دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپا ڕەوشی من تاوتوێ دەکات، لەو باوەڕەدام کە پێویستە گەلی کورد و ئەو ڕەوشەی تێیدا دەژین، بێتە بەرچاوان. یاسای ڕۆما کە بناخەی یاسای ئەوروپایە سەرەکیترین سەرچاوەی ڕێزگرتنە بەرامبەر نەریتی گەلان، واتە ڕێزگرتنە لە قەواره و هەبوونە یاساییەکەی. بە بەراوردکردن لەگەڵ یاسای ڕۆمای ٢٥٠٠ ساڵ بەرلەئێستا، ناشێ یاسای ئەوروپای سەدەی بیستەم لە ڕەوشێکی دواکەوتووتردا بێت. ئەگەر بەمجۆرە بێت کەواتە نکوڵی لە گەوهەری خۆی دەکات.

پێشخستنی بەرگرینامەکەم لەسەربنەمای ئەوەی چۆن ڕاستینەی گەلی کورد بە درێژایی مێژوو پەردەی سەندووە، سەبارەت بەدۆزینەوەی وەڵامی ئەم جۆرە پرسانە ناچاریەکە. بۆئەوەی وەڵامی پێویست بۆ ئەوانە بدرێتەوە کە بانگەشەی ئەوە دەکەن گەلی کورد کە بەردەوام نکوڵی لێدەکرێت جێگای لەنێو مێژووی شارستانییەت نییە، هەربۆیە تاوتوێکردنی لەگەڵ مێژووی شارستانییەت گرنگ بوو. ئەوانەی لەنێو قۆناخی مێژوودا هەبوونی خۆیان نەناسن، لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا خۆیان ناناسن و ناتوانن لە پێناو بەدیهێنانی مافەکانیان تێکۆشان بکەن.

کاتێك شیکردنەوەی مێژوویی لەهەمانکاتدا بە شێوەیەکی زانستی ئەوە دەخاتەڕوو کە سەرجەم شارستانییەتەکان وەکو ئەڵقەکانی زنجیرەیەك بەیەکەوە گرێدراون و ئەڵقەی دواییش شارستانییەتی ئەوروپایە، خزمەتی ئەوە دەکات لەجیاتی شێوازێکی سۆزداری بەشێوەیەکی زانستی کێشەکان تاوتوێ بکرێت. گەیشتنی دۆزەکە تاوەکو دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپا پەیوەندییەکەی لەگەڵ ئەم ڕاستینەیە دەخاتەڕوو.

بۆ ئەوەی شارستانیەتی ئەوروپا بە شێوەکی ڕاستەوخۆ بەرپرسیارێتی خۆی سەبارەت بەگەلی کورد نیشان بدات، ئامازەم بەوە کرد کە چۆن کاریگەری سیاسەتی داگیرکاری ئەم دووسەد ساڵەی دوایی کراوەتە سەر کە بەریتانیا سەر کێشی دەکرد، ئەمەش پێویستی بە هەستکردنە بە بەرپرسیارێتی ئەخلاقی و سیاسی. واتای کرداری تێپەڕاندنی ئەم سیاسەتە

داگیرکاریە لەلایەن یاسای یەکێتی ئەوروپا، بەواتای ئەوە دێت کە سەبارەت بە کێشەی کورد گرێدراوی پەیڕەوکردنی پەیمانی ماق مرۆڤی ئەوروپایە.

ئیتر لەبەر ئەوەی کێشەی کورد بووە بە کێشەی ئەوروپا، لەو باوەڕەدام کە دادگای ماق مرۆڤی ئەوروپا بە شێوەیەکی وەها بەرفراوان هەبوونی کوردان روونەکاتەوەو نەخاتەڕوو. بەهۆی ئەو هەلومەرجەی تێیدا بووم ئەو هەڵسەنگاندنەی لە بەرگرینامەی ئیمرالی نەمتوانی ئەنجامی بدەم، هەرچەندە چەندین کەموکوڕی و ناتەواوی لە خۆوەبگرێت، لەو باوەڕەدام کە بۆشاییەکی پڕکردووەتەوە. هەوڵمدا هەڵسەنگاندنی بەرفراوان سەبارەت بە PKK ئەنجام بدەم. دادگای ماق مرۆڤی ئەوروپا لە بڕیارە جیاجیاکانیدا هەرچەندە تەواوی بنکەی رێکخستن لەخۆوە نەگرێت، هەندێ بڕیاری سەبارەت بەتیرۆر تاوانبارکردنی هەبووە، لەبەرگرینامەدا گرنگیم بە روونکردنەوەی ئەم بابەتە دا. بەشێوەکی گشتی لەدیاردەی توندوتیژیەوە، تاوەکو دەگاتە چەمکی توندوتیژی لەنێو PKK بەشێوەکی بەرفراوان جێگام بە بابەتەکە دا. لەمیانەی ئەمە هەوڵمدا هەڵوێستی خۆم و رێکخستن بەرامبەر توندوتیژی و شەڕ روونبکەمەوە. بەشێوەیەکی بەرفراوان ئەوە خراوەتەڕوو کە هەبوونی گەلی کورد بەشێوەیەك لەژێر توندوتیژی دەسەڵاتدارە بیانیەکاندا ژیاوە کە بەسەر هیچ گەلێکی دیکە نەهاتووە، هەربۆیە دەرفەتی پێشکەوتنی ئازادانەی نەبووە. بەدرێژایی مێژووی شارستانییەت کوردان تەنیا لەمیانەی پاشەکشێ بۆ شاخەکان توانیویانە هەبوونی خۆیان بپارێزن. هەربۆیە هێزی ئەوەیان بەدەست نەهێناوە کە بەئیرادەی ئازادی خۆیان شارستانییەتی شار ئاوا بکەن و بۆ ماوەیەکی درێژ بەردەوامی پێبدەن. ئەوانەی ئاواشکراون لەدوای ماوەیەکی کورت لە داگیرکردن رزگاریان نەبووە. تاوەکو ئێستاش مانەوەیان بەشێوەی خێڵەکی سەرچاوەی خۆی لەم تایبەتمەندێتیە مێژووییە وەردەگرێت.

PKK خواستی ئەم گەمارۆ مەزنەی توندوتیژی بشکێنێ. بەڵام زهنیەتی گوندێتی ـــ خێڵەکی بنکەکەی بە تەواوەتی لەمیانەی شێوازێکی راست و دروستی بەرگری رەوا بەتەواوەتی تێکۆشانێکی چەکداریان پەیڕەو نەکرد. هەروەکو دەزانرێ گەلێك کەمەموو هەبوونێکی قەدەخە کرابێت تادەگاتە دەربڕینی ئازادانەی زمان، ئەوا ماق بەرگری رەوای هەم بەگوێرەی یاسای گەردوونی هەم لە دەستوورە نەتەوەییەکاندا هەیە. نەك بەکارهێنانی ئەم مافە، بەڵکو بەکارنەهێنانی رەوشێکی لە یاسا بەدەرە. رێبازی بەرگری رەوای PKK هەم مافێکی بەگوێرەی دەستوور، هەم ئەرکێکی پیرۆزە پێویستە لە پێناو گەلەکەی پەیڕەوی بکات. هیچ دەزگایەکی یاسا ناتوانێ بەهۆی بەکارهێنانی ئەم مافە گەلی کورد تاوانبار بکات. لەراستیدا ئەوانەی پێویستە تاوانبار بکرێن، ئەوانەن کە پێویستییە دەست لێبەرنەدراوەکانی یاسای هاوچەرخیان شایستەی گەلەکەمان نەبینی. لەم رەوشەدا بەرگری رەوا تاکە بژارە کە لەدەستدا دەمێنێتەوە. ئەم مافە دەستووریە بەکارهێنراوە. تاوەکو دان بەو مافانەی گەلەکەمان دانەنرێت کە

بەشێوەیەکی زۆر ئاشکرا لە پەیمانی مافی مرۆڤی ئەورووپا دیارکراوە، تاوەکو هەموو شتێکی نکوڵی لێبکرێت و پەروەردە و قسەکردن بەزمانی زگماکی قەدەغە بێت کە سادەترین مافە، ئەوا تاوەکو دوایی دەست لەبەکارهێنانی مافی بەرگری رەوا بەرنادەین، ئەمە پێویستییەکی یاسایە. لەچەندین بڕیارەکانی دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپا سەبارەت بەم بابەتە ئاشکرا بووە کە تاوانباری راستەقینە سیاسەتەکانی دەوڵەتە. سەرباری ئەوەی هیچ تاوانێکیان نەبوو بەڵام کوشتنی بەهەزاران هاووڵاتی سڤیل بەدەستی ئەو چەتانەی کە لەلایەنی دەوڵەتەوە خۆراکیان پێدراوە و چۆڵکردن و وێرانکردنی بەهەزاران گوند، کردەوەی تیرۆریستین کە تاوانی مەزن پێکدێنن. گەلەکەمان لە رابردوو و رۆژگاری ئەمڕۆمان لەژێر تیرۆرێکدا دەژی کە بەسەر هیچ گەلێکی دیکە نەهاتووە. هێشتا نموونەی هەڵەبجە لەبیرنەکراوە. هەربۆیە بەکارهێنانی بەرگری رەوا ئەگەر لەسەر بنەمایەکی چەکداریش بێت، پێویستییەکی یاسای گەردوونی و دەستووری نەتەوەیی یە.

ئەوەی پێویستە پەسند نەکرێت و سەرباری ئەوەی منیش بەدرێژایی چەندین ساڵ بەرامبەری راوەستام، بەڵام ئەو توندوتیژیەی زەحمەتیم بینی لە رێگرتنی، دەرکەوتە دەرەوەی رێبازی بەرگری رەوا. هەندێ کەسایەتی و گرووپی نێو PKK، هەم بەرامبەر هەڤاڵانی خۆیان ، هەم بەرامبەر گەل، هەم بەرامبەر ئەو کەسایەتی و هەندێ دەزگای دەوڵەت کە دەرەوەی توندوتیژین، توندوتیژییان پیادە کردووە. هەروەکو دەزانرێ ئەمەم بە هەڵە بینی و هەوڵێکی مەزنم دا بۆئەوەی هەروەکو لەنموونە و ئاستی توندوتیژی نێوان ئیسرائیل ـــ فەلەستین دەبینرێ نەبێتە رێبازێك. نەگەیشتنی توندوتیژی بەم ئاستە لەنزیکەوە گرێدراوی ئەم هەوڵانەی منە. لەقۆناخی ۱۹۹۳ بەدواوە بەتایبەتیش لەمیانەی جەسارەت وەرگرتن لە تورگۆت ئۆزاڵی سەرۆك کۆماری ئەو قۆناخە، ئەو ئاگربەستە یەکلایەنەی هەنگاومان بۆی هاوێشت، لەدوای چەند قۆناخێکەوە بەدیسپلینێکی مەزن و بەرزەوە پراکتیزە دەکرێت. PKK بەشی هەرە مەزنی هێزە چەکدارەکانی خۆی بۆ دەرەوەی سنوورەکان کشاندۆتەوە و خستوویەتیە نێو سیستەمی بەرگری رەوا. لەراگەیاندنی فەرمانڕەواکانی تورکیاش ئاواکردنی ئەم سیستەمە پشت راست کراوەتەوە. گرێدراو بەم بابەتە، PKK لە کۆنگرەی حەوتەمدا بە ئاشکرا رایگەیاندووە کە بەدوای جوداخوازیدا نییە، لەم لایەنەوە پرۆگرام و ستراتیژی خۆی ئاشکرا کردووە . لەچوارچێوەیەکدا کە یەکێتی وڵاتی تورکیا و یەکپارچەیی دەوڵەت بەبنەما بگیردرێت، چەندین جار رایگەیاندووە کە ئامادەیە کێشەی کورد لەنێو ئاشتی و چارەسەری دیموکراتییانە چارەسەر بکات. ئەم هەڵوێستەی بەواتای ئەوەش دێت کە بە بێ ئەوەی داواکارییەکی زێدەڕۆیی دەربخاتە پێش، لەسەر بنەمای بەکارهێنانی ئەم مافە لەچوارچێوەی پەیمانی مافی مرۆڤی ئەورووپا لایەنگری چارەسەرییەکە، تاوەکو ئێستا بەفەرمی لەلایەن دەوڵەت وەڵامی نەدراوەتەوە. تەنانەت دەوڵەت لە داننان بەکێشەی گەلی کوردیش زەحمەتی دەبینێ.

چەندەی دەکرێت دان بە پێوانەکانی دیموکراسی و یاسای ئەورووپا دانانێت. سەرباری ئەوەی بەرئەندامی یەکێتی ئەورووپایە، تاکە وڵاتە کە پێوانەکانی کوپنهاگنی جێبەجێ نەکردووە.

بەرامبەر بەم رەوشە پێویستە دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپا رەوشی بەرگری رەوای PKK بەرچاو بگرێت کە بە بەرپرسیارێتیەکی بەرزەوە ئەنانەت دەرکەوتنە دەرەوەی سنوورەکانیشی بەرچاوگرت و دوو ساڵە هەم بەفەرمی هەم بە کرداری بە دیسپلینێکی تەواو پەیڕەوی دەکات. پێویستە دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپا ئەوە بزانێ و تەقدیر بکات کەلەم رێکەوتە بەدواوە PKK خۆی لە رووداوە تیرۆریەکانی دەرەوەی یاسا بە دوورخستووە و هەموو شتێکی بە گوێرەی رێبازی بەرگری رەوای پیرۆز پیادە دەکات. تەقدیرێکی بەمجۆرە رۆڵی دەبێت لەوەی کێشەی کورد لەزەمینە رەواکاندا گفتوگۆبکرێت و بکەوێتە قۆناخی چارەسەری. ئەو بڕیارانەی دادگای باڵا، سەبارەت بە تاوتوێکردنی کێشەکە لەچوارچێوەی یاسای دیموکراتیدا دەیدات، کاریگەریەکی پۆزەتیڤانە دەکاتە سەر دەزگاکانی یەکێتی ئەورووپا و کار بەدەستانی کۆماری تورکیا، هەروەها لەچوارچێوەی پێوانەکانی یاسای دیموکراتی، PKK هانی چارەسەری دەدات. هەربۆیە ئاماژە بەوە دەکەم کە ئەو بڕیارانەی دادگا لەسەر بنەمای ئەم راستیانە بەتایبەتیش لەمە بەدواوە پێشی دەخات واتایەکی مێژوویی دەبێت لەچارەسەرکردنی کێشەیەکی قورس. لەگەڵ رێزگرتنم بەرامبەر ئەو بڕیارانەی پێشتر سەبارەت بەم بابەتە وەریگرتووە، ئاشکرایە کە ئەم بەرگرینامەم بنەمای ئەو رەخنانە پێك دێنێت سەبارەت بە ناتەواوییەکانی. بابەتی توندوتیژی و جوداخوازی کە دادگای باڵا بەردەوام بەرچاوانی دەگرێت، هۆکارە راستەقینەو بەرپرسیارەکانی خراوەتە روو. تێکەڵنەکردنی ئەوەی رێگا لە پێش مەغدوریەت بەکاتەوە و مەغدورەکان گرنگییەکی مەزن لەخۆوە دەگرێت. هەربۆیە بەسەرتاسەری و یەکپارچەیی بینینی PKK سەبارەت بەدادگا تا دوارادە بایەخدارە. بەشێکی مەزنی ئەو دۆزانەی پێشکەشکراوە گرێدراوی PKKیە. هەربۆیە لەبەشی تایبەت بە PKK ی بەرگرینامەدا هەروەکو بەشەکانی سەبارەت بەگەلی کوردیش، داخوازی و باوەڕی خۆم دیاردەکەم کە پێویستە بەبایەخەوە هەڵسەنگێنرێت. ئاشکرایە کە ئەم بەرگرینامەیە لەهەمانکاتدا بۆ ئەم دادگا باڵایەش گەوهەری بەڵگەی گرنگ لەخۆوە بگرێت کە وەکو کۆڵەکەیەك هەڵبسەنگێنێ.

تەنیا کاتێك ئەم دوو بابەت و راستینە سەرەکییە، واتە رەوشی یاسایی گەلی کوردو رەوشی سیاسی، سەربازی و یاسایی PKK روونکرایەوە و هەڵسەنگێنرا، ئەوکات دەتوانرێ بەشێوەیەکی راست و بابەتی رەوشی من تاوتوێ بکرێت.

**ــ قۆناخی دادگایی ئیمرالی، پەیمانی مافی مرۆڤی ئەورووپا و دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپا**

گریمانی ئەوەی کەتاکەکان بێ بەرپرسیارێتی و بەتەنیا دەتوانن بژین، بەشێوەیەکی زانستی تەنیا حەوت ملیۆن ساڵ بەرلەئێستا ، جێگای باسە کە هێشتا مرۆڤ لەقۆناخی

پەرپینەوە بوو بۆ بەمرۆڤبوون. ئەوە وەکو بۆچوونێکی زانستی بەشێوەیەکی گشتی پەسند دەکرێ کە ئەو کاتە بەشێوەی کۆمەڵەی بچووك لە نێو سیستەمێکی هاوشێوەی لەیستۆك دەژیان. لەم مێژووە بەدواوە لەگەڵ گەشەکردنی ئاستی کۆمەڵگای توخمی مرۆڤ، تاکەکانیش پەرەسەندنیان بەخۆوە بینیوە، ئەوانەی لەدەرەوەی کۆمەڵگاش ماونەتەوە بەواتای مردن دێت.
لەبەرگرینامەدا هەڵوەستەم سەبارەت بەم بابەتەش کرد، هۆکارەکەی ئەوە بوو: هەروەکو تیرۆریستێکی درندەی لەئاسمانەوە کەوتۆتە خوارەوە، لەمیانەی فەرمانە نهێنی و تایبەتەکانی سەرۆکی گەورەی ئەمریکا و دوا سەرۆکی کابۆی، تەواوی هێزە مەزن و قارەمانەکانی جیهان، سەرەتا لەلایەن یەکینەکانی هەوالگری و ئاسایش، لەدوایی دەستگیرکرام و لە مەحکەمترین ژوور، لە دورگەی ئیمرالی دەریاچەی مەرمەرە لەمیانەی تەدبیری ئاوارتەوە، بەتەنیا خراومەتە نێو تابوتێکی سێ ـ پێنج مەتری. لەرەوشی "گەورەترین تیرۆریست دام کە بەلانی کەم سی هەزارکەسی کوشتووە" کە لە مێژوودا نموونەی نەبینراوە. لەسەرتاسەری جیهان و تورکیا لەمیانەی پروپاگەندەیەك تا ئێستا هاوتای نەبینراوە بەمجۆرە نیشاندەدرام. گەلێك شت سەبارەت بە پیادەکردنی سیاسەتێکی تایبەت گوترا، نووسراو پەیرەو کرا کەچۆن لە سێدارەم بدەن یاخود پارچە بە پارچە گۆشتم بخورێت، تا دەگاتە هێشتنەوەم بۆئەوەی زیاتر خزمەت بکات و برزێ و تاوەکو تاکە دۆستێکی نەمێنێ.
بۆئەوەی بتوانرێ ئەوە هەڵسەنگێنرێ کە دادگای ئیمرالی بە گشتی بە گوێرەی یاسا، بەتایبەتیش بەگوێرەی پەیمانی مافی مرۆڤی ئەورووپا گونجاو بووە یان نا، مسۆگەر هۆکاری ئەوە بووە کە بەرگرینامەکەم بەرفراوان بگرمە دەست. بەتایبەتیش ئەوەی لەسەرووی هەموویانەوە لە بەرگرینامەکەم هەڵسەنگاندو هەوڵمدا بیسەلێنم کە "منیش مرۆڤم گەلێکم هەیە کە جێگای خۆم تێدا دەگرم" بۆ ئەوە پێشکەشم نەکرد ببێتە فەنتازیا. ڕووبەڕووی جیهانێکی بەدرۆ و دەمامککراوین کەمن بە مرۆڤ نابینێ، گەلەکەشمان بەگەل لەقەڵەم نادات و بێ بەزەییە و لەمیانەی پەردە و درۆی بێ هاوتا بەڕێوەدەبردرێت. تەنانەت ئەمە لە ڕۆژگاری ئەمرۆماندا پەیرەو ناکرێت، ڕاستینەیەکە بۆ قووڵاییەکانی مێژوو درێژ دەبێتەوە. ئەگەر وەکو مرۆڤ و گەلان ببینرابواین، بەمجۆرە یەکسانی یاسایی کە بۆ هەر کەسێك پیادە دەکرێت بۆ من و گەلەکەشمان پەیرەو بکرابووایە، مسۆگەر سیناریۆیەکی تراژیدی ـ کۆمیدی یاسایی لە جۆری ئیمرالی ئەنجامنەدەدرا. کێشەکە لەوەدا سەرچاوە ناگرێت کە دادگایی کردنەکەم لەنێو هەلومەرجێکی بێ ئاماندا ئەنجامدراو ئەم دادگاییە لەگەڵ زۆربەی ماددەکانی پەیمانی مافی مرۆڤی ئەورووپا ناکۆکە. لەگەڵ ئەوەی ئەم لایەنانەش گرنگن، جیاکاری سادەن سەبارەت بەشێوە پێویستەکە. سەرەکیترین پرەنسیپی یاسا بابەتیبوون و واقیعیبوونە. یاسا پشت بە نیازو بانگەشەی تاکەکان نابەستێت، کاتێك ئاماژە بەوە دەکەم مەبەستم یاسای هاوچەرخە. ئەگەرنا ئاشکرایە کە فەرمانەکانی دەوڵەت کە ریشەکەی یاسای

خودایی یە بە یاسا دانانرێت، لەم چوارچێوەیەدا نەك یاسا، بەڵكو دەتوانرێ باس لە فڕكردن و داگیرکاری و دەستدرێژی بۆچوونی ستەمكارو ساختەكار بكەین كە خۆی بە خاوەنی ریشەیەكی ئیلاهی دادەنێت. دادگاییكردنی من لە ئیمرالی تەنیا نكۆڵیكردن لە یاسا و تاوانێك نییە، لەهەمانكاتدا كراوە بە ئامرازی لەناوبردنی راستییەكان، كەئەمەش زۆر بەمەترسیدار دەبینم و ئامانجێكی نهێنی یە، نەك تەنیا لەو رۆژانەی لە ئیمرالی بووم، لە تەواوی قۆناخی ئەوروپا و كینیا ئەو سەرسامبوونەی رۆژانە روویدەدا، ئامانجی ئەوە بوو كە راستینە مێژوویی و مرۆییەكان بۆ من و گەلەكەمان پەیڕەو نەكرێت. دەیانخواست لە رەوشی كەسایەتی وگەلێك بەجێمان بهێڵن كە لە هێندییە بێنەواكان بێ نرختروە لە ئاستێكی نزمتری ئاژەڵدا دەبینرێ. ئەوەی مەترسیدار بوو، ئەم رەوشە بوو، لایەنی بێبەزەیی و پرلەنێشی مەسەلەكەش ئەوە بوو لەمیانەی سڕكردن و نەهێشتنی هۆشمەندی من دەیانخواست بەو ئەنجامە بگەن. پیادەكردنی كردارێكی (رهابلیتە ـ اصلاح) و لەنێوبردنی بەرفراوان و قووڵ تاوەكو ئەمانی یەك دۆست جێگای باسە، ناتوانم بڵێم رەوشێكی مەترسیداری وەها بەتەواوی كۆتایی پێهاتووە. راستە لە دادگادا گووتم ئەشكەنجەی قەبە نەكراوە، تەنانەت باسم لە قۆناخی لێكۆڵینەوە كرد كە رێزگرتنی دوولایەنەی لەخۆوە دەگرت. بەڵام ئەم لایەنە تەنیا پەردەیەكی ئەم قۆناخەیە. راستیەكان لەشوێنێكی دیكە شاراوەیە. شایانی باسە كە ناكۆكبوون بە یاساو پەیمانی ماف مرۆڤی ئەوروپا تەنیا بە یاسای تورك و بەڕێوەبەرایەتی و دادگای ئاسایشی دەوڵەت گرێبدرێت دەبێتە هەڵوێستێكی تەسك. تەنانەت لەو باوەڕەدام كە توركەكانیش وەكو گەل و دەوڵەت، بەشێوەیەكی راست و تێر زۆر لەوە دووربوون كەلە رووداوەكان ئاگادار بن. هەربۆیە هیچ كاتێك پەیڕەو كردنی دژە ــ توركێتی هەرزانم لە جێگای خۆیدا نەبینی. بەئەندازەی دەرككردن بەراستیەكان، زانیتی ئەوەی كە لەشوێنێكی جیاوازترە، بەردەوام ئەوەم هێنا بەرچاوان كە هەڵوێستێكی زانستی و بەرپرسیارانە ژیانییە. ئەنجامدانی بەرگرینامەیەكی فرەلایەن تاڕادەیەكیش پشت بەم هۆكارانە دەبەستێت.

مەزنترین خراپەكاری بەرامبەر یاسا و دادگا بكرێت، لە دەستدانی توانستی تێگەیشتنی خودی راستی و چیرۆكەكەیەتی. لەبەر تەواوی ئەم هۆكارانە تاوەكو ئەوساتەی قۆناخی ژێرچاوكردن دەستپێكرد گرنگیم بە روونكردنەوەی راستیەكان دا. ئەگەر سەرۆكی گەورەترین دەوڵەتی جیهان كلنتۆن دەڵێ: "من فەرمانی تەسلیم كردنیم دا"، ئەگەر بریماكۆف ی سەرۆك وەزیرانی دووەمین هێزی مەزنی جیهان، لەو رۆژەی لە ئەوروپا بەدەرنرام، بڵێ: "من فەرمانم بەتەواوی وڵاتەكانی كۆمەڵەی دەوڵەتە سەربەخۆكان دا كە نەیەتە وڵاتەكەتان"، لەئیتاڵیا سەرباری ئەوەی بەگوێرەی یاسا ماق بە سەربەستی مانەوەم هەبوو، بەفشارێكی دەروونی ناچاری دەركەوتنم بكەن، لەیۆنانستانیش لای ئەو بەڕێوەبەرایەتی و حكومەتە لێدانی كوشندەم بەربكەوێت كەباوەڕیم بەدۆستایەتیەكەی هێنا،

ئەگەر بەرژەوەندی ناهەقانەی ئابووری و سیاسی لەژێر ئەم هەڵوێستانە شاراوە بێت، تەنانەت هەرە دوایش لە ئاستی وەزیردا بڵێن "ئێوە دەبەینە هۆڵەندا" و بەشێوەیەك من تەسلیم بە یەکینە تایبەتەکانی ئاسایشی تورکیا بکات کەلە یاسادا جێگای نییە، لێرەدا تەنیا باس لە پێشێلکردنی یاسا ناکرێت، ئاشکرایە رووبەرووی پیلانگێرییەکین کە لەم سەردەمەدا هاوتاکەی نەبینراوە.

کێشە ئەوە نییە من تاوانبارم یاخود نا. کێشە سەبارەت بەوەیە کە لەمیانەی کامە زهنیەت و بەرژەوەندییەوە لەسەرتاسەری ئەوروپا هەڵوێستی ناکۆك لەگەڵ پەیمانی مافی مرۆڤی ئەوروپا نیشاندرا. لە کەسایەتی منـدا خیانەتێکی گـران بەرامبـەر پێوانـە یاسـایی و دیموکراتیەکانی ئەوروپا جێگای باسە. لەو سنوورانەی کە پەیمانی مافی مرۆڤی ئەوروپای تێدا پیادە دەکرێت، ئەو مادە یاساییەی بەرامبەر من پەیڕەو دەکرێت پەیوەندی بە پەنابەری سیاسیەوە هەیە. شایانی باسە دادگای ئیستنادی رۆما لە ئیتاڵیا داخوازی پەنابەریمی پەسند کردووە. لەرەوشێکی بەمجۆرەدا ئەو کەس و دەزگایانەی رۆڵیان هەیە لە بەدەرنانی من بۆ دەرەوەی ئەوروپا لە میانەی شێواز و رێچکەی کە هاوتاکەی نەبینراوە، تاوانیان ئەنجامداوە. دەستگیرکردنێك کە بەدەستی تاوانبارەکان ئەنجامدراوە، ئاشکرایە کە لەگەڵ ماددەی پێنجەمی پەیمانی مافی مرۆڤی ئەوروپا ناکۆکە و پێشێلکراوە. هەربۆیە بەرلە هەموو شتێك پێویست دەکات بڕیار سەبارەت بە پووچەڵکردنەوەی ئەم دەستگیرکردنە نایاسایی و بەدیلگرتنم بدرێت. بەشێوەیەکی بەرفراوان ئاماژە بەم بابەتە دەکەم. بەڵام هەروەکو چۆن زۆر بەسانایی دادگای باڵاش دەتوانێ ببینێ، پێویست دەکات باش ئەوە دەستنیشان بکرێت بۆچی من و گەلەکەم وەکو مرۆڤ و گەلانی دیکە لەقەڵەم نەدراین. ئەم بابەتە لەسەرووی هەمووانەوە دێت. هەرلەبەر ئەمەش بۆئەوەی ببێتە یارمەتیەك بۆ دادگا، لەخۆڕا بەشێوەیەکی درێژ لەسەر بنەمایەکی زانستی ئاماژەم بەوە نەکردووە کەمرۆڤێکی چۆنم و وەکو قوربانی ئەو تیرۆرە مەترسیدارانەی بەدرێژایی مێژوو پەیڕەو دەکرێت چۆن بەم رۆژانە گەیشتم. چونکە ئەوەی لەسەر من پەیڕەو دەکرێت، تەنانەت لەسەر هیچ دڕندەیەك پەیڕەو ناکرێت. هەروەها هەوڵەکانی نکۆڵیکردن لە هەبوونی گەلەکەمان، تەنانەت دژی پێکهاتەی دواکەوتووترین تیرەش پەیڕەو نەکراوە. کاتێك دەڵێم پێویستە یاسا واقیعیبوون بەبناخە بکرێت، مەبەستم ئەم راستینەیەیە. ئەوەی لەو دەنگە دەرکی پێدەکرێت کە دەکاتە هۆڵی دادگای باڵاو بەملیۆنان کەس پەیوەندیدار دەکات، ئەوەیە تاوەکو ئەم دۆزە بەگوێرەی پرەنسیپە گەردوونیەکانی یاسا بەرێوە بچێت، ئەمەش تەنیا لە میانەی دانان بە مافی ئەم راستینانە دەبێت.

بەئاشکرا ناچارم ئاماژە بەم لایەنە بکەم. تەنیا هەلومەرجەکانی دادگایی ئیمرالی بە سەرپێچیکردن لە پەیمانی مافی مرۆڤی ئەوروپا ببینرێ و بڕیاری لەسەر بدرێ، ئەوا وەکو بەردەوامی پیلانگێری هەڵدەسەنگێنم. مەحاڵە ئەمە پەسند بکەم. لە حاڵەتێکدا بڕیارێکی

وەها پەسند بکەم، لەکاتێکدا لە رابردوو و رۆژگاری ئەمڕۆمان خۆشەویستی و رێزێکی مەزنی گەلم بەدەست هێنابێ، ئەوا منیش دەبم بەیەکێك لە بەکرێگیراو و خائینەکانی نێو کوردان. ئەم بەکرێگیراوانەی کە لاساییکەرەوەی سەرەکی بێ پاسایی و ناهەقیکردن لە گەلەکەمان، بەردەوام تێکۆشانم لەدژیان کرد بۆئەوەی بێنەوە سەر رێگای شەرمەندانەی یاسا . بەڵام هەر هەوڵێکی دادگای ئیمرالی کە بەواتای فووتدانی پیلانگێری بهاتبووایە، ئەوا بەواتای سەرکەوتنی لەیستۆکی ئەم بەکرێگیراوانە دەهات. ئەگەر ئەم ناهەقییە تاوتوێ بکەین، دادگا دەبێتە ئامرازێکی ئەمە و ئەگەر منیش ئەمە هەرس بکەم، باهیچ گومانێك نەبێت تاوەکو مرۆڤە دڵسۆزەکانی ئەم گەلەمان بمێنێ ئەم رەوشە رێگا لە پێش ئەوە دەکاتەوە ئەم تابلۆیەی کە لەئارادایە بێبەزەییانە بەردەوام بێت، لەوانەیە بەهۆی هەلومەرجەکانی ئەوروپا بینینی ئەم راستییە ئاستەم بێت. بەڵام ئەوەی دادگایی دەکرێت ئەو تاکە ئومێد و ئیرادە ئازاد و شەرمەندانەی گەلەکەمانە کە بەناوی گەلەکەمان کڵپەبەکڵپە خۆی دەسوتێنێ و تاوەکو دوا هەناسەکانی بەرامبەر هێزە پەلاماردەرەکان خاوەندارێتی لە شەرەفی مرۆڤایەتی دەکات و پێویستە بپارێزرێت. هەرچەندە هێندەی شایستە بوون نوێنەرایەتی ئەم ئیرادەیەم نەکردبێت، بەڵام هەرگیز ناهێڵم و رێگا بەوە نادەم ئەم بەهایانە لە کەسایەتی مندا، بەتایبەتیش بەرامبەر یاسا زیانی بەربکەوێت، یاخود لاواز بێت و نابم بەئامراز. بەرلەهەمووشتێك پێویستە تەواوی ئەم راستینانەو هێزو سیستەمانە بەشێوەیەکی راست پێناسە بکرێت کە هەنگاو بە هەنگاو یاسای ئەوروپایان پێشێلکرد و نەك لەمیانەی پیلانگێریەك، بەڵکو لەرێگای زنجیرەیەکی پیلانگێری منیان رفاند، داواکاریم لە دادگای باڵا ئەوەیە بەتایبەتی ئەم بابەتە روونبکاتەوە و بەبڕیار بگات، چونکە بەگرنگ و مێژوویی دەبینم.

ناتوانرێ رفاندن و دەستگیرکردنی من وەکو رووداوێکی ئاسایی هەڵسەنگێنرێ. تەنیا بۆ ریسوا کردن و ئارەزایی دەربڕین دژی ئەم رووداوە شوومە بەسەدان مرۆڤ ئاگریان لە جەستەیان بەردا، پێشوازییان لەمردن کرد. خواستیان زەبرێکی مەزن لە ئومێدو باوەڕیەکانی گەلەکەمان بوەشێنن. خراپتریش ئەوەبوو، ئەگەر قۆناخی خۆکوژی سەری بگرتبووایە کە خواستیان منی تێبخەن، ئەوا راستییەکی دەست لێبەرنەدراو بوو کە قۆناخێکی نوێی لەگەڵ خۆی دەهێنا، کەگیانی هەزاران کەسی لەگەڵ خۆی دەبرد، هەربۆیە وەکو دیارییەك پێشکەشکردنم بە تورکیا، لەلایەنێکەوە کاریگەری بۆمبایەکی ئەتۆمی نیشاندەدا کەزۆر لەوەی ژاپۆن و هەڵبجە تێکدەرو خراپەکارتر بێت. بەڵام سەرباری هەموو زەحمەتییەکانی، پووچەڵکردنەوەی قۆناخی خۆکوژیدا سەپێنراو، ئەوانەی پووچەڵ کردەوە کە کاریگەری بۆمبایەکی بەمجۆرەیان پیلانکردبوو. تەواوی لێکدانەوەکان لەسەر ئەوە کرابوو کە من بەرگەی ئەم هەلومەرجە سەخت و بێبەزەییانە ناگرم، یان دەکەومە نێو مانگرتنی تامردن، یاخود بەو دەمانچەیەی باڵیۆزی یۆنانی بۆی بەجێهێشتبووم کۆتایی بەژیانی خۆم دێنم. ئەنجام دەبووە،

بەهەمزاران چالاکی گیانبازی و قووڵبوونەوە و بەردەوامبوونی قۆناخێکی توندو تیژی درێژخایەن و خوێناوی کە سنووری توندوتیژی نێوان ئیسرائیل ـ فەلەستین تێپەڕ دەکرد. بەرپرسیارێتی ئەخلاقیم بەرامبەر گەلەکەمان و دۆستان و هەڤاڵانم و هەڵوێست و کەسایەتییە ئاشتیخوازەکەم، پێویستی دەکرد نەکەومە نێو ئەم گەمەیە؛ خۆم بەوە ئیقناع کرد کە ئەنجامەکەی چی دەبێت بابێت تاوەکو لە دەستم بێت ژیان ڕاستتر دەبێت، بەمجۆرە لەیستۆکەکەم تێکدا. بەشێوەیەکی سەرەکی پیلانگێری لەئەنجامی ئەم هەڵوێستەم زەبری بەرکەوت و پووچەڵ بۆوە. ڕێگای ئەوەم نەدا کە خاکی ئەنادۆڵ و میزۆپۆتامیا بخرێتە نێو گەمەیەکی خوێناوی کە بەساڵان بەردەوام دەکات. لەراستیدا ئەو سیاسەتەی پەیڕەوکراوە وەکو پوختەیەکی ئەم دوو سەد ساڵەی دوایی یە. سەرەتا ڕاکێشانی کوردان بۆ نێو یاخیبوون و دوایی هێشتنەوەی بەبێ پشتگیری و گەیاندنی بەخاڵێك کە ( بەتورکان بڵێ لێیان بدەن ) پوختەی ئەم سیاسەتە یە. بەگوزارشتێکی دیکە یاری ( کەروێشك رابکە، تاژی بیگرە) بەرێوەدەبرد. ئاشکرایە کە سیاسەتێکی زۆر بێ بەزەییانە پیادە دەکرا.

لە بەرگرینامەدا شوێن شوێن ئەوەم نیشاندا کەلە قۆناخی ڕفاندنەکەدا کامە دەوڵەت چ جۆرە ڕۆڵێکی بینیوە. ئەگەر بخوازرێت لە داهاتوودا دەتوانم بەشێوەیەکی زارەکی و نووسراو لەگەڵ شاهیدەکان وەڵامی پرسیارەکان بدەمەوە. ئەگەر وەکو پوختەیەکی کورت دووبارەی بکەمەوە:

ا ـ قۆناخی ڕفاندنی من و هەڵوێستی لە یاسا بەدەر، ئەم قۆناخە لە ڕێکەوتی ٩ی ئەکتۆبەری ١٩٩٨ لە فرۆکەخانەی ئەتینا لەکاتی پێشوازیلێکردنم دەستیپێکرد، لە جیاتی پەرلەمانتەری دۆست پادۆفاس کە کۆنە وەزیرە، ستافراکیەری سەرۆکی ئیستخبارات کە نازناوەکەی پابی یە لەگەڵ کالاندریس ی نازناو عەگید کەخۆی بەدۆست دەزانێ، پێشوازیان لێکردم. سەرباری ئەوەی ئاماژەم بەوەکرد کە دەخوازم داوای پەنابەری سیاسی بکەم و مافی ئەوەم هەیە، کاتێك گوتیان زەبر بەکاردێنین، بەرەو مۆسکۆ ڕێگام گرتەبەر. لە مۆسکۆ لەلایەنی جیرنۆفسکی پەرلەمانتەر پێشوازیم لێکرا. نوێنەری پارتیمان نومان ئوچار بوو. دوایی پێیان ڕاگەیاندم کە بریماکۆڤ سەرۆك وەزیران گوتوویەتی هەرە زێدە دەتوانێ نۆ ڕۆژ بمێنێتەوە، ئەگەر نەڕوات بەزۆر دەینێرین. لەم ماوەیە لە ماڵی میترۆفانۆف ی پەرلەمانتەر مامەوە. قۆناخی مۆسکۆ کە ٣٣ ڕۆژی خایاند، کاتێك حکومەت پێویستی ئەو بڕیارەی دومای جێبەجێ نەکرد کەبە ٢٩٨ دەنگ بەرامبەر یەك بڕیاری سەبارەت بە پەنابەری سیاسی مندا، بەرەو ئیتاڵیا کەوتمە ڕێ. کاتێ چاوەڕوانی دۆستایەتی بووم، دەستگیر کرام. دواتر دادگا کۆتایی بە دەستگیرکردن هێنا. بەڵام لە ژێر گەمارۆیەکی دژواردا هێڵرامەوە، هەموو ڕێگایەك بۆ ڕفاندنم تاقیکرایەوە. دوای ٦٦ ڕۆژ لە یەکەمین دەرفەتدا لە دەرکەوتن بەولاوە چارەیەکی دیکەم نەما. لەم قۆناخەدا پارێزەری ئیتاڵی و وەرگێڕم هەبوو. دەتوانن هەموو ڕووداوەکان

روونبکەنەوە. پەرلەمانتار و پارێزەرم پیاپیسا و ئەحمەدی وەرگێڕ شایەدی هەموو رووداوەکانن. کاتێك دووبارە هاتمەوە مۆسکۆ، سەرباری ئەوەی خۆیان پەیمانیان دابوو، بەڵام منیان خستە نێو رەوشێکی دژوار. ئەوانەی وەکو وەزیر بە ناوی ئەمریکا و ئیسرائیل هاتنە مۆسکۆ مادلین ئولبرایت و شارۆن بوون. قەرزەکانی IMF گفتوگۆ دەکرا. پرۆژەی شەپۆلی شینیش لە رۆژەقدا بوو. وابزانم بۆ تەسلیم کردنەوەی من سەبارەت بە قەرزی IMF و پرۆژەی شەپۆلی شین لەگەڵ بەرێوەبەرایەتی مۆسکۆ رێککەوتن.

وەکو دوا وێستگە، کاتێك جەنراڵی خانەنشین "ناکزاکیس" و وەرگێڕ "ئایفەر کایا" فرۆکەیەکی تایبەتیان هێنا، لە پەترۆگراد چووینە ئەتینا. دوای تێپەڕبوون بە رێگای کەسایەتی تایبەت (لە فرۆکەخانە)، شەوێك لای هاوڕێی ناکازاکیس مامەوە. ئێوارەکەیتر کاتێك بە ئامانجی چاوپێکەوتن لەگەڵ وەزیری دەرەوە پانگالۆس چوومە شوێنێك دیسان چاوم بە "ستاڤراکیس"ی سەرۆکی ئیستخبارات کەوت. خرابوومە نێو تەڵەزگەوە. بە زۆر منیان بردە شوێنێك دوای ئەوەی شەوێك بە فرۆکە لە ئاسمان گەڕاین و سوڕاین، لە دوورگەی کۆرفۆ دابەزێنرام. میدیای ئەوروپا دەیگووت "ئەم شەوە تەواوی فرۆکەخانەکانی ئەوروپا بە رووی ئاپۆ داخرابوو". سەرۆك وەزیرانی روسیاش بە ناوی کۆمەڵەی دەوڵەتە سەربەخۆکان قەدەخەی کردبوو. ئاشکرابوو کە لە ئاستی هەرە باڵادا بڕیارێك وەرگیرابوو. دوایی روون بۆوە کە ئەم بڕیارە بە نهێنی لە سویسرا وەرگیرابوو. ئەو هێزەی بڕیاری دەرخستبوو یەکینەیەکی دەرەوەی یاسای شێوازی گلادیۆی ناو ناتۆ بوو کە لە ژێر کۆنترۆڵی ئەمریکایە. هەروەها ئەمەش راستینەیەکە کە دواتر ئاشکرا بوو، هەمان یەکینە لە کینیا رفاندنی منی پیلان کرد. هەروەها لە راگەیاندندا ئاماژە بەوە کرا کە ئیستخباراتی ئینگلترا رۆڵێکی کاریگەرانەی لەمەدا بینی. حکومەتی یۆنانیش لەمیانەی پشت بەستن بە دۆستایەتی ساختە رۆڵی ماشەی بینی. باوەڕیم بە کالاندەریس هێنا کاتێ بە ناوی حکومەتی یۆنان پێی گووتم، لە ماوەی ١٥ رۆژدا پاسپۆرتی کۆماری باشووری ئەفریقیا ئامادە دەکرێ، بۆ ئەوەش مانەوەت لە باڵیۆزخانەی یۆنان لە کینیا بۆ ئاسایش باشتر و گونجاوترە، بەمجۆرە بەرەو کینیا رفێنرام. سەرباری ئەوەی حکومەتی یۆنان و "کۆستولاس"ی سەفیر ئاگاداری مەسەلەی رفاندن بوون، بەڵام پێیان رانەگەیاندم. لە رۆژی هەرە دواییدا لەگەڵ هێزی ئاسایشی کینیا رێککەوتن، بە تایبەتیش بە ناوی پانگالۆس متمانەیان دا و گووتیان "دەچینە هۆڵەندا"، باوەڕ دەکەم لەگەڵ کاریگەری ماددە سڕکەرەکانیش منیان بۆ فرۆکەخانەیەك رفاند، سەرکەوتن لەوەی تەسلیمی یەکینەیەکی تایبەتی هێزی ئاسایشی تورکیام بکەنەوە کە لە ٢ی شوباتەوە ئامادەکاری خۆیان کردبوو.

دواتر نوێنەری تایبەتی سەرۆکی ئەمریکا "بلینکن" بۆ میدیای راگەیاند کە ئەم ئۆپەراسیۆنە بە فەرمانی تایبەتی بیل کلینتۆن ئەنجام دراوە. تەنانەت ئەم پوختە باسەش زۆر

بە ئاشکرا نیشان دەدات کە سەرباری ئەوەی داوای پەنابەری سیاسی لەسەفارەتی ئیتاڵیا و یۆنان پەسند کرابوو، بەشێوەیەکی فـورس حوکمەکانی پەیمانی مافی مرۆڤی ئەوروپا پێشێل کراوە و رفاندنی من لەمیانەی چ جۆرە پێشێلکارییەکی یاسا ئەنجامدراوە. لەو شوێنەی کەبەزۆر تەسلیم کرام، خودی کۆستاڵۆس پێی گوتم: ئەو داواکارییەی پەنابەری کە لەباڵیۆزخانەی یۆنان لە کینیا پێشکەشت کردووە پەسند کراوە و پەیڕەو دەکرێت. لەمیانەی پارێزەرێك کە لە ئەتیناوە هاتبوو هەوڵم دەدا ئەم کارە بەڕێوەببەم. تەنانەت لەکینیاش لە چوارچێوەی پەیمانی مافی مرۆڤی ئەوروپادا بووم. هەربۆیە پەسندم نەکرد بەزۆر لە باڵوێزخانە دەرم بخەن و بەرامبەریان بەرخودانیم کرد. بەکورتی لەماوەی نێوان ٩ی ئۆکتۆبەر تاوەکو ١٥ی شوبات دەبووایە حوکمەکانی پەیمانی مافی مرۆڤی ئەوروپا دەرهەق بە من پەیڕەو بکرێت. هیچ یەکێك لەم وڵاتانە روسیاشی تێدا، دەسەڵاتی ئەوەی نییە ئەو مافانە پێشێل بکات کە پەیمانی مافی مرۆڤی ئەوروپا دانی پێداناوە. تەفلی ئەو سەرلێدانەی پارێزەرەکانم دەبم کە دەرهەق بەم دەوڵەتانە پێشکەشی دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپایان کردووە. تەفلی ئەوە دەبم کەبەر لە دۆزی ئیمراڵی، ئەو داواکارییە لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێت کە سەبارەت بەم وڵاتانە واتە یۆنان، ئیتاڵیا و روسیا ئەنجامدراوە. بەڵام دوای ئەوەی رووی شاراوەی مەسەلەی رفاندنی من ئاشکرابوو، ئەوا ئاشکرا دەبێت کە دەستگیرکردنم لەگەڵ پەیمانی مافی مرۆڤی ئەوروپا ناکۆکە.

ئاشکرایە کاتێك منیان تەسلیمی تیمی تورکیا کرد گرێدانیان بە هیچ رێسایەك نەما، سەبارەت بەم بابەتە هیچ بەڵگەنامەیەك لە ئارادایە، هەروەها رووداو لە چوارچێوەی سنوورەکانی ئەوروپا روویداوە، هەربۆیە بەئاشکرا حوکمەکانی پەیمانی مافی مرۆڤی ئەوروپا پێشێل کراوە. لەسەر ئەم بنەمایە ئەنجامگیربوونی مەسەلەی دانیشتنەکانی ئیمراڵی بەوەی لەبەرئەوەی لە بناخەی یاسایی بێبەشە، "داوا نییە" یاخود " پێکنەهاتوە" دەبێتە پێویستیەکی گرێدان بە یاسا. بڕیارێکی پێچەوانەی ئەمە بێتە دژی پەیمانی مافی مرۆڤی ئەوروپا دەبێت. هەتا ئەمە بەو واتایە دێت کە دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپاش دەبێتە ئەڵقەیەکی ئەم زنجیرە و، یاساش دەبێتە ئامرازی پیلانگێری قۆناخی رفاندنی من، باوەڕیم وایە کە دادگای باڵا ئەمە پەسند ناکات. جارێکی دیکە ئومێد و باوەڕی خۆم سەبارەت بەوە دیار دەکەم کە دادگای باڵا هەڵوێستێکی واتادار بەرامبەر بوویەری رفاندن نیشاندەدات کە ئەویش پەیوەندیدار دەکات، بڕیارێکی مێژوویی دەدات کە شایستەی مێژووەکەی بێت.

ب ـ سزای لە سێدارەدان و بەکارهێنانی وەکو ئامرازێکی فشار و هەڕەشە دژ بەگەل کورد، لەگەڵ ئەوەی باوەڕیم وایە کە لەلایەنی یاساییەوە پێویستە ئەم دۆزە بەتەبوو دابنرێت، بەئامانجی ئەوەی ئاگاداری هەندێ زانیاری ببن، ئەوا ئەنجامدانی هەندێ هەڵسەنگاندن سەبارەت بە سزای لە سێدارەدان، بایەخدار دەبینم.

سزای مەرگی من لە ڕێککەوتی ٢٨ی حوزەیرانی ١٩٩٩ بوو. ئەم مێژووە ساڵرۆژی لە سێدارەدانی شێخ سەعیدی رێبەری پاخیبوونی کوردانی ساڵی ١٩٢٥ ـە هەروەها لەمەش گرنگتر، ١٥ی شوبات رۆژی تەسلیمکردنی من بە تورکیا، رۆژی دەستپێکردنی پاخیبوونی شێخ سەعیدە. هەردوو مێژووش بە ئەنقەست هەڵبژێردراوە. واتە دەیانخواست ئەمە بە گەلی کورد بڵێن: هەرچەندە سەرهەڵدان بکەن ئەنجام ناگۆڕێت. سلێمان دیمرێلی سەرۆك کۆمار لە گووتەیەکی خۆیدا دەیگووت" ٢٨ پاخیبوون ئەنجامدرا، هەمووی سەرکوت کرا، دواپاخیبوونیش هەمان چارەنووس بەخۆیەوە دەبینێ". ئاشکرایە کە پیلانکردنی سیناریۆیەکە بۆ کۆن دەگەڕێتەوە، دوایی پێم زانی کە ئیسرائیل، ئەمریکا و یۆنان لە ساڵی ١٩٩٦ تەفلی ئەم سیناریۆیە بوون. لەوانەیە لەچاوەڕوانی و ئامانجەکانیان جیاوازبن، بەڵام لە پاکتاوکردنی من بەرژەوەندییان هاوبەش بوو. تاوەکو بڵێی کاریگەریەکانی ئەوانەم لەسەر کوردان و بزاڤی ئازادی کوردان سنوودار کردبوو. تەواوی ئەو لێکدانەوانەی لەسەر بەکرێگیراوان کردبوویان پووچەڵ کرایەوە. هەربۆیە هەموویان بە کین بوون. لەبەرئەوەی ئەو لێکدانەوانەی ٤٠ ـ٥٠ ساڵە لەسەر سەدان کەس و گروپی کوردستان، لەسەر رووی هەمووشیانەوە لە سەر بارزانی و تاڵەبانی دەیکەن، بەهۆی من بێکاریگەر بوون، هۆکاری ماددی بنگەی پیلانگێری دژ بە ئاپۆیە. کارتی کوردان بەردەوام پێویستیەکی ژیانییە و دەیانەوێ بە دەستیانەوە بێت. هەرگیز پەسندیان نەدەکرد بەهۆی من ئەم کارتەیان لەدەست دەربکەوێت. لە گەوهەری خۆیدا لەسەر ئەم بنەمایە لەگەڵ بەرێوەبەرایەتی تورکان رێککەوتن. پاکتاوکردنی ئاپۆ بۆ هەموویان سوودمەند بوو. تەنانەت بۆ سوریاش زۆر قورس بوو. یاریدەدری سەرۆك کۆمار عەبدولحەلیم خەددام لە چاوپێکەوتن لەگەڵ رۆژنامەیەکی تورکیدا گوتبووی" عەبدوڵڵا ئۆج ئالان کاریگەری دەکاتە سەر کوردەکانی سوریا، ئێراق و ئێرانیش، هەربۆیە ئیتر ئێمەش نەمانەخواست، لەمەسەلەی PKK هەمان رێبازمان هەیە".

حکومەتی یۆنان و کلینتۆن ساڵی ١٩٩٦ لەسەر ئەوە رێککەوتبوون کەپاکتاوکردنی من گونجاوترین رێگایە تاوەکو بزاڤی کورد بکەوێتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیان. لە راستیدا بەکرێگیراوەکانیان بێکاریگەر کرابوون. ئیتر نەیاندەتوانی سیخوڕێکی کورد بەکاربهێنن. ئەڵمانیا بەهۆی هۆکاری زۆر ریشەدارتر بەرامبەر من کیندار بوو. غروری ئەڵمانی کەسایەتی منی هەرس نەدەکرد. پێچەوانەی ئومێدە باوەکانیان بووم سەبارەت بە میزۆپۆتامیا.ئینگلتەرە، فەرەنسا، سوێد و روسیا و دەوڵەتانی دیکە هۆکاری هاوشێوەی ئەومیان هەبوو. راستی پێکهاتەی هەزرم لەگەڵ هیچ یەکێکیان نەدەگونجا. تەنیا ئیتاڵیا لەبەرئەوەی تازە نزیکی مەسەلەکە دەبۆوە، بێ ئەزموون بوو. کاتێك بۆ ماوەیەکی کورت لە ئیتاڵیا مامەوە بەو ئەنجامە گەیشت کە رزگاربوون لەمن گونجاوترین رێگایە. لەراستیدا مەزنترینی ئەوانەی بەرژەوەندییەکانی خۆیان لە جیهان بەکاردەهێنن، هەم لەلایەنی چینایەتی، هەم نەتەوایەتی، تەنانەت

نێودەوڵەتیش هاوبیربوون سەبارەت بەوەی من لە بواری سیاسی و ئابوورییەوە بەگرانی لە سەریان دەوەستم. نەیاندەخواست لینینی دووەم بخولقێنن. بەڵام تاوەکو دوایی رێگای بوون بە عیسای دووەمیان ئاوالا دەکرد. پێ بە پێی تورکان بەو باوەڕییە گەیشتبوون کەلەوانەیە ببم بەگەورەترین دوژمنیان لەمێژوودا. لە راستیدا پاشەڕۆیەتی باو و شۆڤێنیزم لە کەسایەتی مندا تواناکاری بەرژەوەندییان بەدەست هێنابوو. چەپی تورك ئەوەی خستەڕوو کە لە پێکهاتەیەکی دیموکراسی و یەکسان دوورە. بەکرێگیراوی کورد لە تەواوی پارچەکانی کوردستان پێ بە پێ زیاتر باوەڕییان دەکرد کە هەڵنێر لە نێوانماندا هەیە.

بەپوختی، تەواوی هێزە باڵادەستەکانی ناوخۆ و دەرەوەی سیستەمی ئاولکراو لە پاکتاوکردنی مندا هاوبیر بوون. ئەگەر لە میانەی پێڕەو و شێوازی پیلانگێڕی و بەدەر لە پاساش بێت، هەوڵیاندەدا بەیەکەوە فەرمانی مەرگی من بنووسن. هەندێ کەس، دۆستان و هەڤاڵان لەوانەیە سەرسوڕماو بمێنن، بەڵام پێویستە ئەم وەڵامە گشتییەیان پێبدەم: "حەزرەتی عیسا رەوشێکی وەهای نەبوو ستراتیژ و تەکتیك پێشبخات". لەرێی کاهینە فەرمیە یەهودیە بەکرێگیراوەکانی رۆما، گرتنەبەری کاروانی قودس، یەکەمین رێگای چالاکییە کە شایستەی مێژووەو ئەنجامگیر دەبێت. دواتر تەماشام کرد: لەم خاکەدا چەندە چارەنووس لە یەکتر دەچێ، کەسایەتییەك کاتێ بەرامبەر جیهانی باڵادەستی قۆناخ سەرهەڵدەبرێ تاج رادەیەك نزیکی پێغەمبەران دەبۆوە! کەواتە قۆناخی هاوشێوە رۆح و کەسایەتییەکی هاوبەشیان هەبوو. لە هەلومەرجی جیاوازدا، بە شێوەی جیاواز لەکاتی لێکچووی مێژوودا نوێ دەبۆوە. هەلومەرجەکان بە خێرایی منیان بەرەو ئەو ئەنجامە دەبرد. ئاشکرا بوو کە بڕیار بڕیاری مردن دەبێ، پراکتیزەکردنی گەلێك سەرنێشەی دەناپەوە. تەنانەت والی رۆمایی پلاتۆسیش سەبارەت بەحەزرەتی عیسا لایەنگری لە خاچدان نەبوو. کاهینە یەهوودییە بە کرێگیراوەکان ناچاریان کرد. تەنانەت گلگامێشیش لایەنگری کوشتنی خمبابای پاسەوانی دارستان نەبوو. ئەنکیدۆی بە کرێگیراو ناچاری کرد بیکوژێ.

ئاشکرا بوو کە بڕیاری مردن بە ئامانجی سیاسی بەکاردەهێنرێ. بەتەواوەتی ئەمە وەکو پارچەیەکی پیلانگێڕی هەڵناسەنگێنم. تەنانەت بە ئامانجی نیازی باش و ئاشتی، تەنانەت بە زیادبوونی ئەو کەسانەی کە خاوەن مێشکێکی دروستن دەتوانرا وەکو بەردێکی بناغەی رێککەوتنی دیموکراسییانە بەکاربهێنرێت. هەڵسەنگاندنی ئەم نزیکبوونەوەیە وەکو لەمیستۆکێك، تەنیا دەشێ کاری ئەوانە بێت کە بەرژەوەندیان لە پیلانگێڕیدایە. هەربۆیە ئاشکراش دەبن.

دەبێ ئاماژە بەوە بکەم کە من بەخۆشم تەواو بڕیارم لەسەر راستینەی ژیان یان مردن نەداوە. ئەم لایەنە زۆر روون و ئاشکرایە کە ئەگەر بە راستی بوویم بە کەسایەتییەکی کۆمەڵگاری، مەردایەتی تاك و مەیدان خوێندن بۆ مردن، نەدەبوو بەو شێوازەی چالاکی کە

راستەوخۆ پەنای بۆ ببەم. لە کاتێکدا دادگا بڕیاری مردنی دەدا، دادگەر تونجای ئۆکتای قەڵەمەکەی خۆی نەشکاندو ناچاردەبوو نارەزایی خۆی بەرامبەر سێدارەدان نیشان بدات. بەراستیش لوغزێکە، ئایا مەسەلەی مردنی من چۆن دەبێت. بووە بە کارتێکی سیاسی مەزن. مەترسیەکان دەیگووت وادێنم. PKK و کوردان مێژووی سەرهەڵدانی نوێیان بە گوێرەی ئەنجامەکانی بڕیاری لەسێدارەدان ئامادە دەکرد. ناوەندە کۆنەپەرست و شۆڤێنیستەکانی تورکان جێبەجێکردنی بڕیاری لەسێدارەدانیان وەکو پروپاگەندە و پرۆسەیەکی هەڵبژاردن هەڵدەسەنگاند و بەکاردەهێنا. سۆزو هەستەکانی تۆڵەسەندنەوە لە هەردوولا هەڵسابووە سەرپێیان. تەواوی هێزە دەرەکییەکان ئەگەر و ئەنجامەکانی بڕیارەکەیان هەڵدەسەنگاند. ئاشکرایە کەزۆر لەولاوەی ئەندێشە و لێکدانەوەی کەسێتیەکان دەبووایە بە بەرپرسیارێتی بجووڵێمەوە. هەڵسەنگاندنی هەر رۆژێکی تێیدا دەژیم بەگوێرەی پێویستیەکانی رێککەوتنێکی دیموکراتییانە و ئاشتییەکی شەرەفمەندانە، راسترین هەڵوێست بوو. قورسایی دانە سەر بەرژەوەندییەکانی خۆم، هەم لە بواری سیاسی، هەم ئەخلاقی، راست نەدەبوو. هەربۆیە نەدەبوو پەیامی وەها بدەمە دەوروبەرو ناوەندەکانمان کەلە چاوەڕوانیدا بوون و رێگا لە پێش ئەنجامی خراپ بکاتەوە. نەدەبووایە لە میانەی تەکتیکی سادەوە PKK بەرێوەببەم. بۆ حیسابی وەها تەسك هەم تواناکاری نەبوو، هەم دەبوو بە هەڵوێستێکی چەوت.

بەرامبەر بەمردن هەوڵمدا ئەو هەڵوێستە بە بنەما بگرم کە بە هەڵوێستی سوکرات ناودەبرێ. تەنانەت واتادارکردنی مردنیش، تەنانەت دۆزینەوەی واتای فەلسەفەی مردن کەبۆ چییەو چۆنە، مەزندەم نەدەکرد هێندە بژیم. لە ژێر بڕیاری مردن کەوەکو شمشێری دیموکلیتس لە سەرم دەهەژێنرێ لە نێو ئاسوودەییەوە پێشوازی لە هەڵکشانی مەزنی رۆح دەکەم کە پەرەسەندنی مەزنی واتا زیاد دەکات. شێوەیەکی ژیان واتادار کرا کە بە شێوەیەکی ئاسایی چەند هەفتەیەك بەرگەی ناگیرێت و تەنانەت بەردیش بێت دەتەقێ. لە راستیدا نەك مردن من شیبکاتەوە، بەڵکو من مردنم شیکردەوەو چارەسەرم کرد. نەك بڕیاری مردن من بێکاریگەر بکات، من بڕیاری مردن و شێوازە هێزەون و بێخێرەکەیم بێکاریگەر کرد. لەکوێوە و چۆن دێت بابێتە ئەگەر سبەینێ بێت یاخود لە ساڵانی داهاتوودا بێت، ئیتر مردن بۆمن بابەتێکی جدی نییە. تەنانەت بە هێزێکی واتاداری وەها گەیشتوومە بڵێم بەخێرو سەفا بێت. کێشەو گیروگرفت روونکردنەوەی ئەم راستینە بوو بۆ گەلەکەمان، دۆستان، PKK و دەوڵەت. بەپێی هێزم و تواناکاریەکان هەوڵمدا ئەمە ئەنجام بدەم. بە شێوەیەکی رێژەیی پەرینەوە لە فەلسەفەی" بمرە ـــ بکوژە" بۆ فەلسەفەی "بژی و بژێنە" بەشێوەیەکی بەرفراوان بەرێوەبرابوو. ئەگەر لایەنەکان خەبات بکەن، ئەوا دەتوانن بە شێوەیەکی هاوبەش لە نێو ئاشتییەکی شەرەفمەندانە خاوەندارێتی لە سەرکەوتن بکەن.

ئەمانە پێشکەوتنی پۆزەتیف بوو. پووچەڵبوونەوەی نیازە خراپەکانی پیلانگێڕی و گووتەی " لەنێو هەر خراپیەکدا باشە هەیە" پێکهات. بێگومان وەکو بەرهەمی ئەزموونی پۆزەتیفی مرۆڤایەتی، پەیمانی مافی مرۆڤی ئەورووپا کە بێگومان بەرهەمی ئەزموونی باشەی مرۆڤایەتی و بەڵگەیەکی هاوچەرخی یاسایە، بەهۆی ناکۆکبوون لەگەڵ ماددەی (٢) لێکۆڵینەوەی لەسەر ئەم بڕیارە وەرگرتە رۆڵ لە وەستاندنی ئەم بڕیارە دەبینێ. لەراستیدا ئەم بڕیارە دەرگایەکی بەختی لە پێش دەوڵەت و سیاسەتی تورک کردەوە کە لەنێو بنبەستبوون دایە.

لەلایەنێکەوە دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپا بووە بە ناوبژیوان. بانگەوازی بۆ لایەنەکان دەکات کە پێویستیەکانی یاسای گەردوونی پەیڕەو بکەن. لە کاتێکدا بانگەوازی بۆ کوردان دەکات" دەست لە یاخیبوون بەربدەن"، بە دەوڵەتی تورکیاش دەڵێ " بەدوای دەرگای چارەسەری یاسای دیموکراسییانەی کێشەکان بگەڕێ". تەواوی ئەم راستیانە بە شێوەیەکی ئاشکرا نیشاندەدات کە ئەو مەسەلە و تایبەتمەندێتیانە مێژوویی و سیاسیە قووڵانەی لە ژێر بڕیاری مردنی شاراوەیە، تیرۆریستێك نییە. دۆزی من و بڕیاری پەیوەندیدار بە سزای مردن، بووە بە گرنگترین فاکتەری پێشخستنی یاخود راوەستانی پەیوەندی نێوان ئەورووپا و تورکیا. تەنانەت ئەم لایەنەش ئاماژە بەوە دەکات کە رێگای تەقلیبوون و قۆناخی شارستانییەتی دیموکراتی هاوچەرخ بە کوێدا تێپەڕ دەبێت. لەسێدارەدانی کوردان، لە نێو بردنیان، بە نەبوو لە قەڵەمدانیان، بەواتای داخستنی گرنگترین دەرگاکانی جیهان دێت. شایانی باسە وەکو پێویستیەکی سەردەم، ئیتر خودی کوردان لە ئاکامی بڕیاری مردن لە جیاتی کپ بوون، هەموو راستیەکانی هەڵسانە سەرپێیان بەدەست هێناوە. بەڵکو لە جددیترین کێشەی مێژوودا، لە بڕیارێکی مردندا حوکمێکی وشیاری و ئارامی نیشاندەدات، ئەم رەوشە دەکات بە بیانووی ئاشتی و ئازادی و بڕیاری ژیان. ئەگەر سەرجەم لایەنەکان بە قووڵیی سەبارەت بابەتەکە بیربکەنەوە، ئەوا لە هەموو خراپیەکدا لەوانەیە رووبەڕووی بە پیتترین بەرهەمی خێر ببنەوە. تەنیا بە پووچەڵکردنەوەی نیازی لایەنە تاریکەکانی پیلانگێڕیەکی بێخێر ناوەستێ، دەبێتە خاوەن شانسی گەیشتنی لایەنەکانی خێر بە سەرکەوتن. هەروەکو بڵێی بۆ یەکەمین جارە لە میانەی بڕیاری ژیانی ئاشتی ئازادانە بڕیاری مردنی لە ئیمرالی دەرگەوت هاوسەنگ دەکات. تێکۆشانێکی گرێدراو بە ئاشتی و رێککەوتنی دیموکراتییانەو یاسا هەموو شتێك دیاردەکات.

لەسێدارەدانی شێخ سەعید و هەڤاڵەکانی رێگای لە پێش سەرەڕۆیی کۆمار و نکۆڵی و توانەوەی زۆرەملێ لە پەیوەندی کورد ـــ تورك کردەوە. بە شێوەیەکی ریشەیی پەیوەندی نێوان هەردوو گەل زیانی بەرکەوتووە کە بەیەکەوە جێگایان لە رزگاری نیشتمانی گرت. کۆمار شانسی دیموکراتیزەبوونی لە دەستداوە. یەك لەدوای یەك یاخیبوونەکانی ئاگری و دێرسیمی هێناوەتە ئاراوە. هەندێ بەرپۆەبەر لەسەرووی هەموشیانەوە مستەفا کەمال و عیسمەت

نینۆنۆ دەرکیان بەوەکردووە کە کێشەکان بەم شێوازە چارەسەرنابن. رۆڵی سیاسەتی " کەرویشك رابکە، تاژی بیگرە" ئینگلتەرای هێزی سەرەکی ئیمپریالیستی ئەم قۆناخە لەم رووداوەدا هەیە. ئینگلتەرا یاری بە هەردوو لایەن کرد و سیاسەتی موسڵ ـ کەرکوك ی بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە بەرێوەبرد.

دوای ٧٥ ساڵ ئینگلتەرا خواستوویەتی لە رێگای هەمان سیاسەتەوە بۆ ئەوەی سەرکەوتووانە لێکدانەوەکانی خۆی سەبارەت بە ئێراق بەرەو بکات کوردان و بەرێوەبەرانی تورك بەکاربێنێ. لە دادگادا گوتبووم" پێویستە جارێکی دیکە ١٩٢٥ بێنمەوە یاد"و جەختم لەسەر ئەوە کردەوە کە پێویستە پەندو ئەزموون لە مێژوو وەربگرین و ئەمەراسترین رێگایە. بانگەوازیم بۆ هەردوو لا کردبوو کە پێویستە ئەمجارە هەردوولایەن ئەوەی دەکەوێتە ئەستۆیان جێبەجێی بکەن لە پێناو گۆرینی یاخیبوونی کوردان و بریاری مردن بۆ برایەتی واتادار و ئاشتییەکی شەرەفمەندانەی کۆمار. تاوەکو ئیستاش دەقی بەیاننامەی ئاشتی و رێککەوتنی دیموکراتیانەی ٢ی ئابی ١٩٩٩ بەیرەو دەکرێت و بەردەوامە. بە شێوەیەکی سەیر مێژوو لە دووریانی، یان شەر، یان ئاشتی بە هەڵواسراوی ماوە. هێزی PKK لە هەموو کاتێك زیاترە و دەتوانێ شەرێکی بەرفراوان بەرێوە ببات. ئاشکرایە کە وزەی شاراوەی گۆرانکارییەکی خراپیش لەخۆوە دەگرێت کە سەدەی بیست و یەکەمیش لە دەست دەدات.

بۆ من زەحمەتی ئەوەیە کە بەشێوەیەکی هێندە قووڵ لە ژێر کاریگەری دووریانی شەر و ئاشتی دام. لە ژێر بریاری مردن بە پۆزەتیڤی ئەنجامگیرکردنی دووریانی بەمجۆرە پێویستی بە سەبرێکی مەزن و هێزی چەمکێکی راست هەیە. بەلام دیسان بە بناخە گرتنی سیاسەتە سەرەکییەکانی PKK و دەوڵەت بە گوێرەی بریاری مردنی من مەترسی مەزن لە خۆوە دەگرێت. ئەمانەش تەنیا بەرادەی ئەوەی هێزەکانی بەرگری رەوای PKK ئاشتی بکەنە ناچاریەك، پێویست دەکات لە سەر بنەمای رازی کردنی دەوڵەت و کۆمەڵگای تورکیاو قازانج کردنیان بکاتە ئامانج و بە هێزێکی چەندایەتی و چۆنایەتی بگات. هیچ ئاشتیەك بەبێ هێز بەدی نایەت. ئاشتییە واتادارەکان گرێدراوی جدیەت و پێکەگرتن و وزەی شاراوەی هێزەکانە. گۆرینی شێوازی شەرێك کە سەرکەوتوو و ژێر کەوتووی نییە بۆ ئاشتی قازانجی بۆ هەرتوێژێك دەبێ. ئامانجی هەموو کەسێك ئەوەیە پەیوەندی کورد ـ تورك لە میانەی لایەنی ئاشتی دووریانەکەدا بکەوێتە سەر راستەرێی برایەتیەکی مێژوویی. پێویستە لە بەرێوەبردنی تەواوی دیموکراسی و ئاشتیەکی شەرەفمەندانە بەدوای یەکێتیدا بگەرێن. لە راستیدا ئەم هەڵوێستە پێویستییەکی رۆحی "قیوای میللیە" کە لە ساڵانی ١٩٢٠ بناخەی کۆماریان دانا. کوردان هێزێکی ستراتیژی ئەم سەرکەوتنە بوون. پێدانی ئەو شوێنەی کە مافی خۆیان بوو لە لایەن کۆمارەوە، قەرزێك و پێویستیەکی سروشتی دامەزراندنە.

لە کاتێکدا ئەوروپا لە لۆزان کۆماری ئەرێ کرد، عیسمەت ئینۆنۆش بە شێوەی" ئێمە کوردان و تورکان بەیەکەوە..." هەڵسەنگاندنی دەکرد، ئەوەیسروشتی بوو، بەلانی کەمەوە

بەرچاو گرتنی داواکاریە کولتوورییەکانی کوردان بوو. بەمجۆرە کۆمار لە هەڵەیەکی مێژوویی دەگەڕێیەوە. شەڕێکی بەرفراوانی نێوان کورد ـــ تورک یش گرێدراوی ئەم بڕیارە بەهەڵواسراوی ماوە. دیموکراتیزەبوونی کۆماری تورکیا وکێشەکانی تەفلیبوونی یەکێتی ئەوروپا بەبڕیاری مردنی منەوە بە هەڵواسراوی ماوەتەوە. تەواوی گۆڕانکاریە پۆزەتیف یاخود نێگەتیفەکان گرێدراوی چارەنووسی ئەم بڕیارەیە. یەکێتی ئەورووپا و پەیمانی مافی مرۆڤی ئەوروپا کە چوارچێوە یاساییە سەرەکییەکەیەتی دەتوانن رۆڵی ناوبژیوانێکی دادوەرانە ببینن لەوەی رەوش بەلایەنی پۆزەتیف بەرەو پێش بچێت. بە شێوەیەکی بنەڕەتی نەهێشتنی ریشەی مەترسیەکانی شەڕ گرێدراوی بینینی ئەم رۆڵەیە بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە. پێویستە کۆماری تورکیاش لەلایەنی خۆیەوە وەڵامی ئەم چارەسەرییە دادوەرانە بداتەوە کەپێویستیەکی یاسای هاوچەرخی خۆیەتی.

بە درێژایی مێژوو کوردان خزمەتی تورکانیان کردووە. ئاشێ بەرامبەرەکەی نکۆڵیکردن و پێپەشکردنی بێ لە تەواوی مافە هاوچەرخەکان. تەنانەت بەکارهێنانی بڕیاری مردن وەکو شمشێری دیموکلیتس بە هیچ جۆرێک نابێت. برایەتی پێویستی بە چی بێت دەبێ مەزنایەتیەکەی بسەلێنرێ و نیشانبدرێت. پێویستە PKKش بەو رادەیەی ئاشتی بەدیدێنێت هێزی سیاسی و سەربازی خۆی بخاتە روو. لە هەمانکاتدا پێویستە ئەوەش بسەلێنێ کەچۆن یەکپارچەیی وڵات و یەکێتی دەوڵەت متمانە و گەرەنتیەکی چەندە پتەون. ئەگەر ئەمانە لەگەڵ یەك ناکۆکیش ببینرێ، نابێ ئەوە لە بیر بکرێت کە هەریەکێتیەك لە سەنتێزی ناکۆکیەکان پێکهاتووە. ئیتر پێویستە ئەمە پەسندبکات کە سەرلەنوێ ئاوالکردنەوەی کۆمار لە سەر بنەمای دیموکراتیەت، تەنیا لەم چوارچێوەیەدا لە رێگای رێککەوتنی دیموکراسییانە و ئاشتی کوردان ئەنجامدەدرێت. دەبێ ببینرێ کە جگە لەمە بە هیچ بژارێکی دیکە سەدەی بیست و یەك قازانج ناکرێت.

شەڕی مردن ـ ژیان کە چل ساڵە لە سەر کەسایەتی من بەرێوە دەبرێتە کەوتووەتە نێو دوا قۆناخی خۆی. لە راستیدا ئەنجامگیربوونی ئەم قۆناخەی لە میانەی پێگە گرتنی تەواوی هێزە نەتەوەیی و نێو نەتەوەییەکان لە ئارادایە بەلایەنی یەکپارچەیی دیموکراتییانەی دەوڵەت و بەهێزی وڵات، گرێدراوی بڕیاری یەکلایەنەی تەواوی هێزە پەیوەندیدارەکانی کۆمەڵگا، سیاسەت و دەوڵەتە سەبارەت بە بابەتی ئاشتی و دیموکراسی. سەرباری ئەوەی بژاری منیش ئاشتی و دیموکراسییە، بەڵام ئەگەر هێزە خراپەکارەکان بە سووربوونەوە هێرش بێنن و درێژە بە پووکانەوە بدەن، ئاشکرایە کە کۆتایی ئەم کارە شەڕێکی ئازادی شەرەفمەندانە دەبێت.

ج ـــ لینجی سیاسی لە قۆناخی ئیمرالی، لەگەڵ رەچاوکردنی ئەوەی کە دادگای ئیمرالی بەشێوەیەکی ناکۆك لەگەڵ یاسا ئەنجامدرا، لەو باوەڕەدام کەپێشکەشکردنی زانیاری و هەڵسەنگاندنی خۆم سوودمەند دەبێت. بەتەواوی تەقلی ئەو داوایانەی پارێزەرەکانم دەبم

سەبارەت بە پێشێلکردنی ماددەکانی ٢، ٣، ٥، ٦، ٧، ٨، ٩، ١٠، ١٣، ١٤ ی پەیمانی ماف مرۆڤی ئەورووپا. ئەو بەرگرییە بەرفراوانانەی لەم لایەنەوە ئەنجامیانداوە، هەم بە گوێرەی تەکنیکی یاسایە، هەم لە لایەنی گەوهەرەوە دەوڵەمەندە، بەرگرینامەکەیان سەبارەت بە منیشەوە لە جێگای خۆیدایە. من زیاتر هەوڵدەدەم ئەو ڕاستیانە ڕوونبکەمەوە کە لە گەوهەری ئەو بابەتانە شاراوەن کە زۆر ناشازن. هەرچەندە تائێستا زیندانی بم، ڕەوشێکی زۆر سەختە و لە تورکیا تەنیا تایبەت بە منە، لە مێژوودا هەلومەرجەکانی نەگۆڕە و لە دوورگەیەك بە تەنیا دەهێڵدرێم، ئەمەش ڕەوشێکی سەختە. لە تورکیا بەهۆی نارەزایی دەربڕین بەرامبەر شێوەی زیندانی F ، زیاتر لە ٥٠ زیندانی یان لە ئەنجامی هێرش یان مانگرتن تامردن شەهید بوون. ئەو هەلومەرجانەی من تێیدا دەژیم زۆر لە ڕەوشی زیندانی شێوەی F قورسترە. لە هیچ پەیڕەوێکی زیندانەکاندا ماددەی سەبارەت بەم کردارانەیان نییە. مامەڵەیەکی کەیفی و زیندانیەکی تایبەتم لەگەڵ دەکرێ. هیچ کەسێك نابینێ کەچۆن دەژیم. بەردەوام بۆماوەی بیست و چوار سەعات هەم بەکامێرا هەم بە چاو لەلایەن هێزە تایبەتەکانی ئاسایش کۆنترۆڵ و چاودێری دەکرێم کە ژمارەیان دەگۆڕێ و هەر جارە و ژمارەیان لە ٢٠ کەس کەمتر نییە. تەنیا کۆمیتەی بەدواداچوونی ئەشکەنجە کە دەزگایەکی نزیك بە دادگای ماف مرۆڤی ئەورووپایە و ئەو ڕاپۆرتەی لەم بارەیەوە پێشکەشی دەکات دەتوانرێ هەڵبسەنگێنرێ کە تەنیا ئەم کردەوەیان لەڕووی سایکۆلۆژییەوە چەندە قورسە. تەنیا لە ئەنجامی تێکچوونێکی ئاسایی کەش و هەوا، چاوپێکەوتنی هەفتانە لەگەڵ پارێزەرەکان هەندێ جار دوو یان سێ هەفتە تەنیا یەك کاتژمێر دەبێت. تەنیا دوای چەند مانگێك دەتوانم بۆ جارێك چاوم بە برایەك و دوو خوشکەکەم بکەوێت. بە هۆی دووری مەودا وهەژاری، بە شێوەیەکی دیکە چاوپێکەوتن ئاستەمە. حەساسیەتێکی قورسم هەیە، هەلومەرجەکانی ئێرەیش قورستری دەکات، بێگومان کەشی دەریا بەردەوام کاریگەری خنکێنەرانە دەکاتە سەر تەندروستیم. لەم ماوەیەی دواییدا هەر خولەکێك جارێ: ناچار دەبم ئەو بەڵغەمە فڕێ بدەم کە لە قورگم کۆدەبێتەوە. هەروەکو بڵێی لاشە لەدوا قۆناخی بەرخودان دایە. خواردنەکان بەشێوازی (گشتییە) کارافانایە. سەبارەت بە تەندروستیم ناتوانم هیچ شتێك وەربگرم. لەگەڵ ئەمەشدا هەوڵدەدەم لە چوارچێوەی پێوانە مەدەنیەکان لەگەڵ فەرمانداریتی دوورگە و بەڕێوەبەرایەتی زیندان پەیوەندییەکان بەردەوامی پێبدەم. کێشەو گرفتەکانم لەوانەوە سەرچاوە ناگرێت. ئەو ستاتۆیەی پیادەدەکرێت گەورەترین ئامرازی فشاری سایکۆلۆژییە.

لەگەڵ ئەوەی ئەم لایەنانەم هێندە لاگرنگ نییە، پێویست دەکات سیستەمی لینجی سیاسی ڕاستەقینە ڕوون بکرێتەوە. تەواوی دونیا بووە شاهید کە لە قۆناخی دادگادا لەلایەن توێژە شۆڤێنیە بەرگ مەدەنیەکان و ڕاگەیاندنەوە تەواو کەشو هەوایەکی لینچ (سزادانی بێ دادگا) زاڵ کرابوو. تەنانەت لە هۆڵی دادگا ڕەخنەیەکی بچووکیش بەهەموڵ و هەنگاوەکانی لینچ کردن وەڵام دەدرایەوە. ئەگەر تەدبیری تایبەتی سەربازان نەبووایە، ئاشکرابوو کە هەر جۆرە

هۆڤێتیەك ڕوویدات. ئەو تیرۆرەی ڕاگەیاندن لەدەرەوە پەیڕەوی كرد، ئامانجی ئەوە بوو كە بەتەواوی گەلی كورد بترسێنێ و دەست لە دۆزەكەی خۆی بەربدات. دەیانخواست لەوە پەشیمانمان بكەنەوە كە هاتووینەتە دونیا. لەم قۆناخەدا بەسەدان مرۆڤی دۆست و وڵاتپارێز ئاگریان لە جەستەی خۆیان بەردا. لەمیانەی پروپاگەندەیەكی لە پێشینە بە شێوەی ئەوەی لە سێدارە دەدرێم، دەیانخواست هەموو ئومێدێكی ئەو مرۆڤانە بڕووخێنن. هەوڵدەدرێ بۆ ئەوەی بخرێتە ڕەوشی مرۆڤێكی زۆر ئاساییەوە، گرنگیەكی مەزنیان بەوە دەدا لە بەرچاوی گەل بچووك بكرێمەوە. لە ڕێگای شەرۆڤەو كاریكاتۆری سەیرەوە دەخوازرا تەواوی خاڵەكانی بەرخودان لە پەلوپۆ بخرێت. تەنانەت ئەو كەسانەی مەیل و دۆستایەتیەكی بچووكیشیان هەبوو بە توندوتیژیەكی زێدەڕۆییەوە سەركوت دەكرا.ئامانجی سەرەكی سیستەمی فشاری پەیڕەوكراو لە نێوبردنی وشیاری سیاسی وڵاتپارێزی خەڵك و نیشاندانی ئەوە بوو كە دۆزێكیان نییە، تەنانەت گووتنی گۆرانیەك، خوێندنەوەی هۆنراوەیەك سەبارەت بەمن، لەنێو كۆمەڵگادا بەس بوو بۆ لینچ كردن. گووتەی هونەرمەند ئەحمەد قایە كە بەشێوەیەكی ناڕاستەوخۆ بەلایەنی من دەرهەق بە ئاشتی دوو قسەی كرد، بەس بوو بۆ ئەوەی دووچاری لینچی سیاسی بێت. ئیتر نەیدەتوانی لە توركیا بمێنێ. بە خیانەتكار ڕاگەیەنرابوو. دوای ماوەیەكی كورت بەرگەی ئەم ئێشەی نەگرت و لە ئەوروپا شەهیدبوو.

لە ئەنجامی هەوڵەكانمان بۆ ئاشتی و ڕێككەوتنی دیموكراتییانە تا ڕادەیەك ئەم كەشە شۆڤێنیە تێپەڕكرا. ئیتر كۆمەڵگا بە شێوەیەكی واقیعی ناكۆكیەكانی خۆی دەبینی. بینی كە لە میانەی شەڕی تایبەت و ئابووری بەرژەوەندیخوازی چ جۆرە پێشێلكاری و لەرێ لادانێك ڕوویداوە، دەركی بەوە كردووە كە هۆكاری سەرەكی ئەو قەیرانەی لە ئارادایە پێكهاتەی سیاسی بەرژەوەندیخوازە. لەلایەكی دیكەوە، دەوروبەرە بەرپرسیارەكانی دەوڵەت بەردەوام ئەمە وەكو ڕاپۆرت پێشكەش دەكەن كە لەمیانەی پێكهاتە كلاسیكیەكانی قەڕكردن و نكۆڵیكردن دەوڵەت ناتوانێ خۆی لە كێشەكان ڕزگار بكات و سەرلەنوێ ئاواكردنەوەی دیموكراتییانە ناچاریەكە و پێویستی پراكتیزەكردنی ریفۆرم لەم بوارەوە ژیانییە. PKK دەركی بەوە كردووە كە بنبەستبوونە پراكتیكی و ئایدیۆلۆژیەكان لە میانەی هەڵوێستە كۆنەكان تێپەڕ ناكرێت و چارەسەرییان بەدینایەت. لە ئاستی خۆیدا لە هەموو بوارێكدا بە سەرلەنوێ ئاواكردندا تێپەڕ دەبێت.

لەلایەن تەواوی توێژەكانی كۆمەڵگا بەقووڵیی هەست بەوە دەكرێت كە ڕەوشێكی نوێ هاتووەتە ئاراوە، ئێستا ئێشی ئەمە دەبینرێ. ئەوەی دەرهەق بەكێشەی كورد لە ئارادایە، ڕەوشی "نەشەر نەئاشتی"یە، قۆناخێكی هودنەیە كە بەگوێرەی ئاگربەست شێوەی گرتووە. لایەنەكان زۆر بە قووڵی بیردەكەنەوە، هەوڵ دەدەن ئەوە دەربخەن كە گونجاوترین هێزو پراكتیك پێویستی بە چییە، بەگوێرەی ئەمەش سیاسەت دیار بكەن و سەرلەنوێ ئاواكردن ئەنجام بدەن. تەواوی كۆمەڵگای توركیا كەوتۆتە نێو ئەم قۆناخەوە. هەرتوێژێك لە ڕابردوو بۆ

رەوشی هەنووکەیی و تاوەکو ئایندە لەگەڵێك لایەن چاو بە خۆیان دەخشێنێتەوە. بە شێوەیەکی واقیعی تر جیهان و هەلومەرجە ناوخۆیی و دەرەکییەکانی وڵات شرۆڤە دەکەن، بەرنامەو رێنومایی نوێ بەدەست دێنێ. زۆرینەیەکی تەواو پێشوازی لە نوێبوونەوەی ژیانی سیاسی دەکەن. بەڵام تەواوی ئەم پێشکەوتنە پۆزەتیڤانە، ئەوە گەرەنتی ناکات کە چارەسەرییەکان بەدیدێت. تەنیا ئەوە دەسەلمێنێ کە وەکو جاران نابێت. گرێدراوی پەیمانێکی کۆمەڵگای نوێیەکە جیاوازییەکانی رەگەزی، هزر، باوەڕی و ناسنامەو چۆنیەتی ژیان لە خۆوە دەگرێت. ئەمەش پێویستی بە دەستوورو یاسای نوێ هەیە.

کێشەی شەڕ و ئاشتی تورکیا، هێندە قووڵە کە تا رادەیەکی زۆر بابەتی کورد تێپەڕدەکات. هەم رابردووی مێژووی درێژخایەن، هەم کێشەکێشە کۆمەڵایەتی، ئایینی و ئەتنیکیەکانی ئەم سی ساڵەی دوایی ئەم راستینەیەی دەرخستۆتە روو. هەرچەندە ئایدیۆلۆژیای فەرمی دەوڵەت و بەڕێوەبەرایەتیە ئۆلیگارشیەکەی هەوڵیدابێت لە میانەی فشار پەردەیەکی یەکڕەنگ بخاتە پێش چاوی تەواوی کۆمەڵگادا، بەڵام سەرکەوتوو نەبووە. ناکۆکی و پێکدادانەکان ئەم پەردەیان دڕاندووە. ئەوەی پێویستە، گەیشتنە بە سیستەمێکی دەستووری کە هەمەرەنگی و فرەکولتووری وەکو دەوڵەمەندییەك پەسند بکات. داخوازی کۆمەڵگا لەم لایەنەوە چڕەو بەردەوام پەرە دەسەنێ. تورکیای ۲۰۰۰کان، ناچارە سەر لە نوێ لەناوەڕۆکدا شێوە بە کۆماری دیموکراتی و عەلمانی بدات. بەلانی کەم هێندەی ساڵانی ۱۹۲۰ پێویستی بە وەرچەرخانێکی ریشەیی دەبینرێت.

قۆناخی ئیمراڵی ژیان ـ مردنی من، هەم پێویستی ئەم وەرچەرخانەی یەکلاکردۆتەوە، هەم رێچکەو رێگا بەرجەستەکانی پێویستی و چۆنیەتی چارەسەری دەست پێکردووە. بێگومان پەیوەستبوونی PKK و زۆرینەی گەلی کورد بە سەرۆکایەتییەوە رۆڵێکی سەرەکی لەمەدا بینیوە. بۆ یەکەمین جارە لە مێژوودا کوردان بەرامبەر پیلانگێڕییەکی بەهێزی ناوخۆ و دەرەوە پەرتەوازە نابن. بە پێچەوانەوە لە میانەی قوفڵبوونێکی ئاوارتەوە هەڵوێستی نموونەیی ئاشتیو رێککەوتنی دیموکراتییانەی خۆی نیشانداوە. هێزو دروستی ئەم هەڵوێستە، بۆ یەکەمین جارە کاریگەری دەکاتە سەر دەوڵەت و تەواوی کۆمەڵگا، بوێری هەنگاو نان بۆ ئاشتی و پەیمانێکی نوێی کۆمەڵایەتی پێداون. لە بەرزترین ئاستدا گفتوگۆ سەبارەت بەو پەیمانە کۆمەڵایەتیە دەکرێت کە کوردانیش لە خۆوە دەگرێت و وەکو راسترین شێوازی یەکپارچەیی وڵات و یەکێتی دەوڵەت دەبینرێ و زۆرینەش ئەم هەڵوێستە بەباش دەبینێ. ئەوەی لە ئارادایە، ژانی لە دایك بوونە. بەڵام ئەمە بەو واتایە نایەت کەهەموو شتێك لەسەر رێگای راست پەرە دەسەنێ. هێزە ناوچەگەر و شوڤێنیستە پاشڤەڕۆکان و پاشماوە سیاسیە کۆنەکان و ستاتۆ بیروکراتیەکان وزەیەکی وەهایان هەیە کەبتوانن هەموو جۆرە کۆسپێك بنێنەوەو تەقینەوەی نوێ دروست بکەن. مەترسیەکانی تەقینەوەی کۆمەڵایەتی، هێشتا دوورە لەوەی بەتەواوی لە رۆژەف دەربکەوێت.

لە میانەی جوڵانەوە بە گوێرەی ئەم ڕاستینەیە، قۆناخی ژیانی من لە ئیمراڵی، سەبارەت بە شوێنگەی بەرگری ڕەوا، لە منەوە تا دەگاتە هەر کەس و دەوروبەرێکی پەیوەندیدار ئەرکی هەمەلایەنەمان دەخاتە ئەستۆ. ئەم ئەرکانە بۆ گەیشتن بە ئاشتیەکی پۆزەتیڤانەو دیموکراسیەتێکی تەواو، چەندایەتی و چۆنایەتیەکی هێزە چەکدارەکانی PKK دەکاتە ناچاریەك. ئەمە تەنیا بەرامبەر بەو هێزانەی تورکیا پێویست نییە کە ئاشتی ناخوازن، بەڵکو بۆ پووچەڵکردنەوەی هێرشەکانی هێزە پاشڤەڕۆکانی ڕۆژهەڵاتی ناوین و ناوخۆی کوردان ناچاریەکە. ئەگەر ئەمە بەدی نەیەت، ئاشتی و دیموکراسی تەواو، تەنیا دەبێتە خەیاڵێك.

دووەمین لایەنی گرنگ، لە ڕێگای تێپەڕاندنی پێکهاتەی کلاسیکی کۆمەڵگا، پێویستی بە ئاواکردنی دیاردەی کۆمەڵگای مەدەنی هەیە کە بە شێوەیەکی بەرفراوان و هەرەمەکی زۆرینەی کۆمەڵگا لە خۆوە بگرێت. ئەو وەڵامەی گەل بیداتە ژیانی منی ئیمراڵی، ئاواکردنی کۆمەڵگای مەدەنییە بەم بەرفراوانیەوە. چارەسەری بۆ گەلی تورکی براو گروپە کولتوریەکانی دیکە ئاواکردنی کۆمەڵی مەدەنی خۆیانە. ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگر ئەوەیە کە یەکێك لە پرۆژە هەرە سەرەکییەکانی پێشخستنی کۆمەڵی مەدەنییە. بەبێ ئاواکردنی کۆمەڵی مەدەنی، ئەنجامدانی سەرلەنوێئاواکردنەوە لە ڕێگای فەرمانەکانی دەوڵەت، دەبێتە خەیاڵێك و خۆ خەڵەتاندن. بەتایبەتی ئەوەی هەرە زێدە پێویستە لەم پرۆژەیە بە خاوەن دەرکەوێت، چەپ و سۆسیال دیموکراتەکانن، کە پێویستە پێکهاتە موحافەزە کارەکەیان تێپەڕبکەن، لە ژێر چەترێکی بەرفراوان و بەپشتبەستن بە ڕێککەوتن لەگەڵ کۆمەڵی مەدەنی، پێشەنگایەتی چارەسەری بکات، ئەمەش گرنگیەکی ژیانی هەیە. ئەگەر کەمێك گرێدان بە یادی هێندە ئێش و شەهادەتەوە هەبێت، ئەوا بە سەرکەوتوویی خاوەن دەرکەوتن لەم جۆرە ئەرکانەیان بەسەردا دەسەپێنێ. لە حاڵەتێکی پێچەوانەدا بە خۆیان پێشەنگایەتی دەسەڵات و سیاسەت پێشکەش بەو توێژە ڕاست ڕەوانە دەکەن کە باوەڕیان بە ئاشتی و دیموکراسی نییە و بێ پرەنسیپن.

لە شەڕی مردن ـــ ژیانی ئیمرالیدا، لە میانەی ئەم وشیاری و هەست کردن بە بەرپرسیارێتی، بە باوەڕی و سووربوونەوە پێویستیەکانی ئەنجام دەدەم. زۆر باش شیکردنەوەی واتای ئەم ژیانەی گەلەکەمان لە لایەن کەسایەتی و دەزگا پەیوەندیدارەکان، بۆ خۆیان واتایەکی ژیانی لە خۆوە دەگرێت. ئاشتیەکی شەرەفمەندانەو چارەسەریەکی دیموکراتییانەی تەواو، بژاری هەموومان و چەقی قورسی تێکۆشانمانە. بەڵام لە میانەی ناسینی هێزە چەتەگەریەکان و شەڕخوازان، نابێ ساتێکیش ئەوە بەر چاو نەگیرێت کە دەستپێکردنی ڤڕکردنێك کە سەرەتا لە منەوە دەستپێدەکات، بەواتای کوشتنی بەدەیان هەزار لە گەلانی تورکیا دێت، کوردانیشی تێدا. بەبێ ئەوەی هیچ کاتێك لە بیر بکرێت کە سەرەکیترین ئامانجی هێزە ناوخۆ و دەرەکیەکانی ئەم پیلانگێڕیەیان ئامادەکرد ئەمە بوو، بەڵکو لە کات و شوێنی گونجاودا بەرەو ڤڕکردنێکی بەمجۆرە هەنگاو بهاوێژن، هەروەکو بڵێی سبەینێ ئەمە ڕوودەداتە پێشخستنی

هەموو ئامادەکارییەکانی پاراستن مەرجە. ئەگەر ئاشتییەکی شەرەفمەندانە بەدی نەیەت، ئەوا شەڕی ئازادی شەرەفمەندانە تەنیا لەسەر ئەم بنەمایە بە سەرکەوتن دەگات.

یەکێتی ئەورووپا و پەیمانی مافی مرۆڤی ئەورووپا و دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپا هێزی کە چارەسەری یاسای دیموکراتی دیار دەکات، بۆ ئەوەی بەلایەنی پۆزەتیڤ رۆڵ لەو قۆناخەی تورکیادا ببینێ، دەبێت زهنیەتی داگیرکاری کلاسیکی رابردوو و سیاسەتەکانی تێپەڕ بکات، جارێکی تر داخوازی و ئومێدی خۆم دیار دەکەم کە لە میانەی بڕیارە دادپەروەرەکانیان بەرەو ئاشتی و رێککەوتنی دیموکراتییانە رۆڵێکی شایستەی مێژوو دەبینن.

د ـ چارەسەری دۆستانە لە دادگای مافی ئەورووپا، لێکەرپنەکانی دیالۆگ و ئەو ئەرکەی دەکەوێتە ئەستۆی کۆنسەی ئەورووپا، رێگایەکی چارەسەری کە دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپا دەخوازێت پێشی بخات، چارەسەری دۆستانەیە لە نێوان داواکارو داوالەسەر. مەبەست لەوەدا ئەوەیە کە هەوڵبدرێت لە میانەی دیالۆگی دوولایەنە کێشەی لە ئارادایە بەلاوە بنرێت، ئەوەی پێویستە بەیەکەوە پێشوازی لە قەرە بوو یاخود خاڵی رێککەوتن بکەن، یان بڕیاری لەسەر بدەن.

ئەگەر هەلومەرجە سیاسی و ئۆرگانەکانی بڕیاردان لە تورکیا ئامادە بووانایە، بەر لەوەی دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپا سەبارەت بە من بکەوێتە قۆناخی بڕیاردان، ئەوا بژاری من ئەوە دەبوو کە بە دیالۆگێکی دوولایەنە کێشەکان لەگەڵ تورکیا و لایەنە پێشێلکاریەکانی دژ بە پەیمانی مافی مرۆڤی ئەورووپا چارەسەر بکەین. من خۆم بۆ ئەمجۆرە چارەسەرییە خاوەن بانگەشەو ئامادە دەبینم. شایانی باسە لە ساڵی ۱۹۹۳وە لەگەڵ سەرۆك کۆمار بەرێز تورگوت ئۆزال سەبارەت بە قۆناخێکی وەها بڕیاری خۆم خستبووەڕوو. دواتر لە هەندێ رێگای ناراستەوخۆوە هەندێ نزیکبوونەوەی بۆ دیالۆگ پێشکەوت. دەوڵەت نیشانیدا کە بەتەواوەتی بەرامبەر ئەم شێوازە داخراو نییە. بەڵام هەندێ گۆرانکاری نێگەتیف، ئەو هێزانەی چارەسەری ناخوازن و تا دوایی جەخت لەسەر توندوتیژی دەکەن توانیان ئەم هەنگاوانە بێکاریگەربکەن. سەرباری ئەمەش دواجار لە سەرەتای ئەیلولی ۱۹۹۸ لە میانەی دەستپێکردنی ئاگربەستێکی یەکلایەنە، هەوڵدرا زەمینە بۆ پێشکەوتنی بەمجۆرە ئامادەبکرێن؛ دیسان دوای سیاسەتی فشاری قۆناخی ۹ی ئۆکتۆبەری ۱۹۹۸ ، لە جیاتی چیا، بژاری ئەورووپا، هۆکارەکەی پێشخستنی رێگاکانی دیالۆگ بوو. قۆناخی لێپرسینەوە لە ئیمرالی لە نێو هەمان کەشدا تێپەڕبوو. لێرەدا لە جیاتی لێپرسینەوەیەکی کلاسیك. جەخت لە سەر ئەوە کرایەوە کە لەمیانەی دیالۆگ وەڵامدانەوەی کێشەکان تاکە رێگای راستی رزگاربوونە. دواتر لە سەر ئەم بنەمایە نامەی بەرفراوانم بۆ ناوەندە کاربەدەستەکانی دەوڵەت و بەرپرسیارانی PKK نارد کە هەڵوێستی بەمجۆرە لە خۆوە دەگرێت. ئەو بەرگرینامەیەی سەبارەت بە دادگاکەی ئیمرالی ئامادەم کرد پەیامێکی ئاشتی و رێککەوتنی دیموکراسییانە بوو کە زیاتر لە دیالۆگ دەگەڕا. ئەم بەرگرینامەیە رێگای لە پێش کاریگەرییەکی گرنگ کردەوە بۆ راکێشکردنی زەمینە بۆ نێو

لێگەڕینەکانی ئاشتی و چارەسەری دیموکراتییانە. خوازیارم ئەم بەڵگەیەش وەکو بەرگرینامەیەکی پاشکۆ بۆ دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپا لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێت.

ئەم بەرگرینامەیەی بۆ دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپا ئامادەم کردووە بە شێوەیەکی بەرفراوانتر ئامانجی ڕوونکردنەوەی ئەو ڕێگایەیە کە بەرەو دیالۆگ دەچێت و پێوانەکانی یاسای دیموکراتییانە بەبنەما دەگرێت. کاتێك لێی بکۆڵرێتەوە دەبینرێ کە لەنێو لێگەڕینی چارەسەریەك دایە کە بە گوێرەی ڕۆحی پەیمانی مافی مرۆڤی ئەورووپایە. هەربۆیە لەکاتێکدا دادگای باڵا پێشنیاری چارەسەری دۆستانە پێشدەخات، لێکۆڵینەوەو لێتوێژینەوەی بەرگرینامەکەم بە شێوەیەکی بەرفراوان بە گرنگ دەبینم و چاوەڕوانی دەکەم.

لە تورکیاشدا ئەنجوومەنی مەزنی میللەتی تورکیا لەم نزیکانە ئامادەکاری هەندێ گۆڕانکاری گرنگ لە دەستووری خۆی دەکات. ئەم ئامادەکارییانەش بە ئامانجی خۆ گونجاندنە بە گوێرەی پێوانەکانی کۆپنهاگن و ئەندامێتی یەکێتی ئەورووپا. ئەگەر گۆڕانکاری گەوهەری لە دەستووردا ئەنجام بدرێت کە وەڵامی چوارچێوەی پەیمانی مافی مرۆڤی ئەورووپا بداتەوە، دەرفەتی چارەسەری دۆستانە دەخولقێنێ. بەڵام داکۆکیکردنی هەندێ پارتی پاشڤەڕۆو شۆڤێنی لە سەر سزای لەسێدارەدان و هەڵوێستی درێژەدان بە قەدەغەنامەکانی سەر پەروەردەی زمانی کوردی و ئازادی ڕادەربڕین، دەشێ ئەم جۆرە هەنگاوانە پووچەڵ بکاتەوە. بەڵام دیسان هەڵسەنگاندن و قۆستنەوەی هەر دەرفەت و تواناکاریەك کە دێتە ئاراوە، ئەرکێکە دەکەوێتە ئەستۆی لایەنە بەرپرسەکان.

لە لایەکی دیکەوە بەبڕیاربوون و لە نێو ئامادە باشی مانەوەی PKK لە دەرەوەی سنوورەکان لە نێو سیستەمی بەرگری ڕەوادا، زەمینەی بۆ دیالۆگ گونجاو کردووە. ئیتر ئەو لایەنەی پێویستە هەنگاو بهاوێژێ ناوەندە بەرپرسیارەکانی دەوڵەتە، ئومێد و پێشنیازمان ئەوەیە، کە لەو لایەنەوە دەوڵەت هاندەربێت و هەنگاو بهاوێژێت، کە ڕێگایەکەی تا دوایی بۆ خۆشی شەرەفمەندانەو سوودمەندە. لە ڕاستیدا تەواوی هەلومەرجە ناوخۆیی و دەرەکییەکانی لایەنەکان هەڵدەسوڕێنێ هەنگاو هاوێشتنی بەمجۆرەی کردووە بەژیانی و مێژوویی . بە هۆی بایەخداری بابەتەکە، لە میانەی هەوڵێکی تایبەتەوە بە ئامانجی لێگەڕینەکانی دیالۆگ هێزی بەخشینی دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپا و بانگەوازی کردن بۆلایەنەکان، لە کاتێکدا سەرکەوتووبێت، واتایەکی مێژوویی دەبێت. داخوازی و هەڵوێستی نیاز باشی خۆم بەرامبەر تەواوی ئەو لایەنانە دیار دەکەم کەدادگای باڵا سەبارەت بەم بابەتە بڕیاری لە سەر دەدەن یاخود پێشنیازی دەکەن.

بە پێویستی دەبینم کە بە پوختی هەندێ بۆ چوون و پێشنیازی خۆم سەبارەت بە کۆنسەی ئەورووپا دیار بکەم کە هێزی پراکتیزە کردنی بڕیارەکانی دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپایە. کۆنسەی ئەورووپا بەرپرسیارە بەرامبەر پراکتیزە کردن و چاودێریکردنی پەیمانی مافی مرۆڤی ئەورووپا. نزیکەی پەنجا ساڵە تورکیا ئەندامێکی دامەزرێنەری کۆنسەی ئەورووپایە.

تەنانەت ئازەربایجان و ئەرمەنستان کە هەرە دوایی تەفلی بوون گۆڕانکاری پێویستیان لە دەستووری خۆیاندا ئەنجامدا، تاوەکو ئێستا تورکیا لە گەلێك بوارەوە ئەو گۆڕانکاریە یاساییانە ئەنجام نادات کە بە گوێرەی پەیمانی ماف مرۆڤی ئەوروپا پێویستە، لەم لایەنەوە بەردەوام ئەو گۆڕانکارییە یاسایی و دەستوورییە دوا دەخات کە یاسای ناوخۆ پەیوەندیدار دەکات و بە گوێرەی ڕاستەڕێی بڕیارەکانی دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپایە. بێگومان سەبارەت بەم مەسەلەیە چەندین جار کۆنسەی ئەوروپا تورکیای ئاگادار کردوەتەوە. بەڵام نیتر لە ئاگاداری بەولاوە، ڕووبەڕووی ئەرکی پێشخستنی هەندێ تەدبیرە. پێشنەخستنی ئەو تەدبیرانە، واتای پێشێلکردنی یاساکانی خۆشیەتی. هەروەکو بڵێی بە شێوەی فەرمبوودان لەگەڵ ئەندامێکی هەڵسوکەوت دەکات. ئەم ڕەوشە بە شێوەیەکی خراپ کاریگەری دەکاتە سەرپێشکەوتنی دەوڵەتی یاسا لە تورکیا. کۆتایی هێنان بەو دواخستنانەی کە سەرچاوەی خۆی لە کێشەی کورد و عەلمانیەت دەگرێت، تا دوارادە گرنگە بۆ ئەوەی ئەم متمانەیە نەشڵەژێت کە بە یاسا دەکرێت.

تورکیا حوکمەکانی یاسا لە سەرووی هەمووشیانەوە سزای لەسێدارەدان و ئەوانەی ئازادی ڕادەربڕینی تەواوی کەمایەتی و هزرەکان قەدەغە دەکات، بەگوێرەی پەیمانی مافی مرۆڤی ئەوروپا ڕێك ناخات. دۆزی من سەبارەت بەم بابەتانە، بەرەوشێك گەیشتووە کە ڕۆڵی کلیل دەبینێ، تەنانەت وەکو ئامرازێکی ئیستیسماری سیاسی بەکاردەهێنرێ. سزای لەسێدارەدان سەبارەت بەمن نەك تەنیا لە ناوخۆ، بە داخەوە لە پلاتفۆرمی یەکێتی ئەوروپا، بۆ ئەندامبوون لە یەکێتی ئەوروپا وەکو کارتێك بەکاردەهێنرێ. ئەم ڕەوشەش نەك تەنیا من،تەنانەت ماف و داواکاریە ڕەواکانی گەلی کوردیش دەکاتە بابەتی هەراجکردن. شایانی باسە دەزگاکانی یەکێتی ئەوروپا خاوەن پێوانەی تایبەت بە خۆیانن. ئەگەر بە شێوەیەکی ڕێژەییش بێت ئەم بەهایانە جێگای گفتوگۆ و فەرمبوودان نییە. بە گرنگیەوە ئاماژە بەوە دەکەم کە بەردەوام گفتوگۆکردنی مافە ڕەوا و یاساییەکانی من و گەلەکەمان لەگەڵ تورکیاو کردنی بە بابەتی هەراج و مامەڵە کردن تاوەکو دوایی بە هەڵەو ناهەقی دەبینم. دیسان دیارکردنی ئەوە بە ئەرکێك دەزانم کەپێویستە کۆنسەی ئەوروپا ساتێك زووتر بانگەوازی بۆ تورکیای ئەندامی دامەزرێنەر بکات کە پێوانەکانی پەسند بکات و بە خێرایی پێویستیەکانی جێبەجێ بکات.

هەروەها بەکارهێنانی پەیوەندییە بەهێزەکانی کۆنسەی ئەوروپا لەگەڵ تورکیا بۆ پێشخستنی دیالۆگی سیاسی کێشەی کورد، ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێ لە جێبەجێکردنی بڕیارەکانی دادگای ماف مرۆڤی ئەوروپا و پێشکەوتنی تورکیا بەرەو دەوڵەتێکی یاسای دیموکراتییانە و عەلمانی. لە میانەی هەڵسەنگاندنی ئەو ئاگربەستە یەکلایەنەی کە PKK بە شێوەیەکی بەهێز لەسەر بنەمای بەرگری ڕەوا بەڕێوەی دەبات، کۆنسەی ئەوروپا بەلانی کەم هێندەی ئەو پەیوەندییەی بەرامبەر کۆسۆڤۆ و مەکدۆنیا نیشانیدا، سەبارەت بە دیالۆگ لەگەڵ دەوڵەتی تورکیاش هەوڵ بدات و یارمەتی بدات، بایەخێکی مەزنی دەبێت. کوردان و تەواوی تورکیا

پێویستیان بەم یارمەتییە هەیە. بە هۆی ئەگەر و ئەنجامەکانی دۆزەکەم دیاریکردنی داواکارییەکانم لەم لایەنەوە بە پێویست دەبینم، هەروەها ئومێدم وایە کۆنسەی ئەورووپاش لە میانەی هەوڵە هێزاو بەهادارەکانی هاوکاری دەکات.

وەکو ئەنجام، لەکاتێکدا بەم شێوەیە ئەو بەرگرینامەیە تەواو دەکەم کە بۆ دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپام ئامادەکردووە، باوەڕیم وایە کە لەگەڵ بەرگرینامەکەی ئیمرالی، پێویستی بە هەڵسەنگاندنێکی ورد هەیە. هیوادارم ئەو زانیاریانەی سەبارەت بە چەندین رووداو و کەسایەتی دایە و پێویستی بە لێکۆڵینەوە هەیە، وەکو بەڵگەو شاهید هەڵسەنگێنرێ. هەروەها دووبارەی دەکەمەوە ئەگەر پێویست بکات بۆ بەرگرینامەی زارەکی و نووسراو ئامادەم. باوەڕیم بۆ ئەوە دیار دەکەم لە میانەی ئەم بەرگرینامەمەوە دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپا هەم بۆ گەلەکەمان، PKK و بۆمنیش، هەم بۆ مرۆڤایەتی پێشکەوتووخواز و تورکیا، بڕیارێکی راست و دادوەرانە دەدات کە شایستەی مێژوو بێت، سڵاو و رێز پێشکەش دەکەم.

## ناسنامەی ئاپۆ:

## لەتیرەوە بەرەو بەگەلبوون

دیارکردنی چوارچێوەیەك بۆ ناسنامەی عەبدوڵڵا ئۆجەلان، وەکو کەسایەتییەك کە بە شێوەیەکی چڕ لە نێو ئەم دیاردەیەدا ژیاوە، بۆ من وەکو ئەرکێکە. چوارچێوەیەکی بەمجۆرە لە هەمانکاتدا بۆ ئەوانەی بە خەباتی مێژوو، کۆمەڵناسی، بیۆگرافی و هونەرەوە خەریکن، دەبێتە بەڵگەیەکی گرنگ سەبارەت بەم بابەتە و بۆشاییەکی گەورە پڕدەکاتەوە. هەروەها وەکو دەزگایەکی تیۆری و پراکتیکی بە شێوەیەکی بەرجەستە پەیوەندیدارکردنی ناوەند و دەوروبەرێکی بەرفراوان و کاریگەریکردنە سەر چەندین گۆڕانکاری و پێشکەوتنی کۆمەڵگا، ئەوا پێناسەکردنێکی ڕاست بایەخدارتر دەکات. سەبارەت بە ڕوونکردنەوەی ئەو هەڵسەنگاندنانەی لە بارەیەوە نووسراوە و دەنووسرێ، گووتراوە و دەگووترێ، سوودمەند دەبێت. بێگومان تاوتوێکردنی بابەتەکە بەرهەمەندە زانستی و ئەدەبییەکانەوە پێویستییەکە و ڕۆژبەڕۆژ بایەخەکەی زیاتر دەبێت. هەروەکو چۆن بەدەگمەن ڕوویداوە کە مێژوو و گەلێك تا ئەم ڕادەیە لە تاکێکدا قاڵبێتەوە، زۆر بە دەگمەنیش بینراوە کە تاکێك لە میانەی کاروانێکی تەنیایی بەمجۆرەدا، مێژوو و گەلێك بخولقێنێ و بەڕێوەی ببات. ڕۆژ بەدوای ڕۆژ زیاتر هەست بەوە دەکرێت کە گەلێك بوار هەن پێویستییان بەڕوونکردنەوە هەیە. ئەنجامدانی شرۆڤەیەکی ڕاست سەبارەت بەو پرسانەی هەم لە هەست و هزری دۆست و هەڤاڵان و هەم ڕکابەران کەڵاڵە بووە و و ئەو گۆڕانکاریانەی لە ژیانیاندا دەرکەوتووە، پێناسەیەکی ڕاست سەبارەت بە ناسنامە دەکاتە پێویستییەکی ژیانی. گرنگتریش ئەوەیە، پێشنەخستنی پێناسەیەکی ڕاست، بەبێ هیچ پێویستییەك مەترسی ئەوە لەخۆوە دەگرێت تراژیدیای زۆر ترسناکتر بخاتە سەر ئەو تراژیدیانەی پێشتر ڕێگای بۆ کردەوە. هەروەها ناوەند و دەوروبەرێکی بەرفراوانی بەکارهێنانی ئەم بابەتە پێکهاتووە. ئەنجامنەدانی پێناسەیەکی ڕاست، ڕۆڵ دەبینێ لەوەی ئەمانە بە شێوەیەکی سانایتر درێژە بە لەپستۆك و بەرژەوەندییەکانیان بدەن. گەلێك بیانووی هاوشێوەی ئەمە، سوودمەند دەبێت لە زیاتر زیندوو ڕاگرتنی بەرگرینامەی دادگای ماف مرۆڤی ئەورووپا. ئەمەش نووسینی ناسنامە دەکاتە پێویستییەك. سەبارەت بەوەی پاشماوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوین بەرامبەر شارستانییەتی ئەورووپا واتایەك دەبەخشێت، مرۆڤ بەرەو تێفکرینێکی بایەخدار دەبات.

**١. لەدایکبوونی سروشتی، پەرتەوازەبوونی کولتووری تیرە و هەنگاوەکان بۆ دارستانی شارستانییەت**

ئەمە بۆچوونێکی زانستییە کە پەرەسەندنی سروشتی ژینگە و مێژوو رۆڵێکی یەکلاکەرەوە لە پێکهاتنی کەسێتیدا دەبینێ. لە ئاستی پێناسەکردندا دەتوانرێ هەندێ بۆچوونی گەوهەری دەرهەق بە چوارچێوەی مێژوویی و ژینگە پێشبخرێت. ئەو ژینگەیەی تێیدا هاتمە دونیاوە شێوەی ئەو تەپۆڵکە بچووکانەی هەیە کە لە رێگای ئەو دۆڵانەوە لێک دابڕاوە کە ناوەندەکانی چیای تۆرۆس و دەشتەکانی میزۆپۆتامیا بە یەکتر دەگەن. گوندی ئۆمەرلی(عەمارە) کە پێنج کیلۆمەتر دەکەوێتە نزیکەی پێچەکانی رووباری فورات کە لە باکوورەوە بەرەو باشوور هەڵدەقووڵێت، ئەو دەوروبەرەیە کە تێیدا هاتمە دونیا و مەزن بووم. کەشەکەی وەکو کەشی دەریای سپی وایە. دەکەوێتە ناوەندی ئەو ناوچەیەی لە مێژوو بە هیلالی بەپیت ناودەبرێ. بۆ کولتوورەکانی دانەوێڵە و ئاژەڵداری گونجاوە. لەو تایبەتمەندێتیانەی سەردەمی نیۆلیتیك کە تاوەکو ئێستا تێیدا دەژی، دەرك بەوە دەکرێت کە سەرەکیترین ناوچەیە کۆمەڵگای نیۆلیتیکی تێدا پێشکەوتووە. تایبەتمەندێتیە فیودالییەکان لە نزیك ناوچەی ئێمە بە هێزە، تەنانەت تایبەتمەندییەکانی سەرمایەداری کەدواتر پێشکەوتن، لە شوێنی لەدایکبوونی من کاریگەرییەکی ئەوتۆی نەبووە. بە شێوەیەکی بەهێز بەردەوامکردنی هەبوونی کۆمەڵگای گوندی نیۆلیتیك، رەوشێکە شایەنی تێڕامانە.

هەروەکو دەزانرێ ئەم ناوچەیە بە شێوەیەکی دژوار دووچاری یەکەمین هەوڵەکانی بە کۆلۆنیکردنی شارستانییەتی سۆمەر هات. دەکەوێتە ناوەڕاستی کۆلۆنیەکانی سۆمەر، کە لە باشووردا کارگامێشە، لەرۆژهەڵات ئورفلـ بیلیچیك، لە باکوور سامسات و رۆژئاواش شاری بەرەیە. ناوچەی ناوەندی پادشایەتی کۆماگەنایە. مسۆگەرە ٢٠٠٠ پێش زایین ئاشنایی شارستانییەت بووە. شیمانەیەکی بە هێزیش ئەوەیە، کە لە کۆمەڵگای نیۆلیتیکی پێشووتر تاوەکو رۆژگاری ئەمرۆمان تەمەنی ١٥ هەزار ساڵە. ئاشنای شارستانییەتەکانی ئاشووری، ماد، پارسی، ساسانی، هێلینی، کۆماگەنا، رۆما، بیزەنتی، عەرەبی ـ ئیسلامی و عوسمانی بووە.

تایبەتمەندییەکی دیکەی گرنگی مێژووی ئەم ناوچەیە، ئەوەیە کە دەرگا و پردی تێپەڕبوونی کۆمەڵە ئەتنیکی و قەومە جیاوازەکانە. کۆمەڵەیەکی ئەتنیکی و قەومی بێگەرد لە ئارادا نییە. تاوەکو ئێستاش شوێنپەنجەی مۆزائیکێکی تێکەڵەی هەموویان بەهێزە. لە پێدراوە مێژوویی و شوێنەوارناسی و ئەژادناسیەکانەوە دەرك بەوە دەکرێت کە یەکەمین کۆمەڵەی ئەتنیکی خاوەنی جێنیشتە جێگیرەکان هۆریە بەرەیشە ئاریەکانن. لێکچوونی پێکهاتەی زمانی کوردانی رۆژگاری ئەمرۆمان لەگەڵ پێکهاتەی زمانی هۆریەکان ئەم راستینە دەسەلمێنێ. هەروەکو دەزانرێ هۆری ناوێکی گشتییە، سۆمەریەکان لەم گەلانەیان ناوە کە

لەناوچە گرد و شاخاوییە بەرزەکاندا ژیاون. هەروەها هەندێ جار سۆمەریەکان گەلی ئەم ناوچەیان بە کوردی ناوبردووە کەبەواتای" گەلی چیایی" دێت. کور واتە شاخ ، دی واتە عائیدبوون. ئەمەش بە واتای شاخی دێت. لە باشووریش کۆمەڵەی ئەتنیکی ئامۆری بەریشە سامی دەژین، کە بەردەوام بەرەو ناوچەکە دزە دەکەن. دەشێ ناوی عەممار کاریگەری ئەم نەریتە کولتوورییە بێت. دواتر ئەم کۆمەڵانەی لەرێی عەرەبەکانەوە پێکهێنران لە ژێر فەرمانداریتی سەعدی کوڕی وەقاس ئیسلامەتیان بۆ ناوچەکە گواستەوە. تاوەکو ئێستا ناوی زۆربەی گوند و مرۆڤەکان ریشەکەی عەرەبی ـــ ئیسلامییە. شیمانە دەکرێ کێشمە کێشی هۆری ـــ ئامۆری باو لەناوچەکەدا بۆ مێژوویێکی یەکجار کۆن بگەڕێتەوە. گەلێك پاشماوەی ئاشووریەکان تاوەکو ئێستاش لە ناوچەکەدا ماوەتەوە. گەلێك بەردی نووسراو هەن.

گروپە ئەتنیکیەکانی دیکەی ناوچە ئاشنایی بووە لوویی‌ەکان و ئەرمەنیەکان جێگای بایەخن. مسۆگەرە لە قۆناخی توانەوە کە لەلایەن گریکەکان لەماوەی ۱۰۰۰ ساڵ پێش زایین تاوەکو ۱۰۰۰ی زایین بەرێوەچوو، لووییەکان کۆمەڵەیەکی ئەتنیکی بە کاریگەربوون لەناوچەکەدا. وشەی گوند کە بەواتای لادێ دێت بەزمانی لوویی و بەمانای گردۆڵە دێت. کاتێك سۆمەریەکان ئەم گردۆلانەی شوێنی نیشتەجێبوون بە"ئور" ناو دەبەن، لووییەکان پێیەڵێن گوند. کۆنترین گەلی ئەنادۆڵە، زیاتر لە باشوور و باشووری رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ نیشتەجێبوون. زمان و کولتوورەکەیان ئارییە.

لە پاشماوە کولتووریەکاندا دەردەکەوێت کە ئەرمەنیەکانیش لە گەلە کۆنەکانی ناوچەن. گوندی جەبین (سایلاك قایا) کە گوندێکی دراوسێمانە و تاوەکو پێنجەمی سەرەتاییم تێدا خوێندووە، هەموو رۆژێك هاتووچۆم دەکرد، تاوەکو سەردەمی کۆمار گوندێکی ئەرمەنیە. خەلفەتی (رۆم قەلا) کە قەزای ئیداریمان بوو، شیمانەیەکی بەهێز ئەوەیە ناوی لە گەلێك دێت کە بەکانزا خەریك بوون و بە هال ـــ پاوۆ ناودەبران. شیمانە دەکرێت ئەم گەلەش باپیرانی ئەرمەنیەکان بن (هەروەکو لە منداڵیشەوە بینیومە ئەوانەی بەکاری کانزاکاریەوە خەریکن زیاتر ئەرمەنیەکانن). وەستایی کانزاکاری لەناوچەکە تایبەت بەئەرمەنیەکانە. لەدووەمین سەدەی زایینەوە ئیتر کۆچی تیرە تورکمانەکانیش بەرەو ئەم ناوچەیە دەبینرێت. لەبەر ئەوەی لەرۆژهەڵات بەتەواوی کوردەکان باڵادەستن، تورکمانەکان زیاتر لە رۆژئاوای فوراتەوە هاتوون و هەوڵی دزەکردنیان داوە. ئەگەر لە ژێر رۆشنایی ئەم راستینەیەدا نەخشەیەکی ئەتنیکی دەوروبەری گوندەکەمان بکێشم بەمجۆرەیە، لەناوەراست گوندی عەممارە (ئۆمەرلی) کوردە، لەرۆژئاوا لە کەناری فورات عەبنۆ ( عەین، بەزمانی عەرەبی بەواتای کانی دێت، کانیەکی گرنگە) تورکمانن. لەباکوور پازوور، دارتۆ، گۆڵگان کوردن. لەرۆژهەڵات ئارا (رێی ناوین) تورکمانن. ئارام لە باشوور تورکمانن. شیمانە دەکرێ ناوی ئاراو ئارام بەریشە ئاشووری ـــ ئامۆری بن. لەباشوور جەبین(سایلاك قایە) لە رابردوویەکی نزیکدا

ئەرمەنیە، لەگەڵ کۆماردا بەتورك كراوە. تەواو لەنێو زەمینەیەكی مۆزائیكی ئەتنیكی كولتووری داین. هەروەكو بڵێی سێ چوار گرووپی ئەتنیکی ــ کولتووری سەرەکی ڕۆژهەڵاتی ناوین لەنێو بەیەکەوە ژیانێكی چڕدان. بەردەوام کاریگەری ئامۆریە سامیەکان، ئاشووری و عەرەبەکان لە باشوور هاتووە، کاریگەری ئەرمەنیەکانیش وەکو گەلێکی پیشەکار، ئاسنگەر و کانزاکار لەباکوورەوە هاتووە. تورك ــ تورکمانەکان گرووپێکی دیکەی ئەتنیکی ــ کولتوورین کەدوای هەمووان هاتوونەتە ناوچەکە. هەرچی کوردانن، وەکو سەرەکیترین خولقێنەر و بەهێزترین درێژەپێدەری کولتوور و شۆڕشی نیۆلیتیك، لەناوچەدا ڕۆڵێکی ناوەندییان بینیوە. چاندن و ئاژەڵداری کاری سەرەکیانە. عەرەبەکان ـ ئامۆریەکان بە بازرگانی، ئەرمەنیەکان بە کانزاکاری، تورکمانەکانیش بەکۆچەری و شەرڤانیەوە خەریك بوون.

ئەم تایبەتمەندێتیەی ناوچەکە، دەرفەت بەزاڵبوونی کولتوورێك نادات کە سەر بە تاکە قەومێك بێت، لە قۆناخە کۆنەکانی مێژووەوە بەیەکەوە ژیانی فرە کولتووری دەکاتە ناچاریەك. لەبواری باوەڕیشەوە ناوچەیەکە لەکۆنەوە مەسیحیەت و موسوڵمانێتی لەناو یەکتردا دەژین. هەربۆیە خاوەن ئەدرەسی کۆنترین ناوچەی فرە کولتووری و ئەتنیکی و مرۆڤپەروەرییە. تەڤلیبوون و بەناویەکداچوونی کۆمەڵە ئەتنیکیەکان چڕە. ژن لە یەکتری دەگوازنەوە. ئەم ڕەوشە ئەوە ڕووندەکاتەوە بۆچی سیستەمێکی فشاری جینایەتی بەهێز ناوانەکراوە. زاڵنەبوونی تاکە کۆمەڵگایەك، هەبوونی هەرگرووپێکی ئەتنیکی لە نێو کۆمەڵگاکاندا و پاراستنی بونیادی خۆیان، تایبەتمەندێتیە بەهێزەکانی گوندی نیۆلیتیك، ناهێڵێت دەوڵەتێکی بەهێز یاخود میرنشینێکی شێوازی کۆیلەداری بێت یاخود دەرەبەگایەتی مۆری خۆی لەناوچەکە بدات. ناوچەکە ئاستی هۆز ــ تیرەی کۆمەڵگای گوندی تێپەڕنەکردووە و بەهەزاران ساڵە هەوڵدەدات ئاستێکی کۆمەڵگایی نزیك بە بنەماڵە ئازادە لادێیەکان بپارێزێت. چونکە بەگایەتی بەخۆیەوە نەدیوە. لە سەردەمی سۆمەریەکانەوە لەگوندەکانی بیرەجك ــ خەلفەتی، سامسات، بیرۆکراتیکی کۆلۆنی گرێدراو بە سەرەڕۆیی ناوەندی هەیە کەخاوەن هێزێکی سنووردارە. ئەم بیرۆکراسیە لە کولتووری گەلانی ناوچە نامۆیە، هەروەکو بڵێی دیوارێکی ئەستوورییان لەنێواندا هەیە. تاوەکو ئێستاش ئەم تایبەتمەندێتیە بەردەوامە. ئەم گەوهەرە کۆلۆنیگەراییەی بیرۆکراسیەت، لە ئاستی خۆجێییدا ڕێگای بە جیابوونەوەی جینایەتی نەداوە، دەرفەتی بە پێکهاتنی بیرۆکراسیەتێکی خۆجێیی نەداوە. هەربۆیە ناتوانرێ باس لە کولتوورێکی بەهێزی جینایەتی بکرێت. کولتووری زاڵ زیاتر کولتووری بنەماڵەی لادێیەتی ئازادە. تەنانەت کولتوورێکی بەهێزی خێڵەکیش نەهاتووەتە ئاراوە. کولتووری سەرمایەداری تازە پێشدەکەوێت. ئەم ڕاستینەیەش ڕەوشێکی تایبەتە بەناوچەکە. بوونی شوێنپەنجەی بەهێزی کولتووری کشتوکاڵی نیۆلیتیك، هۆکارێکی گرنگی هەستەکانی یەکسانی

و بەتەواوی نەپلیشانەوەی ژنانە. بەکورتی دەتوانم بەم شێوەیە تایبەتمەندێتییە سروشتی و مێژووییەکانی ئەو ناوچەیە پێناسە بکەم کە تێیدا هاتوومەتە دونیاوە.

فاکتەرێکی لەمێژینەوە ناسنامەی منداڵ یەکلادەکاتەوە خێزانە، کۆمەڵی گوندە کە خێزانیش جێگایی خۆی تێدا دەگرێت. هەروەکو چۆن لە چوارچێوەی دیاریکراویشدا دەرکی پێدەکرێ جڤاتی گوندەکەمان لە ژێرکاریگەری کولتووری نیۆلیتیکی هەزاران ساڵ بەر لە ئێستا، بەبێ ئەوەی هێندە لە باوەڕی ئیسلامی تێبگات لە نێویدا دەژی. لەو خێزانە هەژارانە پێکدێت کە جیاوازی چینایەتییان لە نێواندا نییە، موڵکێکی هێندە کەمیان هەیە کە تێری گوزەرانی خۆیان ناکات، کارکەری و سەپانی بۆ دەرەوە دەکەن. ئەگەر لەکۆنیشەوە بێت عەشیرەتگەرایی تێپەڕکراوە؛ پەیوەندییەکانی خزمایەتی و بنەماڵەیی هێندە لاواز بووە تەنانەت تێری بەتێرەبوونیش ناکات. بەرامبەر بە پەیوەندییەکانی سەرمایەداری کە لە پێشکەوتندایە، کەوتوونەتە نێو رەوشی زەحمەتکێشی نەدار. دەرهەق بە پێکهاتەی بیروکراسیەتی کۆماریش نامۆن. خوێندەوارییەکی سنووردارییان هەیە. هێندە ئاگاداری کولتووری کۆمار نین. دەتوانرێ بگووترێ کە کۆمەڵگای نیۆلیتیک لەمناوەدا کاریگەری کۆمەڵگاکانی کۆیلەداری، دەرەبەگایەتی و سەرمایەداری لەدەرەوە وەرگرتووە، بەبێ ئەوەی بە وەرچەرخانێکی دیالەکتیکی تێپەڕبکات، لە میانەی چەمکی "ئەوەی بەسەرمان دێت، ناچارین پەسندی بکەین، قەدەرە "بەقوولایی لەنێو پاسیفیزمدا دەژیت. ئاستەمە هەموو کولتوورەکان واتایەکیان بۆی هەبێت. ئەوانەی لە ژێرەوە ماون وەکو چینەکانی ژەنگ، بەستوویانە. لەلایەنی هزری و رۆحییەوە هیچ خولقکارییەکیان لێ چاوەڕوان ناکرێت. دەتوانین ئەمە بە "مانەوە لەدەرەوەی رۆژگار"یش ناو ببەین. بەگشتی کۆمەڵگای رۆژهەڵات کە لە ساڵانی ١٠٠٠ی زایینییەوە دووچاری موحافەزەکاری و لەناوخۆ داخراوبوون هات ئەم تایبەتمەندییانە تا ئێستاش بەردەوامە. بەبێ ئەوەی دەرك بەوە بکەن کە ئەو خوداوەندەی باوەڕییان پێیهێناوە کامە پێویستیانی پێکهێناوەو تەنانەت لەبواری میتۆلۆژیشدا یادگارییەکانی لەدەستدا.وەکو کۆمەڵگایەکی مارژینال لەنێو رەوشێکدا دەژی کە لە نزمترین خاڵدایە و دابەشکراوە. تەفلینەبوونیان بۆ هیچ قۆناخێکی شۆڕشگێری سیستەمی سەرمایەداری، رەوشی مارژینالی تەنگەتاوتردەکات. زۆر بە ئاستەم کۆمەڵگای گوند لەبواری جەستەیی خۆی بەرهەمدێنێ، هەرچی لە بواری ئایدیۆلۆژییە بە قوولایی لە نێو نامۆبوونی هزری و رۆحی دەژیت. ئامانجێکی نەوتۆی کۆمەڵایەتی، سیاسی و ئایدیۆلۆژی ژیان نییە. تەنانەت هزری فریادڕەسی و ئاخیرەت واتای خۆی لەدەستداوە. بەڵام بوون بە فەرمانبەری بچووك و کارکەری لە ئەوروپا، دەتوانێ ئومێدی سنووردار بخولقێنێ. رووبەڕووی راستینەی مرۆڤێکین کە خراپی نییە، بەڵام خێریشی نییە و بێکاریگەر و ملکەچە. هەروەکو بڵێی مەحکومی ژیانێکە، کە هەموو شتێکی رزاوە

بێواتا بووە، بێچارەیی بەقەدەرێك دەبینیٚ و وەكو ئەوە وایە كە لە بەندیخانەیەكی كراوەی جیهان خۆی بەندكردووە.

لە بنەماڵەیەك هاتوومەتە دونیاوە كەلە نێو ئەم راستینەیەدا دەژی. بەڵام كاتێك لەمیانەی هەندیٚ زاراوە بیرم كردەوە، كە شیمانەی هەیە بۆهێڵی كۆمەڵایەتی هەبێت، دەركەم بەوە كرد كە پێویستە لە نزیكەوە لێكۆڵینەوە لەسەر بنەماڵەمان بكرێت. دراوی ئەوتۆ نین كە ئاماژە بەهەبوونی ریشەی تیرەی بەرایی و خانەدان بكەن، دەشیٚ بنەماڵەیەكی بەرەچەڵەك بێت كە ناوەندی هەردووكیانە. بەزمانی كوردی بە "ماڵی ئۆجەـ" ناودەبرێت. دەتوانین"ماڵی" وەكو فامیل بەكار بێنین، "ئۆجە" كۆنترین باپیرەمانە كە دەزانریٚ. لەو باوەڕەدام، نازناوی ئۆجەلان بۆئەم باپیرە دەگەڕێتەوە. ئۆجە دوو خێزان ( ) بۆ هەردوو كوڕەكانی حوسێن و عەبدوڵڵا پێكدێنیٚ. باوكم كوڕی عەبدوڵڵایە، ناوی عومەرە. ناوی منیش لە باپیرەم عەبدوڵڵا ماوەتەوە. ئەو تایبەتمەندێتیانەی باپیرەم كە زۆرجار دەگووترێتەوە، ئەوەیە كە زۆرزان و سوارچاك بووە. من خۆشم شایەدم كە باوكم كارەكتەرێكی وەهای هەبوو، دەست و پیٚ سپی، بەڵام مسۆگەر گرێدراوی باوەڕیەكانی بوو، دڵسۆز و بەناموس بوو، سەبارەت بەهیچ كەسێك بەخراپی بیری نەدەكردەوە. وەكو كەسایەتیەك هاتە بەرچاوم، كە ئەگەر هەلومەرجەكانی لەباربووایە، لەرێگای ئەم تایبەتمەندێتیەیەوە دووداڵی لە تەقلیبوونی قەڵەمبازە مێژووییەكان نەدەكرد. لەراستیدا عارف بوو. سەبارەت بەناسینی من لە ئاستێكی بەرزدا بوو. ئێستاكەش لەبیرمە. كاتێك لەژێر داری فستق پێی گووتم كاركردنت زۆر خاوێنە و شێوازەكەت فەتحكارییە، لەژێر فووڵایی ئێشی بێهێزیەوە دەیناڵاند. ئەگەر ئەو ساتە دیار بكەم كەهیچ كاتێك لەبیری ناكەم لەجێگای خۆیدا دەبێت. كاتێك وەكو فەرمانبەرێكی مساح لە دیاربەكر بووم، لەسەر دیواری ویلایەت بینیم. كاتێك كاڵەكێكم پارچە كرد و خواردمان خۆشحاڵی خۆی نیشاندا. دڵم بەم رەوشەی ئێشا. ئەو لایەنەی هەرە زێدە گرنگی پێدەدا قازانجكردن بوو لەرێی رەنجەوە. كاتێك لەنێمە توورە دەبوو دەیگووت:"خۆزگە نان كەروێشك بووایە، ئێوەش تازی و بەدوای بكەوتنایە". دەیخواست ململانێی ئاماان تێبگەیەنیٚ. بەڵام هێزی تێگەیشتنی ئەمەمان نەبوو. كاتێك بەمنی گووت" ئەگەر بمرم، تەنانەت دڵۆپە فرمێسكێكیش لەچاوت نایەتە خوار" بەزانایی قسەی دەكرد و راستی گووتبوو.

لەلایەكی دیكەوە لەخۆرازیبوونی رەسەنێتی لەسەر خێزاندا زاڵ بوو. هەروەها باسی ئەوەش دەكرا كە زۆر لەكۆنەوە بیروكراتێك بەناوی عوسمان پاشا لەنێو خێزاندا دەركەوتووە. ئەو خەباتەی ئیسمەت ئیسمەت سەبارەت بە بیوگرافیای من بە پشتبەستن بە لێكۆڵینەوە و لێگەڕینەكانی فەرمانداریێتی گشتی ئەنجامیدا، بەهەمان ئەنجام گەیشتبوو. شیمانەی ئەوە لەپێشە كە بەرامبەر هێرشەكانی تیرە عەرەب و توركمانەكان بۆسەر كوردەكان بنەماڵەكەمان پێشەنگایەتی كردووە. لەو زەوی و زارە بەرفراوانەی بۆیان ماوەتەوە دەرك بەوە دەكرێت كە

ناوچەکەیان بەرامبەر هێرشی تیرە عەرەبەکان لەباشوور و تیرە تورکمانەکان لەرۆژئاوا پاراستووە. لەرابردوو کاتێك یەکپارچەبوون لە بەسکیەکان هاتوون کە لقی رۆژئاوای خێڵی بەرازین، دەتوانرێ بگووترێ تێکۆشەرترین بنەماڵەی رۆژئاوایان پێکدێنن. هەروەکو دەزانرێ بەشێکی بەرازییەکان لەناوچەی سنووری ئێراق ــ ئێرانی نزیك سلێمانییە دەژین. لەو قۆناخەی من تێیدا بووم، پەیوەندییەکانی خێڵەکی بەتەواوی لەبیر کراوە. وەکو ناوێکی گشتی هەر بنەماڵەیەك خۆی بە" کرمانج" ناودەبات. کرمانجێتی گوزارشت لەو کوردە دەکات کە لەخێڵ دابڕاوە، هەنگاوی ناوەتە قۆناخی بەگەلبوون. بەشێوەیەکی بەربڵاو بوون بە کرمانج لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم و سەدەی بیستەم پێشدەکەوێت. ئەمەش بۆ کوردان بەواتای بەگەلبوونێکی بەرفراوان دێت. کاتێك ئەوە بێنینە بەرچاوان کەتەواوی ئەو خێزان و بنەماڵانەی لەدەرەوەی خێڵ و تیرە دەمێنن بەکرمانج ناودەبرێن، ئەو قۆناخەی کە شکانی کاریگەری دەرەبەگایەتی و دەرکەوتنی لادێی ئازاد و زەحمەتکێشانی لادێی تێدا پێشکەوت، دینامیکێکی گرنگی کوردانە. هەروەکو چۆن من لەم دینامیکەوە هاتووم، PKKش لەبەرئەوەی کوردان بەشێوەیەکی سەرەکی پەیوەندیدار دەکات، جوڵانەوەیەکی کرمانجانە. بناخەی کۆمەڵایەتی ـ ئابوورییەکەی بەشێوەیەکی قورس کرمانجە. کرمانج گوزارشت لەکوردی قۆناخی بەگەلبوون دەکات. سۆزەکانی تیرە و خێڵ نامێنێ؛ ئەگەر بەشێوەیەکی لاواز و لەخۆشیەوە بێت، وشیاری قەوم و گەل جێگاکەی پڕ دەکاتەوە . بەگوێرەی وشیاری خێڵەکی، گوزارشت لەشێوەیەکی پێشکەوتووتری وشیاری میللی و کۆمەڵایەتی دەکات. ئەم رەسەنێتییەی لەپێکهاتەی سەرۆکایەتی PKK و کادیرە سەرەکییەکانیدا هەیە، ئەو بناخە کۆمەڵایەتییە پێکدێنێت کە لە رێکخستن و رێبەرەکانی دیکەی کوردان جیای دەکاتەوە.

لایەنی دایکمان ئاڵۆزترە. دایکی باوکم بەسێ سەر بە لقی شابیقان ی خێڵی گەدیکانە کەتاوەکو ناوچەی عەرەبەکان بڵاوبوونەتەوە. مردنی ئاسایی بەمردار بوون" حەرام، مردنی پیس " ناودەبەن. باپیرەم "باوکی دایکم" حەمید لەگوندی ئارای تورکمانان لەگەڵ حەوا دەبن بە هاوسەر، دایکم عومیش لەوانە دێتە دونیا. حەوا و عومیش لەنێو بنەماڵەدا نوێنەرایەتی ژنی بەکاریگەر و بەهێز دەکەن. مسۆگەر خۆیان لە مێردەژن کەمتر نەدەبینی. دەتوانرێ بگووترێ بەسەرەتاییترین شێوە تێکۆشانی کۆمەڵایەتیان دەکرد کە سەرچاوەی خۆی لەناکۆکی ژن ـ پیاو دەگرێت. ئەو هاوسەنگیەی ناواکراوە بەشێوەی بالادەستی نەبووە، بەڵکو بەشێوەی رێککەوتن بوو. بەڵام بەردەوام تۆوی پێکدادانی لەخۆوە دەگرت. ئاشکرایە کە لەنێو بنەماڵەکەماندا لەبەرئەوەی ژن گواستنەوە لەرەچەڵەکی جیاوازتر هەبوو، پێویستییان بەوە بینیوە کە نزیکبوون و تەبایی لەنێوان خۆیاندا ناوابکەن. ڕێگایەکی کۆتاییهێنان بە کێشمەکێشە باوەکان، تێکەڵاوی ژنخوازیە. وەکو دیارە بەشێوەیەکی بەربڵاو ئەم شێوازە پەیڕەو دەکرێت.

کاتێك من لەو خێزانە هاتمە دونیا کە بەکورتی بەمجۆرە دەتوانم چوارچێوەکەی دیاربکەم، لەراستیدا نوێنەرایەتی دوا پاشماوەکانی فامیل و تیرەم دەکرد. هەروەکو بڵێی مێژوویەکی ۱۵ هەزار ساڵەی نەتنیکی لەگەڵ مندا کۆتایی پێدێت. ئەو قۆناخە سەرسوڕهێنەرە سیاسی و ئایدیۆلۆژییەی دەکەومە ناوی پێکهاتەیەکی وەهای هەیە کە کۆتایی بە ئەتنیك دێنێ و قۆناخی گەل دەکاتەوە. تێپەڕبوونی پڕ بەمێش و ئازار سەرچاوەی خۆی لەم تایبەتمەندێتییە وەردەگرێت. هەروەکو بڵێی رۆڵی دوا هێندە سوورە دەبینم. لەوانەیە بەبێ ئەوەی هەستی پێبکەم، رۆڵی دوا ئومێدی رەچەڵەکیان پێداوم. کاتێك بێبەزەییانە بەرگی بنەماڵە" م پارچەپارچە کرد، دواتر دەرکم بەوە کرد کە میراسێکی مێژوویی ۱۵ هەزار ساڵم تەنگەتاو کردووە. زۆر دوای مردنیان دەرك بە فرمێسك و خەمگینی دایك و باوکم دەکەم. بەڵام هەر شۆڕشێك لایەنی بێبەزەیی هەیە. سروشتی ئیرادەی شۆڕش وایە؛ هەست بە هەندێ ئێش و ئازار ناکات. تاکە لایەنی کە بینیم ئاسودەم دەکات، ئەوەیە کاتێك دایك و باوکێك منداڵێکی نوێ دێننە دونیا، دەخوازن ببینن کەخیانەت لە رابردوویان ناکەن، بەپێچەوانەوە بۆ خاوەن دەرکەوتن لێی سەختترین و بەئازارترین بەڵام شەرەفمەندانەترین رێگا هەڵدەبژێرن. هەربۆیە دەیانتوانی بەئاسوودەیی لەنێو گۆڕدا بخەون.

هەرچۆن هاتمە دونیا و خۆمم ناسی، خۆم لەنێو شۆڕشی خێزان و گوند دۆزیەوە. هیچ ئامانجێکی خێڵەکی، جینایەتی و نەتەوەیی نەبوون کە خۆم پێیانەوە گرێبدەم. تەنانەت ئایینیش کە بریتییە لە ئەزبەرکردنی عەرەبی، دوور بوو لەوەی تێرکەر بێت. هەلومەرجەکانی ئەوە لەئارادا نەبوو بەشێوەیەکی بەهێز سەرلەنوێ خێزان بەرهەم بهێنرێتەوە. هیچ شتێك لەئارادا نەبوو کە هەستەکانی هەڵکشان تێر بکات. ئێستاش لە بیرمە کە قوتابخانەم وەکو درندەیەك دەبینی کە قووتم دەدات. شاریشم وەکو دیاردەیەك بینی کەمن قووتدەدات و هێزم بۆ بەدیناهێنێت. گروپەکانی گوندیش هیچ ئومێدێکیان نەدەدا. لە بڕیارگای فیسکە فیسك و فیتنە و فەساد بەولاوە هیچ رۆڵێکی دیکەیان نەبوو. لەم قۆناخەدا بەردەوام چاوم لەناوچە شاخاوییەکان بوو. تەنانەت زۆر باشم لەبیرە کە دایکم سێ دەرگای لەسەرم داخست، سێ جار دوای ئەوەی منی نێو خنکێن دەکرد و دەبووژامەوە، هەرچۆن دەهاتمە هۆش خۆم، بەخێرایی بروسك دەمکێشا بەدەرگا، خۆم دەهاوێشتە دەرەوە و تاوەکو شاخ رانەدەوەستام. دەگەڕام و دەسووڕام. دیارە کەلە شتێك دەگەڕێم. دوایی کاتێك بەراوردم کرد بینیم کە قەڵەمبازەکانی پێغەمبەر و فەیلەسوفەکان پێویستی بەکاروانی تەنیایی بەمجۆرە هەیە. رزگاربوون لەرەوشی رۆژانەیی و قاڵبوونەوە بەرەو نوێ، زیاتر لەمیانەی ئەم شێوازە دەرفەتی هەبوو. رکابەرایەتی هەموو رێسا گرنگەکانی ماڵەوەم دەکرد. بەگومانەوە هەڵوەستە کردنم بەرامبەر دابونەریت و چەمکی ناموس و پێشێلکردنی ئەمانە پێبەپێ زیادی دەکرد. کاتێك داپیرەم حەوا جارێکیان بینی بەدزیەوە لەگەڵ یەکەمین هاوڕێی منداڵیم

شەهید حەسەن بینداڵ لە گەڕانێکی شاخ دەگەڕاینەوە، قیامەتی بەسەرمدا خراپ کرد. چونکە حەسەن منداڵی دوژمنەکەمان بوو. هەنگاوانم بۆنەمە تاوانێکی ترسناک بوو. ئێستاکەش لەبیرمە، بەرامبەر دایکم وەستاو گووتی "عومیش ئەم کورەت بێ نامووس دەرکەوت". سەرباری ئەم کینە، یەکبوون لەگەڵ منداڵی دوژمن، رۆژ بەدوای رۆژ بەهێزتر دەبوو. لەکاتێکدا لەمنداڵانی خزم و کەس دوور دەکەوتمەوە، گەڕان بەدوای پەیوەندی و یەکێتی لەگەڵ منداڵانی ئەو خێزانانەی بەدوژمن گوزارشتیان لێدەکرا، بۆمن بوو بە چالاکیەك. لەراستیدا دوایی تێگەیشتم کە یەکەمین رێکخستن و سروشتی ئایدیۆلۆژی و سیاسی خۆم لەم رێگایە پێشخست. بەمجۆرە یەکەمین پرەنسیپی پرۆژەی کۆمەڵگای نوێم هاتە ئاراوە.

بەردەوام پەسندنەکردنی پراکتیکی و پرەنسیپیانەی کۆمەڵگای گوند و خێزان پەرەیدەسەند. لەیاریەکانمدا شێوازی نوێی ژیانم تاقیدەکردەوە. یاری بۆمن راستی بوو، هەرچی راستی خێزان و گوند بوو بۆمن ئەو زنجیرانە بوون کە دەبووایە لێی رزگار ببم. هەربۆیە چۆن هەستم بەخۆم کرد، لەمیانەی هەوڵێکی نائاساییەوە هەوڵمدەدا گروپەکانی منداڵیم بخولقێنم. پرەنسیپەکەی یاری و تواناکاری بوو. کێ هەرە زێدە یاریم لەگەڵ بکات و سەرکەوێت، ئەو منداڵە هێزاترین ئەندامی رێکخستنەکەمانە. لەمەسەلەی شەهید حەسەن بینداڵ زۆر زەق و بەرچاوە کە جیاوازی نێوان دۆست و دوژمنم نەکردووە، لەم لایەنەوە تاوەکو دوایی بەپرەنسیپ هەڵسوکەوتم کردووە. لەم لایەنەوە دووەمین پرەنسیپم، جیاوازیم لەنێو هەردوو رەگەزدا نەدەکرد. ئێستاش ئەو کیژۆڵانەم لەبیرە کە لە کاتی یاریکردندا هەستم بە تواناکارییەکانیان کردووە. هەندێ جار بەمانگان لە دەوریان دەگەڕام و سووڕام ، هەوڵمدەدا رایانکێشمە نێو یاری. لەم لایەنەوە یادێکی زیندوو، پەیوەندی بە ئەلیف ی کچە مامی حەسەنەوە هەیە. دوایی گوێبیستی بووم کە بەمجۆرە گێڕاویەتەوە. "لەو رۆژانەی ئیتر بە بووکێنی دەچووم، زۆر بە رێك و پێکی لەماڵ نزیك بۆوە و بانگێشتی یاری کردم". ئەمە راستە. لەم تەمەنەشدا مێردکردنی کچانی خاوەن تواناکاریم پەسند نەدەکرد. لەبیرمە کە لەم تەمەنەشدا پەیوەندیەکی تایبەتم لەگەڵ ئەو کیژۆڵانە هەبوو کە خاوەنی تواناکاری و جوان بوون. بەگوێرەی من ئەوەی زیر بووایە، جوانیش بوو؛ ئەوەی جوانیش بووایە، دەبووایە زیریش بێت. هەروەها لە بیرمە کە ئەو ژنانەی ئەو کاتە هەستیان بەو مەیلەی من دەکردو لەو قۆناخەدا، بەشێوەی گروپ گوێرایەڵیان دەکردم و پێشوازییان لێدەکردم. بە هۆشمەندی گوند ناو دەبرام. ئیمامی گوند موسلم هەستی بەوە کردبوو کەلەم تەمەنەدا بەردەوام لەریزی دوای ئەو نوێژ دەکەم، لەبیرمە کە گووتی" ئەگەر بەم خێراییە بەردەوام بێت، وەکو ئەولیاکان دەفڕێت". ئایین دایونەریتێکی گرنگ بوو. بەڵام هۆکارێکی گرنگی ئەوە بوو کە پێ بە پێ کەسایەتیەکی بەگومانم تێدا پێشبکەوێت. بەجۆرێك هەڵوەستەم سەبارەت بە خوداوەند دەکرد کە هەندێ جار دەگەیشتە ئاستی قەیران. بەڵام دەتوانم بڵێم لە شیکردنەوەکانی ئەم

بەرگرینامەیەدا هەیە، بەشێوەیەکی ریشەیی ئەم زاراوەیەم شیکردەوە. رێگایەکی رێکخستنی منداڵانیش ئەوە بوو، کە بەخۆم بەر نوێژم بۆ دەگرتن و بەمجۆرە رێکمدەخستن. پێویستە بگووترێ کە لەخۆمەوە بینینی رۆڵی ئیمام شتێکی سەیرە. لەجیاتی شەڕ، زیاتر مەراقم ئەو یاریانە بوو کە توانا کاریەکان ئاشکرا دەکات.

چوونم بۆ قوتابخانەی سەرەتایی لەنێو هەستێکی ئاڵۆزدا بەدیهات. بەرەوشێکی رۆحی ئەندێشەوە پێشوازیم لەقوتابخانە کرد؛ بەڵام هەستم بەوە کردبوو کە تاکە رێگای بەرزبوونەوەم بێرەدا تێپەڕدەبێت. لەیەکەم رۆژی چوونم بۆ قوتابخانە تاوەکو دوا قۆناخی زانکۆ بەردەوام جێگای سەرنج راکێشان بووم. بەردەوام لەریزی پێشەوەی سەرکەوتووەکان بووم. بەڵام ژیانی گوندیشی تێدا بێت، ئەو کەش و هەوایەی کەسایەتی من لەو رۆژانەوە تێیکەوت، پارچەیەکی جیا نەبۆوەی کارەکتەری منە. ئەو تایبەتمەندێتیەم کە لەرووخساردا لەگەڵ ستاتۆی گشتی گوند، خێزان، دەوڵەت و کۆمەڵگا بەگونجێ، لەگەڵ تایبەتمەندێتی سۆفیگەراییم بەتەواوی ناکۆکە کە لەژێرەوە بەراستی باوەڕیم پێی هەیە و هەوڵدەدەم جێگیر و پراکتیزە بێت. دوایی بەو رادەیەی دەرکم پێکرد، بۆم دەرکەوت کە ناکۆکیەکی گەردوونییە. کاتێك هەوڵدەدەم خۆم وەکو کۆمەڵگای فەرمی و نیو فەرمی نیشانبدەم، ئەم ناکۆکیە هەر بەرێوەدەچێت. لەناکۆکی نێوان تاك و کۆمەڵگاشدا هەمان رەوش لەئارادا بووە. ناکۆکی ناییی فەرمی و نایینی سۆفیگەرایش لەم راستینەوە سەرچاوە دەگرێت. ئەوەی بۆمن جیاواز بوو ئەوەیە بەردەوام و بێ بەبێ و بەچڕی ئەم دووریانەم بۆ دوو تێڕوانینی جیاواز سەبارەت بەژیان گۆڕی. ئەم ناکۆکیەش رێگای لە پێش ئەوە کردەوە کە کەسایەتیم لەنێو گومان و ئەندێشە و دوودڵی مەزن گەشە بکات.

رۆژانە بەبێ هاتووچۆی قوتابخانەی سەرەتاییم دەکرد کە لەگوندی جەبین ی ئەرمەنیەکان بوو. ناشنای کۆمار ببوو. خێزانێك لەبەر چاوان بوو کە کاریگەری کۆماری نیشاندا. زۆر چاك هەستم بەو راستییە کرد. لەو کاتە هەستی کوردایەتی لەژێر وشیاریمدا شاراوە بوو. هەستم بەوە کردبوو کە دەبێتە سەرەکیترین کۆسپ لەپێش بەرزبوونەوەی من. هەروەکو بڵێی گوێم لەگووتەی (کوردە بەکلکەکان)دەبوو. ئیتر هێدی هێدی دەنگی ئەو گووتانەی شۆڤێنیزم دەهات کە نارەحەتی دەکردین. دەبێ ئاماژە بەوە بکەم کە بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە ئەم کۆسپانەم لە مامۆستاکان و گەلی جەبین تێپەڕکرد. سەرباری هەموو کۆسپەکان، ئەو پەیوەندییانەی لەو قۆناخانەدا لەگەڵ ئەو گوندانە پێشمخست کە بەزمانی تورکی قسە دەکەن، لە باشترین نموونەکانی برایەتییە. ئەم گوندانە بە قورسایی تاوەکو ئێستا وەك دۆست ماونەتەوە. نەکەوتنە نێو شۆڤێنیزمی فاشیزمەوە. تەنانەت پەیوەندییەکەیان جێگای باسە کەلە گوندەکانی کوردان زیاترە.

شوێنپەنجە و کاریگەری کودەتای ٢٧ی گوڵانی ١٩٦٠لەسەر من هەبووە کەلە قۆناخی سەرەتایی و کۆمەڵگای گوند هاتەناراوە. یەکەمین مەیلی سیاسیم بەهۆی ئەم رووداوە پێشکەوت. هەستم بەوەکرد کە سەرچاوەی سەرەکی هێز سوپایە. بەشێوەیەکی رەشبینی پێشوازیم لە لەسێدارەدانی مەندەرەس کرد. بەلام کاردانەوەشم بەرامبەر ٢٧ی گوڵان نەبوو. لەبیرمە لەو قۆناخەدا لەسەر دارێکی بەرز بە عەزیزی هاورێی سەرەتاییم گووت "تۆ رۆڵی فەرماندەیی هێزەکانی پیادە ببینە، منیش رۆڵی فەرماندەی هێزی ئاسمانی ، باهەوڵ بدەین لەم رێگایەوە ئەنجامێکی باشتر بەدەست بێنین". تایبەتمەندێتی ئەم هەڵوێستە، دواتر وەکو تایبەتمەندێتی شۆرشگێری لە پێشکەوتنی مندا بەکاریگەر دەبوو. هێز و گۆرانکاری وەکو دوو فاکتەری ئامەزرۆیی یەخەی بەرنەدام. لەو ماوەیەی لە گوند مامەوە خاوەنی هەڵوێستێك بووم کە بە دۆستی ئاژەڵان دیار بوو و کارکەرێکی باشی کشتوکاڵ بووم. وەکو عیبادەت پێشوازیم لەکاری چاندن و دروێنە دەکرد. خەریکبوونم بە ئاژەڵەوە کارێکی بە زەوق بوو. لەوەرانندنیان لە بەپیتترین لەوەرگا بەختەوەری دەکردم. بەپەرۆشەوە بە درەختەکانەوە پەیوەندیدار دەبووم. خەریکبوون بە خزمەتکردن و کۆکردنەوەی بەروبوومی رەز خۆی لە خۆیدا کارێکی پیرۆزی بوو. دانەوێڵە و ترێ و بەروبوومی درەختەکان بە نیعمەتی پیرۆز لە قەڵەمدەدرا. فرێنەدانی وردکەنان و تەنانەت خواردنی نانی گەنم، تایبەتمەندێتیەکی جیاکاری بوو. ئاشکرایە کەلەژێر کاریگەری قووڵی کولتووری نیۆلیتیك دەژیام.

بەکاردانەوە وەڵامی بانگەشەی خاوەندارێتی دایکم دایەوە کە سەبارەت بە من هەیبوو. بوون بەخاوەنی خۆم ئامانجێك بوو. هەربۆیە ناکۆکیەکانم لەگەڵ دایکم بەردەوام بوو. بانگەشەکانی باوك سنووردارتر بوو. سەبارەت بەکاری رێك و پێك و چاك لەگەڵ براکەنم لەناکۆکیدا بووم. ململانێ لەنێوانمان دا روویدەدا. خێزان دوور لەباوکسالاری بوو. سەربڵندی دایکم هاوسەنگیەکی مسۆگەری ئاوا کردبوو. ئەم هاوسەنگییە هەلومەرجی گونجاوی بۆ ئەوە ئامادە دەکرد ئازادانە پێبگەم . کلیلبوونی دەسەڵات باوك ــ دایك لەنێو خێزاندا بۆشاییەکی دەخولقاند. سوود وەرگرتنم لەم بۆشاییە، دەتوانرێ وەکو یەکەمین دەرفەتی کاروانی ئازادی ببینرێ. خاڵانم وەکو سەرچاوەیەکی هێز بینی. بەهۆی کاریگەری بەهێزیان لەسەر دەسەڵاتی گوند، کاریگەرییان هەبوو لەوەی بەرەنگاری هەلومەرجەکانی گوند ببمەوە. دەرك بەوە کرابوو کە ئەدەبیاتی خاڵ لەخۆرا نییە.

یەکەمین دابرانی جددی لە گوند وخێزان، لە یاخیبوونێکی نێو خێزان (عائلـــــــة) دەستیپێکرد. بەپێی ئەوەی دواتر زانیاریم پێگەیشت، نووسەر ئەحمەد فارەمان ئەم یاخیبوونەی بە"یاخیبوونی یەکەم" ناوبردووە، کە دەخوازێ بیکات بەرۆمان. سەبارەت بە کۆتاییهاتنی قۆناخێك ئاماژەکردن بەم قۆناخە شایانی ئاماژەپێکردنە. لەمیانەی رەنجەوە باخم رێکدەخست، براکەشم محەمەد لەخۆیەوە تێیدەکەوت و خراپی دەکرد. بەبەرد راوە دووم دەنا.

تاوەکو ئەو شوێنە ڕاوە دووم نا کە ساواری لێ دەکوڵێنن. کاتێک باوکم هاتە وەڵام، لەناوەڕاستی گوند بەبەرد لەگەڵیدا کەوتمە نێو پێکدادانێکی دژوار. ئیتر ئەوە تێگەیشتم کە جێگام لەماڵەوە نەماوە، ئیتر ڕووی ئەوەشم نەمابوو لەگوند بمێنمەوە. بەمجۆرە شەڕکردنم لەگەڵ باوکم، جێگای گاڵتەجارییەکی مەزن بوو. لەهەمان ڕۆژ بەنهێنی چوومە ماڵەوە. کیسی پارەی باوکم بینیەوە کەزۆر بەتایبەت حەشاری دابوو. دە لیرەم هەڵگرت کە بۆ ئەو سەردەمە پارەیەکی کەم نەبوو، بەخێرایی و بەتەنیا، بەکین و چاوی پڕ لە فرمێسکەوە نەفرەتم لەگوند کرد و بەجێمهێشت. هەرە دوایی کاتێک لەژێر دار گوێزێکی بچکۆلانەکە تەماشای گوندم کرد، بە حەسرەت و چاوی پڕ لە فرمێسکەوە کاتێک تەماشای دواوەم کرد و گووتم " جارێکی دیکە ناگەڕێمەوە "دواتر دەرکەم بەوە کرد لەڕاستیدا بەشێوەیەکی جددی لە کولتوورێکی هەزاران ساڵە دابڕام و هەنگاوم بۆلێگەڕینێکی نوێ هاوێشتووە.

ئەم دوا ڕێپێوانەم سەیربوو. کاتێک گوندی ئارام ی دراوسێم تێپەڕکرد، بەبێ ئەوەی هیچ شوێنپەنجەیەکی ڕەنجاوبوون بمێنێ بەسەرکەوتوویی تێپەڕمکرد. کاتێک گەیشتمە دووەمین گوند قەرەمەزرا بەشێوەیەکی زۆر پێگەیشتووانە چاوەڕوانی ئەو پاسەم کرد کە لە خەلفەتیەوە دێت. کاتێک سواری پاسیش بووم زۆر ئارام و لەسەر خۆ بووم. بەسەرکەوتوویی بیرەجیکم تێپەڕکرد، گەیشتنم بە پردی بیرەجیک کە یەکێک بوو لە ئاسەوارەکانی قۆناخی مەندەرەس و تازە ئاواکرابوو، بەهەمان خێرایی بوو. ئامانجم چوونە ماڵی خوشکم حەوا بوو کەلە نیزیپ بوو. گەیشتم. دووەمین ڕۆژ منیش لەگەڵ چەند خزمێک چووم بۆ کۆکردنەوەی گەنم و تاوەکو دەستەکانم ئەستوور بوو دوو ڕۆژ بەرگەم گرت. ڕاستتر کارەکە هێندەبوو. ١٠ لیرەم دەسکەوت بوو. ئەمە هەنگاوێکی گرنگی خۆسەلماندن بوو. ئیتر بێ گوند و بێ ماڵەوە دەمتوانی بژیم.

دیاردەیەکی دیکەی شایەنی بەبیرهێنانەوەیە، هەڵوێستی خەڵکی لادێ بوو بەرامبەر بەمن. مەیلی هاوبەش ئەوەبوو: "خوا کوڕی هیچ کەسێک وەکو کوڕی عومەر لێ نەکات، بووە بە شێتی چۆڵایی، ئیتر خێری لێ پەیدا نابێت" بەڵێ قەناعەتێکی بەمجۆرە دروست ببوو. دواتر سەرکەوتنە نائاساییەکانم لە فوتابخانە کە بەخەونیشیاندا نەدەهات، دەیخستنە نێو شەرمەوە. ئەمە شێوازێکی وەڵامدانەوە بوو.

یادگارییەکی دیکەی گرنگ ئەو هەنگاوانە بوو کە بەرامبەر شەڕی مەحۆ وجەمۆ هاوێشتم. مەحۆ بەردەوام شەڕی دەخواست. ڕۆژێکیان کراسەکەی خۆم پڕ لە بەردکرد و لەسەر گۆشەی بانێک چاوەڕوانیم دەکرد، بەشێوەیەک بەرد بارانم کرد کەهیچ دەرفەتێکم پێنەدا. تاوەکو ماڵی خۆیان ڕایکرد. جارێکی دیکە شەڕی نەکرد. هەرچی جەمۆیە دوای ئەوەی ماوەیەک بەدوایدا گەڕام، دیسان ڕۆژێکیان کراسەکەم پڕلە بەردکرد و فشارم بۆ برد. ئەویش تاوەکو کۆتایی ماڵ ڕایکرد. ماڵەوەیان بەزۆر لەدەستیان دەرهێنام. دوای ئەوەی بەباشی وانەی خۆی وەرگرت، ئیتر

مەترسی لەو نەمابوو. بەبیرم دێت کە بەرامبەر بەم ڕووداوە دایکم خاوەنداری لێکردم و بەشان و باڵی هەڵدام. بێچارەیی باوکم و یاخیبوونی دایکم کە بۆ بەدەستهێنانی ماف وەك ڕێگایەکی دەبینی و هیچ سنوورێکی نەدەناسی، کاریگەریان هەبوو لەچەمکی بەرەنگاربوونەوەی مندا. بەپێی ئەوەی دواتر گوێبیستی بووم، تێڕوانینی دایکم سەبارەت بەمن باش و پێگەیشتووانە بوو. باوەڕەکەم لەوەڵامدانەوەی پرسیارێکی فەرماندەی سەرلەشکری نورفا گووتبووی" زۆر هەوڵمدا لەژێر جۆکی خۆمی بهێڵمەوە، بەڵام نەمتوانی" ئەمەش ڕاست بوو. ئەو یەکەم کەس بوو هەستیکرد و گووتی کە شێوازەکەت بەتەنیات دەهێڵێتەوە. گووتەکەی بەمجۆرە بوو: "هەموو کەسێك سوودت لێ دەبینێ، بەڵام وەکو خۆت، لەگەڵتدا کار ناکەن"، ئەمەش وەکو خۆی ڕاست دەرکەوت. هەروەها دوا هەڵسەنگاندنی سەبارەت بەمن بەم شێوەیە بووە"ئەو تاقانەی من بوو، جێگاکەی و بەخۆیشی زۆر جیاوازبوو". کاتێك مردووە دوا گووتەی"بەردەوام دوعا بکەن، خێر بەسەر هەرکەسێکدا بڵاوبکەنەوە" بووە. دواتر کاتێك ڕۆڵی ئەوم لە هەڵسەنگاندنەکانی سەبارەت دایك و ژن تاوتوێکرد، پێویستی ئەوەم بینی بەبچووکی نەبینم و مافی خۆی پێبدەم. ئەم هەڵسەنگاندنانەشی سەبارەت بە ژنان زۆر عاریفانە بوو کە دەیگووت" زۆر زەحمەتە بەو مێشك و کەسایەتیەوە ژن بدۆزیەوە" دەبووایە ئەقڵی ئەم دایکەم پەسند بکەم کە دەمگووت لە کین بەولاوە هیچ تایبەتمەندێتیەکی دیکەی نییە، یەهۆی ئەو مێژووەی کوێرمان دەکات لەیەکتر نامۆ ببووین. بەڵام کاتێك بگەڕێینەوە و تەماشایەکی دواوە بکەین، ئەوا دەمبینی و پەسندم دەکرد کە دەنگێکی ڕەسەنی باوەڕی خوداوەندی دایك بووە و پڕ لەمنەتەوە یادی دەکەمەوە چونکە ئەم دەنگەی بەمن گەیاند. ئەوەی یاخیبوونم بەرامبەری کرد، دایکم نەبوو، بەڵکو سیستەمی دووڕوو و نامۆ و ستەمکاری کۆمەڵگای باڵادەستی پیاو بوو کە ژن و دایکی کردبوو بە هیچ. هەرچەندە لە یەکتریشمان پیرۆز نەکردبێت، بەڵام ئەوەم سەلماندووە کە کوڕێکی باشی دایکم بووم.

### ٢. کۆمەڵگای بۆرژوازی و ئاشنابوون بەکۆمار، گومان و هەڵوێستی شۆڕشگێڕی

لەساڵی ١٩٦٤ لە نزیب چوونم بۆ قوتابخانەی ناوەندی، دووەمین قۆناخی ژیانم دەستپێدەکات. لەهەمانکاتدا لەلایەن خوشکی گەورەم کەلسوم و داپیرەم حەوا(دایکی دایکم) هەوڵمدەدا لەسەر دوا تواناکاریە لاوازەکانی پەیوەندی خزمایەتی بەڕێوەبچم. نیزیب ئەو شوێنە بوو کە خاڵەکانم و پورەکانم لێی دادەنیشتن. ئەو شارە بوو کەبەخێرایی لە ناوچەکە پەرەیدەسەند. کارگامێش بۆ سۆمەریەکانی سەردەمی کۆیلەداری واتای چی بێت، ئەوا نیزیب کە لە شوێنێکی نزیکی ئەو ئاوالکراوە، لە هەلومەرجەکانی کۆماردا هەمان ڕۆڵی هەمبوو. کۆلۆنیەکی نوێی سەرمایەداری پەرەیدەسەند. تەنیا لەڕێی ئەو شووشە و پەیکەرانەی خاڵۆم

مستەفای بازرگانی شتومەکی کۆن لەوەختی بەرەبەیاندا دەیهێنا و دەیبردن، دەرکم بە نکوڵیکردن لەمێژووی رابردووی وێرانەکانی شوێنەواری کارگامێشی مێژوویی و بەلقیس ــ زەوگما دەکرد. لەگەڵ ئەوەی لەقوتابخانە لەگەوهەردا توانای ئاوێتە بوونی ئەوتۆم نەبوو. لەرووخساردا دەمتوانی لەریزی پێشەوە لەسەر هێڵێکی سەرکەوتوودا بەرێوە بچم. هەڵوێستی وشکی داپیرەم حەوا بەجۆرێك خۆی نیشاندەدا کە دەیگووت هێندەی دەخوازی ناتوانی نان بخۆی. دەرکم بەوە دەکرد کە رووبەرووی جیهانی رکابەرەکان بوومەتەوە.

قوتابیەکی زیرەك و بەرچاوانی مامۆستایان بووم. سەرنجیانم راکێشا بوو، باوەڕییانم بەدەست هێنابوو، یەك بەدوای یەك نمرەی باشم وەردەگرت. بەڵام پاشماوەی تایبەتمەندیەکانی دەرەبەگایەتی و لاوازیەکانی ژیانی بۆرژوازی کە هەستمکرد ناتوانم لەگەڵیان ئاوێتە بم، دەبووە کۆسپ لەوەی ببمە خاوەن هیوا و ئومێد. لەدوای قوتابخانەی ناوەندی لەجیاتی قوتابخانەی مامۆستایان، خوێندنی دواناوەندیم هەڵبژارد. لەبەر ئەوەی بەپارەبوو توانام نەبوو. دواناوەندی بەخۆڕایی و خوێندنگای پیشەکاری بژارەکانی پێشم بوون. بەڵام داخوازی راستەقینەم دواناوەندی سەربازی بوو. لەبەر ئەوەی تەمەنم گونجاو نەبوو، رێگای لەپێش گەورەترین تێکشکانی خەیاڵم کردەوە. هەروەکو بڵێی ئەم رووداوە لێدانێکی گەورە بوو بەر خەیاڵی گۆڕینی بەهێزی کۆمەڵگا کەوت. کاتێك دەرکم بەوە کرد کەلەبوارەکانی ئایین و سەربازی ناتوانم پێشکەوتن بەدیبێنم، گۆڕەپانی سیاسیم وەکو ئامانجێك بۆ خۆم دیارکرد. بەو ئامانجەش دواناوەندی پیشەکاری                 کە وەرگیرابووم، دەبووە قۆناخێکی تێپەڕبوون. ئەم خوێندنگایە لەناوەندی ئەنقەرە بوو. لەماوەی نێوان ساڵانی ١٩٦٦ ــ ١٩٦٩دا لەوێم خوێند. بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە پۆلەکانم دەربازکرد. تاوەکو پۆلی دووەمی دواناوەندی ئایدیۆلۆژیای ئایینی لە پێشتر بوو. لەقۆناخی دواناوەندیشدا درێژەم بە رێکخستنی گروپەکانی نوێژکردن دا. چوومە کۆمەڵەکانی ئولکە ئۆچاغلاری و تێکۆشان بەرامبەر کۆمۆنیزم. لێرەدا گوێبیستی هەندێ کۆنفرانس بووم کە سلێمان دیمرال پێش دەهات. لەبواری ئایدیۆلۆژیەوە لەکۆنفرانسی نەجیب فازل کساکورك هەستم بەسەرنج راکێشترین کاریگەری کرد. تاوەکو نیوەی شەو گوێگرتنم لەکۆنفرانسەکەی ترسناك بوو. وەڵامێکی سۆزداری دەدایە ئەو کینەی بەرامبەر کۆمەڵگای بۆرژوازی هەم بوو؛ ئامانجی بەهەمبوونی رێگای دیکە دەکرد.

یەکێك لەبەکاریگەرترین مامۆستاکانی ئەم قۆناخەم مامۆستای ئەدەبیات بوو. سەرهەنگ فاروق چاغلایان کە مامۆستای ئەدەبیاتی قوتابخانەی ئەرڕ(                              ) بوو، پەیوەندیەکی نائاسایی بەرامبەر من نیشاندەدا. نووسینەکانی منی لەگیرفانی خۆی دەگەڕاند، وەکو نموونە لەگەڵ مامۆستاکان گفتوگۆی لەسەر دەکرد، پێشنیاری بۆ قوتابیەکانی پۆل دەکرد بەهای من بزانن و تا ئەم رادەیە باوەڕی پێدەدام. تەنانەت نووسینەکەمی بۆ لای دکتۆرە

تایبەتەکەی خۆی برد. پەیوەندیدارییەکەی بەرامبەر من، بەردی بناخەی پێشکەوتنی بەخۆ باوەڕکردنم بوو.

لەپۆلی دوای قۆناخی ناوەندی پەیوەندیم لەگەڵ چەپ پێشکەوت، ئەمەش چیرۆکێکی سەیری هەیە. کاتێک چەپڕەوی ـــ راستڕەوی وەکو مۆدێلێک هاتە مەیدان، من بەتەدبیر هەڵسوکەوتم کرد. بەوشیارییەکی سنووورداری وەها گەیشتبووم کە بەبێ تێگەیشتن بڕیار نەدەم. رۆژێکیان، کاتێک خوێندنەوەی پەرتووکی ئەلفبای سۆسیالیزمم تەواو کرد کە لە تەنیشت جێگاکەی خۆمــم بینی، لەبیرمە لە هــزری خۆمـدا گـووتم: "**محەمـــەد دۆرانـــدی، مـارکس سەرکەوت**". زانیاریم سەبارەت بە هەردوو بابەتیش سنووردار بوو. هێزێکی وەهام نەبوو دۆگماتیزم تێپەڕبکەم. بەڵام دیسان دەتوانم ئاماژە بەوە بکەم کەلەساڵی ١٩٦٨ کەوتمە سەر راستەڕێی جیابوونەوەی دووریان. لەساڵی ١٩٦٩ لەمیانەی تەڤلیبوونی مەراسیمی ئیمـران ئۆکتەمی سەرۆکی دادگای باڵا وەڵامی دەنگی پێی چەپم دایەوە. ئیتر لەبواری کرداریشدا دەتوانرا بەچەپ لەقەڵەم بدرێم. تەواوی ئەم گۆڕانکارییە نائاساییانە لەماوەی یەک دوو ساڵ روویدا. مێشکم بەتەواوی ببووە ناوەندێکی گومانکردن. لایەنگیریکردنی چەپڕەوان یاخود راستڕەوەکان، منی تێرنەدەکرد. لەنێو برسێتی ئایدیۆلۆژیدا بووم. یەکێکی وەها نەبووم لەرێگای دروشمەکانەوە بکەومە جوڵە.

بەبێ ئەوەی لەهزر و چەمکدا ئیقناع ببم، رۆژ بەدوای رۆژ ژیانم ئاستەمتر دەبوو. گومانکردن گەیشتبووە ئاستی هەرە بڵندی خۆی. گومانم لەهەموو شتێک دەکرد. زانیارییە فەلسەفیە سنووردارەکان گومانی زیاتر دەکرد. نەدەبووم بەملیتانێکی ئاسایی چەپڕەو. هەروەکو چۆن نەبووم بە ملیتانێکی راستڕەو، لەنێو کەش و هەوایەکی بەمجۆرەدا لەساڵی ١٩٧٠ لە دیاربەکر دەستم بەکاری فەرمانبەری تاپۆیی کرد. یەکەمین جار بوو پارەیەکی زۆر قازانج بکەم. کوردایەتیش کەوتبووە نێو گفتوگۆکانی چەپگەری. دیاربەکر شارێک بوو کە بەتەواوەتی کوردبوو. هەربۆیە کێشەی نەتەوەیی زیاتر جددیەتی خۆی دەسەپاند. لەوێدا ئامانجم ئەوەبوو تاقیکردنەوەی وانەکانی دواناوەندی بدەم و بچمە زانکۆ. لەوەدا سەرکەوتم. لەهەمانکاتدا دیپلۆمەی قوتابخانەی زیاگۆکالپم وەرگرت. پارەیەکی وەهام کۆکردەوە تێری زانکۆ بکات. ئەو ساڵە لە تاقیکردنەوەکانی چوون بۆ زانکۆ، زانکۆی دادوەری ئەستەنبوڵم بەدەستهێنا. شوێنی دامەزراندنی خۆم بۆ باقرکۆی ئەستانبوڵ گواستەوە. کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٧٠ و ١٩٧١ م لە ئەستەنبوڵ بەسەربرد. بە خێرایی بووم بە ئەندامێکی (کۆمەڵەی شۆڕشگێری کولتووری رۆژهەڵات) DDKO. رێبەرایەتی بەریشە دەرەبەگ، رێگای پێشکەوتنی بنبەست دەکرد. بەشێوەیەکی رەخنەگرانە هەڵوێستەم کرد. سەرباری ئەمەش هەنگاوێکی جددی بوو. لەکاتێکدا بەخێرایی بەرەو رەوشی ئەندامێکی لە پێشینە دەچووم، کودەتای ١٢ی ئاداری ١٩٧١

ڕوویدا. ئەگەر ئەم کودەتایە کەمێك درەنگ تر بهاتبووایە، لەوانەیە منیشی لەگەڵ خۆی بردبووایە. هەربۆیە بە تەنیشتمدا تێپەڕبوو.

لەئەستەنبۆل کەسایەتی وەکو موسا عەنتەر و حیکمەت کفلجملیم ناسی. موسا عەنتەر وەکو ڕۆحی DDKO وابوو. باسی ئەزموونەکانی خۆی دەکرد، دەیگووت"دەمەوێت بارێتان پێ بکەم. بەتایبەت کوێبیستی گووتەی" ڕۆڵەکانی میزۆپۆتامیا، سەرکەوتن بۆ تێکۆشانتان دەخوازم"لەحیکمەت کفلجملی بووم. بەڵام ئەوەی ڕێگای لەپێش بژارێکی ڕیشەیی من کردەوە، ئەو ئاخافتنەی ماهیر چایان بوو کە چەند ڕۆژێك بەر لە هەنگاوونان بۆ خەباتی نهێنی بەتەنیا لە زانکۆی پیشەکاری ئەستەنبۆڵ چووە سەر کورسی (سەرباری ئەوەی ئەوەی هێنایە زمان ئەو بابەتانە بوون کەمنیش ڕەخنەم دەکرد) بەو دەنگە ڕەسەن و بەبڕیار و باوەڕی و وشیاریەکەی دەیگووت" ڕیفیزیۆنیزم ڕاستیەکە، پێویستە لە دژی بوەستین. ناتوانرێ کێشەی کورد بشاردرێتەوە، نابێ ئەمە پەسندبکرێت. ئەگەر داکۆکی لەسەر هەڵوێستی هەڵپەرستانە بکات، پێویستە پەیوەندیەکان بپڕدرێت"، ئەم ئاخافتنەش نزیکبوونەوەی منی لەچەپڕەوی قووڵتر کردەوە. لەساڵی خوێندنی ١٩٧١ ـــ ١٩٧٢ لەڕیزی بیستەمدا سەرکەوتم و لەزانکۆی زانیاری سیاسی وەرگیرام. ئیتر بەنامانجەکەی خۆم گەیشتبووم. ئیدی لەزانکۆی زانیاری سیاسی فێری سیاسەت دەبووم. هێندە ئاستەم نەبوو ببم بەمیلیتانێکی لە پێشینەی چەپڕەوێتی. کاتێك لەئەنجامی کودەتای ١٢ی ئادار ملیتانە لە پێشەکان دووچاری تەسفیەبوون و گرتن بوون، ڕێگامان واڵابوو. لەمیانەی وشیاری و ئەزموونی سنووردار، ئەو سێ ساڵەی پێشتر لە ئەنقەرە بەسەرم برد ڕۆڵی لەوەدا بینی بەخێرایی بەرەو پێشەوە بڕۆم. هەروەکو لایەنگری بەرەی پارتی کۆمۆنیستی گەلی تورکیا جموجۆڵم دەکرد. لەزانکۆدا قورساییان زاڵ بوو. ماوەیەکی درێژ چاوەڕوانی THKP-C راستەقینەکانم کرد. کاتێك قەڵەمبازە چاوەڕوانکراوەکانم نەبینی، هێندی هێدی لەسەر ڕێبازی خۆم قاڵدەبوومەوە. هەنگاوم بۆ ئامادەکاری سەبارەت بەکێشەی نەتەوەیی کورد دەست پێکردبوو. بەهۆی هەڵوێستە شۆڤێنیەکانی بەرێوەچوون لەگەڵ چەپی تورك ئاستەم دەبوو.

شەهیدبوونی ماهیر چایان و هەڤاڵەکانی و ئەنجامدانی یەکەمین چالاکی بایکۆت بەرامبەر ئەمە، ڕێگای لە پێش زیندانیکردنێکی حەوت مانگی کردەوە. بەهۆی لاوازی و ناتەواوی شاهێدەکانم، لە پانزە ساڵ زیندانی ڕزگارم بوو. دەنیز گەزمیش و دوو هەڤاڵەکەی لە سێدارەدرابوون. تابلێی چەپ سەرکوت کرابوو. کاتێك لەکۆتاییەکانی ساڵی ١٩٧٢ لە زیندانی ماماق دەرکەوتم، بە تەواوی خۆم بەگوێرەی قەڵەمبازی گرووپی سەربەخۆ ئامادە دەکرد، لە نیسانی ١٩٧٣ لە ئەنقەرە، لەبەنداوی چوبوك یەکەمین کۆبوونەوەی سەبارەت بە چارەسەری کێشەی کوردم بە شەش کەس ئەنجامدا. لەکوردستان بیرۆکەکانی دژ بە داگیرکاریم بە بناخە دەگرت. ئەمە پێبەگرتنێکی تایبەت و ڕەسەن بوو. ساڵی یەکەم نزیکەی دوازدە خوێندکاری

زانکۆمان قازانج کرد. حەقی قەرار، کەمال پیر و دوران کالکان کە بەریشە تورک بوون هاتبوونە ریزەکانمان. لەساڵی ١٩٧٤ ـــ ١٩٧٥ بەڕێوەبردنی ئەرکی بەرپرسیارێتی "کۆمەڵەی دیموکراتی خوێندنی باڵای ئەنقەرە" DژADY شانسی پێشکەوتنی گروپی زیاد دەکرد. کاتێك لەساڵی ١٩٧٦ بەشێوەیەکی ڕیشەیی لەچەپی تورك دابڕاین، بڕیاری قەبوون بەرەو کوردستانمان دا، لەگەڵ کۆبوونەوەی دیکەمانی ساڵی ١٩٧٦ بۆ یەکەمین جار حەقی قەرار بەرەو ئاگری، مەزلوم دۆغان بەرەو باتمان کەوتنەڕێ. ئیتر ئەو پردانەمان دەقڕاند کە ئێمەی بە سیستەمەوە گرێدەدا. ئەو کاتە بە ئاپۆچیەکان ناودەبراین.

بۆ وەڵامدانەوەی پیلانگێڕی تیرۆرکردنی حەقی قەرار لەساڵی ١٩٧٧ لەعەنتاب، ئامادەکردنی پرۆگرام، ئەو یەکێتیە مەترسیدار و سۆزداری و ماجەرایەی لەگەڵ کەسیرە یڵدرم، ئاراستەگرتن بەرەو دیاربەکر بەئامانجی گەیشتن بەدوایی، کۆبوونەوە ٢٢ کەسیەکەی گوندی فیس و بڕیاردان دەرهەق بەجولانەوەکە وەکو پارتیەك، کۆتایی بە قۆناخێك دەهێنا. لەکاتێکدا تورکیا بەرەو کودەتای ١٢ی ئەیلول ئاراستەی گرتبوو، یان دەرکەوتن بۆ دەرەوە یاخود ئەگەر بەردیش شەق ببات بەرخودانێکی شاخی چەند مانگێك یان چەند ساڵێك، وەکو بژار ڕووبەڕوومان ببووەوە کە شەرەفی مرۆڤ دەپارێزێ. دەستگیرکردنی شاهین دۆنماز و یڵدرم مەرکیت و ئیعترافکردنیان و داواکاریەکانی کەسیرە، کۆچی ٢ی تەمموزی ١٩٧٩ی بەرەو رۆژهەڵاتی ناوینی مسۆگەرکرد. جارێکی دیکە هەمان ڕێگای حەزرەتی ئیبراهیم دەگیردرێتە بەر؛ لە ئورفاوە، منیش وەکو خەڵکی ئورفا، لەپێناو هەمان ئامانجی پیرۆز و دادوەری، لە پێناو یەکسانی و ئازادی ڕێگای ئاوچەیەکی دیکەی پیرۆز دەگرێتە بەر.

دەتوانرێ شرۆڤەی هەمەجۆر سەبارەت بە کۆماری تورکیای ماوەی نێوان ١٩٦٠ ـــ ١٩٨٠ بکرێت. دەتوانرێ بگووترێ کە کۆمەڵگای تورکیا لەلایەن سەرمایەداریەوە هەژێنراوە و لەنێو قاڵبە تەسکەکانی کۆمەڵگا و دەوڵەتی کلاسیکی جێگای نابێتەوە. ڕاستە کە لێکەرپینێکی قووڵی دیموکراسیەتیش کەوتەگەڕ. دەستووری ٢٧ی ئادار دەرفەتی گفتوگۆکردنی ئازادانەی کێشەکانی ڕەخساندبوو. بەڵام لەجیهانێکدا کە شەڕی ساردی لەسەر زاڵ بوو، دینامیکی ناوخۆ هێزی ئەوەی نییە لەوڵاتێکی هەستیاردا ئەنجام بەدەست بێنێ. تەنیا لەمیانەی شۆڕشێکی گەلەری بەهێز دەتوانرا وەرچەرخانی خێرایی کۆمار لە سیستەمی ئۆلیگارشی بگۆڕدرێت و لەخزمەتی گەلدا بەرەو دیموکراتیزەبوون ببرێت. هەرچی هاوسەنگیەکانی دەرەوەشە دەرفەتی بەشۆڕشی بەمجۆرە نەدەدا. بزاڤی لاوان کە بەناوی گەل بەڕێوەدەچوو، ئەو هێزەی نەبوو دیوارەکانی ستاتۆی لەئارادایە تێك بشکێنێ. بزاڤەکانی لاوان لەجیهان هەناسە کورت ببوون. تاوەکو موحافەزەکاری سۆسیالیزمی بونیادنراو تێپەڕنەکرێت، ئەوا هێندە شانسی هەنگاوی دیموکراتییانە نەبوو. تەنانەت لەم قۆناخەدا بەرفراوانترین شۆڕشی گەلیش ڕوویدات، ئەوا سەرکوتکردنی لەڕێگای هاوکاری هێزی ئیمپریالیزمی جیهانی ئاستەم نەبوو. شایەنی باسە

رژێمەکانی ١٢ی ئاداری ١٩٧١ و ١٢ی ئەیلولی ١٩٨٠ لە ئەنجامی پارمەتیەکانی ئیمپریالیزم بەسانایی جێگیر بوو. ئەم کودەتایانە دیمەنی وڵاتێکی نیشاندەدا کە کێشەی قورسی هەیە. تێکۆشانی شۆڕشگێڕی سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا. بەڵام کودەتاکان ئەوەیان سەلماندووە کە حکومەتی ئولیگارشی و ئەنجوومەن تواناکاریەکی وەهایان نییە تورکیا لە کێشەکانی رزگار بکەن.

وەکو کەسایەتیەکی کۆمەڵایەتی و نەتەوەیی کەوتبوومە نێو دێوەزمێك کە بۆی ئامادە نەبووم. ناسنامە و وشیاری و ئیرادەم نەیدەهێشت تەقلی پێشکەوتنێکی شێوازی بۆرژوای تورکیای ساڵانی ٦٠ ــ ٨٠ و پێشکەوتنێکی شۆڕشگێڕی وەها ببم کە تا دوارادە ماجەرایە، بێ سەرۆکایەتیە، رێباز و کردارەکەی یەکلا نەبۆتەوە. بەشێوەیەکی سەرتاپاگیری نەمدەتوانی تواناکاری هەرسکردنی دەزگاکانی کۆمار نیشانبدەم. هەروەکو بڵێی پێوانەکان زۆر جیاوازبوون. ئەو پەروەردەیەی دەمبینی لەسەر بنەمای ئەزبەرکردن و تەنیا بەئامانجی فەرمانبەریتی بوو. لەراستیدا کۆماری تورکیا لەمیانەی نکوڵیکردن لەناسنامەی کورد شانسی ئەوەی لە دەستدابوو هەرس بکرێت. دەتوانی چ بە دیاردەیەك بڵێی کە نکوڵیت لێکردووە یاخود لەمیانەی ئیرادەیەکی یەکلایەنی فشار بگریتە دەست و وەکو بڵێی" من بەمجۆر شێوەت پێدەدەم و راستت دەکەم"، رووبەڕووی کامە ئامانج دەبیتەوە؟ ئەوەی بەرامبەرت دار نییە، مرۆڤە. ئەم چەمکە تەنیا بۆ سیستەمی دەوڵەتی راهیبی سۆمەرو میسر لەجێی خۆیدایە کە ٢٠٠٠ ساڵ پێش زایین تازە سەریهەڵدابوو. ئەوانیش وەکو پێویستیەکی ئیرادەی رەهای خودایی، هاووڵاتیەکانیان لەمیانەی چەمکێکی یەك لایەنە بەرێوەدەبەن کە تەنیا لەنێو زیندەوەرە خشۆکەکاندا هەیە. ئەو ئایدیۆلۆژیا فەرمییەی لەسەر بنەمای نکۆلیکردنە ناوی کۆماریش بێت، ناشێ هیچ واتایەکی لەمە جیاوازتر لەخۆیەوە بگرێت. ئەگەر شێوەیەکی توانەوەی داگیرکاری بەشێوازی شارستانییەتی رۆژئاوا پەرەیسەندبووایە، لەوانەیە واتایەکی هەبووایە. شایانی باسە قەدەخەکردنی زمان لە سیستەمی راهیبی سۆمەر و میسر بە ئەقڵیشدا تێپەڕنەدەبوو. لەلایەن بەرێوەبەرایەتی تورکیا کار گەیەنرابووە ئەم ئاستە.

بێگومان لەدایکبوونێکی بەگیروگرفت بەرامبەر بەرژێمێکی نکۆلیکردن کە لە دێوەزمە خراپترە لەجێی خۆیدا دەمێنێ و دەکەوتە نێو گومان و ئەندێشەوە. ئەگەر تایبەتمەندێتی مرۆڤێکی شەرمەزەند هەبێت، لێپرسینەوە بەرامبەر رووداوەکان دەکات، هەوڵدەدات تێبگات بۆچی دەخوازن نکۆلی لێبکەن. ئەمەش بەمانای لێپرسینەوەی کۆمەڵگا و دەوڵەتی فەرمی بەرامبەر دەهات. تایبەتمەندێتیە باوەکانی یاخیبوون، بۆ دۆگماتیزمێکی ئەوپەڕگەری کۆك دەبوو. بوون بەموریدێکی باوەڕمەندی هەر قەڵەمبازێکی ئایدیۆلۆژی کە پەسندی دەکات، ببووە راستینەیەك. ناکۆکی و ململانێی کۆماری ئۆلیگارشی و لاوانی شۆڕشگێڕ و ناسنامەی کوردان، تایبەتمەندێتیەکی سەرەکی قۆناخە.

ئەنجامی ئەمەش بونیادنانی فاشیزمە. لەمیانەی دەستووری ٢٧ی گوڵان دەرفەتی دیموکراتیزە بوون لە پێش کۆمار رەخسا. بەڵام بە پێی پێویست پێنەگەیشتنی هەلومەرجەکان، لەوەش گرنگتر دەرنەکەوتنی ئیرادەی گەلێك کە وەکو هێزی ئیرادە و وشیاری ببێتە وەڵام، رێگای لە پێش بەفیڕۆچوونی ئەم تواناکارییە کردەوە. ئەو ئۆلیگارشییەی هەستی بەمەترسی وشیار بوونەوەی گەل کردبوو، بە پشتبەستن بە ئەزموونە مێژوویی و هاوپەیمانە رۆژئاواییەکانی، زەحمەتی لە پێشخستنی پێکهاتەیەکی لەرابردوو دژوارتر نەبینی. ئیتر سیستەم لەمیانەی خواردنی قوربانیەکی زۆر گەورە دەبوو. چالاکی و شەهید بوونەکانی گروپە شۆڕشگێڕیەکان، بیانووی بۆ درندەیی و تۆکمەبوونی ئۆلیگارشی دەخولقاند. ناتەواوی شۆڕشگێڕێتی بەواتای پێگەیشتنی دژە شۆڕش دەهات.

بەرامبەر بەم راستینەیە نەدەتوانرا لەگەڵ کۆماری ئۆلیگارشی بەدوای رێککەوتن بگەڕێین. چونکە بەتەواوی پشتی بە پاشڤەرۆیی، نکوڵیکردن و خوێنمژی دەبەست. تاکە گووتەی وەڵامدانەوەی ئەمە بەکارهێنانی توندوتیژی بوو لەبەرامبەر توندوتیژی. دەرفەت و تواناکاری هیچ جۆرە وەڵامێکی دیکە نەبوو. یان تەسلیمیەت، یاخود بەرخودان وەکو تاکە رێگایەك دەردەکەوتە پێشمان. چەپی تورك بەهۆی ئەو پێکهاتەی کە پێ بەپێ پەرتەوازە دەبوو دووربوو لەوەی وەڵامێکی سەرکەوتووانە بداتەوە. لەمیانەی پێکدادانە لادەرانەکەی راستڕەوی ـــ چەپڕەوی، فاشیزم بەدەزگا دەبوو. هەرچەندە زۆر قارەمانانە بەرخودان بکەن لە پیرعەودالّ و بەدرەدینێکی هاوچەرخ تێپەریان نەدەکرد. شایانی باسە چارەنووسی رێبەرە شۆڕشگێرە مەزنەکانی وەکو دەنیز، ماهیر، ئیبراهیم بەم واتایە دەهات. بەرەو ساڵانی ١٩٨٠ کان توندوتیژی شۆڕشگێری دووبارەبوونەوەیەکی زێدەڕۆیی بوو. لەخولقاندنی ئەنجامێکی هاوشێوەی حەفتاکان تێپەڕی نەدەکرد. لەم قۆناخەدا کۆماری ئۆلیگارشی سەرکەوتنی بەدەستدەهێنا. هێندەی دەیتوانی و دەیدۆزییەوە بەدوای تواناکاریەکانی ژیان دەگەڕا.

وەکو تاك رووبەڕووبوونەوەی تەنیاییەك ببوو بەناچارییەك کەپێ بە پێ قووڵدەبۆوە. ماجەرای کەسیرە دەبووە خوێ و بیبەری مەسەلەکە. ئەوەی توانیم ئەنجامی بدەم، ئەوە بوو کە لێکۆڵینەوەم لەسەر تەواوی ئەزموونە نەتەوەییە ـــ دیموکراتیە هاوچەرخەکان و خوڵقاندنی دەرفەتی ئومێدێك بوو.

ئەمە واتادارترین وەڵام بوو بەرامبەر بەیاد و کۆششەکانی ئەم هەموو شۆڕشگێڕە، لەراستیدا خولقاندنی رێبازێکی ئایدیۆلۆژی، سیاسی و رێکخستنی بەناوی کوردستان، نەك وەکو جودابوونێکی ستراتیژی بەڵکو وەکو ئامرازێکی تاکتیکی یەکێتی ئازادانە دەبینرا. پێویستی جودابوونەوە لەپێناو یەکبوون زەق بوو. یەکێتیەکی زۆرە ملێیانەی کە هیچ بنەمایەکی هاوچەرخی نەبێت، دان بەهیچ پرەنسیپ و رێسایەك دانەنێت، تەنانەت زۆر لەوەی عوسمانیەکان دواکەوتووتر بێت، هیچ واتایەکی نەبوو. کۆمار خۆی مەحکومی دۆگمای

نەتەوەپەرستیەکی نکوڵیکار کردبوو. دەدەکرا لەرێگای ئەمەوە بەگەلبوون و نەتەوەبوونێکی دروست ئەنجامبدرێت. بەرادەی هەرە زێدە فاشیزمیش لەسەر ئەم شێوازە شۆڤێنییەی میللیگەراییەوە بەرز دەبۆوە. هەلومەرجی ئەوەیان بۆ رەخسابوو میللگەرایی ئەتاتورك بەکاربهێنن. هەربۆیە توانست و بانگەشە هاوچەرخەکانی سەرەتای کۆمار دەخرایە خزمەتی پاشڤەرۆیی. ئەمە پیلانگێڕیەکی سیستەمی ئۆلیگارشی بوو، باش سەری گرتبوو. دەرەبەگ و کۆمپرادۆرە کوردەکانیش جێگای خۆیان لە نێو سیستەمی ئۆلیگارشیدا پتەو کردبوو.

بەرامبەر بەم راستینانە نەك لەلایەنی گەوهەر، بەڵکو لەشێوەدا بە گشتی بەئامانجگرتنی کۆمار ناچاریەك بوو. لەکاتێکدا لەو ساڵانەی بەرەو هەشتا من وەکو تاك و PKK ش شێوەمان دەگرت، دیاردەی کۆماری بەرامبەرم فاکتەرێکی پەکلاکەرەوە بوو. ئەوە لەولاوە بمێنێ کەدان بەناسنامەی کوردانەدا بنرێ، هەموو جۆرە رێگا و رێچکەیەکی لەگۆڕنان لەرۆژەڤدابوو. لەمیانەی وشیاری ناسنامەی کولتووری و چینایەتیم کە بەگوێرەی قۆناخ پێکهاتبوو، تاکە خەباتی وائاداری دەمتوانی ئەنجامی بدەم، ئەوەبوو ئەگەر هیچ نەبێت شتێك لە وزەی شاراوەی کوردان بەرهەم بهێنرێ. تەنیا بەمجۆرە وابەستەبوونمان بەیادی شۆڕشگێڕەکانی تورکیا و بەتایبەتی شەهیدی هێژای گروپەکەمان هەڤاڵ حەقی قەرار دەسەلێنرا. رەوش لە رۆیشتن بەدارستانێکی هۆڤ دەچوو کە هیچ رێگایەکی نەکراوەتەوە. لەکاتی بەمجۆرەی مێژوودا بەردەوام قەڵەمبازی هاوشێوە ئەنجامدەدرێت. ئامادەکاریەکی وەها ستراتیژیەتێکی ئەوتۆی نییە. هەنگاو بۆ نادیار(مجهول) دەهاوێژی، شتی نوێ تەنیا بەمجۆرە لەدایك دەبێت. دەرکەوتنی حەزرەتی محەمەد لە مەککە و کاروانی قودسی حەزرەتی عیسا لەگەوهەری خۆیدا هەمان واتایان هەیە. یان تەسلیمی نەزانی و نکوڵیکاری قۆناخ دەبیت، یاخود بن پێیدەکەیت. بەجۆرێکی دیکە پێشکەوتنی مێژوویی بەدینایەت. پێهەڵگرتنی سامسۆنی مستەفا کەمالیش بەمجۆرەیە. لەسەرەتادا ستراتیژ و پرۆگرام و رێکخستنی نییە، بەلام تاکە هەنگاوی راست کە رێگای مێژوویی دەکاتەوە، لە پێهەڵگرتنی وەهادا شاراوەیە. تەنیا کاتێك پێهەڵگرتن واتادار دەبێت، ئەوا ئامادەکاری و ستراتیژی و رێکخستن دێتە ئاراوە. لەراستیدا ئەوەی مستەفا کەمالی گەورە کردووە تواناکاری و دەستەڕۆیی سەربازی نییە، سەبارەت بەم لایەنە بەهێز نییە. هەوڵدەدات ساتێك زووتر لەم گەوهەرە رزگاری بێت. ئەوەی بەئەنجامێکی راستەقینەی گەیاند، ئاسۆ و واتای پێهەڵگرتنەکەیە. قەڵەمبازی وەها لەمێژوودا زۆرن. بەشێوەیەکی گشتی ئەوەی رێگای پێشکەوتنی کردۆتەوە، بەبوێری هاوێشتنی ئەم هەنگاوانەیە.

هەربۆیە سەرباری ئەوەی تەواوی هەلومەرجە مادیەکان لە دژتە، بەلام بیرکردنەوە لە قەڵەمبازی PKK نیشاندانی بوێری لەم پێناوەدا، هەرچۆنێکی چەواشەدەکرێت بابکرێت، لەگەوهەری خۆیدا ئەولایەنەی قورسە ئامانجی کۆماری دیموکراتییە. تەنانەت ئەمە چەمکی راستەقینەی ستراتیژی بوو کە ئامانجی کوردستانێکی ئازاد و سەربەخۆ تەنیا لەمیانەی

کۆمارێکی دیموکراتی بەدیدێت. بەرامبەر بە چەمکی یەکێتی پاشەڤەرۆیانەی هێزە ئۆلیگارشیەکان و کۆماری ئۆلیگارشی، لەبواری پراکتیزەکردنیشدا ئەوە پشت ڕاست کرایەوە کەچەمکی کۆماری دیموکراتییانە و یەکێتی ئازادانەی هێزە دیموکراسیخوازەکان گوزارشتی لەڵەمبازە مێژووییەکەمانە.

دەخوازرا ڕزگاری نیشتمانی کە لە بیستەکان بە پێشەنگایەتی تورکەکان بەڕێوە چوو، لەمیانەی پێشەنگایەتی کوردان بە ڕزگاری دیموکراتی تەواو بکرێت. یەکێتی دیالەکتیکی نێوان هەردووکیان، درێژکراوە و گوزارشتی هاوچەرخی پێشکەوتنی مێژوویی بوو. هەڵوێست نیشاندانێکی بەپەرەنسیپانە بەرامبەر میللیگەرایی سەرەتایی کورد و میللیگەرایی شۆڤێنی تورکان، بەڤوولاییەوە گرێدراوی ئەم ڕاستینەیەیە.

کەسایەتی ئەم قۆناخە بەڤاڵبێك، دەفتەرێك دەچووێنم کە ڕێگا بە نووسینی هەڵەی مێژوویی نادات، بەرامبەر بەمە دەرفەت بەنووسینی چەند ڕاسیتەکی گشتی بدات. هیچ جەسارەتی ئەوەم نەبوو خۆم بزێنم. نامۆبوونم بەرامبەر سەدەی بیستەم هەر بەردەوام بوو. بەتەواوی نقووم نەبوونم لەنێو ڕەوشی ڕۆژانەیی هۆکارێکی بەدەستهێنانی ڕەهەندی مێژووییە. ئەگەر سەبارەت بە کوردان ئەم قۆناخە وەکو قۆناخی کورکبوون هەڵسەنگێنرێ چەوت نابێ. شانبەشانی خولقاندنی گەل خۆخولقاندن، تەنیا گرفتێکی وشیاری و فەلسەفی نییە، لەهەمانکاتدا ناوەرۆکێکی ئاکاری بوو. ژیانێکی دابڕاو لە ڕاستینە سەرەکیەکانی گەل، بەکەوتن و بێشەرەفی و بێ ئەخلاقی دەبینرا. گومانەکانی سەبارەت بەخوداوەند لە مێشکمدا هەبوو، جێگای خۆی بۆ گومان لەبوارەکانی کێشەی نەتەوەیی و ڕێکخستن و سیاسەت بەجێهێشت. سەبارەت بەتێرکردنی زاخاوی مێشکم ئەم دیاردە ماددیانە گونجاوتر بوون. لەجیاتی میتافیزیا، شێوازی دیالەکتیکی سەرنج ڕاکێشتر بوو. بێگومان بەرامبەر جموجۆڵ و بزووتنەوەی شۆڤێنی کۆمار و کۆمەڵگای بۆرژوازی، بەرجەستەکردنی ناسنامەی کورد، هەنگاوێکی گرنگ و بایەخدار بوو. ئەمە سەبارەت بەکۆماریش دەسکەوتێکە. کاتێك بەهەموو پێودانگەکانیەوە دیموکراتیزەبوون ڕێڕەوی گرت، هیچ گومانم لەمە نەبوو کە ئەم ڕۆڵەم دەرکی پێدەکرێت.

درەنگ دەرکم بەوە کرد کە گرنگترین کەموکوڕیم تێکەڵکردنی دۆگماتیزم و ڕاستی بووە لەگەڵ یەکتردا. بەڵام ئەم دیاردەیە تاوەکو ئێستاش لە ئاستێکی بەرزدا وەکو ڕاستینەیەك لەنێو کۆمەڵگای ڕۆژهەڵات لە ئارادایە. سەرسوڕهێنەر نییە کە دۆگماتیزمی سۆسیالیزمی بونیادنراو جێگای دۆگماتیزمی ئایینی بگرێتەوە. دۆگماتیزم وەکو نەخۆشیەك لە چەمکەکانی کولتووری و ناسنامەی تەواوی لایەنە ڕاست و چەپەکان وەکو نەخۆشییەك وەستاوە و پێویستی بە بەلاوەنان هەیە.

**٣. خۆخولقاندن لەمیانەی شەڕ، بەڵام تاوەکو کوێ؟**

قەڵەمبازی شۆڕگێڕانە لەخاکەکانی میزۆپۆتامیا و ئەنادۆڵ بەرەو شوێنگە پیرۆزەکانی رۆژهەڵاتی ناوین، نموونە مێژووییەکان دێنێتەوە یاد. ئەوەی ئەنجامدراوە قەڵەمبازی گروپێکی ئەتنیکی یاخود قەوم نییە؛ لەمیانەی هەنگاونان بەو باوەڕیەی کە ئایدیۆلۆژیای شۆڕشگێڕی هاوچەرخە، ئەزموونی سەرلەنوێ خۆ پراکتیزەکردن و بەژیانیکردنە. هەموو شێوەیەکی کۆیلایەتی رەتدەکرێتەوە، تاوەکو بڵێی باوەش بۆ ئازادی دەکرێتەوە. لەنێو سەختترین هەلومەرجدا و لەمیانەی مامانێتی زەبری شۆڕشگێڕی، ئەو شوێنەی بۆ سەرلەنوێ لەدایکبوون هەڵبژێردراوە، لەسەرووی شوێنە گونجاوەکانی جیهان دێت. هەروەکو تۆوەکانی باوەڕی کە لە مێژوودا هەوێن بووە و لەوێشەوە بەجیهاندا بڵاوبووەتەوە، تەواوی کەسایەتی گرتۆتەوە. لەسەرووی هەموویانەوە تایبەتمەندێتیە سیاسی و ئایدیۆلۆژییەکان، کولتووری چینایەتی و نەتەوەیی، وەکو هەویر بەیەکەوە دەیانشێلێ و دەکرێت بە خانەیەکی سەرەکی و لەمیانەی گوزارشتێکی ئازادانەی بەهێز لە پێناو سەرلەنوێ زایین، وەکو پیرۆزی راهیب ــ موئمین هەموو جۆرە هەوڵ و کۆششێك دەدرێت. هەروەکو بڵێی هاوڕێی حەزرەتی ئیبراهیمم، هەوڵدەدەم بە خێرایی زۆری و زەحمەتیەوە رێگا بکەمەوە. هەروەکو حەزرەتی موسا، بۆ ئەوەی ئەو قەومە ئەفرەتلێکراوە لاڕێیە بێنمەوە سەر راستەڕێ، تاوەکو دوایی هێزی هزر دەکەمەوە. هەروەکو عەزیز پاولێ باوەڕمەندەکان بۆهەموو شوێنێك دەنێرم و بڵاودەکەمەوە. بۆ ئەوەی ویژدانی مرۆڤایەتی لەدەست دەرنەچێ، چەندەی بڵێی نزیکی شێوازی پێغەمبەرایەتی دەبمەوە. دەبووایە بەرامبەر راستینەکانی سەدەی بیستەم کەڵێی بەگومان بووم چۆك دانەدەم. رۆحی مرۆڤایەتیم تەسلیمی ئەو نەدەکرد. یاخیبوون ریشەیی بوو و بەجۆرێك کە شایستەی نموونە مێژووییەکان بوو. زۆر لەولاوەی نەتەوەپەرستیەکی تەسك بوو، بەناوی مرۆڤایەتی بەرپرسیارێتی بوون بەهیوا و ئومێدێکی لەدەست نەدەدا. بەپوختی باوەڕی بەجیهانی لە ئارادا نەبوو و تەسلیمی نەدەبووین. بەبێ سڵەمینەوە بەدوای یۆتۆپیای نوێدا وێڵ بووین کە پێویست بوو پشت بە راستی و دادوەری و جوانی ببەستێ. هێزە ماتریالیستەکانی سەردەم هەرچەندە زۆرینەش بن، خولقاندنی یۆتۆپیایە نوێکانی رۆژهەڵاتی ناوین، دەبوو بە عینادێك بەرامبەر هەموویان.

دیاریکردنی ئامارێکی ئەو تێکۆشانەی لەماوەی نێوان ساڵانی ١٩٧٩ ــ ١٩٩٩ بەڕێوەم بردووە ئاستەمە و پێویستیش ناکات. لەداهێندەدا بە پشتبەستن بە ماتریالە دەوڵەمەندەکان مێژوو ئامارێکی راستەقینە دیاردەکات. شیکردنەوەی رێباز و هێڵە سەرەکیەکانی هەڵوەستەکەم سوودمەندتر دەبێت.

١ ـ نابێ ئیرادەی ئازادی دیل بکرێت و بشێوێندرێ. لە رۆژهەڵاتی ناوین تەنیا رێگایەکی سیاسەت ئاڵۆز و نادیار نییە، بەڵکو کەناڵەکانی بڵاوبوونەوەی ئایدیۆلۆژیاش ئاڵۆز و نادیار و

تێکەڵە. دەرکەوتن بەبێ لارێچوون پێویستی بە تواناکاریەکی مەزن هەیە. لەو سەردەمەی رێگا سەرسوڕهێنەرەکانی زیگۆراتەکانی سۆمەر و ئەهرامەکانی میسر ئەم راستینەیە بەم شێوەیە، ئایدیۆلۆژیا و سیاسەتەکان بەرادەیەکی سەرسوڕهێنەرانە دەتوانێ سەرکەوتووبێت. هەربۆیە چوون بۆ رۆژهەلاتی ناوین و هەوڵدان بۆ بەرێوەبردنی سیاسەت، بەوە دەچێت کە رێگا زگزاکەکان دەکەوێتە نێو ئاڵۆزی و نادیاریەکی بێ سنوور. گەوهەری سیستەمە ئاڵۆز و نادیارەکە تاك دەپەشۆکێنێ و بەخۆیەوە گرێ دەدات. راهیبەکانی میسر و سۆمەر هەموو هێزی خۆیان لەو تاقیکردنەوە سەرسوڕهێنەرانە وەردەگرت کە تەواوی بەرنەندامەکانیان پێدا تێپەڕدەکرد. تەواوی ئیرادە سەرەرۆییەکانی دواتر لاسایی ئەم پێڕەوانە دەکەنەوە، هەرکەسێکی دەکەوێتە پێشیان واقوڕماوی دەکەن و دەیخەنە ژێر کاریگەری خۆیان. هەروەکو بڵێی ئەمە جۆرێکی پەروەردەی ملکەچکردنە. کاتێك هەموو جۆرێکیش لە باخێکدا دەگەرێنرێن ئامانج ئەوەیە. کاتێك بەکردەوەیەکی جەهەنەمیشی تێپەڕدەکەن، ئەوەی دەخوازن ئەنجامی بدەن، جیاوازی یان شکاندنی ئیرادەی ئازادە، یاخود ملکەچکردنە. پێکهاتەی بۆهێڵی ( Genatik ) بەرێوەبەرایەرتی سیاسی رۆژهەلاتی ناوین بەمجۆرە دانراوە.

ئەوەی کۆماری تورکیا ئەنجامیداوە شکاندنی ئیرادەیە لەرێگای پێڕەوی قەبە و دژوار، هەرچی لە رۆژهەلاتی ناوینە بەشێوەیەکی نەرمتر و خەڵەتێنەر و لێکدانەوە وردەکانی بازرگانان ئەنجام دەدرێت. هەربۆیە ئەگەر بگووترێ "هەنگاومان بەرەو گۆرەپانی ئازادی هاوێشت و رزگارمان بوو" خۆ خەڵەتاندنە. لە پێهەلگرتن بۆ ئەوروپاش ئەمە بەمجۆرەیە. پێهەلگرتن بۆئەوەی سۆزێکی ئازادی خەڵەتێنەر دەداتە دەست، بەلام کەسایەتیەکی قووڵ و نەخۆش بەتەواوی گەمارۆ دەدات و دەیکاتە بەلایەکی سەر ئەوانەی دەمێنێتەوە.

دەبێ ئاماژە بەوە بکەم کە لەرۆژهەلاتی ناوین بۆئەوەی ئیرادەی ئازادی لەدەست نەدەم، هەوڵ و کۆششێکی زۆرم دا. لەو ناوچەیەی کە بەرادەی هەرە زێدە میللیگەرایی تێدا پێشکەوتووە، لە چوارچێوەیەکی دیموکراتی هاوچەرخدا گەران بەدوای پەیوەندیدا، تەنانەت هەوڵێکی لەخۆرایە. ئەوەی دەسەپێنرێ عەشیرەتگەراییەکی هاوچەرخە کە لەسەرووی هەمووشیانەوە بەرژەوەندی تیرە و هۆزی خۆی لە پشتەوەیە. هەرچەندە لەمیانەی ووشەی بریقەدار گوزارشتی لێبکرێت، میللگەرایی شێوەیەکی پێشکەوتووی شۆڤێنیزمی خێڵە، گوزارشتێکی خێلایەتییە کە گەورە کراوە و بەسیاسی بووە. ئەمەش تێروانینێکی تەسکە و لە خۆی بەولاوە کەسی تر نابینرێ. کاتێك بەمجۆرە بوو بەردەوام ئیرادەی ئازادی تۆ بۆخۆیان وەکو هەڕەشە دەبینن.

دەتوانم بڵێم ئاستەمترین مەسەلە بۆمن، پاراستنی ئیرادەی ئازادم، نیازی ئازادی بەرنەندامە نوێیەکانی هەڤاڵێتی بوو، ئەمە بووە بەسەرەکیترین کێشە. تاوەکو ئێستاش دۆستان و ئەندامانی PKK لەوە دوورن کەبزانن ئەمە بە چ واتایەك دێت. هەربۆیە تەسك و

لەیەك ئاستدا دەمێنێ، ناتوانن خۆیان ڕزگار بکەن و نەبنە قوربانی تەکتیکە بچووکەکان. کۆششێکم کەزۆر لەسەرووی بەشداربوونە کردارییەکەم بەهادارترە، ئەوە بووە کەنەهێڵم چ لە ناوخۆ بێت یاخود لەدەوروبەردا ئیرادەی ئازادی لەلایەن تەڵەکەبازەکان بەخراپی بەکار بهێنرێت. نابێ لەبیربکرێ کە ئیرادە و ڕۆحی ئازادی لەدەست بدەین، تەنانەت ئەگەر دەوڵەتیش لەپشت بێت لەرووخان ڕزگاری نابێت.

ب ـــ ئاواکردنی ئیرادەی ئازاد، لەمیانەی سەربەخۆیی ئایدیۆلۆژی و بەهێزبوونی ڕێکخراوبوون بەدیدێت. ناشێ باس لەئیرادەی ئازادی ئەوانە بکرێت کە سەربەخۆیی بیرکردنەوە و ڕێکخراو بوونیان لەدەستداوە. مسۆگەر ئەمانە بەشوێنێکەوە گرێ دەدرێن. ئەگەر بۆشایی لە سیستەمی ڕێکخستن و بیرکردنەوەدا هەبێت، مەحاڵە لەلایەن ڕکابەرەکانیان پڕ دەکرێتەوە.

لەرۆژهەڵاتی ناویندا تێکۆشانی مەزنم بەڕێوەبرد تاوەکو ڕەوشی دیلێتی ئیرادە و بێ ڕێکخستنی ڕوونەدات. ئەو مەیلەی ئاستەمە ئاستەنگ بکرێت ئەوەیە کە ئەوەی بەزۆری لەو کەسایەتیانەدا دەبینرێ کە فەڵەمباز ئەنجام دەدەن ئەوەیە کەساتێك زووتر بۆئەوەی لە کاریگەری زەحمەتیەکان ڕزگاریان بێت، بەدوای ڕزگاری کەسێتی خۆیدا دەگەڕێت. لەراستیدا کەوتنە نێو ئەم مەیلە، ئەگەر بەشێوەیەکی جیاوازیش بێت بەواتای دەستپێکردنی دابڕان لە واتای شکۆداری فەڵەمباز و بەها ئازادەکەی دێت. کاتێك دەڵێ ماڵێ ـ خاوەن ماڵێ ماڵێ ـــ منداڵێ بەرامبەر بە کێشە و گرفتەکانی گوزەران، لەهەموو شوێنێك و بەرامبەر هەرکەسێك ملکەچ دەکات. چ ڕۆژهەڵاتی ناوین بێت یاخود ئەوروپا لەم ڕێگایەدا بۆتە گۆڕستانی هەزاران شۆڕشگێر و جەنگاوەرانی ئازادیخواز. ئەوانەی لە شەڕەکانیشدا ژێر نەکەوتوون لەم ڕێگایەدا بەلێزمە لە پەلوپۆ کەوتوون. لەبەرئەوەی دەرکەم بەو مەترسییە کردبوو، گەورەترین کارو خەباتم ئەوە بوو کەژیانێکی وەها بۆخاوەن ئیرادە ئازادەکان بەدیبێنم کە گرێدراوی هێزی بیرکردنەوە و دیسیپلینی ڕێکخستن بژین، لەم پێناوەشدا لەهەموو بوارێکدا فیداکاریم کرد. لەکاتێکدا تەواوی ڕێکخراوەکانی دیکە پەرتەوازە بوون و لەبیر کران، ئەوا ئەم هەوڵ و کۆششانە بناخەی ئەوە پێکدێنێت کە تاوەکو ئێستا PKK لە میانەی هێزێکی مەزنەوە پێشدەکەوێت و وەرچەرخانی خولقێنەرانە ئەنجامدەدات.

زۆر دەخوازم ئەوە بزانرێ کە: پێشخستنی وشیاری ئازادی و تواناکاری ڕێکخستنی گەنجێك بەتایبەتیش کچانی گەنج، زەحمەتترین خەباتە، بەڵام خەباتێکە ئەنجام دیاردەکات. خۆفیداکردن بەبێ ئەوەی کات و شوێنی هاتبێت، کەوتنە نێو پێکدادان و خەباتێکی حەماڵی، لەسوود زیاتر، زیانبەخش دەبێت. بەتایبەتیش لەمیانەی وشیاری ئازادیەوە تواناکاریە ڕێکخراوەییەکان زاڵ نەکرێت کە ئیرادەی ئازادی بەهێز دەکات، ئەو خەباتە کردارییانەی بەڕێوە دەبرێت زیاتر بەلا دێنێتە ئاراوە. سەرباری ئەوەی هەوڵەکانم لەم لایەنەدا

پەکلاکەرەوە بوو، ئەو بەشە بوون کە بەرادەیەکی هەرە کەم دەرگی پێکراوە لەبەرئەوەی کاتێك باسی خەبات دەکەیت بەردەوام حەماڵی بەخەیاڵی کەسایەتی کورددا دێت، هێندە نرخی بیرکرنەوەی ئازاد و بەڕێوەبەرایەتی ڕێکخستن نازانێ. لەم رووەوە شەڕێکی مەزنی ئیرادەم بەڕێوەبرد. ئەگەر ئەم شەڕە نەبووایە، ئەوا هەر ئەندامێکی PKK لەدەستی ئەم هێز و ئەو هێز یان دەبێتە حەماڵێکی ئاسایی یاخود بەبێ ئەوەی هەست بکات کە کراوە بەنۆکەر، دەبێتە یەکێك کە خۆی خەڵەتاندووە یاخود لە موئمینێکی پەرێشان تێپەڕناکات کە لەناوخۆیدا داخراوە. ئەوەی منی بەتەنیا هێشتەوە عیناد و داکۆکیکردنی مەزنم بوو لەم لایەنەدا. بەگوێرەی من بێبەشبوون لە سووربوون و هەوڵێکی بەمجۆرە، زۆر لەوە مەترسیداترە کە پیرۆزترین بەهاکەی بەناموس دەناسرێت، واتە لەوە مەترسیدارترە کە خێزان و خوشکی خۆت پێشکەش بەخەڵکی بکەیت.

ج ـ پاراستنی ناسنامەی کورد لەسەر بنەمای ئازادی، یەکێك لە ئاستەمترین خەبات و تێکۆشانە. نەك تەنیا لە ئایدیۆلۆژیای فەرمی تورکاندا، بەڵکو لە ئایدیۆلۆژیای فەرمی عەرەب و فارسەکانیشدا کورد گوزارشت لە بەشێکی پارچە خراپبووەکان دەکات. رووبەڕوو بوونەوەمیان لەمیانەی ناسنامەیەکی کوردی ئازاد و شەرەفمەندانە، جیاوازی لەگەڵ هەڵوێست نیشاندانێکی دوژمنکارانە نییە. کاتێك بەشێوەیەکی ئازاد لەمیانەی ناسنامەی کوردەوە رووبەڕوویان دەبنەوە کە سەدان ساڵە نکوڵیان لێکردووە هەموو جۆرە پیلانگێڕیەکیان لەسەر رەوا بینیوە، بۆیان رەوشێکی پڕ لەئێشە. هەربۆیە پێویست دەکات باش دەرك بەوە بکرێت کە ناسنامەی کوردی ئازاد مەترسیدار نییە و پێویستییەکی ژیانی برایانەیە و بۆ پەسندکردنی ئەمەش بەسەریاندا پێویستی بە توناکاریەکی مەزن و ئارامی و کارامەیی هەیە. لە مۆزائیکی گەلانی رۆژهەڵاتی ناوین کردنەوەی جێگایەکی شەرەفمەندانە بۆ کوردان زۆر ئاستەم بووە. گەیاندنی ناسنامەی کورد بە شوێنێکی شایستە و شەرەفمەندانە، کە بەکرێگیراوانی کورد وەکو هەرزانترین کاڵا کردوویانەتە بابەتی هەراجکردن، زەحمەتترین تێکۆشانم بوو لەرۆژهەڵاتی ناویندا. لەم لایەنەوە PKK و گەلێك ناوەند و دەوروبەری کورد، ئەوانەی دۆستن و دۆستیش نین، وەها مەزندە دەکەن کە پێشکەوتنەکان لەخۆڕا بەدیهاتوون. بەتەنیا هێشتنەوەم لە رۆژهەڵاتی ناوینیشدا لەنزیکەوە گرێدراوی بە بەرزی هێشتنەوەی کەرامەتی کوردە. هەموو کەسێك کوردی نۆکەر و داردەست دەخوازێت. کاتێك ئەمە پەسند ناکرێت و رەتدەکرێتەوە، ئەوا هاوکاری و یارمەتیدان لە گەمە و پیلانگێڕیەکاندا یەك بە دوای یەکتر پێشدەکەوێت. کاتێك کەسایەتی خۆم لەگەڵ کەسایەتی کوردی ئازاد دەکەم بەیەك، واتای راکێشانی تەواوی مەترسیەکانی مێژوو و سەردەمە بۆ سەر خۆم. ئەو نەفرین و دوژمنایەتییە زیادەی لە راستینەی کورد پەنگی خواردۆتەوە، ناوەرۆکێکی وەهای هەیە، هەر کەسێك لێی نزیك بێتەوە دەیسووتێنێ. هەربۆیە بەدرێژایی مێژوو زیاتر راکردن لە ناسنامەی ئازاد بووە و بڕیار

بەلایەنی بەکرێگیراوی دراوە. ئەگەر ئەویش مەترسیدار بینرابێت، ڕۆڵی داردەستی ماڵەوەیان بینیوە و بۆ هەر ڕەنگێك خۆیان گۆڕیوە كە ئەربابەكانیان خواستوویانە. پارچەكردنی تەواوی ئەم دابونەریتانە، تەنانەت سەرباری ئەمانەش بەزیندوویی هێشتنەوەی ناسنامەیەكی ئازاد، دیموكراسی و یەكسانی و ئازادی لەناسنامەی خۆیاندا لەو پێكهاتانەی كە پێشنەخراوە، بەردەوام ڕێگای لەپێش گرژی و نائارامی كردۆتەوە. بڕیاریان لەسەر ئەوە داوە، كە ئەو ناسنامە ئازادەی لەكەسایەتی مندا نوێنەرایەتی دەكرێت لە بەرژەوەندیاندا نابێت. كاتێك دەڵێم "من وەكو تاك ونم كرد، بەڵام گەلی كوردی ئازاد سەركەوت" مەبەستم ئەم ڕاستینەیە بوو.

ژیان و تێكۆشانم لەرۆژهەڵاتی ناوین ئەگەر سەبارەت بەراستینەی گەوهەری تەماشای بكرێ، ئەوا دەبینرێ كە سێ پێكهاتەی سەرەكی بەدیهاتووە.

یەكەمیان خولقاندنی ڕاستینەی گەلێكی جەنگاوەرە. گەوهەری ئایدیۆلۆژی و ڕێبازی سیاسی كەلە هەلومەرجی توركیا خولقێنراوە هەرچەندە لەژێر كاریگەری دۆگماتیزمێكی فورسیش دابێت، ئەوا لەچارەسەركردنی كێشەی نەتەوەییدا بەشێوەیەكی گشتی كاریگەری سۆسیالیزمی زانستی كراوەتە سەر و گوزارشت لە گونجاندنی دەكات بەگوێرەی هەلومەرج و واقیعی بەرجەستە. لێرەدا ئەوەی گرنگە بەبێ پەنابردنە بەر قاڵب و هێزەكانی سۆسیالیزمی بونیادنراو، خولقاندنی سیستەمێكی ئایدیۆلۆژی بۆ گەلی كورد پێویستە كە لەمیانەی هێزی بیركردنەوەی خۆی و هەوڵی كرداری بێت. هەرچەندە ئەم ئەركە هەندێ لایەنی كەموكوڕی و دۆگماتییانەشی هەبێت، بەشێوەیەكی سەرەكی لەو قۆناخ و لەنێو ئەو هەلومەرجەدا سەرخراوە كە هێشتا لەتوركیا بووم. هەرچەندە چەندین لایەنی گشتی لەخۆوە بگرێت، لە ئەنجامدا ڕێبازە سیاسیەكەی بۆیەكەمین جار لەسەر بنەمای بەرژەوەندیەكانی گەلی كورد، بەشێوەی ئیرادەیەكی ئازاد بەرجەستە بووە كە خزمەتی دەكات. ڕێگای بزاڤی ئازادیخوازی گەلی كوردی قۆناخی نوێ ڕۆشنكراوەتەوە، ئەو ڕێگایە دیاركراوە كە دەیگرێتەبەر. تاوەكو ساڵی ۱۹۸۰، بەتایبەتی لەمیانەی چالاكی ۳۰ی تەمموزی ۱۹۸۰ی PKK لە سیفەرەك بەرامبەر بنەماڵەی بۆجاق، ئەم قۆناخە گەیشتە لوتكەی خۆی. ئەمە دەتوانرێ وەكو كۆتایی قۆناخێك و ڕاگەیاندنی قۆناخێكی نوێ هەڵسەنگێنرێ.

ئەوەی لە ڕۆژهەڵاتی ناوین خولقێنراوە، وەڵامدانەوەی هێزەكانی فشاری ناوخۆ و دەرەوەی سەر گەل و پەیوەندییە ئایدیۆلۆژی و سیاسیە پاشەڕۆكانە لەمیانەی شێوازی شەڕەوە. بۆ یەكەمین جارە گەلی كورد لەو ڕێگایەی لەلایەن ئیرادەی خۆی و بەگوێرەی بەرژەوەندیەكانی دیاركراوە، لەپێناو بەدەستهێنانی ژیانێكی ئازاد، كەوتۆتە نێو بڕیار و شەڕێكی وەها كە هەرچی كۆسپێكی لەپێشیدا هەبێت پێیان لێبكات و بەلاوەیان بنێت، لەگەڵ هەزری دواكەوتوو و خو و ڕەوشتی هەزاران ساڵەی خۆی كەوتۆتە نێو شەڕ و ململانێ. بۆئەوەی مێشكی ئازاد و

لقەكانی بخولقێنرێ، ئەم شەڕە پێویستییەكی ژیانی بوو. لە هێرشكردنە سەر و پاككردنەوەی تەواوی پاشخانەكانی كۆیلایەتی سیستەمە باڵادەستەكان، لە نیۆلیتیك تاوەكو كۆیلەداری و دەرەبەگایەتی و دواتریش تاوەكو ئەوەی سەردەمی سەرمایەداری دوو دڵی نەكردووە. ئەوەی پێویستە لە پێناوی ئازادی ئەنجام بدرێت، شەڕیكی ناوخۆیە. هەرچەندە پڕ لە ژانیش بێت، لەمیانەی ئەم شەڕەوە ئەو لایەنانە فرێدەدات كەبوونەتە كانگرێن. بۆ یەكەمین جارە لە مێژوودا بەشێوەیەكی بەرفراوان و سیستەماتیك ئەو پەیوەندییە ئایدیۆلۆژی و كردارییانە رووخێنراوە كە سەرچاوەی خۆی لە چینی كوردە بەكرێگیراوەكان وەردەگرێت و هەموو جۆرە پاشڤەڕۆیی و نۆكەرایەتییەك لەخۆوە دەگرێت و دەرفەت بە رۆشنگەری نادات. ئەگەر ئەم شەڕە پیادەنەكرێت، ئەگەر بەشێوەیەكی سنوورداریش بێت سەرنەخرێت، ناشێ شەڕی ئازادی بەرامبەر هێزە دەرەكییەكان ئەنجامگیر بێت. ئەوەی خوازرا لە میانەی چالاكییەكەی دژ بە بۆجاق بسەلمێنرێ ئەم راستینەیەیە. ئەو شەڕەی چەتەگەرێتی ناو PKK و میلیگەرای سەرەتایی كورد رێگایان لەپێش كردەوە، دیسان سەرچاوەی خۆی لەم راستینە وەردەگرێت. دەرنەكەوتنی ئیرادەی ئازادی گەل و ئەگەر سەریشی هەڵدابێت، سەركوتكردن و هێرشە بێبەزەییەكانی ئەم هێزانە لە بەرامبەری، هۆكارەكەی بۆئەوە دەگەڕێتەوە كە مسۆگەر گرێدراوی تایبەتمەندێتی مێژوویی و بەرژەوەندییە ژیانیەكانیەتی. ئەگەر بەگوێرەی ئاستی خوازراویش نەبێت، دەتوانرێ بگووترێ تارادەیەك ئەم شەڕەی گەل سەركەوت.

پێناسەكردنی چالاكی ١٥ی ئاب وەكو پاراستنی گەوهەری راستینەی گەل كە دەخوازرا بە تەواوی بختكێنرێ، راسترین گوزارشتە. ئەگەر ئەمە وەكو هێرش دیار بێتە لەگەوهەری خۆیدا ئاگاداریەكە دەڵێ "من گەلەم لەتێوم مەبە . بەتایبەتیش وەڵامە بۆ بەرتەلیەتی زیندانی ئامەد و هاوڕەكانی " دەست لەهەبوونی خۆمان بەرنادەین"؛ شەڕیكە لە پێناو وەڵامدانەوەی گووتەی " پێویستە دونیا دەنگمان ببیستێ"ی مەزلوم دوغان و گووتەی "تاكوتن ئەكوتن لە هەبوونمان بكەن" ی محەممەد خەیری دورموش و واتاداربوونی گووتەی رزگاری گەلی تورك لە شەڕی ئازادیخوازی گەلی كوردا دەبینم" ی كەمال پیرە. ئەم هەڵمەتەی شەڕ وەڵامێكە دراوەتە هێزە سەرەڕۆیی و ئۆلیگارشیەكان، لەسەرووی هەمووشیانەوە هێزە ئۆلیگارشیەكانی توركان و كوردان و جەخت لەسەر ئەوە دەكات " ئیتر قۆناخی فشار و چەوسانەوەی بێ سنوورتان لەسەر گەل تێپەڕبوو، كاتی ژیانی ئازادی ئێمە هاتووە". بۆ ئەوەی بەشێوەیەكی هاوچەرخ و شەرەفمەندانە بژی، پێویستە قوربانیەك بدرێت. ئەم قوربانیەش خودی شەڕی گەلە. بەجۆرێكی دیكە دەرفەتی رزگاربوون لەو هێزە ئۆلیگارشی و سەرەڕۆییانە نییە كە لە چوار لاوە گەمارۆی داون. بە ئەندازەی ئەوەی شەڕی خۆی بەرامبەر هەموو جۆرە هێزێكی ئۆلیگارشی و سەرەڕۆ بەرێوەببات، ئەوا بوون بە گەلێكی ئازاد و شەرەفمەند دەبێتە راستییەك.

هەرچەندە زیان و ئێش و ئازارەکانی چەندە مەزن بێت، بەڵام پارچەکردنی سیستەمێکی توانەوەی زۆرەملێ و فشار کە گەیشتبێتە ئاستی نکوڵیکردن لە هەبوونت، تەنیا ئەو کاتە بەدیدێت، کە گەل تاوەکو مۆخی ئێسقانی هەست بە شەڕی پاراستنی گەوهەری خۆی بکات. ئەگەر ئەم شەڕە نەبێت هەروەکو چۆن نابێ بە خاوەنی هیچ مافێك، ئەوا لە قڕکردنیش رزگاری نابێت. هەربۆیە شەڕی گەلی کورد لەنێو هەلومەرجەکانی رۆژهەڵاتی ناوین بەرامبەر ئەو هێزە پاشڤەڕۆ و پاکتاوکارانەی هێرشیان کردۆتە سەر هەبوونەکەی، لەوە بەولاوە کە پێویستییەکە، چالاکییەکی پیرۆزی درێژەدان بە هەبوون و ئازادکردنی خۆیەتی. کەموکوڕیەکانی، ئەو خیانەتانەی دووچاری هات و پێشنەکەوتنی فەرمانداریێتییەکەی و کورتخایەنی و درێژخایەنی، هیچ لەم پیرۆزیە ناگۆڕێ و ناتوانێ بێ واتای بکات. هەروەها ئەم شەڕە شەڕێك نییە لەدژی گەلانی دراوسێ یاخود لە پێناو دابڕان بێت. بە پێچەوانەوە شەڕی یەکێتی ئازادانە و کۆماری دیموکراتییە کە هەموویان دەوڵەمەند و شەرەفمەند دەکات. شەڕی یەکێتی ئازادانە و پێشکەوتووخوازی گەلانە بەرامبەر بە جوداخوازی و پاشڤەڕۆیی نایینی و میللگەرایی کە هێزە باڵادەست و چەوسێنەرەکان دەیسەپێنن. چ لەلایەنی تیۆری بێت یاخود کرداری تەرخانکردنی هەموو شتێك لەپێناو شەڕێکی گەلەری بەمجۆرە باوەڕیم وایە کە ئەرکێکی منە بەرامبەر گەلەکەمان. هەرچەندە هەروەکو چۆن خواستوومە ئەم شەڕە گەلەرییە بەرێوەنەبراوە، بەڵام باوەڕیم بە پێویستی و گەوهەرەکەی مسۆگەرە. بەڵام ناتوانم بڵێم بەرامبەر بە چەتەگەرێتی ناوخۆ تاوەکو دەگاتە هێزە ئیمپریالیستە هەمە جۆرەکان سەرکەوتنی پێویستم بەدەستهێنا کە دەمخوازن ئەمە بەخراپی بەکار بێنن. بەڵام هەرگیز نابێ لەبیر بکرێت کە ئەم ئەرکە دەکەوێتە ئەستۆی هێزی پێشەنگ و ئەو گەلەی شەڕ بەرێوە دەبات. هەوڵەکانم لە پێناو گرێدان بە بەرخودانی هەزاران ساڵەی گەلی کورد و گەلانی رۆژهەڵاتی ناوین و پێ بەخشینی گەوهەرێکی هاوچەرخ و پێشکەوتنخوازانە، پێویستییەکی ژیانی گرێدان بەم خاکە و رێزگرتنە بەرامبەر فەوارە کولتووریەکان. خەمگینییەکەم ئەوەیە، کە تاوەکو دوایی، تەنانەت لەمیانەی چەند تەمەنێك خستنە سەر یەکتر، لەهەموو جۆرە هەوڵێك دوور مامەوە یاخود بەگوێرەی ئەوەی دەمخواست ئەم هەوڵ و کۆششانەم پێشکەش نەکرد، کە ئاشتییەکی شەرەفمەندانە و یەکێتییەکی ئازادانە ئەنجامگیر بێت، بەڵام لەو باوەڕەدام کە گەلەکەمان و هێزە بەرپرسیارەکانی، ئەم کەموکوڕیە بەلاوە دەنێن و سەرکەوتن مسۆگەر دەکەن.

دووەمین تێکۆشانی واتاداری ئەنجامم دا، خوڵقاندنی خەباتگێرانی ئازادییە. لە هەلومەرجەکانی تورکیا بەملیتانبوون نەزۆك و دۆگماتیك بوو. بەناوی PKK بەملیتانبوونێك هەبوو کە بەشێوەیەکی سنووردار توانای بیرکردنەوەی هەبوو و لەئاستی تەقاندنی چەند فیشەکێکدا توانای چالاکی هەبوو. نەدەشیا لەرێگای ئەمەوە شەڕی گەلەری بەرێوە ببردرێت.

تەنیا هێزی ئایدیۆلۆژی و سەبر و بوێری و کارامەیی لە کۆتاییدا هەوڵ و کۆششی مەزنی بەدەستدەهێنا. خولقاندنی ملیتانانی ئازادی، بەشی هەرە مەزنی کات و هەوڵەکانی منی پێکهێناوە. خولقاندنی خەباتگێرانی ئازادیخوازی گەل لەو تاکانەی کە لەمیانەی پاشەرۆیی هەزاران ساڵە بەخێو کراون و لە هێزی هیچ سۆز و بیرکردنەوەیەکی واتادار و یەکلابۆوە خاوەن بەشی خۆیان نین و لەشەڕ بەرامبەر بەخۆشی بۆتە جەنگاوەرێکی کوێرانە و خیانەتکار، لەراستیدا زەحمەتترین کار بوو کە پێویستی بە تواناکاری هەیە. لەمیانەی سەدان خولی پەروەردە و بەدەیان هەزار دیالۆگ و ئاخافتنی تایبەت خواستم بە ملیتانی ئازادی بگات. بەبێ هەناسەدان بەردەوامیم پێدا. تەنانەت کاتێك بەرێوە دەچووم و خواردنیشم دەخوارد، چاوەکانم و زمانم لەم پێناوەدا کاری دەکرد. دەمزانی کە ئەرکەکەم زەحمەتە و شەرمەزمەندانەترین کارە و مردن لە پێناویدا هێندەی داوەمەوێ باریکە. بەڵام لەمیانەی بەهای مەزنی بەلاوەنانی مێژووی ئەفرینلێکراو و لەپێناو ڕۆڵ بینین و بەشداریکردن لە مێژووی ئازادی، هەر هیچ نەبێت بۆئەوەی چەند ساڵێکی خۆی بەشێوەیەکی راست تەرخان بکات. بەهەموو هێزی خۆم هەڵوەستەم لەسەر ئەم ملیتانە کرد. خەباتێکی تایبەتی گەوهەری و بە چەندایەتی و چۆنایەتی وەهام سەبارەت بەملیتانێتی کرد کە هیچ سیاسەتمەدار و سەرباز و پێغەمبەر و فەیلەسوف لە مێژوودا ئەنجامیاننەداوە. بەڵام بێ بەزەییانە خەرجکردن تەنانەت بەفیڕۆدانی ئەو گەنجانەی دڵی گەلن و ئەو ڕەنجە مەزنەی من کە لەم لایەنەوە خەرجمکرد، لەلایەن چەتەگەرێتی ناوخۆوە کە هەڵوێستێکە دەگاتە ئاستی بەئەنقەست پێشخستن، بەردەوام سەرچاوەی خەمگینیەکی مەزن و کین بوو. سەپاندنی ئەمجۆرە خیانەت و پیلانگێڕییانە بەرامبەر بەمەیلی خولقێنەرانەم لەو ئاستەدا نەبوو کە دەرکی پێبکرێت و بەرپەرچی بدرێتەوە.

بەڵام ملیتان بەخۆشی بەرامبەر ئەمە بەرپرسیاربوو. ئایا بەهیچ شێوەیەك ڕێزی بەرامبەر خۆی نەبوو؟ ئایا هێندە ڕەنجە نابینێ؟ ئایا دەرکی بەوە نەدەکرد کە خۆشەویستترین بەرخۆڵە و شێری باوك و دایکیەتی و ڕۆڵەی هیوا و ئومێدەکانیەتی؟ تا چ رادەیەك دەتوانێ خاوەندارێی لەو هەوڵ و کۆششانەی من بکات کە تەنانەت کاریگەری دەکاتە سەر بێ ویژدانترین کەس، تا چ کاتێك بەکرداری واتا بەم سۆز و پەیمانە مەزنانە دەدات کە داویەتی؟ لەسەرووی هەمووشیانەوە بۆ ماوەیەکی درێژخایەن چۆن هەبوون و پێشکەوتنی خۆی مسۆگەر دەکات؟ دەبووایە ملیتان و جەنگاوەری ئازادی وەڵامی ئەم پرسانە بداتەوە. ئەو ڕێنوماییانەی لەمیانەی سەدان بەڵگەوە روونکرابوونەوە، هێزی کرداری دەستەبەردەکرد و لە رەوشێکی وەهای دەردەخست کە ببنە ئامرازی فەرماندەی ساختە و بێ رەچەڵەك، پێویست بوو نوێنەرایەتی ئەمە بکەن. لەو باوەڕەدام گەلێك شتم پێشکەشکرد. ئەو وەڵامەی درایەوە ئەمانە، مردن و کوشتنی نابەجێی هەزاران کەس بوو. بەهیچ جۆرێك ئەوەی نەکرد بە ئەرکی

سەرەکی کە پێویست دەکات چۆن و لەکوێ بژی و بژێنێ. گەلێکم پێگەیاندن. ئەویش شەڕێکی زۆری پیادەکرد، بوێری و فیداکاریەکی بێ سنووری نیشاندا، بەڵام نەبووە پسپۆڕ، هیچ نزیکی خولقاندنی سیستەمی خۆی نەبووە. لە فێربوون و خو و ڕەوشتە هەرزانەکانی ژیان و مردن ڕزگاری نەبوو، نەبوو بە سوپا و ئاستی فەرماندەبوون. نکوڵی لە هارەمانێتیەکەیان و ئەو بەهایانە ناکەم کە هاتوونەتە ئاراوە. بەڵام لەکاتی خۆیدا بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە پێشەخستنی هەڵوێست بەرامبەر چەتەگەرێتی ناوخۆ و نەتەوەپەرستی سەرەتایی و بەدەستنەهێنانی ئەنجام، بەسە بۆ نیشاندانی کەموکوڕیە مەزنەکەیان. بەردەوام ئەمە لەخۆم دەپرسم: ئایا لەسەرەتاوە بەزانیبووایە وەها دەبن، مۆڵەتم دەدا شەڕ بەرێوەببەن؟ بەلانی کەم لەلایەنی خۆمەوە بەرپرسیارێتیەکەم پەسند دەکرد؟ بەڵام سەرباری ئەم خەم و پەژارە مەزنانەم، دیسان خولقاندنی خەباتگێرانی ئازادی، خەباتێکی ئەفسانەییە. شایستەی ئەمە نەبوون. بەفیڕۆ خەرج کرا. بە شێوەیەکی خیانەتکارانە و بێ بەرپرسیارێتی بەکارهێنرا. بەڵام دیسان لەو باوەڕەدام ئەو جێگایەی لە مێژوودا گرت کە شایستەیەتی. مسۆگەر یادی هەزاران شەهید ژیانی ئازاد دەخولقێنێ، گەلی کوردی ئازاد دەئافرێنێ. هەروەها هیوا و باوەڕی خۆم دیاردەکەم کە ئەوانەی ماونەتەوە لە ئاستی بەرگری ڕەوادا، جگە لەوەی تەواوی کەموکوڕیەکانی خۆیان بەلاوە دەنێن، لە پێناو ئاشتیەکی شەرەفمەندانە و یەکێتی ئازادانەی گەلانی برا، بە ئاستی چەندایەتی و چۆنایەتی پێویست دەگەن و دەبنە هێزی گەرەنتی سەرکەوتن.

سێیەمین خەباتی ئەفسانەیی من لە ڕۆژهەڵاتی ناوین، سەبارەت بە ئازادی ژنە. ئەو خەباتەی کە پێویست بوو بەر لە خەباتی ڕزگاری نیشتمان و ڕەنج بێتە زەحمەترین تێکۆشان بوو. ژن یەکەمین چین و نەتەوە و ڕەگەزی چەوسێنراوەی پاشڤەڕۆیی و کۆیلەدارییە. جیاوازی ڕەگەزی لە ڕووخساردا، دەکرێتە بیانووی فشار و نایەکسانی. کاتێك بە قووڵایی لێکۆڵینەوە سەبارەت بە مێژوو بکرێت، دەرك بەوە دەکرێت کە ژنان یەکەمین قوربانی باڵادەستی کۆمەڵایەتی و سیاسین. یەکەمین چینی هەموو جۆرە نایەکسانی و بەکۆیلە کردنێکە کە بەسەر مرۆڤایەتیدا سەپێنراوە. دوای ئەوەی ژن کرا بە کۆیلە و بووە ئامرازێکی کۆك وماڵیکراوی ناوماڵ، ئیتر خولقاندنی کۆمەڵگای چینایەتی و دەوڵەتەکەی کەوتەگەڕ. دوای ئەوەی پیاوی ستەمکار و درۆزن ژنی خستە لەمیانەی ئەو بوێریەی لەمەیەوە وەرگرتە، بەرەو سەرکوتکردن و بەرزکردنی ڕەگەزی خۆشی هەنگاوی هاوێشتە، میتۆلۆژی و ئاینیەکانی خولقاندووە کە گەورەترین سیستەمی هێزی خەڵەتێنەرن. هەڵبەتە میتۆلۆژیا و ئاینی وەهاش هەن کە گەلان لە ڕاستی نزیك دەکەنەوە. ئێمە باس لە ئایین و میتۆلۆژیای باڵادەست و چەوسێنەرەکان دەکەین کە تەڵەکەبازی و زۆرداری بەرهەم دێنن. کاتێك تەماشای ئەم ئایین و میتۆلۆژیانە بکرێ، دەبینرێ کەژنان هەنگاو بەهەنگاو لە تەختی شکۆداری خوداوەندی ژن

دەخرێت و بێ بایەخ دەکرێت و لەدواییشدا لە نێو دەبردرێت. ئەدەشیا جەنگاوەری ئازادی بێت و ئەمە نەبینی. وەکو منداڵانی ئازادی ئەو خاکانەی ئایینی خوداوەندی دایکی خوڵقاندووە و شوێنی یەکەمین خوداوەندی ئەشقە، هەوڵمدەدا دەرك بە یەکەمین سەرچاوەکانی تامەزرۆییە و مەزنەکانمان بکەم و لێکۆڵینەوەم دەکرد و بیانووەکانی هەبوونیم دەدۆزیەوە.

هەڵوەستە کردنم سەبارەت بە کێشەی ژن ئەوەی تێپەڕکردووە کە کێشەی کەرامەتی تاکێك بێت. تەواوی دژی پێویستییە بچووکەکانی زایەندییە. سەوزگەر گەیشتنی رەگەزەکان بە یەکتری، گەیاندنی بە ئاستێکی باڵاتر لە غەریزەی سێکسی ئاژەڵی، کە بریتیە لە دۆستایەتی و هەڤاڵێتیەکی مەزن، بۆمن وەکو مەردایەتیەکی راستەقینە بوو، دەرکم بەوەش کرد دوودڵیم لە جووتبوون لەگەڵ ژندا لە ترسەوە سەرچاوەی دەگرت. پیاوی باڵادەست ترسی خوڵقاندبوو. لە ژێرناوی نامووس ئەم لەیستۆکەی پیادە دەکرد. تەنانەت کاتێك دەیگووت "خۆشم دەوێیت" جاری دووەم چەقۆی لێ دەوەشاند. زۆرداریەکەی سەرسوڕهێنەر بوو. وەکو رەگەزێك ژنی بچووك کردۆتەوە، جەستە و ژیری و سۆزەکانی ئیفلیج کردووە. خرابووە نێو قووڵاییەك کە باوەڕ ناکرێت. تەنانەت ئەو پیاوە سۆسیالیستانەی لەخۆیان رازین تەنانەت ژنیش، نەیانتوانی خۆیان رزگار بکەن و نەبنە داشی ئەم لەیستۆکە. لەمیانەی ئەو هێزەوە هەڵوەستەم سەبارەت بەم کێشەیە کرد کە تینوێتی مەزن بۆ ئازادی پێی بەخشیبووم. چەندین شیکردنەوە و دیالۆگ و ئاخافتنی ریشەیی بێ ژمارم ئەنجامدا. نەك وەکو خاوەنێکیان، بەڵکو وەکو هونەرمەندێك، لە راوەستانێکی جەستەیی جوان و رێك و پێك، تاوەکو بین بە پشکۆی زانابوون و گەیاندنیان بە ئاستێك کەلەمیانەی دەنگ و زمانیان تامێکی وا بەدیبێت کە هیچ شتێکی دیکە ئەم تامەی نەبێت. موداخەلەی هەموو شتێکیانم کرد. پێگەیشتن، بەڵام هەرزەکار و بێ ئەزموون بوون. ژیانی ئەفرینلێکراو و پیاوە ئەفەندیەکان لە ئەنیشتیانەوە بوون. لە کارامەیی و ئەزموونێکی وەها بێبەش بوون کە بەرامبەریان و لەگەڵیاندا شەڕێکی مەزنی رەگەزی گەوهەری بەرێوە ببەن. بەم ئێش و ئازارەوە خۆیان لە هەڵدێرەوە فڕێدا خوار، ئاگریان لە جەستەی خۆیان بەردا، بەبۆمبا خۆیان پارچە پارچە کرد. ئەوان لە ژێر ناوی فارمانێتی هەموو شتێکیان ئەنجامدا. ئەو پیاوێتییەی لە بەرامبەریان بوو لە هەڵوێستێکی قەبە جیاوازتر نەیانخواست جۆرێکی دیکە، هەڤاڵێتی و دۆستایەتی مەزنی یەکسانیخوازەکان بە ئەقڵی خۆیاندا تێپەڕبکەن، هەروەکو گوڵ هەڵدەوەرین و لەناوچوون.

بە ئەندازەیەك کە لە گەوهەردا باوەڕیم بە باوەڕی خوداوەندی ژن هەمبێت بە هێزی رێزگرتن و خۆشەویستی گەیشتم. هەرچەندە هەوڵ بدەن شەڕی ژنی مەزن بچووك بکەنەوە و لە بەرچاوانی بخەن، بەڵام هەقی خۆم پێدا. هەم بۆ ژنێك خیانەت لە پیرۆزترین ئەرك دەکەیت و بە شێوەیەکی نارەزایی دەژیت، هەم لە پێناو هەڤاڵێتی ژنی رەسەن ئەو ئەرکە

جێبەجێ ناکەیت کە دەکەوێتە ئەستۆتا خواستم بۆ هەموو ناوەند و دەوروبەرە پەیوەندیدارەکان لە سەرووی هەموووشیانەوە بۆ PKK نیشانبدەم کە شەڕی ژن لایەنێکی وەهای نییە کە بە بچووك ببینرێ. بەلانی کەم هەوڵمدا هێندەی خوداوەندە پیاوە زۆردار و درۆزنەکان، جیهانی خوداوەندی ژن بناسرێ کە هێزی ئەشق و راستیە و تاوەکو دوایی بە شێوەیەکی جددی و بەپرەنسیپانە هەوڵمدا لەناوەڕۆکەوە خۆشەویستی و رێزلێگرتنی پێویستی بەرامبەر نیشانبدرێ و بیسەپێنم.

هەرچەندە خیانەتکار و بەکرێگیراویش دەرکەوتبن، هەرگیز نابێ ئەوانە لە بیر بکرێن کە بەدڵ و گیان تەفلی بوون. بەتایبەتیش شەهیدەکانیان بەردەوام وەکو عەزیزە پیرۆزەکانی ئەم خاك و گەلەکانمان یادیان دەکرێتەوە. ئەوان هەریەکە و خوداوەندێکی ئازای راستەقینەن. بەرێزەوە پێشوازیم لە یەکێتی و بەپارتیبوونیان کرد و پارەستیانم دا. بەردەوام جەختم لەسەر ئەوەکردەوە پێویستە ببنە گەرمەنتی ژیانێکی ئازاد و جوان. بەو باوەڕیەوە تاوەکو دوایی درێژەم بەهەوڵ و کۆششەکانی خۆمدا کە مسۆگەر رۆژێکیان بە ئاستی ئەو ژنە بەهێزە دەگەن کە پیاوی ستەمکارو درۆزن و پاشەڕۆ دێنێتەوە سەر رێ. مرۆڤ تەنیا لە میانەی ئەو ژنەوە مەزن نابێت و نابێت بە پیاو، کەموکێیەتی. من نەمخواست بەمجۆرە مەزن بم و ببم بە پیاو، تەنانەت رەوشێکی وەهام بە کەرامەت شکێن بینی، دەزانم کەمژنانم خستۆتە رەوشێکی سەختەوە. دەرك بەوەش دەکەم کە ئەوانم کردووە بە پارچەیەك لە ئاگر، ئەوەش دەزانم کە هی وەها لە نێویاندا هەن کە دوژمنایەتیەکی مەزن و ستەمکاریش دەکەن. ئەوەش دەزانم کە بەتەنیام هێشتوونەتەوە. بەلام گرنگترین راستی کە دەخوازم بیزانن ئەوەیە کە پێویستە بزانن هێندە بەهێز بن کە چارەنووسی شەڕ و ئاشتی دیار بکەن. ئەگەر ئەمە نەبێت ژیان حەرامە. ئەگەر ئەمە نەبێت ئەشق نابێت. ئەگەر ئەمە نەبێت هیچ ئومێد و هیوایەك بەدینایەت. تەنیایی و جودایی ئەو بەدەل و رێگایەیە پێویستە بۆ بەدەستهێنانی ئەم مەزنایەتیە و زاڵبوونی بگیردرێتە بەر. باوەڕی و ئومێدەکانی خۆم دیاری دەکەم کە لەمیانەی هێزی هەزاران ساڵەی ئازادی و یەکسانی خوداوەندی دایك و خوداوەندەکانی ئەشق کە لەم وڵاتانە لە دەستیاندا. لە رێگای خەبات و شەڕێك لە تەوەرەی ژندا سەرلەنوێ جوانی و ژیری دەخوڵقێنرێ، ئەوەی کە هەشە بە هێزێکی خۆیی وەها دەگات کە پەیمانی نوێی کۆمەلایەتی پراکتیزە بکات. بە ئەندازەی بانگەشەی هەڤاڵێتیەکی پڕ لە رێز و خۆشەویستی لەگەڵ ژنان، مسۆگەرە کەتادوا هەناسەکانم وەکو کارکەرێکی ئەشق درێژە بە هەوڵ و کۆششەکانم دەدەم. بێگومان کە بە ئەندازەی واتا پێدان و بە پێویستی بینینیان هی هەڤاڵانی ژنم و بەردەوامیش بەمجۆرە دەبم.

لە رۆژهەلاتی ناویندا تێکۆشانی دیکەی گرنگیشم بەڕێوەبرد. بەتایبەتی پێویستە هەوڵە دیپلۆماسیەکانی من زۆر باش بزانرێ کە لە پێناو گەلی کوردا بە شوێنێکی شەرمەزمەندانە

بەرێوەم برد، چونکە ئەو دیپلۆماسیەتەی کوردە بەکرێگیراوەکان گەلی کردبوو بە هیچ. مەسەلە ئەوە نییە کە دیپلۆماسیەتێکی فەرمی لەگەڵ ئەم توێژانە بەرێوە ببردرێت کە مەزن دیارن. ئەوەی پێویستە وابکەیت کەتەواوی هێزەکانی جیهان و هەرێم هەست بەو هەوڵانەت بکەن کەناهێڵی گەلەکەت ببێتە ئامرازێکی هەرزانی بازرگانی و لەیستۆکە سیاسی و پیلانگێرییەکان. ئەوە نیشانی دۆست و دوژمنان دەدات کەناتوانرێ هەبوون و ئازادی گەلی کورد ببێتە بابەتی هەراجکردن. ئەگەر بە شێوەیەکی سنوورداریش بێت بۆ یەکەمین جارە لە مێژوودا هەنگاوی وەها دەهاوێشترێت. لە ئەنجامی ئەم هەوڵو کۆششانە گەلی کورد لەهەموو کاتێك زیاتر بۆتە خاوەنی ناسنامە و ئیرادەی ئازادی خۆی. ئەوە نیشاندراوە کە بەسانایی ناتوانرێ بکرێتە بابەتی لەیستۆك و پیلانگێری. ئەوە سەلمێنراوە کە بێخاوەن نییە و بەخۆی و هێزە پێشمەنگەکەی بە هێزێك گەیشتوون کە دەتوانن هەموو جۆرە لەیستۆك و پیلانگێرییەك پووچەڵ بکەنەوە. لەوانەیە بەناوی گەلەکەمان رێککەوتنی دیپلۆماسی بریقەدارمان ئەنجامنەدا. بەڵام مسۆگەرە کە پەیمانی نەنووسراومان لە مێشك و دڵی دۆست و دوژمنان بەجێکرد کە کوردان بۆ ژیانێکی ئازاد بە بڕیارن و هەرگیز دەستی لێ بەرنادەن، تەنانەت ئەگەر پێویست بکات لەم پێناوەدا هەر جۆرە بوێری و فیداکارییەك نیشاندەدات.

تەنانەت دەسکەوتە دیپلۆماسیەکانی کوردە بە کرێگیراوەکان، لە سایەی بوونی ئێمەدا لە رۆژهەڵاتی ناوین بەدەستیانهێناوە. تەنانەت لە سەربنەمای دژایەتی ئێمەش بێت تەواوی ئەو رێککەوتنانەی ئەنجامدراون و ئەو بەرژەوەندییە مادیانەی بەدەستهاتوون لە سەر خوێن و رەنجی ئێمە بەدیهاتووە و بەرزبووەتەوە. ئەمڕۆ ئەمە بۆ خاوەنی بەکرێگیراوەکان باس دەکەین. گەلەکەشمان قارەمانە راستەقینەکانی رەنج دەناسێ. لە میانەی پێزانین بەوەی کە ئیرادەی ئازادی کوردان و تەواوی پێگەگرتنەکانی کە PKK لەناوەوە و دەرەوە پشتی پێدەبەستێ، گرێدراوی ئەم هەوڵ و کۆششانەمانە و شایستەبوونیان بەمە بایەخدار دەبینم. بۆ ئەوەی بە هێزی خۆیان لەهەموو بوار و گۆڕەپانێکدا بە هێز و توانایەك بگەن کە سەرکەوتن بەدیدێنێ، ئومێدەوارم بە ستاتۆ نەخەڵەتێن و بە دیپلۆماسیەتێکی راستەقینە بگەن.

ئەگەر بە شێوەیەکی زۆر سنوورداریش بێت. جێگاو بایەخێکی زۆر بەو خەباتانە دراوە کە قۆناخی ئەکادیمیای نەتەوەیی دێنێتە ئاراوە. لە رێگای باوەڕهێنان بەوە کە ئەو هەوڵ و خوێنە زۆرەی بە فەدەر دەریا بە درێژایی مێژوو رژێنراوە تێری نەکرد و ئەوەی پێویستە هێزی واتابەخشین و قووڵاییەکەیەتی، لەم چوارچێوەیەدا قۆناخی فێرگەی بەرفراوان بۆ گەل و پێشمەنگەکەی دەستپێکردووە. گۆڕینی هەر ماڵێکی تێیدا دەژیام و گۆڕەپانێکی خەبات بۆ خوێندنگایەك، بۆتە تایبەتمەندێتی و بەشێکی جیانەکراوەی ژیانم. هەروەکو فەیلەسوفەکانی چەرخەکانی یەکەمین هەر ژێر دیوارێك و بن دارێك کراوە بە خوێندنگایەك. لە میانەی هەستکردن و دەرککردن بەوەی کەلاوازترین لایەنی گەلەکەمان هێزی مێشکە، بایەخ بەم هەوڵ

و تێکۆشانە دراوە. ئەزموونی ئەکادیمیای مەعسوم قۆرقوماز شەپۆل بە شەپۆل بۆ هەر مرۆڤێك و گۆڕەپانێك گواستراوەتەوە. نەك تەنیا لە بوارەکانی سیاسی و سەربازی، بەڵکو لە بوارەکانی مێژوو، زمان و هونەریشدا بۆ هەنگاونان بەرەو سیستەمی ئەکادیمیا بناخەی هەزری و پێکهاتەی ژێرخانەکەی دانرا. لەو ڕێگایەی بەرەو ئازادی و هەبوونی کولتووری کوردان دەچێت سیستەمێکی پەروەردەیی لە ئاستی ئەکادیمی کە قۆناخێکی مێژووییە، ڕاستینەیەکە. ئەوەی پێویستە ئەنجامبدرێت ئەوەیە هەموو تواناکاریەکانی بوار و گۆڕەپانە پەیوەندیدارەکان بکرێت بەیەك و بە فێرگەی تایبەتی خۆی بگات. لە سیاسەتەوە تا زمان، لە مێژووەوە تا فەلسەفە، لە هونەرەوە تاوەکو ئابووری لە هەموو بوارێکدا دەرفەتی ئەکادیمیایەکی نەتەوەیی هەیە. لەمیانەی باوەڕی و هەوڵێکی مەزنەوە بەشداریکردن و ڕۆڵ بینین لەم جۆرە تێکۆشانەدا، تاکەکان شکۆمەند دەکات و ئازادی بۆ گەلەکەمان دێنێ. ئەوانەی لەم بوارەدا سەرکەوتووانە ئەرکەکانی خۆیان رائەپەڕێنن، ئاشتی و ئاتوانن جێگای خۆیان لەناو شارستانییەتی دیموکراتیدا بگرن. لە کرداری ژیاندا زاڵبوونی هەزری و تواناکاری هونەر واتای سەرکەوتن و چاکە و جوانییە.

وەکو دەرئەنجام، لە ژیانی ڕۆژهەڵاتی ناویندا تەنیا بەوە ئەدەوەستاین کە یۆتۆپیایەکی ئازادی بخوڵقێنین کە گەلەکەمان و دۆستان لە سەر پێیان بوەستن. بە ئەندازەی بناخە مێژووییەکەی کە پێویستە ئەم یۆتۆپیایە پشتی پێ ببەستێ، تواناکاریەکانی ئازادیشمان پێشکەش کرد، تاوەکو ئەوەی لە ئارادایە سەرکەوتووبێت. ئەو یۆتۆپیایانەی گەلانی دیکە بە سەدان هەزاران ساڵە پێکیانهێناوە، ئێمە لەماوەی ٢٠ ــ ٤٠ ساڵ لەو پارچە شکست و لە پەلوپۆخراوانەی کەس پێی رازی نەبوو و ئومێدە لاوازەکانی سەبارەت بە ئایندە، تا دوارادە بە گوێرەی ڕاستینەیەك خوڵقاندمان کە تا دوارادە متمانە و باوەڕی پێ دەکرێت و جێگای سەرکەوتنە. لە ئاکامی دەرککردن بەوەی ئەم یۆتۆپیایە هێندەی نان و ئاو و هەوا پێویستە، بەواتای ئەوە دێت کە دۆستان و هەڤاڵان و گەلەکەمان بیکەن بە موڵکی خۆی و لە ڕێگای بێ کۆتایی ژیانی ئازاد بەڕێوەبچن.

### ٤. گەڕان بەدوای ئاشتی و پێشخستنی رەخنە و رەخنەدان

گووتەی "هەر شەڕێك ئاشتی خۆشی هەیە" ڕاستیەکی گشتییە. شەڕ چەندە بیانوو و ئامراز و ئامانجی هەبێت، ئەوا ئاشتیش بیانوو و ئامراز و ئامانجی خۆی هەیە. هەروەکو مەزەندە دەکرێ ئاشتی چالاکیەکی پاسیفانە نییە؛ هەروەها قۆناخێکی ژیانی وەها نییە کە بە سانایی پێبیگەیت و بەشێوەیەکی ئاسایی و لە خۆیەوە بەدیبێت. دەشێ ئاشتی وەکو قۆناخێکی جڕی ژیانی سیاسی بەر لە شەڕ و دوای شەڕ پێناسە بکرێت. دەشێ وەکو قۆناخێکی

ناجێگیری نێوان سیاسەت و شەڕیش هەڵسەنگێنرێ. بەڵام ئەوەش ڕاستە کە سیستەمێکی بەهای ئەخلاقییە کە لە نێو ژیانی کۆمەڵگادا دەخوازرێ و تەنانەت لە پێناویشیدا شەڕ بەڕێوە دەبردرێت. نابێ هیچ کاتێك لە بیر بکرێت کە ئاشتی دیاردەیەکی دینامیکیە و لە نزیکەوە پەیوەندی بە شەڕەوە هەیە. ئەوەی شەڕی نەبێت ئاشتیشی نابێت. بە پێچەوانەشەوە ئەوەی لە ئاشتی تێنەگات دوورە لەوەی بەگەوهەری لە شەڕ تێبگات.

باسکردنی مێژووی تیۆری شەڕ بە شێوەیەکی درێژ لە دەرەوەی بابەتەکەمانە. بەڵام ئەمە تێڕوانینێکی بەگشتی پەسندکراوە کە لە ڕابردوویەکی نزیکدا بە شەڕێکی چڕی هێوردا تێپەڕین. هەڵەمبازی ١٥ ی ئابی PKK ، ئەو قۆناخەی کە هەڵەمڕەوانی کۆماری تورکیا بە گەورەترین چالاکی تیرۆریستی ناوی دەبەن، لە ٢٠٠٠ بە دواوە کەوتۆتە نێو لێگەڕینێکی قووڵی ئاشتی. ئەوەی دەبێ لێپرسینەوەی لێبکرێت، تا چ ڕادەیەك ئەم لێگەڕینانەی ئاشتی واقیعی بوون. ئەگەرنا سەدان ساڵ بەر لە ئێستا بە هۆی چەندین فاکتەرەوە دیاردەی ئاشتی بەردەوام لە ڕۆژەڤی کۆمەڵگای تورکیادا بووە. ئەگەر شەڕ و پێکدادان هەبێت، داخوازی ئاشتی کراوە، ئاشتی هەبێت، مافی ژیان بە کارهێنراوە. لەلایەنی نەتەوەییەوە تاوەکو دەگاتە نێو خێزان، ئەو کۆمەڵگایەی تێیدا دەژین، ڕووبەڕووی دیاردەی قورسی توندوتیژییە. لەبەرئەوەی کێشە نەتەوەیی و کۆمەڵایەتیەکان چارەسەرنەکراوە، بەردەوام کین و توندوتیژییان کەڵەکە کردووە. ڕۆژێکیان ئەم توندوتیژیە کەڵەکە بووە تەقیوەتەوە، بەرەو یاخیبوون و پێکدادانی بردووە.

بەهۆی ئەو پێچارەییە قورس و قووڵەی کێشەی کورد تێیدا دەژی، دیاردەیەکە کە بەرادەی هەرە زێدە توندوتیژی لە خۆیدا کەڵەکە کردووە. هەربۆیە بە سەدان ساڵە یاخیبوون ڕوودەدات. لەبەر ئەوەی یاخیبوونەکان بە ئاشتییەکی دادوەر و شەرەفمەندانە ئەنجامگیر نەبوو، ئەوا ڕەوشی "نەشەڕ، نەئاشتی" وەکو سەختترین و بێ خێرترین شێوازی ژیان، پەخشەی گەلەکەمانی گرتووە، لە ڕاستییدا "نە شەڕ، نە ئاشتی" بێبەزەییترین شێوازی بەڕێوەبردنی کۆمەڵگایە. لە میانەی ئەم سیاسەتەوە گۆڕینی گەلێکی لاواز و کردنی بە سەرسام، بەواتای ئەوەش دێت کە بۆ چەوسانەوە و فشاری بێ سنوور کراوە دەبێت. لەو جوگرافیایەی کوردان تێیدا دەژین، بەڕێوەبەرایەتیەکانی نەتەوەی سەردەست ئەم سیاسەتە پیادە دەکەن. بەردەوام شێوەی بەڕێوەبەرایەتی قەیران، یاخود ڕەوشی ئاوارتە، هەروەکو بڵێی شێوازێکی بەڕێوەبەرایەتی ئاسایی و هەمیشەییە، سانایی و ئاسایی بووە. تەنانەت سەدەکانی ١٩و ٢٠ پڕ لەم شێوازانەی بەڕێوەبەرایەتی تێپەڕبووە. ئاشکرایە پێویست دەکات کۆتایی بەم شێوازە بەڕێوەبەرایەتیانە بهێنرێت و دەستی لێبەربدرێت کە لە مرۆڤایەتی بەدەرن.

لەڕاستیدا ئەو چالاکیانەی لەدەوروبەری PKKدا پێشکەوت، لە ئاشکراکردنی ڕەوشی "نەشەڕ، نەئاشتی" بەولاوە شتێکی دیکە نییە. ئەم چالاکیانە گوزارشت لە تێکدانی ستاتۆی توندوتیژی شاراوە و دەمامککراو و یەکلایەنە و تێپەڕبوون بۆ زەمینەیەکی توندوتیژی

دوولایەنە دەکات (هەرچەندە لاسەنگیش بێت). لە ستاتۆیەکی نایەکسان و ستەمکار و لەنێو بەر، تێپەڕبوون بۆ ستاتۆیەك دەسەپێنێ کە بەدوای دادوەری دەگەڕێت و دەخوازێ کۆتایی بە ستەمکاری بێنێ و لە ڕێگای پێشکەوتنی هاوچەرخانە پەرەسەندن بە ئامانج دادەنێت. هەربۆیە پێویستە ئەو شەڕەی لە دەوروبەری PKK پەرەیسەند، لەگەڵ شەڕە کلاسیکیەکانی رزگاری گەلان یاخود یاخیبوونە شۆڕشگێڕیەکان تێکەڵ نەکرێت. تاوەکو سروشتی شەڕەکان نەناسین، ئەوا لە هەنگاو نان بۆ ڕێگای چارەسەریش سەرکەوتوو نابین. لەرەوشێکی وەهادا ئەو کێشەیەی پێویستە لە قۆناخی رۆژگاری ئەمڕۆمان گفتوگۆ بکرێت، گفتوگۆکردنی ئەوەیە کە پێناسەیەکی راست سەبارەت بەو شەڕەی PKK بکرێت کەنزیکەی بیست ساڵی خایاند و ئێستا لەرەوشی بەرگری رەوادایە، لەمیانەی ئەم پێناسەشەوە بە ئەندازەی وەڵامدانەوەی پرسی"ئەگەر بەردەوام بێت، چۆن شەڕێك؟ ئەگەر بەردەوام نەبێت، ئەوکاتە چۆن ڕێگایەکی چارەسەری کە بەرەو ئاشتی بچێت" پێویستە. رەوشی"نەشەڕ، نە ئاشتی" هەڵوێستێکی پتەو و مرۆڤانە نییە. ئەمەش تەنیا گوزارشت لە قۆناخی پەڕینەوە دەکات کە پێویستە زۆر کورتخایەن بێت. وەکو دەرئەنجام یان بە شەڕیکی نوێ یاخود بە ئاشتیەکی هەمیشەیی ئەنجامگیر دەبێ. لە رەوشی رۆژگاری ئەمڕۆماندا "نەشەڕ، نەئاشتی"[*] حاڵەتێکی مەترسیدارە کە گەندەڵی لەگەڵ خۆیدا دێنێ و بەواتای قۆناخێك دێت کە تەنیا لە بەرژەوەندی ئەو هێزانەدایە کە ئاشتی و خۆشگوزەرانی کۆمەڵگا ناخوازن.

بەلارێدا چوونی بانگەشەیەکی وەها لە ئارادایە؛ ئەگەر قۆناخێك بنبەست بووبێت — ئیتر ئەمە لەرەوشی شەڕدا بێت یاخود ئاشتی — ئەو شتەی پێویستە ئەنجام بدرێت، بێگومان نابێ تاوەکو لەنێوچوون ئەم رەوشە بەردەوام بێت. هەروەکو دەزانرێ گەورەترین شەڕەکانی مێژوو بە خێرایی ئەنجامگیربووە. شەڕی درێژخایەنیش روویداوە. بەڵام لە لۆژیکی ئەمانەدا، لە ئەنجامدا بنبەستبوون نییە، تواناکاری و دەرفەتی چارەسەری هەیە. بەهۆی ستراتیژ و تاکتیکی درێژخایەنە. هەنگاوێکیش بە ئاراستەی چارەسەرییە. ئەوەی راست نییە، ئەم شێوازانەی شەڕ نییە. پەسندنەکردنی ئەو شەڕانەی شێوازی چارەسەری لەنێودەبەن و خۆیان دووبارە دەکەنەوە، بایەخدارە. کەموکوڕی هی کام لایەن دەبێت بابێت، ئەنجام ناگۆڕێت. تێپەڕکردنی ئەم جۆرە شەڕ و پێکدادانانەی کە ڕێگا لە پێش زیان و ژانێکی مەزن دەکەنەوە و هیچ واتایەکیشیان نییە، پێویستیەکی بەمرۆڤبوون و ئاقڵمەندییە. لە مێژوودا گووتەیەك بەناوی "سەرکەوتنی پەرۆس" هەیە. ئەم گووتەیە بەتەواوەتی گوزارشت لەو پرسە دەکات کە دەخوازین ئاماژەی پێبکەین. شەڕ هێندە درێژخایەن بووە، لە کۆتاییدا هەردوو لایەن ژێرکەوتوون. ئەگەر یەکێکیان سەرکەوتووش بێت، هیچ شتێك لە ئارادا نییە بەدەستیهێنابێت.

ناوەڕۆکی ئەو شەڕانەی بەسەر گەلی کورد سەپێنراوە، زۆر نزیکی ئەم ڕەوشە بۆتەوە. ئەمە شەڕێکە کە هیچ دەسکەوتێکی بۆ لایەنە سەرکەوتووەکەش نییە. مەگەر گەلی کورد لە سەدەی ۲۱ەمدا لە نێو ببردرێت، ئەگەرنا ئەم شەڕانەی سەپێنراون هیچ واتایەکیان نابێت. ئەگەر کوردان وەکو گەلێك لە نێو ببردرێن، لەوانەیە گەلێکی دیکە لە جێگای ئەو نیشتەجێ بکرێت. ئەگەر دەرفەتی ئەمە نەبێت و مەحاڵ بێت، ئەو کاتە دەبینرێ کە لە دەرەوەی ئازادییە هاوچەرخەکان رێگایەکی دیکەی چارەسەری نییە، ناشێ بیر لەوە بکرێتەوە کە مافە هاوچەرخەکانی مرۆڤ زیان بە هیچ دەوڵەتێك بگەیەنێ. جگە لەوانەی مەیلی فاشیزم و شۆڤێنیزمییان هەیە، ئازادییە هاوچەرخەکان دەوڵەت و کۆمەڵگا بەهێزدەکەن. نە تواناکاری نەپێویستی ئەمەش هەیە گەلی کورد لەمیانەی شاڵاوێکی توندوتیژی درێژخایەن بەرەو جودابوون بچێت. لە میانەی یەکێتی ئازادانەوە بەیەکەوە ژیان لەگەڵ گەلان، لەبەرژەوەندی خودی گەلی کوردیش دایە. لەم چوارچێوەیەدا لە هەلومەرجەکانی رۆژگاری ئەمڕۆماندا کە دەرفەتی ئازادییە هاوچەرخەکان لە ئارادایە، بەهایەکی ئەوتۆی شەڕێکی درێژخایەنی رزگاری نییە. بەرژەوەندی گەلی کورد بە ئاشتیەکی شەرەفمەندانە و خەباتی سیستەمێکی دیموکراتیدا تێپەڕدەبێت. بەڵام کاتێك نکوڵی لە هەبوونی بکرێت و دەرفەت بەوە نەدرێت کە ئازادانە گوزارشت لە هەبوونی کولتووری خۆی بکات، هەنگاونانی بۆ نێو ڕەوشی بەرگری ڕەوا، تەنانەت ئەگەر سەد ساڵیش بەردەوام بێت، تاوەکو ئەم ڕەوشە بەلاوە نەنرێت و دان بە ئازادییە هاوچەرخەکان نەنرێت، درێژەدان بە ڕەوشی بەرگری ڕەوا وەکو پێویستی یاسای گەردوونی مافێکە. هیچ ڕەوشێك لەوە بێ شەرەفانەتر نییە کە هەبوون و بەها کولتوورییەکانی خۆت نەپارێزیت. لە هیچ شێوەیەکی بەڕێوەبەرایەتی مرۆڤایەتیدا بەرامبەر بە نکوڵیکردن لە هەبوون و بێبەشکردن لە کولتوورەکەی، بێ دەنگ نامێنن. تەنیا کاتێك لە حاڵەتی مرۆڤایەتی دەربکەوێت، دەشێ ئەمە رووبدات. لە حاڵەتێکی وەهادا، نە شەڕە درێژخایەنەکانی جوداخوازی، نە رژێمە زۆردارەکانی لەسەربنەمای نکوڵیکردن لە هەبوون و قەدەغەکردنی کولتوورەکان، هیچ شتێك نییە بە دەستی بێنن و لێی سوودمەند ببن. بەو ئامانجە ئەگەر شەڕی پیادەکراو لە ئارادابن، دەستبەردان لەمانە پێویستییەکی بەمرۆڤبوون و ئاقڵمەندییە.

دانان بەوەی هەندێ چالاکی PKK لە رابردوو بەرگری ڕەوای تێپەڕکردووە، بینینی وەکو هەڵەیەك و تێپەڕکردنی، هەڵوێستێکە لە جێگای خۆیدایە. ئەو خاڵەی PKK پێیگەیشتووە، بەدیهێنانی ئەو قۆناخەیە. هەم لە بواری تیۆری، هەم کرداری وەرچەرخان لە هێڵی بەرگری ڕەوا ئەنجامدراوە. شتێکی لەمە زیاتر نییە کە PKK ئەنجامی بدات. مەسەلەکە دەکەوێتە ئەستۆی دەوڵەت. دانان بە هەبوونی گەلی کورد و ڕەخساندنی دەرفەتی مافی ئازادی رادەربڕین و گوزارشت کردن لە بەها کولتوورییەکانی و بەبێ جیاوازی خستنە گەڕی سیستەمی دیموکراتی و لەگەڵ ئەنجامەکانی دەرخستنی لێبوردنێکی گشتی؛ هەلومەرجی سەرەکی

بەلاوەنانی ناهەقی و بەدیهاتنی ئاشتییە. ئەگەر دەوڵەت یاخود دەوڵەتەکان ئەم مافە بچووکانەی گەلی کورد پەسند نەکات و دانی پێدا نەنێت، ئەوا ئەو ئەرکەی دەکەوێتە ئەستۆی گەلی کورد و هێزە پێشەنگەکەی، ئامادەکاری یە بۆ شەڕێکی بەرگری رەوا ئەگەر سەدان ساڵیش بەردەوام بێت. تەواوی گۆڕەپانە گونجاوەکانی جوگرافیا و پەیوەندییەکانی دۆستایەتی و بنکەی جەماوەری، بۆ بەکارهێنان بەگوێرەی ئەمە ئامادە دەکرێت. تەنانەت ئەگەر پێویست بکات سوپای بەرگری رەوا دەگەیەنرێتە سەد هەزاریش. مەزنکردنی هێز گرێدراوی پاراستنی هەبوونی خۆیەتی، ئەگەر لەمیانەی هێزێکەوە بەدیبێت، باهێزێك بێت، ئەگەر بە سەد هەزار کەس ئەنجامبدرێت، ئەوا با بەو ژمارەیە درێژە بەرەوشی بەرگری رەوا بدرێت، لەمە بەو لاشەوە چارەیەکی دیکە نییە.

رەوشی ئێستای کوردان دەرفەتێکی ئەوتۆ نادات لەسەر بنەمای هێرشی ستراتیژی شەڕێك بەڕێوە ببات؛ ئەگەر دەرفەتێکی بەمجۆرەش هەبێت پێویست ناکات. زیانەکانی ئەمە چەندین قات لە سوودەکانی زیاتر دەبێت. بەڵام لە رەوشێکی وەهادایە کە چەندین ساڵیش درێژبخایەنێ دەتوانێ شەڕێکی ستراتیژی گەوهەری خۆپاراستن بەڕێوە ببەن. هیچ زیانێك لەمەدا نابینێ. لەوانەیە هەندێ زیانی مرۆیی بدرێت. هەروەکو دەزانرێ زیانەکانی مردنی ئاسایی، لە هی شەڕ کەمتر نییە. بەڵام سوودەکانی زۆرە. تەنانەت بەلانی کەم لەنێو رەوش و زەمینەی شەڕیشدا بێت دەتوانێ شەرەف و هەبوون و کولتوور و وشیاری و ئیرادە و تەنانەت پارچە پارچەش بێت نیشتمانی خۆی رزگار بکات. رۆژ بەرۆژ وشیار دەبێتەوە و دۆستان قازانج دەکات. رۆژێکیان دێت گەلە دراوسێکان و مرۆڤایەتیش قازانج بکات. هەربۆیە شەڕی بەرگری رەوا ئاییندەی هەیە. بنبەستبوونی نییە. ئەگەر لەناوەوە لە خۆوە نەگیردرێت لەدەرەوە، لە دەشت نەبێ لە شاخ، لە شاخ نەبێت لە شار، چەکداری نەبێت بێ چەك، بێ چەك نەبێت بە چەکداری، بەئاشکرا نەبێ بە نهێنی، بە نهێنی پێویست نەبێ ئەوا لە میانەی تاقیکردنەوەی هەموو شێوەیەکی ئاشکرای - ئابووری، کۆمەڵایەتی، سیاسی، سەربازی ـــ دەتوانێ هەبوون و کولتووری خۆی بپارێزێ، شایەنی باسە لە سەردەمێکدا دەژین تەنانەت بە هێزترین دەوڵەتیش هێرش بکاتە سەر هەبوونە کولتوورییەکان و دان بە مافەکانی مرۆڤ نەنێت، لەلایەنی جیهانەوە گۆشەگیر دەکرێ.

ئەگەر دووبارەش بێت بۆیە دیسان ئەم لایەنانە باس دەکەم: ناتوانرێ خۆ لە ئاشتیەك بدزنەوە کە لەگەڵ کوردان ئەنجام دەدرێت. ناتوانرێ درێژە بەرەوشی" نەشەڕ، نەئاشتی"بدرێت. ئەو شەڕانەی دەسەپێنرێن لە"سەرکەوتنی پیرۆس" زیاتر دەسکەوت بەدەستناهێنێ. لە حاڵەتێکی وەهادا بە رۆژەڤکردنی ئاشتی قەڵەمبازی ١٥ی ئاب کەمزێدە درێژەی کێشا، پێویست و واقیعیە. وەکو نموونە هاوچەرخەکانی دیکە، هاوێشتنی هەنگاوی پێویست، پێداویستیەکی بەرژەوەندیەکانیەتی. ئەوەی کوردان دەیخوازن تەنیا رێزگرتن لە

هەبوونیان و ئازادی بۆ کولتوورەکەیان و خستنەگەڕی سیستەمێکی دیموکراتی تەواوە. ناتوانرێت بیر لە چارەسەرییەك بکرێتەوە کە لەمە مرۆڤانەتر و دڵنەرمتر بێ. سیستەمی نوێی بەرگری ڕەوا کە PKK لە نێویدایە پێویستییەکی ڕۆحی بڵندی بەرپرسیارێتییە. پێویستە دەوڵەت، یاخود دەوڵەتەکان هەنگاوەکانی پێویست بەمە نیشانبدەن.

بەر لە قۆناخی ئیمرالی لە ڕێگای جیاوازەوە ئەوەم نیشاندابوو کە لێگەڕینێکی ئاشتی لەم چوارچێوەیەدا بێت، بۆ من زۆر لە پێشخستنی شەڕەوە بەهادارترە. ڕاگەیاندنی ئاگر بەستی یەکلایەنە لە ١ی ئەیلولی ١٩٩٨، هەڵوێستی ئەرێنیانە لە دیالۆگی ڕاستەوخۆ و ناردنی نامە بۆ فەرماندە باڵاکانی دەوڵەتی تورکیا، پەیوەندی ناراستەوخۆ لەگەڵ سەرۆك کۆمار ئۆزال و سەرۆك وەزیران ئەربەکانیش لەم چوارچێوەیەدا بوو. چەندین جار ئاماژەم بەمە کرد. لە قۆناخی ئیمرالی زیاتر سەبارەت بە ئاشتی قاڵبووەمەوە. ئەمە وەکو وەلامێك بۆ هیچ قەرەبووداننێك نەبوو، بەڵکو وەکو ئەرکێکی سیاسی و مرۆڤپەروەری دیارم کرد. بەلانی کەم تیۆری و پراکتیکی ئاشتی هێندەی تیۆری و پراکتیکی شەڕ پێویستە. ئەگەر بە شێوەیەکی سنوورداریش بێت، گرانەوەی بۆ پێهەڵگرتنەکانی ئازادی، ئەوا پێویستە وەکو بژارێك هەڵبژێردرێ کە لە پێشەوەی ئەو شەڕانەش بێت کە دەسکەوتێکی زێدە بەدەستدێنێ. هەروەها باوەڕیم بەوە هەیە کە سۆز و وشیاری و ئیرادەی ئاشتی ڕەسەنترە. باوەڕیم بەوەیە گەلێکی بە شێوەیەکی ئازادانە ئاشتی بە دیهێنابێت، بەردەوام بە ڕێکخستن و وشیارییەوە لە نێو شەڕ و ئاشتیدا بە شێوەیەکی ساناتر دەتوانێ مافەکانی خۆی بەدەست بهێنێ. هیچ گومانم لەوەدا نییە کە ئاشتی لاوازی نییە، بەڵکو بەهێز بوونە. لە میانەی دیلبوون بە دۆگما نەتەوە پەرستییەکان و ئەو گوزارشتە دیماگۆژیانەی لە ژێر ناوی "وڵات و ئاڵا و دەوڵەتی پیرۆز" نیشاندەدرێت، وەکو درۆی فاشیانە هەڵدەسەنگێنم. باوەڕیم وایە کە بەبڕیارترین وڵاتپارێزی بەرێزگرتن بەرامبەر تەواوی هەبوون و فەوارە کولتوورییەکان تێپەڕدەبێت. هەروەها ئەوانەی بخوازن بەرادەی هەرە بەرز سوودیان بۆ نەتەوەکەیان هەبێت، تەنیا کاتێك بەئەندازەی کولتووری خۆیان ڕێز بەرامبەر کولتووری تەواوی گەلان نیشانبدەن، ئەمە بەدیدێت. سەدەی بیست و یەکەم دەبێتە گەواهی ئاشتی گوردان، لەسەرەتاکانی سەدەی بیستەم هەردوو گەلی کورد و تورك بەیەکەوە شەڕی ڕزگاری نیشتمانیان دژی لەیستۆکەکانی ئیمپریالیزم بەڕێوە برد. هۆکارەکانی چی دەبێت با ببێت، کەموکوڕییەکانیان ئەوەیە کە شانبەشانی ئاواکردنی کۆمار سیستەمی دیموکراتی و یەکێتی ئازادانەیان بەدینەهێنا. ئەو ئەرکەی دەکەوێتە ئەستۆیان ئەمجارە لەسەرەتاکانی سەدەی بیست و یەکەمدا چاوەڕوانی سەرکەوتنە. ئەم سەرکەوتنەش ڕێگا لەپێش ئەوە دەکاتەوە تورکیا لە ڕۆژهەلاتی ناوین، قەفقاسیا، بەڵکان و ئاسیای ناوین ڕۆڵی پێشەنگی ببینێ.

بێگومان قۆناخی ژیانم لە نیمراڵی ڕۆڵی لەوە هەبوو بەقووڵایی بیر لەدیاردەی ئاشتی بکەمەوە. لەچوارچێوەی تواناکاریەکاندا ئەنجامەکانی ئەوەم بۆ دەرەوەش گواستەوە. ئەم هەوڵانەشم ڕۆڵێکی دیاریکراوی بینی لە نەرمکردنی زەمینەی تورکیا لەم دوو ساڵەی دواییدا، بەتایبەتی ئەهاوێشتنی ئەو هەنگاوانەی لەچینی سیاسەتمەدار، پەرلەمان وحکومەت چاوەڕوان دەکرێ، دەرفەتی لەپێش زیاتر کردنەوەی ڕێگا و ئاشتیەکی هەمیشەیی نەداوە. من بەهۆی ترسان لەمردن ئەم هەڵوێستانە نیشان نادەم. باش دەزانم کەئەمە بە سوود و چارەسەری نابینم. بەڵام بە بایەخەوە ئاماژە بەوە دەکەم کە وەکو پێویستیەکی ناسنامە ئایدیۆلۆژیەکەم هەنگاوەکانم بەهەڵە شرۆڤە ئەکرێ و لێکدانەوەی جەوتی لەسەر ئەکرێت. ئەوەی لەسەر من بەڕێوە دەبردرێت سیستەمی ڕزینە. هەڵبەتە دەزانرێ بەچۆن پیلانگێڕییەك خرامە ئێرە. دەرفەت نەدان بە ئومێدە باوەکانی پیلانگێڕان لەسەر ئەنادۆڵ، میزۆپۆتامیا و تورکیا، بۆئەوەی زیاتر دەرفەت بەو توێژە شۆڤێنی یە پاشڤەڕۆیانە ئەدرێت کە سیاسەت لەسەر خوێن و شەڕ بەڕێوە دەبەن، بەبڕیارم لەسەر درێژە دان بەهەڵوێستی ئاشتی و یەکێتی ئازادانە کە لە بەرژەوەندی تەواوی گەلانی تورکیادایە. هەروەها ئاماژەم بەوە کردبوو کە لەنێو بردنی من تەنیا بەکەسایەتی من سنووردار نییە، ئەگەر بەمجۆرە بووایە هێندە روونم نەدەکردەوە و ئەمدەکردە مەسەلەیەك. بەڵام لەبەرئەوەی زۆر باش دەزانم بەهۆی ئەو پیلانگێڕیەی تاوەکو ئێستا بەڕێوە دەچێت لەنێو بردنمان وەکو سەرەتایەك بۆ لەناوبردنی یەك بەدوای یەکی تەواوی هەڤاڵان، دۆستان و گەلە وڵاتپارێز و دڵسۆزەکەمان بەکاردەهێنرێت، کاتێك ئەگەرێکی بەمجۆرە کەوتە ڕۆژەڤ و وەکو مەترسیەك هاتە ئاراوە ئەوا هەنگاوەکان بۆ ئامادەکاریەکی سەرتاسەری و ڕابوونە سەر پێیان و سیستەمی بەرگری ڕەوا ناچاریەکە. ئەوانەی ماقووڵترین هەنگاو لەپێناو ئاشتی ناهاوێژن هەموو شتێکیان لێ چاوەڕوان دەکرێ. پووچەڵکردنەوەی پیلانگێڕی پێویستی بەهەوڵ و کۆششێکی زیاتر هەیە. پێویستە باش لێکدانەوەی ئەوە بکرێت کە سیستەمی پووکانەوە دەخوازێ بەکوێ بگات. لەسەرەتا شێوەی خۆکوشتن بەسەر مندا سەپێنرا بوو. لەچەندین گۆڕەپاندا قۆناخی دوای من ئەخشەی بۆ کێشرابوو. ئەوەی تاڵەبانی تەنیا یەکێکیان بوو. پیلانی گرێدراو بە بارزانی ش هەبوو، ئەم پیلانانە کۆتاییان پێنەهات، بۆ کات بەجێهێڵدرا. بە هیچ جۆرێك نازانرێ شێوازی چارەسەری تورکیا چییە. بەڵام ئاشکرایە کە بۆ کات درێژی دەکاتەوە و گونجاوترین ئەلتەرناتیڤ بەگوێرەی بەرژەوەندیەکانی خۆی پەیڕەو دەکات.

هەڵوێستی ئێمە دەزانرێ. مەرجە کە هێزەکانی بەرگری ڕەوا خاوەن چەندایەتی و چۆنایەتیەکی وەهاین کە لەنێو هەر چوار دەوڵەتی دراوسێدا بتوانن ئاشتی و چارەسەری یەکێتی دیموکراسییانە بەدیبێنن. تەنانەت سادەترین ئاشتیش پێویستی بە تۆکمەترین و بەهێزترین هێزی بەرگری ڕەوا هەیە. کامە دەوڵەت هێرش دەکات با هێرش بکات، پێویستە

بەرامبەر هەموویان خاوەن پلانی تۆکمە و ئامادەکاری و پێگە گرتنێکی قووڵ و بەرفراوان بن. ئەوکاتە شانسی ئاشتی و چارەسەری دیموکراتییانە دەبێت کە سیستەمێکی بەرگری رەوای بەمجۆرەی لەپشت بێت کە بەرگەی هەموو جۆرە هێرشێك بگرێت. دووبارەی دەکەمەوە: ئەمە بۆ هەرچوار دەوڵەتیش لە جێگای خۆیدایە. لەسەر ئەم بنەمایە پێویستی بەتێکۆشانێکی بەرفراوانی کۆمەڵی مەدەنی و خەباتێکی سیاسی هەیە کە پشت بە رێککەوتن لەگەڵ هێزەکانی چارەسەری دیموکراتییانە دەبەستێ، بەشێوەیەکی سەرەکی تێکۆشانی کۆمەڵی مەدەنی و هێزەکانی رێککەوتنی دیموکراتییانە ئاشتی و چارەسەری دیموکراتییانە بەدیدێنن. تەنیا بەئەندازەی بەهێزکردنی ئەم تێکۆشانە و هێزەکانی هاوپەیمانێتی لەلایەن هێزەکانی بەرگری رەوا و دەرەوە ، دەشێ پێشکەوتنەکان پۆزەتیف و خێرا بن.

هەلومەرجەکان چەندە سەختیش بن، هەوڵدەدەم بەرخودان بکەم. لەژیانی ئیمرالیدا، بەرهەمهێنانی سەبر، واتا و بوێری، بۆمن زەحمەت نابێت. زەحمەتی جەستەیی لەئیرادەی من بەدەرە. پۆزەتیڤانەتر ئەوەیە کە هەم مێژووی گشتی، هەم مێژووی بزاڤی ئازادی لەمیانەی هێزی سۆزداری ئیمرالی بەردەوام هەڵدەسەنگێنم. هەندێ کار و خەباتی ئەدەبی پلان دەکەم. دەتوانم ئاماژە بەوە بکەم، دەرککردن بەهێزی سۆز و بیرکردنەوەم لە قۆناخی ئیمرالی بایەخێکی نائاسایی هەیە و بەرەو بوون بەهێزێکی ئاوارتە دەبات. مەزنایەتی و مەزنبوونی مێژوویی، بەتوندی گرێدراوی هاوبەشی کردن و نوێنەرایەتیکردنی راستینەکەمە لە ئیمرالی. هێندە بێبەزەییانە و بەچڕی بەرێوەچوونی مێژوو و رەوشی هەنووکەیی، یەکێك کە پێکهاتەیەکی وەکو منی هەیە، چاودێریکردن و ئەنجام وەرگرتنی، هەروەکو چۆن هێزێکی مەزن بەوانە دەدات کە باوەڕییان بەخۆیان هەیە، ئەرکی گەورەشیان دەخاتە ئەستۆ. خۆشیم لە خۆمەزنکردن نایەت. بەڵام بۆ بەراوردکردن بەردەوام رەچاوکردنی عیسا، پاولوس، محەمەد، لینین، ستالین و نموونەکانی دواتر سوودمەند دەبێت. لەو باوەڕەدام کە ئەم شیکردنەوانەی بە شێوەیەکی بەرگرینامە پێشکەشم کردووە کاریگەری دەبێت لە فەبوونی ئاسۆ و دەوڵەمەندکردنی هزر و سۆز و ئارادەیەکی مەزن وەڵامی پێویستیەکان دەداتەوە، بەڵام ئەگەر ئاشتییەکی شەرەفمەندانە و ژیانێکی ئازاد بۆخۆیان بخوازن، پێویست دەکات هەرکەسە و هەوڵ و کۆششی تایبەتی خۆی بەگوێرەی تایبەتمەندێتیە ئاوارتەکەی قۆناخ تەقلی بکات.

تاوەکو ئێستا من ٪٩٠ ی باری دەوڵەت و PKK و گەل هەڵدەگرم. ئەمە بۆ خۆم بەشەرەف دەزانم. بەڵام ئەوانەی بار هەڵنەگرن، شانسێکی ئەوتۆی شکۆداری و مەزنبوونیان نییە. هەربۆیە تاوەکو بڵێی بایەخدان بە شێوازی گەوهەری و بوێری و سەرکەوتووانە پێویستە. قۆناخی بەمجۆرە قورسایی وەهایان هەیە کە چارەنووسی سەدەیەك ــ دوو سەدە دیار دەکەن. بەمجۆرە هەڵسەنگاندنی ئەمە، گرنگبوونی سەدەکان تێپەڕدەکاتە ئەو قۆناخانەی دەتوانین بڵێین کە شایستەی مێژوون، رێگا لە پێش هەبوونی هێزی رەسەن و بەکەسایەتی بوونیان

دەکاتەوە. لە بەکارنەهێنانی ئەم شانسەدا نەك بەناوی خۆم، بەناوی هەموو کەسێك خەمگینی خۆم دیار دەکەم. ئەو خاکانەی دەتوانرێ بەهەشتی لێ بخولقێندرێ نابێ هێندە سەرەتایی و وەکو شوێنی بێ خێری و بێ کەڵك بمێنێ. مەزنایەتی ئومێدەکانم لە هەموو کاتێك بەهێزترە. دابەشکردنێکی ناتەواو و نوێنەرایەتی نەکردن، بەناوی ئێوە و تەواوی ئەو مرۆڤانەی خاوەن چەمکی تێگەیشتنن، وەکو سەرچاوەیەکی خەمگینی و زیان دەبینم. من هیچ واتایەك بەوە نادەم کە ئەوانەی بەدوای راستی و ژیانی ئازاد و جوانین بۆچی سەرکەوتنێکی بالادەست ناهێنن. هەربۆیە چاوەڕوانیەکانی بەردەوامم سەبارەت بە سەرکەوتن و چارەسەری مەزنە.

پێشخستنی رەخنە ــ رەخنەدان سەبارەت بەم قۆناغانەی ژیانم کە بەشێوەیەکی درێژخایەن و چڕ تێپەڕبوو پێویستییەکە و گەلێك ئەزموونی لێدەکەوێتەوە. هەوڵدەدەم بەشێوەی چوارچێوەیەك و بەپێناسەوە، وەکو خاڵی سەرەکی ریز بەندی بکەم؛

ا ـ لەسەردەمی سیستەمی راهیبی سۆمەرەوە زەمینی ژیانی کەسێتی تاك لە کۆمەڵگاکانی رۆژهەڵات بەردەوام جاڕ دراوە. هەزاران ساڵ بەر لەئێستا بڕیار لەسەر ئەوە دراوە کە پێویستە تاك چۆن بژیت و بیربکاتەوە و وەکو قەدەرێك پێشکەشکراوە. ئەمەش پشت بەو چەمکە دەبەستێ کە دەڵێ بالادەستی کۆیلەداری لە گەوهەری خۆیدا سیستەمی جێگیری ئاسمانە لەسەر زەوی. شێوازی هزری میتۆلۆژی و ئایینی بەردەوام ئەم سیستەمەی تۆکمە کردووە. بەهۆی یەکەمین هەلومەرجەکانی کۆمەڵگای کۆیلەداری، تارادەیەك گرێدانی تاك بەسیستەم کە خاوەنی سێبەری خۆشی نەبێت، هەر لەسەرەتاوە بنچینەییترین لێدانی لە کەسێتی تاك داوە. ئەو رۆڵەی بێ کەسایەتیکردنی کە میتۆلۆژیای سۆمەر دەستیپێکرد، لەلایەنی ئاینە تاکخوداییەکان بە رێسای وشکتری باوەڕی گرێدراون. سەبارەت بەهەر بابەتێکەوە تاك هەنگاو بۆ سۆز و هزرێکی خولقکارانە بهاوێژێ مۆری گوناهباری لێدەدرێت و ئەمەش رێگا لە پێش ئەوە دەکاتەوە لەناو کۆمەڵگا بەلاوەبنرێت. تاك کە بەرامبەر ئەمە بێ دەسەڵاتە یەکسەر تەسلیم دەبێت. ئەو دەسپۆتیزمەی پێ بەپێ بڵاودەبێتەوە، چەمکێکی قەدەرگەرایی بەهێز لەسەر تاکەکانی رۆژهەڵات زاڵ دەکات و ئاسانکاری بۆ بەڕێوەبەرایەتیەکەی دەکات.

ئەوە لەولاوە بمێنێت کە باوەڕی بەهزری خۆی ناکات. تاك دەخرێتە رەوشی وەها تەنانەت نازانێ و هەست بەوە ناکات تواناکاریەکی بەمجۆرەش هەیە. ئەوەی دەکەوێتە ئەستۆی، هەرچییەکی پێشکەشی دەکرێت وەکو خۆی پەسندی بکات. لەژێر ناوی سیستەمی ئاسمانی یاخود سیستەمی خودایی، بەهێزبوونێکی سەرسوڕهێنەرانەی سیستەمی شارستانییەتی کۆیلەداری و لە دەستدانی هێزی تاك، ئیتر وەکو شتێکی سروشتی و قەدەر پێشوازی دەکرێت. هەر دەوڵەت و میرنشینێکی تازە دێتە ئاراوە جگە لەهەنگاوێکی دیکەی پێشخستنی ئەم سیستەمە رۆڵێکی دیکە نابینێ.

ب ــ ئەو وەڵامەی تاك لە کۆمەڵگای ڕۆژهەڵات دەیداتەوە ئەم ئایدیۆلۆژیا فەرمی یە، لەمیانەی شێوازی سۆفیگەرایی هزری نهێنی بەشێوەی بەدواداچوونی بووە. ئەمانە کە یەکەمین شێوەی تەریقەتگەرایی بوون، وەکو گروپی شرۆڤەکردنی ئایینی بەگوێرەی خۆیان، هیچ کاتێك نەبوونەتە ئەلتەرناتیڤی سیستەم. لە کاتێکدا لەرێگای هزری فەلسەفی بناخەی شارستانییەتی ڕۆژئاوا دادەنرێ، کاتێك لە شارستانییەتی ڕۆژهەڵات هزری میتۆلۆژی ( ئەفسانەیی) کە بەردەوام پەرە دەسەنێ، پێ بەپێ دەگاتە ئاستی باوەڕی ئایینی، ئەوا موحافەزەکارتر دەبێت. ئەو گومانکردنە سنووردارەی سەرەتا بەتەواوی جێگای خۆی بۆ دۆگماکان بەجێدێڵێ. دوای ئەوەی گووترا فەرموودەی خودایە، ئیتر بیرکردنەوەی سەربەخۆ هیچ واتایەکی نەماوە، گوێپێنەدانی، واتای ڕووبەڕووبوونەوەی خوداوەندە. هیچ کەسێك وەکو فەرموودەکانی خوداوەند ڕاست قسە ناکات. تاکی ڕۆژهەڵات هزری تایبەت بەخۆی نییە. خاوەن قاڵبی هزری ئامادەکراو و کلێشەی ئەزبەرەکراوی هەزاران ساڵ بەر لە ئێستایە. پێویست ناکات بەدوای هزری خولقکارانە بکەوێت. هەمووی لە پەرتووکەکاندا نووسراوە. بلیمەتترین کەسایەتی، ئەوەیە کە زانیاری هەموو پەرتووکەکانی ئەزبەرە کردووە. کاتێك شرۆڤەی سۆفیگەرایی کراوە، بەزەندیق تاوانبار کراوە. بەچەندین قات باڵادەستی ئایدیۆلۆژیای فەرمی بەسەر تاکدا تۆکمە کردووە.

ئەم شێوازەی لە تەواوی ئاسیا و ڕۆژهەڵاتی ناوین زاڵە، لە گریکەکان( یۆنان) دووچاری تێکشکان هات، کۆمەڵگای گریك زەمینەی بۆ ئەوە نەرەخساندووە کە ئەم شێوازە هێندە پێشبکەوێت و پەسندی بکات. زیاتر ڕێگای لەپێش پەسندکردنی تایبەتمەندییە پێشکەوتووەکانی هزری فەلسەفی کردۆتەوە. شارستانییەتی ڕۆژئاوا لەمیانەی ئەمجۆرە هزرە فەلسەفیە یەکەمین بناخەی خۆی داناوە. بایەخدان بەهزری تاك لە گەوهەری ئەمەدا شاراوەیە. بەمجۆرە جیابوونەوەی نێوان ڕۆژهەڵات ـ ڕۆژئاوا، لەسەر بنەمای بەکەسێتی بوون دەستپێدەکات و دەکرێتەوە . لەکاتێکدا لەرۆژئاوا هێزی مێشکی تاك و خولقکاریەکەی پێشدەکەوێت، تاکی ڕۆژهەڵات پێ بەپێ زیاتر لەنێو دۆگما بێواتاکان دەخنکێت و بەتەواوی دەسڕێتەوە.

بێخێربوونی ڕۆژهەڵات سەرچاوەی خۆی لەو دۆگماتیزمە دەگرێت. ئیتر تاك لەمیانەی چاویلکەی ڕەش یان سپی ی دۆگما لە جیهان و گەردوون دەڕوانن. لەرێگای ئەم چاویلکانەوە پێشتر دیارکراوە کەتاك چی بەچ ڕەنگێك دەبینێ، تەنانەت چۆنیەتی ژیانکردنی کامە هەست و سۆز تاوەکو وردترین لایەنەکانیەوە بە ڕێساکانیەوە گرێدراوە. بەگوێرەی ئەوەی هەزاران ساڵ بەر لەئێستا، تەنانەت لەسەرەتای هەبوونەوە (الازل) ئەوە دیارکراوە و بڕیاری لەسەر دراوە کە چۆن دەبینێ و قسە لەسەر چی دەکات، شتێك لە ئارادا نییە بدۆزرێتەوە و بخولقێنرێ. ئەنجام تەماشاکردنێکی سەرسوڕمانە. دەبێ جیهان و وڵات هاوشێوەی ئاو، بەیەك ڕەنگ ببینێ.

لەسروشتدا بەدوای پاساو دۆزینەوە و داهێنان ناگەڕێی. ئەمانە هەمووی تایبەت بەخوداوەندە. ئەو بیرەکانەوە و بەنووسین پێمان ڕادەگەیەنێ. بە کورتی، لەکاتێکدا تاکی ڕۆژهەڵات بەهۆی ئەم شێوازەی بیرکردنەوە تەواوی تواناکاریەکانی هزر و هەستی خۆی و دەسکەوتە مەزنەکانی شارستانییەت لەدەست دەدات، تاکی ڕۆژئاوا هەروەکو بڵێی تازە بەتازە دارستانی دۆزیوەتەوە و لەم پێناوەدا کەوتۆتەڕێ، هەموو ڕۆژێك لە ڕێگای هزرو سۆزی نوێ، هەوڵەدات جیهان وەکو بەهەشت ببینێ، وەکو سەرچاوەیەکی بێ سنووری هێز بدۆزێتەوە.

ج ـ ئەو گوناهەی من لە منداڵییەوە ئەنجامم دا، لەراستیدا سەرچاوەی خۆی لەو سەرهەڵدانە دەگرێت کە بەرامبەر دابونەریتی پێنج هەزار ساڵە کردم، گومان و ناکۆکییە دژوارەکانی گوند، ئەو سیستەمە پەیوەندیدار دەکات کە لە قووڵاییدا جێگیر بووە. هەر لەسەرەتاوە هەڵوێستی سەربەخۆ بەرامبەر بەهەر شتێکی لەنێو خێزان و گوند بەگوێرەی ئەقڵ و ئازادیم نەبینیوە، بەواتای هەژانی نەریتی پێنج هەزار ساڵە دەهات. شوێنگەی تایبەتی باوك و دایك، بێ کاریگەرکردنی یەکتریان، ئێجگار لاوازبوونی کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی و نەبوونی سەرۆکێکی سەرەڕۆ لە گوند دا، بەواتای شکانی دابونەریتی باو دەهات. کەسایەتی دایك ی تایبەت بەگوێرەی کۆمەڵگای نیۆلیتیك، قاڵبەکانی کۆیلەداری لاوازتر کردبوو. بێچارەیی و نەبوونی بانگەشەی باوك بەناوی سیستەم، زیاتر گۆڕەپانی لە پێشدا کردەوە. کەسێتیەکەم ئەم زەمینەیە هەڵدەسەنگێنێ. هێندە مەودا دەگرێت، زیاتر متمانە بەخۆی دەکات. گاڵتەجاڕی لادێییەکان کاریگەریم لێ ناکات. هیچ دەستەڕۆییەك نامێنێ پێشم لێ بگرێت. لەناوەڕاستی گوند یاخیبوون بەرامبەر باوك کە گەورەترین دەسەڵاتە، لەراستیدا لە بناخەوە سیستەمی پێنج هەزار ساڵەی ڕاهیبی سۆمەر دەهەژێنێ. هێزی ماڵەوە و گوند تێری پەروەردەکردنی من ناکات، ئیتر ئەو باوەڕی و متمانەم بەدەست هێنابوو کە بەرێگای خۆمدا بڕۆم. دەتوانرێ هیوا و نومێد لەو منداڵە چاوەڕوان بکرێت، کە قاڵبەکانی کۆمەڵگای ڕۆژهەڵاتی رووخاندووە.

تەنانەت بەگوێرەی ڕاستی گووتەی (خوێك گرتت بە شیری، تەرکی ناکەیت بە پیری)، زەحمەتە کۆمەڵگای بۆرژوازی و دەزگاکانی کۆمار بتوانێ من بووەستێنێ. شایەنی باسە، ئەگەر بە ڕووکەشیش بێت، خۆیان لەگەڵێك لایەنەوە لەگەڵ کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی لەنێو ناکۆکیدا بوون. ئەمە بەکەڵك من دەهات. مەیلی شۆڕشگێڕێتی کە لە تەنیشتمەوە دۆزیمەوە، زیاتر ئەمەی بەخێو دەکرد. کاتێك ڕێگای ڕۆژهەڵاتی ناوینم گرتەبەر، هەروەکو شکاندنی بت لەلایەن حەزرەتی ئیبراهیمەوە، لەراستیدا منیش بەشێکی گرنگی دابونەریتی پێنج هەزار ساڵەم تێکشاند بوو. بێگومان ئیتر رەوشێکی وەها لە ئارادا نەمابوو بمێنمەوە. یان پاشەکشێ بۆ شاخ، یان کۆچکردن، یان چالاکی فارەمانانە، ئەو چارەنووسە بوو کە چاوەڕوانی دەکردم. دواتر باش دەرك بەوە دەکرا کە بە دەرەنگکەوتنێکی دوو هەزار ساڵە کارێکی ئیبراهیمی ئەنجامدرا.

لەژێر هەلومەرجی تایبەت بەخۆم ئەگەر هەستیشی پێنەکەم، هەر لەمنداڵیەوە، ئەوە یەکلا دەبۆوە کە بەرامبەر سیستەمی پێنج هەزار ساڵەی شارستانییەت یاخیبووم. ئەم راستینەیە، لەهەمانکاتدا دەبێتە شۆڕشگێڕیەکی تایبەت بەخۆی.

د ـ مارکسیزم و چەپی تورك شۆڕشگێڕی قۆناخێکی سنووردارە. تێکۆشانیان بەرامبەر سەرمایەداری لەسایەی ئەو کەسایەتییەی لە ژێر کاریگەری ئەوان بەدەستیان هێناوە، هۆکارێکی سەرەکی ژێرکەوتنیانە. لە ناوەڕۆکدا لە سیستەمی سەرمایەداری دانەبڕاوە. نیاز پاکی و رادیکالیزمی دژە سەرمایەداری بەتەنیا تێری تێپەڕکردنی سیستەم ناکات. ژیان و کەسایەتی کە هەیانە، تواناکاری و هێزێکی وەهای نییە ئەو دەوڵەتەی سەرمایەداری پشتی پێدەبەستێ تێپەڕێکات و وەرچەرخێنێ، لەشێوەی هاوچەرخی تەریقەتە سۆفیگەرایەکانی چەرخە کۆنەکان تێپەڕناکەن کە هێندێکی تر پێشکەوتووترە و تارادەیەك بناخەیەکی زانستی هەیە، لەوە رزگاریان نابێت کە نەبن بە جەمسەری هەرە چەپی سەرمایەداری. شۆڕشگێڕێتی سەرمایەداریش، سەرباری ئەو هەموو دژە ـ دەرەبەگایەتییەی، لەژێر کۆنترۆڵ و کاریگەری ئەو پێدەکات. چەندین قاڵبی رۆحی و هزری لەوێ بەدەستدێنێ. شارستانییەت وەکو شێوەی گشتی کۆمەڵگای چینایەتی، تایبەتمەندێتی سەرەکی بۆهەموویان بەدەستدێنێ.

خودی شارستانییەت سیستەمێکی گشتگیرە. شۆڕشێکی راستەقینە، تەنیا بەو ئەندازەیەی ئەم گشتگیرییە شیبکاتەوە، دەتوانێ بانگەشەی ئەوە بکات کە شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی جیاوازە. ئەوەی نوێ دێت لەجیاتی رووخانی کۆن، رۆڵی تۆکمەکردنی دەبینێ، هەرە دوایی ئەوەی کە سۆسیالیزمی بونیادنراویش ئەنجامیداوە ئەمەیە. ئەمەش بەڵگەیەکی تێپەڕنەکردنی سیستەمە. رەنگدانەوەی ئەم سیستەمە وەك راستڕەو و چەپڕەو لەسەر کۆمەڵگای تورکیا بە شێوەیەکی تێکچوو و لاواز بەدیدێت. شوێنگەی من تەنیا دەتوانێ رێککەوتنی کاتی لەگەڵ کۆمەڵگای فەرمی بۆرژوازی و پاشماوە چەپڕەویەکەی بکات. چاوەڕوانی ئەوە ناکرێت هەردووکیان لەناو یەکتردا بتوێنەوە. ئەم خاسیەتەی بەشێوەیەکی تیۆری راستە، بەکرداریش بەدیدێت. هەم بە مەودا نزیکی مارکسیزم و سۆسیالیزمی بونیادنراو دەبمەوە، هەم بەشێوەیەکی هاوشێوە پێشوازی لە شێوەی مارکسیزمی دەرچووی تورکیا دەکەم. شتێکی سروشتییە کە هەڵوێستێکی هاوشێوە بەرامبەر کۆیە بێکاریگەرەکانی رۆژهەڵاتی ناوین نیشان بدەم. نەمدەتوانی لەنێو پێکهاتەی هیچ یەکێك لەدەوڵەت، شۆڕشگێڕێتی وچەپڕەوی ئەواندا بتوێمەوە. ناچاری بوو کە رێگای خۆم بگرمە بەر. هەرچەندە بەتەنیابم بەڵام قووڵایی واتاو شکۆداری ئەو رێگایەی دیارکرا بوو روون و ئاشکرا بوو. بۆ یەکەمین جار بوو لە کۆمەڵگاکانی رۆژهەڵاتی ناوین تەواوی سیستەمە کۆن و نوێکانی داگیرکاری خستۆتە بەرامبەر خۆی و تاوەکو دوا سنوورەکانی یەکسانی و ئازادی درێژ بۆتەوە. لێگەڕینەکانم سەبارەت بە سیستەم هێندە قووڵە کە دەتوانێ ئەو شارستانییەتانە تێپەڕێکات کە بەریشە هی رۆژهەڵاتی ناوینن.

بەو رادەیە گرێدراوی ناسنامەی خۆیەتی کە سیستەمی رۆژئاوا وەکو خۆی پەسند ناکات، ئەم رەوشە لە ئەنجامدا تەواوی سیستەمی ئیمپریالیستی جیهان لەبەرامبەر خۆیدا دەبینێتەوە. مسۆگەرە لەخاکی رۆژهەڵاتی ناوین نقوومی لێگەڕینێك بوومە کە لە دۆگماتیزم رزگاری بووە. تەنانەت ئەگەر تواناکاری داهێنانیش نەبێت، دەرکەوتن لەنێو هەموو شێوە کۆن و نوێکانی دۆگماتیزم، هەست و هزرێکی زۆر جیاواز دەبەخشێ.

هـ ـ من هێز و تامی ئەم هەست و هزرە ئازاد کراوەم ناسی. لەوانەیە لەمیانەی گێرانەوە بەشێوەی رۆمانی درێژ تێروانین و خەیاڵەکانی ژیانم شیبکەمەوە. تەنیا بەمجۆرە گرێکوێرە کراوەتەوە، چاویلکە رەش و سپیەکەی ئەسپ فرێدراوە. ئەو دۆگماتیزمەی پێنج هەزار ساڵ لەرێگای هێزی ئیلاهی پارێزراوە، بەتەواوی پیرۆزییەکەیەوە، خراوەتە رەوشێك تەنیا بۆ مۆزەخانە بێت. لە کۆنترین بلیمەتەکانی رۆژهەڵاتی ناوین و شۆڕشگێرە راستەقینەکان نزیك بووینەتەوە. لەنێو دەوڵەمەندێتیەکی نائاساییەوە، هەم لێشاوی بەوروژمی هەست و سۆزەکان، هەم لێدانی بروسکە ئاسای هزر لەمێژوو نزیك دەبینەوە. وڵاتی بێخێر نەماوە، هەموو لایەك بە پیرۆزییە کۆنەکەی خۆی گەیشتووە و پڕ لەرەنگ بووە. هەرگۆشەیەك تا ئاستێك بانگەوازی دەکات و دەڵێ "وەرە لە منیش تێبگە و چارەسەر بکە". تەواوی ئەوانەی لە گۆڕستانن هەروەکو بڵێی لەزیندووبوونەوەی رۆژی مەحشەر نزیك بوونەتەوە و زیندوون. لەراستیدا کاتێك پەردەی رەشی دۆگماتیزم دەدرێت، هەروەکو بڵێی هەموو شتێك لەنێو دەوڵەمەندی و جوانی رەنگی خۆی و بە دەنگی خۆی بانگەوازی دەکات. کاتێك ئاماژە بە پچڕانی پەردە دەکەم، لەوانەیە ئەوانەی دەخوازێت روونی بکاتەوە لەبەرچاوانە. ئەو وڵاتەی خوداوەندەکان و سەرمرۆکان قەدەخەیان کردبوو، ئەو مرۆڤەی رێگای بیرکردنەوەی لێگیرابوو، ئیتر دەبێتە هی خۆی. جیهانی پیرۆزیەکانی پێنج هەزار ساڵ بەر لەئێستا بەدەستیهێنا، لەگەڵ مرۆڤە دۆستەکان بەیەکتر دەگات. ئەو راستینەیەی بەرووخانی ئایدیۆلۆژیای فەرمی سەردەست ناودەبرێت، پێویستە ئەمە بێت. مرۆڤپەروەری نوێ و رێنسانس بەمجۆرە دەست پێدەکات. تێدەگەم، تاکەکانی ئەوروپاش کاتێك شارستانییەتی خۆیان پێشخست، بەمجۆرە دەستیان پێکردبوو. بەڵام ئەمە لاساییکردنەوە نییە، بەرێوە چوونە لەسەر خاکی رۆژهەڵاتی ناوین. دووبارە کردنەوەی ئەوروپا نابێت. ئەو وەکو منداڵی دوێنێ یە. رێنسانسی رۆژهەڵاتی ناوین، لەسەر بنەمای رەگ و ریشەکانی خۆی دەبێت. دەشێ ئەوروپا تەنیا ببێتە بەشێکی ئەم پەرتووکەی داستانی ئازادی.

دونیایەکی بەرەخنە وەها دەکرێتەوە و پێشدەکەوێت، لق و پۆپ دەگرێت و مەزن دەبێت. گرنگ ئەوەیە نارەزاییەکانی ژیانم بۆ جەکێکی راستەقینەی رەخنە گۆڕیوە. لەمیانەی جێگیربوون لەسەر بنەمای زانستیبوون و پارچەکردنی دۆگماتیزم و رووخانی یۆتۆپیا پووچەکان، وەکو ئەوە وام کە بە سیستەمێکی هزر و هەست و یۆتۆپیایەکی وەها گەیشتووم،

کە مرۆڤانە ترە و زیاتر گرێدراوی مێژوو و ئایینددیە و تاوەکو بڵێی بەدەوڵەمەندێتی گەیشتووە.

ژ ـ وا لەقەڵەم نادەم کە بەتەواوی لە دۆگماتیزم رزگارم بووە. پڕ لە نێش و داخە، راستیەکیش ئەوەیە ماوەیەکی درێژخایەن لەژێر کاریگەری دۆگماکان جولاوەمەتەوە. چەندە پێویست و راستیش بوو بێت، بەڵام منیش کەوتمە نێو ئەو هەڵەیەی کە دۆگماکان لەپێش یاخود لەسەرووی مرۆڤ ببینرێ. هێندە پشتبەستن بە بەرێوەبردنی مرۆڤ وەکو پێویستییەکی رێساکان، مسۆگەرە کە نەریتێکە لە سیستەمی راهیبی سۆمەر ماوەتەوە. کاتێک گووترا ( ئەمە رێسایە، یاسایە) بەردەوام دەبێ سیستەمی بەکۆیلەکردن بێننەوە یادتان. یاسا و رێسا پێویستن، بەڵام هیچ کاتێك نابێ دەرفەت بەوە بدرێت کە بەشێوەیەکی دارنراو حوکم بەسەر مرۆڤدا بکات. لەوانەیە رێساکان شکۆمەندی بێنێ، تەنانەت رێگا لە پێش ئاواکردنی گەورەترین دەوڵەت و شارستانییەت دەکاتەوە. بەڵام ئەوەی لەدواییدا دێتەئاراوە، بەکۆیلەکردنی مرۆڤەکانە، بەکۆیلەکردنی رەگەزی مرۆڤە. هیچ جۆرە پێشکەوتنێك نابێتە بیانووی پاراستنی کۆیلایەتی. تەنیا بەرادەی سانایکردنی دونیا زەحمەتەکەی مرۆڤ دەتوانرێ بەها بە سیستەمێك بدرێت. بەناوی مرۆڤایەتیەوە ناتوانین هیچ سیستەمێك پەسند بکەین کە لەژێر ناوی ئایینده، خوداوەند، دەوڵەت، نەتەوە یاخود بەناوی مەزنایەتیەکی دیکە مرۆڤ بکات بەقوربانی. لەو رۆژانەدا ئەو یاسایانەی زۆر باسی دەکرێت لەپێناو دەوڵەت و مرۆڤەکانە. گووتەی " پێویستە وەها بێت" لە سەلماندنی ئەوەی تاج رادەیەك خائینانە جموجۆڵ دەکرێت بەولاوە، واتایەکی دیکەی نییە.

بەلانی کەم سەرباری ئەوەی باشترینیانم بەناوی هەڤاڵێتی خواستووە، بەڵام کەوتنم بۆ نێو ئەم نەریتە نەفرینکراوە، حیساب نەکردنی هێزی ئەم نەریتە لەلای منەوە، وەکو رەخنەدانێکی راستەقینە دەمێنێتەوە. من نەبووم کە بەردەوام بەمجۆرە بیرمدەکردەوە؛ تاوەکو دوایی راستییە گشتییەکانم پێشکەشکرد، تەنانەت بەخۆم سادەترین پەروەردەشیانم بەرێوەبرد، ئەوەی دەمێنێ ئەرکی ئەوانە، ئەوەم بەئەقڵدا نەدەهات لەگۆڕەپانی ئەرك و بەرپرسیارێتیدا سەرکەوتوونەبن! باوەڕیم بەهێزی یاساو رێساکان هێنابوو. دووربووم لەوەی لەنێو راستینەی بەرجەستەو واقیعی لەمرۆڤ تێبگەم. ئەگەر لەنێو رێسای لایەنی بەرامبەردا بێت، تەنانەت فریشتەش بێت، چی بەرامبەر بکرێت لەجێی خۆیدایەهەقە. ئەمەش باوەڕیەکە لە نەریتە نەفرینلێکراوەکەی باڵادەستەکان ماوەتەوە؛ خودی دۆگمایە. لەکاتێکدا بەسەدان گروپی هەڤاڵان رێ دەکەوتن، هەروەکو یەکێك وابووم کە باوەڕی بە خوداوەند هێناوە. ئەوان لەنێو هەموو هەلومەرجێکدا بەشێوەی موعجیزەیی فەرموودە پیرۆزەکانیان سەردەخەن. دۆگماتیزم ئەمە بوو. تاوەکو قورگ تێیکەوتبووم.

ئەگەر بڵێین لەو سەردەمەدا زانست خۆی لە دۆگماتیزم رزگارکردووە، دەبێتە خەڵەتاندنێکی مەزن. بەپێچەوانەوە ئەو دۆگماتیزمەی زاناکان بەناوی زانستیبوون تێیکەوتوونە، لەدۆگماتیزمی راهیبەکان مەترسیدارترە کە میتۆلۆژییان خوڵقاند. هیچ نەبێت راهیبەکان بۆمبای ئەتۆمیان نەبوو. لەلایەنێکی دیکەش ئەوان زۆر بەئەنجامی ئەوکارەوە خەریکبوون کە ئەنجامیاندەدا. زاناکان کەراهیبی مۆدێرنی ئەم چەرخەمانن، ئەوە بەراوردبکەین کە پرۆفسۆرەکان هەوڵێکیان لەولایەنە نییە و، جگە لە پەرستگاکانی زانست، واتە جگە لە خوێندنگاکان، لەسەرووی هەمووشیانەوە زانکۆکان، پێیەوە خەریك نابن، ئەوا دەبینرێ کە بەگوێرەی ئەو راهیبانەی میتۆلۆژییان خوڵقاند و پێغەمبەرەکانی ئایینیان ئافراند، زۆر لەمەسەلەکە دوورن و بێ رۆحی بەرپرسیارێتین. نوێنەرەکانی دۆگماتیزم کە لەهەموو ئەو دامەزراوانە قووڵبوونەتەوە کە جێگای بەرپرسیارێتین، لەسەرووی هەمووشیانەوە دەوڵەت، راستیەکی دیکەی پێویستە ببینرێ ئەوەیە کە هەریەکە وەکو دیلێك هەڵسوکەوت دەکەن یاخود دیلکراون. مەترسیدارترین لایەنی دۆگماتیزم لەزۆربەماندا ئەوەیە، خۆخەڵەتاندنە لەمیانەی زانستی بینین. ئەنجام هێرۆشیما و هەڵەبجەکانە. دۆگماتیزم بەشێوەیەکی گشتی بەرهەمی راستینەی کۆمەڵگا، بەتایبەتیش بەرهەمی جیابوونەوەی چینایەتییە. بەهێزترین چەکی پەروەردەیە. ناتوانرێ وابەسانایی دەستبەرداری لێبکرێت. تاکە چەکی بەکاریگەری بەرەنگاربوونەوە، بەوەدا تێپەڕدەبێت کە ئەوەی ئەنجام دەدرێ و بیری لێبکرێتەوە تاکو بڵێی لەتاکدا ڤاڵ بکرێتەوە. ئەگەر بەمەرجی واتای داهێنانی گەوهەری و لێکدانەوەی تەواوی ئەنجامەکانی فۆرمیلەی بکەین بەشێوەی"هێندەی دەتوانی بیربکەیتەوە کاربکە، هێندەی دەتوانی کاربکەیت بیربکەرەوە" دەبێت. ئێستا بەرامبەر بەم نەخۆشیە گشتییە جگە لە جموجوڵێکی بەرپرسیارانە هیچ چارەیەکی دیکە دیار نییە.

ر- ئەوکاتە پێویست دەکات یەك بە دوای یەك ئەم پرسیارانە لەخۆم پرس بکەم: کاتێك درزی نێوان شێوازی کرداری و راستیەکان مەزن بوو، ئایا پێویست بەگۆڕینی پێگەکان و داکەوتنە نێو گۆڕەپانی کرداری نەبوو؛ ئەمە راستتر نەدەبوو؟ لەبەشە پەیوەستدارەکان هەوڵدەدەم وەڵامە گشتییەکان شیبکەمەوە. ئەگەر هەر لەمیانەی رستەیەکەوە دووبارەی بکەمەوە، یاخیبوون بەرامبەر خێزان( ) و گوند پێویست بوو. بەردەوام بەرێزەوە پێشوازی لەم چالاکیە رەسەنە دەکەم. بایەخ و گرنگی لە پێشینە بەو منداڵانە و خەیاڵەکانیان دەدەم کە بەرامبەر دۆگماکانی هەزاران ساڵە سەریانهەڵداوە. دواتر بەگوێرەی کارەکانی ئەنجامەم داوە بەدوای وەڵامدا دەگەڕێم. لەگەڵ ئەوەی کە لێگەڕینەکانی رێککەوتنم بەرامبەر کۆمەڵگای بۆرژوازی و دەزگاکانی کۆمار راست دەبینی و درێژەم بەم چەمکە دەدا. لەجیاتی پێشخستنی ئەلتەرناتیڤی ئەمە و چالاکیەکی رادیکاڵانەی رووخاندنی ئەو لایەنانەی پێویستی بەرێکخستن هەیە، ئەوا بەرەنگار بوونەوە لەمیانەی هێزێکی سیستەمی بەرگری رەوا و

قووڵکردنــەوەی ڕێککــەوتن و وەرچــەرخان بــەرێگا و پــێڕەوێکی ڕاســتتر دەبیــنی. چــەمکی مرۆڤانەم، جگە لە چەمکی بەرگری ڕەوا و ئامرازەکانی، مۆڵەت بەهیچ ئـامرازێکی توندوتیـژی و تێپـەڕبوون بۆ دەوڵـەت نـادات و هـەرگیز بەرامبـەر بـە مـرۆڤ و کۆمـەڵگا تێکـەڵی ئـامرازی "بەشێوەیەکی کلاسیکی ئامرازی بەڕێوەبەرایەتی جینایەتی" دەوڵەت نابم. لەچەمك و کرداری خۆمـدا جێگـا بـە شێوازی بەڕێوەبەرایـەتی دەوڵـەت و کۆمـەڵگای کلاسـیکی نـادەم. لـەرێگای هێزێکی بەرامبەر رووخاندنی ئەمە و ئاواکردنی نوێتر لە شوێنیدا، خەڵەتاندنێکە. بەرامبـەر ئەمە بە پشتبەستن بە خشتەکاری گشتی کۆمەڵگا و ڕێکخستنە تەکنیکیەکەی، بەڕێوەبەرایـەتی لەرێگای یەکینەی سڤیل بەبناخە دەگرم کـە هیـچ هێزێکی جەسـتەیی و چـەك بـەکارناهێنن. ناکەومە نێو لەرێ لادانی سۆسیالیستی بونیادنراو. تەنانەت ئەگـەر پێویست بکات بەرامبـەری تـەواوی جیـهان، لەتاکـە مرۆڤێکـەوە دەسـت پێدەکـەم تـاوەکو تـەواوی مرۆڤایـەتی و گـەلان دەگرێتـەوە، پێویست بکات و ببێتـە ناچاری تـاوەکو بەدەستهێنانی ئـەنجام درێـژە بەبـەرگری ڕەوای پـیرۆز دەدەم. لـەم واتایەشـدا گرێـدراوی گووتـەی "مرۆڤێك بەسـەردونیا سـەردەکەوێ" دەمێنم.

هەربۆیە پاراستنی بزاڤی ئازادی بەرامبەر تەواوی جیهانیش لەجێگای خۆیدا بوو، لەبواری تەکتیکدا دەمانگووت ئایا لەمیانەی بەڕێوەچوون بۆناواخنی ئەوان ئـەنجامێکی باشتر بەدەست دێنین، یـان زیـاتر لەمیانـەی پاشەکشـێکردن بـۆ چیاکـان و نێـو گـەل؟ لەسـەرەتای سـاڵانی هەشتاکان، پێگەگرتنم لە زاگرۆس، دەشیا ببێتە ڕێگایەك. بێگومان لەسـەرەتاکانی نـەوەدەکاندا لەگـەڵ شـەڕی کـەنداو ناڕاستەگرتنم بـەرەو ئـەم ناوچەیـە بەلایـەنی پۆزەتیـڤ بێـت یـاخود نێگەتیڤـە دەشیا ڕێگا لەپێش ئـەنجامی بایـەخداردا بکاتـەوە. هـەرە دوایـی لەسـەرەتای هـاوینی ١٩٩٨ ئـەم تواناکاریـە هـاتبووە ئـاراوە. لەگـەڵ تەقینـەوەی بۆمباکـەی ١٩٩٦ لـە شـام بەتـەواوی بەجێهێشتنی ئەم ناوچەیە، لەوانەیە گونجاوتر بووایە. بـەڵام بەشێوەیەکی گشتی چەمکەکـەی دیکە نەوەبوو، کەتا دوا هەناسە لەسەربنەمای پێویستیەکانی دۆسـتایەتی پێگـە سـەرەکیەکان بپارێزرێ، ئەمەش چەمکێکی ناموس بوو. ئەگەر لەگەڵ دۆسـتەکانت لەیەك سـەنگەردا بیت، هەڵوێستێك بـەواتای ڕاکـردن بێت، دەبـووە خیانـەتکردن لەدۆسـتایەتی. هەربۆیـە هەرچـەندە مەترسیەکان بـەرچاوان بـوون، سـەرباری ئاستەمکردنی پێشکەوتنە مێژوویـەکان، سـەنگەرم نـەگۆڕی. لاوازی دۆستەکانم و جموجوڵ نـەکردنیان بـەگوێرەی پرەنسـیپی ئـەخلاقی، ئـەوان پەیوەندیدار دەکات. من کەسایەتیەك نیم کە دەست لەچەمکی دۆستایەتی بەردەم و دەستی لێ بەرنادەم. تەنانەت ئەگەر منداڵێکی پێنج ساڵیش من بخەڵـەتێنێ، دیسان بـەڕێوەچوون لەسـەر ڕێگای دۆستایەتی بەبنـەما دەگـرم. ئەمـە مەسـەلەی بژار نییـە، بـەڵکو کێشـەی کەسـایەتی و ئەخلاقە.

و. چەندەی بڵێی کەموکورتی ئاستی ناوەندی PKK و کادیرەکانی دەرکەوتبوو. ئایا بۆ وەڵامدانەوەی ئەمە پەروەردەکردنی هەزاران گەنج تێری دەکرد؟ ئایا راستتر نەبوو گرووپێکی بچووك لەوانە بگرمە لای خۆم و قاڵیان بکەمەوە؟ ئەمانە پرسیاری گرنگن و گرێدراوی پرسیارەکانی پێشووترن. ئەو وەڵامەی دەمدایەوە، یان دەبوو لەلایەك راستەوخۆ دابکەومە نێو گۆڕەپانی پراکتیکی و لەبواری کرداریشدا بەرپرسیارێتی سیاسی و سەربازی بگرمە ئەستۆ، یاخود قاڵبوونەوەیەکی زیاتر بوو لەگەڵ گرووپێکی تەسکدا. لەراستیدا لەهەردوو بواریشدا نزیك بەپێویستی خەباتێکی چڕکرا. بە پشتبەستن بەتەلەفۆن و بێتەل و کاسێت و نووسین و تەکنۆلۆژیای هەیە، قاڵبوونەوەی مەزن ئەنجامدرا، رۆڵێکی نزیك بەفەرماندارێتی گۆڕەپانی مەیدانی بینرا. ئەوانەی بەنجی پێنج هەزار ساڵەیان خواردبوو نەیاندەتوانی وەڵامی بانگەوازیەکانم بدەنەوە. کلپەبەکڵپە خۆیان دەسووتێنن، بەڵام تێریان نەدەکرد. بۆ ئەوەی تێربکەن گۆڕەپانی سەربازی و سیاسەتی پراکتیکم بۆیان بەجێهێشتبوو. ئایا دەبوو ئەمە هەڵەیەك بێت؟ باوەڕیەکی وەها لەمندا بەهێزبوو کە لەدوای ئەوەی پەروەردەیەکی چڕ و گەوهەری وەهایان بینی کە نموونەکەی لەمێژوودا نەبینراوە، مسۆگەر کەسانێك دەردەکەون تێر بکەن و بگەنە ئاستی پێویست. بەڵام پێشکەوتنەکان ئەوەیان نیشاندا نەك من، بەڵکو چەمکی چەتەگەرێتی بەهێزە. بەرامبەر بە پێکهاتەی ناوەند و کادیران کە ئەرکی فەرماندارێتی سەربازی و سیاسییان جێبەجێ نەکرد و لەکاتی خۆیدا کەموکوڕیەکانیان بەلاوەنەنا، چەمکی چەتەگەرێتی بێبەزەییانەترین وەڵامی دایەوە و تەنانەت رەنجە مەزنەکانی ئێمەی بەرەو خیانەتێك برد کە بەرامبەرمان بەرەو سەرکەوتن بچێت. لەراستیدا لەو لایەنەوە زیاتر رەخنە و رەخنەدان، نوێبوونەوە و وەرچەرخان دەکەوێتە سەرشانی ناوەندی PKK و کادیرەکانی. من تەنیا ئێشی مەزن لەوەدا دەبینم کە شایستەی رەنجەکانم نەبوون. هەروەها ئەنجامی ئەو پەند و وانانەش نیشاندەدات کە بەدەستم هێناوە، بەڵام دیار ناکەم.

ی ـ دەبێ ئاماژە بەوە بکەم کە جێگام بە پرەنسیپی ستاتیکاو ئەخلاقی لەشێوەی ژیان و خۆشەویستی و رێزگرتن داوە. وابەستەبوونم بە پرەنسیپی"یان ژیانی ئازادانە دەبێتە یان هیچ نابێت" لەسەردەمی لەدایکبوونەوە تامردن تەنانەت هەتا هەتاییە. رێز و خۆشەویستی دەشێ لەرێگای ستاتیکا و گەلی ئازاد بەدیبێت. راستە کە ژنانم لەناوەندی ئەمە داناوە. هیچ گومانم لەوە نەکرد کە ئەو ژنە ئازادانەی لەمیانەی مەیلی ئازادیخوازی لەدایك بووە، لەگەڵ ئەو ژیانەی لەدەورووبەری پێشدەکەوێت، جوانترین و دۆستانە دەبێت. نەکەوتمە نێو کۆمپلێکس. لەجیاتی ئایین و کۆمەڵگای پیاوسالاری، وتایەکی مەزنم بەو ئایین و کۆمەڵگایەدا کە مۆرکی خوداوەندە ژنی پێوەیە و بەلانی کەم یەکسانی ژن بەرچاودەگرێت. لە پێناو بەدیهاتنی ئەمەش کارکەریەکی مەزنی ئەشق و ئازادی ژنم پەیڕەو کرد. بەچاوی موڵکایەتی

تەماشای هیچ ژنێك، مرۆڤێکم نەکرد. بەبێ فەرمبوودان بەڕێوەچوونم بە ناقاری ئەم ڕێگایەم و درێژەدان بە بەهای ستاتیکی و ئەخلاقی، ئادوایی بەڕێوەچوونم، ئەنجامێکی سروشتی کارەکتەری کەسایەتیمە.

لەجیاتی شیکردنەوەی زیاتری بوبەری رەخنە ـ رەخنەدان، لەبابەتە پەیوەندیدارەکاندا نیشاندان و رەنگدانەوەی لەچارەسەری کرداریدا بەبایەخترە. دەبێ بزانرێ کە بەردەوام گرنگیم بەوە داوە. بەتایبەتی لەگەڵ قۆناخی ئیمرالی بەقووڵایی بەخۆمدا چوومەوە؛ بۆ گەیشتن بەوشیاری گەوهەری و سۆزی ئازاد و هاوبەشێتیکردنی ئەمانە و رەنگدانەوەیان درێژەم بەهەوڵ و کۆششەکانم دا. ئەو پێشکەوتنانەی لە ئارادان ئەوە دەسەلێنن کەگرێدراوی گووتەی بەڵێنمان کردارمانە ماوینەتەوە.

## دوا گووتە (١)

ئەو بەرگرینامەیەم کە سەبارەت بەو دۆزە پێشکەش کرد کە بەرامبەر شارستانییەتی ئەوروپایە و ئەمرۆ لەدادگای ماڤ مرۆڤی ئەوروپا تاوتوێ دەکرێ کە دادگای باڵایەتی، بەرگرینامەیەکی زۆر جیاوازە و تایبەتی هەمەرەنگە. بەشێوەیەکی سەرەکی شارستانییەتی ئەوروپا چارەنووسی من دیار دەکات. بۆ نەبینینی ئەمە پێویست دەکات تا دواڕادە گێل و نەفام بیت. هەندێ دەوڵەتی ئەوروپا ئەو رۆڵەی بۆ تورکیایان دیارکردووە بەشێوەی کردەوەی تاژییە کە لە گووتەی"کەروێشك راکە، تاژی بیگرە" دیار دەبێت. ئاشکرایە لەمێژە ئەمانە کوردانیان خستۆتە رەوشی کەروێشکەوە. سەرەکیترین بانگەشەی بەرگرینامەکەم سەبارەت بەوەیە کە ئەوروپا دەرهەق بەکوردان لەنێو دووڕوویی و ناهەقییەکی مەزندایە. ئەم هەڵوێست و نزیکبوونەوەیەم سۆزداری نییە. بۆ ئەوەی بسەلمێنم بەمجۆرە نییە، لەپێناسەکردنێکی زانستیانەی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی تاوەکو شیکردنەوەی مێژوو، پێویستی ئەوەم بینی دەست بۆ کار و خەباتێکی زۆر ئاستەم ببەم. ئەگەر سنووردار بوونی زانیاریەکانم سەبارەت بەمێژوو رێگا لە پێش چەندین هەڵە و کەموکوڕیش بکاتەوە، باوەڕیم بەراستی ئەم شیکردنەوانە هەیە کە ئەنجامم داوە. لەراستیدا بۆ ئەوەی بەگوێرەی واتا مێژووییەکەی رۆڵێکی تایبەت بە بەرگرینامە گوزارشت بکرێت. لەبەرگرینامەدا دەبینرێ کە هەندێ هەڵسەنگاندنی بوێرانە هەیە. لە لێپرسینەوە و حیساب لەیەك خواستن لەگەڵ گۆڕەپانی شارستانییەتی خۆی هیچ چارەیەکی دیکەی نییە. ئەوەی بەرامبەر ئەوروپا رەزیل و ریسوا بووە من نیم، شارستانییەتی رۆژهەڵاتی ناوینە. هەربۆیە هەوڵمدا لەمیانەی شیکردنەوەیەکی بەرفراوان سەبارەت بە راستینەی هەنووکەیی و مێژوویی رۆژهەڵاتی ناوین هەنگاوی قەڵەمباز بهاوێژم کە هەروەکو بڵێی لەگۆڕی خۆیدا خەوتووە و لەدەوروبەری بستەباڵاکاندا دەژی.

بەردەوام باوەڕیم بەوە هەیە: ئەوانەی خۆیان شینەکەنەوە و تێنەگەن، ماڤ ئەوەیان نییە هیچ شتێك لەکەسانی دیکە چاوەڕوان بکەن، هەروەکو لە گووتەی گەلەریدا گووتراوە، بەیارمەتی کەسانی دیکە نابێ ببیت بە زاوا. ئەمە راستیەکە کۆمەڵگاکانی رۆژهەڵاتی ناوین و جیهان جگە لەوانەی بەریشە ئەوروپایین، نەك تەنیا بەیارمەتی کەسانی دیکە، خراپتریش ئەوەیە سەرەتا لە دۆشەگی بووکێنی ئەوروپا تێپەڕدەبن، دواتریش لەسەر دۆشەگەکانیان پاڵدەکەون و بەدوای بەختەوەریدا دەگەڕێن. ئەمە لایەنێکی سیاسی و ئەخلاقی نییە پەسند بکرێت. ئەو وەڵامەی لەلایەنی خۆمەوە داوەمەتەوە ئەم مەترسییە، کاروانی ئازادی بوو. لەرێگای بەسانایی بەلاوەنانی کۆت و بەندەکانی گوند و خێزان، لەمیانەی کونکردن یاخود تێپەڕکردنی دیوارەکانی دەزگاکانی کۆمار و کۆمەڵگای بۆرژوازی تورکیا کە پشتم پێیبەست،

توانیم بەلاوەی بنێم و تێپەڕی بکەم. ئەو دەستەی ڕێککەوتن کە بۆ ڕۆشنبیران و پێشکەوتووخوازان و چەپی تورکیا درێژمکرد، کەس دەستی بۆ درێژ نەکرد و لە هەوا مایەوە. خودی تورکیاش وابەستەبوو؛ وەکو چارەسەری خۆی لە پاشەڕۆیی ناوخۆ دەناڵاند. چەکی بەکاریگەری ڕاستڕەو و چەپڕەو و ناوەندی نەتەوەپەرستی بوو. لەرەوشێکی وەهادا نەبوون دەست لەمە بەربدەن و واتا بەمافی برایەتی بدەن. لەژێرناوی وڵات پارچە دەکەن و دابەشی دەکەن، بەتەواوی گرێدراوی قەیران بوون. جگە لە کاردانەوەکانی هێرشبردن بۆ خۆپاراستن هیچ تواناکاریەکی دیکەی لە ڕۆژەڤدا نەبوو کە بۆ جموجۆڵێکی دیکە هەنگاو بهاوێژێ.

ئەمە ڕاستییەك بوو تەنانەت ئەگەر بەتەنیاش بێ جگە لە سەرهەڵدان بەرامبەر ئەم زوڵم و ستەمکاریە هیچ بژارو ڕێگا چارەیەکی دیکە نەمابوو. لەجیهانێکدا تەنانەت دەنگی ئازەڵەکانیش سنووردار ناکرێت، دەرکەوتنم لەنێو ڕاستینەی گەلێك کە دووچاری فشارێکی وەها هاتووە گەیشتۆتە ئاستی قەدەخەکردنی زمان زۆر بەئێش بوو و تەنیا لەمیانەی هەندێ وەڵامی دژ دەتوانرا شەرەف و ئامووسی مرۆڤایەتی ڕزگاربێت. جگە لەکاردانەوەی بەرخودانێکی بەمجۆرە دەرفەتی ئەوە نەدەبینرا لە هەلومەرجی ئەو ڕۆژانەدا وەڵامێکی خولقکارانە تر بەناوی کوردان بدرێتەوە. گوزارشتی بەرجەستەی ئەم ڕاستینەیە دەرکەوتنی PKK بوو. بەخێرایی خۆی لەو دۆگما ئایدیۆلۆژیانە پێچا کە وەکو پێشکەوتووترین ئایدیۆلۆژی سەردەم مەزندە دەکرا، ئیتر ئەو قۆناخە نوێیەی هەنگاوی بۆ نرا دیاردەیەکی مێژوویی بوو. هەوڵی ئەنجامدانی ئەوە دەدرا کەلە سەردەمی نوێدا بەناوی تەواوی گەلان ئەنجامدەدرا. بەجۆرێکی دیکە هاوچەرخ بوون بەدیدەهات. نزیکترین نموونەی ئەمەش خودی کۆماری تورکیا بوو.

بەئەندازەی ئەوەی ئەو هەنگاوەی نرا هەموو بریتی نییە لەراستی، نەدەتوانرا بگووترێ کە پڕ لە هەڵەی مەزن و نەخۆشی بوو. ئەو گۆڕانکاریانەی ڕێگای لە پێشکردەوە، ئەوە نیشاندەدات کە لە ئەرازووی دادوەری ڕاستیەکان سەنگین تربووە. بەڵام ڕاستی ئەوەیە کە بۆ چارەسەری و سەرکەوتن، بەتەنیا تێر ناکات.

لەبەرئەوەی ناوچەیەکی بەدرێژایی مێژوو بەرادەی هەرە زێدە دۆگماکانی چینی باڵادەست و چەوسێنەری تێدا قاڵبۆتەوە، ئەوا قووتدانی ڕاستیەکانی جیهانی سیاسەت و سەربازی و لەناوبردنی تێپەڕکردووە. هەربۆیە پێویست بوو تایبەتمەندیەکان و پێوانەکانی داهێنانی ئایدیۆلۆژیا و بەپێرەوکردنی سیاسەت و سەربازی بەناوی گەلان و چەوساوەکان بەشێوەیەکی تۆکمە پێشبخرێت. بەتایبەتی لەم پێناوەدا هەوڵ و کۆششی مەزن لە ڕۆژهەڵاتی ناوین نیشاندرا. بەبایەخەوە گرنگی بەوە درا کە لەمیانەی تێکنەشکان و هەمیشەییەوە بەردەوامی بەئیرادەی ئازادی گەلی کورد بدرێت. بەشێوەیەکی بەردەوام و چڕ قەڵەمباز بۆ چیاکان و جیهان و مرۆڤایەتی ئەنجامدرا. هەوڵدەدرا دۆست ــ ئەگەر ناتەواویش بێت ــ دروست بکرێت.

ویژدانی جیهان وشیاربکرێتەوە. هەرچەندە زیان و ئێش و ئازارێکی مەزنی هەبوو، بەلام بەرامبەر خوڵقاندنی وشیاری و ئیرادەی ئازادی کوردان، ئەمە وەکو بەرامبەر و بەهایەك پەسندکرا. لە ئەنجامدا دیاردەی کوردی ئازاد خوڵقێنرابوو کە پێویست بوو رێزی لێبگیرێت و لەگەڵیدا رێکبکەون. ئەگەر بەشێوەزمانی چینی بالادەستیش نەبێت، تەنانەت لەنزمترین ئاستیشدا بێت، ئەوا بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد ئەم دیاردەیە تێر دەکات. ئیتر هەنگاو بۆ قۆناخێکی ئاشتی دڵنەرم و شەرەفمەندانە ترابوو. ئاشتیەکی واتادار و جیهانی برایەتی لەگەڵ گەلانی دراوسێ ئاوا دەکرا. ئیتر دەبووایە بەرێوەبەرایەتیەکانی دەوڵەت لە پێناو ئاشتی هەنگاو بهاوێژن.

کاتێك بەم خاڵە گەیشتین، پیلانگێرییەکەی ٩ی شوبات تەقیەوە. ئەم پیلانگێرییەی لەتورکیا زیاتر لەرێگای ئەمریکا و ئیسرائیل پێشخرا، تەنیا بەمنەوە پەیوەندیدار نەبوو. ئەم پیلانگێرییە لەدژی دەزگایەکی سەرۆکایەتی پێشخرا کە زۆرینەی گەلی کورد پێیەوە گرێدراو بوو کە خۆی لەپێناویدا بەخت بکات. لەبواری کرداریدا وەها نیشاندەدرا کە ئەم پیلانگێرییە لەدژی تاکە"تیرۆریستێکە" بەلام ئامانج تەواوی ولاتپارێزە دڵسۆز و گرێدراوەکان و PKK و دۆستانی بوون. پاکتاوکردنێکی ریشەیی پیلانکرابوو. ئاشکرایە پێویست بوو زۆر بە وریایی و دوور لە سۆزداری و قالب، جموجۆڵ بکەم.

بەشێوەیەکی یەکلاکەرەوە لەم قۆناخەدا بەشێوەیەکی راست یەکێتی برایانە و ئاراستەی بەرژەوەندییە راستەقینەکانی تورکیا پێناسەکرا. هەم لەلایەنی گەل، هەم PKK چەمکی بەرگری رەوا پەسندکرا و پراکتیزە کرا. بەلانی کەم هێندەی قۆناخی شەڕ، ئەم هەنگاوانەش واتاداربوو و بەهایەك بوو لەکاتی خۆیدا هەنگاوی بۆ نرا. هێندەی شەڕ، ببووم بە کەسایەتیەك کە ئاشتیشی پێوە کلیل کرابوو. ئەگەر زۆر سەختیش بوو بێت، بەلام ئاشکرایە کە وەلامی پێویستم دایەوە، شیکردنەوە و پراکتیزەکردنی قۆناخی ئاشتی. ئیتر هەنگاوی دواتر وابەستەی هەڵوێستی کۆماری تورکیا و تەنانەت دەوڵەتەکانی دراوسێ بوو کە نیشانیاندەدا. قۆناخی دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپا کە لەژێر ئەم هەلومەرجە دەستیپێکرد، نەدەبوو بە دۆزێك کە لە میانەی لێتوێژینەوەیەکی سادە پێشبخرێت. بۆ ئەوەی دەرك بە واتای بکرێتە شیکرنەوەی شارستانییەتی ئەوروپا مەرج بوو. ئەوەی دادگای دەکراو دۆزەکەی ببوو بە رۆژەف من نەبووم، بەڵکو راستینەی گەلی کورد بوو کە لەژێر بەرپرسیارێتی ئەوروپا بە ئاستێك گەیشتووە لە مرۆڤایەتی دەربکەوێت. تاوەکو تەواوی ئەم راستینەیە بە هەموو رەهەندە مێژوویی و هەنووکەییەکان نەخرێتە روو و پێناسە نەکرێت، ئەوا لەقەڵەمدانی دادگاییکردنی دۆزەکە بە دادوەرانە، هەڵەیەکی مەزن بوو. تەنانەت رێگای لە ئەنجامێکی مەترسیداری وەها دەکردەوە کە ببێتە ئامرازێکی درێژەپێدەری پیلانگێڕی. هەربۆیە قاڵبوونە سەبارەت بە راستینە و کێشەی کورد زیانی بوو.

ئەو دەستنیشانکردنە مێژوویی و کۆمەڵناسیانەی لەم بارەیەوە ئاماژەم پێکردووە، سەربازی ئەوەی بەردەوام رێگا لەپێش گفتوگۆ بکاتەوە، لەو باوەڕەدام ناوەرۆکێکی وەهای هەیە خزمەت بە زانیاری و وشیاریەکی وەها دەکات کە هزر دەکاتەوە. تەنانەت لەوەش دڵنیام کە بۆ یەکەمین جارە هەندێ بیرۆکە سەبارەت بە بابەتی جیاواز پێشدەخرێت. بەتایبەتیش ئەم دوو سەدە سەختەی دوایی کە لەژێر بەرپرسیارێتی ئەوروپا تێپەڕبوو، واتە تاوەکو شیکردنەوەیەکی راست سەبارەت بە سەدەی نۆزدەهەم و بیستەم نەکرێت، ئاشکرایە کە بە شێوەیەکی راست و دروست دەرك بە رۆژگاری ئەمرۆشمان ناکرێت. تەنانەت ئەگەر لەمیانەی هێڵی گشتیش بێت، راستیەکانی شیکردنەوەی ئەم سەدەیە قورسترە، بێگومان بەشداری و رۆڵی لە پراکتیك و چەمکێکی راستی سیاسی و سەربازی دەبێت. هەروەها لەو باوەڕەدام وەکو ئیرادەی ئازادی گەلی کورد شیکردنەوەی PKK لە میانەی هێڵی گشتی، راستە و پڕ لە پەند و ئەزموونە. بەهەزاران دۆز لە دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپا تاوتوێ دەکرێ کە راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ پەیوەندییان بە PKK وە هەیە. دۆزی منیش یەکێك لەوانەیە. ئاشکرایە بۆ گەیشتن بە ئەنجام و بڕیاری راست بە ئەندازەی راستینەی گەل، هەڵسەنگاندنێکی بابەتیانەی راستینەیPKKش پێویستە. دابڕاندنی دۆزی من لە راستینەی PKK و گەلی کورد پەسند ناکرێ. ئەمە بەواتای ئەوە دێت بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ببیە ئامرازی پیلانگێڕی. بۆئەوەی رێگا لە پێش ئەمە نەگرێتەوە، لە هەڵسەنگاندنەکانی سەبارەت بە PKK ناچار بووم لە بواری جیاوازدا تاقیبکەمەوە.

بەرلەوەی دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپا لێکۆڵینەوە سەبارەت بە من بکات و بڕیار وەربگرێت، پێویست دەکات سەبارەت بە راستینەی PKK و گەلی کورد بەهۆی دیموکراسی و یاسای ئەوروپا لێکۆڵینەوە بکات و بە بڕیار بگات. هەروەها بەمجۆرە بە هەزاران ئەو دۆزە تایبەتانەی کە وەکو ناتەواویەکی جددی دەبینم، لەسەر کۆڵەکە واقیعیەکانی پێوانەکانی یاسای دیموکراتییانە دەچەسپێ. کاتێك شارستانییەتی ئەوروپا هەڵدەسەنگێنین، بۆ شیکردنەوەی رۆژهەڵاتی ناوینی رۆژهەڵاتی ئەمرۆمان، هەم بۆ روونکردنەوەی چەمکی تایبەتم سەبارەت بە سۆسیالیزم بایەخم پێدا، لە کوێی مێژووی شارستانییەتی ئەوروپا دایە؟ چی قەرزاری کۆمەڵگاکانی رۆژهەڵاتی ناوین و مێژووی شارستانییەتە؟ ئەو گۆڕانکاریە گەردوونیانە کامانەن کە رێگایان لە پێش کردۆتەوە؟ هەوڵمدا بەشێوەیەکی گشتی و لە ئاستی پێناسەکردندا وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەمەوە. تاوەکو پێکهاتەی فەلسەفی و ئەخلاقی ئەوروپا دەرکی پێنەکرێت، نەدەشیا وەڵامێکی راست بدرێتەوە داگیرکاری ئیمپریالیزمی کە لەرابردوو وەکو سیستەمێك بەسەر جیهانی دەسەپاند. تەنانەت لەگەڵ هەڵوەشاندنەوەی ئەو شێوازە مارکسیستیەی رێگای لە پێش سۆسیالیزمی بونیادنراو کردەوە، گەلێك هەڵە و کەموکوڕیەکانی دەرکەوتبووە روو. پێویست بوو هەڵوێست بەرامبەر شارستانییەتی ئەوروپا چۆن بێت کە لە رۆژگاری ئەمرۆماندا

بە سەردەمی یاسای دیموکراتییانە ناو دەبرێت؟ هەروەها ئایا هەڵوێستی دۆگماتییانەی مارکسیستی تێری دەکرد؟ شێوە نوێکەی دژە ـ ئیمپریالیزم کە ئەمڕۆ بە شێوەی دژە ـ جیهانیبوونە، دەیتوانی چی بۆ ڕزگاری گەلان بەدی بێنێت؟ هەوڵدرا چەندین گیروگرفت و مەسەلەی لەجۆری ئەمە لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێت. هەرچەندە پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆی لەگەڵ بابەتەکەدا نەبینرێ، بۆ تەواو دەرککردن بە ڕاستی، جگە لە تێگەیشتنێکی ڕاست سەبارەت بە زاراوەکان، هیچ چارەیەکی دیکەمان نەبوو. شارستانییەتی دیموکراتی هاوچەرخ کە ڕۆڵێکی گرنگی لە پێشخستنی ئەورووپا هەبوو، وەکو قۆناخێکی پێشکەوتنی چارەسەر ئامێزانە، بە پۆزەتیڤ هەڵیدەسەنگێنم. بەتەواوی ئەمە لە دەورووبەری سیستەمی سەرمایەداری هەڵناسەنگێنم، وەکو میراسی هاوبەشی مێژووی مرۆڤایەتی بەهایەکی مەزنی پێدەدەم. هەربۆیە باوەڕیم وایە کە شارستانییەتی دیموکراتییانە توانستی گرنگی وەها لە خۆوە دەگرێت وەڵامی تێکۆشانی هەزاران ساڵەی زەحمەتکێشان بداتەوە. هەروەها باوەڕی خۆم دەرهەق بەوە دیار دەکەم کە نابێ گەوهەری چارەسەر ئامێزانەی پێشکەوتنی سێ نەوەکەی مافە سەرەکیەکانی مرۆڤ بچووك ببینرێ، لەسەر بنەمای پشتبەستن بەم مافانە، هەڵوێستێکی بونیادنەرانە سەبارەت بەو کێشانە دیاری دەکرێت کە لە هەر وڵاتێکدا هەیە و لە گونجاوترین زەمینەی ڕێککەوتن و تەبایی بەیەکتر دەگەن. هەروەها نابێ بێخەمی لە کۆمەڵی مەدەنی بکرێ کە پێویستە وەکو گۆڕەپانی سێیەم بیری لێ بکرێتەوە. ئەوە سەلمێنراوە کە کۆمەڵگای دەوڵەتی فەرمی و کۆمەڵگای کلاسیکی دەرەبەگایەتی یاخود کۆمەڵگای بۆرژوازی، ئەم دوو مۆدیلەی کۆمەڵگا نەك شێوەی چارەسەرکردنی کێشەکانن، بەڵکو سەرچاوەی خوڵقاندنی کێشە و گیروگرفتن. هەربۆیە بەمەرجی هێشتنەوەی ماف بەرگری ڕەوا، دەزگاکانی کۆمەڵی مەدەنی ئامرازی ژیانین لە چارەسەرکردنی کێشەکانی لە ئارادان. لە قەڵەمدان و تاوانبارکردنی ئەم ئامرازانە بە **"ئامرازە نوێکانی ئیمپریالیزم"** لەلایەن چەپە کلاسیکیەکان هەڵوێستێکی دوور لە بەرپرسیارێتی و بەپێچەوانەوە کەوتنە نێو لەیستۆکی ئیمپریالیزمە.

لەگەڵ ئەمەشدا لە چوارچێوەیەکی بەرفراوانتر تەماشای زاراوەی بەرگری ڕەوام کرد. دوای ئەوەی ڕەوشی سەپێنراوی" **نەشەڕ، نە ئاشتی** "م وەکو ڕەوشێکی پووکانەوە و ڕزین دیار کرد، ئەوا ئەگەر حکومەت و دەوڵەت و هێزە بەرپرسیارەکان هەنگاوە پێویستەکان نەهاوێژن، ئەوا ئەو ئەرکەی دەکەوێتە ئەستۆی گەلی کورد، هەنگاونانە بۆ سیستەمێکی بەرفراوان و باش ئامادەکراوی بەرگری ڕەوا کە چەندایەتی و چۆنایەتیەکی وەهای هەبێت بتوانێ وەڵامی هەموو جۆرە هێرشێك بداتەوە و خۆی بپارێزێ. لە پێناو ژیانێکی شەرەفمەندانە ئەمە وەکو تاکە بژارێك ڕووبەڕووی گەلی کورد دەبێتەوە. بۆئەوەی جارێکی دیکە ڕێگا بە تراژیدیا هاوچەرخەکان نەدرێت، ئەوا دەرکپێکردن و جێبەجێکردنی تەواوی پێویستیەکانی بەرپرسیارێتی سەرجەم لایەنەکانم وەکو بابەتێکی ژیانی هەڵسەنگاند. جەختم لەسەر ئەوە

کردەوە کە ئەو وەڵامەی پێویستە لە چوارچێوەی رۆژهەڵاتی ناوین بدرێتەوە شارستانییەتی رۆژهەڵاتی ناوین بە پێشخستنی سیستەمی دیموکراتییانە تێپەڕدەبێت. رێنسانس و دیموکراتیزەبوونی رۆژهەڵاتی ناوینی نوێ لەسەر بنەمای شارستانییەت، تاکە رێگای چارەسەری تەواوی ئەو کێشە و گیروگرفتانەیە کە رەهەندی قووڵ و هەمەلایەنیان هەیە. ئیتر هەروەکو لە نەتەوەپەرستی ئەزۆکی سەدەی دوایی و بەرهەمە دواییەکەی دەبینرێ کە تراژیدیای ئیسرائیل ـ فەلەستینە، ئیتر دەستبەردان لەم نەخۆشیە و گەڕانەوە بۆ بەها دیموکراتیەکانی و بایەخدان بەمەی کردۆتە ناچاریەك. ئیتر مەسەلەکان لەچوارچێوەی سیاسی دەرکەوتوون، ئیتر بووە بە قەیرانێکی ئەخلاقی. ئەو بژاره دیموکراتییانەی رۆژهەڵاتی ناوین لە میانەی پشتبەستن بە هەبوونی کولتووری و مێژوویی خۆی پێشی دەخات، دژە بیرۆکەی گرنگ بەرامبەر بیرۆکەی ئەورووپا دەسەپێنێ کە یەکلایەنە شارستانییەتی ئەورووپا لە جیهانی بڵاودەکاتەوە، بەمجۆرەش ئومێد و باوەڕیم بەوە هەیە رۆڵ و بەشداری لە سەنتێز و یۆتۆپیایەکی واتاداری مرۆڤایەتی دەبێت.

ئەوە تێڕوانینێکی گشتی پەسندکراوە کە شارستانییەتی ئەورووپا لە دوا قۆناخدا دەژی. خواستوویەتی رووخانی شارستانییەت لەرێگای فاشیزم بووەستێنێ، کاتێك لەمەدا سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا، جگە لە هەنگاونان بۆ شارستانییەتی دیموکراتییانە هیچ شانسێکی دیکەی نەبووە، کە بۆ وەرچەرخانی ئاشتیخوازانە کراوەیە؛ هەرچەندە ئەوەی هەڵدەوەشاوە سۆسیالیزمی بونیادنراو بێت، بەڵام ئەمەش راستییە کە سەرمایەداری ئەورووپاش رووبەڕووی وەرچەرخانی ئەوتۆ بۆوە کە لە چوارچێوەی سەرمایەداری دەربکەوێت. ئەشقی ترمیستانا و ئیمسۆلدا کۆتایی پێهاتووە. بوێری پارزیڤالیش و بەرێوەچوونی لەنێو ئەو دارستانانەی کەسی تێنەکەوتووە بەهۆی ماندووبوون و بە ساڵاچوون رووبەڕووی هەمان چارەنووسە. کاتێك گومان لەوەدا نییە کە ئەو ئەشقەی لەسەر رێبازی خوداوەند عەشتارە ئەشقی دواییە، ئاشکرایە پێویست دەکات زەمین بۆ ئەشقی نوێ چۆڵ بکات. ئەمەش راستیەکی حاشا هەڵنەگرە کە کاروانی پارزیڤالی دوا نوێنەری گلگامێشی قارەمانە. بەڵام ئەوەش مسۆگەرە کە لە وڵاتی گلگامێشدا پێویستی بەو کەسانە هەیە کە شایستەی کاروانی ئەم وڵاتە بن.

کێشەی کورد بووە بە کلیلی تورکیا سەبارەت بە ئەزموونی شارستانییەتی هاوچەرخ، یان دەیکاتەوە و تێپەڕی شارستانییەتی هاوچەرخ دەبێت یان دەست لەم لەخۆباییبوونە بەردەدات. هێندە بە سانایی ناتوانن دووركەوتنەوە لە رێنومایییە هاوچەرخەکانی ئەتاتورکی دامەزرێنەری کۆمار بگرنە بەرچاو.هەرچەندە قورسیش بێت، بەڵام شیمانەی هەرە بەهێز ئەوەیە کێشەی کورد لە چوارچێوەی پەیوەندی تورکیا ـ یەکێتی ئەورووپا بەرەو چارەسەری بچێت. پێویستە بەبێ ئەوەی جیتر ئەورووپا تەنگەتاو بکرێت، چارەسەریەکی ناوخۆیی تورکیا دوا نەخرێت، هەم بۆکۆتاییهێنان بەو هەلومەرجانەی رێگایان لە پێش قەیران کردۆتەوە، هەم

سەبارەت بە کەوتنە نێو قۆناخی هەڵگشانی دیموکراتییانە لە مێژووی تورکیا، دەبێ وەکو شانسێك هەڵیسەنگێنێ و بەکاری بێنێ. لەلایەنی بەهێزترین و گەشەسەندووترین دەوڵەت و وڵات سەلێنراوە کە بەهێزی یەکێتی وڵات و دەوڵەت بەم رێگایەدا تێپەردەبێت.

کۆنسەی ئەوروپا وەکو هێزی جێبەجێکردنی بریارەکانی دادگای ماف مرۆڤی ئەوروپا، وەکو پێداویستی پەیمانی ماف مرۆڤی ئەوروپا کە بەڵگەی سەرەکی مافیەروەرییە، پێویست دەکات بەهۆی دۆزەکەی من لەرێگای بەرپرسیارێتی و هەڵوێست و نزیکبوونەوەیەکی گەوهەری و ئەنجامگیر پشتگیری لەو پێشکەوتنانەی تورکیا بکات کە بەئاراستەی یاسا و مافپەروەری دیموکراتییانەیە. بەبێ ئەوەی چیتر هێز لە دەست بدەن و خۆیان بخەنە رەوشێکی سەختەوە، لە گرنگترین ناوچەی مێژوو هەنگاونان بەرەو چارەسەری کێشەیەك کە بووە بەکانگرێن، تەنیا سوودی بۆلایەنەکان دەبێت. هەروەکو چۆن هیچ زیانێك بەکەس ناگەیەنێ و هیچیان پێ ون ناکات، سەرلەنوێ دەرفەتی گەرانەوە و بەدەستهێنانەوەی ئەو مرۆڤایەتییەیان بۆ دەدات کە ونیان کردووە و سەردەمانێکی درێژە لە بیریان چۆتەوە. ئایا دەبێ سەرکەوتنێکی لەمە گرنگتر و بەهادارتر هەبێت؟

هەرە دوایی لە بەرگرینامەدا چیرۆك و ناسنامەی کەسێتی خۆم شیکردەوە و هەوڵمدا روونی بکەمەوە. ئەمەش لەلایەنێکەوە ئامانجی پێویستی وەڵامدانەوەی ئەو رەخنە ئەرێنی و ئەرێنیانەیە کە لەلایەن گەلێك کەسەوە ئاراستە کراوە. گەلێك نووسین و پەرتووك دەرهەق بەمن نووسراون. ئێستاش رۆژەڤی گفتوگۆی چڕ و بەرفراوانم. ماف وەڵامدانەوە کە تەنانەت کاتێك لە دەرەوەش بووم بە ئاستەم پێیدەگەیشتم، دەرفەت نەبوو لەناوەوە بەکاری بێنم. لەم میانەدا بۆ وەڵامێکی گشتگیر پێشکەشکردنی چەندین سەرەداو کە ببێتە زەمینەی وەڵامدانەوە، گەلێك سوودی لێ دەکەوێتەوە. خولقکارانە جوڵامەوە. لەراستیدا لەم ئاوێنەیەدا هەرکەس جێگای خۆی دەبینێ کەلە کوێیە. ئامانجێکیشم ئەوە بوو کە بەئاوێنەیەکی گشتی مەزن ئەوە نیشانی ئەو کەسانە بدەم کە بە هەڵە تەماشا دەکات" تۆ لە فلان شوێنی ئاوێنەکەیت".

هەروەها بەتەواوی هێزم و لە ناخمەوە خواستم ئەوە نیشانی ئەو کەسانە بدەم کە دەخوازن دۆستایەتی و هەڤاڵێتی بکەن رووبەرووی چۆن پێکهاتەیەك بوونەتەوە و ئەمەم بە ئەرکێکی دەست لێبەرنەدراو بینی. هەروەها خواستم بەشێوەیەکی ئاشکراو مەردانە نیشانی ئەوانە بدەم کە بە شێوەیەکی بێواتا سوورن لەسەر دوژمنایەتی من، کە من چیم، چیم کردووە، دەتوانم چی بکەم و رێگا لە پێش چی بکەمەوە. مەزندە دەکەم هەموو کەسێك ئینجا ئەمە دەزگا بێت یاخود کەسایەتی، بە دروستی هەڵوەستە سەبارەت بە راستینەی من دەکەن و بە ئەنجامی سوودمەندانە دەگەن.

بێگومان بەرگرینامەکەم هەوڵدەدات گەلێك بابەت لە میانەی شێوازی جیاوازەوە تاوتوێ بکات و نیشانی بدات. لەوێدا تا دوارادە بە روونی و ئاشکرایی و بەرپرسیارێتی ئەوە

دەخاتەڕوو کە مرۆڤایەتی و گەل و ڕێکخستنێك چی بووە و خواستوویەتی چی بێت. واتا بە گەلێك لایەن و پەیوەستیدارەکان دەدات و ڕۆڵیان پێ دەبەخشێ. نەمدەتوانی خۆم لەم هەڵوێستە بەلاوە بدەم. خواستم دوا گووتەی بەهەزاران شەهیدی مێژوو و ئەو کەسانە بڵێم کە نەیانتوانی بڵێن بۆچی دوا هەناسەیان دا. خواستم ڕاستینە و هاوارەکانی گەلێك نیشانبدەم کە بێ زمان کراوە و مەحکومی بێچارەیی و ڕەوشێکی وەها کراوە کە دیار نییە لەکوێ و چۆن لەنێوبردراوە، کۆنترین گەلی مێژووە بەلام دووچاری گەلێك خیانەت هاتووە. هەوڵمدا بە ڕۆحێکی بەرپرسیارێتی بڵند ئەوە پێناسە بکەم و بپارێزم کە وەکو ڕێکخراوێکی بەهەزاران شەهیدی قارەمانی هەیە، لە نێوخۆ و دەرەوە دووچاری گەلێك خیانەتی مەزن هاتووە. بەراستی PKK چییە و چی بووە و پێویست بوو چۆن بێ.

بەتەواوی دەرك بەو پیلانگێڕییە دەکەم کە دووچاری هاتووم. ئەم بەرگرینامەیەم یەکەمین وەلامی بەکاریگەرمە بەرامبەر ئەوانەی دەخوازن نەك تەنیا بەرامبەر من بەڵکو لە ڕێگای پیلانگێڕیەوە خۆیان بەسەر تەواوی مرۆڤایەتی زاڵ بکەن و هەوڵدەدەن ڕۆژی خۆیان بەسەر بەرن. تۆڵەسەندنەوە شایستەی خۆم نابینم. تەنانەت ئەگەر لە هەزاران یەك گەوهەرێکیش لەلایەنی بەرامبەردا هەبێت ئەوا قازانجکردنی دوژمن و کردنی بەدۆست پارچەیەکی جیانەبۆوەی کەسایەتییە مرۆڤپەروەرانەکەمە. بەلام ئەگەر دەرفەت ببینم و بە پێویستی بزانم، ئەوە دەمخواست ئەوەش نیشان بدەم کە چۆن تۆڵە لە پیلانگێڕان دەسەنرێتەوە و ئەو چالاکییە قارەمانانە و جەنگاوەریە چۆنە کە دەیانهێنێتەوە هۆش خۆیان و جارێکی دیکە هەڵوێستی نەفرەتکارانەی بەمجۆرە بەرامبەر مرۆڤایەتی نیشان نادەن.

**مرۆڤایەتی و ئازادی سەردەکەوێت،**

**تەواوی پیلانگێڕ و زۆردار و تەڵەکەبازەکان ژێر دەکەون.**

## دوا گووتە (٢)

ناچار بووم بە پشتبەستن بە شیکردنەوەی شارستانییەت بەرگرینامەکەم پێش بخەم، گەوهەری شیکردنەوەی ئەو وەرچەرخانانە دەکات کە کۆمەڵگاکان لەسەر بنەمای شێوەی باڵا بەخۆیانەوە دەبینن. دیارکردنی ئەو گەوهەرە دیالەکتیکیەی پێشکەوتنەکان پشتی پێدەبەستێ، پێناسەی دیاردەی کۆمەڵگای ئاماژەپێکراو جێگای باسە، گرینگراوی ئەو تێڕوانینە دەمێنێ کە جیابوونەوەی چینایەتی و بەدەوڵەتبوون لە بناخەی مێژووی شارستانییەت شاراوەیە، خودی مێژووش تاوەکو ڕۆژگاری ئەمڕۆمان بەشێوەی ئەڵقەکانی زنجیرەیەك وەکو یەکێتیەکی ئۆرگانی بەخۆیەوە دەبینێ، چەمکێکی دینامیکی و ئۆرگانی سەبارەت بە مێژوو، وەکو گوزارشتی قۆناخی دیالەکتیکی هەڵدەسەنگێنرێ کە لەسەر بنەمای جیابوونەوەی چینایەتییە. وەکو ئەنجامێکی سروشتی ئەم چەمکە، بە شێوەیەکی تیۆری پێشبینی ئەوە دەکرێت کە ئەو گەوهەر و مەودایەی لە نێوان ڕاستینەکانی دوێنێ و ڕاستینەکانی لە داهاتوو پێکدێت هێندە دووری یەکتر نین.

لە ڕێبازی مێژوویی‌دا دوو تایبەتمەندێتی بەبایەخ و ڕۆڵی کلیلی هەیە. یەکەمیان، جیابوونەوەی چینایەتی و سیستەمی سیاسی کە لەسەربنەمای زێدە بەرهەمە، بەشێوەیەکی سەرەکی بۆ کولتووری پەرستگای ڕاهیبەکانی سۆمەر دەگەڕێتەوە. لەلایەنێکەوە شارستانییەت قەبوون و بڵاوبوونەوەی ئەم شارستانییەتەیە. پەیوەندیەکی توندوتۆڵ لەنێوان زێدە بەرهەم و میتۆلۆژیاکان هەیە کە پەرستگا پشتی پێدەبەستێ. بە واتایەکی دیکە بەرهەمی میتۆلۆژیای ڕاهیبەکان و بەروبوومەکانی زێدە بەرهەم، سەرەکیترین پێشکەوتنن کە مۆری خۆیان لەمێژوو داوە. تەواوی مێژوو نووسەکان هاوبیرن لەسەرئەوەی ڕاهیبە سۆمەریەکان یەکەمین نموونەی ڕەسەنیان داهێناوە. هەربۆیە شیکردنەوەی کولتووری پەرستگای سۆمەریەکان، لە شیکردنەوەی مارکس سەبارەت بە سەرمایە لە پێشترە. بە تەنیا و دابڕاوی شیکردنەوەی سەرمایە کەموکوڕی مەزن و هەڵەی شێواز لە خۆوە دەگرێت. زێدە بەها شێوەیەکی مێژوویی زێدە بەرهەمە و زۆر دواتر دەرکەوتووە. جیاوازی چینایەتی بۆرژوا ـــ پرۆلیتار کەلە دەوروبەری زێدە بەرهەم پێشدەکەوێت لەنێو یەکبوونی مێژوویی خاوەن شوێنگەیەکی سنووردارە. بەتەنیا ناتوانێ و دوورە لەوەی هزر و دەوڵەت و ئەخلاق و هونەر پێناسە بکات. تەنانەت لەنێو لۆژیکی سیستەمی باڵادەست و چەوسێنەر تێکۆشانی چینایەتیش تاوتوێ دەکات، لە ئەنجامیشدا هەروەکو لە نموونەی سۆسیالیزمی بونیادنراودا بینرا، جگە لە کردنەوەی ڕێگا لە پێش سیستەمی زێدە بەها بەولاوە تێپەڕی نەکردووە. چەندەی دەکرێ ناتوانرێ ئەو ڕێگایە بدۆزرێتەوە کە بەرەو ئەو سیستەمە کومەڵایەتییە خەیاڵ بۆکراوە

دەچێت کە بە یۆتۆپیای کۆمۆنیستی ناودەبرێت. بێگومان کاریگەری ئەو ڕێگایەی لەمەدا گیراوەتەبەر یاخود ئەو ڕێچکەیەی پێیەوە پابەندن یەکلاکەرەوەیە. خودی ئامانج لەگەڵ مەزنایەتی هەوڵ و کۆششەکان و قارەمانێتییەکە تێرناکات. شیکردنەوەو تێپەڕکردنی کولتووری پەرستگای سۆمەرییەکان دەشێ ڕۆڵ لە ڕزگاربوون لەم بنبەستبوونەدا ببینێ. بەلانی کەم شرۆڤەکردنێکی ڕاست سەبارەت بە سەرجەم پێشکەوتنەکانی شارستانییەت، لە پێناسەکردنی وەرچەرخانێکی کۆمەڵایەتی گشتگیردا دەرفەتێکی زیاتر دەرەخسێنێ.

دەشێ شیکردنەوەکانم سەبارەت بە شارستانییەت کە لەنێو هەلومەرجێکی دوور لەتەندروستی و بێ ئامادەکاری پێشمخست وەکو هەنگاوێکی لەجۆری تاقیکردنەوە بمێنێ. دەتوانرێ ئەمە وەکو چوارچێوەیەکیش هەڵسەنگێنرێ. بەڵام باوەڕیم وایە کە گەیشتن بە ڕاستینەی زاراوەی پێشخراو و ئەو ڕێچکەیەی پێیەوە گرێدراون بەهاکەی زانستییە، هەر بۆیە باڵابوونی پایەدار لەخۆوە دەگرێت. کاتێك لەم چوارچێوەیەدا تەماشای مێژوو بکرێت، دەبینرێ کە هەر شتێکی ڕوویداوە لەمیانەی بەدەزگابوونی زێدە بەرهەم و بەرهەمی میتۆلۆژی لەدەوروبەری پەرستگا، بەپێی بەسەرچوونی کات بەفووڵایی و فراوانی بڵاوبۆتەوە. بۆنموونە کاتێك ئیستیسماری سێکسی هەڵدەسەنگێنین کە وەکو بنیابەخ دەبینرێ و گۆڕەپانێکە دەتوانرێ کەمترین پەیوەندی تێدا پێشبخرێ، ئەو کاتە باشتر دەرك بەڕاستی ئەم هەڵوێستە مێژووییە دەکرێت. دەزگای هۆلیوود و پلەیبۆی ئەمریکا، جگە لەشێوەیەکی گەندەڵبووی خۆجێیی دەزگای ڕاهیبی ژن و پیاوانی سۆمەر کە بەشێکی ژێرەوەی کولتووری پەرستگای سۆمەرە، هیچ واتایەکی دیکەی نییە. کارگە، کۆشك و سەراکان، دەزگاکانی دەوڵەت، مافپەروەری، باوەڕییەکان، مزگەوت، کلێسە، حەوراکان، تەواوی لقەکانی هونەر و پیشەکاری لەمنداڵدانی کولتووری پەرستگادا شاراوەیە. کاتێك کات و هەلومەرجەکانی ئامادە و لەباربێت هەموویان لەوە دوور نامێنن کە سەرلەنوێ لەدایك بن و جێگای خۆیان بۆ هی پێشکەوتووتر بەجێبێڵن. ئەوکاتە زۆر بەسانایی دەبینرێ کە مێژوو لەرۆژگاری ئەمڕۆمان، ئەمڕۆش لەمێژوودا شاراوەیە. پێویستە ئەمە وەکو ڕاستینەیەك پەسند بکرێ کە خۆ بینینمان لەدەرەوەی یاخود لەسەرووی مێژوو ڕاست نییە، مێژوو تەنیا لەنێو مۆزەخانە و وێرانەکان دا نەماوەتەوە، بەڵکو لەرۆژگاری ئەمڕۆشماندا بەردەوامە.

لێرەدا ڕاستینەیەکی مێژوویی ڕووبەڕوومان دەبێتەوە، ئەویش ئەوەیە هەر قۆناخێکی مێژوویی واتادار، بەردەوام تایبەتمەندییەکی وەها بەبناخە دەگرێت کە دەزگا و هزر و باوەڕی خۆی بە نموونەی ڕەسەن نیشانبدات. لێکدابڕانی نێوان مێژوو و ڕۆژانە، لەهێزی پڕوپاگەندەکردنی باڵادەستی فەرمی ئەم تایبەتمەندێتییە سەرچاوە دەگرێت. ئەمانە بۆ ئەوەی زاڵ و باڵادەست بن ناچار دەبن بانگەشەی نوژەنی خۆیان و نموونەی یەکەم بکەن. بەڵام لێرەدا پێویست دەکات دوولایەن لەیەکتر جیابکرێنەوە: جیاکردنەوەی ڕاستینەی ئەو

نوێبوونەوەیەی بەراستی لەرێگای وەرچەرخانەوە بەدیهاتووە لەگەڵ ئەوەی تەنیا پشت بەهێزی پروپاگەندە دەبەستێ و هەڵخەڵەتاندن و تەڵەکەبازی لەخۆوە دەگرێت و راستینەیەکی ماکیاژکراوی گەندەڵ و دیماگۆژیەتە، بایەخێکی مەزنی هەیە. کاتێك دەرفەت بەخەڵەتاندن و چەواشەکاری ئەو دیاردانە نەدەین کە دیماگۆژیەت و پروپاگەندە لەمێژووی شارستانییەت ئەنجامی دەدات، ئەو راستینە بێگەرد و راستەی مێژووە کە رەوشی هەنووکەش یەکلایی دەکاتەوە. باوەڕیم وایە لەشیکردنەوەکەمدا لەسەر ئەم هێڵە بەشێوەیەکی راست شارستانییەتم روونکردەوە و خستمە روو. هەربۆیە ئەو پیلانگێڕیە نێودەوڵەتیە بەرفراوانەی کۆتایی سەدەی بیستەم راستینەی خۆی لەم شارستانییەتەدا دەدۆزێتەوە.

خودی شارستانییەتیش پشتی خۆی بەو خەڵەتاندن و فشار و گوشارە جەستەییەی باوەڕی و هزری ئەفسانەیی دەبەستێ کە دوایی بەسیستەم کراو لەلایەن راهیبەکانی سۆمەر بەرامبەر بەمرۆڤایەتی و کۆمەڵگای نیۆلیتیك پێشخرا کە هێشتا ئاشنای جیابوونەوەی چینایەتی و بەدەوڵەتبوون نەببوو. دیسان لەنێو تەواوی ئەو پەرەسەندنانەی شارستانییەت مافپەروەری وەکو نزیکترین دەزگای دادوەری دەبینرێ. لێرەدا ئەو مافپەروەرییەی باسی دەکەین، ئەوەیە کە لەدەوروبەری زێدە بەرهەمدا شێوە دەگرێت. دواترین شێوەی کە مافپەروەری شارستانییەتی ئەورووپا بەخۆیەوە گرتووە، پشت بەو پێشکەوتنە بایەخدارانە دەبەستێت کەمافپەروەری لەگۆڕەپانی دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤ بەدیهێناوە. ئەگەر سنووردارێش بێت، لەسیستەمی مافپەروەری ئەورووپادا کە لەسەربنەمای دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤە، دەرفەتی ئەوە هەیە تاك و گەلان داوای هەندێ مافی خۆیان بکەن.

لەرێبازی مێژوویی‌مدا دووەمین لایەنی گرنگ، سەبارەت بەو توێژانەی کۆمەڵگایە کە بەرهەمی زێدەیان لەسەر بەدەست دەهێنن. بەدرێژایی مێژوو چینە سەردەستەکانی کۆمەڵگای چینایەتی، دژ بەو توێژانە لەنێو تەواوی دەزگاکانی ژێرخان و سەرخانی کۆمەڵگادا باڵادەستبوون. ئەگەر ئەوانە بەشێوەی کۆمەڵەی ئەتنیکی هەوڵی خۆ پاراستنیشیان دابێت، ئەوا لەسەر بنەمای ئەو جیابوونەوە چینایەتیەی لەهەناویاندا پێشکەوتووە بەبەردەوامی سەنگەریان لەدەستداوە. رەوشی فشاری بەردەوام و پاشڤەڕۆیی رۆژانەیی کە لەنێو هەلومەرجی ماددی و هزریاندا هەیە، رێگای لەپێش ئەوە کردۆتەوە بەدرێژایی مێژوو گەلان لەنێو رەوشی کۆمەڵگای نیۆلیتیك بەهەڵواسراوەیی بمێنێ. شارستانییەت وەکو کۆمەڵگای شار بەردەوام لە بەرامبەر کۆمەڵگای لادێ بەهێز بووە، بەرامبەر راستینەی لادێیی گەلان بەشێوەیەکی زیاتر کۆمەڵگای چینایەتی لەنێو هەلومەرجی شاردا پێشکەوتنێکی بەدەستهێناوە. لەراستینەی بەکۆمەڵگابوونی گەلاندا، جگە لەکەمینەیەکی بچووك، جیابوونەوەی چینایەتی هێندە دەرفەتی پەرەسەندنی بەخۆیەوە نەبینیوە. بەرخودان بەرامبەر چەوساندنەوە و فشار رۆڵێکی یەکلاکەرەوەی لەمەدا هەیە. هیچ کاتێك مرۆڤایەتی

لەخۆیەوە رەوشی کۆیلایەتی بێ سنووری پەسند نەکردووە. بەردەوام لەمیانەی سەرهەڵدان و لێکەرینەکانی ئازادی بەرەنگاری ئەو سیستەمانەی کۆمەڵگای چینایەتی بۆتەوە کە لەئەنجامی فشار و هەوڵێکی ئایدیۆلۆژی گەورە بەسەریدا سەپێنراوە، هەرکاتێك دەرفەتی بینیبێ دوو دڵی لەوە نەکردووە کە هێزی ئازادی و دەزگاکانی پێش بخات.

سۆسیالیزمی زانستی کە پشت بەشیکردنەوەی شارستانییەتی سەرمایەداری دەبەستێ، بۆ یەکەمین جار رۆڵی رێزانی و چوارچێوەی ئایدیۆلۆژی تێکۆشانی توێژە چەوساوە و ستەملێکراوەکانی کۆمەڵگای بینی.بەڵام بەتەواوی تێپەرنەکردنی کاریگەرییەکانی کۆمەڵگای چینایەتی لەهەناویدا شێوەی گرتووە، هۆکاری سەرەکی سەرنەکەوتنی سۆسیالیزمی بونیادنراوە. کاتێك بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکانی کە بەدوای یەکسانی و ئازادیدا دەگەرێن خاڵی دەرکەوتنیان بەهەلومەرجی سەرەتایی ئازادی و یەکسانی کۆمەڵگای نیۆلیتیك گرێبدەن، دەشێ ئەم راستینەیە بەشێوەیەکی پۆزەتیڤانە تێپەربکرێت. راستینەی ئەو گەلانەی کە بەهەڵواسراوی لەنێو هەلومەرجی کۆمەڵگای نیۆلیتیك ماونەتەوە، لەتەواوی قۆناخەکانی شارستانییەتدا ناچاری دووبارە بوونەوەی هەمان چارەنووسکراون، لەسەرووی هەموویانەوە رەگەزی ژنی چەوساوە لەژێر هەموویانەوەیە، فشارە چینایەتی و ئەتنیکی و کولتووری و نەتەوەییەکان بەناویەکدا پەیرەو دەکرێن، تاوەکو رۆژگاری ئەمرۆمان مێژوویەکی تایبەتیان بەخۆیانەوە بینیوە. هەندێکیان کەم، هەندێکی دیکە زۆر، هەندێکیان کورتخایەن و هەندێکیش بەردەوام لەژێر ئەو زنجیرەیەی فشار و چەوسانەوە هەبوونی کولتووری خۆیان پاراستووە و بەرخودانیان پێشخستووە، ئەو بەشەی مێژوویان پێکهێناوە کە فەرمی نییە. ئەگەر بەشێوەیەکی بێکاریگەر و لە بەرچاو سووککراویش بێت، ئەم مێژووە بەشێوەی تەواوی هاوکێشەی هێزی و فەلسەفی و ئایینی و ئەفسانەییش بێت هەبوونی خۆی پاراستووە. لەقۆناخی خۆیاندا بەرامبەر هێزە فەرمی و باڵادەستەکان بەشێوەی رەوت و مەزهەبی نیوشاراوەی جیاواز تێکۆشانیان کردووە، وەکو تیشکی لێکەرینەکانی ئازادی و هێزی ئیرادەکەیان خزمەتی کردووە.

بێگومان هەڵوێستی بەمجۆرەم سەبارەت بەمێژووی شارستانییەت بەهۆی پەیوەندییەکەی بەدیاردە و کێشەی کورد کە بەناویەوە دادگایی دەکرێم، ئەوە دیار دەکات تاوەکو بەشێوەیەکی راست جێگای کوردان لەنێو شارستانییەتی دیموکراتی دیار نەکرێت، ناشێ بەشێوەیەکی راست دەرك بەکێشەکانی بکرێت. ئەگەر لەمیانەی هێڵی گشتیش بێت توانراوە مێژووی کوردان شیبکرێتەوە و بخرێتەروو. کوردان لەسەرووی ئەو گەلانەوە دێن کە نیۆلیتیکیان خوڵقاندووە. بێگومان ئەگەر وەك پۆلێنکردنی گەل دواتر دەرکەوتبێت، کۆمەڵە ئەتنیکیە رەسەنەکانی وەکو ریشەیەك بەبنەما داناوە. لەم لایەنەوە رۆڵی لەپێشخستنی کۆمەڵگای ئاژەڵداری و کشتوکاڵی شۆرشی نیۆلیتیك مسۆگەرە. تەواوی راستینەکانی ئاسەوارناسی، نەژادناسی و جوگرافی ئەم

رۆڵە دەسەلمێنن. گەورەترین بەشداری و رۆڵی لەمێژووی مرۆڤایەتیدا، لەرۆژی لەدایکبوونییەوە تارۆژگاری ئەمڕۆمان نزیکەی بەدرێژایی ١٥ هەزار ساڵ، وەکو کۆمەڵگایەکی ئاژەڵداری و کشتوکاڵ بەردەوام خزمەتی کردووە. لەهەمانکاتدا ئەم تایبەتمەندێتییەی کاریگەری لەوە هەبووە کە بەدرێژایی مێژووی شارستانییەت لەنێو رەوش و هەلومەرجی نیۆلیتیک بەهەڵواسراوی بمێنێتەوە.

مێژوو ئەمە نیشاندەدات: ئەو کولتوور و گەلانەی بەشێوەیەکی هەرە قووڵ و درێژخایەن لەنێو شێوەیەکی کۆمەڵگا ژیابێت، بەشێوەیەکی ناوەندی ناتوانن ببنە لانکەی ئەو شێوە کۆمەڵگایانەی کە لەدوای خۆیانەوە هاتووە، کاریگەری چڕ و بەهێزی ئەو کۆمەڵگا کۆنەی لەناوی ژیاون دەرفەت بەکۆمەڵگای نوێ نادات. وەکو دژە ـ تێزی کۆمەڵگای کۆن، کۆمەڵگای نوێ لەو گۆڕەپان و هەلومەرجانە پەرە دەسەنێ کە ئەو کاریگەریانەی تێدا لاوازە. بێبەختی کوردان لەوە سەرچاوە دەگرێت کە بەشێوەیەکی هەرە قووڵ و درێژخایەن لەنێو قۆناخی نیۆلیتیک دا ژیاون. جیهانی سەرەکی کوردان بەهەزاران ساڵ لەدەوروبەری کشتوکاڵ و ئاژەڵە ماڵیەکان شێوەی گرتووە. ئەم راستینەیە لەهەمانکاتدا بەواتای ئەوەدێت کە لەکۆمەڵگای شار نامۆ بێت و بەردەوام مەحکومی ژیانێکی لەشێوەی خێڵەکی بێت. کوردان کە بوونە لانکەی لەدایکبوونی کۆمەڵگای شاری سۆمەریەکان، هەر لەرۆژی لەدایکبوونەوە بەردەوام لەنێو پێوەندی و ململانێدا بوون. کاتێك ئەو هێزە زیادبووەی کۆمەڵگای شار لەماوەیەکی کورتدا رێگای لەپێش بالأبوونی سەربازی کردەوە، لەو رۆژەوە تارۆژگاری ئەمڕۆمان نزیکەی پێنج هەزار ساڵە بەگووتەی سۆمەریەکان وەکو هۆریەکان ی ( خەڵکی بەرزاییەکان) کورتیەکان (گەلی وڵاتی بەرزاییەکان) جگە لەوەی لەمیانەی پاشەکشێکردن بۆ شاخەکان هەبوونی خۆیان پاراستووە، بەسانایی دەرفەتی پێشکەوتنی دیکەیان نەبینیوە. بەرامبەر بەو فشار و شاڵاوانەی لەچوارلاوە هاتوون، تەنیا توانیویانە بەشێوەی یەکینەی خێڵەکی بچووك بۆ سەختترین ناوچە شاخاویەکان پاشەکشێ بکەن و درێژە بەپڕەچەڵەکی خۆیان بدەن. هەروەکو بڵێی لەماوەی کورت کورتدا داگیرکردنیان بۆتە چارەنووسێك.

ئەم راستینە ئەوەش روووندەکاتەوە کە بۆچی کوردان بەشێوەی یەکینەی خێڵی تەسك و بەهێز ماونەتەوە و هەبوونی کۆمەڵایەتی خۆیان هێندە پێشنەخستووە، لەهەمانکاتدا جگە لەتوێژێکی بەکرێگیراوی سنووردار ئەوەش روون دەکاتەوە کە بۆچی لەهەناوی خۆیدا جیابوونەوەیەکی چینایەتی قووڵی بەخۆیەوە نەبینیوە. جیابوونەوەی چینایەتی وەکو دیاردەیەکی دەرەکی بەدیدێت. هەم چینی سەردەستی بەکرێگیراو، هەم چینی چەوساوەی ژێردەست لەنێو هەلومەرجی شارستانییەتی بیانی پێکدێت. ئەم رەوشەش وەکو هۆکارێکی سەرەکی توانەوەیەکی بەرفراوان و پێشنەخستنی ئازادانەی کولتوور و زمانی خۆی رووبەڕوومان دەبێتەوە. کاتێك لەنزیکترەوە تەماشای ئەو راستینە مێژووییە بکەین کەتێیدا

ژیـاون دەبینـین کـە سـتاتۆی کـوردان نەبەباڵادەسـتی نـاوخۆ نەبەباڵادەسـتی دەرەکـی روون ناکرێتەوە. کاتێ بەرەو دەرەوە هەنگاو بهاوێژێ دەتوێتـەوە و گەوهـەری خـۆی لەدەست دەدات. کاتێ بەرەو ناوخۆ پاشەکشێ بکات بەشێوەی پاشکەوتووترین یەکینەی خێـڵ و تـیرە و بنەماڵە لەنێو رەوشی دابڕان دەژی و دووچاری گۆشەگیری دەبێت. مەحکومی بێکاریگەرترین و ستاتۆی کۆمەڵگایـەکی وەها دێـت کـە لەمەترسـیدایە. هـەروەکو بڵێـی لـەکۆنترین مامـان کەمرۆڤایـەتی هێناوەتە دونیاوە کەوتۆتە رەوشی دایپرەیـەک کـە لەکۆشـەیەک کـەوتووە و کـەس لەزەمانەکـەی تێناگات. ئاشکرایە کە ئەم راستینەیە رێگـای لـەپێش ستاتۆیەکی زۆر ستەمکارانە و نایەکسان کردۆتەوە.

کاتێک لەلایەنێکی ترەوە هەڵوەستە بکرێت، لەبواری ئایین و ئـەخلاق تەماشـای مەسـەلەکە بکرێ، دەبینرێ کە هەلومەرجێکی کۆمەڵایـەتی وەها لەناواخنی خـۆی دەگرێـت کـە بەرادەی هەرە زێدە گوناهباری و نەفرەتی تێدایە. پیرۆزییەکەی بۆ تەواوی ئەو میوە و ئاژەڵە ماڵییەکان دەگەڕێتەوە کەبۆ یەکەمین جار بۆ مرۆڤایەتی بەدەستهێنا. پیرۆزی نان، شەراب و شیر، رەمـزی ئـەم لایەنـەی راسـتینەکەیە. نـاتوانرێ نکوڵـی لەهـەبوونی پـیرۆزی لـەنێو بۆهێڵـی کـوردان و پـەیڕەوکردنی بکرێـت. بـەڵام ئەمـە راسـتینەیەکە لـەژێر ماوەتـەوە و بەتـەواوی گوزارشـتی لـە خۆی نەکردووە. گوناهباری کوردان لەوە سـەرچاوە دەگرێـت کـە بەشـێوەیەکی شایسـتە خـاوەن لەپیرۆزیەکانیان دەرنەکەوتوون. خاوەنی هێنـدە پیرۆزیـە بیـت و نەبیتـە کۆمەڵگایـەکی ئـازادی شایسـتە بەمـە، رەوشـێکی گوناهبـاری گشـتی هێناوەتـە ئـاراوە. لای کـوردان ئـایین لـەجیاتی پاکبوونـەوە لـە گوناهـەکان، گوناهـەکان دەشـارێتەوە. ئـەوەی رۆڵـی سـەرەکی لـەوەدا دەبینێـت ئەوەیە کـە تـەواوی ئـەو باوەڕیانـەی لـەدوای کولتـووری خوداوەنـدی ژنـی هەلومەرجـەکانی کۆمەڵگای نیۆلیتیک هاتوون، ریشەکەیان بیانییە.

ئـەم ئـایین و خوداوەندانـەی ئـامرازی ئـایدیۆلۆژی پەلهاویشـتن و کۆلۆنـی هەلومـەرجی کۆمەڵگایـەکی جیـاوازن، بـاوەڕی و ئـیرادە و وشیاری کوردانـی تێکداوە و رێگـای لـەپێش ئـەوە کردۆتـەوە لـەبواری هـەزر و سۆزداریشـدا زۆر بەپاشـکەوتوویی بمێننـەوە. هـەزر و سـۆزێکی خولقکارانە بۆ خۆیان و هەلومەرجەکانی ژیانیان بەرهەمناهێنێ کەپشتی پێدەبەستن. نـەداری ماددی یەنەداری مەعنەوی ئەنجامگیر دەبێـت.هەرچی نەفرەتـە، ئـەو وەڵامـە ئەخلاقییـە کـە دراوەتە تەواوی ئەو جوڵانەوانەی داگیرکاری، دەست بەسەرداگرتن و وێرانکاریانەی بـەدرێژایی مێژوو بەرێوە چووە، لەلایەنی ئایینیشەوە لەبەرزترین ئاستدا گوزارشت لـەگوناهباری دەکات. لەبەرئـەوەی هیـچ کۆمەڵگایـەک لـەمێژووی خۆیـدا هێنـدە لەناویەکدا دووچـاری داگیرکـاری و دەستدرێژی و وێرانکاری نەهاتووە، کوردان هەرە زێدە دووچـاری نـەفرەت هـاتوون، مـەحکومی تاریکایی و ئێشی گـەلێک هـاتوون کـە بێبـەخت و بێچارەنووسـە. لەلایـەنی تـەواوی شـێوەکانی شارستانییەت و لەرێگای هێزە بژاردەکانی نەفرەت بەشێوەی کارەسات بەسەدان ساڵ شەپۆل بە

شەپۆل تا رۆژگاری ئەمڕۆمان شوێنگەیەکی بەکاریگەری هەبووە. ئێش و ئازارە مەزنەکانی ئەو کۆمەڵگایەی کوردانی دووچاری نەفرەت کردووە، تاریکایی و شەرمی لەخۆوە گرتووە. ئەم راستینەیە لەلای کوردان نەخشە و وێنەی پیرۆزی و گوناهباری و نەفرەت دەکێشێت.

رۆشنکردنەوەی کێشەی کورد یەکێك بوو لەئامانجە سەرەکیەکانی بەرگرینامەکەم. زۆر لەمولاوە کە کێشەی کورد کێشەیەکی تەسکی نەتەوەیی بێت، وەکو کێشەیەکی مرۆڤایەتی رووبەروومان دەبێتەوە کە پێویست دەکات لەهەموو بوارەکانی مێژوویی و کۆمەڵایەتی شیبکرێتەوە، تەنیا بەو کێشە نەتەوەییانە ناچێت کە لەهەناوی سیستەمی سەرمایەداری و لەدەوروبەری بازاری نەتەوەیی پێکهاتووە. بناخە مێژوویی و کۆمەڵایەتیەکەی دەرفەت بەشێوەگرتنێکی بەمجۆرە نادات. کێشەیەکە لەگەڵ نموونەی سۆمەری کۆمەڵگای چینایەتی لەدایکبووە و مەزنبووە. کاریگەریەکی بەرچاوی سەرجەم سیستەمە کۆیلەداری و دەرەبەگایەتییەکان جێگای باسە. دەتوانرێ بگووترێ تەواوی شارستانییەتە گرنگەکانی لەرۆژهەڵاتی ناوین ئاواکراون و پەرەیان سەندووە، سەبارەت بەکێشەی کورد بەقووڵایی رێگایان لەپێش کێشە و گیروگرفت کردۆتەوە. سەرجەم ئیمپراتۆریەتەکانی سۆمەر، بابل، ئاشوور، هیتیت، گریکۆ ـ رۆمان، بیزەنت، پارس، ساسانی، و ئیسلامی جوگرافیای کوردانیان کردووە بەگۆرەپانێکی شەڕ. وەڵامی کوردانیش بەرامبەر ئەم هێزانە، بەشێوەی کۆمەڵەی بچووکی خێڵ و تیرە پاشەکشێی قووڵایی ناوچە شاخاوییەکانیان کردووە و هەبوونی خۆیان پاراستووە، هەرچی توێژەکانی دەشتن لەناو کولتوور و هێزی باڵادەستدا تواونەتەوە و بێ کەسایەتی ماونەتەوە. هەڵوێستی " ئەوەی هات و چو، ئاغام و پاشامی " چینی سەردەست تایبەتمەندێتیەکی نەگۆری ئەم قۆناخەیە.

لە سایەی ئەو هەلومەرجانەدا کێشەی کورد ناتوانێ بگاتە ئاستێکی سیاسیش؛ بەرامبەر بە داگیرکاری و دەستدرێژییە بێسنوورەکان، تەنیا دەتوانێ هەبوونی جەستەیی خۆی بپارێزێ. لە ژێر جۆرێکی هەرەشەی فڕکردن پاراستنی هەبوونی خۆی لە بواری جەستەیی، وەکو ئامانجێکی سەرەکی بەرجەستە بووە. لە جیاتی ئەوەی سەرکەوتن لە ئەنجامدانی هەڵمەتێکی کولتووری ــ سیاسی ببینێ، بەڵکو لەوەدا دەبینێ کە رێ لەوە بگرێت و نەهێڵێ لە رەوشی کۆمەڵگابوون دەربکەوێت. کاتێك بەشێوەی پاشکەوتووترین خێڵ، تیرە و بنەماڵە لەسەر پێیان مایەوە، ئەوا سوپاسی ئەم رەوشە دەکات و بەسەرکەوتنی لەقەڵەم دەدات. چونکە رەوشی لەمە بەولاوەتر، دەرکەوتنە لەرەوشی کۆمەڵگا؛ کەوتنە نێو رەوشی جینۆساید و فڕکردنە. دووریانەکە ئەوە بوو، لە بواری جەستەییدا یان لە ناوچوون یاخود بەردەوامکردن. وەکو هێزێکی سیاسەت و رێکخستن گەیشتن بە ئاستی ئازادی سیاسی و کولتووری رەوشێکی زۆر سنووردار بوو، بەڵام لەهەلومەرجەکانی رۆژگاری ئەمڕۆمان پێشکەوتنێکی لەمجۆرە لەئارادایە. بەڵام هەرەشە و مەترسی سەرەکی بەجۆری کوشتاری جەستەیش نەبێت، ئەوا لەمیانەی

سیاسەتی توانەوە و فشار گۆڕینی و دەرخستنی لەگەوهەری خۆی، وەکو سەرەکیترین تایبەتمەندێتی کێشەکە بەدرێژایی مێژوو رووبەڕوومان بۆتەوە. کاتێك وەکو کێشەیەکی ئازادی دەنگی دایەوە، ئەو کاتە واتایەکی هەبوو.

کێشەی کورد لەمیانەی ئەم تایبەتمەندێتیانەیەوە، دوو واتای سەرەکی هەیە: یەکەمیان، بەرخودان بەرامبەر هەوڵەکانی توانەوە و نەبوونی بەموڵکی خۆی؛ دووەمیان، گەیشتن بە تواناکاریەکانی ژیانی ئازاد. ئاڵۆزی فرە رەهەندی کێشەکە لەم تایبەتمەندێتیە مێژوویی و کۆمەڵایەتیانەی سەرچاوە دەگرێت. داگیرکاری و فشاری نەتەوەیی و چەوسانەوەی ئابووری و توانەوەی کولتووری کە بە پشتبەستن بە سەرمایەداری پەرەی سەندووە، ئەو کێشە و گیروگرفتانەی قووڵتر کردۆتەوە کەبە درێژایی مێژوو کێشەی کورد پێیەوە دەناڵێنێ. هەڵبەتە کوردان کە مەحکومی شێوازی ژیانێك بوون بەردەوام لەنێو تەنگەتاوی دان و هەروەکو ئەوەیە لەسەر پردی سیرات بێت، بەرامبەر هێزە نەتەوەیی و سیاسییەکانی لەژێر سایەی سیستەمی سەرمایەداری خۆیان رێکخستووە، ئادوارادە لەرەوشێکی بێ چەکی و لاوازی دایە. گوشاری نەتەوەیی کە لەسایەی سیاسەتەکانی توانەوە و چەوسانەوە بەگوێرەی فشاری باو هاوچەرختر و بەهێزترە، ئەو راستینەیەی لە کێشە و دیاردەی کورد بەرامبەر رێڕەو و پەیڕەوەکانی چەوسانەوە و توانەوە لەئارادایە رەوشێکی وەها پێشکەوتووە تەنانەت خۆبەدەستەوەدانیش تێپەڕدەکات، بێچارەییە، بەشێوەیەکی خۆبەختانە دەست لە خۆبەردان، پەنابردنە بەر ئاسنامە نامۆکانی دوژمنان. هەرچی بەرخودانە سنووردارەکانە کە لەپێناو ئازادی نیشاندراون، لە ماوەیەکی کورتدا لە ئەنجامی پیلانگێڕیە ناوخۆ و دەرەکییەکان لەوە رزگاریان نەبووە کە ئەنجامی پێچەوانەیان لێنەکەوێتەوە.

ئەمە راستینەیەکی دەرکپێکراوە لە ناو ئەم راستی و رەوشەدا کوردان ناتوانن تواناکاری سیاسی و هونەری و باوەڕی و هزرێکی تۆکمە پێش بخەن. هەروەکو بڵێی لە ئەنجامی ئەو کۆڵەمستانەی لەلایەن هەرکەسەوە بەر دەم و چاوی دەکەوێت تەنانەت ناتوانێ بە دروستی هەناسەش بدات. ئاشکرایە لەنێو هەلومەرجێکی بەمجۆرەدا ناتوانێ بە تێڕوانینێکی هونەری و زانستیانە و شوێنەوارەکانی بگات. کاتێك ئەو شێتایەتیەی لە تێڕوانینی کوردان هەیە لەگەڵ بێچارەیی و داخوازی بەزەیی پێهاتنەوە بەناو یەکتردا دەچن و لەگەڵ یاخیبوونی سەرەتایی دەبن بەیەك، ئەوا ئەو دووبارە بوونەوەی وەکو سووڕانەوەی چەرخ وایە و پێبەپێ بێ واتاو بێ شێوە دەبێت، سەرچاوەی خۆی لەم راستینەوە دەگرێت. ئەو نەفرەت و گوناهباریەی ئایینەکان دەخوازن روونیبکەنەوە ئەنجامێکی دیکەی ئەم راستینەیەیە. ئەو رەهەندەی لە کێشەی کورد هاتۆتە ئاراوە، واتە راکردن لەخود و قووڵایی خیانەتی بابەتی و پەنابردنی خۆبەختانە بۆ ئاسنامەی نامۆ و هی دوژمنان، تەنیا دەشێ لەژێر سایەی پێشکەوتووترین نەفرین و گوناهباری رووبدات. لەنێو کەش و هەوایەکی بەمجۆرە دەنگی خۆش و رەنگ و شێوە

پێشناگەوێت. لە میانەی هێزی واتا بەخشین ناتوانرێ بە ئاراستەی راست، چاك و جوانی بە قووڵایی سۆزداری بگات. بە پوختە بەهۆی نەبوونی هەلومەرجە ماددی و مەعنەویەکانی کە دەتوانین بە مرۆڤانەی ناو ببەین، بەشێوەیەکی ئازاد و شەرەفمەندانە ناژین.

لەو شیکردنەوانەی لە بەرگرینامەکەمدا سەبارەت بە راستینەی PKK ئەنجامەدا و شوێنێکی گرنگی گرتووە، هەوڵدرا ئەوە بسەلمێنرێ کە PKK ئامانجی بەدیهێنانی هەڵوەستەیەك بووە سەبارەت بەکێشەی کورد و هەر هیچ نەبێ بتوانێ بڵێ منیش مرۆڤم. هەرچەندە بە قووڵبوونێکی ئایدیۆلۆژی چڕ و هێزێکی پراکتیکی نەگەیشتبێت، بەشێوەیەکی سەرەکی لە دیاردەی کورد بەدوای هەڵوەستەیەکی مرۆڤانەی بەبڕیار دەگەڕێ و هەوڵدەدات بیهێنێتە ئاراوە. پەنابردنی بۆ شێوازی توندوتیژی کە نەیتوانی سەرکەوتووانە پەیڕەوی بکات، لە گەوهەری خۆیدا جگە لە ئامرازی بەرگری رەوا هیچ رۆڵێکی دیکە نابینێ. بەکارنەهێنان و پەیڕەونەکردنی بەرگری رەوا بەشێوەیەکی راست و دروست بەرامبەر تیرۆرە هەمەجۆرەکانی قڕکردن؛ ئەو لایەنەیەتی کەهەرە زێدە پێویستە رەخنەی بکرێ و تاوانبار بکرێ. ئەو راستینەیەی کوردان تێیدا ژیاون؛ لەهەموو گۆڕەپانەکاندا لەسەر بنەمای ئایدیۆلۆژی، ئەخلاقی، سیاسی، سەربازی، کولتووری بەرگری رەوا دەکاتە ناچارییەك. لەرەوشێکی پێچەوانەدا تەنانەت ناتوانن خۆیان وەکو مرۆڤیش پێناسە بکەن. بەرخودانی کوردان لەگەڵ سووربوون لەسەر ئەوەی وەکو مرۆڤ و گەلێك بژین، جگە لەوەی کەدەبێ وەکو گەلێك بۆ ئەوانیش دان بە ئازادی و دادوەری دابنرێت، نابێ بەهیچ جۆرێکی دیکە هەڵسەنگێنرێ. ئیستیسمارکردن و کردنی بە ئامرازی بەرژەوەندییە تەسکەکانی کەسێتی و بنەماڵێتی، وەکو قوربانییەك پێشکەشکردنی بەگەمە سیاسییە هەمە جۆرەکان، ئەو لێکەڕینە راستە ناگۆڕێت کە لە ناوەرۆکەکەیدا هەیە، پێناسە سەرەکییەکەی کێشەکە لەنێو نابات. ئەوەی PKK تێیدا سەرکەوتنی بەدەستهێنا؛ کێشەکەی ئاشکرا کرد، کردی بە موڵکی رای گشتی نەتەوەیی و نێونەتەوەیی و رێگا راستەکانی چارەسەری دەرخستە روو. ئەگەر کەموکوڕی و هەڵەی گرنگیشی هەبووبێت، لەو باوەڕەدام پێویستە رۆڵە مێژووییەکەی بەمجۆرە پێناسە بکرێت. نابێ ئەمە رەچاو نەکرێت کەلە ساڵانی ٢٠٠٠دا PKK رووبەڕووی وەرچەرخانی زۆر گرنگ بۆوە.

لە بەرگرینامەکەمدا هەوڵمداوە ئەوە نیشانبدەم کە چارەسەری هاوچەرخانەی کێشەی کورد بە پێودانگەکانی دیموکراسیەتێکی تەواو و دەوڵەتی مافپەروەری تێپەڕدەبێت. ئەوە خراوەتەڕوو کە ئەو چارەسەرییە نەتەوەپەرستییەی لە سەدەی ١٩ و ٢٠ بەبنەما گیراوە، زیانی لە دەسکەوت زیاتر بووە. ئایدیۆلۆژیای نەتەوەپەرستی و پێرەوەکانی هەوڵیداوە جێگای عەشیرەتگەرایی و ئایینگەرایی بگرێتەوە، لە جیاتی بنەمای زانستی لەسەر بنەمای سۆزداری و شۆڤێنیزم رێگای گرتۆتەبەر، لە ئەنجامیشدا هەردوو شەڕی دابەشکردنی جیهانی و چەندین

شەڕی هەرێمی و نـاوخۆیی لەگـەڵ خۆیـدا هێنـاوە و لـەرێگای ئـەم شـەڕانەوە مرۆڤایـەتی هەژاندووە. لەگەڵ ئیفلاسکردنی فاشیزمی نەتەوەپەرستی کـە سـەرمایەداری وەکـو رێگـای رزگاربوون لە قەیران تاقیکردەوە، لـە کۆتاییـەکانی سـەدەی بیسـتەمدا، سەرکەوتنی سیستەمی دیموکراسییانە وەکو گونجاوترین رژێم مسۆگەر بووە، گرێـدراو بـەوەی بـەبێ پێویستی بینینی یاریکردن بـە سـنووورە سیاسـیەکان و لەدەسـتدانی واتـای توندوتیـژی لـە ئـەنجامی شۆڕشـە تـەکنۆلۆژی و زانستیەکان، تەناتـەت لـە ئاستەمترین کێشەکانیشدا تواناکاریـەکانی رێککـەوتنی دیموکراتییانـە، بـەهای چـارەنووس نامێزانـەی خـۆی سـەلماندووە. لەگـەڵ ئـەو ئاشـتییە درێژخایەنەی سیستەمی دیموکراتییانـەی وەکو گرنگـترین دەسکەوتی شارستانییەتی ئەورووپا بەدەستهاتووە، لەگەڵ رەخساندنی دەرفـەتی گەشـەپێدانی ئـابووری، رێگـای لـە پێـش ئـەوە گردۆتەوە لەئاستی دونیادا ببێتە هێزی سەرنج راکێشان. پێناسەی بەرفراوانی مافەکانی مرۆڤ و واتـاداربوونی مافپـەروەری وەکـو بەهایـەکی هەڵکشـاو، سـەنتێزێکی بـەهێزتری دەوڵـەتی مافپـەروەری و سیسـتەمی دیموکراتـی لەگـەڵ خۆیـدا هێنـاوە. لـەو سـەنتێزەی دەوڵـەتی مافپەروەری بینینـەوەی چارەسـەری بـۆ تـەواوی گیروگرفتـە نەتـەوەیی و کۆمەڵایەتییـەکان سەخت نییـە. هـەروەکو چۆن ئەزموونـە مەزنەکەی شارستانییەتی ئـەورووپا رێگای لـە پێش ئەمە گردۆتەوە، ئەوەش مسۆگەر بووە کە هێزە سەرەکییەکەی لەم رێگاچارەیە وەرگرتووە.

جێگرتنی گەلی کورد لەنێو سێ گروپی گەلی مەزنی تورك، عەرەب، فارس و ئـێرانی لـە نێـو جوگرافیـای رۆژهـەڵاتی نـاوین، وەکـو رواڵـەتێکی نـامۆی مێـژوو، لـە رۆژگـاری ئـەمڕۆماندا لـە جیاتی رۆڵێکی نێگەتیفانە، دەرفەتی ئەوەی پێدەدات رۆڵێکی پۆزەتیفانە ببینێ. کاتێك شێواز و پـێڕەوی نەتەوەپەرسـتی بەبناخـەبگیرێت، ئـەوا حاشـاهەڵنەگرە رێگـا لـە پێـش هـەمان ئەنجامـەکانی ململانـێ مەزهـەبی و ئـایینی و خێڵەکیـەکانی مێـژوو دەکاتـەوە. لەکێشـەی کـورد نەتەوەپەرستی نەتەوەی سەردەست و ژێردەست لە کارەسات بەولاوە هیچ شتێکی دیکە لەگەڵ خۆی ناهێنێ. ئەو سیاسەتانەی لە سەدەی ١٩ و ٢٠ لەسەر کوردستان پـەیڕەو کـرا ئـەم راستینە پـڕ لـە ئێش و ئازارەیـان سـەلماندووە. دوا پێکدادانـی ئیسـرائیل ــ عـەرەبیش بـەرچاوترین نموونەیە کە لـە گەوهـەری خۆیـدا بێبـەزەیی و ئیفلاسبوونی نەتەوەپەرستی دەسـەلمێنێ. لـە سەردەمی شارستانییەتی دیموکراتییدا مێـژوو لـە رۆژهـەڵاتی نـاوین رۆڵێکـی گرنـگ بـەکوردان دەبەخشێتەوە.

هـەروەکو چۆن لـە بەرەبـەیانی شارستانییەتدا داپـیرە و باپـیرەی کـوردان لـە کەسـایەتی سۆمەریەکان بناخەی لە دایکبوونی شارستانییەتیان دانا و رۆڵی لانکەی بینیوە؛ لە رۆژگاری ئەمڕۆشماندا بۆ لە دایکبوونی شارستـانییەتی دیموکراتییانـە لەسـەر هـەمان جوگرافیـا ناچارە وەکو گەلێکی سەرەکی رۆڵ ببینێ. کاتێك گەلی کورد خۆی دیموکراتـیزە دەکات، لـە هـەمانکاتدا ئەو شارستانییەتەش لە رۆژهەڵاتی ناوین ناچاری دیموکراتیزەبوون دەکات کە لـە مێزۆپۆتامیـا

سەرچاوەی گرتووە. لە کاتێکدا جارێکی دیکە لە لە دایکبوونی شارستانییەت و مەزنکردنیدا رۆڵی دایک و لانکە دەبینێ، گەرەنتی ئەمەش تەنیا پێودانگە دیموکراتیەکانە کە لەناو نزیکترین سیستەم لە ئازادی و دادوەری بەدیدێت. ئەم رۆڵە لە کۆنە وڵاتی سۆمەریەکان ئێراق وەکو راستیەکی دەست لێبەرنەدراوی سیستەمی نێو دەوڵەتی جێگای خۆی لە رۆژەڤدا گرتووە. تاوەکو بە چارەسەریەکی دیموکراتیانە نەگات، دەرکەوتن و کەوتنی لە رۆژەڤ جێگای باس نییە ، ئەمەش بۆ هۆکاری ریشەیی دەگەرێتەوە. پێهەڵگرتن و چارەسەری دیموکراتیانەی کوردان، هەروەکو بڵێی چارەنووسی نوێی رۆژهەڵاتی ناوین پێکدێنێ.

کاتێك شۆرشی ئێران لە ئیسلامی دیموکراتدا بەدوای قەڵەمبازدا دەگەرێ، دیسان رۆڵی کوردان بێ هاوتایە. چارەنووسی دیموکراسیەتی ئێرانیش لە ئەنجامی چالاکی و وشیاربوون و شێوە نوێکانی ژیانی کوردان نەشونما دەکات. هەرچی لە تورکیایە دیموکراتیزەبوون هەم لە دەوڵەت هەم لە کۆمەڵگادا، هەم لە تەواوی دەزگاکانی سیاسی سفیل گەیشتۆتە ئاستێك بەبێی ئەو نابێت. لەسەرەتای سەدەی بیستەمەوە نەتەوەپەرستی تورك کە پشتی بەبناخەیەکی لاوازی بۆرژوازی دەبەست، بەشێوەیەکی دەمارگیری و شۆڤێنی لە میانەی نکوڵیکردن لە شارستانییەتی ئەنادۆڵ، بووە بە کۆسپێکی سەرەکی لە پێش پێشکەوتنی هاوچەرخانەی نەتەوەی تورك. ئەو نەتەوەپەرستیەی ئەتاتورکی دامەزرێنەری کۆمار کە لەسەر بنەمای پاراستنی وڵات و کولتوورە تا ئاستێکی مەزن رووبەرووی نکوڵیکردن بۆتەوە. نەتەوەپەرستی کوردان کە هەناسە کورتتر بوو، هەروەکو چۆن بە درێژایی سەدەیەك هیچ ئومێدێکی بۆ کوردان نەخولقاند، جگە لەهێزی ئامادەکاری کارەساتە پر لە ئێش و ئازارەکان هیچ رۆڵێکی دیکەی نەبینیوە. هاندان و وروژاندنی نەتەوەپەرستی لە نێوان هەردوو گەلاندا، لە ئامادەکردنی کارەساتی نوێتر بەولاوە تێپەرناکات. تەواوی هەلومەرجە نەتەوەیی و هەرێمی و نێودەوڵەتیەکان لە ساڵانی ٢٠٠٠دا دیموکراتیزەبوون بەسەر رۆژەڤی تورکیا دەسەپێنێ. تەواوی کێشە ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسیەکان، لەسەرووی هەمووشیانەوە کێشەی کورد، بەئاستێك و قۆناخێك گەیشتووە تەنیا لە میانەی گەیشتن بە پێوانەی دەوڵەتی مافپەروەری (یاسای) دیموکراتیانە چارەسەر دەبێت. ئاشکرایە کە تاکە رێگای گەیشتن بە ئاستی شارستانییەتی هاوچەرخ کە بەردەوام دروشم و ئامانجی تورکیایە بەم چارەسەریە تێپەردەبێت.

لە مێژووی تورکاندا لە سێ قۆناخی ستراتیژیدا رۆڵی کوردان بەپێی پێویست سەلمێنراوە. بەشێوەیەکی مێژوویی دەستنیشانکراوە ئەگەر کوردان نەبوونایە سەرکەوتنی مەلازگرت ی ساڵی ١٠٧١ بەدینەدەهات. دیسان ئەو پەیوەندییانەی لە سەرەتای سەدەی شانزەدەهەم لەگەڵ کوردان پێشخرا رۆڵێکی یەکلاکەرەوەی هەبوو لەوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ببێتە هێزێکی جیهانی و لە شەری چاڵدیران ی ١٥١٧ و چەندین شەری دیکەدا سەرکەوتن بەدەستبێنێ. رزگاربوونی تورکان لەو رەوشە مەترسیدارەی دوای هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە

ساڵی ١٩١٨ تێیکەوتن، بە تایبەت لە ناخافتنەکانی ئەتاتورک کە ڕۆڵی ڕزگارکەری بینی و لە ستراتیژ و تەکتیکەکاندا ڕوونیکردۆتەوە دەردەکەوێت کە ئەگەر کوردان نەبوونایە نەدەشیا ڕزگاریان بێت. لەراستیدا دەتوانرێ ئەم راستیانە و پێکهاتە سیاسیانەی تورکان بەخۆیانەوە بینی وەکو راستینەی کوردانیش شرۆڤە بکرێت. لەو پێکهاتە سیاسیانەی لە هەزار ساڵی دوایی لە ئەنادوڵ و میزۆپۆتامیا بەرزبوونەتەوە، دوای تورکەکان، ڕۆڵی کوردان بە پلەی یەکەم دێت. ئەو پێکهاتە سیاسیەی لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا لە ئارادایە، تایبەتمەندێتی کۆماری دیموکراتی و عەلمانی یە. هەروەکو سەردەمی ڕزگاری دیسان لە ئەنجامی یاخیبوون، بەرێوەبەرایەتی ئۆلیگارشی و دوا سەرهەڵدانی PKK سەلمێنراوە، ئەگەر کوردان نەبن، ئاشتی و ئەمە سەرناگرێت. تەنیا ئەوکاتەی کوردان تەڤلیبوونێکی ئازاد و دادوەرانەیان هەبێت، کۆماری تورکیای دیموکراتی و عەلمانی بەدیدێت. هەروەکو چۆن هێندەی ڕیشەی مێژوویی، ڕزگاربوون لەو قەیرانە قورسانەی بەشێوەیەکی ڕۆژانە لە ئارادایە ئەم راستینە دەسەپێنێ، سەر لەنوێ هەڵکشانێکی مێژوییش بەم تەڤلیبوونەدا تێپەڕدەبێت.

لە بەرگرینامەکەمدا بەها دەدرێتە هێزی چارەنووس سازانەی مافپەروەری. وەکو گشتگیری ڕێساکانی جێبەجێکردنی ئیرادەی کۆمەڵگا مافپەروەری چەندە دیموکراتییانە بێت، هێندە چارەنوس ساز دەبێت. ئەو مافپەروەری ـ یاسایەی لە ڕۆژهەڵاتی ناوین وەها نیشاندراوە کە سەرچاوەکەی ئیلاهی یە، لەگەڵ وەهەری خۆیدا دەتوانرێ بەو شێوەیە پێناسە بکرێت کە بەزاری پادشایی سەرەڕۆیی دەرەبەگایەتی و کۆیلەداری یەکلایەنە گوزارشتی لێدەکرێت و ئیرادەی گەل تێدا سڕاوەتەوە. هەرچی یاسای ڕۆمایە کە وەکو بناخەیەک یاسای ئەورووپا پشتی پێ دەبەستێ، بە شێوەیەکی ئاشکرا ئیرادەی هێزەکانی کۆمەڵگا تێیدا یەکلاکەرەوەن. فەبوون بۆ پێشکەوتنێکی دیموکراتییانە، تایبەتمەندێتی سەرەکی ئەم سیستەمەی مافپەروەرییە. یاسای ئەورووپای ڕۆژگاری ئەمڕۆمان لەگەڵ ئەوەی ئیرادەی چینی بۆرژوا بە بنەما دەگرێت، سەبارەت بە نوێنەرایەتیکردنی گەل ژمارەیەکی زۆری ئیرادە و بە تایبەتیش تاک بە شێوەیەکی زیاتر لەخۆوە دەگرێت. تایبەتمەندێتی یاسای دیموکراتییانە پابەندی ئەم پێشکەوتنانەیە. چەندە ماف و بەرژەوەندییە سەرەکییەکانی تاک و گەلان لە ناوەندەکانی یاسا ڕەنگبداتەوە، ئەوا بەو ئەندازەیەش بەهای جێ دەسەری کێشەکان زیاد دەبێت. لەبەرئەوەی پێشکەوتنی یاسا و مافپەروەری لەم لایەنەوە بەواتای گەرەنتی دادوەری و ئازادییەکان دێت، ئەوا ئاشتی کۆمەڵایەتی و گەشەپێدان و ئارامی دەبێتە خاوەن ستاتۆیەکی بەبایەخ.. لە کاتێکدا دوای ئەو ئەزموونە گرنگانەی شارستانییەت ئەورووپا بە خۆیەوە بینی و بە شێوەی یەکێتی ئەورووپا وەکو هێزێکی سیاسی خۆی کرد بە یەک، بناخەی یاسایی ئەم پێشکەوتنەشی بە شێوەی

پەیمانی مافی مرۆڤی ئەوروپا ڕێکخستووە کە بەهای دەستوورێکی هەیە. لەسەر بنەمای پەیمانی مافی مرۆڤی ئەوروپا یەکێتی ئەوروپا گوزارشت لە یەکێتیەکی یاسایی ـ مافپەروەری دەکات. گوزارشتی دامەزراوی پەیمانی مافی مرۆڤی ئەوروپاش، دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپایە. بێگومان دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپا ڕۆڵێکی گرنگ لە گەرەنتیکردنی مافە سەرەکییەکانی تاك و گەلان دەبینێ.

بەهۆی پێشێلکاری زۆربەی ماددەکانی (خاڵەکانی ) پەیمانی مافی مرۆڤی ئەوروپا گواستنەوەی دۆزەکەم بۆ دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپا، جگە لە پێشێلکردنی مافەکانی کەسێتی من، سەبارەت بەوە جێگای بایەخە ئەوە نیشانبدات کە سەبارەت بە مافە سەرەکیەکانی گەلی کورد لە چ ڕەوشێکدایە. بەیانکردنی ئیرادە لەسەر بنەمای پێشێلکردنی مافی تاك هەڵوێستێکی زۆر تەسکە، مەترسی ئەوەی هەیە بواری مافی گەلان لە یاسادا ڕەچاو نەکرێت، هەربۆیە هەڕەشەی ئەوە لە خۆوە دەگرێت ڕێگا لەپێش بێدادی بکاتەوە. دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپا دەتوانێ ئەم هەڕەشە و مەترسییە چارەسەر بکات. لەرەوشێکی پێچەوانەدا کاتێك کراسێکی یاسایی بکرێتەبەر ڕەوشی ڕفاندن و دەستگیرکردنی من کە بەرهەمی پیلانگێڕیەکی بەرفراوانە و لەگەڵ گەوهەر و ماددە بەرجەستە و پەیوەندارەکانی پەیمانی مافی مرۆڤی ئەوروپا ناکۆکە، ئەوکاتە بەخۆشی دەبێتە پارچەیەکی ئامرازی پیلانگێڕیەکە. بەشێوەیەکی بابەتی هەڵسەنگاندنی چالاکیەکانی ئەو پێکدادانانەی لەلایەن هەردوو لایەنی شەڕ وەکو شەڕێکی بەردەوامی ئاست نزم بەڕێوە دەچوو، بۆ گەلی کورد هەڵسەنگاندنی وەکو بەرگری ڕەوا و ئەگەر لەم شەڕەی بەرگری ڕەوادا چالاکی وەها ڕوویدابێت کە تاوانی شەڕبن ئەوا پێویستە لە هەردوو لایەندا لێکەڕێنی دەرهەق بکرێت و هەوڵبدرێ لە دادگایەکی تایبەت دادگایی بکرێت، ئەمەش پێویستییەکی دادوەری و مافپەروەری هاوچەرخە. لەم لایەنەوە دادگاییکردنەکەی ئیمرالی هەم لە بواری ناوەڕۆك، هەم سەبارەت بە مافپەروەری پۆزەتیف لەگەڵ پەیمانی مافی مرۆڤی ئەوروپا ناکۆکە. هەروەکو لە چەندین نموونە بینراوە پێشخستنی دادگایەکی بێ لایەنی تاوانەکانی شەڕ، ئەرکێکی ئەخلاقی و سیاسی کۆنسەی ئەوروپایە کە هێزی بەڕێوەبردنی دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپایە و تورکیاش ئەندامێکی دامەزرێنەرە تێیدا.

ناشێ پێکدادانێك کە مەرگی نزیکەی ٤٠٠٠٠ کەس و چۆڵکردنی نزیکەی ٤٠٠٠ گوند و کوێستانی لەگەڵ خۆی هێنا بە تیرۆریزم ناوببرێت و بکرێتە موڵکی تاکێك، بکرێتە موڵکی من. لە تورکیا بەتایبەتی گوتەی سەرۆك کۆمار سلێمان دیمرال" هەندێ جار دەردەکەوینە دەرەوەی ڕۆتین"، هەروەها گووتنی" لیستەی ئەوانەی دەکوژرێن لای منە " لەلایەن

تانسۆچیلەر کە ئەو سەردەمە سەرۆك وەزیران بوو، هەروەها گووتەی " بەهەزاران چالاکی هاوشێوەی ئەمەمان ئەنجامداوە" کە محەمەد ئاغری وەزیری ناوخۆی ئەو قۆناخە سەبارەت بە رووداوی سوسوورلك ئاماژەی پێکرد، بەشێوەیەکی ئاشکرا نیشانىدەدات کە لە بەرزترین ئاست و کامە بواردا یاسا و مافیەروەری پێشێلکراوە. بەهەزاران دۆزی بۆ دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپا گواستراوەتەوە ئەم بێدادییە نیشاندەدات. ناشێ بە چەند هەزار دۆلارێك ئەم بێدادییە قەرەبوو بکرێت. ئەگەر بەمجۆرە تێپەڕبکرێت، ئەوا کەواتە دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپا و کۆنسەی ئەورووپا پەیمانی مافی مرۆڤی ئەورووپایان کردۆتە ئامرازێکی دژی کوردان؛ لەگەڵوهەمەری خۆیدا وا لەقەڵەم دەدرێت کە یاساو مافیەروەری پێشێل کراوە. بۆ رێنەکردنەوە لە پێش پێشێلکاریەکی سەختی یاسایی بەمجۆرە دۆزەکەم بایەخێکی مەزن لە خۆوە دەگرێت. لەبەرئەوەی تورکیا ئەندامی دامەزرێنەری کۆنسەی ئەورووپا و بەرئەندامی یەکێتی ئەورووپایە ناچارە گرێدراو بە پەیمانی مافی مرۆڤی ئەورووپا بجووڵێتەوە. لەبەرئەوەی دەوڵەتێکی کوردان نییە، پەسندنەکردنی وەکو لایەنێك، نابێتە هەڵوێستێکی دادوەرانە. هەربۆیە لێگەڕینی ماف لە ئاستی تاکەکان، ئەوا پێچەوانەی ئەو راستینەیە دەبێت کە پەیمانی مافی مرۆڤی ئەورووپا بەشێوەیەکی بابەتی بۆ تەواوی گەلان داتی پێداناوە و لە مافیەروەرییە " سێ جۆری ماف" ناودەبرێت. کردنەوەی دادگایەکی دادوەر و تایبەت بەکوردان کە لەنێو کێشەی زۆر قورستر لەوەی بەڵگان دا دەژی، لەگەڵ رۆحی پەیمانی مافی مرۆڤی ئەورووپا گونجاو دەبێت. لەم چوارچێوەیەدا بەرگرینامەکەم تاوتوێ دەکەم و گەوهەرەکەشی بەم راستینەیە پشت ئەستوور دەکەم. ئەگەرنا ئەو پێشێلکاریە یاساییانەی لە ئیمرالی دووچاری هاتم بەکێشە و گیروگرفتی پلە دووی هەڵدەسەنگێنم. بێگومان هەوڵ و هەنگاوەکانی دارزانی (لینجی) سیاسی کە بەدرێژایی قۆناخی دادگایکردنەکە لە ئارادا بوو، بە تەنیا زیندانیکردنم لە دوورگەیەکدا کە هیچ هەلومەرجێکی گونجاوی تەندروستی تێدا نییە و بەشێوەیەك خراوەتە نێو تابووتی ژوورێکی تاکەکەسی هەروەکو بڵێی لە خاچدراوم، بێگومان ئەم رەوشە لەگەڵ پێڕەوی کۆمیتەی ئاستەنگکردنی ئەشکەنجە لە ئەورووپا ناکۆك و پێچەوانەیە. دەبووایە سەبارەت بەسەرجەم ئەم مەسەلانە تەگبیری پێویست وەرگیرا بووایە.

بە جەختکردنەوە دەخوازم ئاماژە بەوە بکەم کە سەبارەت بەو پێشێلکارییە یاساییانەی ئەنجامدراوە، نەك دەوڵەتی تورکیا، بەڵکو حکومەتەکانی یۆنان، روسیا و ئیتاڵیا بەرپرسیار دەبینم. هەروەکو چۆن لەبەرگرینامەشدا بە بەرفراوانی ئاماژەم پێکرد پێشێلکاری یاسا لە هەڵوێستی پیلانگێرانەی ئەم حکومەتانە سەرچاوەی خۆی دەگرێت. مافی پەنابەری سیاسیم بۆ

ئەورووپا ژێر پێخراو هەروەکو لەلایەنی نوێنەری تایبەتی سەرۆکی ئەمریکا بلینکن لە دەزگاکانی راگەیاندن راگەیەنرا، بەفەرمانی کلینتۆن ی سەرۆکی ئەمریکا وەکو دیاری تەسلیم کراوم. لە بەرزترین بەرپرسیارانی سیستەمەوە تا دەگاتە حکومەت و سیخوڕەکان بەرامبەر ئەم پێشێلکارییە یاساییە بەرپرسیارن. تاوەکو دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپا کێشەکە شینەکاتەوە و کۆتایی بە پێشێلکاری یاسا و مافپەروەری نەهێنێت، دادگاییەکەی ئیمرالی بە نارەوا لە قەڵەم نەدات و پووچەڵی نەکاتەوە، هەرگیز وەها لەقەڵەم نادرێت کە دادوەرانە جوڵاوەتەوە؛ ئەوا لە مەترسی و هەڕەشەی ئەوەش رزگاری نابێت کە بکەوێتە ژێر کاریگەری پیلانگێڕیەك کەحکە کەسایەتی مندا دژ بە گەلی کورد ئەنجامدراوە. کاتێك دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپا رۆڵی مێژوویی خۆی سەبارەت بەم دۆزەی من ببینێ، ئەوا جێگای راستەقینەی خۆی لە وەرچەرخانی کۆماری تورکیا بۆ دەوڵەتی یاسای دیموکراتی و عەلمانی دەبێت. لێرەشدا لەمیانەی رێ نیشاندەری دادگای باڵا دەخوازم ئاماژە بەوە بکەم کەبۆ ئەو رێچکەیە ئامادەم کە بە" چارەسەری دۆستانە" ناودەبرێت. کاتێك کاربەدەستانی تورکیاش پەسندی بکەن، ئەوا لەسەر بنەمای دەست لەچەك بەردان و بەبناخە گرتنی سنوورەکانی دەوڵەت، لەرێگای دیالۆگ و پێوانە دیموکراتیەکان کارکردن بۆ تەبایی و رێککەوتن بەگونجاوترین رێگا دەبینم و لەم بارەیەوە PKK ش هەمان ئیرادە بەیان دەکات.

دەزگاکانی دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپا و یەکێتی ئەورووپا ئەگەر تەنیا لەچوارچێوەی مافی تاك تەماشای کێشەکە نەکەن و پەیوەندی نێوان سیاسەت و مافپەروەری بەشێوەیەکی گونجاو لەگەڵ پێوانە دیموکراتیەکان شیبکەنەوە، ئەوا رۆڵێکی گرنگی دەبێت لەوەی کوردان و کۆماری تورکیا لەو قەیرانە سەختانە رزگاریان بێت کە پێیەوە دەناڵێنن. پێشکەوتنێکی بەمجۆرە رۆڵێکی ریشەیی لە یەکبوونی تورکیا لەگەڵ یەکێتی ئەورووپا دەبینێ و قۆناخی تەفلیبوون خێرا دەکات. لە مێژوودا گەلێك جار بینراوە کە دۆزی گرنگی یاسایی رۆڵێکی مەزنی لە وەرچەرخانی پۆزەتیڤانەی دەوڵەت بینیوە. لەوەرچەرخانێکی بەمجۆرەدا دەشێ یاسای دیموکراتی ئەورووپا رۆڵێکی ئەرێنی ببینێ. دووبارە ئاماژە بەوە دەکەم کە پێشکەوتنێکی بەمجۆرە سەبارەت بەئەورووپا لە هەمانکاتدا ئەرکێکی ئەخلاقی و سیاسییە.

هەڵوێستەکانی سەردەمی داگیرکاری ئەورووپا لە بنەچەی کێشەکانی کورد و تورکیا شاراوەیەوە و کاریگەرییەکی سەختی هەیە. بەبێ ئەوەی ئەم کاریگەرییە هیچ لە قورسایی و خێرایی خۆی کەم بکاتەوە تاوەکو رۆژگاری ئەمرۆمان درێژەی بە حوکمی خۆی دەدات. کاتێك دەڵێین پێویستە ئەمجارە رۆڵێکی ئەرێنی ببینێ، مەبەستم ئەوەیە ئەم کاریگەرییە ئەرێنییە

بەلاوەبنرێت، هەربۆیە دەبێ وەکو پێویستییەکی پەیمانی مافی مرۆڤی ئەوروپا و بەبێ ئەوەی بەرامبەر گەوهەری رژێم بکەونە نێو دوودڵی ئەرکە سیاسی و ئەخلاقیەکانی جێبەجێ بکات. باوەڕیم وایە کە ئەو بەرگرینامەیەی پێشمخستووە رێگای چارەسەری بەمجۆرە رۆشن دەکاتەوە.

چالاکی و چەمکی دژە ـ ئیمپریالیزمی ئەوروپا کە پاشماوەی سەردەمی نەتەوەپەرستییە و زیاتر خزمەت بە پاشڤەرۆیی خۆجێیی دەکات، بەواقیعبینی و پێشکەوتوخواز نابینم . ئەوەی پێویستە ئەنجام بدرێ نەك وروژاندنی دوژمنایەتی نێوان شارستانییەتەکان، بەڵکو دەرخستنی تواناکاری سەنتێزە لەسەر بنەمای لایەنە تایبەت و ئازادەکانی، بەمجۆرە رۆڵ و بەشداری لە کاروانێکی ئازادیخواز و دادوەرانەتری مێژوو دەکات. ئەو واتا و ئەنجامەی کە بەرگرینامەکەم پێی گەیشتووە ئەمەیە. هیچ گومانێکم لەوەدا نییە کە بەتایبەتی بەخوڵقاندنی مێژووی ئازادی خاوەن ماف سەردەکەوێت.

**سیستەمی پشت بەستوو بە ستەمکاری و تەڵەکەبازی ژێر دەکەوێت، ئەو سیستەمەی بە ئازادی و دادوەری پشت ئەستوورە سەردەکەوێت!**

**عەبدوڵڵا ئۆج ئالان**

**دورگەی ئیمرالی ـ زیندانی تاکە کەسی داخراو**

**١١ ی نیسان ـ ٢٨ ی ئاب ٢٠٠١**



پەرەسەندنی کەسێتی تاک، واتای سەرهەڵدانی کۆمەڵگای ئازادە. دەشێ هەندێ جار تاکێکی رۆشنبیر نوێنەرایەتی نەتەوەیەك یا کۆمەڵگایەك بکات. کولتووری گروپ‌و خێڵ‌و بەندییی بە سانایی دەرفەت بە پەرەسەندنێکی بەمجۆرە نادات.

کاتێك تاك‌و رۆشنبیر پێویستیەکانی کاروانیان جێبەجێبکەن، ئەو ئاراستەیە بەدیدێت کە کۆمەڵگاکان بۆ سەدان ساڵ شوێنی دەکەون، بەمجۆرەش ئەو کارە چەندین شەڕو پارتی ناتوانن ئەنجامی بدەن، ئەو جێبەجێی دەکات.

پێویستە بەردەوام بەبیر خۆمان بێنینەوە کە هونەرمەندان‌و پێغەمبەران‌و فەیلەسوف‌و بیریاران، هەریەکەو لە قۆناخی خۆی رێنیسانس‌و کاروانێکی رۆشنگەری بوون. ئەو کۆمەڵگایەی رۆشنبیری نەبێت وەکو ئەو قافڵە وایە کە رێزانی خۆی لەدەستداوە. لەبەر ئەوەی شۆڕشی رۆشنگەری‌و رێنیسانس تاکی هێندە پێویست‌و ژیانی بۆ کۆمەڵگاکان دەخولقێنێ‌و خۆشی لەلایەن ئەو تاکانەوە دەخولقێنرێ، هەر بۆیە بایەخێکی مەزن‌و دەست لێبەرنەدراویان هەیە.

عەبدوڵلا ئۆج ئالان